سەرجەم بەرهەمەکانی

# مامۆستا هێمن



تاریک و ڕوون، ناڵەی جودایی،
بارگەی یاران و نامە و پەخشانەکان

 ## ناوەڕۆک 

### کتێبی یەکەم: سەرجەم شیعرەکانی هێمن

## کتێبی دووهەم: سەرجەم نووسراوەکانی هێمن (هەواری خالی)

# لە کوێوە بۆ کوێ!

من بۆخۆم وام، ڕەنگە زۆر کەسیش وابێ، کە شێعری شاعیرێک یا نووسراوەی نووسەرێک دەخوێنمەوە «چ زیندوو چ مردوو» پێم خۆشە خۆشی بناسم. بزانم کێیە؟ خەڵکی کام وڵاتە؟ کاری چییە؟ چۆن دەژی و ئەگەر مردووە چۆن مردووە؟ لە کوێ نێژراوە؟

بۆیە بڕیارم دا سەرگورشتەی خۆم لە سەرەتای ئەم بەشەی دیوانەکەم دا بنووسم. بە کێم گووتبا ئەو سەرگورشتە بنووسێ؟ کێ من لە خۆم باشتر دەناسێ؟

پێوە بووم زۆر درێژی بنووسم. تەماشام کرد دەبێتە چیرۆکێکی درێژ و شیرین و پڕ کارەسات. چ چیرۆکێک لە بەسەرهاتی ئینسانێک لە واقیع نیزیکترە؟ ئەویش بەسەرهاتی ئینسانێکی نیزیکەی پەنجا ساڵی لە ساڵەکانی چەرخی بیستەم، ئەو چەرخە سەیر و سەمەرەیە، ئەو چەرخە پڕ کێشە و شەڕ و شوورە، ئەو چەرخە پڕ لە کارەسات و پەلامارە، ئەو چەرخە پڕ لە شۆڕش و ئاڵوگۆڕە وەبیر بێ. بەتایبەتی ئەگەر ئەو ئینسانە کورد بێ. کوردێکی بێ بەش و چارەڕەش بێ و تا ڕادەیەک لە خەباتی ڕزگاریخوازی نەتەوە زۆرلێکراوەکەیدا بەشداربووبێ. بەڵام بەداخەوە بۆم نەکرا. بەشی زۆری لەبەر تەوەزەلیی خۆم. با بمێنێ بۆ هەلێکی تر ئەگەر مام وازی لێ نامێنم.

خوێنەری خۆشەویست! پێت وا نەبێ لێفەم لەسەر هەتیوان هەڵداوەتەوە و لە بنی کوولەکەم داوە و هەرچیی هەیە نووسیومە. نا هەر وا کورتە سەرگورشتەکەمت بۆ دەگێڕمەوە.

شاعیری هیچ قازانجی بۆ من نەبووبێ ئەو قازانجەی هەبووە كە ئەو ناوە دوور و درێژەی «سەید محەممەد ئەمینی شێخەلئیسلامی موكری» لە كۆڵ كردوومەتەوە.

باوكم ناوی سەید حەسەنی شێخەلئیسلامی موكری بوو. لە تۆرەی مەلا جامی چۆڕی بوو كە سێسەد ساڵ لەوە پێش هاتۆتە ساباڵغ و بنەماڵێكی گەورەی لەو مەڵبەندە پێك هێناوە. دایكم ناوی زێنەب و كچی شێخی بورهان بوو كە ئێستا بنەماڵەیەكی گەورەی موكریانن.

بەهاری ساڵی ١٣٠٠ی هەتاوی (١٩٢١ی زایینی) بە شەوی جێژنی بەراتێ لە گوندی لاچین نزیكی ساباڵغ لەدایك بووم. مێژوكم لە مەمكی دایكم نەكردووە و فرچكم بە شیری دایەن گرتووە.

دایكم زۆری بەچاوی دادەدامەوە و دەیگوت: تۆ پێوقەدەم ڕەش بووی. هەر تۆم وەزگ كەوت لەشی ساغم بەخۆمەوە نەدی. نەخۆشیم پێوە نووسا، كوێرەوەری و پەژارە ڕووی تێ كردم. لەسەر مانگ و ڕۆژی خۆم بووم كە ناچاربووین برەوین و بچینە لادێ. كە بەربوویەوە، نە من تلپاتی تەڕم لە مەمكیدا بوو، نە باوكت سیپاڵێكی لەماڵێدا مابوو. لەشكری شكاك وەك ئێمەشی وەك هەموو خەڵكی ساباڵغ ساف لەساف تاڵان كرد و گەسكی لەو ناو ماڵەدا كە سێسەد ساڵ بوو وەسەریەك نرابوو و بەمیرات بۆ باوكت بەجێ مابوو.

منیش جارجار بەپێكەنینەوە دەمگوت دایەگیان سووچی من چییە؟

دایەنەكەم ناوی یاسەمەن و خەڵكی ئازەربایجان بوو. لەلەكەم كە ناوی عیزەت بوو خەڵكی توركیا بوو، ئەو دووانە لەبەر هەژاری و نەداریی خۆیان پەڕیوەی كوردستان ببون و لە گوندەكەی ئێمە گیرسابوونەوە و لە سەروبەندی لەدایكبوونی مندا منداڵێكیان ببوو. منداڵەكەی ئەوان لە من بەختەوەرتر بوو، نەژیابوو و تووشی كوێرەوەریی دنیا نەهاتبوو و عەمری درێژی بۆ من بەجێ هێشتبوو و پارووی دایك و بابیشی لە ڕۆنی هاوێشتبوو.

ئەو ژن و پیاوە هەژارە و ئاوارە بەدڵ و گیان منیان بەخێو دەكرد و زۆریان خۆش دەویستم. منیش ئۆگری ئەوان ببووم وەك دایك و بابی خۆم خۆشم دەویستن.

لەبیرمە زمانی ئەوانم وەك بلبل دەزانی، جا نازانم توركیم دەزانی یا ئازەری؟ ڕەنگ بێ ئازەری بووبێ، چونكە منداڵ زمانی دایكی باشتر فێر دەبێ.

مردنی عیزەت و تۆرانی یاسەمەنم باش وەبیر دێ. ئەم ڕووداوە یەكەم زەبری توند بوو كە وەهەستی ناسكی منداڵانەی من كەوت و یەكێكە لە بیرەوەرییە هەرە تاڵەكانی ژیانم.




لە ڕاســـتیدا من دوو جار هەتیو بووم و دووجارم دایک و باب مردوون: جارێک بەساوایی و جارێک بە پیری.

بابم هەم دەوڵەمەند بوو، هەم بەدڵ و دەسبڵاو، چاکی بەخێو دەکردین، پێنج خوشک و دوو برا بووین، کاکم و خوشکێکم لە من گەورەتر بوون. بەمنداڵی زۆر تێروتەسەل و کۆک و پۆشتەبووم. بەڵام کۆیلە و دیل بووم، کۆیلەی ناو قەفەزی زێڕ، کۆیلەی ڕێوشوێنی کۆن.

ڕێوشـــوێنی بنەماڵەکەمان ئیجازەی نەدەدا من لەگەڵ هاوتەمەنەکانم گاڵتەوگەپ بکەم. چونکە من کوڕە دەوڵەمەند بووم و ئەوان کوڕە هەژار. من کوڕی شێخەلیسلامیی بەناوبانگ بـــووم، ئەوان کوڕی لادێییەکی بێ ناوونیشـــان. من بەروپشـــت ئەتڵەس بـــووم و ئەوان کەڕەکرمانج. من کۆک و پۆشتە بووم و ئەوان ڕووت و ڕەجاڵ.

ئاخ...! گەورەکانم تێ نەدەگەیشتن من چەند پەرێشان و کەلەلام، ئەوان نەیاندەزانی بەو کردەوەی خۆیان چۆن هەستی من بریندار دەکەن، برینێک کە دەبێتە گریمانەی ڕووحی و تا مردن سارێژ نابێ.

ئێســـتاش کـــە وەبیرم دێتەوە کزەم لە جەرگی دێ و خەمێکـــی گران دام دەگرێ، کە من لە هەموو خۆشـــیی ســـەردەمی منداڵی بێبەش بووم. لەپێش چـــاوی من منداڵەکانی گوندەکەمـــان، ئەو ڕەش و ڕووتانەی هاوشـــانی من نەبـــوون! بەئازادی و بێباکی گاڵتە و گەمەیان دەکرد، لە خاک و خۆڵ دەگەوزین، لە ســـەربانان هەڵدەبەزین، لە قوڕ و چڵپاودا غارغارێنیان دەکرد، لەسەر تەپۆلک و کۆپەین ملانەیان دەگرت، لەسەر سەهۆڵ خلیسکیان دەکرد، لەسەر لۆدە کا بازبازێنیان دەکرد، بەگژ یەکدا دەچوون، پێک هەڵدەپڕژان، ئاشت دەبوونـــەوە، ئاورۆچکەیان دەکردەوە و خانووچکەیان دروســـت دەکرد. هێلانە چۆلەکەیان دەردەهێنا، تەبکەیان دەناوە. هەلووکێن، تۆپێن، هەمزەل، هەنگڵەشـــەلە، دایە من مەمدە بەگورگی، هەڵوای بەشـــەپان، قەرەقەرێ و دەیان جۆرە گاڵتـــەی دیکەیان دەکرد. بەڵام من بەو تاوانەی کە نەجیبزادە بووم دەبوو وەک گەورە گەوران لە دیوەخان لەســـەر چۆک دابنیشم و متەقم لەبەر نەیەتە دەر! بۆ بەدبەختی لە ماڵی ئێمەاد نێرینەی لە من بچووکتر نەبوو. دەبوو لەبەر هەموویان یەک پێ هەســـتم و تا ئیزنم نەدەن لەبەر دەسیان ڕاوەستم و دانەنیشـــم، لەدوای هەمـــووان نان و چام بۆ دابنێن. چەندم پـــێ خۆش بوو نە کەوای مەخمـــەر و تاقـــە و قوتنی و خەزەلم لەبەردا با، نە پانتۆڵی ئاڵمانی زەردم لە پێدا با، نە کاڵەی شەمامەبەندی ئاوریشم چنم لە پێدا با و نە شەدەی سەوزم لەسەر با و نە پشتێنی پەشمینەی کەسکم لە پشتدا با و وەک منداڵە ڕووتەڵانەکان ئازاد بام.

نەڵێن ماشاڵڵا کوڕەکە لەو تەمەنەشدا ئازادیخواز بووە و هەستی بەجیاوازیی چینایەتی کـــردووە و ڕقی لێ بـــووە، نەخێر نەوەڵڵا نە ئازادیخواز بووم و نە تڕەماش، وازم لە گەمە و یاری بوو و براوە.

تەنیا بیرەوەرییەکی خۆشم لە زەمانی منداڵیم هەیە، ئەویش ئەوەیە شەوانە دەچوومەوە ژووری و ســـەرم وەســـەر ڕانیَ دایە مرۆت دەکرد و ئەویش حیکایەتی بۆ دەکردم، تا خەو دەیبردمەوە. دایە مرۆت پیرێژنێکی دنیادیدەی کۆنســـاڵ بوو. بۆ خۆی نەیدەزانی تەمەنی چەندە، بەڵام بێگومان زۆری لە ســـەد ســـاڵ هەڵبواردبوو. شەش پشتی بنەماڵەی ئێمەی دیبوو، سەرسپی و هاودەمی دایکم بوو. ڕووح سووک، قسە خۆش و نوکتەباز بوو، هەزاران نەقل و نەزیلەی خۆشـــی دەزانی و بۆی دەگێڕامەوە. زۆر شـــتی بەنرخ لەو فێربووم کە لە ژیاندا کەڵکم لێ وەرگرتن. ڕووحی شاد بێ.

ئەلفوبێم لە خزمەت مامۆســـتا ســـەعید ناکام خوێند، کە ئەودەم مێرمنداڵ بوو. کاکم کە مامۆســـتای تایبەتی بـــۆ ڕاگیرابوو، زۆر لـــە خوێندن دەترســـا و خەریک بوو منیش بترســـێنێ و بەمەرەدی خۆی بەرێ. بەڵام مامۆســـتا ناکام نەک هەر ســـامی لە خوێندن شکاندم، بەڵکە تێی گەیاندم خوێندن خۆش و شیرینە. پێش ئەوەی ئەلفوبێم پێ بناسێنی بزنۆکە و مەڕۆکەی حوسێن حوزنیی ئەوەندە بۆ خوێندبوومەوە هەمووم لەبەر بوو. کتێبی ئەنجومەنی ئەدیبانی ئەمین فەیزیمان هەبوو. شـــێعرە گاڵتەکانی شێخ ڕەزای فێر دەکردم. لەبیرمە قەســـیدە درێژەکەی عارف سایبم کە وا دەس پێدەکا: «ئاوارەیی خاکی وەتەن و سەیر و سەفا خۆم» لەسەرڕا بۆ خوارێ لەبەر بوو، وەک تووتی دەمخوێندەوە و لە مانای نەدەگەیشتم.

کە ســـامم شکا بابم ناردمیە سابڵاخ تا لە مەدرەسەی دەوڵەتی بخوینم. لەپێشدا زۆرم پێ خۆش بوو. لە مەدرەسەی «سەعادەت» ناونووسیم کرد. بەڵام کە ڕۆژی هەوەڵ چوومە سەر کلاس تۆقیم و وەختابوو شێت بم. من منداڵێکی لادێیی نازداربووم، لە کوردی بەولاوە هیچ زمانم نەدەزانی لە مەدرەسەش کەس نەیدەوێرا بە کوردی قسە بکا.

مـــن لـــە ژیانمدا ڕۆژی ڕەش و تاڵم زۆر دیون، بەڵام ڕۆژی ڕەشـــتر و تاڵترم لەو ڕۆژە نەدیوە کە چوومە مەدرەسە. مامۆستاکەم کە خۆی کورد بوو و دوایەش تێگەیشتم فارسی باش نازانێ، بەفارســـی تێی ڕاخوڕیم هیچی تێ نەگەیشتم. هاودەرسەکانم کە هەموویان لە من باوخۆشـــتر بوون پێم پێ کەنین، زۆر بەخۆمدا شکامەوە. ماوەیەک بەشەو لەبن لێفەدا لە ترسی مەدرەسە دەگریام و بەیانی بەقرخەمەرەسی دەچوومەوە. منداڵ هەموو گاڵتەیان





پـــێ دەکردم و پێیان دەگوتـــم «کرمانج». لە مەهاباد بەخەڵکـــی لادێ دەڵێن کرمانج و بەوشـــەیەکی ســـووکی دەزانن. دوایە بۆیان گێڕامەوە دەیانگوت بەفارســـی جنێومان پێ داوی و حاڵی نەبووی. چابوو سێ چوار کوڕەپوورم لەو مەدرەسە دەیانخوێند و لەسەریان دەکردمەوە. دەنا منداڵە وردکە لەوانە بوو شـــێتم بکەن. ئێستاش نازانم کوێڕا فارسی فێر بووم و لەگەڵ وەزعەکە ڕاهاتم.

مەدرسەکەمان خانووێکی گەورە و کۆن و کەلاوە بوو. تاقە چاوەیەکی ئاودەست هەبوو قەت وەبەر نەدەکەوت. مزگەوتمان لێ نیزیک بوو، بەڵام نە فەڕاشـــی مەدرەسە دەیهێشت وەدەرکەوین و نە مجێوری مزگەوت ڕێگای دەداین بچینە ئاودەســـتی مزگەوت. بۆشکەیەک ئاوی چۆمی بۆگەن لە بن دیوارێک داندرابوو. دەفرێکی تەنەکەیان لەسەر دانابوو، ئەو هەموو منداڵە بەو دەفرە ئاویان دەخواردەوە. هەمیشـــە لەسەر چوونە ئاودەست و ئاوخواردنەوە شـــەڕ لەنێو شـــاگردەکاندا پەیدا دەبوو و «نازم»ی مەدرەسە، کە پیاوێکی زۆر زاڵم بوو بیانووی وەگیر دەکەوت کە دارکاریان بکا.

ژووری دەرس خوێندنمـــان تەنـــگ و تاریـــک بـــوو. پەنجەرێکی تێدا بـــوو کە لەباتی شووشـــە کاغەزی لێ درابوو. بۆ ئەوەی ڕووناکتر بـــێ کاغەزەکەیان بەڕۆن چەور کردبوو. کورســـییەکانی چەپرەک و شـــکاو بوون. مێز و کورسی مامۆستاش لە ئێمە باشتر نەبوو. مامۆســـتاکەمان پیرەپیاوێکی کوێرەمووشەی زۆر تووڕە و تۆسن بوو. هەمیشە سێ چوار شووڵی ئاڵووباڵووی لووس و لێک و ئەستووری لەسەر مێزەکە داندرابوو. هەرکەس دەرسی نەزانیبـــا یا ورتەی لەبەر هاتبا دەر زۆر بێ ڕەحمانە وەردەگەڕا ســـەروگوێلاکی. تا فێری فارسی بووم دوو سێ جاری بیزار کردم. بەڵام لەدواییدا لێی نەدام. کە مامۆستا چووبا دەر شـــاگردێک کە پێیان دەگوت «موبســـیر» لە جێگای ئەو دادەنیشت. ئەرکی ئەوەبوو هەر کەس برۆزی بکا بەمامۆستا بڵێ. هەموومان لە موبسیر پتر دەترساین تا لە مامۆستا. هۆی ئەوەبوو مامۆســـتا ڕقی لە کەس نەبوو و لە خۆڕا لە کەسی نەدەدا، بەڵام موبسیر ئەوەی نەیدەزانی ڕقی لە هەر کەس بایە با هیچیشـــی نەکردبا شکایەتی لێ دەکرد و مامۆستاش بێ لێپرسینەوە و پێ ڕاگەیشتن دەیکوتا.

بەرنامەی دەرسەکانیشـــمان تازە فیکری لێ دەکەمەوە زۆر گران بوو. ئەو ســـاڵی وام ڕابوارد و لە ئاخری ســـاڵێدا یەکێک بووم لە باشـــترین شاگردەکانی کلاس و لە ئیمتیحانی ئاخری ساڵدا زۆر باش دەرچووم.

هاوینێ چوومەوە گوند. حەیف مامۆستا ناکام لەوێ نەمابوو. بەڵام میرزایەکمان هەبوو

زۆر لە مامۆســـتاکەی مەدرەســـەم خوێندەوارتر بوو. لەکن ئەو و بابم کتێبی دووەمم تەواو کــرد. بەرنامەی ئەودەمی وابوو دەبوو هەموو کتێبەکە لەبــەر بکەی و من هەمووم لەبەر کردبوو.

ســـاڵی دووەم زۆر ئاســـوودە بووم. هەر مەشق و حیســـاب و دیکتە مابوو لەوانیشدا باش بووم. بۆیە هەر لە هەوەڵەوە یەکێک بووم لە شـــاگردە باشـــەکان و پێم وانییە لەو ســـاڵیدا لەسەر دەرس لە شووڵێک زیاتریان لێدابم. وەزعی مەدرەسەش لە پار باشتر بوو، ژوورەکەمان لە هی پار زۆر خۆشـــتر و ڕووناکتر بوو، مامۆستاکانیشـــمان باشـــتر بوون. بەڵام یەکیان کە کورد بوو و دەرســـی فارســـی پێ دەگوتیـــن زۆر توند و بەزاکوون بوو، هەموو ڕووحمان لێی تۆقیبوو. مامۆســـتای حیسابمان ئازەری بوو. فارسی ئەوەندە خراپ دەگـــوت کە ئێمەی منداڵ گاڵتەمان پێ دەکرد. بەڵام حیســـابی باش فێر کردین. لەبیرمە ئێوارێک جەدوەلی زەربی بۆ نووسینەوە و هەریەکە دانەیەکی داینێ و حاڵی کردین چۆنی لەبەرکەین. گوتی ســـبەینێ ئێوارە لێتان دەپرسمەوە و هەرکەس ڕەوانی نەکردبێ غەڵەت و شـــوولی لێ دەدەم. من ئەو شەوەی نەنووستم تا لەبەرم کرد. سبەینێ لێی پرسینەوە، کەس نەبوو بەتەواوی لەبەری بێ و وێی نەکەوێ. تەنانەت من کە زۆر چاکم لەبەر کردبوو شـــولێکم ئافەریمانە هەر خوارد. خۆش ئەوە بوو مامۆســـتای حیســـابمان بۆ خۆی لێی نەدەداین و مامۆستاکەی ترمان ئەو زەحمەتەی لەباتی ئەو دەکێشا.

چوار کلاسم لە مەدرەسەی سەعادەت و پەهلەوی خوێند. هاوینانیش لە گوند لەکن بابم تۆمار و کتێبی ئینشام دەخوێند و لەبەر خەتی ئەمیر نیزامی گەرووسی و میرزا حوسێنی ڕەشـــەم دەنووسیەوە. ئینشای فارسی باش فێر ببووم و خەتم یەکجار خۆش بوو، زۆر لە ئێستام خۆشتر دەنووسی.

دەڵێن دەعبای زیرەک بەدندووکێ پێوە دەبێ. بابم کە خەت و ئینشای منی دیت، گوتی ڕۆڵە بوویە میرزا و خوێندنی مەدرەســـە بەســـە، بچۆ لە مەدرەسەی دینی بخوێنە و جێی مەلا جامی چۆڕی بگرەوە. زۆرم پێ ناخۆش بوو دەســـت لە خوێندنی مەدرەسە هەڵبگرم، نازانم بۆ هیچ پێم خۆش نەبوو ببمە مەلا. ڕقم لە بەرگەکەیان بوو. کەوای درێژ و تەشـــک و پاڵدێمی مەلایانەم پێ جوان نەبوو. بەڵام چار چبوو؟ حوکمی حاکمە و دەردی موفاجا. تەسریفی زەنجانیان لەبن هەنگڵ نام و هەی دێ بۆ خانەقای شێخی بورهان تا دەس بکەم بەڕایەڵەکردن وئالێ باباگوتن. جا پاش ماوەیەک کەوای ئاودامێن لەبەر بکەم و سیواک لە لاســـەر بچەقێنم و شاڵی گەرگەڕێ لەسەر ببەستم و جێگای مەلا جامی چۆڕی نگرمەوە و وەجاغی بنەماڵەکەمان کوێر نەکەمەوە.

چوار ساڵ لە خانەقا خوێندم یا باش ئەوەیە بڵێم نەم خوێند. بەڵام تۆڵەی کۆیلەتی ساوایەتیم ئەستاندەوە. لەگەڵ گەلی خاڵۆزاکانم کە وەک بەرانی سوڵتان مەحموود بەرەڵڵا و تەرخان بوون و لە هیچ جێگایەک دەنگ نەدەدران و کەس بەرپەرچی نەدەدانەوە، گەلێکم بەدفەڕی و بزۆزی و دەس بزێوی کرد.

نەوەشێخ، ئەویش نەوەشێخی چل ساڵ لەوەی پێش ئەگەر کەس دەستی وەبەر نەیەنێ و بەرپەرچی نەداتەوە لە سەروبەندی بلووغدا چ دەمێنێ نەیکا؟

ئەو چوار ساڵە خۆشترین ساڵەکانی ژیانی منن. زۆر خۆشمان ڕادەبوارد. دەستەیەکی ٨ ـ ٩ کەسی هاوتەمەن بووین، هەموو خاڵۆزا و پوورزا بووین. هەر هەژارمان بێگانە لەگەڵ بوو کە لە خۆمان هەڵنەدەبوارد. ئەویش بۆ خۆی زۆر قسەخۆش و خوێن شیرین بوو و باوکیشی پیاوێکی زۆر ماقووڵ و لە خانەقا زۆر خۆشەویست بوو.

شاعیرێکی فارس دەڵێ:

مرد خردمند هنر پیشه را
عمر دو بایست در این روزگار
تا بیکی تجربه آموختن
با دگری تجربه بستن بکار

بۆ پیاوی خاوەن هونەر و زانا دوو جار ژیان پێویستە تا لە یەکیاندا تەجرەبە وەسەریەک بنێ و لەوی تریاندا تەجرەبەکەی لەکار بێنێ.

دەستی شکاو و ڕانی وردم، ئەوی ئێستای دەزانم ئەگەر ئەودەم دەمزانی کار لە جێگایەکی دیکە بوو و منیش شتێکیتر بووم. بەڕاستی خانەقا زانستگایەکی گەورە بوو و دەمتوانی زۆر شت فێر بم.

خانەقای ئەو سەردەمانە زۆر ئاوەدان بوو. خەڵک دەهات و دەڕۆیی و کەس هەقی بەسەر کەسەوە نەبوو. فەرق و جیاوازی زۆر کەم بوو. جارێکی دیکەشم گوتووە و دووپاتەی دەکەمەوە دەتگوت کەشتی نووحە. لە هەموو تۆو و تۆرە و ڕەگەزێکی لێ بوو، پەنای بێکەسان و لێقەوماوان و ئاواران بوو. پیاوچاک، خۆپارێز، دیندار، موسڵمان، مەلا، سەید، زانا، خوێندەوار، چەتە، دز، پیاوکوژ، نەزان، شێت، بێکارە، پەککەوتە، کوێر، شەل تەنانەت بێ دینیش لە بن میچێکدا کۆببونەوە و پێکەوە دەژیان و هەموو یەک

جیرەنانیـــان وەردەگرت. ئەفغانی، فارس، تورک، ئازەری و تەنانەت هیندیشـــی لێ بوون. کوردی هەموو ناوچەکانی کوردستانی لێ هەبوون. کە بەشێوەی جۆربەجۆر قسەیان دەکرد و هــی وا هەبوون بەزەحمەت تێک دەگەیشـــتن. پیاوی گـــەورە و زانا بەناوبانگەکانی ئەو سەردەمەی موکریان وەک مامۆستا فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوا قازی موحەمەد، حاجی مەلامو‌حەمەدی شـــەرەفکەندی، عەلیخانی ئەمیری بەتایبەتـــی ئاغا خوێندەوار و زاناکانی فەیزوڵلابەگـــی هاتوچۆی خانەقایان دەکرد و بەمانـــگ و دوو مانگ لەوێندەرێ دەمانەوە. مەلای گەورە گەورەی لێ بوون و دەرســـیان دەگوتەوە. پڕ بوو لە سوختە و موستەعیدی باش. کەسێک ویستبای بخوێنێ و شت فێر بێ جێگای خوێندن و شت فێربوون بوو. بەڵام من لە کیســـم چوو و ڕەفاقەتی خاڵۆزاکانم و فیز و هەوای ئەوەشـــێخی نەیهێشت لەو هەلە کەڵکی پێویســـت وەرگرم. بێجگە لەوە لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا دووجار خراپ نەخۆش کەوتم و لە خوێندن بووم. جارێک کەوتوویيم گرت و لە مردن گەڕامەوە. تەنانەت دەیانگوت ئاومان بۆ گەرم کردووی و کفنمان بۆ بڕیوی. جارێکی تر کوانێکی گەورەم لە لامل هات و شەش مانگ لەبەری کەوتم و پاشان عەمەلیان کرد و ماوەیەکی دووروودرێژ بناوبوێر بووم. ئەو کوانە بەجارێک هێز و بڕستی لێ بڕیم و هەرگیز وەک خۆم لێ نەهاتەوە. من بە منداڵی قەڵەو و پتەو و بەهێز و هەرەکەت بووم. کەم منداڵی هاوتەمەنی خۆم بەزۆرەوانی دەرۆستم دەهاتن. بەڵام کە ئەو کوانەم لێ هات ئیتر هێز و توانام لە کەمایەسی دا.

ئەودەمی لە سابڵاخ دەمخوێند هەژارم دەناسی، هاتوچۆی دوکانی بابی هەژارم دەکرد. مەلایەکی پیری زۆر قسەخۆش بوو. کە چوومە خانەقا یەکترمان گرتەوە و بووینە دۆست. جاروبار خۆمان لەگاڵتەوگەپ دەدۆزیەوە و شـــێعرمان دەخوێندەوە. هەموو شوێنەوارەکانی ســـەعدی و حافز و مەولەوی و کەلیم و ســـایب و شـــاعیرە بەرزەکانی فارسیمان پێکەوە دەخوێندەوە و هەر تێگیراوێیەکی هەشـــمان با ڕەهاکردنی هاسان بوو. خانەقا ئەدیبی زۆر گەورەی لێ بوون، لێمان دەپرســـینەوە. مەلا قادرێکی پیری لەرزی دەنگ نووســـاوی لێ بوو، هەر بەحاڵ مابوو. ئەگەر بڵێم ئەو مەلایە ئاســـاری سەعدی لە خودی سەعدی باشتر دەزانێ پێم وایە موبالەغەم نەکردووە. کەیفی بەوە دەهات شێعرێکی سەعدی لێ بپرسیەوە، جا بەو دەنگە نوســـاو و لەرزە سەعاتێک بۆت شـــی بکاتەوە. خۆ شێخ موحەمەدی خاڵم چ ئەدیبێک بوو من ناتوانم تاریفی بکەم. ئەودەمی شەڕەشـــەقی ژیان وای لێ نەکردبووم ناوی خۆشـــم لەبیر بچێتەوە. هەر شێعرێکم خوێندباوە دەستبەجێ دەهاتە بەرم. هەزاران شـــێعری فارسیم لەبەر بوو. شێعری کوردیشمان هەرچی وەگیر کەوتبا لەگەڵ هەژار دەمان نووسیەوە و لەبەرمان دەکرد.

لە ئاخریدا من و هەژار بەتەواوی لە تاقمی کوڕە شێخەکان جوێ بووینەوە و شەووڕۆژ خەریکی شـێعر خوێندنەوە بووین. چەند چیرۆکی گەورە و چووکی وەک ئەسـکەندەرنامە و ئەمیر ئەرسـەلان و شـیرۆیە و حوسـێنی کوردمان پەیداکردن و خوێندمانەوە. شەوی سێشـەممو و جومعـەی وا هەبوو هەمـوو فەقێیەکانی خانەقا دەکەوتنـە لایەک و من و هەژاریش لەلایەک و شێعرێنمان دەکرد. بڕوا بکەن بۆڕمان دەدان.

ئەو هەموو شێعر خوێندنەوە و ڕەفاقەتی هەژار و هاتوچۆی مەجلیسی ئودەبای خانەقا زەوقی ئەدەبی لە مندا بەوجوود هێنا و تەنانەت شـێعری فارسیشـم دەگوت. بەڵام تەنیا لـەڕووم هەڵدەهات بۆ هەژاریان بخوێنمەوە. ئـەو خوداگرتووەش لەباتی ئەوەی بۆم چاک بکا و هانم بدا گاڵتەی پێ دەکردم. لەبیرمە جارێکی شـێعری شـاعیرێکی فارسـم دزیبو و لەناو شـێعری خـۆم ئاخنیبوو، بۆم خوێندەوە. گوتی وەڵـڵا ئەوانی خۆت زۆر خراپن، بەڵان هینەکەی ئیبنویەمین زۆر باشە. زۆر بەخۆمدا شکامەوە و دەستم لەو کارە ناڕەوایە هەڵگرت. خەریک بووم شـتێک بە شتێک بکەم کە بابم تێگەیشت ئەو ماوە عومرم بەزایە چـووە و لـە خانەقا نەمخوێنـدووە، ڕای گوێزتم بۆ کولیجە. ئەویـش مڵکی خاڵم بوو و مامۆستا فەوزی لەوێ مەلایەتی دەکرد.

دەبێ بڵێم من دەسکردی فەوزیم. ئەو هەڵی وەشاندمەوە و تێکی هەڵشێلامو سەرلەنوێ دروسـتی کردمـەوە. ئەو دەرکی زانیـن و فێربوونی بۆ کردمەوە. ئـەو ڕێگای ژیانی پێ نیشـاندام. بێگومان ئەگەر نەچووبامە خزمەتی فەوزی و لەکن ئەو مامۆستایم نەخوێندبا ڕێبازی ژیانم ئەو ڕێبازە نەدەبوو کە گرتم و پێیدا ڕۆیشتم و ئێستاش بەرم نەداوە.

ئـەو تێی گەیاندم مـن ڕۆڵەی کوردم و کوردیش نەتەوەیەکـی بێ بەش و چارەڕەش زۆرلێکـراوە و دەبـێ ڕۆڵەکانی لەپێناوی ڕزگارکردنیدا فیـداکاری بکەن و لەخۆبوردوویی نیشـان بدەن. ئەو فێری کردم زەوقی ئەدەبیم چۆن تیف تیفە بدەم و مشـتوماڵی بکەم. ئەو فێری کردم چۆن بنووسم و چۆن شێعر بڵێم. ئەو فێری کردم وڵاتەکەم خۆش بوێ و پێـی هەڵبڵێم. ئەو حاڵـی کردم کوردی زمانێکی ڕەوان و بەربڵاو و دەوڵەمەندە و دەکرێ ئەدەبێکی گەورە و دنیاپەسندی هەبێ.

ئەو حاجی قادری کۆیی، نالی، کوردی، سـالیم، مەولەوی، حەریق، مەحوی، ئەدەب و وەفایی پێ ناسـاندم و شێعرەکانی ئەوانی بۆ شی کردمەوە. ئەو فێری ڕۆژنامەخوێندنەوە و ڕۆمان خوێندنەوەی کردم. ئەو دیوانی شـاعیرە شۆڕشگێڕەکانی فارسی بۆ پەیداکردم و هانی دام بیانخوێنمەوە و شتیان لێ فێربم. بەڵام سوێندی دام قەت بەفارسی شێعر نەڵێم




هەتا بۆم دەکرێ بەکوردی بنووسم.

ســـاڵ و نیوێـــک لە خزمەت ئەو خوێندم. بەیانان لەگـــەڵ گزینگ دەکەوت، دەچوومە ماڵی مامۆستا و زۆر ڕۆژی وا هەبوو، تا بانگی نیوەڕۆی دەدا و مامۆستا هەڵدەستا بۆ نوێژ دەرســـم دەخوێند و هیچمان ماندوو نەدەبووین. کەم وابوو لەســـەر کتێب دەرسم پێ بڵێ، دوڕوگەوهەری نایابی لە دەریای قووڵ و بێ بنی زانستی خۆی دەردێنان و لە کۆشی منی هەژاری چاو لەدەســـتی دەکردن. بەڕاستی مامۆستا و شاگرد نەبووین پیر و مورید بووین. من تا ڕادەی پەرســـتن ئەوم خۆش دەویســـت و ئەویش منی بەکوڕی خۆی دەزانی. ئەگەر ڕۆژێک نەمدیبا ئارەزووم دەکرد. جومعە و سێشەممۆمان نەبوو. ئەو لە پێگەیاندنمدا بەپەلە بوو، منیش تامی تێگەیشـــتنم کردبوو و قەت لە خوێندن و خوێندنەوە و گوێ ڕاگرتن لە مامۆستا وەڕەز نەدەبووم.

پاش نیوەڕۆیانیش لەباتی مامۆســـتا دەرســـم بەکچ و کوڕە گچکەکانی خاڵم دەگوت، ئەویش دوو قازانجی هەبوو. هەم زانیاری خۆم بەرەوژوور دەچوو هەم زەحمەتی مامۆستام کەم دەکردەوە.

فـــەوزی بەبڕوای مـــن یەکێکە لـــە گەورەپیاوانی مێژووی کوردســـتان، کە داخەکەم شوێنەوارەکانی فەوتان و خۆشی لەبیر چۆتەوە. ئەو لاوە کوردانەی لە سەردەمی پاتشایەتی ڕەزاخانی پەهلەویدا کە بەتەقلیدی ئاتاتورک خەریک بوو گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا بتوێنێتەوە و یەکێک لەو ســـێ کوچکە ئاورە بوو کە پەیمانی ســـەعدآبادی پێک هێنابوو، ئازایانە کوردایەتیان دەکرد، یا ڕاســـتەوخۆ شاگردی فەوزی بوون یا شاگردی شاگردەکانی ئەو. بەتایبەتی پێشەوا قازی موحەمەدی شەهید شانازی بەوەوە دەکرد کە شاگردی فەوزی بووە.

مـــەلا ئەحمەدی فـــەوزی یا مەلای ســـولێمانی کێ بوو؟ چکارە بـــوو؟ بۆ پەیوەی مەڵبەنـــدی ئێمە ببوو؟ نازانم. من ئەودەمی ئەوەندەم مەبەســـت نەبـــوو ئەوانە بزانم. لە ڕووشم هەڵنەدەهات لێی بپرسم، بۆ خۆشی هیچ باسی خۆی بۆ نەکردووم. ئەوەندە دەزانم دەیانگوت خەڵکی شـــاری ســـولێمانییە و لە کوردســـتانی عێراقەوە لەگەڵ شێخەلیسلامی گەورەدا کە لە پێش بابمدا شێخەلیســـلامی موکریان بووە و هەر لە بنەماڵەی مەلا جامی بووە، هاتۆتە موکریان. پاش مردنی شێخەلیســـلام ژنەکەی ئەوی مارە کردبۆوە و کچێکی لێ هەبوو کە بەجوانەمەرگی مرد. ژنێکی دیکەشـــی هێنا و کچێکی تریشـــی لەوی بوو. وا بزانم ماوە و مێردی کردووە. بۆ خۆی لە ســـاڵی ١٣٢٢ ـ١٩٤٣ دا لە گوندی حاجی کەند

مرد و له خانەقای شـێخی بورهان نێژراوه. کتێب و نووسـینەکانی وەگیر زاواکەی کەوتن که هیوادارم نەفەوتابن. وەک بیسـتوومه پاش مردنی ١٤٠ تمەن دراو و دوو ماینی میرات لێ بەجێماوه.

فـەوزی زانایەکـی گەوره، ئەدیبێکی کەم وێنه، کوردێکی پـاک و بێباک بوو. بەڵام شاعیرێکی باش نەبوو. بیرێکی تیژ و وردی هەبوو، ئەمما تەبعەکەی ئەوەنده ڕەوان نەبوو بتوانێ بیخاته ناو چوارچێوەی شێعری عەرووزییەوه. ئەو دەمیش شێعری سپی نەببووه باو. جاروبار شـێعری خۆی بۆ دەخوێندمەوه. بەڵام هیچ بەدڵم نەبوون. جارێکی قەسیدەیەکی درێژی فارسـی بۆ خوێندمەوه و نەشیگوت پێت چۆن بوو؟ گوتم باش نەبوو. وا دیار بوو خۆشـی زۆری خۆش نەدەویست پێکەنی و گوتی: هی خۆمه. بەڵام بۆ کەس وەک تۆ بیر و بڕوای خۆی دەرنابڕێ و بۆ هەرکەسـم خوێندۆتەوه گوتوویانه زۆر باشـه؟ گوتم قوربان لەسایەی تۆوه من وام لێ هاتووه شێعری باش و خراپ لێک بکەمەوه. ئەوجار قاقا پێکەنی و گوتی دیاره نەک هەر باش نین، بەڵکه خراپیشن و کاغەزەکەی ورد ورد کرد.

درۆ نەبێ له خۆیم نەبیستووه، بەڵام بیستوومه زۆر دۆستی عاریف سایب بووه. ئەوەشم بیستووه چەند جار مەحموود جەودەت هاتۆته موکریان و له ماڵی ئەودا خۆی شاردۆتەوه و لەگەڵ خەڵک تەماسـی سیاسـی گرتووه، تەنانەت بیسـتوومه کۆمەڵەی ژینەوەشیان دروست کردووه. بەڵام هەر گوتەیه و زۆر جێگای متمانه نییه. مامۆستا غەزەلێکی حافزی تەخمیس کردبووو که لەناو شێعرەکانیدا پەسندم کردبوو. ئەوەش بەندێک لەو تەخمیسەیه که بەبڕوای من وەستایانەیه.

گهـی شـوی ز امیـران پادشـه محسـوب
گهـی وزیـر و بـدرگاه پادشـه محبـوب
گهـی شـوی بسـر دار ناگهـان مصلـوب
«بچشـم عقـل درایـن رهگـذار پـر آشـوب»
«جهـان و کار جهـان بـی ثبات و بی مِحل اسـت»

بێجگه له فەوزی من له کولیجه مامۆسـتایەکی دیکەشم هەبوو که زۆری لێ فێربووم. سـەید عەبدوڵای سـەید مینه پیاوێکی یەکجار درێو و ناشـیرین و زۆر ناقۆڵا و نالەبار و زۆر شـپڕێو و ئاڵۆز بـوو. نەخوێندەوار بوو، بەڵام زۆر زانا و تێگەیشـتوو بوو. ڕەنگه

بڵێین نەخوێندەوار و زانا وەک کوڵە و شـاخدارە و چۆن شـتی وا دەبێ؟ بەڵێ ئەو پیاوە نەیخوێندبوو، تەنانەت حەرفێکیشی نەدەناسی. بەڵام لە ئەدەبی فارسی و کوردیدا دەستێکی باڵای هەبوو. هەرچی جارێکی گوێ لێ بووبا دەهاتە بەری و قەتی لەبیر نەدەچۆوە. بەشی زۆری شانامەی فیردەوسی، خەمسەی نیزامی، مەسنەوی، غەزەلیاتی سەعدی و بەتایبەتی سەرتاسـەری دیوانی حافزی لەبەر بوو. خۆ باسی شێعری شاعیرەکانی کورد هەر ناکەم. کام شـێعری هەرە گرانت لێ پرسیباوە وردترین مەعنای لێ دەداوە. لەبیرمە جارێک کۆنە مەلایێک ئەو شێعرە فارسییەی لێ پرسیمەوە.

آنچه بر من میرود گر بر شتر رفتی ز غم
میزندی کافران در جنت الماوا قدم

من ئێستاش و ئەو دەمیش ئەو جۆرە شێعرانەم پێ خۆش نەبوون و نین، نەمزانی و مەلا گاڵتەی پێکردم. لە خاڵ عەوڵام پرسییەوە گوتی هەی لەمنت نەکەوێ، ئەوە ئیشارە بەو ئایەتەیە کافر هەنگین دەچنە بەهەشت کە وشتر لە کونی دەرزییەوە بچێ. یانی ئەوەی لە شـاعیر قەوماوە ئەگەر لە وشـتر قەومابا وا باریک دەبوو لە کونی دەرزییەوە دەچوو و کافریش بە بەهەشت وەردەبوون.

بۆخۆشی شێعری دەگوت و بەخوێندەوارێک دەینووسینەوە. شێعرەکانی وەک شێعری شاعیرەکانی پێشوومان پڕ بوون لە وردەکاری شاعیرانە و وشەی بێگانە. بەڵام لە گۆرانی گوتندا بەندی وای دەگوتن سەربەسـەر گەوهەریان دێنا. وشەی ساکاری کوردی و قافیەی جوان و مانای وردیان هەبوو. ئەو دوو شێعرەی ئەوم لەبیر ماون.

جەفا و وەفا، ڕاستی و درۆ
بوونە کردەوەی ئەمن و ئەتۆ
جەفا پیشەی تۆ وەفا پیشەی من
ئەمن ڕەپ و ڕاست ئەتۆ درۆزن

ســەڵت و ڕەبەن بوو، لە دیوەخانی خاڵم دەژیا. بەتەواوی مەعنای کەلیمە هونەرمەند بوو. گوێی نەدەدا ســەر و بەرگ و دەموچاوی، زۆر بەرزەفڕبوو، چاوی لە بەرات و خەڵات و شــاباش و دیاری نەبوو. دەنگی خۆش بــوو، بۆ خۆی و بۆ دڵی خۆی گۆرانی دەگوت. بۆخۆی وانی لێ نەبا، شــاش لەبەری پاڕاباوە متەقی لێ نەدەهات. چاک لەگەڵ من ڕێک کەوتبــوو. شــەوانە پێکەوە لە دیوەخــان دەماینەوە. من کتێبم بــۆ دەخوێندەوە و ئەو بەیتی بۆ دەگوتم. من لەو بەیتانەوە فێری وشــەی ڕەسەنی کوردی بووم. ئەگەر مامۆستا فەوزی شاعیرە بەرزەکانی کوردی پێناساندم و ئەدەبی فارسی فێرکردم، سەعید عەوڵاش فۆلکلۆری ئەدەبی کۆنی نەتەوەکەمی پێناســاندم و فێری وشــەی ڕەسەنی کوردی کردم. هاونشــینیی ســەعید عەوڵا تەئســیرێکی قووڵی لە ژیانی ئەدەبی مندا هەبوو و ئێستاش هەیەتی. ئەو پیاوە نەخوێندەوارە یەکێکە لە مامۆستا هەرە گەورە و بەنرخەکانی من.

با ئەوەش بڵێم من لە کولیجە بۆ یەکەم جار ئاشــق بووم، عیشــقێکی پڕ سۆز و کوڵ و ئەفلاتوونی، عیشقێکی پاک و خاوێن و ئاسمانی، عیشقێکی ساکار و منداڵانە و دوور لە هەوەس و هەوا. بەڵام ئەو عیشقە زۆری دەوام نەکرد. ئەو گڕوکفە زوو دامرکا و خۆڵەمێشی فەرامۆشــی داپۆشی. گراویەکەم گاڵتەی بەهەستی پاکی من کرد. ئەو لە من بەئەزموونتر بوو، ئەو هەوەســباز بوو نە عاشــق. بەڵام هەرچی بوو ئەو گڕوکفەش تەئســیری لەسەر قریحەی شاعیرانەی من بوو.

ساڵی ١٣١٧ کە لاوێکی ١٧ ساڵە بووم. مامۆستاکەم لە کولیجە ڕۆیشت و منیش دەستم لە خوێندن هەڵگرت و چوومەوە ماڵێ و دەستم کرد بە کاروکاسبی. ئێستا ماڵمان لە گوندی شــیلان ئاوێ بوو، بابم ســامانەکەی جارانی نەمابوو. بەڵام هیمەتەکەی هەر مابوو. برا و ئامۆزاکانی لێ جوێ ببوونەوە و هەر گوندێکی بۆ مابۆوە. چاک خەریکی کاسبی بووم و زوو فێری کاری کشتوکاڵ کرام. بەڕۆژ کارم دەکرد و بەشەو موتاڵا. هەرچەند کتێب و ڕۆژنامەم کڕیبا بابم دەســتی نەدەهێنام. زۆر شــەوی وابوو تا بەری بەیان نەدەنووســتم و تەماشام دەکــرد. بڕوام پێ بکەن ژوانی لەگەڵ کیژانم لەبەر خوێندنەوەی کتێب لەبیر چۆتەوە و لێم تۆراون و گلەییان لێ کردووم. ئەو ڕۆژەی پیاومان لە شــار دەهاتەوە و کتێب و ڕۆژنامەی بۆ دێنام نیوێکی ڕێگای بەپیرەوە دەچووم.

چاپەمەنی ئەو ســەردەمی ئێران پێشــکەوتوو نەبوو. چەند گــۆواری وێنەدار و جوان دەردەچــوون، کە لەلایان ســەفارەتی ئاڵمانــی نازییەوە یارمەتــی دەدران و بەقازانجی نازیسمیان دەنووسی. کتێبی سیاسی ئەودەمی هەموو لەبارەی هیتلەر و مۆسۆلینیدا بوون. ڕۆژنامەکانیــش تەبلیغاتیان بۆ ئاڵمان دەکــرد و بە بەژن و باڵای پەهلەوییان هەڵدەکوت.

تەنیـــا ڕۆژنامەیەک کە ئەودەمی شـــیرین بـــوو و تا ژیاش هەر شـــیرینتر بوو و نەحلەت لەو کەســـەی مراندی تەوفیق بوو. ئـــەو ڕۆژنامەیە ڕۆژانی پێنجشـــەممو دەردەچوو و لە هەموو ژمارەکەیدا دەینوســـی: «شەوی جومعە دوو شتت لەبیر نەچێ. دووهەم ڕۆژنامەی تەوفیق» . من ڕەبەن بووم، دەنا ئەوی تریشم لەبیر دەچوو. بەڵام شەوی جومعە تەوفیقم نەدەچۆوە. ئەو چیرۆکانەی تەرجەمەی دەکران زیاتر پۆلیســـی بوون. چیرۆکنووســـی زۆر چاک هێشـــتا لە ئێران پەیدا نەببوو. بەڵام من بۆژۆم نەدەکرد و هەموو شتم دەخوێندەوە. هاتوچۆی مەهابادیشم دەکرد و دۆست و ئاشنای چاکم پەیدا کردبوون. جارێ ئەوە ئەرکێک بوو بابم پێی ئەســـپاردبووم هەرچەند جارێ چووبامە شـــار دەبوو بچمە مەحکەمەی قازی موحەمەد و دیوەخانی میرزا ڕەحمەتی شـــافیعی و ســـڵاوی بابمیان پێ بگەیەنم. ئەو دوو جێگایە قەوغاترین دیوەخانی مەهاباد بوون و خەڵکیان زۆر لێ دەبوو و وردە وردە چاو و گوێم دەکراوە و گەورەپیاوەکانی وڵاتم دەناســـین و ئەوانیش لەبەر خاتری بابم حورمەتیان دەگرتـــم. بێجگـــە لەو دوو جێگایە کە ئەگەر لەبەر قســـەی بابم نەبـــا هێندە نەدەچووم، جێگایەکی تریش هەبوو کە ناکرێ ناوی بێنم. ئەو جێگایە مەکۆی ئەو لاوانە بوو کە هەوای نیشتیمانپەروەرییان کەوتبووە ســـەر. زەبیحی و ڕەسولی میکاییلی قزڵجی و نانەوازادە و ئیلاهی و ســـەیدی و زۆر کەســـی ترم لەوێ ناسین. هەژاریش هەرچەند جاری هاتبا شاری بەماڵـــی ئێمەدا دەهات. ئەو ڕفیقانە کۆڕی ئەدەبی بچووکی کوردیان پێک دێنا و بەنهێنی شـــێعری کوردییان دەخوێندەوە. دەیان ناردە کوردســـتانی عێراق و هەرچی کتێبی لەوێ چاپکرابـــان بۆیان دەهات و دەیاندا بەمنیش. قەت نەمپرســـی کـــێ بۆتان دەنێرێ و کێ دەیانهێنێ؟ من کاڵەک خۆر بووم نە بیستان ڕن. چەند شاعیریش هەبوون شێعری خۆیان بەنهێنی بڵاو دەکردەوە. بەتایبەتی سەیفی قازی و... ئاگریان دەکردەوە.

ســـاڵی ١٣٢٠ (١٩٤١) من لاوێکی پێگەیشتوو بووم. لە کاروباری کشتوکاڵ و ئاژەڵداری کارامە ببووم و لە ئەدەبیاتی فارسی و کوردیشدا شارەزایی تەواوم پەیدا کردبوو. بۆخۆشم شێعرم دادەنا. دیوانێکی گەورەم دروست کردبوو. بابم ئەگەرچی بۆخۆی ئەهلی زەوق بوو و شـــێعری زۆر پێ خۆش بوو، زۆری پێ ناخۆش بوو من ببمە شـــاعیر. لەکن ئەو ببڕای ببڕای باســـی شـــاعیری خۆم نەدەکرد. دەفتەری شـــێعرەکانم وەک بێچووە پشیلە لە بابم دەشاردەوە.

ڕۆژێک خەریکی شێعر نووسینەوە بووم. کارێکم هاتە پێش وەدەرکەوتم و دەفتەرەکەم لەگۆڕێ بەجی هێشت. ترسی وەم نەبوو بابم لەو وەختەدا بێتە دیوەخان. زۆرم پێ نەچوو کە هاتمەوە دەفتەرە ســـوور دیار نەبوو. پرسیارم کرد گوتیان بابت دەستی دایە و بردی،

لە پشتێن بەرەژێرم مرد. پێم وا نەبوو بەهاسانی نەجاتم دەبێ. زانیم خراپم لێ قەوماوە. شـێعرەکانم پوختە نەبوون، لاسـای شـاعیرە کۆنەکانم کردبۆوە. هەموو جۆرە شێعرێکم دانابوو. تەنانەت لە فرهاوێشـتندا لاسای شـێخ ڕەزا و ئیرەج میرزای فارسیشم کردبۆوە. بۆیە هەقم بوو بترسم. گاڵتە نەبوو، من هەم شاعیر بووم و هەم ئیعترافم بەگوناه کردبوو، با بە خەیاڵیش بێ. منیش وەک شـێخ ڕەزا بوختانم بەخۆم کردبوو و بابم شـتی وای پێ قبووڵ نەدەکرا، بەڵام وا دیار بوو نەیخوێندبوونەوە. چوومەوە ژووری و گوتم ئەگەر کارەکە گەند بوو دایکم دەکەمە تکاکار. پرسـیم گوتم کوا بابم؟ گوتیان بەتووڕەیی چووە متبەخ. خۆم وەپەنا دا، بەبۆڵەبۆڵ هاتەدەر و لەبەر خۆیەوە دەیگوت: خوێڕی کارم بۆ فێر بووە. شاعیری شـاعیری! دەیەوێ لەبرسان بمرێ. خۆم بەمتبەخدا کرد، تەماشام کرد دەفتەرە سوور لەسەر کڵی تەندوور بۆتە قەقنەس.

ئەو دەمی زۆرم پەرۆش بوو. بەڵام پاشـان گوتم دەسـتی خۆش بێ. چونکە بێگومان ئێستا مابان بۆخۆم دەمسووتاندن. ڕاستە هەموو مەوزوون بوون و قافیەیان هەبوو. بەڵام لاساکردنەوەی تەواوبوون و هەستی شاعیرانەی خۆمیان کەم تێدابوو. پاشانیش زۆری وام فڕێ داون.

بێجگە لە کاروکاسبی ڕۆژانە و موتاڵا و خوێندنەوەی شەوانە لە دێ سەرگەرمی دیکەشم بوون، سواری و تەقڵە و ڕمبازی و ڕاوە کەو و ڕاوە تاژی و ڕاوە تفەنگ.

بابم ئەسـپی زۆر ڕەسەن و باشـی هەبوون کە زۆری خۆش دەویستن و باشی ئاگا لێ بوون. من و کاکم هەمیشـە ئەسـپ و ماینی تایبەتی خۆمان هەبـوون. هیچمان هەقمان نەبوو سـواری ئەسپی ئەویتر بین، دیارە کاکم سەرپشک بوو و ئەسپی باشتری بۆ خۆی هەڵدەبژارد. بەڵام لە دواییدا هەمیشە ئەسپی من باشتر دەردەچوون. چونکە لەوی هێدیتر بـووم و کەمترم ماندوو دەکردن و لەوی بەمشـوورتر بـووم و چاکترم ئاگا لێ دەبوون و باشـترم بەخێو دەکردن. زۆرجاریش گرنەی تێ دەهاڵاندم و ئەسپەکەی لێ دەستاندمەوە و یەکی دیکەی دەدامێ. بەڵام بابم بۆی تێهەڵدەهێنامەوە و ئەسـپ و ماینەکانیتری دەدا بە من سواریان بم و تەعلیمیان بدەم. سوارێکی باش بووم و لاغم چاک دەعاملاندن. بەڵام قەت ڕاوکەری چاک نەبووم. نە تەماڵ و دیاردیم باش دەدیتەوە، نە شـوێنم چاک دەگێڕا، نـە داوم بەپەلە بۆ دەچەقا، نە تفەنگم باش دەنگاوت. دیارە بەتاپڕ کەم وابوو لە هەردی ببوێرم. بەڵام نەمدەگەیاندە ئەو تفەنگچیانەی لە هەوا دەیاندەبوارد.

ڕۆژانـی جێژن و بووکهێنان و خەنەبەندان و کچ بەمێرددان داوەت و ڕەشـبەڵەکمان

دەگرت. هەموو جارێ پیاوێکی ماقووڵ و ڕدێن سـپیمان دەنارد کن بابم و ئیجازەمان لێ وەردەگرت. هەموو جـارێ موخالەفەتی دەکرد. بەڵام هێندی لەبـەر دەپاڕاینەوە دەهاتە ڕەدایە و بەو شـەرتەی لە نەدیوی دیوەخانی ئێمە داوەت بگیرێ ئیزنی دەدایـن. بەڕاستی خـۆش بوو، کـچ و کوڕ و ژن و پیـاوی گوندەکەمان هەڵدەپەڕین. من ئەو ڕەسـمەم لە ڕەشبەڵەکی لادێدا زۆر پێ جوان بوو کە پیاو مەگەر ژن بۆخۆی بانگی کردبا، دەنا هەقی نەبوو بچێتە دەستی دۆیان. پیاو دەبوو هەمیشە لەپێشەوەڕا بچێتە نێو گەڕی داوەت، دەنا عەیب بوو. بەڵام دۆ دەبوو لە پاشـەوەڕا بێتە نـاو داوەت و هەڵبژاردن بەخۆی بوو. ئەو ڕەسمە دەگەڕێتەوە سەر ئەو زەمانەی کە ژن لە کوردەواریدا ئازادی پتر بووە.

بۆ شەوداوەت ئیجازەمان لە کەس وەرنەدەگرت. شەوی مانگە شەوی هاوین لە حەوشەی مەڕی کچ و کوڕی ئاوەدانی تێکەڵ دەبوون و داوەتیان دەگرت و هەمیشە لەدووی منیشیان دەنارد. زسـتانان لە ئاخەل و هۆڵاندا شـەوداوەتمان دەگرتن. جارجارە سۆفی شەیتان و شـۆفار خەبەری ئەو شـەوداوەتانەیان بە بابم ڕادەگەیاند. ئەویش لەپێشدا جنێوی بە من و دوایە بەچەند کوڕەجحێڵەی دێ دەدا و کەمێکی هەڕەشـە لێ دەکردین و دەبڕاوە. بەڵام بەقسـەی شەیتان و شـۆفار دەستمان لە شـەوداوەت هەڵنەدەگرت و جنێوی گەورانیش بەقەولی کوڕەجحێڵەکان خەڵات بوو.

زسـتانان بەشەو جۆرابێن و کاڵەمسـتێن و فەلەی بێدەنگ و کۆسەبازی و تەڕکی بن بەڕەیان لە مزگەوت دەکرد و بە ڕۆژ جگێن و ماتێن و مێشێن و هێلکەشکێن و شێروخەتیان دەکرد. من تا کتێبم وەگیر کەوتبایە لە دیوەخانی خۆمان وەدەر نەدەکەوتم و نەدەچوومە سەیری ئەوانە. بەڵام سەرە بەهاران هەموو ڕۆژێ دەچوومە تۆپێن.

لە مانگی خەرمانانی ١٣٢٠ـ١٩٤١ ڕۆژێکی سـەر خەرمانـان. کرێکارەکانمان خەریکی مالووسک زرینگاندنەوە و باڵەکەو بوون و منیش لەکنیان دانیشتبووم و ئەسپەکەم وەسەر کوێزر کردبوو. ئەودەمی فرۆکە و ماشـێن زۆر کەم بوون و خەڵک پێی سەیر بوون. لە پڕ دوو فرۆکەی ڕەشی زەلام پەیدا بوون. ئێمە تا وێستا فرۆکەی ئەوەندە زلمان بە ئاسمانەوە نەدیبو. هەموو دەستیان لە کار هەڵگرت و تەماشای فرۆکەکانیان دەکرد. دیمان فرۆکەکان نیزیـک بوونەوە و نەوی بوون و کاغەزیان بەردانـەوە، هەموویان ڕایان کرد بزانن چییە؟ ژنێـک لەپێش هەمواندا گەڕاوە و کاغەزێکی دامێ و گوتی ها بەقوربانت دەبم بیخوێنەوە بزانە چییە و چێ تێدا نووسراوە؟

بڕوا بکەن وەختابوو لە خۆشـیان باڵ بگرم. ئەو کاغەزە بەیاننامێک بوو کە بە زمانی




کوردی نووسـراو بوو. چۆن ئەوە خەونە، یا ڕاستییە؟ لە دەوڵەتێکی گەورەی وەک یەکێتی سۆڤیێتی بەزمانی کوردی بەیاننامە بڵاو بکاتەوە؟ بۆ من هەروا کەم نەبوو.

بۆ من کە شێت و شەیدای زمانی کوردی بووم ئەو پەڕە کاغەزە بەس بوو کە لە خۆشیان شاگەشـکەم بکا. ئەو دەمی وا وردم لێک نەدابۆوە، بەڵام لە واقیعدا لە باری سیاسـییەوە ئەو کارەی دەوڵەتی شـوورەوی ئەوپەڕی ئازادیخوازی تێدا بوو و نیشانەی ئەوەبوو کە ئەو دەوڵەتە ئیعتراف بەبوونی گەلانی جۆربەجۆری ئێران دەکا.

ئەو بەیاننامە بۆنی شـەڕی لێدەهات. دیاربوو لەشـکری سـوور هاتبوو دەئێرانەوە. هەرچەند لە بەیاننامەکەدا دڵخۆشـی خەڵکیان دابۆوە و هەڕەشە و شتی وای تێدا نەبوو، بەڵام ئێمە زۆر لە ڕووسان دەترساین. پیرەکان نەقڵی بەدفەڕی و بێڕەحمی و دەستوەشێنی لەشکری تەزاریان لە شەڕی یەکەمدا بۆ گێڕابووینەوە. لە سەرتاسەری ڕۆژگاری حکوومەتی پەهلەویدا ڕۆژنامەکانی ئێران هەر شـتی خراپیان لە دژی شوورەوی نووسیبوو. باڵشویک لەو سـەردەمەدا لە ئێران گەورەترین جنێو بوو. خۆ بەتایبەتی پاش ئەوەی شەڕ لەنێوان ئاڵمانـی نازی و یەکێتی سـۆڤیێتیدا هەڵگیرسـا، چاپەمەنی ئێران هەموو نووسـینەکانی بەسـوودی ئاڵمان و بەزیانی شـوورەوی بوو. ماوەیەک بوو شارەوانی مەهاباد ڕادیۆیەکی هێنابوو و بەرنامەکانی «بێرلەنی» بەزمانی فارسـی بڵاو دەکردەوە، کە سەرتاپا جنێو بە کۆمۆنیزم و باڵشـوێزم بوو. بەڵام ئەوانە هیچی بۆ من لەو وەختەدا گرنگ نەبوون. گرنگ ئەوە بوو کورد میللەتێکە دەوڵەتان دەیناسن و بەیاننامە بەزمانی ئەو بڵاو دەکەنەوە.

نازانم چۆن خۆم گەیاندە ئەسـپەکەم و سـواربووم و پێم پێوەنا و لەسـەر جڵەوان چوومەوە ماڵ، بەیاننامەکەم بۆ بابم خوێندەوە. بەڵام ئەو بەپێچەوانەی من ڕەنگی بزڕکا، شڵەژا و بەکاوەخۆ گوتی: ڕۆڵە قەوما، وا دیارە ڕووس هاتوونە دەئێرانەوە. شەڕ و کێشە پەیـدا دەبێ، وڵات دەشـێوێ. کوڕی خـۆم تۆ نەتدیون و نایانناسـی. زۆر خراپن، زۆر پیاوکوژ و بێ بەزەیی و دەستڕەشن. من کوشتاری سابڵاخم بەچاوی خۆم دیوە و لە بیرمە چۆن خەڵکی بێ دەرەتان و لێقەوماویان بەشیران شەق شەق دەکرد. دەبێ زوو خۆمان خڕ کەینەوە و خۆ بگەیەنینە قایمە. خودا بمانپەرێزێ. ڕۆژی پیاوانە، بۆ ئەو ڕۆژە بوو دەمگوت فێری سـواری و تفەنگ هاویشـتن بن. بۆی مات بوو و دوو سێ جار لەبەر خۆیەوە گوتی: «هەرزن و بزن چیایە مەزن». بابم هەقی بوو نیگەران بێ چونکە ئەو لەشـکری تەزاری دیبو. ئەو کوشتاری بێ ڕەحمانەی ژەنەراڵە کۆنەپەرستەکانی ڕووسی لە کوردستاندا دیبوو.

ئـەو وەکو زۆربـەی ئێرانییەکان ئاگای لە ئاڵوگۆڕی پاش شۆڕشـی ئۆکتۆبەر لە یەکێتی سۆڤیێتیدا نەبوو. نەیدەزانی لەشکری سوور چۆن عاملاوە؟



بۆ ئێوارێ چەند پیاوی ماقووڵی مەهاباد پەیدا بوون. ئەوانیش دۆست و هاوتەمەنی بابم بوون. شەڕی یەکەمیان وەبیر دەهات. زۆر لە بابم پتر نیگەران بوون. یەکیان گێڕایەوە و گوتی نۆ کەس لە بنەماڵەی ئێمە بەڕۆژێک بەدەستی سالْداتی ڕووس کوژراون.

ئەو قسانە منیشی بڕێک نیگەران کردبوو. بەڵام لە خۆشی بەیاننامەکە هەر شاییم لە دڵدا دەگەڕا. خەریکی خزمەتی میوانەکان بووم. بەڵام هەر دەمە نادەمێک بەیاننامەکەم دەردێنا و دەمخوێندەوە و سەرلەنوێ لە تەنکەی گیرفانم دەناوە.

شەو کاکم و پیاوەکانمان چوون و ژن و منداڵی ئەو میوانانە و خزمەکانیان لە شار هێنادەر.

بەیانی دوو فڕۆکە هاتن و چەند نارنجۆکی بچووکیان بەشار دادا، ئەرتەشی شاهەنشاهی، ئەو ئەرتەشەی لە کوشتنی میللەتی ئێراندا لاسای داگیرکەرانی مەغوول و نازی دەکردەوە، تاوێکی بەربەرەکانی نەکرد و پێش ئەوەی لەشکری سوور بگاتە مەهاباد چەکی فڕێ دا و وەک تۆوی هەرزن بڵاو بوو. هەژار لەو بارەوە هەر ئەودەم چەند جوانی گوت:

«بەبڵاوبوونی دوو پەڕ ئاگاهی»
«بوو بڵاو ئەرتەشی شەهەنشاهی»

تفەنگی برنۆیان دەدا بەنانێک. ئەویش ئەوی ئازایان، دەنا ئەوی ترسەنۆک بەرتیلی دەدا تفەنگەکەی لێ وەرگرن.

بەشی زۆری خەڵکی مەهاباد ڕوویان لە گوندەکەی ئێمە کرد. بابم پێشوازێکی باشی لێ کردن و هەرچی هەمان بوو لە ئیختیاری نان. عەمباری گەنمی کردەوە و ئاشەکانی گوندەکەمانی دا بەخەڵک و هەرکەس هەرچەندی ئارد ویستبا دەیاندایە.

هەموو ڕۆژێ جاڕیان دەکێشا هەر کەس هەرچی پێویستە بێ لەڕوودامان و شەرم کردن داوا بکا. خەڵکی مەهاباد ئەو پیاوەتییەی بابمیان لەبیر نەچوو و تا ما زۆریان ئیحترام گرت.

چوار پێنج ڕۆژ کەس بەسەر کەسەوە نەبوو. لەپێشدا لەشکری ئینگلیس گەیشتە سابڵاخ و دەستێکیان ڕە سەربازخانە خست و چەکی قورسیان برد. دوایە لەشکری سوور هات. بەپێچەوانەی ئەوەی چاوەنۆڕی دەکرا نە کەسیان تاڵان کرد، نە ئازاریان بەکەس

گەیاند. ئەوەندە باش لەگەڵ خەڵک جووڵانەوە کە کەس بەلەشکری داگیرکەری نەدەزانین. نەقڵێکی خۆشـــم وەبیرهاتەوە: لە زەمانی پەهلەویـــدا کابرایەکی دز و چەتە و پیاوکوژ و خـــراپ پەیدا بوو. بەتاقی تەنێ کەڵەگایی لە خەڵک دەکرد. کەتە پێنج تیرێکی کۆنی پێ بوو و لەو ناوەدا دەگەڕا و هەرچی وازی لێ با دەیکرد. پۆلیسی ئێران بۆی نەدەگیرا. بەڵام زانیبای چۆتە هەر ماڵێک خـــاوەن ماڵەکەی دەگرت. کابرایەکی پیریان بەو تاوانە گرتبوو کە شەوێک «سۆغرە» یانی ئەو چەتە پیاوخراپە نانی لە ماڵی خواردبوو، دوو ساڵ بوو لە ورمـــێ گیرابوو. کە هاتەوە پێوەی چووم و گوتم مامە چۆنت نەجات بوو؟ گوتی چووزانم، فریشتێکی سووری چاوشین هات و دەرکی لێ کردمەوە و گوتی بڕۆ.

لەشـــکری تاران لە موکریان نەما. لەپێشدا عەشـــیرەتەکان تا ڕادەیەک ئاڵۆزییان کرد و یەکتریان کوشـــت. بەڵام وردە وردە وڵات ئارام بـــۆوە و وەزعێکی لەبار بۆ جووڵانەوەی سیاسی پێک هات.

ئێمە یانی ئەو پۆلە لاوەی لە زەمانی پەهلەوییەوە یەکترمان گرتبوو و دۆستانە پێکەوە کارمان دەکـــرد. مەیدانمان بۆ ئاوەڵا بۆوە و چالاکی خۆمان پەرە پێدا. دەمانناردە عیراق ڕۆژنامە و گۆواری کوردییان بۆ دەهێناین و دەمانخوێندنەوە. من شـــێعری خۆم و شـــێعری شاعیرەکانی ترم بەخەت بۆ لاوەکان دەنووسینەوە و بڵاوم دەکردنەوە. دڵشادی ڕەسووڵی لە عیراقەوە هاتبۆوە. ئەو ئیملای کوردی لە هی ئێمە باشـــتر بوو و خەتیشی خۆشتر بوو و زۆریشـــی شـــێعری بێکەس و پیرەمێرد و ئەحمەد موختاری جاف و حەمدی لەبەر بوون و بەخەت بڵاوی دەکردنەوە. گۆواری گەلاوێژ ڕۆڵێکی باشـــی یاری کرد و لاوەکانمان فێری کـــوردی خوێندنەوە بوون. هەلومـــەرج بۆ پێکهاتنی حیزبێکی ناسیونالیســـتی کوردی لە مەهاباد پێک هاتبوو.

پـــاش دامەزراندنی حیزبی تودەی ئێـــران چاپەمەنییەکانی ئەو حیزبەش ئاڵوگۆڕێکی فیکرییان لەناو کۆمەڵی کوردەواریدا پێک هێنابوو. تەنانەت چەند کەسی کورد و ئەرمەنی تێکۆشـــان لکی ئەو حیزبە لە موکریان دابمەزرێنن. بەڵام خەڵک پێشـــوازی لێ نەکردن. حیزبێکیش بەناوی حیزبی ئازادی بە بەرنامەیەکی چەپییەوە سەری هەڵدا و نەژیا.

تـــا ڕۆژی ٢٥ ی گەلاوێژی ١٣٢١، ١٦ی ئابی ١٩٤٢ کۆمەڵەی «ژ. ک» دامەزرا. ئەوانی ئەو کۆمەڵەیان دامەزراند دۆستانی پێشووی من بوون. من لەو سەروبەندیدا لە تەورێز بووم و لە ڕۆژی دامەزرانی کۆمەڵەدا حوزوورم نەبوو. کە هاتمەوە بەهۆی زەبیحی کە لەمێژ ساڵ بوو دۆســـت بووین بە کۆمەڵە ناســـێندرام. لە ماڵی یەکێک لە دۆستەکانی خۆم کە پاشان

زانیم ئەندامی ژمارە یەکی کۆمەڵەیە و بەڕاســـتی تێکۆشـــەرێکی بەجەرگ و ئازا و نەبەز و کۆڵنەدەر بوو، بەقورئان و بەئاڵای کوردســـتان و بەشـــەرەفی خۆم و بەشمشێر سوێندیان دام کە بەزمان و بەقەڵەم و بەئیشارە خەیانەت بەنەتەوەی کورد و ئەندامی کۆمەڵە نەکەم. نـــاوی نەهێنی حیزبیم «هێمن» بوو و ژمارەی ئەندامەتیم ٥٥. من هەقم نەبوو هیچ لەوان بپرسم. بەڵام ئەوان ئەوەندەیان موتمانە بە من بوو، پێم بڵێن هەژاریش ئەندامی کۆمەڵەیە و خۆت لەکن ئەو مەشارەوە ئەوەش بەو ڕادەگەیەنین.

بەو جۆرە من لە ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئەدەبیمدا پێم نایە قۆناخێکی نوێ.

ئەندامەتی کۆمەڵەی «ژ. ک» گۆڕانێکی سەیری بەسەر مندا هێنا. شەو و ڕۆژ لە بیری کۆمەڵەدا بووم کە ئەویش ئامانجی ڕزگارکردنی نەتەوەکەم بوو. هەموو ئاوات و ئارەزووی تایبەتی خۆم وەلا نا. ئیتر نەتەنیا دەستم لە شەوداوەت و هەڵپەڕین و ڕێبازگرتن و لەسەر سوانە وەستان هەڵگرت، بەڵکو وەک سۆفی تۆبەکار تووشی هەر کیژ و ژنێکی کورد دەهاتم ســـەرم دادەخســـت و چاوم لێ نەدەکرد. چونکە ئەوەشـــم بەخەیانەت دەزانی. بۆ خاتری کۆمەڵە من دەســـتم لە یارێک هەڵگرت کە بەگەورەتریـــن مەحروومییەتی ژیانمی دەزانم و ڕابردنی زەمانیش لەبیری نەبردوومەوە و ناسۆری لە دڵمدا هەر ماوە.

لەو ســـاڵانەی دواییدا دۆستێکم کە باش لە شـــێعر بەتایبەتی لە سەبکی شاعیری من دەگا، گوتی: تۆ بۆ گوتووتە: ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نیم؟

گوتم کاکە من قەت درۆم لەگەڵ ئیحساسی دەروونی خۆم نەکردووە. ئەگەر تۆ دەتزانی من ئەو شێعرەم لە چ هەلومەرجێکدا گوتووە، بڕوات دەکرد هەستی دەروونی خۆم دەربڕیوە و بەڕاستی لەو کاتەدا من لە خەیاڵی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵدا نەبووم.

«کۆمەڵـــە» بێجگـــە لەوەی کۆمەڵەیەکی سیاســـی بوو کۆمەڵەیەکـــی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقیـــش بوو. زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵە بڕوایان بەو ســـوێندە هەبوو کە خواردبوویان و دەســـتیان لە ئاکاری دزێو هەڵگرتبوو. دزی، خراپە و نێوان ناخۆشـــی لە کزی دابوو و دەتوانم بڵێم لە هێندێک جێگایان هەر نەما.

هێندی پێ نەچوو کۆمەڵە سەرانســـەری کوردســـتانی ئێرانی تەنیەوە و پەلی هاویشت بۆ پارچەکانی تری کوردستان، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراقدا لکی کۆمەڵە زۆر پەرەی گرت و بەهێزبوو.

ئەندامانـــی کۆمەڵە لە هەموو چین و توێژەکانـــی کۆمەڵی کوردەواری پێک هاتبوون و جیاوازی بیروباوەڕی سیاســـی و فەلســـەفییان هەبوو. ئەگەر چاوێک بەتۆرگانی کۆمەڵەدا




بخشێنن ئەو ڕاستییەتان بۆ دەردەکەوێ، کە من لێرەدا مەجالم نییە بۆتان شی بکەمەوە. بەڵام هەموو لەسەر شتێک ڕێک کەوتبوون. ئەویش ڕزگاری کوردستان بوو. ئەندامی کۆمەڵە خاوەنی هەر بیروبڕوایەک با و لە هەر چین و توێژێک بایە بۆ فەرمانی لای سەروو نەک ئامادە بەڵکە بەڕاستی فیدایی بوو.

داهاتی کۆمەڵە تەنیا و تەنیا مانگانەی ئەندامان و فرۆشی چاپەمەنییەکان و داهاتی تیئاتر و نومایشەکانی بوو. کەچی زۆر بەباشی بەڕێوە دەچوو. هۆی ئەوە بوو هەموو کەس بەوپەڕی دڵخۆشییەوە مانگانەی دەدا و چاپەمەنی کۆمەڵەی بەچەند هێندی نرخی دیاریکراو دەکڕی. من خۆم دیومە ژمارەی «نیشتمان»یان بە ٢٠٠ ئەوەندەی نرخەکەی کڕیوە، نیشتمان قەت دانەیەکی نەدەماوە. کۆمەڵە لەپێشدا کتێبێکی بچووکی شێعری بڵاو کردەوە بەناوی دیاری کۆمەڵەی «ژ. ک» کە شێعرە نیشتمانییەکانی حاجی قادر و مەلای گەورەی کۆیە و هەژار و شێخ ئەحمەدی حیسامی تێدا چاپکرابوون و دەسبەجێ تەواوبوو. دوایە گۆواری نیشتمانی وەک ئۆرگانی کۆمەڵە چاپ کرد.

یەکەم شێعری من لە ژمارەی دووی نیشتماندا بەناوی م. ش هێمن بڵاو کرایەوە و ئیتر بوومە ئەندامی دەستەی نووسەرانی ئەو گۆوارە و لە هەموو ژمارەکانیدا شێعر و وتارم بڵاو کردەوە.

زەبیحی سەرنووسەری نیشتمان بوو و بەڕاستی لە چاپکردنی ئەو گۆوارەدا زەحمەتی کێشا و وریایی نیشاندا. جگە لە زەبیحی و چەند کەسی باوەڕپێکراوی تر کەس دەستەی نووسەرانی نیشتمانی نەدەناسی و نەیدەزانی ئەو گۆوراە لە کوێ چاپ دەکرێ.

ئەندامی کۆمەڵە وەک ئەندامی حیزبێکی نەهێنی و بەدیسپلینی توند هەر ئەوەندەی دەزانی کە پێویست بوو بیزانێ.

لەبیرمە نیشتمانم بۆ بابم دەخوێندەوە. بەتایبەتی شێعرەکانی خۆم و دەیگوت کوڕە ئەو هێمنە کێیە؟ لەدڵی خۆمدا پێدەکەنیم، بەڵام نەدەکرا بڵێم ئەو کەسەیە کە تۆ دەفتەری شێعرەکانت لێ لە تەندووری بەکەمران هاویشت. کۆمەڵە گۆواری ئاواتیشی چاپ کرد و من لەویشدا نووسیم.

تیئاتری «دایکی نیشتمان» گەورەترین تەبلیغاتی بۆ کۆمەڵە کرد. ئەو تیئاترە کە زۆریش ساکار بوو و دەتوانم بڵێم لەباری هونەری و تەنانەت فیکرەوە ناتەواویش بوو. سێ چوار مانگ لە مەهاباد و شارەکانی تری موکریان لەسەر شانۆ مایەوە. کەم کەس هەبوو نەچووبێ و هەر کەسیش چووبا دەگریا و هەستی کوردایەتی دەبزووت. لە دێهاتی زۆر

دووره‌ده‌سته‌وه خه‌ڵک بۆ دیتنی ئه‌و نومایشه ده‌هاتن. بێجگه له ته‌بلیغاتی سیاسی له‌باری ماددیشه‌وه داهاتێکی زۆری هه‌بوو و کۆمه‌ڵه‌ی ده‌وڵه‌مه‌ند کرد.

کۆمه‌ڵــه هه‌ر بــه‌و داهاتانه توانی چاپخانه‌یه‌کی ده‌ســتی بکڕێ و لــه مه‌هاباد دای بمه‌زرێنێ.

تا زیاتر له کۆمه‌ڵه‌دا کارم ده‌کرد پله‌ی زانیاریشــم پتر ده‌چووه ســه‌ر و له پیاوی زانا و ئه‌دیبی وه‌ک پێشــه‌وا قازی موحه‌مه‌د و کاکه ڕه‌حمانــی موهته‌دی نیزیکتر ده‌بوومه‌وه و شــتیان لێ فێر ده‌بووم. هیــچ کام ئه‌و پیاوه گه‌ورانه‌ی کورد کــه له پارچه‌کانی تری کوردســتانه‌وه ده‌هاتن له من شاراوه نه‌بوون. هه‌مزه عه‌بدوڵڵا، مسته‌فا خۆشناوی شه‌هید و میرحاج و قودسی شه‌هید و زۆری ترم له‌و تێکۆشه‌رانه دیتن و ئاڵوگۆڕی فیکریم له‌گه‌ڵ کردن. چاپه‌مه‌نییه‌کانی ئێران پێشــکه‌وتووانه‌تر بوون و شتی تازه‌یان تێدا بوو. به‌تایبه‌تی چاپه‌مه‌نییه‌کانی حیزبی توده‌ی ئێران له ڕوونکردنه‌وه‌ی بیروڕای سیاسی مندا کاریان کرد. ڕه‌وابیتی فه‌رهه‌نگی ئێران و شــووره‌وی لقی له مه‌هابادیش دامه‌زرا. منیش یه‌کێک له‌وانه بووم که له‌وێدا کارم ده‌کرد. هه‌رچه‌ند به‌داخه‌وه ئه‌و بنکه پێشــنیاره‌کانی منی جێبه‌جێ نه‌کرد و هیچی به کوردی بڵاو نه‌کرده‌وه، به‌ڵام زۆر شتی به نرخی به‌فارسی بڵاو ده‌کرده‌وه و که‌ڵکم لێ وه‌رده‌گرتن. شــێعر و نووسراوی کوردی به‌ئازه‌ری و ڕووسی ته‌رجه‌مه ده‌کران و ئه‌وه‌ش ده‌ســکه‌وتێکی باش بوو بۆ ئێمه. یه‌کێک له‌و شــتانه‌ی ته‌رجه‌مه کران و منیش له ته‌رجه‌مه‌کردنیدا به‌شــداربووم ئاڵه‌کۆکی هه‌ژار بوو، که له‌لایان ئینســانێکی واقیعی و شاعیرێکی باشی ئازه‌ربایجانی شووره‌وی مامۆستا جه‌عفه‌ر خه‌ندانه‌وه به ئازه‌ری و به‌شێعر ته‌رجه‌مه‌کرا.

شــه‌ڕی ماڵ وێرانکه‌ری دووه‌م به‌تێکشــکانی فاشــیزم و نازیسم و شرت و گوم بوونی هیتله‌ر و کوژرانی مۆســۆلینی و گیران و له‌ناوچوونی شــه‌ڕ هه‌ڵایسێنه‌کان ته‌واوبوو. هیوا و هومێدی گه‌لانی ژێرده‌ســت و زۆرلێکراو گه‌شه‌ی په‌یدا کرد. له‌شکری هاوپه‌یمانه‌کان له ئێران چوونه‌ده‌ر. له حاڵێکدا که جووڵانه‌وه‌ی ڕزگاریخوازی گه‌لانی ئێران ڕۆژ به‌ڕۆژ په‌ره‌ی ده‌گرت. گه‌لی کورد یه‌کێک بوو له‌و گه‌لانه‌ی که هیوای به‌دواڕۆژی گه‌شــه‌داری خۆی ده‌م به‌ده‌م په‌ره‌گرتر ده‌بوو.

ده‌ســته‌یه‌ک له ڕووناکبیران و ئه‌ندامانی کۆمه‌ڵه‌ی «ژ.ک» هاتنه سه‌ر ئه‌و بڕوایه که جێبه‌جێکردنی به‌رنامه‌ی کۆمه‌ڵه له هه‌لومه‌رجی ئێســتای جیهان و کوردستاندا ئیمکانی که‌مه. بۆیه به‌رنامه‌یه‌کی کورت و نوێیان که له‌گه‌ڵ هه‌لومه‌رجی ئه‌و ســه‌رده‌میدا ده‌گونجا

گەلاڵە کرد و لە ڕۆژی ٣ی خەزەڵوەری (١٣٢٤) ١٩٤٥ یەکەم کۆنگرەی حیزبی دیموکراتی کوردستان لە شاری مەهاباد گیرا و ئەو بەرنامە پەسندکرا و ڕێکخراوی حیزبی دیموکراتی کوردستان هەر لەسەر بناخەی ڕێکخراوی کۆمەڵەی «ژ. ک» دامەزرا و تەنیا لە کادری ڕابەریدا ئاڵوگۆڕێک پێکهات و پێشەوا قازی مەحەمەد کە ئەندامێکی سادەی کۆمەڵە بوو و ناوی نەهێنی «بینایی» بوو بەپێشەوای حیزب هەڵبژێردرا و سەرۆکی کۆمەڵە کە پیاوێکی زۆر تێکۆشەر و ئازا و پاک بوو لە کادری ڕابەریدا نەما. ئەم ئاڵوگۆڕە هیچ کاری نەکردە سەر ئەو پیاوە و لە ڕیزەکانی خوارەوەی حیزبدا درێژەی بەخەبات و کاری خۆی هەر دا و ڕەنجێکی زۆری کێشا.

لەکۆبوونەوەکانی کۆنگرەدا من بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا لە بەرامبەر خەڵکدا شێعرم خوێندەوە. کاتێک بەڕێوبەری کۆبوونەوە گوتی: ئێستاش «ئاغای هێمن» شێعرتان بۆ دەخوێنێتەوە و من بۆ شێعر خوێندنەوە بەشەرمەوە چوومە سەر مینبەری مزگەوتی سووری مەهاباد، هەمووکەس تەنانەت پێشەواش واقی وڕما و لە خۆیان دەپرسی: چۆن هێمن شاعیر و نووسەری نیشتمان (سەید موحەمەد ئەمینی شێخەلیسلامی) بوو و ئێمە نەمان دەناسی؟ بابیشم کە ئەوەی بیستەوە لە گفتی خۆی پەشیمان بۆوە و گوتی هێمن شاعیرێکی باش نییە.

حیزبی دیموکراتی کوردستان کۆڕێکی بەناوی «هەیئەتی ڕەئیسەی میللی» هەڵبژارد کە منیش یەکێک بووم لە ئەندامەکانی. لە هەڵبژاردنی ناوخۆدا حاجی بابەشێخ کە پیرترین ئەندام بوو، بەسەرۆک و من کە لاوترین ئەندام بووم بەسکرتێر هەڵبژێردراین. چەند مانگ لەو کۆڕەدا کارم کرد. کارێکی گران بوو. هەر من بەتەنێ بەکارەکان ڕادەگەیشتم و حاجی بابەشێخی ڕەحمەتی هەر ئەوەندەی لەسەر بوو ئەوی من دەینووسم ئیمزای بکا. هەرچەند لەبارەی دەستەڵات و ناوبانگەوە کارێکی گرینگ بوو، بەڵام لەگەڵ زەوقی من ڕێک نەدەکەوت. بەتایبەتی بەڕێ چوون لەگەڵ حاجی بابەشێخی خۆبەزۆرگر و کەللەڕەق کارێکی هاسان نەبوو.

لێرەدا کە باسی حاجی بابەشێخ هاتە گۆڕێ دەمەوێ شتێکی مێژوویی ڕوون بکەمەوە. لە نووسراوی چەند پیاوی بێ خەبەردا دیومە و لە خەڵکێ ساکاریشم بیستووە تاوانی خەیانەت وەباڵ حاجی بابەشێخ دەدەن. من حاجی بابەشێخم خۆش نەدەویست. چونکە لەگەڵ ئەوەشدا دەیانگوت لە علوومی دینیدا زۆر شارەزایە و ڕیازیاتی کۆن زۆر دەزانێ، پیاوێکی زۆر کۆنەپەرست و کەللەڕەق و خۆپەرست و ناشارەزا بوو. بەڵام زۆر ڕاست و پاک و ئازا و بەبیروباوەڕ بوو. بەهیچ بارێک تاوانی خەیانەتی پێوە نانووسێ. لەکاتی وتووێژ




لەگــەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی مەرکەزیدا دوور نییە فریوی خواردبێ و بەهەڵە چووبێ. بەڵام لە ڕێگای ڕاست لای نەداوە.

بڵاوە پێدانی گەمارۆی دەوری سەقز و سەردەشت و خوڕ خوڕە کە تاوانەکەی دەخەنە سەر حاجی بابەشێخ پێوەندی بەمەسەلەیەکی قووڵ و نەهێنی سیاسییەوە هەیە کە لێرەدا جێگای باس کردن نییە و با جارێ دەرخۆنەی لەسەر دابنێین و زۆر لە دەستەڵاتی حاجی بابەشــێخ بەرەژوورتر بوو. حاجی بابەشــێخ ئەوەندەی دەســتەڵات نەبوو فەرماندەیەکی دەوروبەری ئەم شــارانە بەقسەی بکەن و بکشێنەوە. خۆ ئەو هیچ مەسئولییەتی لەشکری نەبوو، لەشکری کوردستانیش وەک لەشکرێکی ڕەسمی بەقسەی فەرماندەکانی خۆی دەکرد نە بەقسەی سەرەک وەزیرێکی بێ دەستەڵاتی غەیرە نیزامی. هیوادارم بەم کورتە نووسینە خوێنەرەکانم ڕوون کردبێتەوە.

من وازم لە ســکرتێری هەیئەتی رەئیســەی میللی هێنا و لە کومیســیونی تەبلیغاتی حیزبدا دەســتم بەکارکرد. لە هەموو چاپەمەنییەکانی حیزبدا دەســتم بەنووسین کرد. لە ڕۆژنامەی کوردســتان و گۆواری هەڵاڵەدا شێعر و وتارم بڵاو دەکردنەوە و لە میتینگەکانی حیزبدا بەشــدار دەبووم. لە دەســتەیەکدا کە بــۆ دانانی کتێبی کــوردی بۆ فێرگەکانی کوردستان کاریان دەکرد، ئەندام بووم. ئەندامە ئەسڵیەکانی ئەو لیژنە وەک لەبیرم مابێ، زەبیحی و هەژار و برایمی نادری و دلشادی ڕەسولی و من بووین. پێشەوا بۆ خۆی و چەند مامۆســتای شــارەزاش یارمەتیان دەداین. هەرچەند هیچمان لەو کارەدا پسپۆڕ نەبووین، بــەڵام چونکە زۆر بەدڵســۆزییەوە کارمان دەکرد پێم وایە کتێبــەکان کە بەداخەوە چاپ نەکران خراپ نەبوون.

ڕۆژی بیســت و شەشی سەرماوەز ئاڵای کوردســتان لە مەهاباد هەڵکرا و ڕۆژی دووی ڕێبەندانی ١٣٢٤ کۆماری کوردســتان دامەزرا. من نامەوێ لەو بارەوە بدوێم چونکە زۆری باس کراوە و تەنیا دەڵێم من لەو ڕۆژە پیرۆزانەدا بەشداربووم و شێعرم خوێندەوە.

لــەو ماوەدا من و هەژار یەکماڵ بووین، شــەو و ڕۆژ پێکــەوە دەگەڕاین. ماوەیەکیش قزڵجیمــان لەگەڵ بوو. کاتی بێکاری و ســانەوەمان زۆر خــۆش ڕادەبوارد. من کە پایەی خوێندەواری و زانیاریم زۆر لەوان کەمتر بوو، لە هاونشینی ئەوان کەڵکم وەردەگرت و شت فێر دەبووم. چونکە من و هەژار بۆ هەموو جێگایەک پێکەوە بووین و لێک هەڵنەدەبڕاین، زۆر کــەس نەیاندەزانی کاممان هەژارە و کامـــان هێمن و ئەگەر یەکمان بەتەنێ گەڕابایێن دەیانگوت کوا ئەوی تر؟

پــاش دووی ڕێبەندان و پێکهاتنی کۆماری کوردســتان کوردەکانــی پارچەکانی تری کوردســتان ڕوویــان لە مەهاباد کرد و مــن و هەژار لەگەڵ هەموو پیــاوە بەناوبانگەکان پێوەندی دۆستایەتیمان دامەزراند. مامۆستا قانیعیشم ناسی و لە ئەزموونی ئەدەبی ئەویش کەڵکم وەرگرت. زۆرم بیرەوەری خۆش لە هاونشــینی مامۆســتا قانیع هەیە کە بەداخەوە لێرەدا مەجالی گێڕانەوەیان نییە.

دایکم لەمێژ بوو دەیویست ژنم بۆ بێنێ و تا نەمردووە من بەزاوایی ببینێ. بەڵام من ملم ڕانەدەکێشا و نەدەچوومە ژێر بار. خۆم بەخوێندەوار دەزانی و پێم وابوو هەق نییە دایک و بابم ژنم بۆ بێنن. بۆ خۆشم لە هەڵبژاردنی دەزگیراندا دڕدۆنگ بووم و هەتا گەورەتر دەبووم ئەو دڕدۆنگییە زیادی دەکرد. لەو ئاخیرانەدا هاتبوومە ســەر ئەو خەیاڵە کە ئەســڵەن ژن نەهێنــم و بەڕەبەنی بمێنمەوە. هیچ کچێک تەبعی جوانی پەرســتی منی ڕازی نەدەکرد و ڕەنگ بێ ئەگەر دایکم نەبووبا ئێســتاش بوخچەی نەکراوە بووبام. بەڵام دایکم ئەو ساڵی پێی لێ لە کەوشان کردم و گوتی: ئیللا بیللا، پێت خۆش بێ و پێت ناخۆش بێ ژنت بۆ دێنم. لەولاشەوە هەژاری لێ دنە دابووم و شەو و ڕۆژ لەبن هەنگڵمدا بوو. هەژار بەتەمەن چی وا لە من گەورەتر نەبوو. بەڵام ســارد و گەرمی ڕۆژگاری لە من زۆر پتر چێشــتبوو. دوو جاری ژن هێنابوو وئەزموونی لەو بارەوە زۆر بوو. توندی و سەرەڕۆیی دایکم و نەرمە نەرمە و دنەدانی هەژار دڵیان نەرم کردم.

دایکم برازایەکی خۆی کە کچی پیاوێکی بەدەســتەڵات و دەوڵەمەند بوو بۆ خواســتم کە نە دیبووم و نە دەمناســی. درۆ نەبێ جارێکی دووربەدوور لەبەر مانگادۆشین دیبووم. ئەویش ڕوخســارم نەدیبو. بەڵام دەمزانی کورتە باڵایە. ئەوەش سەیر بوو من ئەو خۆوێژە نەبووم کە گوتوویەتی: «ســەد نەحلەت لە حاڵەتم هەر ئیی کورتم خۆش دەوێن» من لە ژندا ئەوی لە هەموو شت پتر سەرنجم ڕادەکێشێ بەژن و باڵای ڕێکوپێک و بەرزە. ئەوەشم بە دایکم گوت. گوتی: ڕۆڵە ئەو قســانە چن؟ زێڕیــش بچووکە. دایکم ژنێکی دنیادیدە و بەئەزموون و کارامە و زۆر بەدەستەڵات بوو. خزم و کەسوکار و دۆست و ئاشناشمان زۆر بــوون، لەناو ئەو هەموانەدا ئەو برازایەی هەڵبژاردبوو. دیارە ئەو بەدوای کچی شــۆخ و شــەنگ و جوان و چەلەنگدا نەگەڕابوو. ئەو دەیویست بووکێکی ئاکارباش و ڕەفتارچاک و وریا و بەمشوور و ماڵداریکەری هەبێ.

شــایی هێمن دەســت پێکرا، هەژار هەڵبەزی، سەرچۆپی کێشــا، دەستی دۆی ناسک و نازداری گوشــی، چاوی لە کیژۆڵان داگرت و شــەوانەش بەو قسە قۆڕانەی خۆی کۆڕی دیوەخانی وەپێکەنین دەخست. بەڵام هێمن نیگەران بوو، نیگەرانی دواڕۆژی خۆی و بیری




لەوە دەکردەوە چۆن لەگەڵ ژنێک کە هەڵبژاردەی دایکیەتی و بۆ خۆی نەیدیوە و نایناسێ، دەتوانێ ژیان بەرێتە سەر. نەیدەزانی تۆقی لەعنەتی بۆ دێنن یا فریشتەی ڕەحمەت.

ڕۆژی ٢٥ی خەزەڵوەری ١٣٢٥ بووکیان بۆ دابەزاندم. دیارە ئەو پەری ناسـک و نازدار و شۆخ و شەنگ و جوان وچەلەنگە نەبوو کە خەیاڵی شاعیرانەی من بەشوێنیدا دەگەڕا و هێشتاش تووشی نەبووە. بەڵام زۆر زوو توانی خۆی لە دڵی مندا جێ بکاتەوە و وا لە خۆی بکا کە لە قووڵایی دڵمەوە خۆشم بوێ و ببێ بەیاری هەمیشەیی و خەمڕەوێنی ڕۆژانی تاڵ و تفتی ژیانم. بیسـت و سێ ساڵ پێکەوە ژیاین و لە پەنا ئەودا هەستم بەسانەوە دەکرد. قەتی ئەوەندە دڵ نەشکاندم ڕۆژێک تا ئێوارێ لێی زیزبم و دەنگی لێ بگۆڕم. زۆر لە ژیانی ژن و مێردایەتیـم ڕازیم. ئیقرار دەکەم ژیانی خۆشـی ژن و مێردایەتیمان زیاتر ئەو پێکی هێنابوو. چونکە من دەزانم حەساس و تووڕە و تەنانەت بیانووگر و جینگنۆکەم، بەڵام ئەو هێدی و ئارام و ژیر بوو و بیانووی نەدەدا دەسـتم. تاقە کوڕێکمان بوو ناوی نا (سەلاح)، ئەوە ماوەیەکی زۆرە لە دیداریان بێ بەشم و دەردی دووری دەچێژم. یادیان بەخێر.

هێشتا مانگێک بەسەر شەوی زاوایەتیمدا ڕانەبردبوو و بەقسەی ئەوڕۆ مانگی هەنگوێنم تەواو نەکردبوو، کە بەداخەوە ئەوەی نەم دەویسـت رووبدا ڕووی‌دا و ئەوەی پێم خۆشبوو بمرم و نەیبینم دیتم. ڕیسـەکەمان لێ بۆوە خوری. هێلانەکەمان لێ شێوا و کۆمارەکەمان ڕووخا و دوژمن بەسەرماندا زاڵ بۆوە.

ماوەیەک بوو هەسـت بەمەترسی دەکرا. جەبهەی سەقز و سەردەشت قایمتر دەکران. چەنـد دەرەبەگی بەناوبانـگ و خاین ڕایان کردبوو بۆ عێراق و یەک دوو مەلا و شـێخی خوێرپەپیاو دەسبەسـەر کرابوون. حکوومەتی ئازەربایجان لەشـکرێکی ساز و تەیاری بۆ پشـتیوانی پێشـمەرگە ناردبووە جەبهەی سـەقز، چونکە وا بەراورد کرابوو کە تەنیا لەو جەبهەڕا ترسی پەلاماری دوژمن هەیە. لەپێشداش چەند جار لەو جەبهەڕا دوژمن پەلاماری هێنابوو، بەڵام زۆر خراپ شکابوو و زەبری دەستی پێشمەرگەی کوردستانی چێشتبوو.

ئازەربایجـان حکوومەتێکـی گەورەتـر و بەهێزتر و زۆر تەیارتر و پـڕ چەکتر بوو لە کوردسـتان. خەتی دیفاعی ئازەربایجانیش زۆر قایمتر بوو. کەوابوو کەم کەس بەخەیاڵیدا دەهات لە ڕێگای ئازەربایجانەوە پەلامار بۆ سـەر جوولانەوەی ڕزگاریخوازی گەلانی ئێران بهێنرێ.

ماوەیەک بوو بۆ ئەوەی کارەکانی حیزبی باشـتر ڕابپەڕن پاش ئەوەی شەوانە پێشەوا کە زۆر شـەو تا درەنگ لە دەفتەری حیزبدا دەماوە دەچۆوە ماڵی خۆی، کادرێکی حیزبی

له دەفتەری حیزبدا دەماوە بۆ ئەوەی ڕاپۆرتی خوارەوە - ئەگەر پێویست بوو - بەپێشەوا ڕابگەیەنی و دەستووراتی پێشەوا بۆ خوارەوە بنێرێ. ئەو شەوی نۆرەی منی تازە زاوا بوو. له دەفتەری حیزب دانیشتبووم و خەریکی نووسینی مەقالەیەک بووم بۆ «کوردستان»، ئەفسەرێکی بچووک بەڵام دۆستێکی گەورەی من و ئەندامێکی زۆر بەوەفای حیزب هاتە ژوور. زۆرم پێ ناخۆش بوو کە دەستی بۆ ڕادیۆکەی سەرمێزەکە برد. چونکە نووسینەکەی لێ تێک دەدام. بەڵام چم نەگوت و قەڵەمەکەم دانا. لەپڕ شتێکی وامان گوێ لێ بوو کە وەختابوو پێمان بەعەرزەوە وشک بێ. ڕادیۆ تاران تەلگرافی پیرۆزبایی دوکتور جاوید وەزیری ناوخۆی ئازەربایجانی دەخوێندەوە کە بەبۆنەی گەڕانەوەی ئەرتەشی شاهەنشاهی بۆ تارانی ناردبوو. دوایە خەبەری ڕاکردنی «موتەجاسیرین»ی ڕاگەیاند. موتەجاسیر و ماجەراجوو دوو ناو بوون کە لەو شەوەڕا بەسەر بەڕێوەبەرانی جوولانەوەی ئازادیخوازی کوردستان و ئازەربایجاندا بڕان و ئێستاش دەزگای تەبلیغاتی ڕێژیم دووپاتەیان دەکاتەوە و دەیانهێنێتەوە کاوێژ.

دەسبەجێ بەتیلفوون ئەو خەبەرەم بەپێشەوا ڕاگەیاند. گوتی بۆ خۆت وەرە ئێرە و بەئەوانی تریش ڕابگەیەنە بێنە ئێرە. بەدوای ئەوانمدا نارد و بۆخۆم چووم بۆ ماڵی پێشەوا. سەدری قازی برای پێشەوا کە نوێنەری مەجلیس بوو له تاران و بەڕواڵەت نەدەبوو لەو واقیعە بترسێ، له هەموو کەس پتر شڵەژابوو. ئەو دەسبەجێ گەڕاوە بۆ تاران و لەوێ گرتیان و هێنایانەوە مەهاباد.

ئازەربایجانی وا تەیار پڕ چەک بەلەشکری ساز و پەرداخ و فەرماندە لێزانەکانیەوە بۆ وا زوو تەسلیم بوو؟ پیشەوەری کارامە و شۆڕشگێڕ و کۆنەپیاو و ئازا و ڕابەرەکانی‌تری ئازەربایجان بۆ وا بەپەلە ڕایان کرد؟ پرسیارێکە کەس بەتەواوی جوابی نەداوەتەوە و منیش جوابم بۆ نادرێتەوە بەڵام دڵنیام ئەگەر فیدایی دەستی کردباوە و ئەگەر فیرقە بەریەرەکانی بکردایە، لەشکری شڕوشپڕێوی تاران نە تەنیا پێی له تەورێز نەدەنا و ئەو هەموو کوشتاری نەدەکرد، بەڵکە تارانیش دەشێوا و لەوانەبوو له سەرتاسەری ئێراندا جووڵانەوەی ئازادیخوازی بەسەر کۆنەپەرستیدا سەرکەوێ و تەنانەت نفووزی ئیمپریالیزم له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا زووتر بنەبڕبێ. بەڵام وەک زانایان گوتوویانە مێژوو ئەوەیە ڕوو دەدا نەک ئەوە کە ئێمە دەمانەوێ.

بەڵێ کوتوپڕ تەورێز گیراوە و کوردستانیش له هەموو لاوە گەمارۆ درا. پاش ئەوەی سەدری قازی نازانم بۆچی بەرەو تاران گەڕایەوە ڕابەرانی حیزبی دیموکراتی کوردستان له ماڵی پێشەوا کۆبوونەوە و ئەو شەوی ڕووحیەی هەموو کەس دەتوانم بڵێم باش بوو.

شـــورای جەنگ بەسەرۆکایەتی حاجی بابەشێخ پێک هات و سورەت جەلسەی یەکەم ئیمزا کـــرا و قەراری بەربەرەکانی درا. بەڵام هێشـــتا مەرەکەبی بڕیارنامەکە وشـــک نەبۆوە کە خەبەر هات یەکێک لە ئەندامەکانی ئەو شورایە ڕای کردووە.

بۆ بەیانی وەزع گۆڕا و بڕیاری بەربەرەکانی هەڵوەشـــاوە و بەپێشمەرگە دەستوور درا بێ دەســـتکردنەوە پاشەکشە بکا و ڕێگا بۆ ئەرتەش بەتاڵ بکا و خەڵک دەستێکی کەوتە ئەولای و یەکێکی کەوتە ئەملای.

پێشمەرگە لە جەبهەی سەقز و سەردەشتەوە بەڕێکوپێکی پاشەکشەی کرد. فیداییەکان کە فەرماندەکانیان ڕایان کردبوو وەک مەڕی بێشوان بڵاوبوون و عەشایر لێیان وەخۆکەوتن و هەموویان داپڵۆسین و نەیانهێشت تاقە فیشەکێک لەگەڵ خۆیان بەرنەوە، بەڵام نەوێرانە پێشـــمەرگە. تەنیا لەناو مەنگوڕان پێشـــی دەســـتەیەکیان گرت کە بەفەرماندەیی زێڕۆی دەگەڕانەوە، زێڕۆش کە بۆ خۆی شـــڕەخۆرێکی وەک ئەوان بوو، دەســـتی نەدا و بەگژیاندا هاتەوە و تەنانەت چەند گوندیشـــی تاڵان کرد و گەیشـــتەوە مەهاباد. ئەوانی فیداییەکانی ئازەربایجانیان ڕووت کرد کەســـیان نەکوشـــت. ئەوی من وەبیرم بێ لەو کارەساتەدا تەنیا پێشمەرگێکی کوردی عێراق شەهید کرا و هێندێکیشیان ناپیاوانە ڕووت کردن. فەرماندەی ئەرتەش بێ هیچ زەحمەت گەیشتە گوندی حەمامیان و پێشەوا لەوێ دیتی.

لەو ماوەدا من هەمیشە لەگەڵ پێشەوا بووم. دیارە لەگەڵی نەچوومە حەمامیان، بەڵام لە شـــاری بەجێم نەهێشت. دەمدیت پەشۆکابوو. بەڵام نەک لە ترسان، بەڵکە لە داخان و لەبەر ناهومێدی.

من لەمێژ بوو پێشەوام دەناسی و لە ڕۆژی تەنگانەدا دیبووم. بەدەست و تفەنگی خۆی پیاوێکی زۆر ئازا بوو. پێش دامەزراندنی کۆماری کوردستان چەند جار عەشایر هاتنە سەر مەهاباد و پێشەوا بۆخۆی لە یەکەم سەنگەردا بۆ دیفاع ئامادەبوو. ئەدی چۆن بوو ئەوجار تەســـلیم بوو؟ بۆخۆم لێم بیست گوتی لەسەرمانەوە ناچن و دەمانکوژن. بەڵام پێم خۆش نییە گەلەکەم بەجێ بێڵم و دەمەوێ لەناو ئەواندا بمرم.

ڕاســـتە کوردستان پاش گیرانەوەی ئازەربایجان و لەدەستدانی ئەو هاوپەیمانە بەهێزە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ درابوو، ڕاســـتە بەشـــێکی عەشایر گوێیان لە کڵاو پەڕاندبوو و چاوەنـــۆڕی خراپەیان لێ دەکرا، ڕاســـتە خەزێنەی کۆمار بەتـــاڵ و حەتاڵ بوو و هەمووی درابوو بەتووتن و هێشتا نەفرۆشرابۆوە و لە عەمباردا مابۆوە، ڕاستە لە هەموو یارمەتییەکی دەرەوە هیوابڕاو کرابوو، بەڵام من بەش بەحاڵی خۆم لەو بڕوایەدام ئەگەر دەســـتەوەکەری

کرابـــا و ئێمە ئەزموونی شۆڕشـــگێڕمان هەبا مێژووی کۆماری مەهابـــاد بەو جۆرە دوایی نەدەهات کە هات.

ڕۆژی ٢٦ی ســـەرماوەزی ١٣٢٥ - ١٩٤٦ ئەرتەشـــی شرۆشـــپرێوی شاهەنشاهی تەواو ساڵەوختێک پاش هەڵکردنی ئاڵای کوردستان شاری مەهابادی گرتەوە.

هێندێک لە بەڕێوەبەران و کادرەکانی حیزب ڕایان کرد و خۆیان شاردەوە و هێندێکیش دانیشـــتن و چاوەنۆڕی گرتن بوون. من ئەو ڕۆژی لە شـــار وەدەرکەوتم و چوومە خانەقای شـــێخی بورهان. لەوێ شـــێخ موحەمەدی خاڵم حەشـــاری دام و لەبن باڵی خۆی گرتم. لە خانەقا بووم کە خەبەری گیرانی پێشـــەوا و ڕابەرانی حیزب و کۆمارم بیســـت. پیاوم وەدووی هەژار خســـت بیبینمەوە و پێکـــەوە تەگبیرێک بکەین. ئەویش بۆی دەرچووبوو و بۆم نەدۆزراوە.

نەخۆشی کەوتوویی لە خانەقا هەبوو، زۆر کەس گرتبووی و چەند کەسیشی کوشتبوو. مـــن جارێکـــی تر هەر لـــەو خانەقایەدا ئەو نەخۆشـــییەم گرتبوو و زۆری لێ دەترســـام. گوتوویانە هەرچی بترسێ ناخەلسێ، هێندە پێ نەچوو گرتم و کەوتم. بەفرێکی یەکجار زۆر و ئەســـتوور کەوتبوو، هیچ دوکتۆرێک بەو بەفرە نەدەگەیشـــتە خانەقا. دوو مانگی ڕەبەق بۆی لەسەر ڕەقی پشتی کەوتم. ئەسپەک لەسەری دام و قسەی هاتەران پاتەرانم دەکرد. هەموو بەدەنم بەنوێنانەوە چوو و توێخی هاویشـــت. بەڵام ئەوجاریش لە دەســـت ئیزرائیل ڕزگاریم هات.

کە لە نەخۆشـــی هەستامەوە بەفریش کەم ببوو، ڕێگا کرابوونەوە. وایان بەمەسڵەحەت زانـــی بۆ ئەوەی کەمێک ژیوەلە ببمەوە و گـــورد بگرمەوە بەدزی بچمەوە ماڵی خۆمان کە لە شار نیزیک بوو و دەرمان و خواردنی باشتری لێ وەدەست دەکەوت. چاک لەبیرم نییە چەند ڕۆژان لە ماڵێدا تەماڵم هەڵگرت و خۆم مەڵاس دا.

ڕۆژێک لە ژوورێ دانیشتبووم و کتێبم دەخوێندەوە، لەپڕ لەناوێدا بوو بەشین و گابۆڕ. ناردم بزانم چییە؟ قاسید بەگریان و لەخۆدان هاتەوە و گوتی ئەوانەی لە شاری هاتوونەوە دەڵێن دەوری شار گیراوە و نایەڵن کەس بچێتە ناو شار یا وەدەرکەوێ و دەنگۆیە و دەڵێن پێشـــەوا شـــەهید کراوە. هێندەی پێ نەچوو قسەکە دڕا و مەعلووم بوو پێشەوا و سەدری قازی برای و سەیفی قازی ئامۆزای لە چوارچرا لەدار دراون.

ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە و ئەو کارەساتە جەرگبڕە هەموو کوردێکی بەشەرەفی خەمناک و تازیەبار کرد. بەتایبەتی دڵی منی بەناسۆر ئەنگاوت. ناسۆرێک کە بۆتە تیراوێ و ئێستاش

هەروەبن دەداتەوە و هەڵدەداتەوە و بێگومان سارێژ نابێ و لەگەڵم دێتە بن گڵ.

من پێشەوام لە دڵەوە خۆش دەویست. بەڕابەرێکی دڵسۆز و ژیرم دەزانی، بەکوردێکی پاک و چاکم دەناسی و بەموسلیحێکی یەکجار گەورە و مەزنم دەزانی. دەمزانی نەتەوەکەی خۆی چەند خۆش دەوێ و چەندی پێ خۆشە خزمەتی بکا. چەند بەئاواتەوە بوو کورد بگاتە ڕیزی نەتەوە بەختەوەرەکان. زۆرم هیوا پێ بوو گەلەکەمان بەپەلە بەرێتە پێش و لاتەکەمان زوو ئاوەدان بکاتەوە. لەو ماوە کورتەشدا دەزانین چەندی خزمەتی بەکەلک کردن. بەڕاستی مەرگی پێشەوا نەک هەر بۆ نەتەوەی کورد بەڵکە بۆ جووڵانەوەی ئازادیخوازی و دژی ئیمپریالیستی سەرانسەری ئێران زیانێکی گەورە بوو. دەریایەک زانست و ئەدەب، دەریایەک فیکر و بیر، بەدەستی زۆردارێکی سەرەڕۆ و نەزان وشک کرا و لەناوچوو.

سێ ڕۆژ پاش شەهیدبوونی پێشەوا یانی ڕۆژی سێزدەبەدەر ـ قەلفرم بۆ کرد و لەگەڵ پیاوێکی هەژار و هاواڵێکی زۆر بەنرخی حیزبی بەرەو کوردستانی عێراق وەڕێ کەوتین. بەدوو ڕۆژ و دانێک سنوورمان پەڕاند. لەوبەری جۆگەوە بازم دا ئەوبەری جۆگە بەڕواڵەت هیچ فەرقێکم نەهاتە پێش چاو. بەڵام لە واقیعدا سنووری سیاسی ولاتێکم پەڕاندبوو و چووبوومە ولاتێکی دیکە. گەیشتمە شاری قەڵادزە، وەنێو بازاڕ کەوتم و نەکەوتم بەبەرگ و لیباس پۆلیس ناسیمی و زانی لەو دیوڕا هاتووم. پیلیان گرتم و خەریک بوون تێکمەوە پێچن. بەڵام مەلایەک و حاجییەک بێ ئەوەی بمناسن باڵیان بەسەردا کێشام و نەجاتیان دام. نەقلەکە ڕاست لە من ڕووی دابوو لە ترسی ئاگر پەنام بۆ مار بردبوو. مەلا پێی خۆش بوو بمناسێ. منیش لەگەڵ ئەوەشدا پێم خۆش نەبوو کەس بمناسێ و ناوی خۆم بەکەس بڵێم خۆم پێ ناساند. دیاربوو مامۆستا منی لە دوورەوە دەناسی. ئەو شەوەی زۆری حورمەت گرتم و لە حوجرەی فەقێیان نووستم و بەیانی بۆخۆی وەپێشم کەوت و بردمی بۆ گوندی گردبوداغ. من بەهیوا بووم سۆراخی هەژار و زەبیحی و قزڵجی و دڵشاد بکەم و قسەی خۆمان بێ لە دڵی خۆمدا وام دانابوو یەک بگرینەوە و سەرلەنوێ دەست بەکاربینەوە. دیارە ئەو قسەم بەمامۆستا عەرز نەکردبوو، بەڵام پێم گوت دەمەوێ ئاواڵەکانم ببینمەوە. مامۆستا گوتی جارێ ڕووبار زۆرن و بوار نین و بێجگە لەوە ئەو کوردانەی ئێرە کە هاتبوونە ئێران هاتوونەوە و دانگەرێزە دەکەنەوە بۆ لای شاران و پۆلیس ئامادەیی هەیە. جارێ ماوەیەک لێرە بە تا ولات کەمێک ئارام دەبێتەوە. هاوڕێیەکەم ناردەوە و بۆ خۆم دەستم کرد بەخوێندن و سەرلەنوێ بوومەوە فەقێ؛ زۆر چاکم دەخوێند. هەم خۆم دەخافڵاند و وەڕەزی خۆم دەشکاند و هەم دەمویست ئەوی لە سووریم دۆڕاندووە

له کایەی تێ هەڵبێنمەوە. هێشــتا لاو بووم و ئەگەر خوێندبام دەمتوانی شــتێک بکەم. بــەڵام خوێندنەکــەم زۆری نەخایاند. بیســـتم وەزعی ئێران ئارام بۆتەوە و دەســـتیان له خەڵــک گرتن هەڵگرتووە و لێکم داوە پاش ئەوەی لێــرەش هەر قاچاغم و ناوێرم بگەڕێم بۆ ســەرێک لــە وڵاتی خۆمان نەدەمەوە؟ ئەگەر زانیــم دەحاوێمەوە ئەوە هەر لەوێ خۆم حەشــار دەدەم. بەتاقی تەنێ ڕووم لە کوێســـتانە خۆشەکانی کوردستان کرد بەنێو چادر و هۆبە و گوڵ و گوڵزاراندا گەڕام. شــەنگەبێری کێل گەردنم دین. لەو گەشـــت و گەڕانەدا بووم کە پارچە شــێعری بەهاری کوردستانم گوت، کە بۆخۆم ئێستاش زۆرم خۆشدەوێ و بەشاکاری دەزانم. ژاندارم و پۆلیس لە هیچ کوێ تووش نەبووم و بێ سەدەمە گەیشتمەوە گوندەکەی خۆمان.

ڕاوەســـتام تا شەو بەسەر دەســـتاندا هات و بەتاریکی چوومە ماڵێ. یەکسەر چوومە پشـــت دەرکی ژووری بابم. بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا خۆم گرت. چونکە بابم خۆ لە خەڵک گرتن و گوێ لە قســـەی خەڵک هەڵخســـتنی زۆر پێ ناخۆش بوو. تەنانەت ژنی ماڵی ئێمە لە ترســـی بابم قەت نەیان دەوێرا شــەمۆڵە بگرنەوە کە ئەودەم لە لادێدا زۆر باو بوو. لە درزی دەرکەوە دیتم بابم بەحەواوە ڕاوەســـتاوە و لەگەڵ ئەو پیاوەی کە لەگەڵم هاتبوو بۆ کوردســـتانی عێراق قســـە دەکا و پێی دەڵێ ڕۆڵە پێم بڵێ لە کوێیە بۆخۆم پیاو دەنێرم. ئەویــش دەڵێ دوو ڕۆژی دی بۆخۆم دەچم و دەیهێنمەوە. قەولم پێداوە جێگا و شــوێنی ئەو بەکــەس نەڵێم. بابم کەمێک بەتووڕەیییەوە گوتی چۆن بەمنیش ناڵێی. گۆتی نەخێر بەتۆش ناڵێم، بەدایکیشی ناڵێم، قەولم پێداوە و قەولی خۆم دەبەمە سەر. ماندوویی ڕێگا و کوێرەوەری غەریبی و لێ قەوماویم لەبیر چۆوە و لە دڵی خۆمدا گوتم چۆن زەحمەتکێشانی کورد کوڕی وایان لێ پەیدا بووە؟

بەڵێ زۆر قارەمانی وا لە خەباتی ڕزگاریخوازی گەلەکەماندا هەن کە کە بەشــەرەفەوە ژیاون و بەشــەرەفەوە دەمرن و مێــژووش لەبیریان دەکا. ئەو پیــاوە، پیاوێکی هەژار و زەحمەتکێــش و نەخوێندەوار بوو. لەســـەرەتای کۆمەڵەوە بەبڕوایەکــی قایم و تەواوەوە هاتبـــووە نــاو کۆڕی خەبات و بێ ئــەوەی خۆی ڕانێ خزمەتی زۆر گــەورەی کردبوون و کەســـیش باشی ناناسێ و منیش لێرەدا ناوێرم ناوی بەرم. چونکە نازانم ماوە یا نەماوە و دەشزانم ئەگەر مابێ تووشی دەردی سەر دەبێ.

چیــدی خــۆم پێ ڕانەگیرا و چوومە ژوورێ. دایکم و بابــم و کابرا واقیان وڕما. دایکم ئامبــازم بوو و تێروپڕی ماچ کردم. بەڵام بابم ئــەو بابەی کە قەت ڕووی نەدامێ و لەبەر

هیچ کارەساتێک نەدەچۆما و بەمەتانەت و خۆڕاگری لە وڵاتدا ناوبانگی هەبوو و هەتا ما یەکمان جگەرەمان لەکن نەکێشا و بێئیجازە دانەنیشتین. خۆی پێ ڕانەگیرا و بەلووزەوەو فرمێسکی لە چاو هاتە خوار و هەتا ماوەیەک هیچ قسەی بۆ نەکرا. دوایە بۆ یەکەم جار و ئاخر جار لە ژیانمدا بەخێرهاتنی کردم و گوتی چاک بوو هاتیەوە. ئەوە لە دوام دەناردی عەفوی عمومی بۆ عەشیرەتان دەرچووە. ڕاستە ئێمە عەشیرەت نین. بەڵام خەڵکی گوندین و دەتوانین لەو دەرفەتە کەڵک وەرگرین. ماڵی دنیام زۆرە و ئێستا هەموو شت بە بەرتیل دەکرێ. جارێ ماوەیەک لە ماڵێ دانیشـــە و هاتوچۆی شـــار و باران مەکە تا بزانین دنیا چی لێ دێ.

لە ماڵێ دانیشـــتم و چ باس نەبوو وردە وردە خەڵکیان بەردا. منیش دەســـتم کردەوە بەجووت و گا و ئاژەڵدارییەکەی خۆم و هاتمەوە ســـەر حووڵلەمەرەســـێ. حیزبی تودەی ئێران بەئاشـــکرایی خەباتی دەکـــرد و ڕۆژ بەڕۆژ کۆمەڵانی خەڵکـــی ئێرانی زیاتر لێ کۆ دەبوونەوە. لە ڕۆژنامەکانی خۆیدا ئیمپریالیزم و کۆنەپەرســـتی بەتوندی دەکوتا و تیئۆری زانستی بڵاو دەکردەوە.

حیزبی دیموکراتی کوردستانیش کەم کەم بووژاوە و کادرە لاوەکانی دەستیان کردەوە بەخەبـــات. پیاو هەق بڵێ حیزبی تودە لەو ســـەردەمەدا لە بووژاندنەوەی حیزبدا ڕۆڵێکی باشـــی یاری کرد. تەنانەت لە پاراســـتنی ناوی حیزبدا. چونکە هێندێک لە لاوە ئازادیخواز و کـــەم ئەزموونـــەکان خەریک بوون ناوی حیزب بگۆڕن و بیکەنە کۆمەڵەی کۆمۆنیســـتی کوردستان و وەک بیستوومە بەڕێوەبەرانی حیزبی تودە مانیع بوون.

ژمارەیەک نیشـــتمان بڵاو بۆوە گەیشتە دەســـتم و هۆمێدم پەیداکرد کە خەباتەکەمان پەرە بگرێتەوە. هەرچەند ڕاپۆرتیان لێ دام کە لە نووســـینی ئەم گۆوارەدا دەســـتم هەیە و برێکیان ئەمبەر ئەوبەر پێکردم و بەخوای دەستێکیشـــیان بەیاڵ و بژیدا هێنام و پووڵ چایەکیان لێ ئەستاندم. بەڵام ئەوە چوو و ڕابرد نەمزانی لە کوێ چاپ کرا و هەر بەشێوە نووســـین نووســـەرەکانم ناســـین. ژمارەیەکیش ڕێگا دەرچوو و پێم گەیشـــت. یەکێک لە نووسەرەکانم دیت و بەڵێنی هاوکاریم پێدا، بەڵام بەداخەوە ئەویش تێداچوو.

لە ڕۆژی ١٥ی ڕێبەندانی ١٣٢٧ ناســـری فەخرارایی لە دانیشـــگای تاران شـــای وەبەر دەمانچان دا تۆزکاڵێکی دەم و لێو و پشـــت پووشاند. ئەو تاوانەیان هاویشتە سەر حیزبی تودە و ئیجازەی ڕەســـمی کارکردنی ئەو حیزبەیان هەڵوەشـــاندەوە و ڕابەرەکانیان گرتن و دەرکی ڕۆژنامەکانیان داخســـتن و لە سەرتاســـەری ئێراندا حکوومەتی نیزامی دامەزرا.




ئەوەش زەبرێک بوو کە بەنەخشـــەی ئیمپریالیزم و بەدەستی کۆنەپەرستی وەجوولانەوەی ڕزگاریخوازی ئێران کەوت.

بەلام زۆری پێ نەچوو ڕۆژنامەکانی حیزبی تودە بەنهێنی دەرچوونەوە و رابەرانی حیزب توانیان لە زیندان رابکەن.

سەیر ئەوە بوو پاش ڕووخانی کۆماری مەهاباد من یەکەم جار دوو ڕۆژ پێش واقیعەی دانیشـــگا وێرابووم بەئاشکرایی بچمە مەهاباد و بەڕۆژی ڕووناک بگەڕێم کە ئەو ڕووداوە لە تاران قەوما و لە مەهابادیش دەستیان کردەوە بەخەلک گرتن. ناچار منیش خۆم شاردەوە. لەو خۆشاردنەوەدا شیعرێکی زۆر باشم لەژێر عینوانی «ژوانی ئاغا»دا گوت کە بەداخەوە خۆم نەمماوە و تکا لەو کەسانە دەکەم کە هەیانە بیپارێزن و ئەگەر کرا بۆم بنێرن. سالی ١٣٢٧ ســـالێکی یەکجار تووش و شـــووم بوو. من بە عومری خۆم زســـتانی وا سەختم لە ولاتی خۆمان نەدیبوو. پازدە ڕۆژی پایز مابوو بەفرێکی ئەســـتوور و وشک باری. یەک نوا لە هەموو جێگایەک لە میترێک پتر بوو. وشـــکەبەند و ســـەرما و سابیقەی بەدوادا هات و یەکسەر بوو بە ڕوو، بەفری دیکەشی بەسەردا بارین، ڕێ و بان گیران، قات و قڕی پەیدا بوو، ئاو وشـــک بوون و خەلک ناچار بوو بەفر بتوێنێتەوە و بیخواتەوە. نەوت و ئاوردوو وەگیر نەدەکەوت. ئاژەل و مالات قڕانی کرد. ڕەپستە ڕزین و نەوەندە گنخان و گرانییەکی زۆر بەسامی بەدوادا هات.

من بۆخۆم لە ئەزموونی پیاوێکی دنیادیدە و کۆنسال کەلکم وەرگرت و توانیم بەشێکی زۆر لە دەغلودانی خۆمان لە ڕزین و زایەبوون ڕزگار بکەم.

بەهـــار درەنگ بوو، هەوا گەرم ببوو. بەلام بەفر ئارەقیشـــی نەدەکرد. ڕۆژێک چوومە مزگەوت تەماشام کرد پیرەپیاوێک بەتەنێ لە تەنیشت سۆبە سارد و سڕەکە هەلکورماوە. هەر منی دیت گوتی: مندالی ئەو زەمانە ئێمەیان پێ خەرفاوە. گوتم مامەگیان چ قەوماوە؟ گوتی: بەســـەری تۆ ئەوە چەند ڕۆژە بەو هەتیوە گێژانەی خۆم دەلێم بچن بەفری ســـەر ڕەپســـتەکەمان کون کون بکەن گوێشـــم نادەنێ. گوتم جا بۆ کون کونی بکەن؟ گوتی بۆ تۆش نازانی؟ گوتم نەوەللا. گوتی بیلامانێ کە سال درەنگ بوو هەرد گەرم دادێ و هەلمێ دەکا. بەفریش نایەلێ هەلمەکە بێتەدەر و لەناو خۆیدا دەگەڕێتەوە و دەغلەکە دەسووتێ. ئەگەر کون بکرێ هەلمەکەی دێتەدەر و ناســـووتێ. قســـەی مامەپیرەم بەدلیەوە نووسا، چەند ڕۆژان پیاوم هەلگرتن و چوومە زک بەفر کون کردن.

هەوا خۆش بوو، بەلام کارەکە زۆر گران بوو. بەفرەکە ئەوەندە ڕەق بوو بە لۆسە کون




نەدەکرا. بەڵام پاشــان تێگەیشتم پەندی پێشــینیان چەند ڕاستە کە گوتوویانە (دەستی ماندوو لەســەر زگی تێرە). بەشــی زۆری دەغڵی ئێمە ئەو ســاڵی نەڕزی و نان و تۆوی خۆمان بوو.

ئەو ســاڵی لە هیچ کوێ دەغڵ نەبوو. ئەو جووتبەندانەی زەوی ئاویژەمان بەدەستەوە بوو، هەرزن و گەنمەشــامییان چاند و نێوەنانیان پەیدا کرد. منیش هەرزن و گەنمەشامی زۆرم چاند و بەرهەمێکی باشــیان دا. بەڵام لە گوندەکەمان هیچ داهاتمان وەگیر نەکەوت، چونکە بۆخۆیان هیچیان نەبوو تا بەشی ئێمە بدەن.

بۆ زســتانی داهاتوو گرانییەکی بەســام سەرانســەری ئێران بەتایبەتی کوردستان و ئازەربایجانی داگرت. دەغڵی فرۆشتن هەر نەبوو، هەشبا لە کڕین نەدەهات. هیچ شتیتریش دراوی نەدەکرد. دوو مەڕی داشــتی پووتە گەنمێکی نەدەکرد. کەویژە گەنمیان بەجووتێک کەڵی خاوێ نەدەدا. هاواری سەروماڵ بوو، برا ئاوڕی وەسەر برا نەدەدا. بەڵام من نەمدی و نەمبیست لە کوردستان کەس ڕاستەوخۆ لەبرسان بمرێ، هەرزن و گەنمەشامی خۆڵاتی و گەنم و جۆ و خورمای عێراق هۆیان داوە.

لەگەڵ ئەوەشدا دەزگای تەبلیغاتی پادشایەتی ئێران لەو ساڵانەدا شەو و ڕۆژ و وەخت و بێ وەخت پەلاماری دەبردە سەر دەوڵەتی شوورەوی، ئەو دەوڵەتە وەک جیرانێکی باش و دڵســۆز گەنمێکــی زۆری دا بە ئێران. ئەویش چ گەنمێک بــە ڕوحی پیاوی پێدەکەنی. بەهاتنی ئەو گەنمە خەتەر کەم بۆوە و قاتوقڕی لە شاران نەما.

دەوڵەت لە دابەشکردنی ئەو گەنمەدا دێهاتیشی لەبیر نەکردبوو و لە ڕووی شوناسنامە میقدارێکی گەنم بۆ هەر خێزانێک دانابوو. بەڵام دەبوو ئاغا بەقەرزی ســەرخەرمان وەری بگرێ و ســەنەد بدا، جا بەســەر خەڵکی گوندەکەدا دابەشــی بکا. ئاغاکان گەنمەکەیان بەزیادەوە وەرگرت و وەک پیاوی چاک لەپێش چاوی کاربەدەســتانی دەوڵەت بەسووت و ســەلەم خۆرەکانی شاریان فرۆشــت و دراوەکەیان نەخد و پوخت لە تەنکەی گیرفان قایم کرد. ئەوان ئەنگڕان، سووت خۆری شار قازانجیان کرد، سمێڵی پیاوی دەوڵەت چەور کرا و ئەوی لەو ناوەدا هیچی پێ نەبڕا هەژار و نەداری لادێ بوو.

لــە بەهاردا خەڵکی دێهاتی ئازەربایجان لە حاڵێکدا کە وەک خەزەڵی پاییز لەبرســان هەڵدەوەرین و پیاو ئاگری بۆ تێ بەردەبوون بە کوردستان وەربوون.

گەلی کورد جارێکی دیکەش پیاوەتی و نان بدەیی و میوانداری خۆی نیشاندا.

هەر دەستەیەک ڕووی لە هەر ئاوەدانییەک دەکرد، خەڵکی ئەو ئاوەدانییە بەپیریانەوە




دەچـوون و ژەمێکیان تێر دەکـردن. زۆر ماڵی وا هەبوون ئەو ژەمـە بۆ خۆیان هیچیان نەدەخوارد و دەیان دا بەو میوانە ڕەش و ڕووت و برسی و خوێنانە. ژاژ و پەنیر و لۆرک تایبەتی ئەوان بوو. ماڵی زۆر لەچەر و پیسکە نەبا ئەو ساڵی ڕزقی بۆ نەگیرا.

ئەگەر گەلی کورد بۆخۆی لە وەزعێکی وادا نەبوو بتوانێ میوانەکانی خۆی باش بەخێو بکا، کە بەهار کامل بوو نیشـتمانەکەی، کوردسـتانی ڕەنگین و بژوێن باوەشی دایکانەی بۆ ئەو برسـی و ڕەشـوڕووتانە، بۆ ئەو لاواز و لەجەرانە، بۆ ئەو لێقەوماو و دەربەدەرانە کردەوە. لە نواڵە زەنویرەکانیدا سفرەی نیعمەتی بەهەڵز و مەندوک و بیزا و کارگ و کوڕادە و زرەمەندی و سـیوەڵووکە و وێنجە کێویلکە و کەنگر و ڕێواس و ئەسـپنک و ئاڵەکۆک و دۆری و ترشۆکە بۆ ڕازاندنەوە.

بەڵێ دیتم لە چەرخی بیسـتەمدا، لەو چەرخەدا کە ئینسـان ئەتۆمی شکاند، ڕاداری دروسـت کرد، تەنانەت مانگی داگیر کرد، ئینسـانیش وەک ئاژەڵ و وڵسات لە کێو و کەژ بلەوەڕێ. دەمدیتن بەگیاخواردن بایان دەکرد. بەڵام نەدەمردن.

ئەو مێگەلە شپرزە و سەرگەردان و بێ شوانە بەچیا سەرکەشەکانی کوردستانی ئێراندا هەڵکشا و گلۆپکی ئەو گیایانەی هەڵپساند و خۆی پێ تێر کرد و شۆڕبۆوە بۆ گەرمەسێری کوردسـتانی پڕ خێر و بەرەکەتی عێراق و وردە وردە دانگەرێزەی کرد تا بەسـەر خێر و خۆشـیاندا کەوت. لەوێ کەوتە فەرعانە. دەغڵـودان فەریکە ببوو، خانەخوێش هەر کورد بوو، بەدڵ بوو، بەبەزەیی بوو، ئینسان بوو و دڵسۆزانە میوانداری کرد و بەخێوی کرد.

من لەو ماوەی ئەو گرانییەدا پیاوەتی ئەوتۆم بەپیاوی نەدار و زەحمەتکێشـەوە دیتن کە بەڕاستی مایەی شـانازی ئینسانیەت بوون. بەڵام بەداخەوە کارەساتی زۆر دڵتەزێن و دیمەنی زۆر دزێویشم دیتن. من بەچاوی خۆم دیتم ئینسان لەبرسان مرد. من ئینسانم دیت لەبەر موحتاجی خەریک بوو نووری چاوی خۆی بەئارد سەودا بکا و هەروەها زۆر حەیوانی دووپێی وام دیتن بەڕواڵەت ئینسـان بوون کەچی لەو وەزعە نالەبارە بۆ ئاخنینی گیرفان یا دامرکاندنی هەوەسی خۆیان کەڵکیان وەرگرت.

ڕۆژێـک لەبن دیوارێکی خـوارو خێچ خۆم لەبەر بەڕۆچکە هەڵخسـتبوو و چیلکەم لە هـەردی دەوەژاند، هێشـتا خاکەلێوە بوو وڵات نەخەملیبوو. بیـرم لە حاڵی ئەو خەڵکە هەژارە دەکردەوە، چەند منداڵی دێ هاتنە لام یەکیان گوتی: فڵانەکەس خەریکە ژن بێنێ. ئەو فڵانە کەسە پیرەپیاوێکی دڵڕەش و کۆنەگزیرێکی بەدفەڕ بوو. کەس کچی نەدەدایە و بـێژن مابۆوە. پێکەنیم و گوتم: ئای لەو درۆیە! منداڵ تێکڕا وەجواب هاتن، بەپەلەپەل و

سوێند و قوران خواردن گوتیان درۆ ناکەین. ئەوە خەریکە کچی ئەو کابرا حەجەمە بکڕێ و لە خۆی مارە بکا. ماشاڵڵا جوانیشە.

- چی چی؟ بیکڕێ؟!

- بەڵێ، بەڵێ، بیکڕێ و لە خۆی مارە بکا.

وەک فیشـــەک لە جێی خۆم دەرپەڕیم و منداڵ کەوتنە شـــوێنم. کە چوومە حەوشەی کابرا، دیتم بۆخۆی لەســـەر کورسییەک دانیشـــتووە و لاقی هاوێشتووە سەر لاق و هەروا بزەی ســـمێڵانی دێ. پیرەپیاوێکی کەڵەگەت و تەژە و وشک و ڕەق، بەڵام بەداروبار لەبن دیوار هەڵترووشـــکاوە و چوار منداڵی ڕەشـــوڕووت و کز و لەجەر لە دەورووبەری کەوتوون. کچێکی باڵابەرز و ئەسمەر و چاو و برۆ جوان، بەڵام لەڕولاوازیش پاڵی وەکۆڵەکەی بێلاکە داوە. چارەڕشی و نەگبەت لەو دیمەنە دەباری.

- ها کوێخا! ئەوە چییە؟

- قوربان چت لێ وەشارم ئەو کچەم لەو پیرە مەشەدییە کڕیوە.

- کڕیوتە؟ بەچەند؟

وەڵڵا قوربان بەگران، بەپووتێک ئارد. (زەردەخەنەیەکیشی بۆ کرد).

ئاگرم لە جەرگ بەربوو، مچوڕکێکم لەبەری پێوە هات و لە تۆقی سەرم دەرچوو، بەری چاوم تاریک بوو خەریک بووم بەگژ ئەو پیاوە دڵڕەشەدا بێم، بەڵام پیشم خواردەوە، خۆم ڕاگرت و لە مەشـــەدیم پرســـی: ئەو کچە بۆ دەفرۆشی؟ ملی بەلاوە نا، هەناسێکی ساردی هەڵکێشـــا، ئاوی لە چاوی گەڕا و گوتی: دایکی دوو ڕۆژ پێش لە برســـان مرد. بۆخۆشی کەنەفت بووە و هەربینا سلار بۆوە. دەستی بۆ لای منداڵەکان ڕاداشت و گوتی: ئەوانەش برســـین. بۆیەی دەفرۆشم تا بۆخۆی لەبرســـان نەمرێ و ئەوانەش بژێوی چەند ڕۆژێکیان هەبێ. سەربەسەر بەزێرم نەدەدا و ئێستا بەئاردی دەفرۆشم.

لە کچەکەم پرســـی: تۆ بەو کارە ڕازی؟ مێرد بەو کابرایە دەکەی؟ فرمێسکی بەچاوە جوانەکاندا هاتە خوار، بەشەرمەوە گوتی: «نینم ئوشاقلار ئاچدلار». - چ بکەم منداڵەکان برسین - گوتم ئەگەر خێرۆمەندێک ئەوەندە ئارد بدا بە باوکت هێشتا حازری مێرد بەو کابرا پیرە بکەی؟ بە بێزارییەوە گوتی: «یوخ وەڵڵا» - نە بەخودا -.

لـــەو کەیـــن و بەینـــەدا ژن و منداڵی ئاوەدانـــی ئاپۆرەیان لە دەوری مـــن دابوو. لە قســـەکانمان نەدەگەیشتن. نەقڵەکەم لەسەرڕا بۆ گێڕانەوە، ژنەکان تێکڕا گوتیان: ئەیەڕۆ، چ خێر بوو کافرســـتانییە؟ گزیـــرە پیرەیان تف باران کرد و هەموویـــان بەغار چوونەوە

ماڵی خۆیان. ئینسانییەت گەیشتە ئەوپەڕی، دەوڵەمەند و هەژار کەس بەدەستی بەتاڵ نەگەڕاوە. هەریەکە لە قەدەر خۆیان، نان، کولێرە، ئاردی گەنم، جۆ، گەنمەشامی، هەرزن، ماش، نۆک، نیسک، تەنانەت برینج و ڕۆن و جلکە کۆنیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

زگی منداڵەکانیان تێر کرد و توورەکەی مەشەدییان ئاخنی. ئەو وەختە من لە خۆشیان گریام کە دیم منداڵە قۆشمەکانی دێ کە لەسەر دوو شایی میشێن و جگێن و شێر و خەت سەری یەکترییان دەشکاند، بەپەلەپەل و هەلەهەل زارکی کیسە پەڕۆکانیان دەکردەوە و هەرچی قەرەپووڵی هەیانبوو لە مستی پیرە مەشەدییان دەکرد و بۆخۆیان مافنگی دەمانەوە.

هەستی ئینسانی ئەو کیژە کوردانە ئاواتی شەیتانی ئەو دیوەزمە بلەوەزەی کردە بلقی سەر ئاو کە قرمی لەو کچۆڵە بێ دەرەتانە خۆش کردبوو. باربووی ئەو ئینسانە ساکار و پاکانە چەند ئەوەندەی ئەو نرخە بوو کە ئەو گورگە پیرە دەیویست ئەو بەرخۆڵە بێ ئازارەی پێ بکڕێ چەند دڵخۆش بووم کە بەهەمووان نەمانهێشت لە گوندە خونچیلانەکەماندا ئینسان بە ئارد سەودا بکرێ.

تەنگانە بەریان کورتە. گرانی دوایی هات. قاتوقڕی تەواو بوو. خەڵک کەوتەوە سەر کار و کاسبی. بەڵام زۆر کەس لەبرسان مردن، زۆر پیاو لە پیاوەتی کەوتن، زۆر ماڵ لە ماڵ بوون، زۆر کەس لەسەر ساجی عەلی دانیشتن و زۆر ناکەس پێگەیشتن. زۆر گیرفان ئاخندران. زۆر کۆشک قوت بوونەوە و زۆر مافووره ڕاخران و زۆر ماشێن کڕدران.

لە وڵاتێکی بێ سەرەوبەرەدا، لە ڕێژیمێکی کۆنی دەرەبەگایەتیدا هەمیشە بەڵای تەبیعەت زوڵم و زۆر و خراپە و دزی و دەسدرێژی پیاوخراپانیشی لەگەڵە.

ئەو ڕووداوە ناخۆشە زۆری کار کردە سەر هەستی ناسک و شاعیرانەی من و هەروەها زۆریشی تەئسیر کردە سەر وەزعی ئابووری و کۆمەڵایەتی و تەنانەت سیاسی کوردەواری. وەزعی خراپی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی وڵات و نەداری و دەستکورتی زۆربەی خەڵک و زۆرداری کاربەدەستانی دەوڵەت و تاوان و خەیانەتی چینی دەستەڵاتدار بوو بەهۆی ڕاپەڕینێکی فیکری بێ وێنەی زەحمەتکێشانی کوردستان و هەست بەمەسئولیەتکردنی ڕووناکبیرانی شۆڕشگێڕ و لەخۆبوردووی نەتەوەکەمان.

ئەو ڕاپەڕینە فیکرییە و ئەو هەست بەمەسئولیەت کردنە بوون بەهۆی ئەوە کە چینی چەوساوە و توێژی ڕووناکبیری کورد زۆر لە جاران بەبڕواتر و ئامادەتر لە دەوروبەری حیزبی دیموکراتی کوردستاندا کۆ ببنەوە. پاش ڕووخانی کۆماری مەهاباد قەت وەک ساڵەکانی




٢٩ و ٣٠ و ٣١ و ٣٢ هەلومەرجی لەباری عەینی و زەینی بۆ خەباتی ڕزگاریخوازانەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێران هەڵنەکەوتووە.

هەرچەند لەو ساڵانەدا حیزبی دیموکراتی کوردستان لەژێر تەئسیری حیزبی تودەی ئێراندا بوو و ئەوەندە بەرەو خەباتی چینایەتی دەڕۆیشت کە لە خەباتی نەتەوایەتیدا کەمتەرخەمی دەنواند و ئەوەندە بۆ ڕووخاندنی کۆنەپەرستی و دامەزراندنی دیموکراتی لە ئێراندا تێ دەکۆشا کە ئەستاندنی مافە ڕەواکانی گەلی کوردی لە پلەی دووەم دادەنا، بەڵام دیسان بەپشتیوانی چین و توێژە چەوساوەکانی گەلی کورد پشت ئەستوور بوو.

مـن هەرچەند بەپێی توانای خۆم لەو خەباتەدا بەشدار بووم. بەڵام لەبەر نەبوونی چاپەمەنی کوردی نەمتوانی هونەرەکەم وەک پێویست لە ڕێگای خزمەتی گەلەکەمدا لەکار بێنم. لەوکاتەدا کە ڕۆژنامەکانی فارسی بەنهێنی بڵاو دەبوونەوە و پۆلیس نەیدەتوانی بیان دۆزێتەوە، بێگومان دەشکرا چاپەمەنی کوردی بڵاو بێتەوە. بەڵام بەڕێوەبەرانی ئەو سەردەمی حیزب لەبەر بێ ئەزموونی ئەوەیان بەلاوە گرینگ نەبوو.

ئەودەمیش بڕوام وابوو و ئێستاش هەر لەسەر ئەو بڕوایەم کە دەبێ زەحمەتکێشانی کورد بەزمانی خۆیان بدوێنین و دەبێ ڕووناکبیرانی کورد بەزمانی ساکارترین ئینسانی کورد مەسایلی سیاسی و کۆمەڵایەتی بنووسن و کۆمەڵانی گەلەکەیان ڕێنوێنی بکەن. بەڕاستی هەم لەباری خزمەتکردن بەزمان و ئەدەبی کوردی و هەم لە باری ڕووناک کردنەوەی بیروڕای سیاسی چینە چەوساوەکانی کوردستان هەلێکی گەورەمان لەدەست دا.

حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکانی ئێران بەتایبەتی حیزبی تودەی ئێران و جەبهەی میللی و پیاوە ئازادیخوازە سەربەخۆیەکان خەباتێکی ڕێکوپێکیان دەست پێکردبوو. ڕۆژنامەکان حەقایقیان ڕوون دەکردەوە و تاوانەکانی ڕێژیم و گەندەڵ فێڵی ئیمپریالیزمیان ئاشکرا دەکرد. کۆنەپەرستی لە مێژینەی ئێران ڕۆژ بەڕۆژ پاشەکشەی دەکرد و سەنگەرەکانی لێ دەستێندران. دەوڵەتەکانی دەستکردی ئیمپریالیزم و نوێنەری کۆنەپەرستی خۆیان نەدەگرت و یەک بەدووی یەکدا دەڕووخان. ڕەزمئارا ئەفسەری بەهێز و بەدەسەڵاتی ئەرتشی ئێران وەک ئاخرین تیری تەرکەشی کۆنەپەرستی هاتە سەر کار. بەڵام بێگومان ئەگەر نەشکوژرابا نەیدەتوانی بەری لافاوی بەتەوژمی خەباتی ئازادیخوازان بگرێ و قازانجی شیرکەتی نەوت بپارێزێ و دەسەڵاتی دەرباری کۆنەپەرست و سەر بەئیمپریالیزم بێنێتەوە سەر دەقی جاران و ئەویش هەر تێدا دەچوو و مێژووش ڕێگای خۆی هەر دەبڕێ.

خەباتی شێلگیر و بێ وچانی گەلانی ئێران نیشتمانپەروەری بەناوبانگ دوکتور




موســەدیقی هێنا ســەر کار. ئەو پیاوە بەجەرگ و نەبەزە خەباتـــی گەلانی ئێرانی ژیرانە ڕابــەری کــرد و توند بەگژ ئیمپریالیزمدا چوو. ســەنگەرەکانی یەکیەک پێ بەتاڵ کرد تا بەجارێکی پشتی شکاند و نەوتی ئێرانی میللی کرد و دەستەلاتی شوومی شیرکەتی نەوتی ئینگلیسی لەناو برد کە لەمێژساڵ بوو وەک دەوڵەتێکی گچکە و بەهێز لەناو دەوڵەتی بێ هێزی ئێراندا ڕەگی داکوتابوو.

بەبڕوای شەخســـی من ئــەو پیاوە مەزنە هەڵەیەکی مێژوویی کــرد، ئەویش ئەوە بوو ئەوەنــدەی بەگژ دوژمنـــی دەرەوەدا چوو بەگژ دوژمنی ناوخۆدا نەچوو. ئەو کەســـەی لە ڕۆژی ٣٠ی پووشپەڕی ١٣٣١دا ئەو فیداکاری و گیانبازی و پشتیوانییەی لە گەلانی ئێران دیبو نەدەبوو بەسەر کۆنەپەرستییەوە بچێ و دەبوو ڕەگوڕیشەی دەربهێنێ. کۆنەپەرستی لە هەموو شــوێنێکی جیهاندا بۆ پاراســـتنی دەســـتەلاتی خۆی دەســـت لە هیچ تاوانێک ناگێڕێتەوە. بۆیە دەبێ ئازادیخوازانیش لە دەرفەتی ئەوتۆدا دەستی لێ نەپارێزن. دەیتوانی هەر لە ڕۆژەکانی پاش ٣٠ پووشپەڕی ١٣٣١دا شوێنەواری کۆنەپەرستی لە ئێراندا نەهێڵی و ئەوەندەی بێهێز بکا کە نەتوانێ ڕاست بێتەوە و سەرلەنوێ وەک داردەستی ئیمپریالیزم بێتەوە سەر کار.

بەدرێژایی حکوومەتی دکتور موســـەدیق کۆنەپەرســـتی لە ئێرانـــدا بەرەو کەم هێزی دەچوو و لە هێندێک جێگادا تەواو بێ دەســـتەلات ببوو. بەلام بەداخەوە لە کوردســـتاندا هەرچەند هێز و گوڕی جارانی نەبوو هێشتا بەتەواوی لێ نەکەوتبوو.

ئەرتەش بەپشـــتیوانی دەرەبەگەکانی خۆولاتی زۆرجار بەرەنگاری خەباتی گەلی کورد دەبوو و زەبری لێدەوەشاند.

جووتیارەکانـــی کوردســـتانی ئێران لە ســـاڵی ١٣٣١ ـ ١٩٥٢دا لـــە دژی زوڵم و زۆر و چەوەســـاندنەوەی دەرەبەگەکان ڕاپەڕین و بۆ یەکەم جار لە مێژووی کوردســـتانی ئێراندا ناتەبایی چینایەتی گەیشتە ڕادەی تەقینەوە و چینی چەوساوەی ولاتەکەمان بۆ ماوەیەکی کورت لە بەشێکی کوردستاندا توانی بەسەر چینی دەستەلاتداردا زاڵ بێ.

جووتیارەکان هەر بەهێـــزی خۆیان توانیان لە بەری فەیزوڵلابەگیان و چۆمی بۆکان و چۆمی مەجیدخان و شـــامات و بەشـــێکی محاڵ بێ خوێنَ ڕێژی و ئازاردان و خراپە لەگەڵ کردن ئاغاکان لە گوندان دەربکەن و بەخاو و خێزانەوە لە شـــاری بۆکانیان پەســـتێون و لەوێشدا گەمارۆیان بدەن و بەپەلە خەریکی چەکداربوون بن.

بێگومان ئەگەر لەو ســـەردەمەدا رابەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردســـتان دروشـــمی

خەباتـــی چەکدارانـــەی هەڵبگرتبایە و ئەزموونی شۆڕشـــگێڕانەی هەبایـــە و جڵەوی ئەو ڕاپەڕینـــەی بەدەســـتەوە گرتبایە و چیـــن و توێژەکانی دیکەی بۆ یارمەتی و پشـــتیوانی جووتیاران هان دابایە، ئەو ڕاپەڕینە زۆر زوو دەبوو بەناوەندی شۆڕش. شۆڕشێکی ڕەسەن و بەرین، شۆڕشـــێکی سەرانسەری کوردســـتان و لەوانەبوو زۆر زوو بتوانێ مافە ڕەواکانی گەلی کورد لە چوارچێوەی ئێرانێکی دیموکراتدا بچەسپێنێ و جووتیارانی کوردستان ڕزگار بکا. داخی گرانم ئەو هەلە لەبارە و ئەو دەرفەتە باشە کەڵکی لێ وەرنەگیرا. بێ ئەزموونی خۆمان پتر لە هەموو هۆیەک شۆڕشـــی کوردستانی ئێرانی وەدواخست. چین و توێژەکانی دیکەی کوردســـتان یارمەتی ڕاپەڕینی جووتیارانی کوردســـتانیان نەدا و دەستیان لەسەر دەست دانا.

ســـەرتیپ موزەفـــەری فەرماندەی تیپی مەهاباد بەســـوپا و لەشـــکر و تانک تۆپەوە بەهـــاواری دەرەبەگەکانـــەوە چـــوو و ڕاپەڕینی جووتیاران و وەرزێرانـــی زۆر بێڕحمانە و بەتوندی سەرکوت کرد.

دەرەبەگەکانی فەیزوڵڵابەگی و دێبوکری بەپشتیوانی ئەرتەش و یارمەتی قوڵەئاغاکانی محاڵ و شـــارۆیران لە وەرزێران وەخۆکەوتن. لێیـــان دان، دەریان کردن، تاڵانیان کردن و کوشتیانن و لاشەی دەیان وەرزێری شۆڕشگێڕ و تێکۆشەریان بەچۆمی بۆکان دادا.

حکوومەتی نیشتمانی موسەدیق نەیتوانی پێشی ئەو تاوان و جینایەتە ئاشکرایە بگرێ. حیزبـــی تودەی ئێران بەو هەموو هێزەی کە ئەو ســـەردەمی هەیبو نەیتوانی ئەو ڕاپەڕینە بپارێزێ و بچووکترین یارمەتی پێ بگەیەنێ.

جارێکی تر بەچاوی خۆم تێشـــکانی ڕەســـەنترین ڕاپەڕینی گەلەکەم دی. ئەگەر گوتم ڕەسەنترین ڕاپەڕین پێم وایە بەهەڵە نەچووم، چونکە ئەو ڕاپەڕینە لەناو زەحمەت کێشترین چینەکانی خەڵکی کـــوردەواری و لەخۆوە هەڵقوڵیبو. یەک دوو کەس نەبێ نوێنەری هیچ چین و توێژێکی کوردستان تەنانەت وردە بۆرژوازیشیان لەگەڵ نەبوو. ڕاستە بەشی زۆری ئەو وەرزێرانە ئەندامی بەوەفای حیزبی دیموکراتی کوردســـتان و دۆستی بەئیمانی حیزبی تـــودەی ئێران بوون. بەڵام بەداخـــەوە ڕابەرایەتی حیزبی دیموکراتی کوردســـتان درەنگ جووڵایەوە و نەیتوانی ئەو ڕاپەڕینە ڕەســـەنە بەچاکی بەڕێوەبـــەرێ. بێگومان ئەگەر ئەو ڕاپەڕینـــە باش ڕابەری کرابا لەو کاتەدا کە کۆنەپەرســـتی لەوپەڕی بێهێزیدا بوو زۆر زوو دەیتوانی هەموو کوردستان بتەنێتەوە و ببێتە سەرەتای شۆڕشێک کە پێم وایە درێژخایەن نەدەبوو.





لە ساڵی ١٣٣٢دا خەباتی گەلانی ئێران بەڕابەرایەتی موسەدیق سەرنجی دنیای بۆ لای خۆی ڕاکێشا و موسەدیق بەیەکەم شەخسی ساڵ ناسرا.

خەباتی حیزبی دیموکراتیش بارێکی لەبارتری بەخۆیەوە گرت و تا ڕادەیەکی زۆر پێشی چەپڕەوی منداڵانە کە ڕاست و ڕاست بەقازانجی کۆنەپەرستی تەواو دەبوو گیرا.

منیش پاش چەند ســاڵ تووشی لاوێکی ڕووناکبیر و تێکۆشەری کورد هاتم کە چونکە ئازادیخوازێکی شــێلگیر بوو بڕوای بەچارەســەرکردنی مەســەلەی نەتەوایەتی هەبوو و لە زمانی یەک دەگەیشتین.

من لەمێژ بوو هاوارم دەکرد، بابە ڕاســتە ڕۆژنامەکانی سەر بەحیزبی توودە ڕۆژنامەی چاک و بەکەڵکن (بەڕاســتیش وا بوون)، بەڵام دەردی ئێمە دەرمان ناکەن. بەشــی زۆری گەلەکەمان فارسی نازانێ و لە مەبەستی ڕۆژنامەکان ناگا و لەسەر مەساییل ڕوون نابێتەوە، بــەڵام بەداخــەوە زۆرم گوێ نەدەدرایە و تەنانەت چەپڕەوی وامــان هەبوون کەلە عەینی نەخوێنــدەواری و نەزانیدا گاڵتەیــان بەو جۆرە بیروبڕوایە دەکــرد و بەردیان لە ئەژنۆی خۆیان دەدا.

ئەو لاوە لە قسەم گەیشت، دەستەڵاتیشی زۆر بوو. بڕیارمان دا ڕۆژنامەی «کوردستان» ڕۆژنامەی حیزبی دیموکراتی کوردستان یادگار و خۆشەویستی پێشەوای نەمرمان سەرلەنوێ چاپ بکەینەوە و بەزمانی ســاکاری کوردی لەگەڵ زەحمەتکێشــانی گەلەکەمان بدوێین و لەســەر مەســاییل ڕوونیان بکەینــەوە. خەریک بوو ئاواتی لەمێژینــەی من بێتە دی، کە بەداخەوە کودێتای شــووم و ڕەشــی ٢٦ی گەلاوێژ بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ لێکی جوێ کردینەوە و وەک بابردەڵە هەریەکەی بۆ لایەک هەڵداشتین.

ئەو لاوە تێکۆشەرە پاش چەند ساڵ ئاواتی منی هێنا دی و توانی ڕۆژنامەی کوردستان چاپ و بڵاو بکاتەوە. چوار ژمارەی ئەو ڕۆژنامەم پێگەیشت. بەڵام ژمارەی پێنجی هەرگیز نەگەیشتە دەستم، چونکە ئەو کەسەی ڕۆژنامەکەی بڵاو دەکردەوە بەخۆی و ڕۆژنامەکەیەوە گیرا و هەموو ژمارەکانی لەناو چوون. من ئەگەرچی زۆرم پێ خۆش بوو لەگەڵ ئەو ڕۆژنامە هاوکاری بکەم و شــتی بۆ بنووســم، هەلومەرجێکی نەهێنی ئەوتــۆ لەگۆڕێدا بوو کە پێ ڕانەگەیشتم هیچی بۆ بنووسم.

زۆر شــت لەســەر کودێتای ڕەش و شــوومی ٢٨ی گەلاوێژ نووســراوە و گوتراوە و دووپاتەکردنەوەیان لێرەدا بێجێیە. بەڵام چونکە ئەو کودێتایە تەئســیری ڕاســتەوخۆی لەســەر ژیانی من هەبووە و منیش یەکێکم لەو کەسانەی وەبەر پەلامار هاتم و زۆرم ڕەنج




و کوێرەوەری و ئازار دیت و گەلێکم زیانی ماڵی پێگەیشت و دەرد و سزام چێشت، ویستم هەروا بەسەریدا تێنەپەڕم.

لە ڕیفراندۆمی موسەدیقدا هێزی کۆنەپەرستی و هێزی ئازادیخوازی زۆر باش ڕادەی دەستەڵاتیان دەرکەوت، بەتایبەتی لە کوردستاندا، بۆ نموونە لە شاری مەهاباد کە دەنگدان ئازاد بوو و وەک گوتم هێشتا کۆنەپەرستی و ئەرتەش کەم تا کورتێک جووڵەیان مابوو، تەنیا دوو کەس بەقازانجی دەربار دەنگیان دا، ئەویش وەک شاهیدێکی زیندوو ئاگام لێ هەیە لاوێکی زۆر پاک و چاک لە داخی چەپڕەوی ئەندامێکی بێکەڵکی حیزب دەنگی دا و پتر لە پێنج هەزار دەنگ بەقازانجی موسەدیق درا. بەوەڕا دیارە خەباتی دژی ئیمپریالیستی چەندی پەرە گرتبوو. خەڵک لەمێژبوو خەریک بوو جێژنی دامەزراندنی حیزبی دیموکراتی کوردستان بگرێ. کەچی خواوڕاستان لەڕۆژی ٢٥ی گەلاوێژی ١٣٣٢دا جێژنەکەیان بوو بەدوو جێژن. لەو ڕۆژەدا بوو کە شا لەبەر تەوژمی شەپۆلی تووڕەیی خەڵک خۆی نەگرت و ڕای کرد و بەرەو بەغدا هەڵات. لەوێش نەگیرساوە و هەی دێ بۆ ئیتاڵیا. بەڕاستی ڕۆژێکی خۆش بوو. دوکان و بازاڕ داخران و خەڵک ڕژانە ناو کووچە و خەیابان. بوو بەهوڕاکێشان و چەپڵەڕێزان و سەما و هەڵپەڕین. ژن و پیاو و گەورە و بچووک لەو زەماوەندەدا بەشداربوون. کۆبوونەوەیەکی گەورەی حیزبی لە مەیدانی شار کرا. منیش پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان بۆ یەکەم جار شێعرم بۆ خەڵک خوێندەوە. دیارە شێعرەکانم بەپەلە دروست کردبوو و لە باری هونەرییەوە زۆر باش نەبوون، بەڵام چونکە ئیلهامم لە خەڵک وەرگرتبوو و بۆ خەڵک بوون، دوو سەعات پێ نەچوو گەورە و بچووک و ژن و پیاو و منداڵی شارەکەمان سەربەندی شێعرەکەمیان دەخوێندەوە و دەیانگوت (دەبڕۆ ئەی شاهی خائن بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ).

سێ ڕۆژان دەنگی دەهۆڵ و زوڕنا و تریقەی پێکەنین و ڕمبەی هەڵپەڕین لە مەهاباد نەبڕایەوە. بەڵام بەداخەوە ئەم کەیف و نەهەنگ و بەزم و زەماوەندە زۆری درێژی نەکێشا و ڕۆژی ٢٨ی گەلاوێژی ١٣٣٢ کودێتای شووم و ڕەش و دژی گەلی - دالیس - ئەشرەف - زاهیدی سووک و هاسان سەرکەوت. زاهیدی ئەو ئەفسەرە فاشیست و کۆنەپەرستەی کە ڕۆژگارێک بەتاوانی جاسووسی ئاڵمانی نازی لەلایەن ئینگلیس و ئەمریکاوە گیرا. ئێستا بەقازانجی ئەوان و دەرباری کۆنەپەرست ڕابەری کودێتای بەدەستەوە گرت و بەسەرکردەیی ژمارەیەکی کەم لە ئەفسەرانی کۆنەپەرست و دەرکراوی ئەرتەش و دەستەیەک پیاوخراپ و کەتە و کۆشە و بەپشتیوانی ئیمپریالیزمی ئینگلیس و ئەمریکا توانی جووڵانەوەی ئازادیخوازی پەرەگرتوو و بەربڵاوی ئێران سەرکوت بکا و دەوڵەتی نیشتمانی موسەدیق

بڕووخێنێ و دەســتەڵات بداتەوە دەست کۆنەپەرستی و شای ڕاکردوو، شای بەزیو و شای خوێنڕێژ و پیاوکوژ بگەڕێنێتەوە سەر تەختی شوومی پاشایەتی و ڕۆژی ٢٨ی گەلاوێژ بکا بەسەرەتای سەردەمێکی ڕەش و شووم و خوێناوی مێژووی ئێران.

من بۆخۆم پێم وانەبوو کۆنەپەرستی بەهەڵاتنی شا لە ئێراندا بنەبڕ دەبێ و ئیمپریالیزمی جیهانی وا ســووک و هاسان دەست لە خەزوبەز و خێروبێری ئێران هەڵدەگرێ، بەڵام قەت خەیاڵیشــم نەکرد وا بەهاســانی زاڵ بێتەوە. چونکە جووڵانەوەی ئازادیخوازی ئێران زۆر بەهێزتر لەوە دەهاتە پێش چاو.

من نامەوێ بچمە قووڵایی مەسەلەکەوە. بەڵام ئەوەندە دەڵێم ئەگەر ڕابەرانی جووڵانەوەی ئازادیخــوازی لە تاران وەدەســت دەهاتن و بەرەنگاری کودێتاچییــەکان دەبوون، هەرگیز کۆنەپەرســتی نەیدەتوانی بەسەر جووڵانەوەی ئازادیخوازیدا زاڵ بێ و شا بگەڕێتەوە ئێران وڵاتەکەمان بکاتە گۆمی خوێن و ئەو هەموو ئینسانە بەشەرەفە بکوژێ و ئەو هەموو خوێنە پاکانە بڕێژێ و ئەو هەموو خەیانەتە بەگەلانی ئێران بکا.

پاش نیوەڕۆی ڕۆژی ٢٨ی گەلاوێژ زۆر بەزەحمەت توانیم خۆم دەرباز بکەم و لە مەهاباد وەدەرکــەوم و ملی چیا بگرم. ماوەیەکی زۆر بەکێوانەوە بووم، شــەوانە خۆم لە گوندێک دەکوتا و نان و ئاوێکم دەخوارد و بەڕۆژ وەچیا دەکەوتم.

پۆلیس زۆر بەتوندی لێم دەگەڕا و هەڕەشــەی کوشــتنی لێ دەکردم. بەڵام شوێنی بۆ هەڵنەدەگیــرام. ئەوەش لە ســایەی یارمەتیدانی خەڵک بوو. هەمــوو کەس ڕای دەگرتم، نانی دەدامێ، دەیشــاردمەوە، تەنانەت ئەوانەی زۆر بەشاپەرست مەشهوور بوون بەڕاستی چاکەیــان لەگەڵ کــردم و زۆریان مەمنوونم. بەڵام بۆیە ناویــان نابەم بۆخۆیان ڕەنگ بێ پێیان باش نەبێ.

پۆلیس کە دەستی وەمن ڕانەگەیشت کەوتە ئازاردانی بابم. ئەوە منی زۆر ناڕاحەت کرد. بابێکی پیر و موحتەرەم کە ماڵی پەناگای لێقەوماوان بوو، ئێســتا لەسەر من سووکایەتی پێدەکرا. ئێستاش کە ئەوەم وەبیردێتەوە ناڕاحەت دەبم. بەوەشەوە ڕانەوەستان و گیشەی گوندەکەیان تێکڕا ســووتاندین. وڵاتی ئێمە زۆر کوێستانە. ساڵی وا هەیە پێنج مانگ بەفر عەرز بەرنادا و حەیوان و ئاژەڵ لەســەر ئاخۆر و دانگەیە. لەبەر ئەوە ناچارە گیا و وێنجە و کۆدە و گزرە تفاقێکی زۆر داخا. بەداخەوە لە قەدیمەوە عادەتێکی خراپ لە کوردەواریدا هەیە هەر کەس ڕقی لە یەکێک هەســتا و بەئاشــکرایی نەیوێرایە گیشــەی دەسووتێنێ. پیاوەکانی پۆلیس بەدزی گیشــەی گوندەکەی ئێمەیان کە بەسەر یەکەوە داندرابوون ئاگر

تێبەردا. بێگومان زەرەری ئەو سووتمانە لە سەد هەزار تمەن زیاتر بوو. ئێستاش کە وەبیرم دێتەوە خەڵکی هەژار و زەحمەتکێش و بێتاوان لە سۆنگەی مندا ئەو هەموو زیانەیان پێگەیشت و بەرهەمی شان و پیلیان بوو بەژیلەمۆ و ئاژەڵە بەستەزمانەکانیان بێ تفاق مانەوە، کزەم لە جەرگی دێ و لەکن ویجدانی خۆم شەرمەزار دەبمەوە و خۆم بەپشیلەی ڕەجەبە شێت دەزانم.

پاش ٢٨ی گەلاوێژ زۆر لە ئەندامانی حیزب ڕوویان لەنێو مەنگوڕان کرد. عەشیرەتی مەنگوڕ بەپانەوە، بەئاغا و ڕەعیەتەوە، بەنەدار و دەوڵەمەندەوە باوەشیان بۆ کردنەوە.

هەرچەند هێندێک لە تێکۆشەران پێشنیاری هەڵاییساندنی شۆڕشی چەکداریان دا و لە بیرمە کاغەزێکم بۆ هات کە چاوەنۆڕ بە بەو زووانە چەک بڵاو دەکەینەوە و شۆڕش دەست پێ دەکرێ، بەڵام چ باس نەبوو. بێگومان لەو وەختەدا کە عەشیرەتی مەنگوڕ لەو شوێنە سەخت و قایمەدا هاوکاری حیزبی دەکرد، دەس پێکردنی شۆڕشی چەکدارانە کارێکی محاڵ نەبوو. پێم وایە دەوڵەت هەستی بەوە کرد و گیراوەکانی بەردان و خەڵکی دامەزراندەوە. منیش پاش چوار مانگ دەربەدەری توانیم بچمەوە ماڵی خۆم و دامەزرێمەوە. لەو ماوەدا بەڕاستی ڕەنج و کوێرەوەرییەکی زۆرم دی و هێز و توانام لەدەست دا.

ئەوەبوو بەسەرهاتی منداڵی و لاوی من. چونکە ڕەنج و کوێرەوەری ژیان لە ٣٠ ساڵیدا منی پیر کرد، سەروڕیشم بۆز بوو، ددانم شاش و واش بوون، چاوم حوکمی کەم بوو، هێز و توانام ڕۆژ بەڕۆژ لە کەمایەسی دا، هەموو شتم بەرەو نەمان چوو. بێجگە لە هەستی شاعیرانەم کە بەبڕوای خۆم تا ئێستاش هەر لە زێدەبییە و کەمی نەکردووە.

لە ساڵی سی و دووڕا هەمیشە لەژێر چاوەدێری پۆلیسدا بووم و پۆلێکم جاسووس لە دەوروبەری گەڕان.

ساڵی ١٣٣٨ ساڵێکی زۆر شووم بوو لە مێژووی ژیانی مندا. لەو ساڵەدا سازمانی ئەمنیەت گەورەترین زەبری لە حیزبی دیموکراتی کوردستان و جووڵانەوەی ئازادیخوازانەی گەلی کورد وەشاند، کە بێگومان لەو سەردەمیدا دەکرا بە بەهێزترین ڕێکخراوی سیاسی ڕێکوپێکی ئێرانی بزانی.

منیش لەو سەردەمەدا تووشی نەخۆشییەکی ڕووحی هاتم. ناهومێدییەکی ڕەش ئاسۆی ژیان و بیرکردنەوەی داگرتم. ئەو ناهومێدییە زۆر جار تا حاڵی خۆکوشتن پاڵی پێوەنام. نامەوێ ئەو تاوانە باوێژمە سەر ئەستۆی کەس. بەڵام ئەوەندە دەڵێم ناتەبایی و ناکۆکی ناو خێزان و بنەماڵەی خۆمان زۆری کار کردە سەر من. هەڵەی وام کردن کە نەدەبوو بەهیچ




نرخێک بیانکەم و بەسەر پەلی وادا کەوتم کە دەبوو خۆیان لێ بپارێزم. دوو ساڵی زۆر تاڵ و تفت و پڕ ڕەنج و کوێرەوەریم ڕابوارد و هەزارجار مەرگم بەئاوات خواست. بەڵام لەپڕ ئەو مژ و هەورە ڕەوی و گزنگی هیوا سەرلەنوێ لە ئاسۆی ژیانمدا ئەنگوت.

لاوێکی ڕووناکبیر و کوردێکی پاک و بەشەرەف کە بەداخەوە ناکرێ ناوی بەرم خۆی و ڕەفیقانی ئەو لەو ماوەدا زۆر لە هانام هاتن و زۆرم لەگەڵ ماندوو بوون. لە ساڵی ١٣٤٠دا سەرلەنوێ تێ هەڵچوومەوە و هاوکاری ئازادیخوازانم دەست پێکردەوە، دەستەیەک ڕەفیقی تازە و تێگەیشـــتوو و ڕووناکبیرم پەیداکردن، لەباری هونەریشـــەوە شێعرەکانم نەک هەر باشتر بوون، بەڵکە بەبڕوای خۆم تێیان پەڕاند.

لە ساڵی ١٣٤٤دا لاوێکی یەکجار خۆشەویست و خزمێکی زۆر نیزیکم کە لە دەرەوەی وڵات دەژیـــا و دەیخوێنـــد و هیوایەکی زۆرم پێ هەبوو مرد، ئەو ڕووداوە زۆری پەرێشـــان کردم.

هێندە پێ نەچوو لە سەفەردا بووم کە خەبەری جەرگبڕی مردنی بابمیان دامێ. ناتوانم شـــەرحی تەئسیری ئەو خەبەرە لەسەر هەستی خۆم بدەم. ئێستا کە ئەو دێڕانە دەنووسم بەزەحمەت فرمێســـکم بۆ ڕادەوەستن. ئەوەندە دەڵێم دەردی باب مردن دەردێکی گرانە و پیاو لە هەر تەمەنێکدا بابی بمرێ هەست بەهەتیوی دەکا.

دوو ســـاڵ پاش دایکیشـــم مرد. بابم پیاوێکی بەزیبک و زاکوون بوو. قەتی ڕوو نەدەدا منداڵەکانی. تەنانەت بەپیریش من جگەرەم لەکن نەدەکێشـــا. دایکم زۆر سەر و ڕووخۆش بوو و منی لە هەموو منداڵەکانی خۆشـــتر دەویســـت، کەچی پێم سەیرە مەرگی بابم زۆر پتری کار کردە سەر من و پتری پەرێشان کردم.

ساڵی ١٣٤٧ لە حاڵێکدا کە زۆر دەوڵەمەند و تێروپڕ بووم و ماڵ و دەوڵەتێکی زۆر لە پێویستی خۆم زیاتر هەبوو و پیر و کەنەفتیش بووبووم و دەمەویست گۆشەگیری بکەم و لەناو ژن و منداڵی خۆمدا بحەسێمەوە، زوڵم و زۆری ڕێژیم نیسبەت بەگەلی کورد گەیشتە ڕادەیەک کە بۆ هیچ ئینســـانێکی خاوەن شـــەرەف قبووڵ نەدەکرا. من چۆن چاوم بەرایی دەدا لاوانی تێکۆشـــەر و ڕووناکبیری کوردم هەر بەو تاوانە داوای مافی ڕەوای نەتەوایەتی خۆیان دەکرد، لە پێش چاو بکوژن و بەوەشـــەوە ڕانەوەســـتن تەرمـــی خوێناوی و کون کراویان بەشار و بازێڕاندا بەچەپڵەڕێزان بگێڕن و داوەت و سەمای لە دەوری بکەن؟ ناچار بەپیری ســـەری خۆم هەڵگرت و بەداری دەستی ڕووم لە وڵاتی غەریبایەتی کرد و دەستم لە ژن و منداڵ و کەســـوکار و یار و دیار هەڵگرت. ئەوە پێنج ســـاڵ و چەند مانگە ئاوارە

و دەربەدەر دەخولێمەوە و هەزار گوتەنی هەر شەوە میوانی خانەخوێیەکم و هەر ڕۆژە لە جێیەک. زۆرم کوێرەوەری و چەرمەسەری چێشتوە، زۆرم شەو و شەونخونی کێشاوە، زۆرم نەداری و ڕووتی دیوە. ئەگەر ژیانی ئەو چەند ساڵە بنووسم خۆی سەدان لاپەڕە کاغەزی بەش ناکا. بەڵام نەهێنی کاری ئیجازە نادا.

خۆێنەوەری خۆشەویست هیوادارم توانیبیم تا ڕادەیەک خۆم بە تۆ بناسێنم. دیارە تۆش چاوەنۆڕی ئەوە نی هەموو رازەکانی خۆم بۆ تۆ گێڕابێتەوە.

من ئینســانم نە مەلاییکەم و نە پــەری، دەخۆم، دەنووم، شــاد دەبم، وەڕەز دەبم، دەگریم، پێدەکەنم، دەترسم، ناهومێد دەبم، داروبەرد نیم. لەو ماوە دوور و درێژەی ژیانمدا زۆر کاری چاکم کردووە و بەسەر خراپەشدا کەوتووم. تەنیا کارێکی خراپی کە دڵنیام قەتم نەکــردووە دزییە. ئەویش قەت ئەوەندە موحتاج نەبــووم مەجبوور بم دزی بکەم. بەچی مەعلووم ژیان ئەوەندەم موحتاج نەکا تووشی ئەو گوناهەش بم کە زۆرم پێ گەورەیە؟

نیوە شەوی سێی ڕێبەندانی ١٣٥٢، ٢٤ی ژانویەی ١٩٧٤ و یەکەمی موحەڕڕەمی ١٣٩٤ لە نووســینەوەی ئەو سەرگورشتە بوومەوە. ئێستا لە شارێکی دوور وڵات بەتاقی تەنێ لە ژوورێکی ڕەق و ڕووق دانیشــتووم. هەموو سامانم تەختێک و دەستێک نوێن و دوو دەست بەرگی کۆن و نوێ و چەند کراســی چڵکن و چەمەدانێک و ســاکێکی دەستی و چەند جلد کتێب و کۆڵێک کاغەزی بڵاوە و ئەسپێ لە گیرفانمدا سەوزەڵەتان عەرز دەکا. بەڵام زگتان پێم نەســووتێ. ئەو ژیانەم بۆخۆم هەڵبژاردووە و دەنا دۆستی وام هەن ئەگەر حەز بکەم پارووی لە زاری خۆیان دەردێنن و لە زاری منی دەنێن.

تا ئەو نوختەم دانا زیندوو بووم و پشووم دەهات و دەچوو و هیچ ڕەنگ مردن نەبووم. جا نازانم کەی سەر دەنێمەوە و کۆچی دوایی دەفەرمووم؟

لێرەشــدا دەمەوێ شتێک بڵێم، بەپێچەوانەی زۆر هونەرمەندی کورد من لە نەتەوەکەی خۆم ڕازیم. کەس تا ئێســتا بێ حورمەتی پێ نەکردووم. داوای دراو و ماڵیشــم لە کەس نەکردووە تا بزانم دەمداتێ یا نا. لە لێقەومانیشدا نانیان داومێ و ڕایان گرتووم.

شێعریشم تەنیا بۆ دەربڕینی ئیحساسی خۆم داناوە و هیچ هەقم نییە منەتیان بەسەردا بکەم. ئەوان پێیان ناخۆش بێ یا خۆش من کە شێعرم بۆ هات ناتوانم نەیڵێم.

«گەلێــک قســەم لــە دڵا بــوو، حیکایەتــم مابــوو
کەچــی لە بەختــی کەچم خامــە نووکی لێرە شــکا»




لەبەر شکانی نووکی خامە نییە کە لە گێڕانەوەی حیکایەتی خۆم واز دێنم. نا من وەک هەموو ئینسـانێکی کورد بەتایبەتی کوردێکی ئێرانی هێشـتا لە دنیایەکی پڕ لە ئەسراردا دەژیم و ناکرێ ڕازەکانی دەروونم هەڵڕێژم. تۆ بڵێی کورد بگاتە جێگایەک و منیش ئەوەندە بژیم هەرچی دەیزانم بینووسم و قازانجی لە زیان پتر بێ؟

ئینسانم.

ژیانم پێ خۆشە.

پێم خۆشـە لە شـاری ئاوەدان، لە شـەقامی پاک و خاوێن لەگەڵ خۆشەویستەکانم بگەڕێم. پێم خۆشـە لە ژووری گەرموگوڕ لەسـەر نوێنی نەرم وەرکەوم. پێم خۆشە سەر وەباسکێکی نەرم و نۆڵ بکەم. پێم خۆشە کام خۆراک خۆشە لەپێشم بێ، پێم خۆشە کام شـەراب چاکە لە جاممدا بێ. دەمەوێ سەما و هەڵپەڕینی نازداران تەماشا بکەم. دەمەوێ جوانترین بالە ببینم، بۆ چاکترین ئۆپێرا گوێ ڕابگرم. دەمەوێ بەرزترین سەمفۆنیم بۆ لێ بدرێ. نامەوێ دەربەدەر و سەرگەردان بم، بەتەنێ بەکێو و شاخاندا بگەڕێم. لە ئەشکەوت و زەندۆڵان بخزێم، لەسەر بەردی ڕەق بنووم. قۆنداغی ڕەق و ساردی تفەنگ بکەمە سەرین. نانی وشـک و کەڕواوی بخۆم، ئاوی سـوێر و گەرم بخۆمەوە، پێم خۆش نییە لاقەفرتە و چەنگەکـڕەی نیوەگیانان ببینم، خوێن و فرمێسـکم وەبەر چـاو بکەوێ، پێم خۆش نییە بەتەقەی تفەنگ و گرمەی تۆپ و هاڕەی تەیارە ڕابچەنم.

بەڵام چبکەم؟!

کوردم

کۆیلەم

ئەوانە هەموو و تەنانەت کوژران و کوشتنم پێ لە کۆیلە خۆشترە.

هێمن

٣/ ١١/ ٥٢



# کوردم ئەمن

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لەدەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم، مەردم ئەمن
ئاشقی چاوی کەژاڵ و گەردنی پڕ خاڵ نیم
ئاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
گەر لەبرسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن
من لە زنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نییە
لەت لەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

شیلان ئاوێ ۱۳۲۱ ـ ۱۹۴۲

***

# وتوووێژی کچ و کوڕ

کاکە گیان لاوی کوردی شۆخ و شەنگ
تا کەنگێ دەبێ وا بێ هەست و دەنگ
دیلی، ژێر دەستی، ئەسیری، تا کەی؟
ڕووتی، نەداری، فەقیری، تا کەی؟
لە ژێر زنجیر و کۆتا دەناڵی
مەگەر دێوانەی، شێتی، عەودالی؟
تێفکرە خەڵکی هەموو ئازادە
هەر تۆ خەمناکی هەموو کەس شادە
وەرە مەیدانی لە ڕێی نیشتمان
بکە قوربانی سەر و ماڵ و گیان

کوڕ:

دێدە گیان کچی کوردی ژیکەڵە
داوێنی پاکت دووربێ لە پەڵە
(لینین) ڕاپەڕی ماڵی چار شێوا
تۆ هێشتا حەپسی لە ژێر چارشێوا
کچی هەموو کەس ئیمڕۆ سەربەستە



هەر هەقی کچی کوردە پێ پەستە
بپسێنە لە پێ تۆ زنجیر و کۆت
دێدە گیان بدە یاری برای خۆت
لە گوێن (ژاندارک) هەستە وەک مەردان
دوژمن وەدەرنێ لە خاکی کوردان

١٣٢١ - ١٩٤٢

***

## خاوەنی زێڕ

لەبـــار و قیـت و قـۆزە خاوەنـی زێـڕ
ئەگـەر کـوورە و وەگەر گۆجە و شـەل و گێڕ
بـەژن باریـك و شـووش و شـۆڕەلاوە
ئەگـەر پیرێکـی خوێـن تاڵـە و ورگ تێـڕ
دەڵێـن زانـا و ئەدیـب و خۆێنـدەوارە
ئەگـەر نەیخوێندبـێ شـەش پیـت و دوو دێڕ
بـەڵام زێـڕت نەبـێ سـووکی ئەگـەر تۆ
بـدەی دەرسـی هەزاری وەك شکسـپێر

۱۳۲۰ ـ ۱۹٤۱

***



## دەیڵێم و بێ باکم

هەچێکی بێتە سەر زارم
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم
ئەگەرچی بێکەس و زارم
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم
ئەوی ئاغا بێکارە
جەبوون و قەڵس و لاسارە
دزی و ڕێگرتنی کارە
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم
گەلی بێ فیکر و ئیدراکن
گەلێ بێ خێر و ناپاکن
توخواکەی کامەیان چاکن
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم
ئەوەندە گێژ و بێ هۆشن
حەیا و نامووسێ دەفرۆشن
لەبۆ ئازادی ناکۆشن
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم

خــودای ئاغاوەتـــان قەنــدە
لەبــۆ قەنــدن هەمـــوو بەندە
بەحاڵـــی وان دەکـــەن خـەندە
ئەمن دمیلێم و بێ باکم

نییانــە بیـــری سەربـەســتی
دەکەن فـەخرێ بـەژێردەســتی
دەڕۆن هـــەروا بەرەو پـەســتی
ئەمن دمیلێم و بێ باکم

لـــە تـــالان و بـــــڕۆ ئـــازان
لە ڕێگرتـــن هـەمـــوو وریـــان
درۆ نـــاکـــەم بپرســــــە وان
ئەمن دمیلێم و بێ باکم

ئەوانەی ئێســـتە ســــەردارن
جـەفاجـــۆن و ســـتـەمکارن
غوڵامـــی پـــــوول و دینارن
ئەمن دمیلێم و بێ باکم

بەشـــەو تا ڕۆژ دەکـــەن تەکبیر
چ ملکێکـــی بکـــەن داگیـــر
چ داماوێـــک بکەن یەخســـیر
ئەمن دمیلێم و بێ باکم

لەبەر زوڵـــم و جـەفای وانـە
وەتـــــەن یەکبــــارە وێرانـــە
هـــەزار خۆزگـــــەم بەبێگانـــە
ئەمن دمیلێم و بێ باکم



لــە شــەرم و شــوورەیی مــردم
بەخــۆم من چــۆن بڵێــم کوردم
کــە ئاغــــا ئابــڕووی بــردم
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم

منـــم لاوێکـــی بـــێ پـــەروا
لــە کــەس باکــم نییــە بەخــوا
ئەگــەر ئاغــا لــە حەبســم کا
ئەمن دەیڵێم و بێ باکم

***

## قەڵای نیشتمان

وەتەن گیان و سەر و ماڵم فیدای تۆ

وەگیانی من کەوێ دەرد و بەڵای تۆ

لە پێناوت دەنێم سەر تا بزانی

منم ڕۆڵێکی ئازا و باوەفای تۆ

لە بۆ پاراستن و حیفزی سنوورت

لەباتی (ماژینۆ) سینگم قەڵای تۆ

دەبێ من چۆن بژیم مەسروور و دڵشاد

کە دەتبینم لەدەس بێگانەدای تۆ

دەبێ کەی سەربەخۆ بی تۆ هەتا من

بە سەربەستی بکەم سەیر و سەفای تۆ؟

بەشینکە و گوڵ سەراسەر سوور و شینە

چ جوانە دیمەنی کێو و چیای تۆ

لەگەڵ تۆ بۆ نەجاتی نیشتمانت

دەدەن (هێمن)! هەوڵ خۆشک و برای تۆ



## ئەمەگی گوڵان

هاتـــــە دەر مانگــــــی یەکەمــــــی بەهـــــار
مێلاقـــــە ســــــووره لـــــە لێـــــوی جۆبـــــار
هــەروا کەمێــک دوور وەنەوشــێک بــوو شــین
وەنەوشـێکی چـۆن؟ ملکــــەچ و سەرشـــین
بــە وەنەوشـــــەی گـــوت مێلاقـــــە جارێک
لەمێـــــژە هەمــــە لـــــە تـــۆ پرسـیارێک
ئەتـــــۆ کـــــە پەلکــت وا ســـوور و گەشــە
دەروونـــــت بـــۆچـــی خەڵـــووزی ڕەشـــە؟

مێلاقە:

چــــت لـــەوەی داوە دەس هەڵگـــرە لێم
ڕازی دەروونــــــم بـــۆ بــــــە تـــۆ بڵێـــم

وەنەوشە:

ســـوێـــندت بـــۆ دەخـــۆم هـــەتـا بمێنـــم
ئـــەو ڕازە لـــەکـــــن کـــەس نەدرکـێنـــم

مێلاقە:

دەس هەڵناگــــری گـــوێ ڕاگـــرە بۆم
تاكـــــو پێـت بڵێـم دەردی دڵـی خـۆم
ئەمـــــن لـــە خاكـــــی كـــوردی ڕواوم
بــــــە ئـــاوی ساردی كانـــی دێـراوم
بــە شــەوبای چیــای بڵنــد و ســەركەش
ڕەنگـــی پەلكـــی من بـــووە ســـوور و گـــەش
چاكـــــەی كوردانـــم لـــە چـاوی دایـــە
لەنـــــاو گوڵانـــــدا ئـــــەوە ڕەوایـــە؟
كـــــورد وا هـــــەژارن مـــن هـــەژار نەبـــم؟
ئـــەوان داخـــــدارن مـــن داخـــــدار نەبـــم؟
دەروونـــــم ڕەشـــــــە، جەرگـــم ســـووتاوە
وەتـــــــی كـــوردســـــتان داگیـــر كـــــراوە
لـــۆمـــەی مـــن دەكـــەن وەنـــەوشـــە كەچـــی
بۆخـــــۆت سەرشـــــین و دژ و ملكەچـــــی

وەنەوشە:

منیـــش بـــــە دەردی تـــــۆ گرفتـــــارم
پـــەروەردەی خاكـــــــی كـــــوردی هەژارم
كـــە تـــۆ هەنـــاوت بـــۆ كـــورد بـــووە ڕەش
منیـــش بـــۆ كـــوردی ســـەرم نـــا لـــە هـــەش
بـــە ملـــی كەچـــــم وەك كـــــوردی دەچم
كـــــە كـــــورد ملكەچـــن منیـــش ملكەچـــم

شیلان ئاوێ - ١٣٢٢

## بەهاری لادێ

بەهـــــارە، کاتـــی کارە، خۆشەویـــستم بۆچـــی بێـــم بـــۆ شـــار
ئەگـــــــەر مـــن بێمە شـــاری، کێ وەئەســتۆ بگـــرێ کاروبار؟
ئەمـــــــن کرمانجم و کرمانج کە هات فەســڵی بەهار، وەک هار
دەبـــــێ بخولێتـــەوە کێـــو و تـــەلان و بەنـــدەن و نیســـار
هەتــــا پەیــدا بـــکا نـــان و نەبـــا بـــۆ خەڵکـــی شـــار، هاوار

***

لـــــەوەی دواوە دەبـــێ قۆڵـــی هەتـــا ئانیشـــکی هەڵماڵـــێ
هەمـــــوو ڕۆژێ هەتـــا ئێـــوارێ بچتـــە جـــووت و جۆماڵـــێ
کـــــە بوولێڵـــی شـــەوێ پەیـــدا بـــوو ئەنجـــا بێتـــەوە ماڵـــێ
بەبـــێ وەی کـــەس هەبـــێ بیشـــێلێ، یـــا خـــۆ پشـــتی داماڵێ
کـــە نانـــی خوارد و لێی نووســـت تـــا بەیـــان نابێ لە خـــەو بێدار

***

ئەوێســـتا کاکـــی جووتیـــاری بـــەکاری چابـــوک و مەزبـــووت
بەبـــــێ باکـــی، بەدڵپاکـــی، بەپێخواســـی بەســـینگی ڕووت
دەڕێـــژێ ئاو، دەچێنـــێ تۆو، دەکا جێ شـــەتڵی پەیـــن و کووت
دەڕێـــژێ ئارەقـــە، پەیـــدا بـــکا تـــا بـــۆ منداڵـــی قـــووت




پشـــوو نـــادا، وچـــان نـــادا، وەڕەز نابـــێ لـــە ئـــەرک و کار

*** 

هەموویـــان توندوتـــۆڵ و گورجوگـــۆڵ و چوســـت و چالاکـــن
هەموویـــان بـــێ فڕوفێـــــڵ و بـــــەکار و ســـادە و پاکن
لـــە لادێـــدا خـــراب زۆر کـــەم دەبینـــی نێـــر و مـــێ چاکن
نـــە ئالـــوودە بـــە ئالکـــۆڵ و نـــە فێـــری بەنـــگ و تریاکن
دەبـــێ بێ دەرســـی ئەخـــلاق لێـــرە بخوێنێ کوڕیژگەی شـــار

*** 

بەتـــاڵ و تفـــت و ســـارد و گـــەرم و ناخۆشـــی ژیـــان ڕادێن
بەگـــژ تیـــن و بلێســـە و بەفـــر و بـــاران و هـــەوردا دێـــن
پەنیـــر و ڕۆن و ماســـت و هێلکـــەت بـــۆ لـــە دێڕا دێـــن
خـــوری، مـــازوو، کەتیـــرە، دەغـــڵ و تووتن بەرهەمـــی لادێن
نمـــەک خـــوردەی دەســـی وەرزێـــرە شـــێخ و حاکم و ســـەردار

*** 

دەکێشـــن زەحمـــەت و ناخـــۆن وەکـــو وان نانـــی خۆڕایـــی
دەکـــــەن کار و دەڕێـــــژن ئـــارەق و ناژین بەڕیســـوایی
لـــە ســـەریاندا نییـــە پـــۆز و ئیفـــادە و فیـــزی ئاغایـــی
لـــە ســـایەی زەحمەت و ڕەنـــج و لـــە ســـایەی کار و ئازایی
بەســـەربەرزی دەژیـــن بـــۆ کۆمـــەڵ و گـــەل نابنە ســـەربار

*** 

نییـــە داوێـــــن و دەســـتی خەڵکـــی لادێ پیـــس و ئالوودە
لـــەدەس ناچـــــێ وەخـــت لێـــــرە بەخۆڕایـــی، بەبێهـــوودە
ئـــەوان وەک ئێـــوە ناژیـــن تەمبـــەڵ و بێـــــکار و ئاســـوودە
ئـــەوان وەک ئێـــوە ناخـــۆن شـــەربەت و شـــەکراو و پاڵـــوودە




لـــە کـــویێ بێنن پڵاو و گۆشـــت و خۆرشـــت و فرِ و فیســـار؟

***

ئـــەوان وەک ئێـــوە ناکـــەن پۆکـــەر و پاســـۆر و ئـــاس و نەرد
یەکێک ســـەرگەرمی شـــێوە ئێســـتەکانە، یەک خەریکی وەرد
ئـــەوەی تریـــان خەریکـــە هەڵدەوێژێـــرێ لـــە کێڵگـــەی بەرد
یەکێـــک ماڵـــوو دەکا یـــەک دادەچێنـــێ تـــازە شـــیناوەرد
ئـــەوی تـــر هـــەڵـــدەپەرتێـــوی لـــک و پـــۆپـــی چڵووکی دار

***

دەبینـــی یـــەک ئـــەوە مەشـــغووڵی هەڵگێڕانـــەوەی بانـــە
ئـــەوەی تـــر دادەمەزرێنـــێ پلووســـک و چۆتـــە گوێســـوانە
یەکێـــک کوتکی لـــەدەس دایە، یەکێک بێڵی لەســـەر شـــانە
یەکێـــک دەشـــکێنێ بـــەرد و یـــەک خەریکی شـــوورەهەڵدانە
بەڵـــێ نابینـــی کاکـــی خـــۆم لـــە دێـــدا کەســـێ بێـــکار

***

کچێـــک پێیەتـــی دوو گـــۆزە بەلەنجـــە دەچتە ســـەر ئاوێ
کچێکـــی تـــر شـــەکۆی هەڵگرتـــووە دەڕواتـــە پـــاراوێ
ژنێـــک چەنـــد ماشـــەری پێیـــە، دەیانهێنێتـــە بـــەر تـــاوێ
ژنێکـــی تـــر بەدەســـتاڕی دەهـــاڕێ گەنمـــی بـــۆدراوێ
بـــەرەو مـــاڵ بوونـــەوە پۆلێـــک و پۆلێـــک دەچنەوە بـــۆ بژار

***

عەزیـــزم تـــۆ وەرە ئێـــرە کـــە چـــاو لـــە جوانـــی نابـــێ تێـــر
ببینـــــە خـــاو و گیابەنـــــد و هەڵاڵـــە و سوێســـن و شـــللێر
لەلایـــەک زاوەمـــــاک دەڕوا، لەلایەکـــــی دەکـــەن هاوێـــر
لەلایـــەک باســـــکی هەڵماڵیـــوە بێـــری مـــەڕ دراوە بێـــر

دەبینـــی دیمەنـــی وا جــوان لەنـــاو بـــازاڕی پـــڕ ئـــازار؟

***

چ خۆشـــە کاڕ و کـــووڕی مەڕ، چ خۆشـــە پڕمەکەی کەحلان
چ خۆشـــە فیتـــە فیتی شـــوان، چ خۆشـــە نوحەکـــەی گاوان
چ خۆشـــە خرمەکـــەی خڕخـــاڵ و بـــازن و ژێرچەنـــەی کابان
چ خۆشـــە نەغمەکـــەی بلوێـــر، چ خۆشـــە لاوک و حەیـــران
چ خۆشـــە دەنگـــی باللـــۆرە، چ خۆشـــە هـــۆوەرەی جوتیـــار

***

وەرە ئێـــرە و مەپرســـە تـــۆ ئـــەدی چارشـــێو و ڕووبەنـــد کوان؟
وەرە ئێـــرە و ببینـــە چـــاوی مەســـت و بـــەژن و بـــاڵای جـــوان
وەرە ئێـــــرە و ببینـــــە وردە هەنـــــگاوی بـــەرەو جێـــژوان
وەرە ئێـــــرە و ببینـــــە نـــازی پێـــری و دەســـبزێوی شـــوان
بچـــۆ ناو ڕەشـــبەڵەک بگوشـــە دەســـی دۆی ناســـک و نازدار

شیلان ئاوێ ـ ١٣٢٢ـ١٩٤٣

***



# تۆم هەر لەبیرە

لە شایيدا لە وەختى هەڵپەڕینا
لە خۆشیدا لە كاتى پێكەنینا
لەكۆڕى ماتەم و گریان و شینا
ئەمن ئەى نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

بەشەو تاكو بەسەرما زاڵ دەبێ خەو
بەڕۆژ تاكو دووبارە دێتەوە شەو
لە كاتێكدا كە دەدوێنم ئەم و ئەو
ئەمن ئەى نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

زەمانێكى كە دەچمە سەیرى گوڵزار
لەگەڵ پۆلى ڕەفیقانى وەفادار
تەنانەت وەختى دەسبازى لەگەڵ یار
ئەمن ئەى نیشتمان تۆم هەر لەبیرە

لە كوێستانێ دەمى ڕاو و شكارێ
لە مەزرایە كە خۆم هەڵكرد لە كارێ

لــــە جێژوانــێ کە دەکوشــم مەمکــی یارێ
ئەمـــــن ئــەی نیشـــتمان تـــۆم هـــەر لەبیرە

دەکـــــەم تەرخـــان لــە ڕێـــی تـــۆدا ژیانـــم
لـــــە ســـــەنگەردا بـــەرەو ڕووی دوژمنـــانم
بـــە خاکـــی تـــۆ دمـــی ئاویلکەدانـــم
ئەمـــن ئــەی نیشـــتمان تـــۆم هـــەر لـەبیـــرە

شیلان ئاوی ١٣٢٣-١٩٤٤

***



## کیژی لادێ

کیژی لادێی نەشمیلی جوان چاک
بێ فڕوفێڵ و هێدی و داوێن پاک
ئەتۆ هەر زگماک وەها جوانی
تەوالێت چییە؟ ناوی نازانی
نیتە کراسی حەریر و پۆپلین
گەوهەری پێچرای لەناو خامی شین
(پۆدر) و (کرێم) و ماتیکت نییە
هەر نەتبیستووە (ئۆدی کلۆن) چییە؟
نەتکرد سووراو و سپیاو چون دووری
لە شاری، کەچی هەر سپی و سووری
(فێڕ)ت لێ نەدا بسکەکەت لوولە
ڕێژیمت نەگرت بەژنت وەک توولە
لاجانگت وەکو گزنگی تاوێ
هەر بۆخۆی جوانە تیف تیفەی ناوێ
کوڵمەکەت وەکو گوڵاڵەی گەشە
بێ سوورمەش چاوە مەستەکەت ڕەشە
وەکو فرمێسکی ئاشق ڕووناکی




وەکو ئاونگی بەیانی پاکی
فێر نەبووی سیحر و گشتەک و نوشتوو
نەجگە گورگت هەیە نە مووروو
مایەی هومێدی کیژی چاوهەڵۆ!
نازانی مەکر و جامبازی و درۆ
چارشێوت نییە ڕوو ناگری لە کەس
ناموسی خۆتە پاسەوان و بەس
بە تاسکە تاسک و بەلەنجەولارت
بە بەژن و بالای بەرز و لەبارت
بەدڵی سادە و بەهەستی پاکت
بەشەرم و حەیا و ئاکاری چاکت
منت کردووە شێت و وێتی خۆت
وەختە لە سوێیان گیانم دەرچێ بۆت

مەهاباد ـ ١٣٢٤

***




## دواڕۆژی ڕووناک

لەمێژ بوو هەققی کورد دەخورا بەفیڕۆ
لەمێژبوو کوردبوو دەیکرد شین و ڕۆڕۆ
لە مەیدانی شەقێنی دوژمنیدا
سەری سەرداری کوردی بوو وەکو گۆ
بەدەوری لاشی نیوەگیانی ئەودا
هەزار گورگ و چەقەڵ دەیکرد ملۆمۆ
دەیانبەست بۆ کوتانی مەرج و پەیمان
هەناوی لێی دەهات بۆچڕووک و بۆسۆ
لە دێدا ئەمنیەی لێ ببووە مێمڵ
لە شاری (شارەبانی) لێ ببۆ سۆ
هەزار لاوی لە بەندیخانەدا مرد
هەزار پیاوی تەنافی خرایە ئەستۆ
کوڕی کوردی لە خۆێنی خۆی دەگەوزی
کچی کوردی سەری کردبوو وەئەژنۆ
ئەوەی سووکایەتی بوو کردی پێمان
نەدەکرا کەس بڵێ بۆ وا دەکەی بۆ؟
بڕا نێفەک، دڕا سەرپێچ و دەسماڵ

برا کیژ و درا کوڕ پاڵەپەستۆ

گوڵستان و زەمەندی کوردەواری

بەپێی دوژمن دەبوو پێشێل و بۆژۆ

دەیانکرد دەغڵودانی ئێمە بەش بەش

دەیانکرد دانەوێڵەی ئێمە کۆکۆ

ئەوی گەنمی ڕەنێو دێنا بەزەحمەت

لە ماڵیدا نەبوو خۆی زمهەرێک جۆ

لە کیسەیدا نەبوو تاڵایی توتن

ئەوی سازی دەکرد سیگاری (ئوشنۆ)

بەدوو گەز جاوەوە خەونی دەبینی

ئەوی عەمباری شای پڕ کرد لە پەمۆ

پەنیرو ڕۆنەکەی ئێمە بە زاری

ئەوان دەخورا، دەما بۆ ئێمە هەر دۆ

مریشک و قاز و بارۆکە و مراوی

بەشی وان بوو، بەشی ئێمەش پەڕوپۆ

لە شارا تاکو (تابین) جەردە و دز

وڵاتیان کردبوو تاڵان و تاپۆ

هەموو سووک و چرووک و پەست و بەدخوو

هەموو ناپاک و نا ئینسان و نامۆ

لەبەر زوڵم و فشار و جەور و بێداد

چلۆن تێک چووبوو لێمان ڕایەڵ و پۆ

جلیتباز کەنگێ دەیوێرا بڵێ هەو

فەلەخۆێ کوانێ دەیوێرا بڵێ هۆ

لە ژێر باری گرانی زوڵمی دوژمن

دەیانبرد مەزنەکانی گەورە نسکۆ



لەپڕ جووڵاوە خەڵک و تێکی ڕووخاند
بناخەی کۆشکی ئیستبدادی یارۆ
شکا بێگانە، پاڵاوتی لەترسان
کوڕی کورد، هاتەوە دیسان هەلی تۆ
مەوێستە، خۆت مەگنخێنە، مەترسە
لە فیشاڵ و لە بوختان و لە دەمگۆ
هەتا حیزبێکی دێموکراتی پێشڕەو
کە پێویستە لە دەوری کۆوەبی کۆ
لە سایەی حیزبی دێموکراتی خۆمان
لە باڵدار تێپەڕی ئەوڕۆکە پێڕۆ
دەسا خۆت هەڵکە ڕێ ببڕە بەگورجی
بڕۆ پێش بێوچان، لێ بخوڕە، باژۆ
نەما داخ و پەژارە و ماتەم و خەم
زەمانی هەڵپەڕین و بەزمە ئیمڕۆ
لە شایی ئێمەدا نابینی ئێستا
کچێکی دڵ بەخەم، لاوێکی بێ دۆ
درۆزن بۆی بزر بوو، هاتە مەیدان
کچی ئازا، کوڕی لێزان و هەقگۆ
توخوونی دوژمنی بەدکارە نابین
کە سووتاوە دەسی ئێمە بەپشکۆ
زمانی ئێمە گەر نازانی دوژمن
دەبێ حاڵی بکەین ئەوجارَ بە برنۆ
لە پێشمان دایە دوارۆژێکی ڕووناک
ئیتر ناخوڕێ هەقی ئێمە بەفیڕۆ

مەهاباد ـ ١٣٢٤

## ڕۆژی شادی

ڕۆژی خۆشی و پێکەنین و داوەتە
هەی چ ڕۆژێکی بەقەدر و قیمەتە
جێژنی سەربەستی و دەمی ئازادییە
کاتی عەیش و نۆش و شایی و شادییە
بەرگی ڕەش ئیتر لەبەرمان دادڕا
بەندەکی دیلی و ئەسارەت هەڵبڕا
سەر بڵیندین چونکە وا ئاڵاکەمان
هەڵکراوە گەییییە ئەشقی ئاسمان
پەرچەمی سوور و سپی و سەوزی ئەمە
شادیهێنە لابەری دەرد و خەمە
سوورەکەی یانی ئەوەی بێتە بنم
خوێن دەبێ بڕژێنێ بۆ پاراستنم
سپیەکەی یانی کەسێکە ڕوو سپی
هیچ شتێک نەیکردبێ مات و کپی
سەوزەکەی دێنێتە بەچاوان وڵات
ئەو دەمەی فەسڵی بەهاری جوانی هات
تیشکی ڕۆژی کورد لەژێر هەوری سیا



هاتـــــه دەر ئەنگاوتـــــی وا لووتکـــەی چیا
دوو گوڵـــــی گەنمیـــش دەڵێ هەر کشـــتوکاڵ
زۆر بکـــەن مشـــتی بکـــەن عەمبـــــار و چـــاڵ
پێـــــت دەڵـــێ نووکـــی قەڵـــەم؛ نووکـــی قەڵەم
زۆر لـــــــه شـــیر باشـــتر دەپارێـــزێ عەلەم

مەهاباد ـ ١٣٢٤

***

# یادگاری شیرین

چاوەکەم! چاوی ڕەشی تۆ ئافەتی گیانی منە
گیانەکەم! برژانگی تیژت نووکە ڕمبی دوژمنە
شیری دەستی شێری ئالآیە بڕۆ ڕاکشاوەکەت
جەرگی لاوێکی هەژاری کوردی ورد پێ بنجنە
دیدەکەی بەخوماری تۆ تورکانە بەدمەستی دەکا
بۆیە مەیلی وا بەکێشە و فیتنە و خوێن ڕشتنە
بەژنەکەت سێدارەیە، کەزیەت تەنافە زوویە دەی
بیخە ئەستۆی من کە کوردم بەشی خنکاندنە
زامی جەرگی من بەفەرموودەی گراوی سواری کورد
مەڵهەمی هەر ژەنگی گوارە و ئارەقی بەر گەردنە
ئارەزۆمە هیچ نەبێ جارێکی ماچ کەم زاری تۆ
ئارەزۆی من چووکە، ئەمما تا بفەرمووی شیرنە
دڵ بەگرمەی تۆپی گەورەی دوژمنیش ڕانەچڵەکێ
دادە خورپێ ئەم دڵە ئەمما بەخرمەی بازنە
خەڵکی دنیا ڕازی دڵداری بە بێتەڵ پێک دەڵێن
ڕاسپاردەی لاو و کیژی کوردە ئێستاکەش شنە
ڕۆژی بەختی هەر لە ژێر هەورێکی ڕەشدا لاوی کورد




تاکــو ڕوخســاری کچــی شــاری لــه پێــش چــاوان ونه
نایــەڵــێ گــۆشــەی برۆکــەت دەرکــەوێ چارشــێوەکەت
ئــەی لە دەس ئــەو چڵکــە هــەورە مانیعی مانــگ دیتنە
چۆن دەبێ سەربەســت گەلی ژێردەست کە کچ دابــەســتە بێ؟
بــەس نەبێ ئــەو کۆیلەتی و ئــەو کچ لە ژوور دابەســتنە؟!
دەرکــی داخســتووە لــە تــۆ بابــت کەچــی دەرکــی نییە
دەرکــە داخســتن لــە تــۆ دەرکــی هــۆمێــد داخســتنە
داڕزینــــە، مردنــــە، ئاخــــر هەتــا کــەی پێــت بڵێن
نابــێ بێتــە دەر لــە مــاڵ، مافــی ژیانــی کــوا؟ ژنــە
لادە چارشــێوی ڕەشــت بــا دەرکــەوێ کوڵمــەی گەشــت
چــون لــە قەرنــی بیســتەما زۆر عەیبــە ئــەو ڕوو گرتنە
کیــژی خەڵکــی بۆمــی ئاتۆمی دروســت کــرد و ئەتۆش
هــەر دەزانی ناوی (ئەســـتێوڵک) و (دەرخــۆنــە) و (پنــە)
فێــری زانســت و هونــەر بــوو ئــەو لــە ســایەی خوێندنی
تــۆش تەشــیمان بــۆ دەرێســی یــادگاری شــیرنە
ئــەو بەئاســمانا فــڕی، دنیــا گــەڕا، چــووە بــن بەحــر
دەک نەمێنــم کاری ئێــوەش هــەر لــە ژوور دانیشــتنە
کــوڕ بــەزێنــە ئــەو لە عیلــم و ئەو لــە کار و ســەنعەتا
گــۆرەویشــە ســەنعەتی تــۆ، پێــت خەنــی بــووم بیچنە
ئەو پنەچــە و ڕوویــەنــد و چارشــێوەی نــەدیوە نــەنکی تــۆ
ئــەو شــڕ و شــاڵاتە دیــاری دوژمنــی دڵ چڵکنــە
کیژی شــێخ و کیــژی حاجی و کیــژێ ئاغــا ڕەنجەڕۆن
کیــژی ئــازادە ئــەوی ژینــی بــەنــووکی گاســنە
شــەنگەبێری یــار و دەســباری کــوڕی کــۆچــەر نەبــێ
چــۆن دەگاتــە جــێ هــەوار و هۆبــە ئــەو بارگــە و بنە؟

قەڵشی دەست و کولمی سووتاوی کچی لادێ نەبێ
چۆن دەگاتە دەستی دەسبڕ ئەو هەموو تا تووتنە؟
نیسک و نۆک و ماشی ناو عەمباری ئاغای مفتەخۆر
پاک لە سایەی ڕەسکەنەی زین و مرۆت و سوێسنە
شۆڕەژن بنکۆڵ نەکا بڕکەی بەقرچەی نیوەڕۆ
چۆن لە کاڵەک تێر دەبێ ئەو زگ زلە بێستان ڕنە؟
کوا مەتاعی کوردەواریمان دەچوو بۆ هەندەران؟
گەر بەسەربەستی نەژیبا ئەو کچە مازووچنە
بێر و هاوێری لەگەڵ کاکی نەکردبا بن پشک
چۆن دەمانبوو ئەو هەموو گۆشت و پەنیر و بەرگنە؟
دەست و کەرکیتی کچی نازداری هەوشاری نەبا
چۆن دەڕازاوە بەقاڵی شار و بازاڕی سنە؟
با هەزار (زێ) و (گادەر) و (لاوێنی) ڕوونیشمان هەبێ
تاکو ژن ئازاد نەبێ، سەرچاوەکەی ژین لیخنە
کۆیلەتی باوی نەماوە، کیژی کوردی خۆشەویست!
ڕاپەڕە، هەستە لە خەو، ئاخر چ وەختی خەوتنە؟
دەرکە بشکێنە، پەچە بدڕێنە، ڕاکە مەدرەسە
چاری دەردی کوردەواری خوێندنە، هەر خوێندنە
دایکی زانایە کوڕی ئازا دەنێرێتە خەبات
من گوتم تۆش تێبگە (ئاگاتە دەریایە زنە)
گوارەکەی زێڕت بەکار نایە، لە گوێ بگرە قسەم
لایقی گوێی تۆ عەزیزم شێعری سادەی (هێمنە)

مەهاباد ـ ١٣٢٤

***




## ڕێبەندان و شاعیر

ڕێبەندان! دیسان هاتیەوە سەرمان
ڕەقمان هەڵێنی دیسان لە سەرمان
بەسۆزەی زریان پیاوی دەکەی سڕ
بەکڕێوە و باکوت ئاژەڵ دەکەی قڕ
ڕێ و بان دەبەستی بە بەفر هەموو
لەبەر پەساران هەڵدەنێی ڕنوو
پرووشە و مژ و کەڕەسیسەکەت
تەپ و تومان و هەوا پیسەکەت
پێیەوە هەزار ئازار و ئاهۆ
کۆخە و هەڵامەت، لەرز و چەق و چۆ
کە تۆ تەشریفی ناشەریف دێنی
دڵی گەلی کورد دادەخورپێنی
ماشین و ڕێگای ئیسفاڵتی نییە
بەو سارد و سۆڵە عیلاجی چییە
بە هەچەهەچی کەرێ، چۆن باری
لادێیی کوردی دەگاتە شاری؟
هەزار لێی دەبڕێ ئاوردوو و زمهەڕ

کـوررووژمـــەی دەکا فەقیـر، ماڵانگەڕ
سـەر دەنێنـــەوە پیـــر و نـــۆجـــوان
بـێ پەرســـتار و بـــێ داو و دەرمـــان
بەخێـر نەهاتـــی مانگـــی مژ و تـەم
دێنـــی بـــۆ ئێمــە گەلێـک دەرد و خـەم

ڕێبەندان:

شـاعیر مـاڵ شـێواو بـۆ دژ دامـاوی؟
گێـژی، خەوئاڵـووی، شـێتی خەرفـاوی؟
بــۆچـی تــۆ ئــاگات لــە دنیـا نییە؟
بــۆچـی نازانـی دەنگوبـاس چییـە؟
بۆ بــە مــن دەڵێی قسـەی سـوێر و تاڵ؟
بۆچـی نازانـی بـێ خەبـەر ئـەو ساڵ
زریانـم هێنـای بـۆ کـورد ئـازادی
شـەماڵم هێنـــای بـــۆ ئێـــوە شـادی
مـــژی مـــن هـــات و مـــژی هەژاری
ڕەوانـد یەکجـــاری لــــە کــوردەواری
بەکەڕەسیســـە و پڕووشـــە و ســـیخوار
ئاواتـــی کـۆنـــی کــوردم هێنـا خـوار
لــە ڕۆژی منـدا کـورد بـەڕووسـووری
هەڵـی بـژاردووە ڕەئیـــس جـەمهـووری
جـا ئـــەو جـار بـاوی کـوردی دێتەوە
ئاســـووودە دەبـــێ، دەحەســـێتەوە



شاعیر:

گیانـــی شـاعیرت دەکـەم بـەقـوربـان
وا هاتـووی ئەوسـاڵ مانگـی ڕێبەنـدان!
دەک بـەخێرهاتـــی قـەدەمـت پیـرۆز
بـەقوربانـت بـــێ جێژنەکـەی نـەورۆز
ڕۆژی تـۆ جێژنـــی گـەورەی کـوردانە
نـاوت دەرمـانـــی ژان و دەردانـــە
ئەوســـاڵ بـەهـارە بـۆ ئێمـە زسـتان
بمـرێ دوژمنـــی کـــورد و کوردسـتان

هەواری کرماویلە ـ ١٣٢٥

***




## بژی دێموکڕات

مزگێنیم دەیە دەگەی بە ئاوات
کوردە لە سایەی حیزبی دێموکڕات
حیزبی دێموکڕات تۆ دەدا نەجات
پیادەی ئەو، شاهی دوژمن دەکا مات

بژی دێموکڕات بژی دێموکڕات

کوردە گیان! ئەورۆ چاو و دڵت ڕوون
لاوانی وڵات پاک ئامادە بوون
تەمای ومیانە ڕاپەڕن، ببزوون
لێوی دوژمنی هەرزەگۆ بدروون

بژی دێموکڕات بژی دێموکڕات

پێکیان هێناوە لەشکرێکی چاک
لە لاوی ئازا و بەکار و چالاک
هومێدم وایە لاوانی خوێن پاک
بە خوێنی خۆیان بپارێزن خاک

بژی دێموکڕات بژی دێموکڕات





هەمـــوو بـــە جـــەرگ و ئـــازا و دلێـــرن
هەمـــــوو بێ‌بـــاک و دڵپـــــاک و مێـــرن
لەنـــاو ســـــەنگەردا لـــە وێنـــــەی شـــێرن
نـــەتـــــەوی بێ‌شـــــک پێیـــان ناوێـــــرن

بـــژی دێموکـــڕات بـــژی دێموکـــڕات

پێشـــمەرگەی کـــوردی لـــە مەیدانـــی جەنـــگ
بەرگـــــەی ناگـــــرێ نە شـــــێر نـــە پڵەنگ
دوژمنـــــــی ئێمـــــە تـــــازە بـــــکا دەنـــگ
ســـینگی دەســـمن بـــە گوللـــــەی تفەنـــگ

بـــژی دێموکـــڕات بـــژی دێموکـــڕات

ڕۆژی بەرگـــــری و شـــــەڕ و تەنگانـــە
پاڵەوانێکـــــە هـــــەر یـــەک لـــەوانـــە
بـــەکوێـــــری چـــاوی پیســـــی بێگانە
ئەوڕۆکـــــە ڕۆژی جێژنـــــــی کوردانـــە

بـــژی دێموکـــڕات بـــژی دێموکـــڕات

مەهاباد، ڕەشەمەی ـ ١٣٢٤

***




## ڕۆژی خۆشی

ڕۆژی جێژن و خۆشییە تێپەڕ بوو ڕۆژی دەرد و خەم
هات شنەی ڕەحمەت بەجارێک ڕای ڕفاند و بردی تەم
دێ لە هەر لایێکی قاقای پێکەنینی کیژ و کوڕ
دێ لە هەر سووچێکی نەغمەی ساز و تار و زیل و بەم
گەرچی زستانە بەفر داپۆشی ئەوڕۆ گشت وڵات
خاکی پاکی ئێمە خەملیوە وەکو باخی ئیرەم
جێژنی ئیستقلالی کوردستانە، ڕۆژی شادییە
جێژنە پیرۆزە لە لاوی هاوولاتی خۆم دەکەم
نۆجوانان! دەی بەقوربانتان دەبم کارێ بکەن
بۆ تەرەققی کورد و بۆ پاراستنی خاک و عەلەم
بۆ نەجاتی نیشتمانی خۆشەویست کارێ بکەن
زوو دەری بێنن لە چەنگی دوژمن و دەستی ستەم
هەر کەسێ بۆ لای سنووری نیشتمانی ئێوە بێ
بیکوژن، وردی بکەن، بینێرنە مولکی عەدەم
لاوەکان! دڵپاکەکان! چالاکەکان! پێشمەرگەکان!
ئێوە شیری لێ بسوون و ئێمە پڕدێنە قەڵەم
هەر بەیەکگرتنتن لە دەستی بێگانە دێنینە دەرێ



خاکـــــی پاکـــــی کـــــوردەواری، نایەڵێـــن بۆ کـــەس ئەلەم
جێژنـــە پیـــرۆزە دەکـــەم لێـــــت و دەڵێـــم خـــۆش بـــی، بـــژی
ئـــەی ڕەئیـــس جەمهـــووری کـــورد و پیـــاوی زانـــا و موحتـــەرەم
تـــۆم بەخـــوا ئەسـپارد و ئەســـپاردم بـــە تـــۆ ئەی (پێشـــەوا)
میللەتـــــی دڵپـــــاک و چـــاک و نیشـــــتمانە جوانـــەکەم

مەهاباد، ڕێبەندانی ـ ١٣٢٤

***

## هەتاوی ئیقباڵ

ڕۆیی خەم هاتەوە هەنگامی سروور
جێژنەیە بەزمە زەماوەندە، سوور
تیشکی زێڕینی هەتاوی ئیقباڵ
لە کولاوکەی گەلی کورد هاتەوە ژوور
کوانێ؟ لەکوێیە؟ ببینێ بەزمم
بدڕێ دوژمنی خوێڕی مەغروور
سەربەخۆ بووین و لەژێر باری خەم
هاتە دەر میللەتی ئازاد و جەسوور
هەڵکراوە لە وڵاتی ئێمە
پەرچەمی بەرزی سپی و سەوز و سوور
خومی شێواوە، پەرێشانە، کزە
دوژمنی قین لەتەزگی ڕق ئەستوور
کوڕی کورد حازرە بەخوێنی خۆی
لە هەموو لاوە بپارێزێ سنوور
کچەکەی حازرە فیشەکدانی
لە ملیدا بێ لەباتی بەرموور
تازە ناوێرێ بە خاکی کوردا



نەتـــــەوی ئێمـــــە بکا چیـدی عبوور
هـــەر بـــــەرز بێتــەوە ئـــاڵای کـــوردی
نیشـــتمانی ببـــێ خـــۆش و مەعـــموور
بـــۆ فیـــداکاری لـــە ڕێـــی میللەتدا
هەربـــژی (قازی) ڕەئیســـــی جـــەمــــهوور

***

## ڕەشەمە

دەک بەخێرییی قەدەمت خێرە چ خۆشی ڕەشەمە
تاکو تۆ هاتی نەما و تێپەڕی ڕۆژی ڕەشی مە
ئیستەکە کوردە هەموو بێ خەم و بێ دەرد و خەمە
شادە، ئازادە، دەکا گاڵتەوگەپ، کەیف و گەمە
نیشتمانی هەموو ڕازایەوە، باخی ئیرەمە

***

شین و ڕۆڕۆ بوو بەشی کورد و سەری نابوو لە هەش
چون لە ئازادی بڕێک نەیبو ئەویش بەهرە و بەش
کوردەواری هەموو داگرتبوو هەور و تەمی ڕەش
نەدەبینرا لە چ لا تیشکی گەلاوێژی گەش
بەشنەبایەکی ڕەحمەت ڕەوی ئەو هەور و تەمە

***

هاتە مەیدانی کوڕی کوردی وەکو فیلی دەمان
هەوڵی ئازادی دەدا ئەو بەهەموو وەخت و دەمان
دوژمنی کوردی ئەوەی دیت و ترووسکایی نەمان
دەشکێنێتەوە با ئێستەکە ئاڵایەکەمان
سەر و ماڵ و کەس و کارم بەفیدای ئەو عەلەمە



***

لاوی کـــــوردی لــه هەمـــــوو لاوە وەکــــو شـــێری ژیـــان
دێتـــــه مەیــدان و دەڵــێ: مــن دەمــــەوێ مافــی ژیـــان
تـــازه هەڵـــناخەڵەتـــێ ئـــەو، بەقســەی نــەرم و نیـــان
دوژمنـــی میللەتـــی کـــوردی هــەمــوو تـــوورەن کــه دییـــان
ئـــەو بەسەربەســــتی دەژی، دوژمنـــی زۆر و ســــــتەمە

مەهاباد ـ ١٣٢٤

***

# دایکی نیشتمان

لە کاتی نیوەشەودا بوو شەوێ دی
ژنێکی پیر ڕەشپۆشم لە خەو دی
بەپارێز چوومە پێش لێی و گوتم پێی
چکارەی دایە پیرە، پێم بڵێ کێی؟
لەبەر چی وا دژ و داماوی دایە؟!
چ قەوماوە کە وا شێواوی دایە؟!
چییە؟ چۆنە لەبەر تۆدا جلی ڕەش؟
سەر و شان و ملت بۆ ناوەتە هەش؟
گوتی نازانی ڕۆڵەی هیچ نەزانم
ئەمن کێم ڕۆڵە! دایکی نیشتمانم
لە تاوی ئێوەیە وا مات و گرژم
لە سوێی ئێوە دەسووتێم و دەبرژم
دەبینم ئێوە داما و هەژارن
کز و خەمبار و زار و لێو بەبارن
منیش بۆیە پەرێشان و پەشێوم
دەبینی باری خەم نیشتووە لە لێوم؟
نەخۆشن ئێوە، بۆیە من نەخۆشم

ئەسیرن ئێوە، بۆیە ڕەش دەپۆشم
بەقوربانت دەبم ئەی دایکی دڵسۆز
مەبە چیدیکە تۆ دڵتەنگ و ئاڵۆز
تەماشاکە کوڕی تۆ شادن ئێستا
هەموو سەربەستن و ئازادن ئێستا
دەزانم ڕۆڵە گیان خەڵکی مەهاباد
لەژێر دەستی کران ڕزگار و ئازاد
بەڵام ڕۆڵەم برای ئێوە لە سەقز
تەماشاتان دەکەن داما و سەرکز
چ شەرمە کاری ئێوە پێکەنین بێ
بەڵام کاری ئەوان گریان و شین بێ
ئەگەر پێت خۆشە جلکی ڕەش نەپۆشم
بکەن ئازاد کوڕانی دیم و خۆشم
لەبەر خۆت دارنە دایە جلی ڕەش
دڵت ڕوون بێتەوە کولمەت ببێ گەش
هەنیسکان بەس بدە چیدی مەکە شین
ببینە بەیرەقی سوور و سپی و شین
ببینە (پێشەوا)ی مەشهووری ئێمە
ببینە تۆ ڕەئیس جەمهووری ئێمە
ببینە هێزی پێشمەرگە و بزانە
کە نووکی نێزە شمشێری ئەوانە
لەژێر دەستی دەکا ڕزگار وَ ئازاد
تەواوی کوردەواری وەک مەهاباد

مەهاباد ـ ١٣٢٤/١١/١٢

# نەورۆزی ڕزگاری

به بەرگی سەوزە ڕازاوە قەد و لاپاڵ و شیو و دۆڵ
چرۆی دەرکردووە دار و ملی دا یەکتری گیا و گوڵ
بەسەر بەفری کەویدا کرد شەماڵی خاکەلێوە خۆڵ
ڕەفیقان ڕۆژی کوردانە، بەهارە، جێژنی نەورۆزە
بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنە پیرۆزە

***

چلەی زستانی ناخۆش بوو تەزووی سەرمایە پیاوی سڕ
دەکرد و کووچە و کۆڵان لە بەفر و لیتە بووبوون پڕ
بەهار هات و دەخەملێ کێو و دەشت و بەندەن و لاخڕ
ڕەفیقان ڕۆژی کوردانە، بەهارە، جێژنی نەورۆزە
بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنە پیرۆزە

***

بەسۆزەی بای بەیان لێوی کراوە خونچەیی خەندان
لەسەر چڵ بلبلی شەیدا لە خۆشی گوڵ دەڵێ بەندان
بەجێ هات ئارەزووی لاوان و گەرمە کۆڕی گۆوەندان
ڕەفیقان ڕۆژی کوردانە، بەهارە، جێژنی نەورۆزە
بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنە پیرۆزە



***

له خۆی داوه بەرەڵبێنه کچی کابانی گەردن کێل

بەناز و غەمزه دەڕوانێ، دەکا شینکەی نەرم پێشێل

لەگەڵ بۆنی وەنەوشه تێکەڵاون بۆنی عەتر و هێل

ڕەفیقان ڕۆژی کوردانه، بەهاره، جێژنی نەورۆزه

بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنه پیرۆزه

***

سەری کوێستانی بەرزی کوردەواری تێی نەکەوتووه خاڵ

له دەشت و بەرپەساران هەڵدراون چادر و ڕەشماڵ

نەما بێگانه تاکو جێژنەمان لێ تاڵ بکا ئەوساڵ

ڕەفیقان ڕۆژی کوردانه، بەهاره، جێژنی نەورۆزه

بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنه پیرۆزه

***

حەساوه پیاوی ڕووتوقووت و بێ ئەنوا و بێ ئیروو

ژیاوه گیانلەبەر دیسان، له کون هاته دەرێ مێروو

لەسەر گوێسوانه دەخوێنن بەپۆل پاساری و سێروو

ڕەفیقان ڕۆژی کوردانه، بەهاره، جێژنی نەورۆزه

بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنه پیرۆزه

***

له دنیادا کەمه هاوتای بەهاری جوانی کوردستان

ئەویش ئەوساڵ که لایێکی نەجاتی بوو لەژێر دەستان

له خۆشی ئەم ولاته شاعیریش بۆته هەزار دەستان

ڕەفیقان ڕۆژی کوردانه، بەهاره، جێژنی نەورۆزه

بەدڵ لێتان دەکەم لەو ڕۆژەدا من جێژنه پیرۆزه

تەوریز - ١٣٢٥/٢/٦

# پێکەنینی گوڵ

کاتی کازیوە پێش گزنگ بوڵبوڵ
لە شەقەی باڵی دا هەتا کن گوڵ
گوتی ئەی نازەنینی عیشوە فرۆش!
کەم کەمە دیارە بێ وەفایی تۆش
بۆ شنەبا هەیەتی لێرە ڕێ؟
بۆ پەپوولە بەدەورەتا دەگەڕێ؟
چەپکی تۆ باغەوان دەکەن دەسگێڕ
لە خەیابان و کووچە و بازێڕ
دەتفرۆشن بەقیمەتی هەرزان
دەتدەنە دەستی ناکەس و هەرزان
بۆیە سووک و چرووکی ناو چەمەنی
لەوەتی بووی هەمیشە پێ دەکەنی
هەڵگەڕاوە بەناز و گوڵ پێی گوت
شێت و شووری کە شرت و شۆمت شوت
وەکو تۆ ئاشقە پەپوولەی زار
بۆ بنە خۆڕایی ئەو بدەم ئازار
شنەبا ڕێ نەدەم کە بۆ لای خۆم

کـــێ دەبـــا بـــۆ هەمـــوو وڵاتـــێ بـــۆم؟
گـــوڵ لەکـــن کـــەس نییە عەزیزم ســـووک
ســـەری زاوایە جێـــی و باوەشـــی بـــووک
مـــن کـــە نـــاگـــاتـــە هەفتەیەک تـــەمـــەنم
بـــۆچـــی بگریم و بـــۆچی پـــێ نـــەکـــەنم

مەهاباد ـ ١٣٢٥

***

## بلوێری شوان

نیــوەشـــــەوە، دنیــا خامـــــۆش

دێتـــە گوێـــمئاهەنگـــێکی خـــۆش

ئاهەنگـــێکـــی گیـــان پـــەروەرە

شـــــادی هێنـــە، خەفـــەت بـــەرە

ئاهـــــەنگێـــکـــــی دڵنـــەوازە

تـــــارە، ویۆڵـــۆنـــە؟ یا ســـــازە؟

نـــا... نـــا... ئاهەنگـــی بلوێـــرە

جـــــا وەرە گـــوێی بـــۆ ڕادێـــرە

هـــــەزار خۆزگـــەم بـــەخـــۆت شوانە

کـــــە بـــەو مانـــگەشـــــەوە جوانە

دانیشـــــتووی لـــە ڕژد و هـــەڵـــدێر

پەنجـــە دەبـــزێـــوی `لـــە بلـــوێر

دەگـــــــەڵ تەبیعـــەت هاودەمـــی

شـــادی، بـــە کەیفی، بـــێ خـــەمی

ئاغـــاش بـــــە نۆکـــەر نـــاگری

وەک مـــن لـــــە داخـــا نامـــری

وەرە شـــــوانە هەمـــوو شـــەوێ



نیـــوەشـــەوێ، کاتـــــی خـــەوێ
لـــەو کێـــــو و نـــواڵە زەنـــوێرە
تـــــێ تـــــوورپێنە لـــەو بـــلوێرە
لەســـــــەر ترۆپکـــــی ئەو کێـــوە
پەنجـــــە لـــــە بلوێـــــر ببزێـــوە
با کێـــوەکـــە دەنـــــگ داتـــــەوە
شـــاعـــیریش خـــــەو بیبـــــاتەوە

**هەواری کرماویلە ـ ١٣٢٥**

***

# کورد و ئازەربایجانی

تێپـــەڕی ئەییامـــی دیلـــــی ئێســـــتە هەنگامـــی ژیانـــە
خـــۆی مـــــەڵاس دا مـامەڕێـــوی نۆبـەتـــی شـــێری ژیانـــە
هەرچـــی پێـــت دەکرێ بکـــە ئـــەی دوژمنـــی خوێـــڕی و بزانە
بـــاوی لاوی کـــــــورد و تـافـــی گـــەنجـــی ئازەربـــایجانە
خـــۆی لـــە خوێنـــاودا دەبینێ هـــەر کەســـێک دوژمـــن بـــەوانە

***

بـــا لە قـــوڕ نیشـــێ و لە هـــەش نێ دوژمنـــی وان پیل و شـــانی
چونکـــە ئـــەوڕۆ یەکتـــری گـــرت کـــورد و ئازەربایجانـــی
ئەوکـــی ئیســـتیعماریان گـــــرت وەک بـــەڵاکـــەی ناگەهانی
تـــــازە بـــەربوونـــی مەحاڵـــە تـــا نـــــەدا یەکجـــاری گیانی
ســـوحـــبەتی پـــێ ناکـــرێ پەنـــجـــە بەهـــێزی ئـــەو دووانـــە

***

ئـــەو کـــەســـەی چەندێک لـــەوەی پێش لێـــی دەدا لافی خودایی
نەیدەهێشـــت ئێمـــە هەمانبـــێ قـــەت لەگـــەڵ یەکتـــر برایـــی
کوانـــێ لەکوێیـــە ببینـــێ پۆلـــی پێشـــمەرگە و فیدایـــی؟
تـــێ بـــگا نـــای بـــێ لەدەســـت ئـــەو نۆجوانانـــە ڕهایـــی
ئـــــەو کـــوڕی ســـمکۆی دلێـــرە، ئـــەو نـــەوەی ســـەتتارخانە



***

لاوی ئـــازای کـــوردەواری نێـــرە شـێـــری کاتـــــی جەنگە
گەنجـــــی ئازەربایجانــــــی وەک پڵەنـــگـــــی تیـــژە چەنـــگە
تێگەیشـــتن نـــۆکـــەری بێـــگانـــە بـــۆ وان عـــار و نـــەنـــگە
پەنجەیـــان ئێســـتا لەســـەر شـــیرە، لەســـەر ماشـــەی تفەنگـــە
هـــەر بەئاســـــتەم بێتـــــە ڕوو بێـــگانە دەکرێتـــە نیشـــانە

***

کۆشـــکی زۆرداری جمیـــوە، هـــەر نەمـــاوە زوڵـــم و بێـــداد
وەک بەهەشـــت خەملیـــوە خاکـــی پاکـــی کوردســـتانی ئـــازاد
موڵکــــــی ئازەربایجانیـــش بـــۆتـــەوە مەعـــمـــوور و ئـــابـــاد
دوژمنـــی بێـــگانـــــە بتبینم هەمیشـــە پەســـت و نـــاشـــاد
چـــۆن ببویە باعیســــــی وێرانـــە ئـــەم دوو خاکـــە جـــوانە

***

کـــورد و ئـــازەربـــایجانـــی هـــــەردوو داوایـــان ڕەوایـــە
هـــــەر بـــژیـــن و پـــایەداربـــێ یەکـــیەتی ئـــەم دوو بـــرایە
میللەتـــــی ئێـــمـــە هومێـــــدی زۆر بـــەکاری پێشـــــەوایە
ئـــەو کـــوڕە ئـــازا و نـــەبـــەرد و مـــەردە بـــۆ مـــیللەت قـــەڵایە
دەک بمێنـــێ تـــا ئەبـــەد ئـــەو کـــوردە زانـــا و قارەمانـــە

تەورێز ـ ١٣٢٥/٢/٦

***

## ڕۆژگاری ڕەش

ئەو ساڵ جێژنەمان تاڵە
دوژمنی زاڵم زاڵە
لاو جێیان سیاچاڵە
دەستی دۆیان بەتاڵە

***

گاڵتەوگەپ و پێکەنین
شەوداوەت و هەڵپەڕین
جێگای خۆیان دا بە شین
دیسان خەمیان دابەشین

***

پۆلی جوان نەشمیلان
دەستەی دەسماڵ تەنزیلان
ئەو ساڵ ناچن بۆ دیلان
نەنگە دیلان بۆ دیلان

***

بڕا نانی سەرخوانان
گرا لاوی گوێسوانان



کاڵ بوّوه پەنجەی جوانان
کوانێ گەمەی جێژوانان؟

***

وەپاش کەوت خەباتمان
داگیراوە وڵاتمان
تێپەڕی ڕۆژی هاتمان
ڕووخا کۆشکی ئاواتمان

***

نەهاتی و تەنگانەیە
باو باوی بێگانەیە
خەزری ئەو یەکانەیە
لێمان لە بەهانەیە

***

بووینەوە دیل و یەخسیر
وڵاتمان کرا داگیر
ڕاوکەر بوونەوە نێچیر
یووسف خرانە ناو بیر

***

حکومەت نیزامییە
تۆزێک ئازادی نییە
ئامانجی دوژمن چییە؟
قڕکردنی خەڵکییە

***

کە شەو داهات دێژبانی
لێمان دەچێتە سەربانی

تفەنگی لەسەر شانی
بۆتە ڕۆستەمی سانی

***

دەڵێ فەرمووی فەرماندەر
لە شامەوە تا سەحەر
هەر کەس لە ماڵ هاتە دەر
(کلکش بکن پسر)

***

داخرا دەرکی ڕۆژنامە
شکاون نووکی خامە
کوردی نووسین حەرامە
دوژمن دەڵێ بێ تامە

***

دڕان کاغەز و دەفتەر
گیران شاعیر و نووسەر
کۆمەڵێک بوون دەربەدەر
کۆمەڵێکیش دەسبەسەر

***

خوێندن بەزمانی خۆمان
سووچ و تاوانە بۆمان
چاپخانە و بڵیندگۆمان
بوونە بەردی بن گۆمان

***

لەلایەک قات و قڕە
لەلایەک کوشت و بڕە





هەموو کەس حاڵی شڕە
دوژمن نان و دۆ بڕە

***

ئاژان وەکو سەگی هار
دەخولێنەوە لە ناو شار
درۆزن و ڕیاکار
دز و جەردە و بەدکردار

***

بەرتیل خۆر و گورگەمێش
وەک سەگی سەر خۆڵەمێش
چەنە سووک و دەم لەپێش
بەفیشاڵ و کێشەکێش

***

ئەمنیە وەک داڵ و قەل
بڵاو بوونەوە ناو گەل
کێ ئازایە بڵێ لەل!
هەتا بیکەن شێت و شەل

***

بۆخۆیان پێ ڕادەگەن
خەڵکی لە کونەڕەش دەکەن
تا پشووی دێ لێی دەدەن
بەقەمچی وەک خەرەزەن

***

لە پیاوی ئازا و سەرکەش
لە زەحمەتکێشی بێ بەش

ئاخنراوە كونەڕەش
نابینی كەسێ ڕووگەش

***

دەستیان كرد بە ڕەشبگیر
ناپارێزن جوان و پیر
دێ زرەی كۆت و زنجیر
هەر لێمان دەسوون شمشیر

***

پیاوی مازاد و ماڵیات
دەسوورێنەوە دێهات
دەستێنن دەغڵ و داهات
لە كرمانج و ئاغاوات

***

ئاغا زانی ئەو جارە
ئەو قەندە ژەهری مارە
پێشبینی كاك هەژارە
ئێستا شەق بەخەروارە

***

قەندی بە زاری تاڵە
دەدا باجی پێنج ساڵە
چاو لێ پۆشین مەحاڵە
كار ئێستا بەگۆپاڵە

***

نۆشی گیانی بێ هەی گۆڕ
گێژی، گەوجی، لەخۆگۆڕ



با هەر سەری بکا شۆڕ

بۆ دوژمنی مچ و مۆڕ

***

بەقەند و شەکر و کووتاڵ

بۆ ئێمەی دێنا ڕاماڵ

ئێستا کەوتووە وەک سیپاڵ

لە گشت لا دەیدەن ڕەپاڵ

***

سواریان کردن پیادە

جامیان کردن بێبادە

داریان کردن ئامادە

شەهید کران (بەگزادە)

***

لە سەقز و لە بۆکان

شین و شەپۆڕە و گریان

تێکۆشەر لە دار دران

قارەمان لەناو بران

***

لە چوارچرای مەهاباد

لە کانگای بیری ئازاد

دەستی ڕەشی ئیستیبداد

چەقاندی داری بێداد

***

لە کاتی نیوەشەوا

لە جەنگەی شیرن خەوا

کــــرا کـــــاری نـــاڕەوا
لــــــە دار درا پــــێشـــــەوا

***

ڕۆڵـــــەی وەفـــاداری کــــورد
پــــێشـــــەوای ئــــارام و ورد
بـــۆ کـــورد ژیا، بـــۆ کـــورد مـــرد
گیانـــی فیـــدای گەلـــی کـــرد

***

زانـــــا بوو، کوردپــــــەروەر بـــوو
پێشــــــەوا بـــوو، ڕابـــەر بـــوو
هـــەر کـــورد نـــەبوو بـــەشەر بـــوو
خەمـــی خەڵکـــی لـــەبـــەر بـــوو

***

بـــۆیـــە دێـــوی ئیســـتیعمار
کــــۆنەپــــەرســـتـــی زۆردار
زاڵـــم، خوێـــنڕێژ، بـــەدکـــردار
بـــۆیـــان ئـــامـــادە کـــرد دار

***

ڕۆڵـــەی کــــوردی بلیمـــەت
نەترســـا لـــە دار و پـــەت
پشـــتی نـــەکـــرد لـــە میللەت
وا دەبـــێ زیـــــک و هیممەت

***

بــــــەڵام کـــوردە نـــابـــەزێ
بـــەو زەبـــرانـــە نـــاتـــەزێ




لە ڕقان لێو دەگەزی

کە سوار بوو دانابەزی

***

داخدارە، خوێنی دیوە

بێدارە، خۆی ناسیوە

لە دوژمن ڕاپەڕیوە

باسکی لێ هەڵمالیوە

***

بەکار و توند و تۆڵە

خۆی ساز دەکا بۆ تۆڵە

ورد دەکا وەک پڕپۆڵە

تاج و تەختی ئەو زۆڵە

***

کوڕ و کچ و پیاو و ژن

ئیستا لێوان دەکرۆژن

دەڕۆستیان نایە دوژمن

دەی ئەنجنن، دەیکوژن

گردبداغ - ١٣٢٦

***

# کچی مەهاباد

لەباری، نازەنینی، نەرم و نۆڵی، دڵتەڕی، شادی
لە چاوی بەد بەدوور بی ئەی کچی جوانی مەهابادی
لە جوانیدا، لە پاکیدا، نییە هاوتات و نازانم
فریشتەی ئاسمانی یانە پەروەردەی پەریزادی؟
سەری کوڵمت گەشە هەروەک گوڵی کوێستانی کوردستان
لەبەر بەژنت دەبێ سەر دانوێنی خەڵفی شمشادی
دڵی سەد عاشقت کردە نیشانەی تیری موژگانت
کچی کوردی! لە تیر ئاویتنا مەعلوومە ئوستادی
بە شمشیری دوو ئەبرۆت جەرگی خەڵکی لەت دەکەی دیارە
دەزانی چەک لەکار بێنی، کچیش بی تۆرمەی مادی
لەسوێیانت وەها دێوانە بووم چاوەمەستی خوێن شیرن
لە قەڕنی بیستەما ڕەنگە ڕەچاو کەم کاری فەرهادی
ئەوێستا تۆ لەوێ دیلی دەسی بێگانەی و ئەمنیش
لە دووری تۆ دەکێشم ڕەنج و دەرد و داخی بێ‌مرادی
زەمانە (هێمن)ی تۆی وێڵی دەشت و چۆڵ و سەحرا کرد
فەرامۆشی مەفەرموو، جاروبارە هەر بکە یادی

شیوە ڕەزان ـ ١٣٢۶



## بەهاری کوردستان

شەماڵ هات بەگاڵەگاڵ
هەور بوون گەواڵ گەواڵ
پشکووت گوڵی گەش و ئاڵ
بلبل کەوتە ناڵە ناڵ

***

بە لەنگێزە، بە باران
بە شنە بای بەهاران
توانەوە وەک جاران
کەوی بەفری نیساران

***

نەما مژ و سەرما و سۆڵ
نە سیخوار ما نە سەهۆڵ
تەرت و ڕژد و شیو و دۆڵ
لێی هاتە دەر گیا و گوڵ

***

دەشت و چیمەن ڕازاوە
کێو بەندەن نەخشاوە

زۆنگ و چێنکە ژیاوە
گیا سەری پێوە ناوە

* * *

لە هەوشین و گەدە و لەند
لە کوێستانی دە سامەرەند
هەڵز بیزا و گیابەند
تێک چرژا، بۆتە زەمەند

* * *

مەندۆک و خاو و کەما
لە نەرمان و ئەستەما
بەسەروە هاتنە سەما
وەیشوومە و سەرما نەما

* * *

وێستاوە زەنگوڵ زەنگوڵ
ئاونگ لەسەر پەلکی گوڵ
لەسەر چڵی سوورە گوڵ
بلبل دەخوێنێ بەکوڵ

* * *

دیسان لە چیا و لە ڕازان
دێ سیرەی سەقر و بازان
پێم خۆشترن لە سازان
لە ئاهەنگ و ئاوازان

* * *

بزوێنە هەموو وڵات
زیندوو بۆتەوە ماڵات




جەنگەی بانەمەڕێ هات

بەرەو کوێستان چوو خێڵات

***

دیسان هات وەکو جاران

هەوهەوی شۆڕەسواران

ویڕەی جلیت و داران

خرمەی ناڵ و بزماران

***

هات خرینگەی زەنگ و قۆڕ

لوشمەلوشم و هۆڕە هۆڕ

هۆقە هۆق و بۆڕە بۆڕ

حیلەی جانوو ئەسپی تۆڕ

***

کار و کووری بزن و مەڕ

لرفە لرفی لۆک و نەڕ

کوڕژنی ئەسپی بەدفەڕ

گوێچکەی پیاوی دەکا کەڕ

***

وەنەوشەی جوانی خۆشبۆ

هاتە دەر لە لێوی جۆ

دار دەری کردووە چرۆ

کەروێشکەی کرد گەنم و جۆ

***

سوێسن و بەیبوون و شللێر

ڕواون لە جێگای زەنوێر




قــــەڵبەزی بــــەست ئــــاوهــەڵدێر
شــەپــــۆڵان دەدا ئــــەستێــــر

***

بــۆنی خــــۆشــی هــــەڵاڵــە
پیــاو مەســت دەکا لــە نــواڵــە
وەک شــــەهیدە گــــوڵاڵــــە
لــــە خوێنــــاوا شــــەڵاڵــە

***

گــــرمەی هــــەوری بــــەهــاران
دێ بــــەیــان و ئێــــواران
خــــونــــاوەی وردە بــــاران
تــــەڕ دەکــــا گــــەڵای داران

***

ئــــەو تــــرۆپــک و نشــــیوە
ئــــەو یــاڵ و خــــڕ و شــــیوە
لــەگوێــن بەهەشــت خــەملیوە
کــــێ مــــەڵبــــەندی وای دیوە؟

***

تیــرەگ و گــــەوە و لاپــــاڵ
پێــــی دادرا تــــارای ئــــاڵ
ســــەرچــــاوەی ســارد و زوڵاڵ
هــــەڵقــوڵــی وەک زیوی قــاڵ

***

هــــات لــــە ڕەوەز و زەردان
قاســــپەی کــەوی ســەر بەردان



ورتەورتی هەوێردان
دێ لەناو شیناوەردان

***

لەکن کارژیلە و بەرخەل
لەکن بزن و مەڕی شەل
کە بۆیان هەڵکەوێ هەل
کچ و کوڕ دەکەن هەمزەل

***

کیژۆڵەی شۆخی جوان چاک
شۆڕەژنی داوێن پاک
ڕووهەڵماڵا و بێ باک
دەڕەتێنن زاو و ماک

***

فیتەی شوان، ئۆحەی گاوان
دێ لە مۆڵگە و دەراوان
دێتە گوێ لاوکی لاوان
بالۆرەی بەڵەک چاوان
منداڵ لە ڕژد و هەڵدێر
بەر دەدەنەوە تاوێر
شوانە لەسەر بەردەبێر
تێی تووڕاندووە لە بلوێر

***

مەڕ لە گۆشتا بووە سوور
خۆ هەڵداوێن شەک و کوور
گەماڵ دەکەن چەق و لوور

سەوەڕیان دەچێ بۆ دوور

***

کچی لەباری ڕەوەند
هەڵی کرد بەلەک و زەند
کەزی هۆنیەوە وەک بەند
کوڕان دەگرێ بە کەمەند

***

لەبەر دەرکی ڕەشماڵان
دەبینی چاوکەژاڵان
دڵان دەبەن بەتاڵان
کاس دەکەن کوڕ و کاڵان

***

لێوئاڵن، دەم بچووکن
خوێن شیرن، ڕەزا سووکن
کوڵمەیان وەک گوڵووکن
گەورە کچن، نۆبووکن
شل و مل و لەبارن
چاو بەکل، گوێ بەگوارن
دەسماڵ پوولەکەدارن
شەدە و گێل گێلە لارن

***

ناسک نەرم و نۆڵن
خاوێنن، سپی و سۆڵن
بڵبناسی و توند و تۆڵن
بەمژۆڵ جەرگان دەکۆڵن



***

هەڵیانماڵیوە باسک
باسکی قەڵەو و ناسک
کە دەکەن تاسکە تاسک
ڕەوەکترن لە ئاسک

***

کیژی مەرزینگ و سەکرن
بەلەنجەولار ڕادەبرن
ناز دەکەن، چاو دادەگرن
کوڕگەل دەبەریان دەمرن

***

کابانی قۆڵ بەبازن
شەنگەبێری کێل گەردن
لەنێو مەڕ دێن و دەچن
وەک پۆلی پۆڕان دەچن

***

سوێسن و وەنەوش و هەمین
کەژێ و خەندان و جەمین
خاسێ، کەوێ، خاتووزین
بەپۆل دەچنە مەڕدۆشین

***

زێڕن و کابان و مێرێ
دانیشتوون لەبەر بێرێ
ئەستی دەکا هاوێرێ
گوڵێ بەرخان دەژمێرێ

***

خونچە و گوڵووک و گەوەر
شەم و کەژاڵ و دڵبەر
زین وَ مرۆت و ئەسمەر
لە تاوڵی هاتوونە دەر

***

مامز دایگرتووە شیری
ناسک دەکوشێ پەنیری
ناز دەشێلێ هەویری
کاڵێ دەکا نان تیری

***

ئامان چۆتە کوڵێنێ
پەری مەشکەی دەژێنێ
بەسێ لۆرکێ دەکوڵێنێ
خەیاڵ ئاوردووی دێنێ

***

(هێمن) لەسەرەخۆبە
نەکەی بچی بۆ هۆبە
دەنا دەشکێنی تۆبە
ئاور دەگری وەک سۆبە

نێزە - خاکەلێوەی - ١٣٢٦

***



## بابردەڵە

لەبەر ئازاری ژینی نالەباری
دەناڵێ بلبلی شەیدا بەزاری
بەسۆز و داخەوە دەیگوت فەقیرم
پەرپوۆم هەڵوەری، بێ وادە پیرم
مەلێکی فێری دارستان و لێڕ بێ
قەفەز پیری دەکا با شووی لە زێڕ بێ
تەلار و سەرسەرا و کۆشک چ دێنێ
کە کۆیلە وەرهەمی تێدا هەڵێنێ
لەگەڵ کازیوە بۆی نەفەرم چلاوچڵ
نەبینم گوڵ، چلۆن ئارام دەبێ دڵ
چ خۆشە عیشق و سەرمەستی، چ خۆشە
چ خۆشە ژین بەسەربەستی، چ خۆشە
چ تاڵە کۆیلەتی و دیلی، چ تاڵە
بەکەم بێ ژینی وا پڕ ئاه و ناڵە

***

من و کونجی قەفەز ئەی داد و بێداد
ئەمن دیلم، قەلیش سەربەست و ئازاد
لە سوێ هێلانەکەم لەت لەت بوو جەرگم
لە تاوی گوڵ نەمام، نیزیکە مەرگم

دەبێ چەند بەرد لە هێلانەم گرابێ؟
گوڵی سوورم چلۆن پەڕپەڕ کرابێ؟
دەبێ چۆن فێر کرابێ باڵ بکا کل
لەبەر پلاری دوژمن بێچوە بلبل
دەسا ئەو ڕاوکەرە کوێر بێ لە چاوان
منی خستە قەفەز بێ سووچ و تاوان
چ ئینسافە ئەمن بەو دەنگی خۆشم
ئەسیر و دیل و زیندانی و خەمۆشم
بەڵام ئێستا قەلی ڕووڕەش لە گوڵزار
بە قارەقارڕ دەدا گوێی خەڵکی ئازار
گوتم ئەی بلبلی خەمگینی دڵمەند
مەناڵێنە لە دەس داو و لە دەس بەند
بزانە تۆ ئەوەی ئەهلی هونەر بێ
دەبێ یا دەسبەسەر یا دەربەدەر بێ
هونەرمەند و ژیانی خۆش محاڵە
هونەرمەند ڕەنجەڕۆیە، ژینی تاڵە
ورینگەی خۆشەکەت بۆ تۆ بەڵایە
ئەتۆ خۆش خوێنی حاڵت بۆیە وایە
ئەگەر نەتبا ورینگە و دەنگی وا خۆش
بەرەڵلا بووی وەکو ئەو ڕووڕەشە تۆش
منیش ئەی بلبلی بەندی وەکو تۆم
وەها دوورم لە هێلانە و گوڵی خۆم
منیش وەک تۆ لەکیسم چوو گوڵی سوور
منیش هێلانەکەم لێ کراوە خاپوور
منیش بابردەڵەی بەر گێژەڵووکەم




دەمێک لەو قوڵکە، تاوێک لەو چڵووکەم
منیش زۆرداری پرزەی لێ بڕیوم
منیش بەدکاری بواری لێ تەنیوم
منیش بێدادی شاباڵی شکاندم
بەناکامی لە خوێناوی تلاندم
منیش چونکە بڕێک خاوەن هونەر بووم
هەمیشە ڕەنجەڕۆ بووم، دەربەدەر بووم
هەزار گۆوەند و سەد پەندم بەسەرهات
لە ئامێزم نەگرتووە بووکی ئاوات
هەزار سوورکەم لەبن هەنگڵ دراوە
دەمم گیراوە، چاوم بەستراوە
لە ئامێزی گەرم بێ بەش کراوم
وەکو تۆ تووشی ڕۆژی ڕەش کراوم
ژیانم پڕ لە ڕەنج و دەرد و داخە
ئەوە گیرساومەوە لەو کێو و شاخە
کەسێک نەی پرسی، نەیزانی چلۆنم
لە یادان چوومەوە، چیرۆکە کۆنم
بەشەو ژان و پەژارەم دێنە پاڵێ
بەڕۆژ ئۆقرەم نییە ساتێک لە ماڵێ
بەڵام هاودەردی ئازیزم هەتا هەم
وەکو تۆ دەردی دڵ ناکەم لە دەس خەم
ئەمن پێم خۆش نییە ئاودەنگێ قەل بم
ئەمن پێم خۆش نییە بێزراوی گەل بم
هەتا دوژمن نەگەوزێنێ دەخوێنم
دەخوێنم بۆ گەلی خۆم، هەر دەخوێنم

# فرمێسکی گەش

قەت لە دنیادا نەبوو بێجگە لە ناخۆشی بەشم
مات و داماو و پەشێو و بێکەس و چارەڕەشم
سەردەمێک ئاوارە بووم و ماوەییکیش دەسبەسەر
ئەمدی ڕووی ئاسوودەیی، هەر تووشی گێرە و قەڕقەشم
دابی کوردی وایە، کەس لاگیری لێقەوماو نییە
بۆچی سەرکۆنەی بکەم لێم زیزە یاری مەهوەشم؟
تیغی بێ مەیلی و جەفای ئەو نازەنینە دڵڕەقە
جەرگی لەت کردم بەجارێک ئەنجنیویە سینەشم
کوشتمی و شەش خانی ئومێدی لەمن گرتن حەریف
مۆرە هەڵداوێم و بێهوودە بەهیوای دووشەشم
نابینی زەردە لەسەر لێوی کەسێ لەم شارەدا
گەر خەم و دەردی دڵی خۆمیان بەسەردا دابەشم
خۆشەویستی گۆشەکەی تەنیایی هەر ئەژنۆکەمە
بۆیە ڕۆژ و شەو وەها گرتوومەتە نێو باوەشم
نایەڵێ دوژمن بەڕەنگە زەردەکەی من پێکەنێ
تا دەمی مردن ئەمن مەمنوونی فرمێسکی گەشم
شاعیرێکی ڕاست و یەکڕووم و فیداکار و نەبەز
کوردە موحتاجی محەک نیم زێڕی بێ غەلل و غەشم

شیلان ئاوی - ١٣٢٧




# گریانی نیوەشەو

شەوانە ئەو دەمانەی شەو دەگاتە کاتی نیوە شەو

خەڵک نووست و لە چاوی من کەسەر دیسان ڕەواندی خەو

سکووتێکی بەسام سەرتاسەری ئەم دێیە دادەگرێ

دەڵێی هەر زیندەوارێکی هەیە لەو دێیەدا دەمرێ

لە هیچ لا خشپەیەک نایە، چرای ماڵێکی نایبیسێ

بەئەسپایی لە ماڵ دێمە دەرێ دەخوشم وەکو نیسێ

تەک و تەنیا بەئارامی دەچم بۆ گردەکەی بەر دێ

بەدڵتەنگی و کز و خەمناکی ڕادەکشێم لەسەر بەردێ

دەکەم جا سەیری ئەستێران و هەڵدەمژم شنەی شەویا

شەو و بێدەنگی چەند خۆشە، هەمیشە خۆزگە هەر شەو با

وەکو ئاواڵی چاک ئەستێرەکان گوێ ڕادەدێرن بۆم

هەتا بۆیان بەیان کەم موو بەموو ڕازی دەروونی خۆم

کوڵم هەڵدەستێ ئەو جارە و لەبەر دەردم دەناڵێنم

هەتا ئاوری دڵم دەکوژێتەوە ئەسرین دەبارێنم

شەوانە گەر نەکەم ئەو شیوەن و ناڵین و گریانە

دەسووتێنێ وجوودم ئاگری ئەم جەرگە بریانە

بەڵێ گریانی نیوەی شەو دەکا ناسۆری دڵ مەرهەم

کوڵ و کۆم دادەمرکێنێ و بەجێ دێڵێ دڵی من خەم

شیلان ئاوی - ١٣٢٧

## ئارەزووی فڕین

ژین بەیخسیری و دیلی بێ کەڵکە
بۆیە لەمێژە لە ژینم تێرم
گوزەران بۆ من لەناو ئەم خەڵکە
سەختە، ناخۆشە، چۆنی ڕابوێرم

***

هێزم لێ بڕا تاکەی دەربەرم
لەناو مەینەت و دەردی سەرزەمین
ئەوە بەینێکە کەوتۆتە سەرم
بیری ئازادی و ئارەزووی فڕین

***

بەڵام داخەکەم نیمە باڵ و پەڕ
کە بفڕم، بڕۆم خۆم بدەم نەجات
بچمە شوێنێکی لێی نەبێ بەدفەڕ
لەباوەش بگرم نۆبووکی ئاوات

***

ئەی سروە باکەی بەیانی! وەرە
بە شنەشن و پشووی خۆت توندکە

لــــەســــەر ئــــەو دونیــا نەویـــەم لابـــەرە
هەتـــــا دەتـــوانــــــی ئـــەمن بڵنـــدکە

***

نــانــا هــــــەورەڕەش! ئــــەورۆ نــەوی بــە
لـــــــەو بــــەرزانــــــەوە وەرە خــــــوار
کــــــەم کەمـــــــە وەرە ڕێـــکــــی زەوی بــە
لەســــەر پشــتی خــۆت ئەمــن بکــە ســوار

***

ئەوجـــــار هەســــــتەوە بــــرۆ بــــەرەو ژوور
مەوێســــــــتە هەتـــــا تەشــــــکی ئاســــــمان
بمبــــەرە نیزیک ئاســــۆی جــوان و ســـوور
نەجــاتــم بـــــدە لــە کاولـــــی خـــــەمان

شیلان ئاوی ـ ١٣٢٨

***

# خونچەی سیس

دیتم لەناو دار و دەوەن
لەسەرچڵی سوورە گوڵێک
هەڵکورمابوو، دەیکرد شیوەن
بەری بەیانی بولبولێک
گوتم ئەی مەلی دڵسووتاو
چییە، بۆ دەناڵی بەتاو؟
کە ناڵینت بۆ ئەوەیە
گوڵت وا زوو هەڵوەریوە
ئەو ناڵینە بێ فایدەیە
بۆچی نازانی، نەتدیوە؟
گوڵ هەفتە ناباتە سەرێ
سیس دەبیت و هەڵدەوەرێ
وەڵامی دامەوە بولبول
بەشێنەیی، بەکاوەخۆ
گوتی نانالێنم بۆ گوڵ
کە سیس بووە، دەزانی بۆ؟
ئەو عومرێکی ڕابواردووە



پشکووتووە جا سیس بووە
ناڵینی من بۆ خونچەیە
بۆ خونچە پەشێو حاڵم
ئەو داخە لە دڵمدا هەیە
بۆیە هەمیشە دەناڵم
ئەو، پێش پشکووتن سیس بووە
بەجوانەمەرگی مردووە

شیلان ئاوی ١٣٢٨

***




## گۆمی خوێن

عەزیزم بۆچی تۆراوی لەخۆڕا؟
چ قەوماوە؟ دڵی تۆ بۆچی گۆڕا؟
ئەتۆ وا زوو لەبیرت کردم ئەمما
فەرامۆشت نەکەم شەرتە لە گۆڕا

***

لە من ڕا خۆ خەتایەک ڕووی نەداوە
ئەدی بێ مەیلی بۆ ڕووی دا لە تۆ ڕا
ئەسیری کەزیەتە کۆتری دڵی من
دەبێ حاڵی چ بێ کۆتر لە تۆڕا؟

***

سەر و ماڵ و کەماڵ و بیر و هۆشم
لە نەردی عیشقی تۆدا پاکی دۆڕا

***

لە چاوم دێ بەخوڕ فرمێسکی خوێنین
کەچی ئەم گۆمە خوێنە هەڵنەچۆڕا
من و لاشەی پەپوولە ماینەوە و بەس
شەوی دووری، شەمیش تواوە لە کۆڕا



## ئاواتی بەرز

لاگری سولحە تەواوی ڕەنجبەری وشیاری کورد
چاوەنۆڕی دەرفەتێکە خەڵکی لادێ و شاری کورد
کوندی شوومی شەڕ لە زەندۆڵان خزی بەدزی و فزی
کۆتری سوڵح و ئاشتی نیشتووە لەسەر دیواری کورد

***

دەستی دا دەستی برای و هاتە ناو کۆڕی خەبات
کیژی نەشمیل و لەبار و شۆخ و گوێ بەگواری کورد
کورد گوتوویە سوار هەتاکو نەگلێ قەت نابێ بەسوار
ئێستە چابوک سوارە، چونکە زۆر گلاوە سواری کورد

***

فێری زۆر دەرسی بەکەڵک و باشی کردین تێشکان
جا ببینە ڕاپەڕین و شۆڕشی ئەم جاری کورد!
بەیت و باڵۆرەی هەزار جار بۆ بڵێ کۆنەپەرست
تازە وێژینگێکی نادا دیدەکەی بێداری کورد

***

ڕۆژ بەڕۆژ قایمترە، مەحکەمترە، بڕوایەکەی
دەم بەدەم چاکتر دەبێ، باشتر دەبێ، ئاکاری کورد

بـــێ وچـــان دەڕواتـــە پێـــش و ڕێگـــــە دەبــڕێ بــۆ هــەدەف
زۆر لـــە ســـاڵان ڕوونتـــــرە ئـــــەو ســاڵەکە ئەفـــکاری کـــورد

***

کـــورد بەزینـــی بـــۆ نەبــــوو دەســتی نــەدا، بــا دوژمنیــش
ڕانەوەســــــتابێ لــــە تـــــاڵان و بـــــڕۆ و کوشـــــتاری کـــورد
ئـــــەو لـــــە ئـــازار و شـــکنجەی قـــەت نەبـــوو خافـــڵ، بـــەڵام
کــــوردی کـــردۆتە ســـماتە جـــەزرەبـــە و ئـــــازاری کـــورد

***

ســـەد هـــەزار بـــەرگێـــڕەوەی با بێتـــــە ســــەر ڕێ، ئـــاخـری
هــەر دەگاتـــە مـــەنـزڵـــی ئـــاوات و خـــۆشـــی بـــاری کـــورد
مافـــــی کـــــوردی هـــــەردەبـــێ بســـــتێندەرێ بســـــتێندەرێ
دوژمنـــی کـــورد تـــێ گەیشـــــتووە ناکـــرێ باشـــاری کـــورد

***

وا گـــزینگـــــی دا بـــەیـــانـــی جـــوانـــی ئـــازادی بـــەشـــەر
ڕۆژی ڕوونـــاکـــە، نــــەمـــاوە زوڵمـــــەتـــی شـــــەوگاری کـــورد
نایــــــەوێ یاریـــدەدان و کـــــۆمـــەکـــی نەســـڵی چـــــوار
جووجەڵـــەی ئاغـــای (ترۆمـــن) وێـــی کـــەوت پلـــلاری کـــورد

***

هەرکـــە تووشـــی بـــوو دەڵـــێ: (یانکـــی گۆهوم یانکـــی گۆهوم)
تـــازە دەســـــتی ئەجنـــەبـــی ناتوانـــێ بگـــــرێ زاری کــــــورد
تووڕەیـــی خەڵکـــی کـــە دی وا کلکـــی گرتـــە نـــاو گەڵـــۆز
دوژمنـــی خوێـــــڕی، وەکـــــو ڕێـــوی لـــە ترســـی داری کـــورد

***

دێتــــــە ســــەر ڕێبـــازی راســـت و دێتـــــە نـــاو کـــۆڕی خەبات
خـــوارەپێچـــەی لێ بـــڕاوە پیـــــاوی خێـــچ و خـــــواری کـــورد



هێزی بێگانەی لەپشت خۆی دیبوو، بۆیە وای دەکرد
باری هێلکان نابزێوێ خاینی لاساری کورد

***

دانەنیشێ گەر لەسەر ئەو پەتک و سینگە بێگومان
تۆ لە ئەستۆیدا دەبینی پەتک و گوێلەوساری کورد
تێک دەدەن کۆشکی بڵیندی مفتەخۆری زگ زەلام
پاڵە و جووتیاری برسی، کارگەری بێکاری کورد

***

دیوتە چۆن خۆی شاردەوە خوێڕیانە وەک ئاغایەکەی!
ئەو گزیرە بەدفەڕەی دەنگی دەدا بێگاری کورد
خۆی لەبەر لافاوی قینی توندی گەل ڕاناگرێ
دوژمنی وەحشی و دڕندە و زاڵم و زۆرداری کورد

***

دەچێتە سەر داری لە ڕۆژی ئینتیقام و تۆڵەدا
ئەو کەسەی کوشتی بەناهەق پێشەوا و سەرداری کورد
نایەڵن ئادار بەسەر پاداری ئەو دەربارەوە
چونکە دەیگوت نایەڵم ئاداری کورد، پاداری کورد

***

«پاش قڕانی مودەعی دەس پێ دەکەن تەعمیری موڵک»
دێتە دی ئاواتی بەرزی «ئەحمەدی موختاری کورد»
«ڕێگەیی ئاسن دەچێتە شاخی هەورامانەوە»
هەر کە کەوتە دەستی کوردی چارەنووس و کاری کورد

***

مەدرەسە و دانیشکەدە بۆ شار و لادێ دادەنێن
خوێندەواریێ تاکو ڕۆڵەی زیرەک و نازداری کورد

ئەو زمانە شیرنەی ئێمە پەرەی دەگرێتەوە
نادڕێ چیدی کتێب و دەفتەری ئەشعاری کورد

***

بێ بڕەو نابێ مەتاعی کوردەواریمان ئیتر
ڕەونەقی پەیدا دەکا ئەو جارەکە بازاڕی کورد
دادەمەزرێنن لە گشت شاری وڵات کارخانەیەک
تا بەدەستی خۆی ڕەنیو بێ بەرهەم و کرگاری کورد

***

بەر دەدەن گاجووتی لەڕ، سواری تەڕاکتۆران دەبن
دێتە دەر بووره و بەیار و بەندەن و نیساری کورد
کشتوکاڵ و جووت و گامان دێتە سەر باری لەبار
پڕ دەبێ تێر و جەواڵ و مشت دەبێ عەمباری کورد

***

خەستەخانەشمان دەبێ، دوکتۆر و دەرمانیش فرە
ناکەوێ تازە لە کووچان خەستە و بیماری کورد
بەختیار و خوێندەوار و ساغ و تێر و پڕ دەبێ
دێتە دەر ماکەی نەهاتی و نەگبەتی و ئیدباری کورد

***

دەست لە ئەستۆی یەک دەکەن ئازاد و شاد و بەختەوەر
کیژ و کوڕ، لاو و گراوی، دڵبەر و دڵداری کورد
بۆنی ڕزگاریت لە شێعری دێ چ جوانت هۆندەوە
ئەی هەژار، ئەی شاعیری تێکۆشەری ناوداری کورد!

***

(کۆتری پیکاسۆ کە مووژدەی هێمنی هێنا گوتی:)
مرد، بەسەرچوو، ڕۆژی ئیستیعباد و ئیستسماری کورد

ئــــەی مــــەلی خـــۆش خــوێنی ئاوارە و تـــەرە و بـــێ‌ئاشـــیان
مـــوژدە بــێ زوو دێیــــەوە نــاو میــللەتــی ڕزگاری کـــورد
بلبلـــــە سەرمـــەســـتەکەی باخـــی مــوکـریــان ئەوچەلیــش
تێــر بخوێنــــە، دەنـــگ هەڵێنـــە تــۆ لەنــاو گوڵــزاری کـــورد
خۆشەویســــتی میللەتــــی خۆتــی لەبیـــر چــۆن دەچییــەوە؟
چاوەڕێتـــــە ئێســــتەکانە شــاری بـــــێ ئەغیـــاری کـــورد
ئــەو ژیانـــەی بـــــێ تــۆ ڕای دەبوێـــری «هێمـــن» مـــردنە
بێکەسـێکە پاشــی تــۆ و پاشـــی ســەرەک کـــۆماری کـــورد

مەهاباد ـ ١٣٣٢

***

# بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ

خاین، خوێڕی، درۆزن، بەدفەڕ، شەڕانی، سەرشۆڕ!
پیاوکوژ، تاوانبار، ڕووڕەش، ناکەس، ملهوڕ، دیکتاتۆڕ!
خەڵکی ئێران بەدەس تۆ کرابوون زیندەبەگۆڕ
ئەوە تۆی لێت قەوماوە، دەریان پەڕاندووی، هەی گۆڕ
دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ

***

ئەی دوژمنی ئازادی، نۆکەری ئیستعمار!
بەدەس تۆ چوونە سەر دار مەزن، پێشەوا، سەردار
بەدەستووری بێگانە دەسووڕا چەرخی دەربار
زاڵ بوو بەسەر دەربارا پاڵە، جووتێر و کرێکار
دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوە ڕێیەت بێ

***

کەی سێبەری خودا بووی، ئەی سێبەری نەهاتی
لە سایەی تۆدا دیمان شەڕ و گرانی و قاتی
لە خزمەتی باوکی خۆتدا لە پیاوکوشتن ڕاهاتی
هەر کە خەڵک لێت ڕاسا، بۆی دەرچووی و هەڵاتی
دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ

***



پشتت لە میللەت کردووە پەنات بردووە بۆ دوژمن
بەدرەقەی ڕێگای تۆ بێ تووک و نزای پیاو و ژن
دوژمنی گەل هەمیشە بەمەرەدی شا دەچن
هەر دیکتاتۆر تێدەشکێ، هەر گەلن ڕزگار دەبن
دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ

***

گزیری گوێ لەمست بووی تۆ بۆ شیرکەتی نەفتی
کلکی ئاغات کێشراوە بۆیە هێندە کەنەفتی
پێمانەوە نووسابووی، هەروەکو قیل و زەفتی
نەکەی بگەڕێیەوە، حالا کە رفتی... رەفتی
دەبڕۆ ئەی شاهی خاین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ

مەهاباد - ١٣٣٣/٦/٢٦

***

## موو ناپسێنم

ئەمن دەمگوت لە دنیا تا بمێنم
لەبەر کەس ئەستەمە سەر دانوێنم
کەچی ئێستا لە داوی بسکی تۆدا
گرفتارم گوڵم موو ناپسێنم

***

ژیانم پڕ لە ڕەنجە و نامرادی
بە هەڵکەوتیش نەهاتم تووشی شادی
دڵم هێند تەنگە هەر جێی تۆ دەبێ و بەس
ئەتۆش مەحکوومی حەپسی ئینفیرادی

***

قەرار بوو بێی لەگەڵ خۆت شادی بێنی
نەهاتی، گەرچی پێت دابووم بەڵێنی
لەناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن
لەکوێ فێر بووی گوڵم پەیمان شکێنی؟

***

ئەگەرچی ڕۆیی، قەت ناچی لە یادم
دەکەم یادت، بەیادی تۆوە شادم
کە بارگەت بۆ هەوار تێک نا عەزیزم



شـــــكا ئەســـــتوونـــدەكی تاوڵـــــی مـــرادم

*** 

شـــــەوانە هاونشـــــینی جامـــــی بـــــادەم

بـــە بـــادە بـــا پـــەژارە و غـــەم بـــە بـــا دەم

كـــــە دەســـتی ڕۆژگار بـــــای دا ســــەری مــــن

ســـــەری شووشـــــەی شـــــەراب وا چـــاكـــە بـادەم

***

## تووڕەیی

ساقیا کوشتمی خەم و مەینەت
دەوەرە لەو شەرابە مەستم کە
نامەوێ جام و ساغەر و پیاڵە
بەشی خۆم بۆ لە لوێچی دەستم کە

***

وەرە ئەی نازەنین بەخێرا خۆت
گێژ و وێژم بکە بە بادە و مەی
با منی ڕەنجەڕۆ لە ژینمدا
هیچ نەبێ جارەکێ بڵێم ئۆخەی

***

حاسڵی تێگەیشتن و زانین
چ بوو بۆ من جگە لە کوێرەوەری؟
سەردەمێکیش پەنا دەبەم بۆ مەی
تا بزانم چلۆنە بێ خەبەری

***

لەو وڵاتە کەسێک لە خەو ڕابێ
بەشی چارەڕەشی و خەم و شینە
تێگەیشتم عیلاجی دەردی من
مەستی و شێتی و نەزانینە



## بۆسەی ڕۆژگار

نیمـــه ئاواڵـــێ لـه گۆشـەی بێکەســیدا غـەم نەبـێ
چاکــه ئـەو لێـرەش وەفـای هـەر مـاوە، سـایەی کـەم نەبـێ
لاپـــەڕەی ژینـــم هەمـــوو هەڵـدیتـــەوە تێیـــدا نییـه
باســـی فرمێســـک و هەناســـه و شـیـوەن و ماتـــەم نەبێ
ڕۆژگاری ســـپڵە بـــۆ مـــن بـۆســـەیـەکی نایـەوە
نەمـــدی هـــەر تیرێکـــی دیهـــاوێ بـەرەو سـینەم نەبـێ
ڕەنجـــی دووری دڵبـــەرم بـــۆ کوشـــتنی مـــن کافییـه
گـەر لـه دنیـادا ئەمـن هیـچ مەینەتـی دیکـەم نەبـێ
کـوا دەزانـێ چەنـد پەرێشـان و پەشـێوە حاڵـی مـن؟
ئـەو کەسـەی گیرۆدەیـی ئـەگریجەو پـەرچـەم نـەبێ
ڕەمـــزی دڵـــداری لـــه زینـــێ فێـــر نـەبـوو یـارم دەنـا
کــوا ئەوینــداری وەفــاداری وەکــو مــن، مـەم نەبـێ؟
کیـــژی شـاریـمان لـەخـۆی وەرگرتـووە چارشـێوی ڕەش
داخـەکـەم نـەمـدی لـەوێ مانگێکـی دەورەی تـەم نەبـێ
شـادی جـارێکـی بـەمیـوانـی نـەهاتـۆتـه دڵـم
ڕەنگـه خـەڵـوەتـخانەیـی خـەم شـوێنی نامـەحـرەم نەبـێ
خـــۆم دەســـووتـێنەم هەتـا بـــەزمـی خەڵـک رۆشـن بکەم
کـێ لەڕێـی خەڵـکا وەکـو شـاعیر دەسـووتێ شـەم نەبـێ

## چارەنووسی شاعیر

بەهار بوو فەسڵی زستانم، ئەگەر یارم لەگەڵ بایە
درۆیە گەر گوتوویانە بەخونچێکی بەهار نایە
لە بارانێ مەپرسە تا هەور بگرێ بەری ڕۆژێ
دەبێ بگریم هەتا ڕووی تۆ لە ژێر چارشێوی ڕەشدایە
هەناسەم لادەدا چارشێو و ڕووبەندی ڕەشت ئاخر
هەور هەرچەندە پڕ بێ کوا حەریفی قودرەتی بایە؟
لەژێر سایەی بڕۆکەتدا حوکمرانی دەکا چاوت
لە سایەی دووخی شمشێرە کە حاکم حوکمی ئیجرایە
لەسەر بەفرێ بەکار نایە وەکو بیستوومە داوی ڕەش
لەسەر کوڵمەت ئەدی بۆ دڵگرە ئەو بسکە تاتایە؟
هونەر ناتوانێ جوانی تۆ بەهیچ شێوێکی بنوێنێ
لە مەڕمەڕ چۆن دەتاشرێ هەیکەلی ئەم بەژن و باڵایە؟
بەڕیشی بۆزەوە سوجدەی دەبەم من بۆ جەماڵی تۆ
ئەدی بۆچی دەیانگوت دار کە پیر بوو تازە دانایە؟
بزەت نایێتە سەر لێو و بەزەت نایە بەحاڵمدا
ئەگەرچی زۆر لە مێژساڵە لە دووت دەخشێم وەکو سایە
دەزانی بۆچی من هێندە پەرێشان و خەفەتبارم



لــــه بــازاڕی ژیـــان غەیـــری هونـــەر نیمـــە چ ســەرمایە
بــەتــوو تــووش تــووشی مــە کتەب بــۆ دەهاتم مــن کــە زانیبــام
خەفــەت، مەینــەت، کەســەر، حەســرەت، بەشــی ئینســانی زانایە
لــەگەڵ چارەڕەشــی و دوورەبــەشی و نــەگبەت دەبــێ هــەڵکــەم
لــەمێژە چـــارەنووســی شـــاعیرانی کـــوردی هـــەر وایـــە

١٣٣٨

***

# جۆلانە

چوومە لای دوکتۆر و گوتی
نەخۆشی دەردەکەت سەختە
گوتم: تۆ پێت وایە دەمرم؟
بەداخەوە، گوتی: وەختە

***

ئەو دڵەکوتەی گرتووتە
پیاوی بەهێزیش بیگرێ
بێتوو ئاگای لە خۆی نەبێ
هێندە پێ ناچێ دەمرێ

***

پێکەنیم و گوتم دوکتۆر!
نالێم زانا و شارەزا نی
بەڵام تۆ پزیشکی ویشکی
باری دڵداری نازانی

***

دڵەکوتەم نییە، دڵم
جێی کیژێکی خانومانە
منداڵە، ئۆقرەی ناگرێ
بۆم دروست کردووە جۆلانە



# ماچی شیرین

بــەمندالّــی لــە لێــوی ئالّــی تــۆم ئــەســتاندووە مــاچێ
بــەپیریــش لەززەتــی ئــەو ماچــە شــیرینەم لەبیــر ناچــێ
بــەســەد دکتۆر و دەرمــان و پــەرســتار نــاکــرێ چارەی
کەسێک تیــری مژۆڵــی ئــەو کچە کــوردەی لــە دڵ ڕاچێ
دەکا گیرۆدەتــر پیرانــی دڵتــەڕ ئــەو کچــە کــوردەی
بچێتــە مــەکتەب و بسکی بــەمۆدەی تــازە هــەڵپــاچێ
خــەم و دەردی زەمانــە پیــری کــردم وشــک و بــێ زەوقــم
کە شــاعیر وشــک و بێ‌شــۆر بوو لەنــاو خەڵکــی دەبێ لاچێ
لــە گۆشــەی بێکەســیدا ئێســتە وا دڵتەنــگ و خەمبــارم
نییــە بــاکــم ئەگــەر ماڵــم بەجارێکــی بەقــوڕدا چــێ
بــەشــی کــوردێکــی زانــا لــەم وڵاتــە مەینــەت و دەردە
ئــەوەی نەتویســت بڵــێ ڕەببــی بــەدەردی کــوردی زانــا چێ
لەنــاو بــازاڕی ئەوڕۆکــەی ئەدەبــدا شــێعری تــۆ (هێمــن)
وەکــو پووڵــی چرووکــە، هیــچ ڕەواجێکــی نییــە، ناچــێ

تەورێز ـ ۱۳۳۸

***

# هێلانەی بەتاڵ

نییــــە باکـــــم ئــەگــەر زاڵــم شــکاندوویەتی باڵــی مـــن
ئــەوە ســەختە کــە وا ناگاتــە گوێــی کــەس ناڵەناڵــی مـــن
بەهــــــار هــات و تەبیعــەت حوکمــی ئــازادی مەلانــی دا
لەنــاو کونجــی قەفــەزدا دیــارە چۆنــە ئێســتە حاڵــی مـــن
لــە گوڵــزاری ورینگــەی بلبلــی سەرمەســت و شــەیدا دێ
بــەڵام نــایــە جــریوێکیــش لــە هێلانــەی بەتاڵــی مـــن
لەســـــەر ناچێتـــــە دەر ســاتێ خەیاڵــی بسـکی خــاوی تــۆ
ئەگەرچــی تێگەیشــتم چــاوەکــەم خــاوە خــەیاڵــی مـــن
ئــەرێ ئــەی ئاســکی ناســک هەتــا کــەی دەســتەمۆ نابــێ؟
ئــەرێ پیرۆزەکــەی خۆشــفەڕ هەتــا کــەی نایــە ماڵــی مــن؟
گوتــت: بــۆت دێمــە جێژوانــێ، هــەزار ســوێندت بەشــاڵم خوارد
لــە ئاهــی عاشــقانەی مــن بترســە، نــەک لــە شــاڵی مـــن
کــە ماڵــت بــێ کەماڵــت بــۆ چییــە لــەو شــارە وێرانــە
کـــە ماڵــی دەوڵەمەنــدی دی، گوڵــم نەیویســت کەماڵــی من
ئەگــەر دەیزانــی مانــای خۆشەویســتی ئــەم کچــە کــوردە
بەســەد یاقــووت و گەوهــەر نەیــدەدا فرمێســکی ئاڵــی مــن
ڕەش و تــــار و درێــــژ و پــــڕ لــە ئــازار و خــەم و دەردە
بەڵــێ شــەوگاری دووری بــوو سەراســەر ژینــی تاڵــی مـــن

مەهاباد ـ ۱۳۳۹



## گلێنەی شاعیر

ئـــەگـــەر خەرمانـــی عومـــرم ئێســـــتەکانە پاکـــی بـــا بیبـــا
بـــەمەرگـــی تـــۆ مـــچوڕکیشـــم بـــەدڵـــدا نایـــە، بـــا بیبـــا
هونـــەر گـــــەر خـــۆی پەرێشـــانی نەبایـــە لـــەم وڵاتەیـــدا
بەشـــــی مـــــن بـــۆ دەبـــــوو چارەڕەشـــــی و خانەخەرابـــی با
لەکـــوێ حاڵـــی مـــن و تـــۆ وا دەبـــوو ئـــەی خۆپەرەســـت ئێســـتا
ئەگـــــەر دنیـــا ئوســـوول و قاعیـــدە و نـــــەزم و حیســـابی بـــا
بـــەجامـــێ بـــــادە تێـــر نابـــم، گـــەر مەیلـــت هەیـــە ســـاقی
گلێنـــەی خـــۆم دەنێرمـــە خزمەتـــت، بـــۆم تێکـــە تـــا بیبـــا
وەبـــەر مـــن نایەڵـــێ لێـــرەش مـــەی و ســـــاقی جەنابـــی شـــێخ
دەنـــا لـــــەولا شـــەراب و حـــۆری بـــا هـــەر بـــۆ جەنابـــی بـــا
هەمـــوو عومـــری ئەبـــەد تێیـــدا نییـــە خۆشـــی دەمێک مەســـتی
خـــدر ئـــاوی حەیاتـــی بـــۆ چ بـــوو؟ فێـــری شـــەرابی بـــا

۱۳۴۰

***

## گێژەڵووکەی خەزان

گێژەڵووکەی بەسام و توندی خەزان
کە پەلاماری دایە باخ و ڕەزان
دەشکێنێ نەمامی شلک و تەڕ
گوڵی بۆنخۆش و تەڕ دەکا پەڕپەڕ
ئەو گوڵەی باخی پێ دەڕازاوە
داخەکەم ئێستە هەڵپرووکاوە
هەروەها دەستی بێ بەزەی تەقدیر
نایەڵێ چووک و گەورە جوان و پیر
تازەلاوان لە خوێن دەگەوزێنێ
جەرگی دایکی هەزار دەبرژێنێ
زەبری توندی زەمانی بەدکردار
شاری کردینە شاری پڕ ئازار
هەرچی دەیبینی دەس بەئەژنۆیە
لە هەموو لاوە شین و ڕۆڕۆیە
بزە نابینی تۆ لەسەر لێوێ
چاوە فرمێسکی خوێن دەپاڵێوێ
سەربەقوڕ، مل بەکوینە گەورە و چووک
خەنە شۆرایەوە لە پەنجەی بووک

مەرگـــی ئـــەو ســێ جەوانـــە بـــێ مـــرادە
مـــاتـەمـــی خســـــتە ئـــــەو مـــەهابادە
گەرچـــی (یوسف) ئەســـیری بـــەندی گڵە
ئێســـتە لـــەو (میســـرە) هـــەر عەزیزی دڵە
گەرچـــی بۆخـــۆی خرایـــە چاڵـــی گـــۆڕ
شـــوێنەواری بەنرخـــی مـــاوە لـــە گـــۆڕ
خزمەتـــی خەڵکـــی زۆر بـــوو ئـــەو لاوە
جـــا چلـــۆن دادەمێنـــــێ لـــەولاوە؟
گـــەر (ســـولەیمان) نەما لە کـــۆڕی خەبات
نـــەگـــەیشـــتووە بـــەئـــارەزوو و ئـــاوات
زینـــــدووە تـــا ئەبـــەد لـــەنـــاو خەڵکـــی
چونکـــە بـــۆ کۆمەڵێـــک هەبـــوو کەڵکی
خزمەتـــی عیلمـــی کـــردە پیشـــەی خۆی
خوێنـــدەوار کـــۆڕی شـــین دەبەســـتن بۆی
ڕەنگـــە شـــاگردی کـــوردی وریـــا و ژیـــر
دەرســـــی ئـــەو لاوەیـــان بمێنـــێ لـــەبیـــر
کاکـــە (داوود) ئەگـــەر لـــە ڕێـــی ژیانـــا
گیانـــی شـــیرین و پـــاکـــی خـــۆی دانا
فێـــری کـــردیـــن دەبـــێ لـــە کـــارکـــردن
نـــەبـــەزیـــن تـــاکـــو ســـەردەمی مردن
یـــادی دوو پیـــاوی چاکـــی زەحمەتکێـــش
یانـــــی کـــاکـــە عەزیـــز و مـــام دەروێش
خەڵکـــی ئـــەم شـــارە قـــەت لەبیـــر ناکەن
خەڵکـــی ئـــەم شـــارە ئۆگـــری چاکـــەن

مەهاباد ـ ١٥ی بەفرانباری ـ ١٣٤١

# گوڵی هیوا

ئەختـــەر کچی کوردی چاومەســـت!
ئیلهام بەخشـــی شـــێعری پڕ هەســـت!
ئەی پێشـــمەرگەی میللەت پەرەســـت
کـــە دیتمـــی تفەنـــگ بەدەســـت
زانیم گوڵـــی هیـــوا پشـــکووت
بەیانـــــی ئـــازادی ئەنگـــووت
ئەختـــەر پێشـــمەرگەی کۆڵنـــەدەر!
ئەختـــەر ئـــەی گوڵی نێو ســـەنگەر!
خوێنـــت دەتکێ لـــە دمـــی خەنجەر
دەگـــری بـــەری هێرشـــی ئەســـکەر
ســـێرەت گرت بەوچـــاوە جوانـــە
لـــە کەلـــەکـــەی ئـــەم بیـــژوانـــە
شـــەقت هەڵـــدا لـــە زێـــڕ و جـــل
تـــوورڕت داوە کلـــدان و کـــل
تونـــدت کـــردووە پشـــتێنی شـــل
فیشـــەکدانت کـــردۆتـــە مـــل
پســـاندت بازنـــە و پاوانـــە



دەستت دا تفەنگ پیاوانە
نارێژی چاو، سوور ناکەی لێو
شانە ناکەی بسکی پەشێو
یەکجاری فرێت دا چارشێو
ئەوە ڕووت کردە چڕ و کێو
دەبڕی جەرگی دوژمنی زۆڵ
بەسەرنیزە نەک بە مژۆڵ

١٣٤٢

***

# ڕاوه بەراز

تفەنگـــــی ڕاوێ ئەســـــتێنراوە یەکســـــەر
بـەقـەولـــی کاک هەژار، بـێ ڕاوە ڕاوکـەر
مـەفەرمـــوو ڕاو نــەمـا لـەو شـارە تـازە
کــە ســــەیری ڕاوکــــەران ڕاوە بــــەرازە
ئیتـــــر دەرچـــــوو بلێـــــن بـــاوی کـــوڕانە
نەخێـــر بـــاو بـاوی (ســۆنە) و (دوو کوڕانــە)
قورینگ و (ڕەش بەشــە) و (دورنا) و (هەڵەتانج)
نــە ئاغایـــان لــەکــن پیـــــاوە نــە کــرمانــج
بەکەیفــی خــۆی لەســـەر ئـەو ئـاوە ڕوونــە
دەکـا گـــاڵتە و قـــومـاری (پێ بــەقــوونــە)
ســەری چـۆن لـێ دەشـێوێ سـی لــە قۆپی
کــە ڕاوکــەر چونکــە بــێ ڕاو مــاوە تۆپـی
(بنـــە) ڕووخـــان و (ســــیپە) چـۆڵ و هـۆڵـــن
بـــڵاون ڕاوکــــەر و بـــاڵنـــــدە پـــۆلـــــن
ڕفـانـدوویــە (قــەلــەســـابـوونـی) ســـابــوون
کــە هەســتی کــردووە لاگـیـریـــە قـــانـــوون
ئـــەوا (کــەروێشــکە)کــەی ســیخوار لــەپشتە




قـولەشـینی بـەهـەسـت و گـورج و گشـتە
لـە لانـا کـەوتـووە و نـاییتـە بیـری
کـە جـاران شـۆرەتی بـوو سەنـگەسـیری
دەکـا سـمکۆڵ و چـاوی هـەر لـە کۆیـە
کـە نیـری تیـگەیـی پاریـز درۆیـە
ئیتـر کـەس ڕووی نەمـاوە بچتـە کیـوی
بەشـیر گاڵتـە دەکـا ئەوڕۆکـە ڕیـوی
لـەسـەر بـەردی دەخـوینێ (کەو) بەدەسـتە
دەڵـێ ڕاوکـەر ئەگـەر پیـاوی دە هەسـتە
لـە چـاوان هەڵوەریـن فرمیسـکی گوڕگـوڕ
کـە دێ و دەڕوا بـەدەسـتـە (چرگ) و (کوڕکوڕ)
هـەویـردە و (زڕڕەکـەو) دینـە ڕەپسـتە
بـەڵام چ بکـەم چەکـم پـلـلار و مسـتە
لـە سـوور کیـڵان دەنیشـن پـۆلـەکـۆتـر
لـە جـاران زۆرتـریـش و سـەربـەخـۆتـر
(فـەقێ ڕەحـمـانـی) ئـاواڵـت چـلۆنـە
چلـۆن بـێ ڕاو دەژی کالیـارە کـۆنـە؟
گـەرم داهـاتـووە وەک پیـرە لـۆکـی
لـە سـوێ ساچمـەزەنـی کـۆنـەڕەشـۆکـی
ئـەوی زۆر تـوورە بـێ (دەرویـش کـەریـمە)
کـە پیـری ئیمـەیە و پیـاوی قـەدیمـە
گەلیکـی دی هـەرا و بـەزم و تـەق و تـۆق
چـرای ژینـی نەبـوو وەک ئیسـتە بێ شـۆق
بـزەی نایێتـە سـەر لیـوی وەکـو میـر
ڕەبـی بـێ ڕاو نەبـێ قـەت ڕاوکـەری پیر

وەکـــو (ئەحمـــەد) گوتی ئـــەی پیری مەشـــهوور
مەخـــۆ خـــەم بـــۆ تفەنگـــی عەهـــدی تەیموور
ئـــەوەی چابـــوو لـــە شـــانی ئێـــوەدا بـــوو
بەڕەحمـــەت بـێ دەنـــا بـــۆ بســـتە چابـــوو
دەبـــێ حاڵـــی چبـــێ (کاخـــدری) خۆمـــان
کـــوڕی کێـــوان و ڕۆڵـــەی بەنـــد و چۆمـــان
مـــەگـــەر نـــۆکان بخـــوات و بچتـــە ڕاوێ
دەنـــا تـــازە دەوێـــرێ ســـاچمـــە باوێ
ڕەبـی دوژمـــن بـــەحـــاڵـی (بـــەهمـــەنی) بێ
لـــە داخـــا ڕەنگـــە لـــووتـــی داژەنیبـــێ
کەســێکی بچتـــە لای و کـــەڵپـــی بێشـــێ
وەهـــا پـــەرتـــە خلێنـــەی بـــۆ دەکێشـــی
جـــەنـــابـــی (ئـــەردەلان) شـــێواوە حـــاڵی
وەکـــو جیبـــی منـــە ســـاکی بـــەتـــاڵـی
ڕەئیســـە گـــەورەکـــەی کـــانـوونـــی ڕاو بـــوو
ئەویشـــی چـــوو لـــە دەس دەســـتە شـــکاو بـــوو
(رهـــاکـــرد اســـت او خـــوی پـــلنگی)
نـــەمـــاوە پـــوز و فیـــز و زەبـــر و زەنـــگی
کـــە ســـایەی کـــەم کـــراوە ئـــەو لە ســـەرمان
لـــەســـەر کێ لـــێ دەدا ئـــەو جـــارە فـــەرمان؟
گـــەلێکـــی گۆشـــتی کێوی خـــوارد بـــەمـــفتە
لـــە گۆشـــت کەڵ ســـاز بکا بـــا ئێســـتە کـــفتە
یـــەقیـــن (مـــەحمـــوود) بـــا نـــادا ســـمێڵی
ســـمێڵ بـــادانـــی پـێ حـــەیفـــە بـــەدێڵـــی
کـــە ڕاوکـــەر بـێ تفەنـــگ ئەڵبەتتـــە دێڵـــە



لــە هــەمووان دێڵتریـش (مــەحمــوود سمێڵە)
دەڵێـــن دوکتــۆر خــەوی نایــە شنــەوانــە
لــە تـــاوی ڕاوی (مالــۆس) و (یــەکــانــە)
نییــە هــۆشــی لە کــەس وەریــگــریّ ویــزیــت
دەدا دەرمانـــی (تیفــۆس) ۆ (بــڕۆنشـــیت)
لــەکــن خانــم یــەقیــن نــامێنـــی نـــازی
لـــە کــووپــەی ببــڕێ قــاورمــەی بــەرازی
بــەشــی ئێمــەی نــەدا لــەو خەســت و خۆڵــە
مــەسـیحی گــەورە ئــەستاندوویــە تــۆڵــە
(مەمـــی خــان) چاکـــە هـــەر مــاوە جەفەنگی
ئــەوەش قازانــج و ســوودی بــێ تفەنگـــی
بـــەڵام (میــرزا حــەســـەن) کاری کــراوە
تفــەنگێکـــی کـــڕی و تــەحــویلـــی داوە
لــە دەســتی مفتــی زادە کــێ دەکا خێــر
تفەنگـــی دایــە، ڕاوی پــێ نــەکــرد تێــر
تفــەنگـــی تـــازە هێنــابــوو حیجـــازی
بـــەڵام مـــەودای نــەبوو بــۆ تــورکــتازی
فـــەڕوفیکـــی ئــەوە گـــرتــی هەموومـــان
لــە داخانـــی دەبــوو بگـــرن هەمــوو مـــان
چــلۆنـــە کــەیفــەکــەت ڕەحمانـــی قـــازی
دەخــۆی ئێســـتاش کەبابـــی جەرگـــی قـــازی
ئەوێســـتاش لــێ دەنێــی تــۆ سەنگەســیران
دەنێـــری کاســـە ســـفرە بـــۆ فـــەقیــران
مـــەزەی وودکاتــە هێشــتا ســینگی بــاڕی
نــەوەڵـــلا هێنـــدە بــرســی بــەرد دەهـــاڕی

ئەوەت چاکە لە قەسسابخانە دوور نی
وەکو عەولای برات بۆ گۆشت زەروور نی
هەڵەم کرد لێم ببورە تاکو مابی
هەڵۆی و کاکە بۆ کوڵلارە نابی
ئەتۆ پەڕکووری توند و تیژ و دڕ بووی
ئەتۆ سوڵتانی شاخ و کێو و چڕ بووی
زەمانە داخەکەم باڵی شکاندی
لەناو داڵ و قەل و کوندی خزاندی
حەیف ئەی شاهەڵۆ بۆ باڵ و چەنگت
حەیف سەد حەیف بۆ دەست و تفەنگت
حەیف ئەی نابیغەی ڕاوی موکریان
کە باڵندە لەترسانت دەگریان
دەبینم ئێستەکانە چەک کراوی
دەترسم چاوی تۆ کوێرکەن مراوی
ڕەفیقان چاکە ئێوە خەڵکی شارین
وەکو من نین، بەشی زۆرتان ئیدارین
(بیحەمدیللا) هەتانە کار و بارێک
بەڕۆژ کار و بەشەو گاڵتە و قومارێک
ڕەفیقێک، خەمڕەوێنێک، ئاشنایەک
کتێبێک، تەختە نەردێک، سینەمایەک
بەلای ماڵی خەلیفەیدا گەڕانێک
لە خزمەت ئەرمەناکیش ئیستیکانێک
بەڵام من خەڵکی لادێم سەگ بەحاڵم
دژ و داماو، کەنەفت و دەس بەتاڵم
پەرێشان و کزم بێ کاروبارم



بە بێ ڕاویش بەجارێک کوڵەوارم
کە زۆری بۆ دەهێنام دەرد و مەینەت
دەچوومە ڕاو و ئامێزی تەبیعەت
خودایە تازە چۆنی بگوزەرێنم
کە تەنیا تۆپەڕەش بوو خەمڕەوێنم
لە ژوورێ دادەنیشم هێندە، دەمرم
کە دەچمە دەشت و مەزرا سەکتە دەگرم
لە ناو داچێندراوی سەوز و شینم
هەزار جاش و کەر و گوێلک دەبینم
لە باغمدا هەیە سەد بزنە گڕوێ
بزن ئازاد کرابێ، ڕیشە دەڕوێ!
بەجووتیاری بڵێم چاکت نەکێڵا
دەزانم دەسبەجێ ڕۆبۆتە تێڵا
بەگاوانێ بڵێم زیانێ مەفەرموو
دەڵێ لاچۆ بڕۆ وەختێ بەسەرچوو
بەشوانی گەر بڵێم مەیکە لە مێشە
دەڵێ دیارە دەمت ئێستاش لەپێشە
لە ناو دێدا کە دەچمە بەربەرۆچکە
دەدەن دەورم منالی سەر بەکۆچکە
ئەوەندە گوێ لەمست و توند و تۆڵن
ئەگەر زوو هەڵنەیەم چاوم دەکۆڵن
خەریک بووم ڕاگرم دوو گۆڵە تاجی
بەوان ڕاوێ بکەم بۆ ناعیلاجی
حیسابم کرد کە نیمە نانی خۆشم
بەبارانێ ڕزی ئەو ساڵ کڵۆشم

چەلان چابوو هەمان بوو تەختەدامە
بەڵام ئەو ساڵ لە دێ دامە حەرامە
ئەگەرچی زۆر لەمێژە دامە فێرم
بەڵام زەحمەت بەمام سۆفی بوێرم
چلۆن ئاغای بکەم ئێستا لە سۆفی
کە سۆفی تازە ئاغای هەڵگلۆفی
بڵێم ئاغا دەڵێ سندان، دڵەدەرد
دەوێری ناوی ئاغا بێنی نامەرد!
لە مەڵبەندێ کە ئازادی نەبێ پیاو
بە ساچمەزەن بچێتە کێوی بۆ ڕاو
سەگی تێ ڕی چ نرخێکی هەیە ژین
ستەم تا کەی، مەگەر ئێمە بەشەر نین

١٣٤١



## شینی گۆران

هەر لە بۆتانەوە هەتا سۆران
هەموو سۆرانی شینە بۆ گۆران
هەر لە کوێستانەوە هەتا گەرمێن
یەخەمان دادڕاوە تا دامێن
لە جزیرە هەتاکو بەحری ڕەش
نییە کیژێ سەری نەنابێ لە هەش
لە دیاربەکرەوە هەتا ورمێ
سەر بەقوڕ، مل بەکۆنە نێر و مێ
هەر لە کەرکووکەوە هەتاکو سنە
شین و ڕۆڕۆ و فغانی پیاو و ژنە
لە مەریوانەوە هەتا زێبار
وەک زرێبارە چاوی کوردی هەژار
هەر لە زاخۆ هەتاکو کرماشان
پرسەیە، ماتەمە، بەخۆدادان
لە مەهاباد هەتا سلێمانی
نالە نالە لەباتی گۆرانی
هەر لە بیجارەوە هەتا شەمزین

کچ و کوڕ، لاو و پیری کورد شەمزین
لە شنۆوە هەتاکو سەنجابی
تووشی کوردێکی بێ کەسەر نابی
هەر لە هەولێرەوە هەتا پاوە
نەتەوەی کورد پەشێوە، تاساوە
جا چلۆن دڵ بەخەم نەبین، نەگرین
جا چلۆن کۆڕی شینی بۆ نەگرین
شاعیرێک بوو بەنرخ و بێ وێنە
بیری ڕۆشن بوو، چەشنی ئاوێنە
شاعیرێک بوو بەجەرگ و هەڵکەوتوو
پێشڕەوی گەل بوو نەک لە گەل کەوتوو
تاکی کەم بوو لە جوان پەرستیدا
وەکو مێو بوو وشە لە دەستیدا
هەستی پاک، مێشکی تازە، بیری نوێ
شێعری پڕ سۆز، قسەی بەتام و خوێ
دڵتەڕ و خۆش خەیاڵ و ناسک بین
بەهونەر، شارەزا، وشە ڕەنگین
پێم پەری شێعر و مۆسیقا تۆران
بۆیە بردیانەوە سەرێ گۆران
یا خودای جوانی تووڕە بوو لێمان
ئەو چرایەی ڕەوا نەدی پێمان
ڕۆژگار گەوهەری وەبن گڵ دا
داخی ئەو مایەوە لە ناو دڵدا
داخەکەم ئەو بڵێسە دامرکا
کە خەریک بوو وڵاتی ڕوونتر کا

ڕۆیی گۆرانی خۆشەویست ڕۆیی
شین و ڕۆڕۆی گەلی نەبیست ڕۆیی
ڕۆیی بێ وەی گەلی بگا بەمراد
ڕۆیی بێ وەی ببینێ کورد ئازاد
ڕۆیی ئاواتی بردە بن گڵی ڕەش
ڕۆیی کورد ماوە بێ کەس و بێ بەش
حاجی، گۆران و پیرەمێرد مردن
«داخەکەم کوردی ئێمە هەر کوردن»
کوردن و تووشی ڕۆژی تەنگانەن
مەردن و دیلی دەستی بێگانەن

**مەهاباد ـ ١٩٦٢**

***

## تەیڵی ئەمان

قەڵەم سەرکێشە، بیریش مووقەڵێشە
بەڵام یارەببی ڕووی ڕەش بێ زەمانە
دڵی تەنگم لە دەستانی هەمیشە
مەکۆگەی مەینەت و دەرد و خەمانە
هەموو تیری بەڵای ئەو ڕۆژگارە
دەکا بۆ سینگی پڕ زامم کەمانە
برا و خزم و کەسوکارم بەجارێ
ئەوان لێم بوونەتە داسی ڕەمانە
لە ماڵی خۆم دەکەم بۆنی غەریبی
کە بێزارم لە هەرچێکی هەمانە
ئەوی خۆشم دەویست وەک گیانی شیرن
تەماشای بۆتە مشتەی ناو هەمانە
لەڕاس من دێڵەڕێوی ترسنۆکیش
وەها ڕاسا دەڵێی فیلی دەمانە
ئەوی دایم لە ژێر خەڵکا ژیاوە
لەسەر من پاڵەوان و قارەمانە
دەمی خۆشم لە ژینمدا نەدیوە



بخوازم تاکو خۆزگەم بەو دەمانە
گەمەی تۆشم بەلاوە سەهلە خوێڕی
گەلێکم پێ کراون لەو گەمانە
هەمە هیوا بەدوارۆژێکی ڕووناک
بەشی ئینسانی بێ هیوا نەمانە
بەشیوەن چاری کاری ئێمە نایە
خەبات، کەڵکی نییە مامەخەمانە
لەبەر تۆ چارەنووسی شووم و بەدفەڕ
ئەوی قەت لێی نەدەم تەپڵی ئەمانە

١٣٤٢

***

## بەری شێعری

ئەی کچی جوان! کچی لەبار!

ئەی کچی زانا و خوێندەوار!

ئەی گوڵاڵەی نواڵی کوێستان!

مایەی شانازی کوردستان!

تیشکی هیوای دوارۆژی ڕوون!

سارێژکەری زامی دەروون!

گەلاوێژی بەشۆقی گەش!

ڕووناک کەرەوەی شەوی ڕەش!

بەهاری خێر و بێر و هات!

گزنگی بەیانی ئاوات!

شێعرت دەوێ لە منی پیر

لە منی پیری گۆشەگیر

لە شاعیری زمان بڕاو

لە شاعیری دەفتەر دڕاو

لە شاعیری بەساڵا چوو

لە شاعیری وشک هەڵاتوو

شێعرێکی تەڕ، شێعرێکی خۆش

شێعرێک دڵان بێنێتە جۆش
شێعرێک دامرکێنێ دەروون
بە برینان بێنێ گۆشتە زوون
شێعرێک وەک خوناوەی باران
شێعرێک وەک سرتەی دڵداران
ناسکتر لە هەودای خەیاڵ
شیرنتر لە بزەی مناڵ
وەک ئارەقەی هەنیەی جوانان
وەک دڵەخورپەی جێ ژوانان
وەکو کەشم و نەشمی بووکێ
وەک ڕەنگ و بۆنی گوڵووکێ
بێ خەوش وەک ئاونگی گوڵ
پڕپڕ لە هەست و سۆز و کوڵ
لە ئاوی کانی ڕەوانتر
لە پەلکەزێڕینە جوانتر
شێعرێک وەک سێبەری بژانگ
وەکو خەرمانەی دەوری مانگ
ڕێکتر لە گەڕی ڕەشبەڵەک
خۆشتر لە خرمژنی کرمەک
لە کوشینی دەستی دۆ خۆشتر
لە مەکە و ئەیەڕۆ خۆشتر
وەک نیگای چاوی خەواڵوو
بە لەشاندا بێنێ تەزوو
وەک شەراب بگەڕێ لە خوێن
خەمڕەوێن بێ و نەشەبزوێن

شێعرێک وەکو دەریای بێ بن
گەرمتر لە باوەشی ژن
شێعرێک سروودی شادی بێ
شێعرێک دەنگی ئازادی بێ
شێعرێک مزگێنی نەجات بێ
شەوچەلەی کۆڕی خەبات بێ
شێعرێک ڕەق بێ، ڕق بێ، قین بێ
گڕ بێ، بڵێسە بێ، تین بێ
شێعرێک سەنگچنی سەنگەر بێ
شێعرێک بریقەی خەنجەر بێ
هێزێک بێ دوژمن بەزێن بێ
مستێک بێ گورچوو تەزێن بێ
بڵێسەی گوللەی هەڵمەت بێ
شەپۆلی ڕقی میللەت بێ
شێعرێک نووستو ڕاپەڕێنێ
شێعرێک دوژمن داپەڕێنێ
بشکێنێ دەرکی باستیلان
ئازاد بکا کۆیلە و دیلان
هەڵبڕێ قەفی زەنجیران
چەک بداتە دەست یەخسیران
بپەڕێنێ دەستی جەللاد
بهارێ ساتۆری بێداد
نرکەی سینگی کرێکار بێ
ئالای شۆڕشی جووتیار بێ
هەروەک گڕی ئاگری نەورۆز



ڕەمزی ئازادی بێ و پیرۆز
هەزاران کاوەی زەحمەتکێش
پاڵ پێوە بنێ بەرەوپێش
شێعرێک هەم توند بێ و هەم ورد بێ
یانی شێعری ئەورۆی کورد بێ
بەڵام ئەی فریشتەی جوانی
ڕەنگ بێ ئەم نوکتە نەزانی
پەری شێعر وەک کچی جوان
بۆ پیاوی پیر نایەتە ژوان

مەهاباد ـ ١٣٤٢

## ئاسۆری تەشەنا

وەرە مەیگێڕ دەمەوێ ئەوشۆ خەمی دڵ کەم کەم
لووزەوم بەردە سەرێ نامەوێ جورعەی کەم کەم
تەشەنا بۆتەوە ئاسۆری دەروونم دیسان
زامی کۆنە و بەمەیی کۆنی دەبێ مەڵهەم کەم
مشتومالی دەوێ ئاوێنەیی ژەنگاوی خەیاڵ
مەست و گێژم کە، هەتا گاڵە بەجامی جەم کەم
ئێستە بۆ چاری خەمم گۆشەیی مەیخانەیە جێم
من کە ڕۆژێک دەمەویست میللەتەکەم بێ خەم کەم
تا نەڕووخاوە، بەڵا پڕ بێ لە خۆشی و مەستی
تازە پێی ناوێ ئەمن هۆدەیی خۆم مەحکەم کەم
چۆن نەبەم بۆ مەی و مەیخانە پەنا تێ گەییوم
لەو وڵاتە هەموو شت زۆرە، بەنی ئادەم کەم
پیر و زورهانم و ئێستاش دڵەکەم هەر دەیەوێ
سەر و ماڵم بەفیدای خاڵ و خەت و پەرچەم کەم
داستانی مەم و زین کۆنە، کچێکم گەرەکە
شلکەڕانی بگوشم بۆنی لە سینگ و مەم کەم
من لە جوانی دەگەڕێم، تێپەڕە زستانی دزێو



کــچ کــه ڕووم نادەنــێ، بــا ســەیری گــوڵ و شــەونەم کــەم
شــەڕەبــایــە لــە چیاکـــان و هـــەوا تـــووشــە دەنــا
وەکــو شـــێتان دەمەویســت ڕوو لــە چیــای ئــەستەم کەم

مەهاباد ـ ١٣٤٦

* * *




# ڕەق هەڵاتم

من لە داخی خزمی خوێڕی و ئاشنای ئەحمەق هەڵاتم
من لە ترسی زاق و زووقی ئەمنیەی چاو زەق هەڵاتم
کوا بەخۆشی خۆم بەجێ دێڵم وڵاتی خۆشەویستم؟
من لە ترسی زللە و باتووم و دار و شەق هەڵاتم
هەر بەپێیان و بەکۆمەکۆمە گەیمە ئەم وڵاتە
ڕەنگە پێت وابێ بەسواری مایەنی گوێ لەق هەڵاتم
(نۆکەری بێگانە ناکەم) هاتە جێ فەرمایشی خۆم
وا لە برسان و لەبەر بێ بەرگی ئیمڕۆ ڕەق هەڵاتم

١٣٤٧

***



## گەرمەشین

بۆ شەهیدێکی کە گەوزیوە لەنێو خوێن دەگریم
بۆ هەڤاڵێکی کە چوو بێ سەر و بێ شوێن دەگریم

بۆ هەموو پیر و جوانێکی لەسەر کوردستان
چوونە بن داری بەبێ وەی کە بشلوێن دەگریم

بۆ کوڕێکی نەبەزیوی کە لە سەنگەردا مرد
نەک بە سەرشۆڕی و بێ شەرمی لەسەر نوێن، دەگریم

ماچ دەکەم ئەو مەچەکانەی بە کەلەبچە دێشن
بۆو سەرانەی بەگرێی قەمچی دەگروێن دەگریم

گەنجی کوردی وەکو گەنجینە لە هەردی خستن
دوژمنم، تاکو نەزانم هەموو لە کوێن، دەگریم

شۆڕەژن سەبەقوڕ و گەورەکچیش مل بەکوێن
تا بمێنی سەری بەقوڕ و ملی بەکوێن دەگریم

بۆ ژنێکی کە لەسەر تەرمی کوڕی تاقانەی
شین دەکا، جەرگ و دڵی لەت لەت و توێ توێن، دەگریم

دوور لە ئازادی لە زیندانی ڕەش و بۆگەندا
بۆ کەسانێکی دەژین چڵکن و دژوێن دەگریم

بووکی کۆست کەوتوو دەبینم لە پەژارەی زاوا
سەری کوڵمانی دەڵێی زەردەیی سەر سوێن، دەگریم

بۆ پەنا سیلە و بن گیشە و جێ ژوانی چۆڵ
بۆ گراوی و کوڕە حەیرانی کە لێک جوێن دەگریم
بۆ وڵاتێکی بەفرمێسک و بەخوێن دێرابێ
من کە سەیرانی َدەر و دەشتی دەکەم، خوێن دەگریم
تا وەکو مولگە و پێشێلی سوپای دوژمن بێ
کێڵگە پڕ پیتەکەم و بەندەنی بژوێن، دەگریم
تا گوڵاڵەی گەشی بۆنخۆشی ترۆپکی کوێستان
بەگڕی مووشەکی بێگانە بپروێن، دەگریم
بەسیەتی دووبەرەکی و ملهوڕی و لاساری
تا برایانە هەموو پێکەوە نەدوێن، دەگریم
دەمەوێ ڕێگەیی ڕزگاری تەخت بکرێ دەنا
تاکو نسکۆیە بەرن، تاکو هەڵەنگوێن، دەگریم
تا کرێکار و فەلا، ڕەنجبەر و ڕۆشنبیر
دەست لە یەک نەگرن و پیاوانە نەبزوێن دەگریم
تا لەژێر ڕەشبەڵەکی کیژ و کوڕی ڕق هەستاو
جەندەکی دوژمنی بەدکارە نەپەستوێن دەگریم
تاکو بۆ تۆڵەیی ئەو ڕۆڵە شەهیدانەی کورد
خەنجەری ڕۆڵەیی ئازا هەموو نەسوێن دەگریم
تا بەداسی دەسی ئەو پاڵە بەکارەی کوردی
دڕک و داڵی سەرەڕێ گشتی نەدروێن دەگریم
تاکو نەسڕێتەوە فرمێسکی هەتیویاری هەژار
تا هەتیو لێوی وەکو خونچە نەپشکوێن، دەگریم
تا بەدەستی پەری ئازادی لەسەر گۆڕی شەهید
گوڵە شللێرە لەگشت لایەکی نەڕوێن دەگریم



## مەتەرێزی شەرەف

لێرەش لەنێو ئەو لێڕ و شاخ و بەردە
لێرەش لەگەڵ ئەو هەموو داخ و دەردە
لێرەش لەنێو شۆڕشی خوێناویدا
لێرەش لە سەرکەوتن و تەنگاویدا
لێرەش لەنێو زەبر و زەنگی زاڵمدا
لەنێو ساچمە و دووکەڵی ناپاڵمدا
لێرەش لەنێو گڕ و ئاگر و ئاسندا
لە بەرامبەر تانک و تۆپی دوژمندا
لێرەش لەنێو دەریای ڕقی بێ بەستێن
لێرەش لەنێو کوڕانی تۆڵەئەستێن
لێرەش لەنێو شەپۆلی خوێن و کەفدا
لێرەش لەنێو مەتەرێزی شەرەفدا
خۆشەویستم لەبیرم ناچی تاوێ
دەم فڕێنی باڵی خەیاڵم تا وێ
هەرچەند دوورم، بەڵام خۆش بێ خەیاڵم
ئاوارە نیم وا دەزانم لە ماڵم

***

هەر بینا دیت ڕمی کۆشکی زۆرداری
گەیشتینە لووتکەی چیای ڕزگاری
ڕەوی تەمی خەم و مژی پەژارە
بووژانەوە ئەو هەتیوە هەژارە
کوتکی کاوە و هێزی پێشمەرگەی دڵسۆز
ڕۆژی ڕەشی کردە نەورۆزی پیرۆز
مێشکی پژا ئەژدەهاکی مێشکخۆر
جەللادەکەی ئەستۆی کەوتە بەر ساتۆر
گیرا، ڕووخا، خاپوور بوو قەڵای سەختی
وەبەر پێلاقان درا تاج و تەختی
هەترەشی چوو ئەرتەش لە ترسی لاوان
خوێڕی بەزین، هاتەوە ڕۆژی پیاوان
نەترەی نەما دوژمن لەبەر پێشمەرگەم
لەگشت لاوە هەڵات و نەیگرت بەرگەم
زۆردارت دی هەڵاوەسرا سەرەوبن
ئۆخژنی هات دڵی گەرمی بێوەژن
خوێنڕێژت دی گەوزی لەنێو خاک و خوێن
ڕازایەوە گڵکۆی شەهیدی بێ شوێن
توانەوە دەسبەند، کەلەپچە، زنجیر
کرانەوە دەرکی قەفەز لە یەخسیر
ئەستراوە فرمێسکی ڕۆڵە کوژراو
ئەستێنراوە تۆڵەی بێ کفن نێژراو
بزەی هاتێ لێوی لە خۆشی بێ بەش
جلکی گۆڕی سۆرانی شین، بەرگ ڕەش
لە شینگایان گەڕا گەڕی ڕەشبەڵەک



(شـــەم) و (شـــەمزین) گرتیانەوە دەســـتی یەک
گـــەڕانـــەوە ئـــاوارە بـــۆ جێـــژوانـــان
گرانـــــەوە لـــە خەنـــە پـــەنجـــەی جوانـــان
جـــا ئـــەو کاتـــە بـــە هـــەتـــوانـــی ئازادی
ســـــاڕێژ دەبـــێ برینـــی نامـــــرادی

چیا - ١٣٤٧

***

## شەنگەبێری

شــەنگەبێری! ســاڵی ســاڵان لــە کــوێســتانی، لەنــاو مەڕی
بــۆ مەڕدۆشــین هەڵــت دەکــرد ئــەو باســکی ســپی مەڕمــەڕی
لــەبــەر هــاڕەی گۆبــەرۆک و گــوارە و کرمــەک و ژێــرچەنە
نیــوەڕۆیــە لــەبــەر بێــرێ کــۆڕی مــەڕی ڕادەپــەڕی

***

کــە ئێــواران کەزیــت دەکــردن ســێ بەنگــێ و چــاوت دەڕشــت
بــەو کــەزی و چــاوە نــەرمانــە بێ ڕەحمانــە شــوانت دەکوشــت
شــەنگەبیــزا بــەســروەبــا ســــوژدەی دەبــردە بــەر بــەژنت
ئاخــر تــۆش هــەوای کوێســتانی ئــەو کوردســتانەت هەڵدەمشــت

***

چێشــتەنــگاوان لــە دەراوان کــە خــۆت لــێ دەکــرد پــێ خاوس
بــە لــەنجــەولاری کیژانــەت شــەرمــەزار دەبــۆوە تــاوس
ئاهەنگــی ژیــن و شــادی بــوو بــەیانــی کــە تێکــەڵ دەبوو
شمشــاڵی مــن، خرمــەی بازن، گــرم و هــۆڕی مەشــکەی گاوس

***

شــەنگەبێری گــراوی خــۆم وێنووســی جەمــاڵ و جوانــی؟
ئێســتاش پاڵێنــێ وەک جــاران لــە شــوان و مێگــەل دەڕوانــی؟



وا مـــن پێشـــمەرگەم دەجـــەنگـــم بـــۆ وڵاتـــی لـــە تـــۆ شـــیرنتر
نـــــەم دەدا بـــەتـــەختــــی شـــایی دەنـــا بـــەردەبێـــری شـــوانی

***

ڕاســـتە تـــۆ جوانـــی، لەبـــاری، نـــازداری، شـــۆخی، نەشـــمیلی
کوڵمـــت گەشـــترن لـــە گـــوڵ و خاڵـــت ڕەشـــترن لـــە زیلـــی
جیـــابـــوونـــەوەت دەردە، بـــەڵام تـــۆش دەزانـــی تامـــی نییـــە
ژوان و شــــــەوڕاو و دڵـــــداری، ڕاز و نیـــــاز بـــە دیلــــــی

***

زۆری نـــەمـــاوە بێتــــــە بـــەر نەمامـــی هـــــەوڵ و خـــەبـــاتـــم
لـــە داگیرکـــەر پـــاک بێتــــەوە خاکـــی پیـــرۆزی وڵاتــــــم
چەک دادەنێــــــم، گـــــۆچـــانەکـــەی جارانـــم هـــەڵـــدەگـــرمەوە
تـــۆ هـــەر بێـــری بە، مـــن هـــەر شـــوان، فریشـــتەی تاســـە و ئاواتم

چیا ١٣٤٧

***

## ئامێزی ژن

جــــاران پــەنــاگای شـــەوانم

ئامێـــزی ئــــاوەڵای ژن بـــوو

گەرمـــی و نەرمـــی ئـــەو ئامێـــزە

مایـــەی حەســانەوەی مـــن بـــوو

***

دەردی ژیـــان، ڕەنجـــی خەبـــات

مانـــدووبوونـــی ڕۆژی نـــاخۆش

بـــەشـــەو لە ئامێـــزی ئـــەودا

هـــەمووم دەكـــردن فـــەرامۆش

***

نیـــگای چـــاوی، بـــزەی لێـــوی

بـــرینـــی دەكـــردم ســـاڕێـــژ

برینـــــی ئـــەو دڵـــەی دوژمـــن

بەتیـــر دەیكـــرد دابێـــژ دابێـــژ

***

نـــازی، تـــۆرانـــی، زیـــزبـــوونـــی

لاوانـــدنەوەی، ئاشـــت بـــوونەوەی



هەموو لە جێـی خـۆی شـیرین بـوون
زۆر سـەختە لە بیـرچـوونـەوەی

***

بەڵـێ سـەختە، یەکجار سـەختە
دووری لـە ژن، نـامـرادی
بـەڵام لـە ژن خـۆشـەویسـتتر
لـە لای مـن ئەتـۆی ئـازادی

١٣٤٩

***

## شەپۆلی تۆڵە

کــــوردە ئـــــەی کوردی لە خۆشـــی بێ بەش!
بـــەس نییـــە کـــۆیلەتـــی دێـــوەزمـــەی ڕەش؟
بـــاژوێ ئـــەســـپی هەوەســـی خـــۆی هـــەروا
بتگـــــری بتکـــــوژی وا بـــــێ پـــەروا؟
ئـــەو (قزل قـــەلعـــە) کـــە بـــۆتـــە (باســـتیل)
هەردەبـــێ پـــڕ بـــێ لـــە یەخســیر و دیـــل؟
تاکـــو کـــەی نەشـــکێ کەلەپچە و دەســـبەند؟
زەجـــر و ئـــازار و شـــــکەنجە تـــا چـــەنـــد؟
خـــوێنـــی لاوانـــــی بـــەبیـــــر و بـــــڕوا
هـــــەر دەبـــێ بـــــڕژێ، بەفیـــــڕۆ بـــڕوا؟
هەڵـــوەرێ گەوهـــەری فرمێســـــکی هـــەتیـــو
دەربـــەدەر بێ کـــوڕی ئـــازا و نـــەبـــەزیـــو؟
بێـــــوەژن تـــەڕ بـــێ بـــەگریـــان چـــاوی
کـــــچ نـــــەبینێتـــــەوە شـــــۆڕە لاوی؟

***

وەختـــــی وەی هاتـــــووە خۆت ڕاپســـــێنی
تـــۆڵـــــە وەرگـــــریـــــەوە، هـــەق بســـــتێنی




ڕاپەڕە، هاتەوە دووبارە هەلت
سەر و ماڵت بکە قوربانی گەلت
کۆبەوە ڕێککەوە، لێک بەستە پشت
ڕاکە مەیدانی خەبات گورج و گشت
هاتەوە کاتی خەباتی شێلگیر
هەڵبڕە بەندەک و کۆت و زنجیر
کوڕبە، ئازابە، نەبەزبە، ڕۆڵە
گژەبای ڕق بە، شەپۆلی تۆڵە
تووڕەبە، سووربەوە لێی وەک پۆلوو
ئاگری دە وەکو پووش و پووشوو

***

ئەو لە خوێن مژتنی تۆ تێر نابێ
تۆ دەبێ بۆ بەزەییت پێی دابێ
لە هەموو لایەکەوە پێی دادە
ڕاوی نێ، زوو لە وڵاتی ڕادە
دەس و خەنجەر کوتوپڕ ڕاکە سەری
وەدەری نێ وەدەری نێ وەدەری
هەڵمەتی بۆ بەرە وەک شێری دڕ
لەشکری لێ بکە دابڕدابڕ
کۆستەکی خەنجەری تۆ بترازێ
ئەو بەسەرنیزە کولەی نانازێ
ویزە گوللەی چەکی تۆی بێتە گوێ
ناپەڕێنێ لە سنووریشت سوێ
بیتەزێنە بە پەلاماری توند
بیبەزێنە لە چیا و شار و گوند

بەنـــدەن و دەشـــت و چـــڕی لـــێ بتەنــە

نەوەکـــو دەرچـــی پـــڕی لـــێ بتەنـــە

مـــەپرینگێـــوە لـــە ئـــاگـــر و ئـــاسـن

تێـــدەگـــەیَ چـــۆن بەگـــەلـت ناناســـن؟

تاکـــو شـــۆڕش نـــەکـــرێ تونـــد و تیـــژ

تاکـــو ســـەنـــگەر نـــەگـــرێ لاو و کیـــژ

نـــادرێ مافـــی گـــەلـــی کـــوردی دلێـــر

هەردەبـــی وا لـــە قەفـــەزدا بـــێ شـــێر

ئـــەو ڕق و قیـــن و بـــەگـــژداچـــوونـــە

تاقـــە ڕێـــگایـــەکـــی ڕزگـــاربـــوونە

١٩٤٩

***



## ترۆپکی ڕزگاری

ڕێبوارێکم ئازا و بەزیبک و زاکوون
دەبڕم چۆڵ و چیا و پێدەشت و بێروون
بەرهەڵستم دەکەم هەپروون بەهەپروون
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاریوون

***

کەند و کۆسپ هەنگاوم پێ ناکا شل
بێتە سەر ڕێم هەزاران گابەردی زل
بەهێزی شان و باهۆ پێی دەدەم تل
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاریوون

***

پێم گرتەوە، دەرچووم لە دارەدارە
ڕێم گرتەوە ڕێگای (قازی)ا و (ئاوارە)
نامترسێنی گوللە، پەتک، سێدارە
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاریوون

***

بەو خوێنانەی لەو ڕێبازە ڕژاوە
گوڵی ئاڵی سەربەستی کورد ڕواوە
منیش بەدڵی پڕ لە هیوا و بڕواوە
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاربوون

***

ڕۆڵەی کوردم فێری هەوراز و لێژم
تا زۆر بڕۆم زیاتر ئارەق بڕێژم
کورتتر دەبێ ڕێگای دوور و درێژم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاربوون

***

ناڕەومەوە لە داوەڵ و تارمایی
زۆرم دیوە بووڵێڵ و تاریکایی
دێنم بەو شەوگارە ڕەشە دوایی
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاربوون

***

من پەروەردەی بن سێبەری ئەشکەوتم
گەلێک جاران لە چاڵاوی ڕەش کەوتم
هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگاربوون

١٣٥٠



## گاو و گەردوون

شەتەک درا لە دار دەرنگانی شەو
لاوێک لەسەر ڕزگاربوونی وەتەنی
وێڕای تەقەی دەسڕێژی دەستەی ئاگر
دێوەزمەی ڕەش دەیگوت و پێی دەکەنی:
جێژنی شایان گاو و گەردوونی دەوێ
خوێنی گەش و فرمێسکی ڕوونی دەوێ

***

هەڵوەری فرمێسکی دڵسۆزانی گەل
خوێنی شەهید ئاڵی کردەوە وڵات
بەڵام لەگەڵ شین و شەپۆڕ و گریان
بۆڵەبۆڵی دێوەزمەکە هەر دەهات:
جێژنی شایان گاو و گەردوونی دەوێ
خوێنی گەش و فرمێسکی ڕوونی دەوێ

***

گوللەی ستەم دابێژدابێژی دەکرد
سەری پڕ ئەوین و دڵی پڕ هەست
لە گۆڕستانی کۆنی پێرس پۆلیس



خوێن دەڕشــاوە و دەیخوێنند کوندی شــوومی مەست:
جێژنــی شــایان گـــاو و گـــەردوونــی دەوێ
خــوێنــی گــەش و فرمێســکی ڕوونــی دەوێ

١٣٥٠

***



## شەو و شەیتان

ئەستێرە یەک یەک ڕاخوشین
ڕەش هەڵگەڕا ئاسمانی شین
هەورێک شۆڕابەی بەرداوە
دەڵێی لە قیرپیان وەرداوە
تاریکانە، شەوەزەنگە
وڵات بێ هەست و بێ دەنگە
گۆڕستانی خامۆشە شار
تێیدا نەماوە زیندەوار
نە ڕادەژێ گەڵای دارێک
نە دێ هەستی پێی ڕێبوارێک
هەرچی کۆڵان و شەقامە
دەڵێی کاولاشی بەسامە
دنیا دەریای بێ شەپۆڵە
لاو داماوە، جێژوان چۆڵە
پەردەی کۆشکان دادراوە
ڕۆچنەی کۆختانیش گیراوە
لە تالار و سەرسەرایان

بڕا ترووسکەی چرایان
شەمی سەرچاکیان لابردن
مردووش هێندەی دیکە مردن
دامرکا، بوو بە ژیلەمۆ
لە ناو ئاورگاندا پشکۆ
ژیان ڕووگرژە و مچ و مۆڕ
دێ بۆنی کفن تات و گۆڕ
شەو زرینگاوە، ڕاشکا
شەیتان سامی لە خوا شکا
کەڵپی خوێناوی گر کردن
فریشتەی پشووبڕ کردن
خەم و خەفەت دادەبێژێ
شادی و ئازادی دەنێژێ
داسی مەرگ و نەمان دەسوێ
هەوەڵ گەوزی داوێتە کوێ؟
دێن و دەچن بە ئەسپایی
لە چوار چرا چەند تارمایی
خێوی شەو و خودای شەڕن
بێچووە شەیتانی بەدفەڕن
ئاخ، دیسان سێدارە چەقی
کوردی چۆ بن لەسەر هەقی
لەپڕ دەنگێکی نێرانە
نرکەی کوڕانە و شێرانە
پەردەی بێدەنگی دادڕاند
خەواڵووی لە خەو ڕاپەڕاند

خەڵک هەمـــوو ئەو دەنـــگەی بیســـت
دەیگوت (پێشـــــەوای) خۆشەویســـت:
کـــە مـــن مـــردم کـــــورد نامـــریٚ
دەس لـــە خـــەبـــات هەڵنـــاگـــریٚ
هـــارووژا وەکـــو پـــوورەی هـــەنـــگ
(مەهابـــاد) گۆڕخانەی بـــێ دەنـــگ
لە دەوروبـــــــەری چـــــوارچـــــرا
هـــەزاران ســـــەر لـــە قـــوڕ نـــرا
کام نــــازداری شـــۆخ و جـــوانـــە
دای لە خـــەم لکـــــی کـــۆڵـــوانە
لـــە چـــاوی کیـــژی مـــل بەکوێـــن
بـــــەخوڕ دەهات فرمێســـکی خـــوێـــن
شـــــۆڕەلاو هاتـــە کـــۆڕی شـــین
ئەویــــش ســـــۆرانی کـــردن شـــین
پیرەپیـــــاو بانـــــگ دەکـــــا ڕۆڵە
لەبیـــر نـــەکـــەن تـــۆڵە، تـــۆڵـــە
تێکـــــــڕا دەڵێـــــن درشـــــت و ورد:
کـــورد نەمـــرد، پێشـــــەواش نـــەمـــرد
بـــا تەرمیشـــــی بخرێتـــــە گـــڵ
چـــۆن یـــادی دەردەچـــێ لـــە دڵ؟

***

شـــادبـــە ئەی پێشـــــەوای نەمـــر
هەتـــن ڕۆڵـــەی ئـــازا و خـــوێنگـــر
بـــــۆ فیـــــداکاری ئامـــــادەن
ڕێـــگای ڕاســـــتی تـــۆ بـــەرنـــادەن





پەڕکووری ڕق ئەستوورە کورد
لەسەر تۆڵەی تۆ سوورە کورد
کچ و کوڕ و ژن و پیاوی
دەکا خەباتی خوێناوی
تا مافی ڕەوای دەستێنێ
ئاواتی تۆ وەدی دێنێ

۱۳۵۱/۱/۸

***



## سنوور

ئەی ئەو کەسەی دەتپەرستم و لێم ونی
تۆ خودا نی، تۆ خۆشەویستی منی

***

لە ئاسمان نی تا وێت ڕانەگا دەستم
لە قاف نی کاڵەی ئاسنت بۆ هەڵبەستم

***

تۆی لە من ون کرد و منی لە تۆ دوور
ئەو بستۆکەی دوژمن ناوی نا سنوور

بەفرانباری ـ ١٣٥١

## ئارەق و تین

پێش ئەوەی گزنگی هەتاو  
ترۆپکی چیا بنگێوێ  
پێش ئەوەی شنەی بەیانی  
بسکی بەرەزا ببزێوێ

***

پێش ئەوەی قاسپەی خاسەکەو  
لە زەرد و ما دەنگ داتەوە  
پێش ئەوەی بلبل بخوێنێ  
خونچە دەمی بکاتەوە

***

پێش ئەوەی سیرەی هەڵۆیان  
پەردەی بێدەنگی دادڕێ  
پێش ئەوەی چوورە پۆپنەکی  
بەرەو ڕووناکی هەڵفڕێ

***

پێش ئەوەی شەمی سەر چاکی  
ئاخر فرمێسکی هەڵوەرێ



پێش ئەوەی گژەبای توورە
ژیلەمۆی پەپوولە بەرێ

***

پێش ئەوەی لاوی بەختەوەر
دەم ڕاگوێزێ لەسەر خاڵان
پێش ئەوەی شەوگەڕی دڵتەڕ
وەڕەز بێ لە ماڵە و ماڵان

***

پێش ئەوەی بیری شل و مل
چاوی خەواڵووی هەڵبێنێ
پێش ئەوەی شوان مەڕی شەوێن
وەگێڕێ، بەردا دەسبێنێ

***

پێش ئەوەی پۆلی نەشمیلان
شل شل داگەڕێن بۆ کانی
پێش ئەوەی سەرکانی و دەراو
ژاوەی بێ لە پەری جوانی

***

پێش ئەوەی حاجی سەلەمخۆر
هەژارێک هەڵنێ بە تەماڵ
پێش ئەوەی ڕێچکە ببەستن
بۆ مزگەوتێ شان بەبەرماڵ

***

پێش ئەوەی دەروێشی چڵکن
پەنجەی خەلیفەی کوشیبێ

پێش ئەوەی شێخ وەک تارمایی

بەرەو خانەقا خوشیبێ

***

پێش ئەوەی گزیری بەدفەڕ

لە دیوەخان پاروو بادا

پێش ئەوەی خاتوونێک بەناز

پەردەی کۆشکی ئاغا لادا

***

من کاوی خۆم لە کار دیوە

من جەرگی زەویم دڕیوە

من شیلەگەم هەڵبڕیوە

من یەک سەریم ئاخنیوە

***

من ڕیزە سواڵەم داناوە

شەغرە وێنجەم پێوە داوە

من گاگێرەم تێر کراوە

یا خۆیانم وەرگێڕاوە

هاوین و پاییز و بەهار

هەتاو لێی نەداوم بێکار

***

من جووتیارم، من جووتیارم

من لەگەڵ هەتاو هاوکارم

من بە ئارەق و ئەو بە تین

دامان ڕشتووە بناخەی ژین

باسکی من و تیشکی ئەوی



بژیو دەستێنن لە زەوی
گەر جووتیار ئارەق نەڕێژێ
گەر هەتاو تیشک ناوێژێ
دانیشتووی ناو کۆشک و قەڵا
دەخۆن نانی گەڵا گەڵا؟

***

بەڵام حەیف ئێستاش لێرە
من برسیم و کەسێک تێرە
نە قەت ئارەقی ئەسڕیوە
نە قەت گەوزی هەڵبڕیوە
نە مەچەکی جەمام بووە
نە چۆڵەمەی لە جێ چووە
نە ئەنگوستی ڕاگیراوە
نە داسوو لە چاوی داوە
نە دڵی پێی دڕ دڕ بووە
نە بن هەنگڵی خڕ بووە
نە کەفی دەردا بە کڵۆ
نە پەنجەی دەری کرد دڵۆ
نە دەستی پاشبارەی ناسی
نە ساوێکی دا لە داسی
نە بەگەرما داهێزا
نە خەوی لە چاوی زاوە
نە بەسەرمایە تەزیوە
نە لە کای پایز خزیوە
نە نووسەکەی پێوە نووسا

نــە لــەبــەر بارانــیٚ خــووســا
نــە زوقمـــی بەســـەردا بــاری
نە لـــە قـــوڕدا کـــەوت بــاری
نــە دی شـــەو و شـــەونخـــوونی
نە چێشـــتی دەردی نـــەبـــوونـــی

***

تــا کــەی وا بــم، تــا کــەی وا بــم
دەس بــەتــاڵ و ڕەنـــج بە بــا بــم
تاکــەی ڕەنجــی شـــان و پیلـــم
بــۆ دوژمـــن بــێ، بــۆ مـــن دیلــم؟
نـــا نــــا، تـــازە ڕاپـــەڕیــوم
نـــاتـــوانـــم بـــدەن فـــریـــوم
ڕێبـــازی شـــۆڕش بـــەرنـــادەم
مـــەودا بـــە داگـــیرکـــەر نـــادەم
لـــە شـــان و باهـــۆی خـــۆم ڕادی
هـــەڵگـــرم ئـــاڵای ئـــازادی

***



## فریشتەی پەڕیوە

سەرنجم گەر دەبڕمە بەژن و بالآت
کچی جوان! بۆچی ڕووگرژی چ قەیدی؟
منم ئەو شاعیرە جوانی پەرستە
کە چاوی من جگە لە جوانی نەیدی

***

بەمندالّی کە پەروەردەی چیا بووم
کەوم دی، پۆڕ و سوێسکە و ئاسکم دی
بە لاوچاکی لە شاری کوردەواری
کچم دی، نازەنین و ناسکم دی

***

گەڕاوم چۆم و نوالّە و مێرگ و بژوێن
بەماه و زەردی ئەستەم هەلّگەڕاوم
تەماشای سوێسن و بەیبوون و شللێر
بە دینی جوانی ڕاهێناوە چاوم

***

لەبەر تاوێ لەسەر پشت ڕاکشاوم
لەدەم جۆگە لەسەر فەرشی وەنەوشان

لەسەر گوێسوانە کردم چاوبڕکێن
لەگەڵ گەورەکچی بەردەرکی حەوشان

***

بەڕۆژی سارد و ساو دیومە بە زستان
تروسکەی بەفری بەرتیشکی هەتاوێ
شەوی هاوین لەناو ئەستێرەکاندا
گەلاوێژم دەدی پرشنگی داوێ

***

لەناو گۆم و گەرمگ و چۆم و قۆپی
بەپۆڵم دین قورینگ و سی و هەڵەتانج
لەبەر بێر و لە هاوێر و لە پاراو
گەلێکم دیوە کیژی شۆخی کرمانج

***

لەمەیدان دیومە نێسکەی ئەسپی خۆشبەز
لەگەڵ دەستوجلیتی شۆڕەسواران
گەڕی شاییم لەپێش چاوی گەڕاوە
لەرەی مەم، سووکە ڕەوتی گوێ بەگواران

***

خوڕینی شوور و بازی مامزم دی
شەپۆلی گۆم و کەف هەڵدانی تاوگە
بە مێرۆژ و سیاسووتی بەهارێ
گەلێک شەو ماومەوە تا ڕۆژ لە ڕاوگە

***

لەسەر دوندی چیای سەربەرزی هەڵگورد
ڕەوەی هەورم پێمدا بەدی کرد



تەماشای دیمەنی سەوزی ولاتم

منی سەرسام و شاگەشکە و خەنی کرد

***

بەهەشتە کوردەواری من، بەهەشتە

فریشتەم من، فریشتێکی پەریوە

بە جوانی تۆ دەژیم لەم دوور ولاتە

وەرە لێم مەبڕە ئەو تەنیا بژیوە

***

بەڵێ تۆ کیژی، نازداری، لەباری

منیش پیرێکی زورهان و دزێوم

بەلام شیرنترە لەو شەکرەلێوە

وشەی کوردی کە هەڵدەڕژێ لە لێوم

١٣٥١

***




# کاروانی خەبات

زەردە پـــەڕی، ســـوور بـــوو ئـــاســـۆ
خەریک بـــوو ســـێرە هـــەڵگیـــرێ
لـــەباتـــی قاســـپە قاســـپی کـــەو
دەهـــات قـــرمـــژنی شێســـت تیـــرێ

*** 

ئاوری بـــــەردەدا لـــــە بـــــەنـــدەن
گـــــڕی خـــومپـــارە و بـــازووکـــا
کام گوڵ گـــەش بوو، کـــام گیـــا شـــلک
بـــەو بڵێســـــە هـــەڵـــدەپـــرووکـــا

*** 

داوەســـتا لـــــەو خـــڕ و شـــیوە
دووکـــــەڵ و بـــۆگـــەنی بـــارووت
نـــەمامـــی نـــاســـک و ســـــاوا
بـــــەدەســـــڕێژ دەبـــوونـــە بـــزووت

*** 

دەیشـــــێلا هـــەڵاڵـــــە و سوێســــــن
ناڵچـــــەی پـــۆتینـــــی ژانـــدەرم




نێرکی بیزا و مەندۆکی تەڕ
دەپەڕین بەگوڵلەی گەرم

*** 

کێوی لە حەوت کێوان تەقین
هەڵۆ دای شەقەی باڵان
کەروێشک تەماڵی هەڵگرت
ڕێوی خوشی بۆ کەنداڵان

*** 

کۆترە شینکەی قەدی شاخی
لوور بوونەوە ناو ئەشکەوت
سوێسکە لە بن پنچک خزا
چۆلەکە لە جریوە کەوت

*** 

خۆی لە رەندۆڵان هەڵکێشا
لە ترسان مار بەپەلەپەل
لە پەڕ پەڕۆچکەی ئاسمانێ
دیاری دا تارمایی خەرتەل

*** 

هەر چوار تەنشتی گیرابوو
لە سەنگەرێکدا بەتەنێ
ئەو لاوەی بەڵێنی دابوو
هەتا مردن چەک دانەنێ

*** 

پشوو سوار وگەروو وشک
گەرم ببوو چەکی دەستی

بەڵام هێشتا نەلەرزی بوو
دڵی پڕ لە هیوا و هەستی

***

هەرچەندە ئاڵقەی گەمارۆ
هەر وا دەهات تەنگتر دەبوو
ئەستێرەی هیوای دەدرەوشی
تا وەخت درەنگتر دەبوو

***

پەندی کوردانەیە و کۆنە
کە شەو قەلاتی مێرانە
هەروا تاریکان پەیدا با
دڕی پێی دەدان شێرانە

***

ڕووناکبیرێکی تا ئیمڕۆ
دەچوو بەرەو ئاسۆی ڕوون
ئێستا هیوای بە بوولێڵ بوو
بۆ لە گەمارۆ دەربازبوون

***

بڵێسەی دا لوولەی چەکێک
تێک هەڵگلا لاوچاکی کورد
ئەفسەر یەک بەخۆی قیژاندی
(بەپیش بەپیش گلولە خورد)

***

لەبن پەسیوان دەرپەڕین
هێزی ڕەش و ئەهریمەنی




دێـــرا بـــەخـــوێنـــــی شەهیـــدێـــک
(کـــوردســـتان) مێـــرگ و چیـــمەنی

***

دیســـــان خـــــوێنـــی قـــارەمـــانێـــک
نـــەخشـــــانـدی ڕێـــگای ڕزگـــاری
دیســـــــان لاپـــەڕەیـــەکی ڕەشــــــتر
کـــەوتــــە ســـــەر مێـــژووی زۆرداری

***

دوا نیـــــگای بڕیــــە لای ئاســـــۆ
بـــەمـــۆلـــــەق ڕاوەســــــتا چـــاوی
شــــــنەبای شــــەو هات ئەســــــتڕی
وەک پـــــەنجەی جـــوانێک جـــوانـــاوی

***

لــــەنـــاو خـــوێنـــــدا دەتلێنــــــــەوە
لاوی بــــــەزیـــــک و بـــــەســــبات
بـــەڵام هـــــەروا دەچێتــــــە پێــــش
بـــــێ وچـــان کاروانــــــی خـــەبـــات

ڕێبەندانی - ١٣٥١

# لە بیرم مەکە

وەهام بیستووە سەردەمی پێشوو
لە گەورە شارێک نازدارێک هەبوو
کچێکی قیت و قۆز و کەڵەگەت
شاکاری دەست و نەخشی تەبیعەت
شۆخ و لەبار و جوان و ڕەزا سووک
لەڕاست ڕووی دەچوو ئابڕووی گوڵووک
دلتەڕ، مەشرەف خۆش، زار بەپێکەنین
شل و مل، ئەسمەر، ناسک، نازەنین
دیدەکاڵ، لێوئاڵ، بسک سێ بەنگی
خاڵی سەر کوڵمەی ڕەشتر لە زەنگی
مەمک خڕ و توند، سینە نەرم و پان
گەردن درێژ و چەنە کورت و جوان
کەی گەزۆ شیرن وەکو دەمی بوو
کەنگێ بەڕەزا وەک پەرچەمی بوو
مانگ لە ئاست هەنیەی شەرمەزار بۆوە
برۆی دی هیلال خۆی لەبیر چۆوە
جەرگ دەبڕین تیری بژانگی




دڵگر بوو بسکی، لووس بوو، لاجانگی
زەندی گۆشتن و شووش و نەرم و نۆڵ
بەلەکی خڕ و پڕ و سپی و سۆڵ
چەنەگەی خڕی وەکو گۆی زێو بوو
بەرخەبەبەکەی وەک شەکرەسێو بوو
خەڵفی شۆڕەبی و مەندۆک و بیزا
لەبەر ئەو باڵا بەرزە دەفیزا
ناز و کریشمە و لەنجە و لارەکەی
پڕی کردبوو هەموو شارەکەی
جوانی وا کەم بوو لەسەر زەمینێ
کەم دایک کیژی وا جوان دەبینێ
لە شارا هەچی هەبوون کوڕ و کاڵ
لەدووی ئەو شۆخە ببوونە عەوداڵ
لێیان گرتبوو گوێسوانە و ڕێباز
کڕیار گەلێکە بۆ کڕینی ناز
وەک مانگی جێژن لێیان دەڕوانی
پێیان هەڵدەگوت بەستە و گۆرانی
بەڵام لە هەموان داوخوازتر لاوێک
بوو، کە نەدەژیا بەبێ ئەو تاوێک
گیرۆدەی کردبوو بەبسکی خاوی
دێوانەی کردبوو بەسیلەی چاوی
ئاوری ئاوری لە دڵ بەردابوو
نازی وەرهەمی پێ هەڵێنابوو
وەختابوو بمرێ بۆ ماچی لێوی
یا وەکو شێتان ڕوو بکاتە کێوی

نەیمابوو هۆش و هەدادان و خەو
ئۆقرەی بڕابوو بەڕۆژ و بەشەو
قسەی دڵسۆز و دۆستی نەدەبیست
لە دنیای ڕووناک هەر ئەوی دەویست
لە دڵی بەربببوو ئاگری بێ ئامان
دەستی بەردابوو لە ماڵ و سامان
شێت و شەیدا بوو، هۆشی نەمابوو
ئاگای لە حاڵی خۆشی نەمابوو
شین وگریان و ڕۆڕۆ بوو پیشەی
هەر بیری ئەو بوو یادی هەمیشەی
ناهومێد نەبوو دەستی بەرنەدا
تا ئەو نازدارەی بۆ هاتە ڕەدا
بەهار بوو دیسان خەملی وەک بەهەشت
مێرگ و لاپاڵ و بەندەن و پێدەشت
کانی وەک دیدەی ئاواران پڕ جۆش
شنە وەک پشووی نازداران بۆنخۆش
گوڵ پشکوت، بلبل وەورینگە کەوت
کەو لەسەر ڕەوەز هەڵی گرت ڕەوت
مێلاقە بادەی ئاونگی دەمشت
شللێر فرمێسکی شادی هەڵدەڕشت
خونچە دایدڕی بەرۆکی کراس
لە خیز هاتە دەر چووزەڵە ڕێواس
بۆن و بەرامە و هەوای بەهاری
عیشق و هەوەس و مەستی لێ باری
بەهار کە بەزمی تەبیعەت گەرمە



دڵی نازداری بێ بەزەش نەرمە
بەڵێنی پێ دا کیژۆڵەی چاوجوان
لە دەری شاری بۆی بچێتە ژوان
لاوی دڵسووتاو گەیشت بەئاوات
کە ئەو نازدارەی بۆ لە ژوانێ هات
ئاوێزانی بوو، گرتی لە ئامێز
گووشی بەباهۆی مەردانەی بەهێز
ڕایمووسی لێوی شیرنتر لە قەند
لە دەستی هاڵاند کەزی وەک کەمەند
گووشی مەمکۆڵەی وەک زەردە لیمۆ
بڕا، لاکەوە، مەکە، ئەیەڕۆ
دەیانکرد یاری و دەسبازی و گەنگەڵ
یەکتریان دەگرت لە مێز و باخەڵ
درێژ دەبوون و هەڵدەستانەوە
لەناو شێنکەدا دەتلانەوە
لاوی تامەزرۆ، کیژی گەردن کێل
سوێسنە و بەیبوونیان دەکردن پێشێل
ڕێکتر دەکەوتن بۆ ئەم لا و ئەولا
قانەقەندیلەی یەکتریان دەدا
سێبەر شۆڕ ببوون، ئێوارە داهات
ئاخ لە خۆشیدا زوو ڕادەکا کات
هەرچەند لە دینی یەکتر تێر نەبوون
ناچار بوون هەستن بەرەوماڵ ببزوون
شل شل داگەڕان بۆ دەم ڕووباری
تا پێش تاریکان بچنەوە شاری

لەسەر کەندی چۆم ڕاوەستان تاوێ
کچ دیتی لەناو نێرینەی ئاوێ
چەپکە گوڵێکی وەکو پتی خوێن
گوتی ئای جوانە! ئەوە گوڵی کوێن؟
بریا هی من با ئەو گوڵە سوورە
حەیفە کەوتە ناو ئەو شێت و شۆڕە
هێشتا قسەکەی نەکردبوو تەواو
کە دڵداری شێت خۆی خستە ناو ئاو
بە پەلەقاژە گوڵی هێنا دەست
هاویشتی بۆ لای کیژی دیدەمەست
گوتی ئەی یاری ژیکەڵە و ژیرم
هانێ گوڵەکەت مەکە لە بیرم
گێژاو لوولی دا، شەپۆڵ نوقمی کرد
خوڕێنی چۆمی کەلاکیشی برد
تۆماری ژینی کورتی پێچراوە
ئەو تەنیا ڕۆژە خۆشەی بۆ ماوە
ساردی کردەوە چۆمی سارد و سڕ
دڵی پڕ هەست و بڵێسە و گڕ
کە ئەوەی بینی کیژی شەنگ و شۆڕ
لەوێ ڕانیشت و کردیە زیڕ و هۆڕ
قژی ڕنینەوە دای لە سینگی خۆی
بەرۆکی دڕی قوڕی پێوا بۆی
لەوێ هێند گریا هەتا بوو شەلاڵ
بە دارەمەیت بردیانەوە ماڵ
هەتا ماوەیەک دژ و وەڕەز بوو




کەم کەم دڵداری پێشووی لەبیر چوو
یەکی تری گرت لە کوڕانی شاری
سەرلەنوێ دەستی کرد بە دڵداری
ژین ڕاناوەستێ، هەوەس نامرێ
دڵداری لەگەڵ مردوو ناکرێ
زیندوو پێویستی بەهاودەم هەیە
بۆ مردوو مردن، هەر ئەفسانەیە
تا خوێن ببزوێ، تەزووی بێ، هەوەس
بێ جووت دژوارە بۆ گشت کەس
کە ویستت دڵی جوانێک ڕابگری
دەبێ بۆی بژی، نابێ بۆی بمری
ژن پیاوی دەوێ، پیاو دەیەوێ ژن
هەزارانی واش بێ سەروشوێن بن
بۆ ژین پێویستە لەشی گەرم و گوڕ
نەک ئاڵا و کێل و گڵکۆ و بەرد و قوڕ
لە یەسکی ڕزیو وەرناگیرێ کاو
بێ کاو دژوارە ژینی ژن و پیاو
تێ نەگەیشتبوو دڵداری بێ هۆش
کە کچ زوو کوڕان دەکەن فەرامۆش
هیچ کەس بەو کارە ناڵێ ئازایی
خۆ بەکوشت بدا پیاو بەخۆڕایی
خۆی بەئاو دادا بۆ هەوەسێ چووک
پێی وابێ پاش ئەو کچ نابێ بەبووک
کەسێک دەیەوێ قەت نەکرێ لە بیر
ناوی لاپەڕەی مێژوو بکا داگیر

خەڵک بەمەردی و ئازایی و پیاوی
هەتا هەتایە هەر بەرن ناوی
بێ بەمایەی سەربەرزی کۆمەڵ
بۆی دروست بکەن پاش مردن کۆتەڵ
لە ڕیزی گەوران ناوی بنووسرێ
سەت شێعری باشی پێ هەڵبگوترێ
جێی شانازی بێ بۆ نەتەوەی خۆی
گۆڕی مەزار بێ، کڕنووش بەرن بۆی
خۆ فیدا بکا بۆ گەل و خاکی
ناوی نەمرە بەپاکی و چاکی

١٩٧٣/١٠/٦

***




# یادم بکەن

لەو دەمەیدا پیاڵە دەدرێن لە پیاڵە
لەو دەمەیەدا لێوتان بە بادە ئاڵە
لەو دەمەیدا کۆڕی شادی دەبەستن
لەو دەمەیدا سەرخۆش و مەستن
لەو دەمەیدا کە دەگرن باز و دەوران
لەو دەمەیدا دەس دەگێڕن لە بەروان
لەو دەمەیدا دەس لە بەژنان وەردێنن
لەو دەمەیدا بەرکۆژە دەترازێنن
لەو دەمەیدا گەڕی ڕەشبەڵەک گەرمە
لەو دەمەیدا دەکوشن کام پەنجە نەرمە
لەو دەمەیدا دۆ دەکەونە خوڕانان
لەو دەمەیدا کە دەکوشن گوڵمەی ڕانان
لەو دەمەیدا تامەزرۆن لە جێژوانان
لەو دەمەیدا بەخۆوە دەکۆشن جوانان
لەو دەمەیدا گڕ دەگرێ مەیل و تاسە
لەو دەمەیدا تێک هەڵدەنگون هەناسە
لەو دەمەیدا کە دەمژن شەکرە لێوان

لـەو دەمــــەیـدا نەبـێ لـەمپـەر و نێـــوان
لـەو دەمــــەیـدا پـۆڵــی بیریـــان ڕادەبـــرن
لـەو دەمــــەیـدا کیــژ چاوتـــان لـێ دادەگرن
لـەو دەمــــەیـدا گــوێ هەڵدەخـــەن بـــۆ تارێ
لـەو دەمــــەیـدا (ماملـــێ) دەڵــێ قەتـــارێ
یـــادم بکــــەن، یـــادی منـــــی دوور وڵات
یـــادی منـــی ڕێبـــواری ڕێــگای خەبـــات
یـــادی منـــی بــێ بـــەش لە خۆشـــی و شـــادی
یـــادی منـــی ســـەوداســـەری ئـــازادی

١٩٧٣/١١/٢

* * *



## دەسکەوتی خەبات

نــــە بلوێــرژەن دەتــووورێنــێ لــە بــلوێــر
نــــە شــۆڕەژن ورینگــــەی دێ لــەبــەر بێــر
نــــە نــارەنــاری کیــژی مــەشــکەژێنــە
نــە سیــرەسیــری شــــمقاڕ و شــــەهێنــە
نــــە بــۆڕە بــۆڕی مانــــگای تــــازە زاوە
نــە شــڵقەشــڵقی مـــەشــکەی نیـــوەژاوە
نــە فیتــــە فیتــی شــوان و کاڕەیـــی مــەڕ
نــە باللــۆرەی کچــی چاوەمەســت و دڵتــەڕ
نــە ئۆحــە ئــۆحــەکــەی گاوانــی باســک
نــە بگــرە بــەردەکــەی کابانــی ناســک
نــە کۆڕەژنــی حــدوودی ســووکــە ســواران
نە خــرمــژنی هەیاســەی گــوێ بــەگــواران
نە قاڕەی ســی و چریکەی بــاز و پــەرکــوور
نــە دەنگــی ئاســمانی و شــادیی شــالــوور
نــە گرمەی هــەور و هــاژەی ڕێــژنــە بــاران
نــە ســروەی بــا و شــنەی ســوورە چنــاران
کــەوی کێــوی نە قاسپەی مــا نــە سیــرە

بەرەو گەرمێن فڕیوە زەردەزیڕە
لە هێلانەی خزی و بێ دەنگە سێروو
دەڵێی خۆشخوانی کوردە و نیەتی ئێروو
گوڵاڵە وَ سوێسنە و خار و کەنێرە
هەموو پرزەن، زەمان کردوونی گێرە
نەماوە ڕەنگ و بۆی بەیبوونی نواڵە
کرانە گزرە مێژوەرد و هەڵاڵە
پەڕیوە سوورگوڵ و پێ خوستە سونبوڵ
ڕزیوە نووسەکە و خاو بۆوە پێکوڵ
کرانە دەستەچیلە لاسکە گۆگەم
خەزانە و جوانی ناوێری بڵێ هەم
کەما و مەندۆک و هەڵز و لۆ پەڕیون
لە ترسی با لەناو قوولکە وپەسیون
لە باخ و چڕ ئەوی دار و درەختە
هەموو زەردن لە ترسی هێرشی شەختە
چەمەن کاڵ بۆتەوە ڕوخساری ئاڵی
لەسەر گۆنەی وەلاچوو دەنکە خاڵی
«گوڵ و حاجیلەکانی دەشتی هاموون»
بەجارێکی بەتاڵانی خەزان چوون
مەلای گوندە چیا، نەک شێخی ورگن
هەیەتی مێزەرێکی بۆر و چڵکن
کەوا سەوزی لەبەر داماڵدراوە
سیواک و تەیلەسانیشی نەماوە
چ بێ نازن، هەوارگەی خۆش و زەنوێر
چ ناسازن چیا و لاپاڵ و هەڵدێر



خــەزانــە بــێ بـــەزە و نـــاخۆش و تـــووشـــە
مـــژە و زوقمـــــە و کەڕەسیســــــە و پرووشـــــە
لـــە کوێســـتانی نـــەمـــاوە خێـــر و خـــۆشـــی
تـــەبیعـــەت هـــەر بینا کفنیشـــــی پـــۆشـــی
ئیتـــــر کـــــەس نـــاگـــرێ داوێنــــــی کێـــوان
لـــە جێیـــان بـــاری خـــەم نیشـــتووە لـــە لێـــوان
بـــەڵام بنـــــوارە ئــــەورۆ شــــارەکـــەی کـــۆ
«قوبـــەی کشـــمیری دا بـــەر شـــەق وەکو گۆ»
ئـــەوا پـــڕ بـــوو لـــە خۆشـــی و کامەرانـــی
بـــەهـــاری شـــــامـــە ئەییـــامی خـــەزانـــی
دەر و دیــــــواری شــــــادی لـــێ دەبــــــاری
خـــــەزانی خـــۆشـــەویســــــتە وەک بـــەهـــاری
قـــریـــوە و داوەت و چـــــۆپی و ســـــــەمـــــایە
گـــەپ و گاڵتـــــە و زەماوەنــــــد و هەرایــــــە
تـــریقـــــە و پێکـــــەنینـــــە و چـــەپڵـــەڕێـــزان
هەمـــوو بـــــەشـــــداری بـــەزمـــن خاو وخێـــزان
هەموو چاوێک گـــەشـــە، گشت کـــوڵمـــە سوورە
کـــەســـەر لـــەو شـــارە بـــێ ئـــازارە دوورە
دەبینـــــی تــــۆ ئەگـــەر چاوێـــــک بگێـــڕی
کچـــی وەک دوڕ، کـــوڕی جوانتـــر لـــە زێڕی
کە دەچنـــە داوەتـــێ ســـەرمەســـت و دڵخـــۆش
فـــڕێ دراوە پـــەچە و ڕووبـــەنـــد و ســـەرپـــۆش
هـــەلـــە هـــەڵکـــەوتـــووە بـــۆ کیـــژ و لاوان
نییـــە ئـــەورۆکـــە باخـــی ســـینە پـــاوان
چلـــۆن ئـــەورۆ نەبێتــــــە ڕۆژی جێــــــژن؟

چلۆن خەڵکی کوڵ و کۆیان نەڕێژن؟
لەلای ئازادیخواز و کوردی دڵسۆز
بەڕێزتر بۆ نەبێ ئەوڕۆ لە نەورۆز؟
کە پاش ئەو ڕەنج و دەرد و کفتوکۆیە
دەبینن کۆتەڵی (حاجی) لە کۆیە
دەبینن کۆتەڵی شاسواری کۆیە
کە ڕۆژێکی بەپێیان لێرە ڕۆیی
چلۆن بۆ سورمە نابێ خاکی شارێک
کە حاجی پێی لەسەر دانابێ جارێک

***

ئەوە کۆتەڵ نییە ڕەمزی نەجاتە
ئەوە دەسکەوتی چەند ساڵەی خەباتە
ئەوە ڕووگەی هەموو کوردێکی پاکە
ئەوە جێگای نیازە، پیرە چاکە
بوتی ساحەب دڵانی دڵ بەسۆیە
کە ئەوڕۆ پێی دەنازێ شاری کۆیە

***

سڵاو ئەی حاجی ئەی ڕۆڵەی زەمانە!
لە سایەی تۆوە هەرچێکی هەمانە
هەموو ژینت لە ڕێی گەلدا بەخت کرد
هەتا ڕێگای خەباتت بۆ تەخت کرد
گەلێکت دی غەریبی و تاڵ و سوێری
نەبوو ساتێ لە خزمەت خۆ ببوێری
بەگژ بێگانە و خۆمانەدا چووی
لەگژ دێوەزمە و دێوانەڕا چووی



نەترسای و نەخەجڵای و نەلەرزی
چ مەشهووری، چ ڕووسووری، چ بەرزی
هەموو شاگردی تۆن شیرن کەلامان
لە تۆ فێر بوون خەبات قازی و مەلامان
بەدەنگی تۆ خەواڵوو ڕاپەڕیون
لە ترسی تۆیە دوژمن داپەڕیون
گەرای ئەفکاری تۆیە باڵی گرتن
کەوا ڕۆڵەی گەلت سەریاڵی گرتن
بەئازایی، بەزانایی، بەوردی
چەکت دا دەستی شۆڕشگێڕی کوردی
پەڕی دیوانەکەت گەنجە و خەزێنە
وشەی شیرینی تۆ دوژمن تەزێنە
هەموو پەندن قسەی سووک و دزێوت
وەکو باڵی پەری پاکە جنێوت
بەنرخە، تازەیە، بەرزە، بەهێزە
ئەوەی فەرمووت لە بارەی پیاوی دێزە
«ئەگەر کوردێک قسەی بابی نەزانی
موحەقەق دایکی حیزە و بابی زانی»
کە شێعری تۆ بزاوتی هەستی هەستان
هەموو سەوداسەری سەربەستی هەستان
لە کوردستان گەلێک شۆڕش بەرپا بوون
کوڕی کوردی بەگژ بێگانەدا چوون
لەمێژساڵە دەڕێژن ئارەق و خوێن
بەڵام داخی گرانم هێشتە لە کوێن؟
ئەوێستاش دەردەکورد نەکرا عیلاجی

ئـەوێسـتاش کـوردی کۆیلە مـاوە حاجـی
گـەلی کوردت نـەبوو هێشـتا نـەجاتـی
بـەخـوێنـی لاوەکان سـوورە وڵاتـی
ئـەوێسـتاش دوژمنـی لاسـار و بـەدفـەڕ
دەکـووژێ کـوردی بـێ تـاوان و لاشـەڕ
ئـەوێسـتاش هـەر دەمـانکەن تیـرەبـاران
دەنـەخشـێنن بـەخوێـن کـۆڵانی شـاران
ئـەوێسـتاش پـڕپـڕن زینـدان لـە لاوان
بـەغـەیـری وەی کـە کوردن نیانـە تـاوان
ئـەوێسـتاش گـۆڕ غـەریـب زۆرن وەکو تۆ
ئـەوێسـتاش بـێ نەسـیب زۆرن وەکـو تۆ
ئـەوێسـتاش بـێ کـەس و دوورە وەتەن هەن
ئـەوێسـتاش شـاعیری پیـر و ڕەبـەن هەن
ئـەوێسـتاش شـێعری وردی کـوردی دەدڕن
زمانـی شـاعیـرانی چاکـی دەبـڕن

***

بـەڵام تـۆ دڵنیـابـە پیـری زانـا!
بناغێکـی وەهـات بۆ کـوردی دانـا
ئیتـر سەنگـەر بـەتـاڵکردن مـەحـاڵـە
ئیتـر کورد و بـەزین خـەون و خـەیـاڵـە

بەرەبەیانی - ١٩٧٣/١١/٢٦

***



# شەوگاری تەنیایی

هـــەتـــا نێڵـــەی نەیـــە ئاورگـــی دڵ، چـــەم پـــڕ لە نـــەم نابێ
هـــەتـــا نـــەم دانەبـــارێ تینـــی ئـــەم ئاورگـــە کـــەم نابـــێ
لەنـــاو ئاورینـــگ و ئاونـــگا شـــەوم ڕادەبـــڕێ بـــێ هەمـــدەم
بەڵـــێ شـــەوگاری تەنیایـــی بەبـــێ فرمێســـک و خـــەم نابـــێ
ســـتەمکاری منـــی دوور خســـــتەوە لـــەو یـــارە شـــــیرینەم
ئیتـــــر مـــــن چۆن ڕقـــی زۆرم لە ئـــــازار و ســـــتەم نـــابـــێ؟
ئـــــەوی ســـەربەرزە لـــــەم وێرانـــەدا تووشـــــی خـــــەم و دەردە
چیـــای ســـەرکەش ببینـــە قەت ســـەری بێ هـــەور و تـــەم نابێ
لەنـــــاو دەریـــای خـــەیـــاڵم دیمەوە مـــن گـــەوهـــەری نـــایـــاب
هەمـــە گـــەوهەر، ئیتـــــر چـــاوم لـــــە دینـــــار و دەرەم نابـــێ
وەرە نـــاو باوەشـــــی گـــەرم و گـــــوڕ و پڕ تاســـە و مـــەیلـم
ڕەدیفیـــــش تێـــک بچـــێ پێم خۆشـــە من دەســـتم لە مـــەم دابێ
وەرە بـــا هەڵمـــژم ئـــەو لێـــوە شـــیرینە بـــە کەیفـــی خـــۆم
لەپـــاش ئـــەو تاڵییـــە بـــا مـــن دەمێـــک شـــەکرم لـــە دەم نابێ
پەلـــەت بـــێ، چاوەڕێتـــم، زوو وەرە، بـــەس خـــۆت بخافڵێنـــە
هـــەزار جـــار هێمنیـــش بـــم بـــۆ ویســـاڵت چـــۆن پەلـــەم نابێ؟

١٩٧٤/١/١٤




## شەوی شاعیر

بابە تاهیرا! منیش دەڵێم وەک تۆ
«ئاخ لەدەس دیدە، وای لەچەنگی دڵ»
دڵی جوانی پەرست و چاوی هەوەس
شەو هەتا ڕۆژ بەمن دەدەن گینگڵ

***

کێ دەزانێ بەشەو لە من چ دەکا
ئەو خەیاڵە پەشێو و ئاڵۆزەم؟
کێ دەزانێ کە چیم بەسەر دێنێ
ئەو دڵە پڕ بڵێسە و سۆزەم؟

***

کێ دەزانێ چلۆن بەیان دادێ
لە منی شێت و شاعیری دڵتەڕ؟
کێ دەزانێ خەیاڵی بن لێفەم
چۆن بەسەر کەوشەنا دەکا شەوپەڕ؟

***

ئەرێ ئەی بەدری ئاسمانی جەمال
هیچ دەزانی چلۆنە حاڵی من؟



شەو هەتا ڕۆژ لە کونجی تەنیایی
وەک هیلال ئاوەڵایە باڵی من؟

***

گیانە! هێشتاکە دانەمرکاوە
ئاگری عیشقی توند و سەرکەشی من
لەشی گەرم و گوڕی دەوێ هەر شەو
بۆیە وا ئاوەڵایە باوەشی من

***

لێوی وشک و بەباری من دەیەوێ
هەڵمژێ لێوی گۆشتن و ئاڵت
دەستی سارد و تەزیوی من دەیەوێ
بیکوشێ مەمکی وەک بەهێی کاڵت

***

دەمەوێ بەو سمێڵە زوورانەم
ئارەقی سینگ و باخەڵت بسڕم
دەمەوێ بسکە نەرمەکەت بگرم
دەمەوێ چاو لە چاوەکەت ببڕم

***

دەمەوێ گوێم لە دەنگی نەرمت بێ
دەمەوێ هەست بکەم هەناسەی تۆ
دەمەوێ من بگەم بەکاوی دڵ
دەمەوێ دابمرکێ تاسەی تۆ

***

دەمەوێ هیممەت و هومێدی من
ئەتڵەسی ناهومێدی دابدڕێ

دەمـــەوێ پـــەنجـــەكەت بـــەئـــەسپایی
تـــۆزی غـــوربـــەت لـــە ڕوومـــەتم بســـڕێ

***

ئـــەی هومێدَ ئـــەی ڕەفیقـــی دێـــرینـــەم
تـــۆ نـــەبـــی كێـــم هەیـــە منـــی بێكـــەس؟
گـــەر هەمـــوولا لـــە مـــن بهـــارووژێ
نابـــەزم تـــۆم لەگـــەڵ بمێنـــێ و بـــەس

***

تـــۆم هەبـــی ئـــەو شـــەوانـــە ڕادەبـــرن
تـــۆم هەبـــی دوایـــی دێ بـــەڕۆژی ڕەش
تـــۆم هەبـــی هـــەر دەگـــەم بـــەئـامـــانجـــم
تـــۆم هەبـــی ئـــەو دەگـــرمـــەوە بـاوەش

١٩٧٤/١/٢٥

***



## بناری هەڵگورد

لە خەودا دیم لەسەر هەڵگورد
لەسەر چیای سەرکەشی کورد
ماندوو، خەستە، شەکەت، کەفت
لەسەر تەختێکی زبرِ کەفت
لەبن لێفەی ئەتڵەسی سوور
لەسەر دۆشەگێکی ئەستوور
بۆ حەسانەوە درێژ ببووم
بەبۆنی گوڵان گێژ ببووم
کەوی گرتبووی دەورویەرم
غوررەکەو بوو لەبن سەرم
شنە کاکۆڵی دەبزاوتم
گزنگ ڕوومەتی دەنگاوتم
لە فریشتان بەرزتر بوو جێم
هەور دەڕەوێن لەبەر پێم
هەوایەکەم هەڵدەمژی
کورد و کەودەری پێ دەژی
گەیبوومە پۆپەی ئاواتم

لێم دیار بوو هەموو وڵاتم
وڵاتی باب و باپیرم
جێی هەڵدانی خۆم و بیرم
وڵاتیِ جوان و دڵگرم
هەزار جاری دەبەر مرم
وڵاتی ڕەنگین و نەخشین
وڵاتی سوور و سپی و شین
خێری خودا، باخی بەهەشت
کوێستان و بەندەن و پێدەشت
تەلان، گەوە، بانوو، بستوو
کانی، زنە، رنوو، پزوو
مێرک، نواڵە، دەریا، ڕووبار
نەرمان، هەڵەموت، لێرەوار
ئاوهەڵدێر، خوڕێن، گۆمی مەند
کێڵگە، بەیار، بژوێن، زەمەند
جێ جێ کۆدە، جێ جێ ڕووتەن
جێ جێ چێنگ، جێ جێ ڕەقەن
جێ جێ ئاوگر، جێ جێ شۆنە
جێ جێ شوورە و قەڵاکۆنە
کوردستانی بەخێر و بێر
«پێی ڕوون دەبۆوە چاوی کوێر»

***

پۆلێکی پەری شل و مل
بەرموور و ملوانکە لە مل
برژانک درێژ و چاو بەکل



شان بەکۆڵوانە شەدە شل
ناسک و نازدار و شۆخ و شەنگ
تەنک و شلک و جوان و چەلەنگ
بەژن باریک و خڕ و پڕ
سەری کولمەیان دەیدا گڕ
نەشمیل، ڕەزا سووک، نازەنین
لەبەر دڵان و خوێن شیرین
چاویان مەست و پڕ شەرم بوو
بسکیان ئاوریشمی نەرم بوو
لەشیان بەتین و گەرم بوو
باسکیان سەرینی سەرم بوو

***

یەکێک خۆی لەباڵ دەخزاندم
یەک یەخەی بۆ دەترازاندم
یەک بەناز خۆی ڕێ دەخستم
یەک مەمکی دەنا لە مستم
یەک دەیشێلام ئارام ئارام
یەک قانە قدیلەی دەدام
یەک بۆی دەگوتم گۆرانی
بەچریکەی خۆشی ئاسمانی
یەکێک سەمای بۆ دەکردم
یەک دەستی لەستۆ دەکردم
یەک بەباڵۆران دەیدواندم
یەک بەسپایی ڕایدەژاندم

***

لەو خەوەدا هێشتا لاو بووم
هێشتا بەنموود و بەرچاو بووم
هێشتا مابوو گوڕ و هێزم
هێشتا هەمبوو باهۆی قەوی
ڕەوەکم دەکردن کەوی
لە جێژوانێ خۆم ڕادەگرت
مێزم بەبزۆزاندا دەگرت
هێشتا پێم دەکرا دەسبازی
گراویم دەکردن ڕازی
هێشتا کەنفت و پیر نەبووم
«لە باڵ جوانادا تیر نەبووم»

***

دڵتەڕ و جوانی پەرست بووم
شاعیرێکی خاوەن هەست بووم
هێشتا دوور نەبووم لە هەڵگورد
کیژم دەهاتن لە شەوگورد
لەپڕ لەو خەوە ڕاچەنیم
بەحاڵی زارم پێکەنیم
لە نێو ماڵێکی بێ ژندا
لە بن لێفێکی چڵکندا
لەسەر تەختێکی ڕەق و تەق
سەرتاپام شەلاڵی ئارەق
پیر و کەنەفت و کەلەلا
هەمنوو لەشم هەلا هەلا
پشتم ڕەق و باسکم تەزیو




پێم نەدەکرا ئەم دیو ئەودیو
کز و گۆد و سڕ و بێ ناز
پێچم دەدا وەک مارانگاز
تازە کوا خەو دەمباتەوە؟!
هەستام وەبیرم هاتەوە
ئاوارەم و دوورە وەتەن
بێ تەماڵ و سەڵت و ڕەبەن
سەرم وڕە و گیانم دێشێ
کەس نییە نازم بکێشێ
چم کردووە بۆ وام بەسەر هات؟
بۆچی تەرە بووم لە وڵات؟
بۆ هێلانەم لێ شێواوە؟
ئەو هەموو ڕێگەم پێواوە؟
بۆ لە خۆشی دوورە بەشم؟
بۆ ئەوەندە چارەڕەشم؟
چییە گوناە و تاوانم
تەریدەم؟ جەردەی کاروانم؟
پیاوکوژم؟ ڕێگرم؟ دزم؟
بۆ دوورم لە کەس و خزم؟
تاوانم ئەوەیە کوردم
خەڵکی بناری هەڵگوردم
بەو هەوایە پەروەردە بووم
بۆیە تووشی ئەم دەردە بووم
کۆیلەتیم بەلاوە نەنگە
بۆیە وڵاتم پێ تەنگە

دەڵێم مافی خۆمم دەنێ
ڕەپێم دەنێ بۆ بەندەنێ
دەڵێم ئینسانم، بەشەرم
ئەو پەندە دێنێ بەسەرم

***

بەڵام هەڵگوردە و نانەوێ
بەڵام گوردە و مافی دەوێ
هەزاری وەکو من بمرێ
دەست لە خەبات هەڵناگرێ
زۆر کەسی وەک من نەمێنێ
ئەو مافی ڕەوای دەستێنێ

٥٢/١٢/١

***



## پەیامی ڕانەگەیەندراو

پەیامی من بەگوێی ئەم دڵبەرە نازدارە ڕاناگا
نەسیم بۆ سیم دەبینێ، شل دەبێ، بەم کارە ڕاناگا
گوتی سەبرت هەبێ دووبارە دێمەوە دیتنت ئەمما
لە کورتی دا تەمەن، وا دیارە بەو کارە ڕاناگا
وەکو پەروانە دەوری لێ دەدەن لاوانی خۆولاتی
گوڵی ئێرە بەژوانی بولبولی ئاوارە ڕاناگا
نەخۆش و دەردەدار و دڵ بریندارم، پەرستارێک
بەحاڵی ئەم دڵە پڕ ژان و پڕ ئازارە ڕاناگا
دەکەی ماچی دەم و لێوان ئەگەر هێز و گوڕێکت بێ
دەنا جوانێک بەدەردی عاشقی بێ چارە ڕاناگا
هەتا کۆمتر دەبێ پشتم پتر هەڵدەکشێ مینی ژوپ
ئیتر دەستم بەداوێنی کچی ئەم شارە ڕاناگا
دەبێ بولبول لە من فێربێ غەزەل خوێنی، بەڵام چبکەم
گرفتارم، چریکەم بەو گوڵ و گوڵزارە ڕاناگا

١٣٥٣-٣-٢١




## دڵی شاعیر

دڵـــی شـــاعیر وەکـــو ئاوێنـــە دەچـــێ
گـــوڵـەکـەم! تــۆ دڵــەکـەم مــەشــکێنە
ڕاســـتە زۆر ناســـکە، ئەممـــا کـــە شـــکا
وەکـــو خـــەنجـــەر دەبـــڕێ ئاوێنـــە

***

## تەرجەمە لە ئەنوەریەوە

هـــەر بەڵایـــەک لـــە ئاســـمانەوە بـــێ
بـــا لەوێشـــڕا نـــەهاتبـــێ بـــۆ مـــن
کـــە گـــەیشـــتە زەوی دەکـــا پرســـیار
ئـــەرێ لـــە کوێیـــە ماڵـــی مـــام هێمـــن؟




## بۆ چەمن

ئەی خودای گەورە! خالیقی بێ چوون
ئەی ئەوەی دات بەئێمە زار و قوون
یا ئەوان بگرە یا بکە تێرم
تێر نەبم بۆ چمن سەر و ژێرم

***

## بۆ کچە کوردێک

کچە کوردێکی نەشمیل و لەباری
بەوەی نییە ماوەییکە چوویە شاری
ئەگەر پێت خۆشە هەروا بتپەرستم
نەکەی لادەی لە دابی کوردەواری

***




## پەری ئازادی

شــــینم گــەلێــک گێـــڕا و شــادیـم کــەم دیــوە
خــۆشــی دەڵێـــن هــەیــە، بـــەڵام نــەمــدیــوە
هــەڵـــوەدا بــووم لـــە دووی پـــەری ئــازادی
تـــووشــی نــەبــووم نـــە لــەودیــو نــە لــەمــدیــوە

***

## بۆ خانمی لازار

ژیـــانـــی دوویـــارە دەبــەخشــیەوە بــەمــردووی عیشــقت
تــۆ مــەســیحا نــەفــەسـی خـۆزگـە منیـش لازار بــام



### دیلی دیل

ئەسیری بسکی ئاڵۆزی کچە کوردێکی نەشمیلم
تەماشا کەن چ سەیرێکە بەدەستی دیلەوە دیلم

***

### شنە

شنە نەبزێوی سەری بسکی ڕەشی
کە لەسەر ڕوومەتی ئارامی گرت
گوێ مەدە ئەو قسە کۆنەی کە دەڵێ
لەشکری کافرە ئیسلامی گرت

***

## بۆ ئاغای لبادی دارایی

بە لباد دەبڕێ سەری پیاوی لبادیە کوێرە
یاڕەبی کەس نەخەیە داوی لبادیە کوێرە
ئەی ئەوەی شاخ بەکەر و باڵ بەپشیلە نادەی
بۆچێ سۆمایی هەیە چاوی لبادیە کوێرە؟

***

## ڕقی پیرۆز

دەمگرێ، ئەمما لەگرتووخانە ڕق ئەستوور ترم
لێم دەدا، ئەمما لەسەر داوا ڕەواکەم سوور ترم
دەمکوژێ، ئەمما بەگژ جەللادەکەم دا دێمەوە
کوردم و ناتوێمەوە، ناتوێمەوە، ناتوێمەوە

۱۹۷۴/۱۳۵۳







محەممەدی مەلا کەریم

وەنەبێ هەر کەســێ پێشەکیی بۆ کاری کەسێکی تر نووسی، ئەوە وا بگەیەنێ خاوەن کارەکە کەسێکی نەناسراوە، یا هیچ نەبێ پێشەکی نووسەکە لەو ناسراوترە. ئەگەر وا بوایە، نە ئەبوو کەس پێشەکی بۆ کاری شاعیرێکی وەک کاک هێمن بنووسێ. ئەگینا کێ بێ لەناو کوردی ئەم عێراقەدا، ئەگەر هێمنیش نەناسێ، هیچ نەبێ شێعری نەخوێندبێتەوە یا ناوبانگی نەبیســتبێ! ئەگەر تا پێنج شەش ساڵ لەمەوبەر تەنها کەم و بێشێکمان هێمنمان ناسیبێ یــا بڵێین ناویمان بەرگوێ کەوتبێ، ئەوا لەم ســاڵانەی دواییدا کە لەلایەکەوە هێمن خۆی ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی خەڵکەکە بووەتەوە و لە لایەکی کەشەوە تەوژمی هەستی ئەدەبدۆستی و بەشداربوون لە کۆڕ و دیداری ئەدەبیدا، وەک بارانی پەڵە، دێبەری دڵ و دەروونی هەزاران لاوی تازە هەڵچووی ئەمڕۆ و، جێگای ئاوات و متمانەی سۆزمانی ئاوداوە، مەگەر ئەوەی بۆی ڕێ نەکەوتبێ و هەل مەودای نەدابێ، ئەگینا کەسێکی ئەوتۆ نەماوە، بەجۆرێ بەبینین، یا بەگوێ لێبوون، یا بەبەرهەم خوێندنەوە، لەگەڵ هێمن نەبووبێ بەئاشنا.

لەگەڵ ئەوەشــدا کە هێمن ئەوەیە باســم کرد، وا من بۆخۆمی ڕەوا ئەبینم پێشکەشی خوێندەوارانــی بکەم و ڕێگای خۆم ئەدەم بەناوی پێشــەکی نووســینەوە بۆ ئەم کۆمەڵە شێعرەی ئەم چەند ساڵی دواییەی، لاپەڕە پێشووەکانی ئەم دەفتەرەی بەم چەند ڕستەیە ڕەش بکەمەوە.

بەر لە هەرچی، حەز ئەکەم ئەوەی چەند جار بە هێمن خۆیم وتووە بەئێوەشـــی بڵێم: لەناو ئەوانەدا کە پەخشـــانیش و شێعریش ئەنووســـن و من هەردوو جۆرە بەرهەمەکەیانم خوێندووەتەوە، لە عەرەبدا نەزار قەبباني و لە کورددا هێمن، من پەخشانیانم لە شێعریان لا دڵگیرترە. ئاواتم ئەوەبوو کاری سەرەکیی هێمن پەخشان نوسین بوایە لەجیاتیی شێعر وتن. ڕەنگبێ هێمن خۆی هێشـــتا بایەخی پەخشـــانی خۆی بەتـــەواوی نەزانێ... ئەگەر وایە دەســـا با بەچاوی مشتەری پێشەکی (تاریک و ڕوون) هـ کەی خۆی، پێشەکییەکەی بۆ (تحفەی مظفریە)، ســـەرەتاکەی بۆ (قەڵای دمدم)ەکەی عەرەبی شـــەمۆ کە مەلا شوکر هێناویەتە سەر دیالێکتی لای خۆمان، بخوێنێتەوە.

بـــەڵام، بـــا کەس وا نەزانێ من مەبەســـتم لەم ڕایـــەم ناڕەزاییە لە شـــێعری هێمن، ڕاســـتەکەی هێمن شێعری ناسکی زۆرە کە لە دڵدا جێگای شایانی خۆی ئەگرێ. دەردەکە لە شـــێعری هێمندا نییە ئەوەندەی لـــەو دەورەدایە کە پاشـــکەوتوویی و نەخوێندەواریی کۆمەڵی کوردەواری خســـتوویەتە ئەستۆی شێعر و هێمنیش وەک شاعیری بەشێکی هەرە پاش خراوی کۆمەڵەیەکی پاشکەوتوو دەستەویەخەی وەستاوە.

مـــن لام وایە لە بناخەدا ئەرکی شـــێعر قســـەکردنە لەگەڵ سروشـــت، لەگەڵ جوانی، لەگەڵ ئافرەت، لەگەڵ دەروون، لەگەڵ هەســـتی بـــەرز و خاوێنی مرۆڤایەتی... ئەبێ لەم ڕێگایانەشـــەوە بـــۆ بابەتەکانی تری ژیـــان بچێ و ببێ بەچەکی خەبـــات... بەڵام لەگەڵ ئەوەیشدا ئەڵێی چی! مۆسیقاوییەتیی شێعر لە لایەکەوە و نەخوێندەواریی کۆمەڵ لەلایەکی کـــەوە و نەبوونی چەکێکی تری ڕاگەیاندنیش ســـەرباری هەمووی، لە هەموو کۆمەڵەیەکی پاشـــکەوتوو، بەوێنە لە کوردستانەکەی ئێمەشدا، شێعری کردووە بەداردەست و پێپیلکەی پیاوی ئایین بۆ خەڵک فێرە تارەتگرتن و دەستنوێژ شتن کردن... کردوویەتی بەکتێب بۆ مەلا بۆ نەحو و سەرف و مەنتیق و بەلاغە و تەجوید و فەرایز وتنەوە بەفەقێ... بەپەندی پێشـــینان بۆ قسەی نەستەق و فەلســـەفەی کۆمەلایەتی بەخەڵک گەیاندن... بە ڕۆژنامە و بەیاننامـــەی نهێنی بۆ وریاکردنەوەی جەمـــاوەر و وروژاندنیان بۆ ناو کۆڕی خەبات... تەنانەت بەفەرهەنگیش بۆ فێرکردنی زمانی بێگانە بەمنداڵان.

کە ئەمە هەموو ئەرکی سەرشانی شۆڕەکچی ناو پەنجەرە و دوودەریی باڵەخانەی بەرزی شـــێعر بێ، ئیتر چۆن نایەتە خوارەوە بۆ کۆڕی ڕەنجکێشـــان، بۆ کوندە و گۆزەهەڵگرتنی ســـەر کانی... بۆ دروێنە و گێرە و کێشـــەی سەر دەغڵی بەرخۆری دوا بەهار و سەرەتای هاوین... بۆ گوڵۆچنیی ســـەر خەرمان لەگەڵ بێوەژنی کۆشـــێ هەتیو بەســـەراکەوتوو... بۆ گســـکدانی بن دارتوو و تووچنینەوەی ناو باخەکانـــی جارانی هەورامان... بۆ کۆڵەدار

هەڵگرتنی زستانان بەپێی پێخاوس و لەناو بەفرا... کە ئەمە ئەرکی سەرشانی شێعری کۆمەڵەی کوردەواری بێ، دیارە ئەبێ هێمنی شاعیر و دەیان کەسی وەک هێمنیش بەشێ لەم ئەرکەیان بکەوێتە ئەستۆ و شێعریان لەژێر ئەم بارە قورسەدا بناڵێنێ... پێڵاو پێ و پێ بکا، کۆڵی لاسەنگ ببێ... تایەکی باری قورس و ئەو تاکەی سووک بێ... دەرگای لە گرێژەنە بچێ!

شێعر ئەبوو تاوە بارانێک بێ پەڵە هەورێکی بەهار یا سەرپەڵە لەلاوە، بای ئیلهامەکەی لەگەڵ گرمە و برووسکەی دەروونی شاعیردا راپێچ بکا و پارچە زەویی دەروونی شاعیرەکەی پێ ئاورشێن بکا، تا نێرگسی تەڕ و پاراوی شێعرێکی پڕ هەست و عاتیفەی پێ بڕوێ، بۆ ئەوەی شێعرێکی ڕاستەقینە بێ، بشێ پێی بڵێن شێعر... ئەگینا ئەگەر وەک چۆن باخەوانێکی شارەوانییەکان، نەک باخەوانی ڕاستەقینە کە بە کۆڵ خۆڵی هێناوە و ڕەقەنی هەورامانی پێ کردووە بەتەلان و نەمامی تیا ناشتووە و پێ گەیاندووە، سۆندەیەکی لاستێک بگرێ بەدەستەوە و بەلووعەیەک بکاتەوە و بن دارێک ئاو بدا و چڵ و پۆپی تۆزاویی گوڵێک بشواتەوە، شاعیریش هەروا، هەر کاتێ پێویستی پێ بوو، دەس بەرێ بەلووعەی (بەهرە)ی بکاتەوە و پارچە شێعرێک بەبۆنەیەکەوە بنووسێ، ئەوە بەپێودانی فەرهەنگی ڕاستەقینەی شێعر نەوتووە، بەڵکو کاسبی کردووە و قسەی ڕێک خستووە...

بۆیە، ئەگەر لە هەندێ شێعری هێمنیشدا لاوازییەک بەدی بکەین، ئەبێ بزانین هێمن کوردەو کوردەواریش لە فێربوونی دەستنوێژگرتن و نوێژکردنەوە بیگرە تا ئەگاتە پێکەوەنانی کۆڕ و کۆمەڵی سیاسی و بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی نیشتمانی و نەتەوەیی و چینایەتی، هەمووی هەر لە شێعر ویستووە و ڕووی دەمی بۆ کردووەتە شێعر، یا هەر هیچ نەبێ شێعری بۆ هەموو ئەم مەبەستە دوور و درێژ و بەدەرەتانانە خستووەتە کار... هێمنیش لە گەڵی لەم ئەرکانەدا یەکێ بووە لەو شاعیرە کوردانەی بۆ کۆمەڵەی کوردەوارییان نووسیوە. شۆڕە کچی شێعری لە پەنجەرە و دوودەریی بەرزی باڵەخانەی دووری لە پاڵە و ڕەنجبەرانی نەتەوە و وڵاتەکەیدا ڕانەگرتووە بۆ خۆی تا لەوێ لە ئامێزی گرێ و دەسەملانێ بێ... لەگەڵ خۆی دایگرتووەتە خوارێ بۆ ناو خەڵک... بۆ بەشداری لە تاڵی و سوێری ژیاندا، تا ئەگەر ئەمڕۆش گوڵاڵە سوورەی ڕوومەتی ئەم لەبەر ئارەقەی ڕەنجکێشان بژاکێ، گوڵی ڕەنگاوڕەنگی شێعری کوردستانی سبەینێمان هەمیشە هەر گەش بێ و سیس بوون نەزانێ.

جا لە بارێکی نالەباری وەک ئەوەدا کە هێمن و هێمنەکانی هەموولایەکی وڵاتەکەمان شێعری تیا ئەڵێن، بەهرەمەندیی هونەرمەند لەوەدا دیاری ئەدا کە چەند ئەتوانێ ئەرکی

سەرشـــانی خۆی بەرامبەر بەهونەرەكـــەی و بەرامبەر بەكۆمەڵیش لەیەک كاتدا لە كارێكی هونەریدا بخاتە یەک و نەهێڵێ هیچ كامیان ببن بەكۆســـپ لە ڕێی ئەویاندا، یا هیچ نەبێ یەكێكیان ئەویان بكا بەژێر پێوە... من لام وایە لەم تاقیكردنەوە قورســـەدا هێمن لە زۆر بەشیدا گرەوی سەركەوتنی بەباشی بردووەتەوە.

برادەرینە!

ئەزانـــم زۆرتان هێمنتـــان بەڕادەیەک خۆش ئەوێ ناتانەوێ بەهیچ كلۆجێک شـــتێكی لەبـــارەوە بنووســـرێ بۆنی ڕەخنەگرتنی لێوە بێ. بەڵام منیـــش هێمنم وەک ئێوە و بگرە زیاتریش خۆش ئەوێ. ســـەرەڕای شـــاعیرییەتییەكەی، من بۆیەشـــم خۆش ئەوێ چونكە ڕەمزی مەسەلەیەكە كە بەیەكێ لە پیرۆزترین مەسەلەكانی ئەم چەرخەی ئەزانم: مەسەلەی خەبات لەپێناوی ئازادیی نیشـــتمان و ســـەربەرزیی هاووڵاتی و ڕێز لێ گرتنی هەموو ئەو مافانـــەی ئادەمیزاددا كـــە ئەگەر یەكێكیانی لێ زەوت بكرێ وا ئەزانم بەشـــێكی گەورەی مرۆڤایەتییەكەی پێشێل كراوە.

بەڵام لەگەڵ ئەم خۆشەویستییەشـــمدا بۆ هێمن، هەرگیـــز لەو باوەڕەدا نیم و لام وایە ناشـــبم كە ئەبێ خۆشەویستی وا بگەیەنێ ئەو ڕەخنەیەی لە دڵتدایە بۆ خۆشەویستەكەتی دەرنەبڕی، نەوەک ئەوەندە لە پێویســـتییەكانی شارســـتانەتیی ئەم چەرخە دووربێ دڵی گەرد بگرێ لێت.



## مانگەشەو

بەڵێنی ڕاگەیاندیٚ ڕاسپاردە
گوتی: بۆت دێتە بن ئەم پاردە، غاردە
لە جێژوانیٚ لەمێژە چاوەڕێتم،
نەهاتی، کیژی جوانی هەڵبژاردە!
تەزووی گەرمم بەلەشدا دیٚ، ئەگەرچی
تەزاندی شان و پیلم بەردی پاردە
وەرە با ڕەنگ و ڕوخسارت ببینم
بەمن چی تیشکی داویٚ مانگی چاردە
گڕی ئەم ڕوومەتەی تۆ گەرم و جوانە
تریفەی مانگەشەو، جوانیش بیٚ، ساردە

١٩٧٤

***

# ناڵەی جودایی

ساقییا! وا بادەوە، وا بادەوە
ڕوو لە لای من کە بەجامی بادەوە
موشتەری وەک من لە مەیخانێ کەمن
زوربەیان شاد و بەکەیف و بێ خەمن
مەی حەرامە بۆ سەهەندە و بێ خەمان
مەستی بێ خەم بۆچی بگرن ئێخەمان؟
ئەم شەرابە تاڵە دەرمانی خەمە
لێی حەرام بێ ئەو کەسەی دەردی کەمە
ئەم شەرابە ئاڵە بۆ بێ دەرد نییە
لێی حەرام بێ ئەو کەسەی ڕەنگ زەرد نییە
بۆ کەسێکە مەی: چزیلکی پێوە نێ
بۆچی ملهوڕ لێرە بینی پێوە نێ؟!
بۆ کەسێکە مەی: کە دەردی کارییە
بێ خەمێک بیخواتەوە، زۆردارییە
بۆ کەسێکە مەی: دڵی پڕ بێ لە داخ
بۆچی لێی بخواتەوە بەرزە دەماخ؟!
ئەو کەسەی بێ کەس نییە و خانە خەراب





دەک بەزاری ماری بێ بادە و شەراب!
ئەو کەسەی نەیچێشتووە دەردی ژیان،
ئەو کەسەی نەیدیوە ئێش و برک و ژان،
ئەو کەسەی نەکرا نیشانەی تیری خەم،
شانی دانەخزا لەبن باری ستەم،
ئەو کەسەی هەستی بەزۆرداری نەکرد،
تیخی زۆرداری برینداری نەکرد،
ئەو کەسەی دەستی لە ئەوکێ بەردرا،
ئەو کەسەی دوژمن لە ماڵی دەرکرا،
ئەو کەسەی نەیبینی هاتی دوژمنی،
نیری یەخسیریی لە ئەستۆ دارنی،
ئەو کەسەی هێندە نەبوو زویر و زگار،
وا نەکەوتە بەر چەپۆکی ڕۆژگار،
ئەو کەسەی نەیهاڕی بەرداشی زەمان
ئەوکەسەی «زیرەی نەگەییە ئاسمان[1]»
ئەو کەسەی دووریی عەزیزانی نەدی،
تیر و تانەی بێ تەمیزانی نەدی،
تۆزی بەدبەختی لەسەر شانی نەنیشت،
لێی نەگیرا دەورپشت و چوار تەنیشت،
ئەو کەسەی خواردی و لە بن سێبەر کەوت
شەو لەبۆ کەیفی لە ماڵێ دەرکەوت:
بۆ دەبێ بێت و بکا مەیخانە تەنگ؟!
شوێنی دیکە زۆرە بۆ گاڵتە و جەفەنگ...

***

ئەو کەسەی ڕاوی نەنێن لێرە و لەوێ،

ئەو کوڕەی ماچی کچانی دەس کەوێ،
ئەو کوڕەی هێشتا لە ژوانی ڕێی هەیە،
سەیرە، زۆر سەیرە کە ئالوودەی مەیە،
ئەو کوڕەی دۆی داوەتی دەستی دەنێ،
بێتە ئێرە، چۆنە هەی دێی ناکەنێ!؟
ئەو کەسەی «دەستی لە مەمکان گیر ببێ[2]»
ئەو کەسەی «تفلی دڵی بۆ ژیر ببێ[3]»
ئەو کوڕەی کیژێک بەرەو ڕووی پێکەنێ
ئەو کەسەی هەر سووکە ئاوڕێکی دەنێ
ئەو کەسەی پەنچۆڵە بکوشێ جارویار،
ئەو کەسەی دەستی بگاتە گەردنی یار،
ئەو کەسەی رامووسێ کولمی تاسولووس،
ئەو کەسەی تێی هەڵنەدابێ چارەنووس،
ئەو کەسەی بمژێ خوناوەی گەردەنێ،
کوفرە یەک قەترە شەرابی گەر دەنێ...

***

ئەو کەسەی ئاسوودەو و خۆش ڕاببوارد،
قەت خەمی یەخسیر و کۆیلانی نەخوارد،
یەک لە ماڵێ چاوەڕێی بوو بێتەوە،
دەرکی نێومالێکی لێ بکرێتەوە،
خەمرەوێنێک گوێ بداتە ڕازی ئەو
نازەنینێتک بێ بکێشێ نازی ئەو،
بگرێ پەنجەی نەرم و نۆڵی ناسکێ،
بۆی کرابێتە سەرینێ، باسکێ،
هەیبێ هێز و گورد و تین و تار و گوڕ،




ڕۆژگـــاری ڕەش نـــەبـێ، بـــەختـــی مکـــوڕ،
ئـــەو کـــەســـە جێـــگای لـــە مـــەیخانـــە نییـــە.
ئـــەو کـــەســـە بـــادە و شـــەرابی بـــۆ چییـــە؟!

***

ســـاقییـــا، وا وەرگـــــەڕێ، وا وەرگـــــەڕێ!
ڕوو لە لای من کـــە، مـــەچـــۆ بـــۆ ســـەرپەڕێ...
لـــەنگـــەرێ بگـــــرە، مـــەبـــە وا بـــەرزەفـــــڕ
بێنـــتە بـــۆ مـــن، بێنـــــە بۆ مـــــن، جامـــی پـــڕ
مـــەی حەڵاڵـــە بـــۆ منـــی وێـــرانـــەمـــاڵ
بـــۆ منـــی ســـەرگـــەشـــتەو و ڕووت و ڕەجـــاڵ
بـــــۆ منـــــی بـــــابـــردەڵـــەی گـــردەنشـــین
بـــــۆ منـــــی دڵ پـــڕ لـــە نـــاســـۆر و بریـــن
بـــــۆ منـــــی ئـــــاوارەو و دوورە وەتـــــەن
بلبلـــــی بـــــێ بـــەش لـــە گوڵـــزار و چـــەمـــەن
پـــەڕ وەریـــوی، بـــــاڵ شـــکاوی، دەنـــگ بـــڕاو
بـــێ بـــژیـــوی، بـــــەش خـــــوراوی، دەرکـــراو
پیـــــری زورهـــــانـــی، کـــەنفتـــــی، دەربـــــەدەر
دیـــــدە ســـــووری، دڵ مـــەکۆی دەرد و کـــەســـەر
داتـــەپیـــوی، بـــێ پـــەســـیوی بـــێ قـــــەرار
بـــێ کـــەســـی، دەســـــتە شـــکاوی، کـــۆڵـــەوار
لێـــــو بـــەبـــاری، دەردەداری، ڕەنجـــــــەڕۆ
شـــاعیـــری جـــوانی پـــەرستی دڵ بـــەســـۆ...

***

ســـاقییا! بـــۆ کـــوێ دەچـــی، بـــۆ کـــوێ دەچی؟
تـــۆش لـــەبـــەر ئـــەو ملهـــوڕانـــە ملکـــەچی؟

تۆش بەڕەنگ و بۆی ئەوان خواردت فریو؟
چاوی تۆشی هەڵفریواند زێڕ و زیو؟
تۆش دەگۆڕیەوە دەگەڵ گەوهەر هونەر؟
کەنگێ گەوهەر جوانی کردن بەختەوەر!
زێڕ بەڵایە، بێ وەفایە دەوڵەمەند
هەر هونەر نەمرە، هونەروەر مەرد و ڕەند
«چڵکی دەستە ماڵی دنیا»[٤] وەک دەڵێن
ماڵپەرست پەیمان شکێنە و بێ بەڵێن
قەدری جوانی کوا دەزانێ ماڵپەرست!
جوانپەرستە پیری خاوەن زەوق و هەست

***

نا مەچۆ، جوانێ مەچۆ، واوە مەچۆ؟
تۆ فریوی زێڕ و زیوی وان مەخۆ!
ئەو هەوەسبازانە جێی متمانە نین
هەر دەزانن گوڵ چنین و بەی ڕنین
وا وەرە، دەی وا وەرە، نێزیک بە لێم
بمدەیە مەی، بمدەیە مەی تا دەڵێم:
«مست مستم ساقیا، دستم بگیر!
تا نە افتادم ز پا دستم بگیر!»[٥]
جا کە سەرخۆش بووم بەدەنگێکی نەوی
بۆت دەڵێم ئەو شێعرە بەرزەی مەولەوی[٦]
«بشنو از نی چون حکایت میکند
از جدائیها شکایت میکند»
گوێم دەیە ئەی دیدە مەستی قیت و قۆز!
تا بناڵێنم وەکو بلوێر بەسۆز



نابێ قەت نالەی جودایی بێ ئەسەر
جا چ نەی بیکا چ پیاوی دەربەدەر
بۆیە نالەم تێکەڵی نەی کردووە
شیوەنێکم پێیە نەی نەیکردووە
لێم گەڕێ با دەربڕم سۆزی دەروون
لێم گەڕێ با هەڵوەرێنم ئەشکی ڕوون
شیوەنی من شیوەنی ئینسانییە
بانگی ئازادی و گرۆی یەکسانییە
شیوەنی من شینی کوردی بێ بەشە
ئەو گەلەی حاشا دەکەن لێی و هەشە
با لە زارم بێتەدەر پشکۆی شێعر
با فراوانتر بکەم ئاسۆی شێعر
پارچە گۆشتێکە دڵی من، ڕوو نییە
نالەنالی من درەنگە، زوو نییە
دەردی دووری... دەردی دووری کوشتمی
دەردی وشیاری و سەبووری کوشتمی
یادی یاران و وڵاتم ڕۆژ و شەو
لێی حەرام کردم قەرار و خورد و خەو
خەمڕەوێنێک لێرە من ناکەم بەدی
چۆن پەنا بۆ مەی نەبەم، ساقی ئەدی!؟
نابینم خاک و وڵات و شاری خۆم
نابینم ناسیاو و دۆست و یاری خۆم
ڕوو لەهەر لایە دەکەم نامۆیە بۆم
نابینم جێژوان و کەونە لانی خۆم
ڕوو لەهەر لایێ دەکەم بێگانەیە

ژیـــن لـــە نێـــو بێگـــانـــەدا تـەنگـانـەیــە
شـــەو دەکێشـــم شـەونخـــوونی و بـێ خـەوی
ڕۆژ دەچێـــژم دەرد و داخــــی بـێ ئـــەوی

***

چـۆن نەناڵـێ ئـەو دڵـەی پـڕ هەسـتی مـن؟!
چـۆن لـە ئـەژنـۆ بینـەوە دوو دەسـتی مـن؟!
چـۆن نـەناڵـێ ئـەو دڵـە ئەنگاوتـەیـە؟!
بـەرد لـە بـەردی بێتـــەوە دەنگـی هـەیـــە
ژانـــی ناســـۆری جـــودایـیــم چێشـــتووە
هەرچـــی خـــۆشـــم ویســـتووە جێـم هێشـــتووە
هەڵبـــڕاوم مـــن لـــە یـــاری نـــازەنیـــن
دەرکـــراوم مـــن لـــە خاکـــی دڵ نشـــین
بـــوومـــە ئـــاوارە و پـــەڕیـــوەی دوور وڵات
کەوتمـــە نێـــو وردە داوی ڕێـــی نـــەجـــات
بـــەکرە شـــۆفـــاری ئـەوی مـــووخـــەی چنیـم
زیـــی مـــەم و زینـــان وڵاتـــی لـێ تەنیـــم
کـــەوتمـــە نێـــو چاڵـــی دیلـــی وەک (مـــەمـێ)
(یایــە زیـــن) لـــە کوێیـــە هـــاواری کـــەمـێ!
کـــوا قـــەرە تاژدیـــن، چەکـــۆ و عرفـۆ لـــە کوێن؟!
بێنـــە هانـــام وەک پڵینگـــی چەنـــگ بەخوێـــن
(لاس)ە شـــۆڕێک بـــووم غـەنیمـــی دوژمـــنان
ئێســـتە ئـــەنگـــاوم بـــەتیـــری چڵکنـــان
وام بـــەتـــەنیایـــی لـــەنێـــو خـــوێنـــا شـــەلاڵ
کـــوانـــێ عێـــل و، کـــوانێ خانـــزاد و خـــەزاڵ؟!
زۆر لـــەمێـــژە نـــارە نـــاری منـــی نەبیســـت

هەروەکو (شەمزین)، (شەمیلە)ی خۆش ئەویست
وەک (سیامەند)ێ لە چۆڵ و بەندەنێ
جەرگی لەت کردم پەلی داربەنێ
شەتڵی جواناوم منی سارده برین
کوا (خەج) تا بۆم بگێڕێ گەرمە شین؟!
مانگی «کانوونێ بەچلوان دەرکرام»[٧]
وەک (برایم) لەو وڵاتە ڕاونرام
کوا (پەریخان) بەند و باوم بۆ بڵێ؟!
بۆ نەسووتێم نەبمە پۆلووی سەر کڵێ؟!
ئەو لە زۆزان، من لە ئارانێ دەژیم
کێ دەڵێ ئەمنیش (وەلی دێوانە) نیم؟!

***

کوردەواری، ئەی وڵاتە جوانەکەم!
ڕۆڵەکەم! خێزانەکەم! باوانەکەم!
ئەی ئەوانەی قەت لەبیرم ناچنەوە
ئێستە بمبینن ئەرێ دەمناسنەوە؟
ڕۆژگار هاڕیومی وەک ئەسپۆنی ورد
هێز و توانای لێ بڕیوم دەردە کورد
بوومە گەپچاڕ و دەکا گاڵتان بەمن
ئەو ڕمووزنەی زەندەقی چوویوو لە من

***

ئەی ڕەفیقان، ئەی عەزیزانی وڵات!
ئەی برای هاوسەنگەری جەرگەی خەبات!
گەر دەناڵێنم، ئەمن پەککەوتە نیم
تێ دەکۆشم بۆ وەسڵ تاکو دەژیم

کۆششی من زۆر بەجێیە و زۆر ڕەوا
چونکە قانوونی تەبیعەت وایە، وا:
«هر کسی کو دور ماند از اصل خویش
باز جوید روزگار وصل خویش»[٨]
ڕێگە دەبڕم، کوانێ هەنگاوم شلە
ڕاستە بێ هێزم، دەکەم ئەمما ملە
هەر دەپێوم کێو و شاخ و چۆڵ و دەشت
دێم بەرەو کوێستان بەرەو باخی بەهەشت
دێم بەرەو زیخ و چەو و کانیاوی خۆم
چۆن لەوانە وەردەگێڕم چاوی خۆم
دێم بەرەو ئەو دار و بەرد و بەندەنە
دێم بەرەو ئەو باخ و مێرگ و چیمەنە
دێم بەرەو زوورک و تەلان و کەند و لەند
دێم بەرەو بژوێن و زەنوێر و زەمەند
دێم بەرەو پاناوک و هەوراز و نشێو
دێم بەرەو ئەشکەوت و زەندۆڵ و پەسێو
دێم بەرەو بەفر و چلوورە و بەستەڵەک
دێم بەرەو شیخاڵ و ڕێچکە و ڕەشبەڵەک
دێم بەرەو لێڕ و چڕ و بەستێن و چۆم
دێم بەرەو هەڵدێر و گێژ و بەند و گۆم
دێم بەرەو هۆبە و هەواری باسەفا
دێم بەرەو لادێ، بەرەو کانگەی وەفا
دێم ببینم نیشتمان و زێدەکەم
دێم ببینم خزم و کاک و دێدەکەم
دێم و دەگرم بازی بێری شۆخ و شەنگ



دێم و دەگرم دەستی دۆی جوان و چەلەنگ
دێم گراویی خۆم لە باوەش وەرگرم
دێم نەهێڵم بەرهەڵست و بەرگرم
دێم و هەڵدەمژم شنەی کوێستانی کورد
دێم و دەچمە شەوڕنی بێستانی کورد
دێم و دەشکێنم لەوێ جامی شەراب
ماچی شیرین نایەڵێ تامی شەراب
دێم و ناترسم لە پەرژینی بەزی
هەر پەری سەرکەوت و دێوەزمە بەزی
تا بمێنێ نووری چاو و هێزی پێم
دێم و دێم و دێم و دێم و دێم و دێم
دێم هەتا هەمبێ بڕست و بیر و هۆش
گەر گلاشم، کوردەواری و ئێوە خۆش!

(١و٢و٣و٤) لە فۆلکلۆر وەرگیراوە.

٥ نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە هی شاعیرێکی هاوچەرخی فارس و، نیوەی دووەمی لە یەکەم مەثنویی مەولەویی بەڵخییە.

٦ مەولانا جەلالەددینی بەڵخی.

٧ لە بەیتی (برایمۆک) وەرگیراوە.

٨ شێعری مەولەویی بەڵخییە.

## جوانی پەشێوش

گوتـــی: ئـــەی بلبلـــە سەرمەســـتەکە بـــۆ خامۆشـــی؟
گوتـــم: ئـــەی نۆگوڵـــە خۆڕســـکەکە کـــوا دڵخۆشـــی؟
گوتـــی: ئـــەی شـــاعیرە گەشـــبینەکە بـــۆ ڕەشـــبینی؟
گوتـــم: ئـــەی ناســـکە تەڕپۆشـــەکە بـــۆ ڕەشپۆشـــی؟

١٩٧٤

***



# تاوانی بێ هێزی

لە کۆ ئەسرین دەبارێنم لەبۆ کوردی پەراگەندە
لە گەرمێن غەرقی ئارەق بووم و چاوم هەر لە سامرەندە
منی زنجیر پسێن لێرە ئەسیری بسکی جوانێکم
زەمانە گەرچی ئاڵۆز و پەشێوە، «کەڵ بەموو بەندە»
گوتی: «ئێوارە بازاڕێ» وەرە ماچت دەمێ، نەمویست
هەڵۆی کوێستانی کوردستانم و ناژیم بەدەستەندە
دڵم سەد هێندی دیکانە بەناز بشکێنی، دەنگ ناکەم
چ سوودێکی هەیە، کێیە بپرسێ داد و گازندە!؟
جیهان و هەرچی خێر و خۆشییە بۆ هەڵبژاردانە
بەقانوونی تەبیعەت پاشەرۆک خۆرە ئەوی گەندە
ئەگەر تاوانی بێ هێزی نییە بۆچی لە دنیادا
بەشی من ماتەم و شینە، بەشی خەڵکی زەماوەندە
بەمردووییش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕ شۆرە
ئەوێستاش دەرسی سەربازی دەڵێ ئەو شاعیرە ڕەندە
سەری تەعزیم لەبەر تۆ دانەواندن فەخرە بۆ «هێمن»
بژی (حاجی) کە کێوی هیممەتت سەد هێندی ئەڵوەندە

١٩٧٤

## ئێوارەی پایز

لە ئاسۆیەکی دوورە دەست
ئاوابوو زەردەی پایزی
دەتگوت بووکێکی بێ نازە
پەردە جێ دێڵێ بە زیزی

***

پەڵە هەورێکی چڵکنە
گرتی سووچێکی ئاسمان
گەڵای زەردی دارێک وەری
زریان بردی بەرەو نەمان

***

جووتێک کۆتری سەر بەکڵاوە
هەڵکورماون لە سوانەیەک
دیارە لەو دەوروبەرانە
پێیان شک دێ هێلانەیەک

***

پاساریی سەرداری کۆڵان
فڕە و جیکەیان لێ بڕا
قەل فڕی... فڕی... تا ون بوو
هەر ڕووڕەشیی خۆی پێ بڕا



***

شەپۆلێک مۆسیقای بەسۆز
هات و ڕابورد بە بن گوێمدا
شوێنێکی بۆ خۆی کردەوە
لە ناخی دڵی تویٚ توێمدا

***

ئاخر کۆڵی بۆ بردە ژوور
بارەرێکی درێژی ڕووت
دەرکی دووکانی گاڵەدا
مام حاجی و بەرەوماڵ بزووت

***

نازدارێکی چارشێو بەسەر
بەتەنیشتمدا تێپەڕی
بەغار هات و توند قیژاندی
ڕووتەڵەیەک بە بەدفەڕی

***

کەمێک ڕاوەستا جا ڕابورد
ئەو لاوەی جادەی دەپێوا
دیاربوو خێسێکی دابوویە
ئەو شۆخە لە بن چارشێوا

***

کیژێک خۆی لە ژوور کوتاوە
دەرکی حەوشەکەی پێوەدا
ئیتر شوێنەواری جوانی
بەدی ناکەم لەم نێوەدا

***

تا تاریکان پەیدا دەبێ
چۆڵ و چۆڵتر دەبێ جادە
نە دێتە دەر کیژی لەبار
نە ڕادەبرێ لاوی سادە

***

هەوا بووڵێڵە، ئاو لێڵە
گوڵ سیس بووە، گەڵا زەرد
تەنانەت ڕەنگی گۆڕاوە
ئەم دیوار و دار و بەردە

***

تەماشای هەر شتێ دەکەم
ڕەنگی پایزی گرتووە
جوانی خۆی لێ شاردووەمەوە
دزێوی ڕیزی گرتووە

***

چاوم لە ئاسمان بڕی
دڵم هێندەی دیکە گیرا
گەلێک بیرەوەریی کۆنم
لەپڕ هاتنەوە بەبیرا

***

ئارام ئارام بەلۆژە لۆژ
ئەوا بەرەو ماڵ بوومەوە
نە کەس لە پێشمدا دەڕوا
نە کەس دیارە بەدوومەوە





***

نا نا نارۆم، مەلەی دەکەم
لەنێو دەریای مەندی خەیاڵ
داهێزاو و ڕووگرژ، تووڕە
دڵ پڕ تاسە، مێشک بەتاڵ

***

ئاخ، دیسان ڕووپەڕێک دڕا
لە ڕۆژ ئەژمێری تەمەنم!
ئاخ، دیسان شەو داهاتەوە
من هەروا دوورە وەتەنم!

***

ئاخ، دیسان چوومە ژێر باڵی
ڕەشی شەوگاری تەنیایی!
ئاخ، دەبێ دیسان بچێژم
ژەهراوی تاڵی جودایی!

***

ئاخ، دیسان دەبێ ڕابوێرم
لە ژوورێکی سارد و سڕدا!
دەگەڵ ئازار دەستەملان بم
تا بەیان لە نوێنی شڕدا!

***

دەڕۆم، دەترسم، دەلەرزم
لە پەلاماری مۆتەی شەو
داد لە دەس ئەم دڵەی بە خەم!
وای لە دەس ئەم چاوەی بێ خەو!

***

دەڕۆم تا سەر پێکەوەنێم
دەگەڵ زام و دەرد و ئێشم
دەڕۆم تا شەوێکی پایز
من شەونخوونی بکێشم

***

دوور قاقایەکم گوێ لێ بوو
دەتگوت گوڵلەم پێوە دەنێ
چۆن بە ئێوارەی پاییزیش
ئێ وا هەیە پێ بکەنێ!

***

خەیاڵم ببوو بە وشە
نەمزانی کەس بەدوامەوە
دەنگێکی لەرزۆک و نەرم
بەسپایی جوابی دامەوە:

***

«بەڵێ هەن و یەکجار زۆرن
بازرگانی فرمێسک و خوێن
بەڵێ هەن و پێ دەکەنن
بە سەر بە هەش، بە مل بە کوێن

***

بەڵێ هەن و پێ دەکەنن
بە من، بە تۆ، بە هەزاران
بە داخی باوک کوژراوان
بە هەنیسکی هەتیویاران





***

بـــه نەزانـــی، بــه نــەخــۆشـی
بــە تــاریــکان، بە شـــەوەزەنـــگ
بــە زنجیــر، بــە تــەنــاف، بــە دار
بــە گــرتووخانــەی تــەڕ و تــەنگ

***

بــە بۆکــوڕووز بــە چــڕە دووکــەڵ
بــە هــاڵاو، بـــە گـــڕ، بــەئــاگــر
بــە تەم، بە مــژ، بە هــۆڕە، بە دۆک
بــە تــۆفــانــی وڵات داگـــر

***

بـــە بـــوومــەلــەرزە، ڕەشـــەبا
بـــەســـووتمان و زیـــان و زەڕ
بـــە هـــەرچـــی خراپ و شـــوومە
بەگشـــت دەســـکری خـــوای شـــەڕ

***

بــە نالــە، بــە کــوڵ، بــە گریــان
بــە ســینگ کوتــان، بــەڕوو ڕنیــن
بــە بەرگــی ڕەش، بــە چاوی ســوور
بــە گـــۆڕخانــە، بــەکۆڕی شـــین

***

بـــە کـــەلاوە، بــە کــونــدەبـــوو
بـــە دیـــواری هـــەرەس هێنـــاو
بـــە داوێنـــی تیتـــۆڵ تیتـــۆڵ
بـــە ئانیشـــکی پینـــەکــراو

***

بە نووکە نووکی بێوەژن
بە هانە هانی ماندووان
بە زیرەزیری منداڵان
بە نووزەی نیوە زیندووان

***

بە نەرە نەڕی جەللادان
بە قرمە قرمی شەست تیران
بە ویرە ویڕی قەمچییان
بە ئەشکەنجەی ڕووناکبیران

***

بە چڵکی یەخەی کرێکار
بە کەفی سەر شانی جووتێر
بە پەچە و ڕووبەند، بە خەنجەر
بە یەک نەبوونی مێ و نێر

***

بە قەڵەمی بەزیوی کول
بە زمانی لەبندا بڕاو
بە دەرکی داخراوی فێرگە
بە کتێب و دەفتەری دڕاو

***

لە قامووسی ئەوانەدا
بەزەیی مانای نەماوە
بێزیان لە بزە هەڵدەستێ
وازیان لە خوێن و زووخاوە



***

هەر دڵۆپی خوێنی لاوێ
بۆ وان یاقووتێکی سووره
هەر تکەی فرمێسکی کیژێ
بۆ وان مرواریی بەرمووره

***

هەناسەی ساردی ئاواران
کۆشکی ئەوان گەرم دەکا
لەشی ڕەق و زگی برسی
جێی پاروویان نەرم دەکا

***

سەرمایەی وان لەگەڕدا بێ،
با زۆر دەرک بەقوڕ گیرێ!
دۆلار لە برەو نەکەوێ
با کوڵەوار بێ داپیرێ!

***

دەبا خوین بێ و سەران بەرێ
چەرخی کارگەیان بگەڕێ
پێ دەکەنن، پێ دەکەنن
بە بڵێسەی ئاگری شەڕێ»

***

گوتم: «کەوابوو، ئاشنا!
بەشی ئێمە لەنێو چوونە»
گوتی: « نا، نا، دوور بنواڕە...
دوور بنواڕە... ئاسۆ ڕوونە...»

# بەرەو ئاسۆ

سـۆفیـی گـۆشـەی خانـەقا بووم، ئێسـتە پیری مـەیکـەدەم
زاهیدی خەڵـوەتنشـین بـووم، ئێسـتە مـەسـت و مەیـزەدەم
سـەروی ئازادیـش لەبـار و دڵگـەش و بـەرزە، بـەڵام
گیانەکـەم مـن شـێت و شـەیدای لار و لەنجـەی ئـەم قـەدەم
جیلـوەیـی جوانـی لـە هەرچیـدا هەبـێ خۆشـم دەوێ
ڕۆژێ کوشـتەی مینـی ژوپ و ڕۆژێ گیـرۆدەی شـەدەم
هـەر یـەکەی بـۆخـۆی دەجـوولێنێتـەوە هـەسـتی دەروون
زەردەپـەڕ، کاروانکـوژە، تاریـک و ڕوونـی سـوبحدەم
ئاسـمانی سـاو و دەریـای مـەنـد و تـارمـایی چیـا
سـێوی لاسـوور و بەهێـی زەرد و هەنـاری گـوڵ بـەدەم
کـێ وەکـو مـن سـارد و گەرمـی ڕۆژگاری چێشـتووە؟
گا لـە دەشـتی گەرمەسـێر و، گا لـە کوێسـتانی گەدەم!
وەک شـەپۆلی زێـی خـوڕەم سـاتێ هـەدادانـم نییـە
گێـژ دەخـۆم، پێچـێ دەدەم، مـن ڕۆڵـە کـوردی ئـەم سـەدەم
ڕێگـە سـەخت و پـڕ لـە کەنـد و لەنـد و هەڵدێـرە و گـەوە
هـەر دەبـێ ببـزووم، دەبـێ بشـکێم، وچـانـی لـێ نـەدەم
سـێبەری مەرگـم لـە پێشـدایە و بـەرەو مەنـزڵ دەڕۆم



ناخی گۆڕی تەنگە جێگام، هەر تل ئاسا بێ قەدەم
من بەرەو ئاسۆ، بەرەو ڕووناکی باڵم گرتووە
چۆن بەرەو تاریکی دەخشێم، پاڵ وەشەیتانی دەدەم!
کانیی ڕوونم دی بەلێشاوی بەهار شلوێ نەبوو
بەفری گەورەم دی چیای گرت و بەتاوێ بۆ قەدەم
ژینی کورتم دی پڕاوپڕ بوو لە شانازی و شەرەف
عومری زۆرم دی کە دوایی هات بەڕیسوایی و نەدەم
ئاگری سینەم بلێسەی دێ و ولات ڕۆشن دەکا
ئەو دەمەی خۆم وەک دڵۆپێک دەچمە نێو دەریای عەدەم

١٩٧٥

* * *



## جوان ناسوتێ

دیم کچێکی لەباری لادێیی

بۆ نوێژ ڕادەخا بەرەڵبێنێ

گوتم: «ئەی نازەنین کە ڕوخسارت

هەموو باخی بەهاری خوا دێنێ

بۆچی پێت وایە ئەو خودا گەورە

هێندە بێ ڕەحمە تۆش بسووتێنێ؟!»

***




## سازی ناساز

بلبلی باڵشکاوی وەختی گوڵم
هەر شەپۆڵان دەدا دڵی لە کوڵم
کوردی بەندیی بەیانی نەورۆزم
گڕی گرتووە دەروونی پڕ سۆزم
موغی بێ ئاگری شەوی یەلدام
چاوەڕێی چارەنووسی ناپەیدام
کەوی بێدەنگی نەوبەهارانم
گوڵی بێڕەنگی چاو لە بارانم
کونجی جێژوانی چۆڵ و خامۆشم
سێبەری نازەنینی ڕەشپۆشم
دەستی بەربووی کچی گەڕی شاییم
هەستی خنکاوی لاوی سەوداییم
کێلی گۆڕی شەهیدی گومناوم
تاکە داری کڕووزی بێ ئاوم
دەفتەری شێعری شاعیری ڕووتم
شەمی سەرگۆڕ و داری تابووتم
کونی گیراوی کۆنە شمشاڵم

خەونی ئاڵۆز و خاتیرەی تاڵم
ژیلەمۆی ئاگری بەیانانم
باوکی فرمێسکم و کوڕی ژانم
باڵە سووتاوەکانی پەروانەم
شووشە بادەی بەتاڵی مەیخانەم
چڵە ڕێحانی دوورە دێراوم
سازی ناسازی هەڵپەسێرراوم
تکە ئاونگی سەر گەڵای زەردم
خەستەو و دەردەداری چی دەردم
ئاخرین تیشکی خۆری پایزم
شاعیری پیری تووڕە و زیزم
چۆن دەتوانم بە تۆ بڵێم من چیم؟!
خۆم گومانم هەیە کە هەم یا نیم؟!

١٩٧٥

***




## ماچی خودایی

وەرە یـــــارم، وەرە ئــــــەی تــــازە یــــارم!
وەرە ئــەســــتێرەکــەی شــــەوگاری تــــارم!
وەرە ئـەی شــــاپــەڕی باڵـــی خــەیــاڵــم!
وەرە ئـەی شــەوچــــرای ڕوونـــاکی مـــاڵــم!
وەرە خاســــەکــەوی ڕام و کــەویـــی مـــن!
وەرە ئیـــلهامــەکــەی نیــوە شـــەوی مـــن!
وەرە ئــۆخــژنـــی ســــینەی پــڕ گــڕی من!
وەرە پیـــــرۆزەکــــەی بــــەرزە فــــڕی مــن!
وەرە ئاونگـــی ســـەر پــەلکـــی گـــوڵی ســـوور!
وەرە ئاورینگـــی گـــەرم و مەشـــخەڵی نــوور!
وەرە ئــەی ڕێـــژنــە بـــارانـــی بـــەهـــاری!
وەرە شـــێعری تــــەڕی پــــڕ وردەکاری!
وەرە ئــەی نــەونــەمامــــی باخـــی ژینم!
وەرە ئــــەی شــــاگــــوڵـی مێــرگـی ئەوینم!
وەرە کــاروانکـــــوژەی کـــاتـــی بــەیــانیم!
وەرە بیـــــرەوەری و ئــاواتـــــی جـــوانیــــم!
وەرە ئــــەی بــــوت هــەتــاکــو بتپەرســتم!

وەرە مەمکۆڵەکەت بگرم لە مستم!
وەرە ئەی (خەج)، وەرە ئەی (خاتووزین)م!
وەرە با بەژن و باڵاکەت ببینم!
وەرە با دامرێ ئاوات و تاسەم!
وەرە با بسکەکەت لادا هەناسەم!
وەرە با هەڵمژم ئەم لێوە گەرمە!
وەرە با هەڵگوشم ئەم ڕانە نەرمە!
وەرە جوانێ، وەرە نازت بکێشم!
وەرە وەک دەستەگوڵ داتنێم لە پێشم!
وەرە با بەس بکەم ئەو باوە باوە!
وەرە با بێن بکەم ئەو بسکە خاوە!
وەرە با دەس لە باڵاکەت وەرێنم!
وەرە کوڵمەم لە کوڵمەی تۆ خشێنم!
وەرە سووربە لەسەر وادە و بەڵێنی!
وەرە کوردبە و مەکە پەیمان شکێنی!
وەرە گیانم فیدای چاوی ڕەشی تۆ!
وەرە با هەست بکەم گەرمی لەشی تۆ!
وەرە ماچم دەیە ماچی خودایی!
کە بێزارم لە ماچی سینەمایی!

١٩٧٦/١/١٢

***



## دەستی تەزیو

حەیفە ئەو دەستە کە گوڵزاری دەنەخشاند، بشکێ
حەیفە ئەو دەستە کە دڵداری دەگەوزاند، بشکێ
حەیفە دەستێ کە بە لەرزی و بە تەزیوی دیسان
دوژمنی ملهوڕی زۆرداری دەلەرزاند، بشکێ

١٩٧٦

***

## کوانێ؟

کوانێ ئەو پەنجە کە توندی دەگوشی مەمکی توند؟
کوانێ ئەو پێیە کە بۆ ژوانێ دەچوو گوندا و گوند؟
کوانی ئەو چاوە کە هەر جوانی دەبینی و چی دی
کوانی ئەو بیرە کە هەڵدەفڕی بەرەو بەرزی و دوند؟

***

## جوانی بەس نییە

جـوان پەرسـتم، جوان پەرسـتم
بـەدیـداری جـوانان مـەسـتم
کـە دەبینم کیـژی تـەڕپـۆش
گشـت خەمێ دەکـەم فـەرامـۆش
کـە کیـژی جـوان دەبینـم
سـاڕێـژ دەبنـەوە برینـم
کـە دەبینـم لـەنجـە و لارێ
هەسـت ناکـەم بـە چ ئـازارێ
کـە نـازدارێ ڕادەبـرێ
دڵی سـاردبـۆوەم گـڕ دەگـرێ
کـە چـاو لـە چـاوێ دەبـڕم
بـە ئاسـمانێـدا دەفـڕم
کە ڕێک دەکـوشم پـەنـجەی نـەرم
لـەشـی سـڕم دەبـێ گـەرم
بـزەی شـیرینی سـەر لێـوێ
هـەسـتی پیـرانـەم دەبـزێـوێ
نـازی شـۆخێکـی نازەنیـن



دەمباتە بەهەشتی بەرین
بیرم لە بەرم دەڕوێن
کەچی کچم هەر خۆش دەوێن
کچ ئاواتی پیرۆزمن
خۆشیی دڵی پڕ سۆزمن
کچ نووری دیدە و چاومن
بەندی جەرگ و هەناومن
کچ ڕووناکایی ژینمن
کچ هەتوانی برینمن

***

بەڵام ژین هەر هەوەس نییە
جوانیش بەتەنێ بەس نییە

***





## پەرستاری ڕەشپۆش

پزیشـــکم شـــەرمەزار بـۆوە کـە نەیتوانـی بـکا چـارم
دەبـێ هیـوام بە مـان چەند بـێ کـە ڕەشپـۆشـە پـەرستـارم
دەڵێـی چـۆنـی؟ چلـۆنـت تێگەیێنـم دەرد و ئـازارم
بەسـاغییش نەیتـوانـی هـەستی مـن دەربـبـڕێ گوفتـارم

١٩٧٦




# چاویلکە

لەو دەمەی ڕا دڵم لێی داوە بۆ ژوان
من دێوانەی چاوی جوانم، چاوی جوان
گەرچی خەڵکی وڵاتی چاو جوانانم
چاوی جوانم نەدی تێر بەچاوانم
هەتا لاو بووم چاوی جوانم لێ ون بوو
پەچە و ڕووبەند و چارشێوم دوژمن بوو
ئێستا پیرم و کەوتوومەتە ئاویلکە
چاوی جوانم لێ ون دەکا چاویلکە

١٩٧٧/١/٢٠

***

# خۆزگە

خــۆزگــە وەک خــۆر نەمدیبایــە شــەوی تار
خــۆزگــە تــاوێ ڕام نەبواردبایــە بــێ یــار
خــۆزگــە پیــری کەلــەلای نــەدەکــــردم
خــۆزگــە لــە یــەکــەم ژوانگــەدا دەمــردم

١٩٧٧



## عیشق و ئازادی

ئەگەرچی شەو درەنگە ساقی بۆم تێکە کەمێکی تر
کەوا ئەمشەو سەری هەڵدا لە ناخمدا خەمێکی تر
لەبادە ئەم ژەمە تێرکە منی تینووی جگەرسووتاو
بەچی دیارە کە دەیبینم شەوێکی تر، ژەمێکی تر!
ئەوەندە دەردەدار و بێ پەرستارم کە پێم وایە:
لەسەر کێکی تەمەن هەڵناکرێ تازە شەمێکی تر
گەلێکم ڕۆژگاری تاڵ و شیرین ڕابوارد، ئاخۆ
مەرگ مەودا دەدا دیسان ببینم سەردەمێکی تر!
گەیشتمە سەر ترۆپکی ئارەزوو ڕۆژێ، کەچی ڕوانیم:
لە پێشمدایە زەرد و ماه و سەخت و ئەستەمێکی تر
هەتا چارشێو بەسەر تۆوە دەبینم نازەنینی کورد
بەسەر بیبیلەکەی چاوی منا دەکشێ تەمێکی تر
نەما (خانی) هەتا چیرۆکی عیشقی ئێمە داڕێژێ
دەنا هێشتا لە کوردستان دەژین (زین و مەم)ێکی تر
پەپوولەی خۆشەویستی من لە شوێنێ ناگرێ ئارام
دەنیشێ و باڵی دەبزێوێ لەسەر سینە و مەمێکی تر
هەزار هێندە پەرێشان و سیاچارە بژیم هێشتا




لەنێو دڵدا هەمە ئاواتی خاڵ و پەرچەمێکی تر
هەتاکو دواپشوو ڕێبواری ڕێگای عیشق و ئازادیم
ئەگەر بێجگە لە ناکامیش نەبینم بەرهەمێکی تر
کە فرمێسکم لەسەر ڕوخساری کیژی دڵشکاو بینی،
گوتم: یاخوا لەسەر سوور گوڵ نەبینم شەونمێکی تر
شەوێکی چاوەنوارت بووم، نەهاتی گیانەکەم، ویستت
منی دڵ ناسکی شاعیر بگێڕم ماتەمێکی تر
خدر نیم بۆ تەمەن شێت بم بەکانیی ژینیٚ دانووسێم
ئەوەندەم ژین دەویٚ تا دەم دەنێمە نێو دەمێکی تر
بەتۆ چارەی چلۆن دەکریٚ دەروونی پڕ لە ناسۆرم
خەساری بۆ دەکەی دوکتۆری زانا مەرهەمێکی تر
بەهار و گوڵ، کچ و مانگەشەو، شێعری تەڕ و بادە
لەوەی زیاتر جەنابی شێخ گەرەکتە عالەمێکی تر

١٩٧٧

***



## سووڕی دەوران

زەمانی زوو هەبوو میرێکی زۆردار
دزێو و دڵڕەق و خوێنڕێژ و لاسار
دڵی خۆش بوو بە ئازاری هەژاران
بەدەس ئەو چوون هەزاران و هەزاران
قسەی خۆشی دەگەڵ خەڵکی جوێن بوو
هەمیشە تیغی جەللادیی بەخوێن بوو
سەری زۆر لاوی جوانچاکی بڕیبوو
زگی زۆر پیاوی دڵپاکی دڕیبوو
ڕق و قینی لە نێو چاوان دەباری
دزی و سووتمان و کوشت و بڕ بوو کاری
بزەی هەرگیز نەبینرابوو لەسەر لێو
دەغەزری وەک یەکانە و بڕڕەکی کێو
درندەی هار و ماری بێ ڕەزا بوو
لە تالان و بڕۆیە شارەزا بوو
لە ترسانی وڵات پڕ ترس و ڕەو بوو
ڕمووزنەی تاریکان و خێوی شەو بوو
گڕووگریان بەناوی ئەو دەکرد ژیر

لـــەوی تـــۆقیبـــوو هـــەم زارۆک و هـــەم پیـــر
مـــەکۆی جـــەردە و چـــەتان بـــوو دیـــوەخـــانـــی
غـــولّام و نـــۆکـــەری بـــوون نـــانـــی نـــانـــی
لـــەوی بێـــزار بـــوو ئینســـانی بـــەنـــامـــووس
تەشـــی ڕێس بـــوو لـــە دەرکـــی ئەو زمـــان لـــووس
دەیـــانکـــرد خـــزمـــەتـــی وەک دیـــل و بـــەنـــدە
هـــەتیوچـــە و سەرســـەری و ســـۆدرە و ســـەهـــەنـــدە
لـــە هـــەق بێـــزار و دڵ بـــەســـتەی ڕیـــایـــی
یـــەکـــەم تـــۆچینـــی کێڵگـــەی بـــێ وەفـــایـــی
نـــەیـــاری چـــاکـــە و یـــــاری خـــراپـــە
خـــەزێنـــەی کـــون بـــڕ و شـــاری خـــراپـــە
پـــەڕی قامـــووســـی ئـــەویـــان کـــردبـــوو داگیـــر
وشـــەی دار و تەنـــاف و کـــۆت و زنجیـــر
بەڕاســـتی ملهـــوڕێـــک بـــوو دوژمنـــی گـــەل
لەبـــەر ئـــەو نـــەیـــدەوێـــرا کـــەس بڵـــێ: لـــەل
خـــودا ڕازی بـــوو لێـــی، ئەممـــا خـــودای شـــەڕ
لـــە خەڵکـــی بەربـــوو وەک گورگـــی نێـــو مـــەڕ

***

بـــەڵام کیژێکـــی بـــوو ئـــەو گـــەنـــدە پیـــاوە
کـــە دەتگـــوت خوشـــکی ئاونـــگ و خـــونـــاوە
لـــەبـــارێ، نـــازەنینـــێ، کـــولّمـــە ئـــالّـــێ
نیـــگارێ، دڵـــڕفێنـــێ، چـــاو کـــەژاڵێ
بـــەژن باریـــک و بـــاڵابـــەرز و تـــەڕپـــۆش
یەســـک ســـووک و ڕەزا شـــیرین و ڕووخـــۆش
هەنـــی جـــوانتـــر لـــە مـــانگـــی ئاســـمانی

پەڕی ڕەشدالّی بوو ئەبرۆی کەمانی
بسک ڕەشتر لە ڕۆژی ژێر چەپۆکان
پەشێواویّ کە ژیری بۆ پەشۆکان
کەزی خاوتر لە خاوی لا نوالّە
لە شەرمی کولّمی سوور بۆوە گولاّلە
ئەوی تیری ئەوین جەرگی نەکوّلیّ
نەبوو ئاگای لە پێکانی مژۆلیّ
بزەی دەرمانی دەردی دەردەداران
وشەی وەک بەختەبارانی بەهاران
سەمای پەریان دەتگوت لار و لەنجەی
پەڕی گولّ دەییەشاندن دەست و پەنجەی
کوڕەی هەردی دەهێنا گوّی مەمانی
لەلای وەی تامی دەسبازیی دەزانی
هەمووشێوەی لە بابی خۆی جودا بوو
فریشتەی پاکیی و خێری خودا بوو
تەبیعەت ئەو کرەی وا ورد تەنیبوو
خودای جوانی لە خۆشیانی خەنیبو
دەگەلّ ئەو جوانییە خاوەن شەرم بوو
دلّی زۆر نەرم و خوێنی زۆر گەرم بوو
دەبوو جێی ئەو بەرزتر با لە هەوران
کەچی دەژیا لە ژووری مالّی گەوران
دەبوو چەتری سەری بالّی هوما با
نەوەک ئاوا لە ڕووپۆشیّ خزابا
دەبوو سواری قەلاّندۆشی هەلّۆ با
لە بەرزایی چیادا سەربەخۆ با

نەوەک لێی داخرابا دەرکی حەوشە
ژیابایە لە نێو ئەو غەور و خەوشە
دەبوو ژوانگەی لەکن ڕاوگەی کەوان با
نەوەک وا چاو لە دەستی دەرکەوان با
دەگەڵ پیروو بکا ڕاز و نیازێ
گەلاوێژی بەهاوڕازی بنازێ
بکا سەیرانی زەرد و ماە و ڕازان
لە خەو ڕابێ بەسیرەی سەقر و بازان
گزینگ بنگێوێ کوڵمەی ئاگرینی
شنە ببزێوێ بسکی پڕ لە چینی
دەگەڵ گوڵ پێکەنینێ فێنکی بەیانی
سەرانسەر پڕ لە خۆشی بێ ژیانی
دەگەڵ بولبول بڵێ حەیران و بەستە
خەڵک شەیدا بکا بەو شۆر و هەستە
دەبایە چێژی ئازادی بچێژێ
نەوەک فرمێسکی نامرادی بڕێژێ
بە ئاونگێ بشوا ڕوخساری پاکی
لە پاکان ون نەبێ دیداری پاکی
دەبوو بوکشن دەس و پەنجەی لە گۆوەند
«کوڕی، دیواندڕی»، بەند هەڵبڕێ، ڕەند
دەبوو جووتی ژیانی هەڵبژێری
نەوەک بابی بە سەوقاتی بنێری
قەفەس زیندانی تاوسی شۆخ و مەستە؟
کچی جوان و لەبار و دەرکی بەستە؟
کچی بێ بەش لەنێو بورج و قەڵادا



دوڕە ئەمما لە دوڕ دورجی بەڵادا

دەبا هەر ئەتڵەس و دیبای لەبەر بێ

کچێک ڕوو بەستە و چارشێو بەسەر بێ

بڵا پاژنەی لە زێڕ بێ کەوشی جوانێ

کە دانرابێ لە دەرکی دەرکەوانێ

بەکاری چی دێ خشڵ و زێڕ و زێوەر

کچێکی نەشتە نێو خەڵک و جەماوەر

بەکاری نایە بەرگی جوان و مومتاز

کچێکی چاوی دووروابێ وەکو باز

لە ژاری تاڵترە خۆراکی چەوری

کچێک وەک ڕۆژ نەیێتە دەر لە هەوری

سیا چاڵی کچانە کۆشکی میران

هەزار خۆزگە بەکاولاشی فەقیران

بەقانوونی تەبیعەت نازی بێ جووت

ئەوی ئینسانە، جا دارایە یا ڕووت

کچی میر و گەدا دڵیان هەیە دڵ

دڵیش ناکا لە دڵداری و ئەوین سڵ

ڕەبەن تامی ژیانی چۆن دەزانێ

ئەگەر «پێ»شی بگاتە ئاسمانێ

کەسێک جووتی نەبوو خۆشیی نەبینی

بەهەشت ناوێنێ ڕۆژێ دێر نشینی

کەسێکی ژینی بێ ژوان ڕابوێرێ

هەموو ژانی جیهانی پێ دەوێرێ

ئەوین مایەی ژیان و بوون و مانە

ئەوین ڕایگرتووە دەوری زەمانە

ئەویـــن نەبوایـــە پێـــی نـــاویٚ بخـــۆی ســـوێند
جیهـــان چـــۆڵ بـــوو پەپـــووش تێیـــدا نەدەخوێنـــد
ژیانـــی بـــێ ئەویـــن دەشـــتی نەبوونـــە
لـــە ســـایەی عیشـــقە ئـــەم دنیایـــە ڕوونـــە
ژیانـــی بـــێ ئەویـــن گشـــتی زیانـــە
کچیـــش نەیخـــوارد فریـــوی ئـــەم ژیانـــە
وەدووی دڵ کـــەوت و پچـــڕی بەنـــد و پێوەنـــد
دڵـــی خـــۆی دا بـــەلاوێکـــی هـــونـــەرمەنـــد
هـــونـــەرمـــەنـــدێکـــی پـــاکـــی بـــەرزە ئـــاکار
کـــە جارجـــار ڕێـــی دەکەوتـــە ماڵـــی خوونـــکار
هـــونـــەرمەنـــدێ کـــە هـــەر نەغمێکـــی تـــاری
گـــڕ و ئاورینـــگ و پشـــکۆی لـــێ دەبـــاری
هـــونـــەرمەنـــدێ کـــە دەنگـــی پـــڕ خورۆشـــی
بـــە بـــەنـــدێ دەپـــەڕانـــد دەرد و نـــەخـــۆشـــی
هـــونـــەرمەنـــدێ کـــە هەســـتی ئاگریـــن بـــوو
دەروونـــی پـــڕ لـــە ناســـۆر و بـــریـــن بـــوو
هـــونـــەرمەنـــدێ کـــە ســـووتاوی ئەویـــن بـــوو
هـــەمـــوو ئەندامـــی ســـۆز و تـــاو و تیـــن بـــوو
هـــونـــەرمەنـــدێ کـــە زادەی دەرد و خـــەم بـــوو
زەدەی دەســـتی ڕەشـــی دێـــوی ســـتەم بـــوو
هونەرمەنـــدێ بـــەزگ برســـی و بەچـــاو تێـــر
لـــە شـــەڕ بێـــزار و دۆســـتی ئاشـــتی و خێـــر
هـــونـــەرمەندێکـــی عـــەســـری فیئـــوداڵـــی
دڵـــی پـــڕ بـــوو، بـــەڵام گیرفانـــی خاڵـــی
شـــەوانی بـــەزم و شـــایی و شـــەونشـــینی




لــه درزی پـــەرد یــەکتـــریـــان دەبینــــی
کــه تێـــک دەڵقــا نیــگای پــڕ گفتــوگــۆیان
دەیــانـــدرکانـد بــەســـانی ڕازی خـــۆیان

***

کـــوڕیش ســەوداســـەری کیــژی ئــەمیــر بــوو
لــه داوی خۆشــەویســـتیدا ئــەســـیر بــوو
ئـــەویــن نابینـــیَ بـــەینــی قـــەوم و دینـــان
ئـــەویــن نازانـــیَ فـــەرقــی تـــوێــژ و چینـــان
ئـــەویــن دوو دڵ دەکا مەفتـــوونـــی یەکتـــر
لەکــن ئــەو وەک یەکــن ئیســـلام و گـــاور
ئـــەویـــن خـــاتـــوو زلێخـــای نـــەرم و هێـــدی
دەکـــاتـــه دیلـــی عـــەبـــدی زێـــڕ خـــریـــدی
ئەوینـــه شـــێخی ســـەنعانـــی غـــەریـــب زان
دەکـــاتـــه گـــاور و شـــوانـــی بـــــەرازان

***

ئـــەگـــەر خـــاتـــوون گـــرفتـــاری ئـــەویـــن بـــوو
ئـــەوینـــی لاوەکـــــه زیاتـــــر بـــەتیـــن بـــوو
گـــڕی گـــرتبــوو دەروونـــی پـــڕ لـــه جـــۆشـــی
له تـــاوانـــی نـــەمـــابوو هـــۆشـــی خـــۆشـــی
له ســوێـــی ئەو شـــۆخـــه ئـــۆقرەی لـــیَ بـــڕابـــوو
لـــه ژینـــدا ژان و ئێشـــی پـــیَ بـــڕابـــوو
ئـــەوینـــی ئـــەو دووانـــــه دوور بـــــەدوور بـــــوو
که دیواری قـــــەڵای میـــری ســـــنوور بـــوو
ســـنوور و شـــوورەو و تـــامـــان و پـــەرژیـــن
لـــه تامـــەزرۆی ئەوینـــیَ تـــاڵ دەکـــەن ژیـــن

قەڵا سەخت و حەرەمخانە پڕاوپڕ
دەرک گاڵەدراو و دەرکەوان دڕ
مەگەر باڵدار بەسەر کۆشکا فڕیبا
مەگەر لێمشت دڵی شوورەی دڕیبا
مەگەر ڕۆژێکی بەزمی بایە خوونکار
کوڕیشیان بردبایە لێ بدا تار
لە درزی پەردە دیبای بەژنی یاری
لە سیحری تێپەڕاندبا سۆزی تاری

***

زەمان ڕابرد، پتر بوو هەستی دۆستی
بەڵێ هەستە کە میر نایەن دەرۆستی
لە دەوری هەستی کەس ناکێشرێ شوورە
خەیاڵیش شارەزای پشتی سنوورە

***

هەراسان بوو کچی میری بەجارێ
گوتی: «بەسیەتی با ڕاسپێرمە یارێ»
ژنێکی ڕاسپاردە کن هونەرمەند
«ئیتر ئەو بێ بەشی و سووتانە تا چەند؟!
خەمی دووری نەخۆین، هەرچی دەبێ، بێ!
دەبا بێ و بڕۆین، هەرچی دەبێ، بێ!
وەڕز بووم لەو ژیان و پنج و مۆرە
بە ئازادی بژیم تاوێکی زۆرە
هەموو زێڕ و جل و نۆشین و خواردن
فیدای تاوێ دەگەڵ ئەو ڕابواردن
هەتا کەی مەینەتی دووری بچێژین!



هـــەتا کــەی بـــووکــی ئـــاواتمـــان بنێـــژیـــن!
هــــەتــا کـــەنگـــێ خـــەیـــاڵ بگرینـــە بـــاوەش!
بلـــەرزێنـــێ مچـــوڕکـــی بێ بـــەشـــی لـــەش!
هـــــەتـــا کـــەی ئـــەو نـــەبینم تێـــر بـــەچـــاوان!
لـــەســـەر مـــن داخـــرابـــێ دەرکـــــی بـــــاوان!
هـــــەتـــا کەی داخـــرێ ســـینگ و بـــەرووی مـــــن!
هـــــەتـــا کەی نەشـــکێ تاســـە و ئـــارەزووی مـــــن!
دەبــــــا بــــێ و ڕوو بکـــــەینــــــە دوور وڵاتـــــان!
نـــەجاتـــــم دا لـــە نێـــو شـــــــووره و قــــەڵاتــــان!
ئـــەگەر مـــەردە، بـــەجـــەرگە، پـــاکە، ســـەربـــاز
دەبـــا بـــێ و مـــن بـــکا لــــەوبـــەنـــــدە دەربـــاز!
نــــــزا و پـــــاڕانـــەوە و گـــــریـــان و نـــــاڵــــــە
چ ســـوودێکـــــــی هەیـــە نـــــووشـــتەی بـــە تـــاڵە
نـــەبـــێ باکی لە خـــــوێـــــڕیـــی دیــــوەخـــانـــان
بـــە پیــــــاوان دێنــــــەدەر گـــــەوهـــەر لـــە کـــانان
بـــە زۆر بشـــــکێ دەبـــــێ دەرکـــــی قـــــەڵایـــە
دەنــــــا ئـــــەو دەرکـــە بۆ کـــــێ ئـــاوەڵایـــە»

***

ئـــەوەی بیســـت لاوۆ گـــەشـــکەی گرت لـــە تـــاوان
گـــوتـــی: «ئـــامـــــادە و ســــــازم بـــە چـــاوان
دڵـــم نـــاوێ نـــەبـــــێ قــــوربـــانـــی نـــــازی
ســــــــەرم نـــــاوێ نــــــەبێتـــــە بــــەردەبـــازی
ئـــەوا بـــــۆی ئـــــاوەڵایـــە بـــــاوەشـــــی مـــــن
بـــەســـە بـــۆمن کە ئەو بێتـــە بـــەشـــی مـــن
لـــە ڕێـــی ئـــەودا بەخـــت کـــەم گـــەر ژیانـــم




بەسەربەرزی و بە شانازیی دەزانم
لە پێناوی ئەوا گەر بچمە سەردار
لە ژێر پێمدا دەبینم مەزن و سەردار»

***

شەوەزەنگی بە زەبری زێڕ و بەرتیل
کراوە دەرکی زیندان بۆ کچی دیل
کچە گۆڕیەوە کۆشک و تاج و تەختی
دەگەڵ ئازادی و ئازار و سەختی
بە جووت ڕۆیین دەگەل یاری وەفادار
بەرەو موڵکی ئەوین و ژینی ساکار
سنووریان هەڵبوارد و چوونە شاری
لەوێش فەرمانڕەوا بوو نابەکاری
لەوێش میرێکی زاڵم کاربەدەس بوو
لەوێش بێ چاوڕوویەک داربەدەس بوو
لەوێش زیندان و بەندیخانە پڕ بوون
گزیر و پاسەوان شوێن گێڕ و دڕ بوون
لەوێش هەر سەربزێوی باسی سەر بوو
لەوێش دنیا بە کەیفی بێ هونەر بوو
لەوێش ناپیاوی بازاڕی گەرم بوو
لەوێش باو باوی پیاوی بێ شەرم بوو
لەوێش پیسکە و درۆزن کاری باش بوو
لەوێش مەردایەتی و پاکی لە پاش بوو
کوڕ و کیژی لەباری پاکی ساکار
لە ڕێی ژینا لەوێ بوونە کرێکار
لە بۆ نانێک و بۆ یەک تۆزە پێخۆر



یەکێکیان بو بە پاڵە و یەک بە جلشۆر
ئەگەرچی زۆر گران بو ئەو ژیانە
بەڵام کەیفی هەبوو بەزمی شەوانە
بەرۆژ ئاوارە بۆ پێخۆر و نانی
بەشەو دەستەملان بوون تا بەیانی
لەشی ناسک کە ئازاری دەبینی
زمان دەیگوت ژیان چەند نازەنینی!
لەدنیادا نەبینرا نۆشی بێ نێش
کەسێک خۆشی دەوێ حازر بێ بۆ ئێش

***

ئەمیریان کرد کە لەو کارە خەبەردار
بە خۆی دادا وەکو ورچی بریندار
بەڕقدا چوو بە ناهەق خوێنی ڕشتن
گزیر و دەرکەوانی گرت و کوشتن
هەمیشە دەیگوت: «ئەی ئەو ئابڕوو چوونە
شتی وا نەیبووە وێنە و نموونە
کچی من بێ بە جووتی بۆرە پیاوێ،
دەکوژرێ، خۆی لە ماڵی کابە باوی!
دەبێ من چۆن بژیم و چۆن بمێنم!
لەنێو هاوشانی خۆمدا سەر هەڵێنم!
کچی من هەڵگرن، وەڵڵاهی جوانە!
کچی من بۆ کچی گاوانَ و شوانە!؟
لەنێو مسکێنی خۆم دەبمە پلیتە
نەکوژم ئەو هەتیوە و ئەم سەڵیتە
نەیانهێڵم دەبێ لەو سەرزەمینە




لـــە شـــانـم دادڕم ئـــەو پینـــە شـــینە
وەکـــارخـــەم دەســـەڵات و هێـــزی زۆرم
بـە خـوێنیَ ئەو پـــەڵە و نـــەنگـــە وەشـــۆرم»

***

بـــەڕێی کـــردن گـــەلیَ شـــەیتـــان و شـــۆفـــار
هـــەتـــا بیکـــەن لـــە حاڵـــی وان خـــەبـــەردار
تـــولـــەی شـــوێنگێـــڕی بـــەردانـــە مـــڵ و مـــۆ
وەکـــار کـــەوتن لـــە ڕاوێچکـــە و لـــە بـــابـــۆ
چ ناپیـــاون ئـــەوانـــەی ســـوودپـــەرســـتن
دژی خـــاوەن دڵـــی شـــەیـــدا دەوەســـتن
چ ســـپڵەن ئـــەو ســـەگـــانەی گـــورگـــەمێشـــن
کەلاک بـــۆ گـــورگـــی بـــرســـی ڕادەکێشـــن

***

گـــەڕان شـــۆفـــارەکان قـــوژبـــن بـــە قـــوژبـــن
وڵاتیان دا ســـەراســـەر ســـەنـــگ و ســـووژن
گـــەڕان شـــار و گـــەڕان دێهـــات و هـــۆبـــە
هـــەمـــوویان پشـــکنی نـــۆبـــە بـــە نـــۆبـــە
گـــەڕان کێو و چیـــا و ئـــەشـــکـــەوت و زەنـــدۆڵ
گـــەڕان کادێـــن و کـــەنـــدوو و ئاخـــور و هـــۆڵ
ســـەروشـــوێنیـــان نـــەبوو پـــەیـــدا لە هیچ کـــویَ
کەســـیَ نـــەیـــدیبـــو دوو شـــەیـــدا لە هیـــچ کـــویَ
بـــە میـــریـــان ڕاگـــەیـــانـــد وەک ڕۆژە ڕەوشـــەن:
کـــە «لێـــرە نیـــن، پـــەڕانـــدوویانە کـــەوشـــەن»
گـــوتی: «پێتـــان دەدەم ئـــەمجـــارە فـــەرمـــان
بچـــن بـــۆ وڵاتـــی دوور و دەورویـــەرمـــان




بڕۆن و ڕامەوەستن، هیچ مەترسن
هەواڵی ئەو دووانەم بۆ بپرسن
لەهەر کوێیە هەبن بیاندۆزنەوە بۆم
وەکو تاژیی بەکار بیانقۆزنەوە بۆم
«دەدەم پارە و خەڵاتی باش بە ئێوە
کە بۆم دەردەس کەن ئەو دوو سەربزێوە
لە بان هەوران بژین یا تەختی بەحران
لە داویان خەن بە فیڵ و فەند و مەکران
گوتوویانە کە خزمەتکاری چاکی
دەبێ وەک داڵ بکەی بۆنی کەلاکی
لە ئێوە کار و تێکۆشان، لە من ماڵ
دەتانهارم بە سەریانا نەبن زاڵ»

***

قەڵای میران بەدەس ناکەس دەنەخشێ
کە «دار هۆرەی لە خۆی بێ زوو دەقەڵشێ»
ئەگەر زێڕ و دراو دەوری نەبوویا
بلووری ژین دەبوو غەوری نەبوویا
ئەگەر پارە نەبوویا بیرەبڕوا
دەبوو زاڵم لە کوێ وا دەستی بڕوا؟
ئەگەر خوێڕی نەکا میللەت فرۆشی
لە خۆی نابینێ زاڵم خێر و خۆشی
ئەگەر ئەسپی غەرەز ناوێ قەڵەمباز
بگاتە جێی وەزیرێ ڕەنگە سەرباز
کە فیل و ڕوخ نەکەونە کلکەسووتە
مەلیک ماتە بەدەستی پیادە ڕووتە

بە من ئەو هێرش و زەبر و زوڵم و زۆرە
بەشی زۆری گوناهی مفتەخۆرە

***

بڵاوبوون خێڵی شۆفارانی بێ عار
لەدوای دوو ئاشقی لاوی فیداکار
گەڕان شار و وڵاتی دوور و نێزیک
دووان بە زمانی فورس و تورک و تاجیک
یەکێک بووە مارگر و یەک بو بەدەروێش
یەکێک بووە حافز و یەک بوو بە دەسکێش
یەکێک بووە لۆتی و یەک بوو بە چاوەش
یەکێک بۆە سواڵکەر و یەک بوو بە جاکەش
خەیابان و شەقام و ڕێگەیان گرت
هەموو جێیان تەنی، گشت جێگەیان گرت
کچ و کوڕ بێ خەبەر لەو تۆڕە داوە
خەریکی کاری خۆیان بوون لە لاوە
ئەگەرچی ڕووت و پێخواس بوون و برسی
بەڵام کەم کەم نەیانمابوو مەترسی
بەسەربەستی ژیانی سەر حەسیری
بە قوربانی بێ تەخت و بەختی میری
چ خۆشە سەربڵندی و بێ نیازی
بە ئازادی بخۆی نان و پیازی!
دەڵێن یارێ گوتی جارێ بەیاری[1]
«گەڕیدەی شارەزای زۆر گوند و شاری
لەهەمووان خۆشتر و جوانتر چ جێیە؟
گوتی: «ئەو جێیە خۆشە یاری لێیە»



که دڵ خۆش بوو دڵۆ با دەربکا دەست
شەکەت بێ با لەش و ئاسودە بێ هەست
دەسێک بکرێ بەشەو لە ملی نیگارێ
بە ڕۆژ ماندوو ببێ با هەر لە کارێ
دەس و پەنجێک کە بۆکشێ جووتە مەمکێ
جەمام نابێ بەکارێ تاکو نەشکێ
کە لێو بمژێ شەوانە لێوی دڵدار
بە ڕەنج کێشانی ڕۆژێ ناگرێ بار
کە شەو تێر ماچ و مووچ و گازە کوڵمە
چبوو سووتاو و تاوانگازە کوڵمە
کەسێکی چێژی ئازادی بچێژێ
لەوەی باکی نییە ئارەق بڕێژێ
بەبێ ڕایەخ شەوێ ئاسوودە دەنوێ
کرێکارێ کە یار پشتی بهەنوێ
بەبێ پێخەف شەوێ گەرموگوڕە لەش
کە یاری نازەنین بگرێ لە باوەش
کە شەو دایماڵێ پەنجەی یاری جوانی
بەڕۆژ با هەر جەدەو بێ پێل و شانی
کە سۆزی عیشقی وان هەردەم پتر بوو
هەموو تاوێکی عومرێکی خدر بوو
لە نێو شۆفارەکاندا خواجەیەک بوو
عەجەب زیانی خورۆ و پیرە سەیەک بوو
ئەمیر بۆ پاسی نێو ماڵی کڕیبوو
نموونەی پیاو خراپی و دەم شڕی بوو
کە خۆی بێ بەش لە خۆشیی ژین کرابوو

هەمــوو دەرکــی هــومێدی داخــرابــوو
کە شــەوقــی عیشــق و دڵــداریی نــەدیبوو
کــە گەرمیــی باوەشــی یــاری نــەدیبــوو
کــە زیبــک وَ غیرەتــی مێریــی نــەدیبــوو
کــە خۆشــیی پیاوەتــی و نێریــی نــەدیبــوو

***

دەروونــی پــڕ گــریمــانــە و حــەســەد بــوو
هەتــا حــەز کــەی بــەخیــل و شــووم و بــەد بوو
کــە کوشــتی پیــاوەتیــی ئــەو دەســتی تــاوان
هەقــی خــۆی بــوو ڕقــی زۆر بــێ لــە پیــاوان
کە وەک یــەک بــوون ژن و گاشــە لــەکن ئــەو
نــەبــوو باکــی بــدا ئــازاری ژن ئــەو
چلــۆن بــڕوا ئــەکــەن ئینســانی بــێ بــەش
نــەبــێ بــێ ڕەحم و بــێ ئینســاف ودڵــڕەش
کــە ئینســانێک وەکــو حــەیــوان خــەسیبێ
نییە ســەیــر گــەر نمــوونەی ناکــەســی بــێ
بــەئــەمری میر ئــەویش خــۆی کــردە ســواڵکــەر
گــەڕا شــار و وڵاتــان ئــەمســەر، ئــەوســەر
هەتــا ڕۆژێکــی خــواجــەی دڵــڕەقــی پیــر
لــە ماڵێــک دووربــەدوور ناســی کچــی میــر
تــەمــاشــای کــرد جلــویــەرگــی دڕاوە
ســەر و پــۆتــڕاکــی ئــاڵــۆز و بــڵاوە
بــەرۆکــی ئــاوەڵایــە، ســینگــی ڕووتــە
ســەری ئــەو کــوڵمــە ناسکەی تــاوەســووتە
هــەڵــی ماڵیــوە تــا ئانیشــکی بــۆ کــوڵ




دەرێژێ ئارەقە زەنگوڵ بەزەنگوڵ

کەچی شادی لە نێو چاوان دەبارێ

کچی میرە و شەرم ناکا لە کارێ

سەری سوورِ مابوو ئەو کابرا نەزانە

چلۆن گۆڕاوە ئەم دەور و زەمانە

«تەماشای ئەم ژیان و ڕێ و شوێنە

ڕەسەن زادە و کوڵ و ئەسپۆن و سوێنە

بە دووی کارا گەڕان کووچە بە کووچە

لە بۆ خاتوونی وا تاوان و سووچە

بەشیر و شەکری پەروەردە کراوە

لە کۆشک و سەرسەرایاندا ژیاوە

هەمیشە خاوەنی کۆیلە و کەنیز بوو

جلوبەرگی هەتا حەز کەی تەمیز بوو

ئەوی دەستووری دابا جێ بە جێ بوو

لە خۆی زیاتر لە ژووری کۆشکێ کێ بوو!

دەیانکرد باوەشێنێ ئەمبەر، ئەوبەر

لە بن سێبەر کچی نەشمیلی ئەسمەر

کەچی ئێستا لەبەر سوورە هەتاوێ

پەڕۆ شۆری دەکا بۆ نان و ئاوێ

مەگەر باوکی پەکی کەوتووە لە تاڵان

کە ئەو ئێستا دەکا جل شۆری ماڵان

دەبێ خواردبێتی مێشکی گوێدرێژێ

دەنا بۆ نانی چۆن ئارەق دەڕێژێ

ئەوی بۆ ئەو کرا ، بۆ کێ کراوە؟

بەخوای وا دیارە نووشتەی لێ کراوە»

***

ئەوەندە تەسکە بیری گەندە پیاوان
دەکەن فەرقی کچی میران و گاوان
دەڵێن: کەنگەر و قوماش نابن بە وڵداش[2]
قسەی کەونە پیاوانە و قسەی باش
دەسەلمێنن بە پیاوی گەوج و سادە
کە: سوار هەر سوارە، پیادەیش هەر پیادە[3]
کچی میران دەبێ لیران وەخۆ خەن
کچی گاوان دەبێ پووشکان وەکۆ کەن
کچی میری دەبێ خۆشی ببینێ
کچی شوانی بچێتە نان چنینێ

***

کچی میری دەبینی باش و ئەفسووس
کچی میر نەیدەبینی پیرەجاسووس
دەمەو ئێوارە ڕزگار بوو لە کاری
گەڕاوە جا بەرەو ئامێزی یاری
بەڵام جاسووسی پەستی شوومی ناپیاو
بەدوای ئەودا دەچوو هەنگاو بە هەنگاو
تەماشای کرد کە لاوێکی قووڕاوی
لە ڕێگایەی بڕیوە سیلە چاوی
کە یاری دەرکەوت بێ ترس و پارێز
بەرەو پیری فڕی گرتی لە ئامێز
لە هیچ کوێ دای نەنا تا بردیە ژوور
ئیتر ڕووی کردە ئەم ژوورە خودای نوور

***



هەڵی نا جێی ئەوان و وەک کرێوە
لە لاقانی وەرێنا هەر لەوێوە
ترەختان و ڕکێفکوت کەوتە ڕێیە
لە خەڵکی وایە «کابرا ئاوی پێیە»[٤]
لە سوێی ماڵ و دراوی باڵی گرتبوو
خەیاڵی مولک و ماش و ماڵی گرتبوو
هەمیشە وایە کاری پیاوی نامەرد
کە سوودی خۆی دەکا تەنیا بەراوەرد
لە خۆی ڕازی بکا ئەو میری خوێنخۆر
دەروونی عاشقان با بێنێ ناسۆر
خەڵک تووشی بەڵایە بێ جەهەننەم
کە ئەو گیری کەوێ دینار و دەرهەم
هەتیو بار سووک نەبێ با باری قورسی
نەیێتە خوار جەنابی ئەو لە کورسی
بە کوچکێوە بدا جەرگی ژنی پیر
هەتا چەنگی لە جێگایەک ببێ گیر
بەوەی چی چیی بەسەردێ پیاوی بێ کەس
کە ئەو پارەی دەوێ و پارەی دەوێ بەس
بەوی چی ماڵی خەڵکی بێ خودان بێ
کە ماڵە جوانە کەی ئەو ئاوەدان بێ
بە کوشتن دا خەڵک ئۆردوو بە ئۆردوو
پەکی پێ ناکەوێ ویجدانی مردوو

***

بە تاڵووکە گەیشتە دەرکی میری
بە گورجی خۆی گەیاندە کن گزیری




گوتی : « زەحمەت نەبێ پێی ڕاگەیێنی
هەمە عەرزێک و عەرزێکی نهێنی
گرنگە عەرزەکەم ، ڕازێکە ڕەنگ بێ
هە تا زووتر خەبەردار بێ درەنگ بێ »

***

ئەوەندەی پێ نەچوو بردیانە کن میر
گوتی: « ئەی میری خاوەن راو و تەگبیر
لە زیادی بێ هەمیشە بەخت و هاتت
پتر بێ و هەر پتر بێ دەستەڵاتت
بەجێم هێناوە ئەرکی بەندەگیی خۆم
لە سایەی تۆوە خایەن بیندراوە
چییە فەرمانی گەورەم ، وەختی ڕاوە»
ئیتر نامەردە پاشەوپاش کشاوە
لە خۆشیان ڕەنگ و ڕووی میری گەشاوە
هەرای کرد: « کێ لەوێیە[٦] بێتە ژوورێ»
بە جارێ داوەرین چەند زرتە سوورێ
گوتی :«ئێوە کە خزمەتکاری خاسن
هەموو ئەو نۆکەرە باشەم بناسن
بکەن ئێستا سەراپا زێڕووەشانی
خەڵاتی گەورەیی دادەن بە شانی»

***

وەکۆی کردن لە پاشان گەورە گەورە
هەموو دەستەونەزەر وەستان بەدەورە
چ گەورە گەورە؟ بەندە و گوێ لە مست بوون
بەرەو ڕووی ئەو تەواو بێدەنگ و هەست بوون



قسەپان و ڕەزاگران و دەغەڵکار
درۆزن، دووزمان، پەتیارە، بێعار
بەگژ خەڵکا دەچوون وەک نەڕڕە دێوی
کە ئەو دیار با دەبوونە دێڵە ڕێوی
کە ئەو دەیگوت: «ئەرێ چبکەین بەیانی؟»
کە ئەو دەیگوت: «گەورەمان بۆ خۆت دەزانی»
گوتی: «ئەی گەورە گەورەی بارەگای من
بڵێن ئێستا چییە تەگبیر و ڕای من؟
دەڵێن ئەو دوو کەسەی لێرە هەڵاتوون
لە پاتەختی وڵاتی نیشتەجێ بوون
کە دۆستی خۆمە میری ئەو وڵاتە
ئەمیرێکی بەزیبک و دەستەڵاتە
دەڵێم چەند کەس لە ئێوە هەڵبژێرم
بچن، سەوقات و دیاریی بۆ بنێرم
بە نامە لێی بخوازم ڕانەوەستێ
دەس و پێی ئەو دوانەم بۆ ببەستێ
بە ڕێیان کاتەوە بۆ دەرکی ئێمە
من ئامادەم ئەویش گەر کاری پێمە»
گوتیان: «صەددەق! قسەی میری تەواوە»
گوتی: « ئیتر قسەم پێتان نەماوە»

***

شەوێکی ڕەش وەکو بەختی ئەسیران
وەکو دوارۆژی زۆردارو ئەمیران
نە مانگ دیار بوو نە ئەستێرەی گەش و جوان
تروسکەی لێ بڕابوو ئاگری شوان

دەروونی پیاو خراپانە شەوەزەنگ
کە داخنرێ بە بوغز و کینە و ژەنگ
بەرەواڵەت کش، بەڵام پڕ کارەساتە
هەزاران ڕازیَ تێدا گەرچی ماتە
لە کۆشک و گرتووخانەی دەرکەبەستە
یەکێک مەستە، هەزاران زار و خەستە
لە لایە لاو دراونە بەر شکەنجە
لە لای دیکە سەمایە و لار و لەنجە
لە کونجێ بێوەژن دەگری و دەناڵێ
لە کۆشکی بادەگێڕە چاو کەژاڵێ
لە سووچێ باب لە سوێی ڕۆڵەی دەسووتێ
لە قەسرێکی دەڕقسێ نیوەڕووتێ
کچی بێ بەش لە ژووری ئەشکی دەسڕێ
کوڕی ئاغاش بەپارە جوانێ دەکڕێ
هەتیوی برسی چڵمی هەڵدەلووشێ
کوڕی شێخ ئارەقی نابڕێ لە شووشێ
لەلایە چارەڕەش کەوتووە لە کوڵان
لەلایە پارە بەش دەکرێ بە کوڵان
لەلایە جامی بادە پڕ کراوە
لەلایە داری ئیعدام هەڵخراوە
بەڵێ ڕاستە قەڵای مێرانە شەوگار
بەڵام تێیدا ونە تاوانی بەدکار

***

کچ و کوڕ نووستبوون بێ خەم لە کەپرێ
نەیانزانی کە دارۆغە دەیانگرێ



له کــوێ دڵــداری پــاکی چــاکــی ســاکار
دەزانــێ فێــڵ و مــەکــری پیــاوی زۆردار
لــە چیــن بێ یــا لــە ماچیــن بــێ دیــارە
کــە ئاغــا دوژمنـــی چینـــی هـــەژارە
لـــەلای خـــۆیـــان هـــەیـــانە غیـــرەت و ڕەگ
لـــەهەر شوێنـــێ هـــەبن تـــوخمـــی دەرەبـــەگ
لــە چین کیـــژی ئــەمیـــرێ هـــەڵبگیـــرێ
لــە مــاچین کــەســـری شـــانە بۆ ئەمـــیرێ
لــە میـــــران هــەرکــەسێکــی دڵنیـــا بــێ
لــە ژینــا تـــووشــی خێـــر و خـــۆشــی نابــێ
نــەیــانــزانــی ئــەوەی ئێــرەش ئــەمیـــرە
خـــەریکـــــی ڕاو و ڕووت و ڕەش بگیـــــرە
هـــــتەتا لێیـــــان وەژوور کـــەوتن یـــەســـاوڵ
له خـــەودا ســواری ســینگیـــان بوون نـــەخـــافــڵ
نــەیانهێشـــــت ڕاپـــەڕن، ببـــزوون، هــــەڵستن
دەس و پێیـــــان بــــە چــــۆڵــــەپێچـــە بــەســـتن
کــە دوایـــی هـــات لـــەوی خانـــەبگیـــری
بەڕێیـــــان کـــردنــەوە بــۆ دەرکـــی میـــری

***

بـــەیـــان ئـــەنگـــووت و ســـۆفی تاکــە تاکــە
گـــوتیـــان هـــەســـتین بچینــە نـــوێـژێ، چاکــە
بڵێنــد بـــوو بانگـــدەری کـــوێــرێ خـــەواڵـــوو
گــوتــی: «بانگـــی بەیانــی درەنگـــە یـــا زوو
«دەبـــێ زوو بــم هـــەتـــاکـــو نـــەبـــڕێ نـــانــم
«بە بێ دەســـتنوێژ بـــدەم بانگـــی بـــەیـــانم»

لە دارکێشی وەژان کابانی نوێژکەر
گوتی: «کابرا دەهەستە جل بکە بەر
کە بارت زوو نەکەی بۆت نافرۆشێ
وەدەستت ناکەوێ پارە و قورۆشێ
کەمی ماوە لەبۆ جێژنی بەراتێ
کراسی نوێ نییە بۆ شانی فاتێ»
ژنی پاڵە گوتی: «هەستە بەسە خەو
خرابی بۆ نەنووستی، فیلە، ئەمشەو
پەلەت بێ زوو بکە کارێ و بزانە
مەلا فەرموو کونی ڕۆژی بەیانە»
بەڕەت بردن گەیشتە ژوورێ ئاغا
تخێڵ بوو جا لە نێو بەندی وەتاغا
گوتی: «خانم بشێلە پێ و دەستم
درەنگ هاتوومەوە، وا دیارە مەستم»
جەنابی شێخ بە خێزانی دەفەرموو:
«هەتیوێکی بنێرە خانەقا زوو
بڵێ شێخ نوێژی کرد و نووستەوە بۆی
خەلیفە نوێژی بۆ خەڵکی بکا خۆی»
خەلیفە پێ کەنی و زانی چ باسە
گوتی: «باوکم بەقوربانی بێ، خاسە»
وڵات ڕوون بوو، کتێبی دەستی دانا
خەریک بوو تازە بنوێ لاوی زانا
کە دایکی کردیە هاوار و فریاد
بەخۆیدا دا، گوتی: «ئەی داد و بێداد!
چبوو تاوانی ئەم جووتە فەقیرە



که وایان لێ بکا ئەم گورگە پیرە
ئەوە کار بوو کە کردی ئەم یەکانە
پەژارەی خستە شاری بەم بەیانە
بە قوربانت دەبم بینایی چاوان
قوڕوولی بۆ دەکەی تۆ سووچ و تاوان
خودایا بەس بدە دەستی ئەمیری
خەراپە، بەدفەڕە، بۆ خۆت خەبیری
هەتا کەنگێ دەدەی تۆ بەخت و هاتی
دەزانی چەند دڕە، نەحلەت لە زاتی!»
گوتی: «دایە! چییە ئەم بۆڵە بۆڵە؟»
گوتی: «هەستە، سەڵام لێ ڕابوو، ڕۆڵە!
ئەمیر ئەمڕۆ لەداری دان بەجووتە
کچۆڵەی خۆی و ئەو خۆش خوانە ڕووتە
لە شاری کەوتووە هاوار و گریان
دڵی گەورە و بچووکان بۆتە بریان»
ئەوەی گوت کەوتەوە ئاه و نزوولە:
«خودایا چەند بەدە ئەم میرە خوولە!
دڵی کوو هات بکوژێ ئەم گوڵانە!
لە یەکتر کا بە ناهەق ئەم دڵانە!
خودای گەورە! بەدەس خۆتە هەموو کار
لەسەرمان لابەرە بێ دادیی خوونکار
لەسەر دڵداری نۆلاوان دەکووژێ!»
کوڕ و کیژان لەپێش چاوان دەکووژێ!»
گوتی: «پاڕانەوە بێ کەڵکە، دایە!
نوزوولە قەت دەڕۆستی زوڵمی نایە

نەزانە تا کو خەڵکی ئەم وڵاتە
بەدەس میرانەوە ئەم دەستەڵاتە
دەئاژۆن، ڕادەدەن تا بلوێ بۆیان
هەموو کارێ دەکەن بۆ سوودی خۆیان
بپارێزن هەتا ئەم موڵک و ماڵە
وەبەر پێیان دەدەن مسکێن و پاڵە
ئەوان پێیان بڕێ دەسکەوت و قازانج
بەقوڕ گیرێ دەبا سەد ماڵە کرمانج
ژن و پیاو و کوڕ و کیژان دەکووژن
قسە توند و قەڵەم تیژان دەکووژن
هەتا خەڵکی لە یەکتر وا نەبانن
ئەوان سواریان دەبن، سواریش دەزانن
«هەتا میرزا حەکایەت خوانی میرە
مەپرسە دایە لەم گوشت و بگیرە
هەتا کیژی هەژاران مەشکەژێنە
لە ماڵی وان هەیە ئەم بێنە بێنە
هەتاکو هێزی ئەم خەڵکە نەجووڵێ
هەزار پاڕانەوەت دایە بە پووڵێ»
کە ژن زانی ئەویش ئینسانە وەک مێر
مەڕی میری ئیتر نایێتە سەر بێر
کە وریابوونەوە پاڵە و کرێکار
دەشێوێ ماڵی میر و مەزن و خوونکار
کە میرزا بوو بە ڕۆشنبیری تازە
هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێ کچی میر
قسێکی کرد کە پەندە بۆ کوڕی ژیر



«بە زۆر بشکی دەبێ دەرکی قەڵایە
دەنا ئەو دەرکە بۆ کێ ئاوەڵایە!
خەبات ڕزگار دەکا کۆیلە و ئەسیران
لە ناخێ ڕادەکا مەزن و ئەمیران
بە ئەفسانەی دەزانن سووڕی دەوران
غولام و ورکەخۆری دەرکی گەوران
بەڵام دەوران دەبێ ڕۆژێ بدا سووڕ
لەبەر گەوران نەبێ پشتی خەڵک کووڕ
کە گۆپاڵی خەڵک دەرهات لە خیزی
ئیتر نامێنێ میری گەورە فیزی»

١٩٧٨/٢/١

***

١. ئەم گوتەیە لەم دوو شێعرەی مەولەویی بەڵخی وەرگیراوە:

| گفت معشوقی بە عاشق کای فتی |
|---|
| تو بەغربت دیدەای بس شهرها |
| پس کدامین شهر زانها بهتر است؟ |
| گفت آن شهری کە در وی دلبر است |

٢و٣. لە فۆلکلۆر وەرگیراوە

٤. لە فۆلکلۆر وەرگیراوە. کینایەیە لە بەپەلە ڕۆیشتن

٥. جساران کەروێشک لە لاندا دۆزینەوە هونەر بوو. نۆکەرێک لە ڕاودا کەروێشکی دۆزیبایەوە دەیگوت نۆکەری ئاغای خۆم پێدەڵێن، هۆی... تەماڵە. لە هێندێ ناوچە پێیان دەگوت (دیاردی).

٦. میرەکان کە بانگی خزمەتکارەکانیان دەکرد ناویان نەدەبردن، هەر دەیانگوت: کێ لەوێیە؟

## خاك

بۆت نووسیوم بۆت بنووسم ئەمن چیم؟
دوندی قەندیل، گۆڕەپانی هەڵگورد نیم
بەرەو بەرزی دەچم ئەگەرچی وردم
خاکی بەرپێی تێکۆشەرێکی کوردم

***



## شەرابی خەست

جێـــژنی نـــەورۆزە، شـــەرابـــم خـــەســـتترە
تـــا نـــەڵێـــن بـــولبـــل لە شـــاعیر مـــەســـتترە
جـــوانی گوت شـــۆخـــی لەبـــاری بـــادەگێـــڕ:
« ئەو کـەســـەی ســـەرمـەستتـــرە، سـەربـەستترە»
«آنچنـــــانـــرا آنچنــــــانتـــر میکنـــد»
شـــاعیری دەروەســـــــت بـــەمەی دەروەســـــتترە
چیمـــەنی شـــێلا بەشـــــایی کیـــژی کـــورد
وەی دڵـــم لـــەو چیمـــەنـــە پـــێ پـــەســـــتترە
مـــن بڕســـــتم لـــێ بـــڕا یـــا کیـــژی شـــار
زۆر لە کیـــژی دەشـــــتەکی بـــەیـــدەســـــتترە

١٩٧٨

***

## خەوم نایە

بەیان ئەنگووت و شەو ڕابورد و من هێشتا خەوم نایە
دەخوێنن بولبول و قومری، بەڵام قاسپەی کەوم نایە
خەیاڵ دەمباتە جێژوانی شەوانی لاوەتی، ئەمما
خرینگەی بازنە و خڕخاڵ و بەرمووری ئەوم نایە

***




## ڕیژنە

تۆ بەڵێنم پێ بدە تا من بەرەو ژوان ببمەوە

بمدەیە ماچێکی تەڕ لەم لێوە، با جوان ببمەوە

دەستی لەرزۆکم هەتا تێیدایە هێزی بەی گوشین

لێم گەڕێ تاوێ لە باخی سینە میوان ببمەوە

شەنگەبێری بسڕەوە فرمێسکی بێ شوانی ئیتر

ڕەنگە هێشتا لەو چیا و زۆزانە بۆ شوان ببمەوە

من گوڵی سەر گۆڕی ئاواتی لە مێژینەم بەڵام

ڕێژنێکم لێ بدا پێم وایە بۆ ڕوان ببمەوە

شێخی سەنعان بۆ کچی گاور لە ئیسلام وەرگەڕا

من خەریکم بۆ کچە شێخێ پەژیوان ببمەوە

١٩٧٨/٧/١٩

# بەهاری زەرد

بۆ لەیلا قاسم

هەمیشە دەرد دەبینم دەرد دەبینم
درۆی دوژمن، دەهۆی نامەرد دەبینم
مەگەر زەردایی ناکەن چاوەکانم
کە ڕەنگی نەوبەهاری زەرد دەبینم

***

بە سۆزەی با کە سکڵی دڵ گەشاوە
دەروون پڕ سۆز و فرمێسکم خوناوە
لە دووی لەیلا بە واوەیلا و شیوەن
دەڕۆم و پۆلی شینگێڕم بەدواوە

***

بزەی هاتێ گوتی: «ڕووناکە ئاسۆم
وەرە جەللاد پەتت باوێژە ئەستۆم
ئەوە پەت نییە مێداڵی ئیفتخارە
کە بوومە قارەمانی میللەتی خۆم

***

ئەوەی بیست شاعیر و گریا بەزاری
ئەگەرچی بەسترابوو لێو و زاری




گوتی: «لەیلا هەمیشە پایەداری
لە ژێر خاکا لە پێش چاوان دیاری

***

کە تۆ تۆرای لە چاوان وەک خەوی من
لە بسکت ڕەشترە مانگەشەوی من
بڕۆ مەجنون بە لەیلای خۆت مەنازە
کە ناوبانگی پتر ڕۆیی ئەوی من

**گۆڤاری سروە ژمارە ١ بەهاری ١٣٦٤ ـ ١٩٨٥**

***

## زینده به چاڵ

پڕ نەبێ جامی بەتاڵم تا کەی؟
نەشکێ باڵی خەیاڵم تا کەی؟
هاوسەر و دەستەملانی ژانم
گیانەکەم! نایەوە باڵم تا کەی؟
شەو لە تاریکی و بێدەنگیدا
ڕۆژەکەم! بۆ تۆ بناڵم تا کەی؟
هەر لە یادی سەری بسکت دابم
گیانە! ئاشوفتە بێ، حاڵم تا کەی؟
هەر منەتباری شەراب و مەی بم
حەسرەتی چاوی کەژاڵم تا کەی؟
هەر لە ماچی دەمەکەت بێ بەش بم؟
لێوی وشک و دەمی تاڵم تا کەی؟
هەوەسی گەستنی کوڵمەم تا چەند؟
ئارەزووی مشتنی خاڵم تا کەی؟
شینە میوانی شەوانی دووریم
شادی، ڕوو ناکەیە ماڵم تا کەی؟
من لە دووڕەنگی بەدڵ بێزارم

ڕەنگــــی زەرد، دیــدەیــی ئــاڵــم تا کــەی؟
مـــن وەکـــو هـــەنگـــیٚ هەڵاڵـــەم مشـــتوون
ژینـــی نێـــو گـــەنـد و هـــەڵاڵم تـــا کـــەی؟
مـــن بـــەشـــێلانی چـــەمـــەن ڕاهـــاتـــم
هاتـــوچـــۆی نێـــو دڕ و داڵـــم تـــا کـــەی؟
بـــۆ ســـــەرینچـــاوە و کانیـــــاوی ڕوون
هـــەڵـــوەریٚ ئـــەشـــکی زوڵاڵـــم تـــا کـــەی؟
مـــن هـــەڵـــۆ بـــووم و چیـــا هێـــلانـــەم
ژێـــر چـــەپۆکـــی قـــەل و داڵـــم تـــا کـــەی؟
قـــەفـــەزی دژمنـــــی بـــەدخـــووی دڵـــڕەق
هـــەڵـــوەرێنـــیٚ پـــەڕ و بـــاڵـــم تـــا کـــــەی؟
ســــــەرە نێـــــــزەی ســـــتەم و زۆرداری
بنجنـــــیٚ ســـــینگی مـــەتـــاڵم تـــا کـــەی؟
گـــورگـــی بێـــدادی لـــە گیـــانـــم بـــەربـــووو
ئێشـــی جـــیٚ گـــــاز و قـــەپاڵـــم تـــا کـــەی؟
مـــن پـــەلـــە قـــاژە و هـــاواریٚ نـــەکـــەم
ئـــەو بڵـــیٚ زاڵـــم و زاڵـــم تـــا کـــەی؟
کوتکـــی بێـــدادی هـــەر بکوتیٚ کاســـە ســـەرم
کـــــار نـــەکا دەســـت و زوخـــاڵـــم تـــا کـــەی؟
ئـــەو کـــــە زاری ڕقـــــی دەرکێشـــــاوە
مـــن زمـــــان بـــەســـــتە و لاڵـــم تـــا کـــەی؟
پـــۆشـــتە و تێـــــر و پـــڕ و خـــۆش لـــەوەڕە
بـــرســـی و ڕووت و ڕەجاڵـــم تـــا کـــــەی؟
تـــەم و مـــژ، بـــەنـــدەن و دەشـــتی گـــرتم
هـــەڵنەکا ســـروە شـــەمـــاڵـــم تـــا کـــەی؟




بەس نەبێ دەسبەسەری و دەربەدەری
نەچمەوە نێو کوڕ و کاڵم تا کەی؟
باخەوانانی جیهان پێم نالێن
بۆ وەری میوەیی کاڵم تا کەی؟
مانگ و مێریخی دەپێوێ ئینسان
منی کورد، زیندە بە چاڵم تا کەی؟
چاوەڕێی تیشکی هەتاوی هیوام
نەڕەوێ هەور و گەواڵم تا کەی؟

**١٥ـ ١١ـ ١٩٧٦**

**لە پاشەرۆک دا بڵاو کراوەتەوە**

***

## بەهار هەر دێ

لە گیاندانا دەگوڕێنم بژی هەر کورد و کوردستان
بە گوللەی دژمنانی گەل دڵیشم بێتە ڕاوەستان
پشووی دواییم دەخوێنم بۆ گوڵ و گوڵزاری ئەم خاکە
لە سایەی ئەم گوڵ و گوڵزارەیە بوومە هەزار دەستان
دەزانن زامی دیلی چەند بە ئێش و چەند بە ئازارە!
دەبێ رابێین هەتا ئێمەیش دەگەینە ڕیزی سەربەستان
خەتای خۆمانە تا ئێستا کە هەروا کۆیلە و دیلین
ئەوانەی شاد و ئازادن کەمێ زووتر لە خەو هەستان
نەتاندیوە کە ڕووباری خوڕێن بەردی دەقەڵشێنێ
وەهاش هەر زۆرداری دەسووتێنێ گڕی هەستان
لە مەیدانی شەڕانخێوی خەباتی قەرنی بیستەمدا
سەرم سووڕما کە ئەسپی سووکەسواری کوردی بۆ وەستان
وەڵامی دامەوە پیرێکی ئازادەی جهاندیدە:
خەتای سواران نەبوو پێش سوارەکانمان قورس و ناوەستان
هومێدێ بەرمەدەن ڕێگەی خەبات بگرن بڕۆنە پێش
تەماشای خەڵکی تێکۆشەر بەدیکتاتۆری چۆن وەستان
هەتا کەنگێ سیاچاڵی بە سامی دژمنی زاڵم

پڕاوپڕ بێ لە ڕۆڵەی گەل جمەی بێ وا دەس بەستان؟

هەتا کەی ئەشکی خوێنینی کچە کوردی برا کوژراو

لە جێی بادە و لە بەزمی دژمنان بدرێتە دەس مەستان

مەترسن ڕۆڵەکانی قارەمانی گەل لە گیانبازی

لە کۆڕی ئەم خەباتە بێ وچانە تاقە یەک کەستان

سەهۆڵبەندانی بێدادی ئەگەرچی تووش و دژوارە

بەڵام لێم سوورە وەک ڕۆژێ بەهار هەر دێ لە دووی زستان

بە خەڵکی عالەمی سەلماندووە تاریخی ئازادی

دەبێ زاڵم لەبەر تێکۆشەران بەرداتەوە دەستان

١٩٧٧/١١/٩

لە پاشەرۆک دا بڵاو کراوەتەوە

***

## ڕەوەز ورد نابێ

زەوی! ئێستاش لەڕووت هەڵدێ بدەی سووڕ؟
نەڕووخای ئاسمانی پیری پشت کووڕ؟
کە حاڵی زارمان ئاوا دەبینن؟
کە ماڵی زاڵمان ئاوا دەبینن
کە مەرگی کاوەکانی چاک دەبینن
کە جەرگی کیژەکان پڕ چاک دەبینن
کە کوڕی شین، بەهاری سوور دەبینن
«ئەمین»ی نا ئەمین مەئموور دەبینن
کە بووکی سووری بێ زاوا دەبینن
کڕووزی بێ گۆنای ساوا دەبینن
کە سۆمایی لە چاو باوکان بڕاوە
بەرۆکی پیرە دایکان دادڕاوە
کە گوندی شووم لە گوندی کورد دەخوێنێ
کە گەنجی کورد دەگەوزێنێ دەخوێنێ
کە تەختی بەختی کورد بێ خێو دەبینن
«سولەیمانی» ئەسیری دێو دەبینن
بناری لێژ و ناهەمواری هەڵگورد

دەبینن بۆتە دەشتی کەربەلای کورد
بەناهەق خوێنی تێکۆشەر دەڕێژن
شەهیدی بێ سەر و بێ شوێن دەنێژن

***

بەڵام با تێ بگا ئەو دوژمنەی پەست
ڕەوەز ورد ناکرێ هەرگیز بەداردەست
دەبێ کوند هەر بەرەو ویرانە بفڕێ
هەڵۆ لەو کێوە سەربەرزانە نەبڕێ

١٣٥٨/٠٢/٢٧

لە پاشەرۆک دا بڵاو کراوەتەوە

***

## بەهاری ئاڵ

لە مێژە ئاواتی منە
ببینم وڵاتی سنە
زێدی کۆن و رەسەنی کورد
بەدرێژایی تەمەنی کورد
ڕوانگەی هەزاران کارەسات
بنە و مەتەرێزی خەبات
شوورەی سەختی بەرەنگاری
پردەی وەختی فیداکاری
بۆسەی پێشمەرگەی کۆڵنەدەر
گۆڕخانەی سوپای داگیرکەر
بچمە لانی بەچکە شێران
قەڵاگای تەنگانەی مێران
جێ پەیکانی تیر ئەنگێوان
جێی پێکانی دەس بزێوان
خاکی نەتەوەی نەبەزم
هەر گوتوویە ئەزم ئەزم

***



تێر تێر بڕوانمە دیمەنی
لە خۆشیانی ببم خەنی
چاو بگێرم لە ڕژد و لێژ
تا برینم ببن سارێژ
دانیشم لە بن دەوەنی
بڕوانمە مێرگ و چەمەنی
هەڵمژم هەوای زەنوێران
خۆ بدەمە بەر ئاوهەڵدیران
هەلگەڕێم بە ڕاز و زەردان
بەردەمەوە جاڵە بەردان
لە بان ڕەوەزان بخوێنم
کەوی بەیان وەدەنگ بێنم
لەو ڕنوانە بکەم ڕەوت
دژمن بۆی نەکراون زەوت
لە مشارەیەک داگرم پێ
نەتەوەی کرد سەرەنگرێ
تۆزێ بەردێ بکەم بە کل
«کە گەردوون پێی نەداوە تل»
وەک گۆرانی هەورامان پیو
پێ بنێمە سەر «پێپیلکەی دێو»
دانووسێم بە کانیاوی ڕوون
ڕابکشێم لەسەر هەڵەسوون
چەپکێ وەنەوشە بچنم
دەسکێ سوێسنە بڕنم
خۆم لە تیشێکی بکەم بەند

هەڵپسێنم چڵی گیا بەند
ئەشکەوتی نەچی لە بیرم
پەناگا بوو بۆ باپیرم
بگرم گەوە و پێچ و خەمی
بچمە سەر دوندی ئەستەمی
لەسەر کێوی بەرزی ئاریز
کوردستان بگرمە ئامێز
بە جوانی ئەو خورِسکاوە
روون بنەوە ئەم دوو چاوە
ئەم چاوانەی گەلی ماوە
لە سویێ کوردستان گریاوە
ئەم چاوانەی فرمێسکیان رِشت
بۆ کوردێکی دوژمن دەیکوشت
ئەم چاوانەی داگیرساون
هێند لە شینگایان گریاون
چم پی دەڵێن لێرە و لەوێ
من کوردستانم خۆش دەوێ
پێشم بڵێن ونی و دێوی
دەپەرەستم چرِ و کێوی
جا دەگەرِێمەوە پێ دەشت
بەلادێیاندا بکەم گەشت
ببینم دێم و بەراوی
بوورەی گاسن لێ نەدراوی
کێڵگەی بەرِێژەو و نەرمان
بەڵام بێ خۆیان و خەرمان



نە سەد، نە بناوان نە بەند
جۆگەی جۆماڵ نەکراوی مەند
ئەستێری پڕ بووەی بۆگەن
پڕ لە لیتە و سێ سوو و جەگەن
جوتیاری ئازا و توند و تۆڵ
گاجووتی لەڕ و گاسنی کۆڵ
برسی هەژار بێ دەرەتان
ڕەوش و ڕووت و بێ تۆو و نان
دەستی قەڵشیو پێ ڕاگیراو
گیرفانی دڕاو و بێ دراو
پاڵەی سواڵە هۆنی بەگورد
چەقڵی چاوی دژمنی کورد
خانووی کاول و ڕەش و برش
هەر نانی ڕەق و دۆی ترش
بۆی کرا درۆ و دەلەسە
کوا ڕێگاوبان و مەدرەسە؟
نەک مافی جووتیار نەدراوە
لادێمان خاپوور کراوە
سەرگەردان بون لەنێو تۆڕا
بەوەی نییە نێویان گۆڕا
بۆ زەحمەتکێشی قارەمان
نە دوکتۆر هەیە نە دەرمان
بێ بەهرەن لە خوێندەواری
خوێندەواری و کوردەواری؟

***

هەتا هێزی خەڵک بزووت
بوو بەمەشخەڵی گەش بزووت
خەڵکی تێکۆشەر خۆی دەرخست
بەگژ ئەرتەش داچوو بەمست
ڕاپەرینێک بوو بێ وێنە
وڵات دەتگوت، گۆمی خوێنە
دیکتاتۆر بۆ پاراستنی خۆی
کردی هەرچی کە دەکرا بۆی
بەدەستی ستەم و تاوان
ڕژا خوێنی شۆڕە لاوان
زۆرداری بۆ زۆر مانەوە
بەرەق هاتە مەیدانەوە
بێ بەزەیی دەستی وەشاند
خوێنی ژن و پیاوی ڕژاند
زگی باوکی پیری سووتاند
ڕۆڵەی لەبەر دایک ڕفاند
ویستی خاکی پاکی ئێران
ئەوەندی دی بکا وێران
بەڵام خەڵکی لە گیان بێزار
دای نەنواند لەبەر زۆردار
لە تانک و تۆپ نەپرینگاوە
گوێی بە گوللە نەزرینگاوە
پێی داگرت، چەقی نەبەزی
تا داگیر کەر گورچووی تەزی

***



کوردیش بەشداری خەبات بوو
ڕۆڵەی ڕۆژی کارەسات بوو
لاوی گیانفیدای گیانفیدا
ئازایانە، شەهیدی دا
لە خەباتی خوێناویدا
لە هەڕەتی تەنگاویدا
کوردستان هەر بوو بە قەڵا
دیتی هەزار دەرد و بەڵا
ئێستا دەڵێ خوێنی گەشم
بۆ شۆڕش ڕشتوە کوا بەشم؟
دژی زۆرداری بووم، هەر وام
هەر دەمەوێ مافی ڕەوام
دەمەوێ بگەم بەنیاز
ناوم مەنێ جیاوازی خواز
کەچی پۆلێک کۆنەپەرەست
بۆ بێگانە بوونە داردەست
لە بەهاری ئازادیدا
لە کاتی خۆشی و شادیدا
خراپە کەوتەوە برەو
تەمایە ڕۆژ بکا بە شەو
سنەی جوانی خوێناوی کرد
درۆ و فێڵ و ناپیاوی کرد
ناپاک هاتەوە کایەوە
داوی بۆ خەڵک نایەوە
دەگرێ دەکوژێ دەبڕێ

شـەڕ دەفـــرۆشـێ زگ دەدڕێ

ژن و منـــــداڵ نـاپـــارێـــزێ

لێمـــان دەگــــرێ مـــەتـــەرێــزێ

ڕاوە ڕووتــــــە و خـــانــەبگیــــر

گـرمەی تـۆپـەی و قرمەی شێست تیر

زەبـــر و زەنگـــی خـــۆی دەنــوینێ

لاوان لـــە خـــوێـــن دەگـــەوزێنـــێ

کـــوردســـتان بـــەهـــاری ئـــاڵـــە

جـــا بەخوێـــن بێ یـــا بـــە گـــوڵاڵە

١٠ ـ ١ ـ ١٣٥٨

لە پاشەڕۆک دا بڵاو کراوەتەوە

* * *



## فرمێسکی ڕونو

تۆ گوتت: «من عاشقی سەوداسەر و دینم دەوێ»
من گوتم: «تاکو بە ئاواتت بگەی دینم دەوێ»
هەڵکەوێ تاوێکی چاوێکی لە دیدارت بکەم
تا بزانی کوانێ بۆ جوانێ دڵ و دینم دەوێ؟
بزگوڕی ڕەش داپۆشێ ڕوومەتی گەش تا بەکەی؟
شاعیری گەشبینم و کوا ؟ چاوی ڕەشبینم دەوێ؟
ئەی پەریزادی مەهابادی! ئەتو ون بووی لە من
تۆم هەبێ لەکوێ پەریزادە و پەری چینم دەوێ
ڕووتم و یاقووت و ئاوریشمم لە بیر ناچێتەوە
لێوی سوور و ئاڵ و بسکی خاو و چین چینم دەوێ
تۆ نەدیوی بۆیە شەو چاوم لە ئاسمانێ بڕی
تۆ بەدی کەم گرشە گرشی مانگ و پەروینم دەوێ؟
تا وەکو ساقی ئەجەل نەمداتێ تاڵاوی نەمان
چاوە بڕکە، دەس بزێوی، ماچی شیرینم دەوێ
ژوانی بن سیلە و پەسیوی لاوەتی یادی بەخێر
بۆ ئەوەی پیرانە نەمرم یادی دێرینم دەوێ
کوانێ ئەو شەوگارە بێدەنگە لە ژوانگەی جێ هەوار؟

کچ ڕەوەک بوو من گوتم: هێدی بە! حەجمینم دەوێ
کوانێ ئەو ڕۆژەی کە سەرچۆپیم دەگرت بانگم دەکرد
دۆم دەوێ، دۆی قۆڵ بەبازن و پەنجە نەخشینم دەوێ؟
شاعیرم، جوانی پەرەستم، دڵتەرم، شێتم، لەشۆق
کێوی بژوێن، دیمەنی جوان و دەشتی ڕەنگینم دەوێ
من بە فرمێسکی ڕنووی کوێستانی کورد پەروەردە بووم
کولمی ئاڵ و چاوی کاڵ و سینگی بەفرینم دەوێ
خۆشەویستی من کچە کوردێکە پاک و نازەنین
باخەوانە پیرەم و باخی بەپەرژینم دەوێ
نامەوێ ڕوو بگرێ تا دەمرێ بە فێڵبازی و درۆ
یاری، نازداری، لەباری، دیاری شەرمینم دەوێ
من تەشی ڕێسێکی وەک شیرنی (وەفایی)م بۆ چییە؟
کیژی وریای چاوکراوەی فێرە زانینم دەوێ
بۆ دەبێ زێندین لە زیندانم بکا چونکە گوتم:
«ئەز مەمم، خەستەی خەمم، کوشتەی ئەمم زینم دەوێ؟
نایەڵن قەت چێژی ئازادی بچێژم من دەنا:
خوێنی شیرینم دەوێ کوا تەرمی خوێنینم دەوێ
بواری وەم نادەن لە نێو مێرگە (چەکۆ) هەڵتوتەکێم
چونکە پرسەی دایکی مل بە کوێن و سەر شینم دەوێ
نایەڵن ئاسوودە دانیشم لە لاپاڵی چیام
قاسپە قاسپی خاسەکەو، بێ گرمەیی مینم دەوێ؟
ئارەزوومە هەرچی ئینسانە بە ئازادی بژی
چۆن گەلی داماو و دیل و مات و خەمگینم دەوێ؟
نامەوێ خوێن بڕژێ یا بۆنی کەلاکی کۆن بکەم
ڕەنگی مێلاقە و گوڵاڵە و بۆنی نەسرینم دەوێ



هەڵپەڕین و پێکەنین دەبزێوی هەستی ناسکم
کوا دڵی پڕ ئێش و ئۆف و جەرگی بەبرینم دەوێ؟
دەرزی ئاژن بوو دڵم لە سوێی شەهیدانی نەمر
بەس نییە، مەودام بدەن تۆزکاڵێ تەسکینم دەوێ
جێی گەرم، پارووی نەرم خۆشە، بەڵام بۆ مافی خۆم
سێبەری ئەشکەوتی سارد و نوێنی بەردینم دەوێ
بۆ بەزاری مەزنیخوازی تاڵە وەک کەکرە و زەرەند
گەر بڵێم من پاسەوانی قەسری شیرینم دەوێ؟
دێوی شەڕ سمکۆڵ دەکا لێم و دەبوڵێنێ دەڵێ
بۆ لەسەردانی هەموو ئێوە تەورزینم دەوێ
بۆ فریشتەی داد بەسینەی پڕ لە کینە و داخەوە
هاتە کوردستان گوتی: ڕەجمی شەیاتینم دەوێ
سەقز و سەردەشت و سابڵاخ و سنەی کرد غەرقی خوێن
سێی تری ویستن گوتی: بۆ سفرە حەوسینم دەوێ
کەی ڕەوایە بمدەنە بەر گوللە یا ڕاوم بنێن؟
گەر گوتم کوردم لە کوردستانی خۆم ژینم دەوێ
کورد مەگەر کوندە کە هەر وێرانە بێ هێلانەکەی؟
نیشتمانی ئاوەدانی جوانی ڕەنگینم دەوێ
زۆر بە ئاواتم کە کوردستانەکەم بێ کێشە بێ
ئاشتیخوازم کوا وڵاتی پڕ ڕەق و قینم دەوێ؟
تا نەهێڵم شوێنەواری نالەباری پەهلەوی
نەگبەتی زۆردارەکان و خۆشیێ مسکینم دەوێ
لاشەرم، کوا بەدفەرم ئەمما لەسەر مافی ڕەوام
دەست و چەک، ئیمان و هیوا و هەستی ئاورینم دەوێ؟
بۆ نەجاتی ئەم گەلە کۆیلە و هەژار و بێکەسە




گیانـــی پـــاک و بیـــری تیـــژ و ڕێگـــەی ناســـینم دەوێ؟
بـــۆ بـــەگـــژداچوونـــی زۆرداری و هـــەژاری و ناهـــەقـــی
کارگـــەر و جـــووتێـــری ئاگـــا و مســـتی ئاســـنینم دەوێ
ســـەخت و ناهـــەمـــوارە ئـــەم ڕێـــگایە کـــوردی کـــوڵنەدەر
بـــۆ خـــەبـــاتێکـــی درێـــژخایـــەن گـــوڕ و تینـــم دەوێ
دوای نـــەجـــات بۆ ئـــاوەدانی و خـــۆشـــی خـــاپـــوورە وڵات
کـــۆمەڵێکـــی چـــاک و پـــاک و ڕاســـت و وردبینـــم دەوێ
بـــۆ خـــەباتـــی هـــاوبـــەشـــی یـــەکســـانی تـــونـــدوتیژی گـــەل
لاوی کارامـــەی بـــەجـــەرگ و کیـــژی ســـەنگینـــم دەوێ
کیـــژ و کوڕ بگـــرن لـــە دەوری گـــۆڕی هێمن ڕەشـــبەڵەک
مـــن کـــە شـــینگێڕی شـــەهیدانم لـــە کـــوێ شـــینم دەوێ

مەهاباد ٣ ـ ١٢ ـ ١٣٥٨

لە پاشەڕۆک دا بڵاوکراوەتەوە

***

## خانەنشین

بولبولێک بووم لە ڕکەیدا بە بەهاری ڕەنگین
دوور لە گوڵزار و لە دیداری گوڵاڵە و نەسرین
کازیوە، بۆ لک و پۆپی گوڵی باغی دەفڕێم
پەڕ و پۆم پێوە نەما، ئێمە ئیتر هێزی فڕین
دەستی ئەو ڕاوکەرە بڕزێ کە بڕی باز و بڕست
سووری سوورگوڵ بدەم و ڕوو بکەمە مێرگی شین
من چریکەم هەموو سووچی چەمەنی پڕ کردبوو
ئێستە نایە لە گەرووم بێجگە لە ناڵەی خەمگین
من کە شینگێڕی هەموو سوورە گوڵی پەڕپەڕ بووم
ڕەنگە هەر دڕکی پەڕیو لێرە بکا بۆ من شین
من کە بۆ دیتنی گوڵ هێڵی سنوورم دەپەڕاند
هەر لەسەر هەق گوتنێ ڕووتە کرام خانەنشین
شاوەڕێخنە دەگەڕێ وا لە دەراوی چۆمەڵ
دینی دینی گوڵە ئەو بولبولی دڵ پڕ لە ئەوین
تازە دڵخەستە و پەڕ بەستە بێ دەستەم من
وەرە دەر ڕاوکەری دڵڕەق لە کەلێن و لە کەمین
تێپەڕێ هێندە بە ناخۆشی ئەگەر ژینی درێژ
خۆزگە سەد خۆزگە بەوانەی کەم و ئاسوودە دەژین

لە چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز دا بڵاو کراوەتەوە ـ شیلان ئاوێ ١٣٦٠

## ئاپۆلۆی ماچ

بە حیجابی ئیسلامییەوە دێم جوانی
ماڵە بابم ئای لەو خەلە و خەرمانە
نەمدیبوو مانگی چاردە وا ڕووناک بێ
بەساوی پاک لەنێو جەغزی خەرمانە

***

گوناح نەبوو، تێم هەڵڕووانی، نەترسام
لە چەمۆڵە و جنێو و بۆڵە بۆڵی
ئەوی جوان بوو لە ڕووی ئەودا بەدیم کرد
هەنیە، کوڵمە، دیدە، بڕۆ، مژۆڵی

***

کە دین نەبی، دینی دەگۆڕێ بۆ تۆ
ئەو تەرسایەی بێ ترس ڕایمووسی خاچ
کچی شەرمین بەڕوو سووووری دەنیشێ
لەسەر ڕووی تۆ شەوێکیش ئاپۆلۆی ماچ

ورمێ ٦٣/٤/٢
لە چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز دا بڵاو کراوەتەوە



## بارگەی یاران

دێت و ڕادەبرێ وەکوو سەروی ڕەوان من چیبکەم؟

کە بەقوربانی نەکەم ڕۆحی ڕەوان من چیبکەم؟

قەدی ئەو شۆخە وەکوو دووخ و خەدەنگە ئەفسوس

پشتەکەم کۆمە وەکو ماڵی کەوان من چیبکەم؟

تاز هەنگاوی شلم کوانێ دەبێ بۆ شەوڕاو

جوانە زۆر جوانە بەڵێ ڕەوتی کەوان من چیبکەم؟

زەبری ئاوزەنگی بڕا و شل بووە دەستی جڵەوم

دێ دەنا پڕمەیی بۆر و بدەوان من چیبکەم؟

ژوانی خۆشی هەڕەتی لاوەتی دێتە خەونم

کاتی ئاویلکە لەگەڵ زیندە خەوان من چیبکەم؟

شەو هەتا ڕۆژێ لەبەر ئێشی لەشم ناڵەم دێ

دیتە گوێم دەنگی «گەلۆ» و «نیوەشەو»ان من چیبکەم؟

بارگەیان تێکەوە پێچا و بەڕێ بوون یاران

لەدنێ وا بەتەنێ پاشی ئەوان من چیبکەم؟

ژیانی من ئێستە وەکوو خۆری دەمی زەردەپەڕە

پێم نەما تین و گوڕ و هێز و تەوان من چیبکەم؟

سروە هات گونچە گوڵی باخە ئەدەب پشکووتن




باخـــەوانـــی گـــەرەکـــە تـــازە جـــەوان مـــن چیبکـــەم؟
ئـــاو نەبـــوو ئـــەو دەمـــی هێمـــن مەلەوانـــی کـــورد بـــوو
ئـــاو شـــوکور زۆرە وەرن زوو مەلـــەوان مـــن چیبکـــەم

١٣٦٤
**لە چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز دا بڵاو کراوەتەوە**

***




## تەوری جەور

دوژمنی کوردی نییە ئەفلەقی دڵڕەق بەتەنێ
ڕیشەیی خەڵکی عێراقی دەیەوێ هەڵبکەنێ
لە عێراق نازی شتێکی بەری چاوی بگرێ
هەر بە تەورێ دەبڕێ زاڵمە نەخل و دەوەنێ
عەرەب و کورد و تورک، ئەرمەنی و ئاشۆری
دەگرێ، یا دەکوژێ، وەک بوتێ سوجدەی نەبەنێ
زێڕی چی؟ ئاسنی ژەنگاوی و تیژە سەددام
کۆنە ئاسۆری ئەون ئێستەکە دێنن تەشەنێ
کوشتی، سووتاندی و بردی لە جنوبی ئێران
وەک مەغوولێ کە لە خۆی ڕازی بکا ئەهریمەنێ
ئەوی ئەو کردی بەنامەردی دەگەڵ کوردستان
شەختە نەیکرد بە گوڵ و نەستەرەن و یاسەمەنێ
مووشەک و بۆمبی لە دێ و شاری وڵاتی هەڵکرد
خەڵکی ئاوارە بوو بۆ دەشت و تەلان و دەمەنێ
گوللە داباری وەکو تەرزە لەسەر پیر و جوان
تەرزە کوانێ بەزمیی دێ بە گوڵ و گیای چەمەنێ؟
وا بڵاو بۆتەوە جەیشی بە پەلاماری بەجێ

تازە کۆ بێتەوە دژوارە بە بێڵ و بەشەنێ
خۆی بە نێرۆن و بە چەنگیز و بە هیتلێر زانی
نەیدەزانی دەدرێ مشتی گرانی لە چەنێ
دەستی بێگانە دنەی دابوو کە خۆی هەڵدێرێ
کەچی ڕاچوو لە پەڕەی جەرگی پەلی دارەبەنێ
لەوەتەی هەڵمەتی شێرانەیی خەڵکی دیوە
خەوی تۆراوە، بەشەو ڕادەپەڕێ، ڕادەچەنێ
ماوەیەک مەستی مەیی بەرزەدەماخی بوو، بەڵام
کاتی وەی هات لە خومار بێتەوە لووت دابژەنێ
ئەو کە نەیهات بەزەیی قەت بە هەژار و بێکەس
ڕۆژی تەنگانە ئەوان چۆن دەبێ دەستی نەکەنێ؟
کەس نییە جەرگی بە کوچکێوە نەنابێ سەددام
چۆن دەبێ جەرگی ئەویش خەڵکی بە کوچکێوە نەنێ؟
چۆن دەبێ باکی نەبێ ئەو لە «أخ» و «أخت»ی عەرەب
چۆن نەجاتی دێ لەدەس مامەڕەش و پوورە نەنێ؟
ئەو کەسەی هانی دەدا ئاگری شەڕ ڕۆشن کا
ناچتە هانای کە کەوت تێر و پریش، پێ دەکەنێ
تازە ڕزگاری لە دەس خەڵکی عێراق دژوارە
هێندە پێناچێ، هەموو دەورووبەری لێ دەتەنێ
چی لەدەس نایە ئەگەر خەڵکی عێراق ئەمڕۆکە
ڕاپەڕن، یەک بگرن، دەس دەنێ، ڕاماڵی دەنێ
ئەمەیە ئاقیبەتی شوومی لەخۆبایی بوون
چارەنووسی ئەمەیە دوژمنی خەڵک و وەتەنێ

بەهاری ١٣٦٤



# شینگێڕی

بەبۆنەی بوردمانکردنی شاری بانە لە لایەن
باڵەفڕەکانی عێراق لە١٥ی جۆزەردانی ١٩٨٤

بانە وێرانە جگەر بریانە
لەش سڕە، دڵ پڕە، چاو گریانە
بەم بەهارە گوڵی وێ پەڕ پەڕ بوون
وا بە دەردی خەزەڵی پایز چوون
جەرگی مێلاقە لە داخان ڕەش بوون
ئەشکی شلێرە وەرین و گەش بوون
پیر سولەیمان خەمی دیکە نابا
سیسە دار و دەوەنی ئاربابا
ئەوی شین ماوەتەوە شینگێڕە
هەر گەڵایەکی هەزاران دێڕە
مێک و میراژی بە هاوکاریِ یەک
چوونە سەر خەڵکی هەژاری بێ چەک
زۆر بە ڕقتر لە قەراری جاران
بانە وێرانە، کرا بۆمباران

هەرچی خانوو بوو لە نزم و بەرزی
وەک دڵی عەسکەری بەعسی لەرزی
هەر بە زار خۆشە دەڵێن شەشسەد کەس
یا نەما، یا نە بەحاڵ ماویە نەفەس
مێشکە پڕژاوە لە نێو خۆڵ و خاک
لەت و پەت بوو لەش و ئەندامی پاک
چۆڵەمە، دیزەلە، ئەژنۆ دەرچوون
ماڵ نەما، یا نە ڕما، یا، سەرچوون
دەس پەڕی، مووره شکا سینەش چاک
ژنی پاک ڕۆیی، بڕا پیاوی چاک
باش بزانە گەلی دوورناسی ورد
ئەوەیە، هەر هەقی ئەفلەق بۆ کورد
ئەوی هاوسەنگەر و پشت و پاڵمە
دیاری دا دیاری بڕەی ناپاڵمە
شەڕفرۆش بەعسییە ئەی ئێرانی
شەڕفرۆش چی گەرەکە؟ وێرانی
چ نەهاوەند بێ چ بانە و دزفوول
بەعسی وێرانگەرە ئێستا مەسئوول
شەڕفرۆش مووشەک و بۆمبێ داوێ
شەڕفرۆش ڕاحەتی ئێمەی ناوێ
زگی ناسووتێ بە حاڵی ئێمە
دڵی کوردە لە ڕقی ئەو کێمە
تێدەگا خەڵکی مەگەر مێشکی ڕزیو
چ دەکا بەعسی بە کوردی ئەو دیو
ئەم قەڵادزەی بە شەهید مەشهوورە



هەر بە ناپاڵمی بەعس خاپوورە
گەوزی لەم شارە لەنێو خوێن و خورِ
بە سەدان پیر و منداڵ کیژ وکورِ
گوندەکانی هەموو لێ ڕووخاندن
ڕەزەکانی هەموو لێ سووتاندن
کانییەکانی بەسمیت دارِشتن
یانی سەرچاوەی ژیانی ناشتن
دای لە سێدارە ئەوی بیناسم
چەند هەزاری وەکوو لەیلا قاسم
بەزەیی کوا لە دڵی بەردیدا
شوومری ناگاتێ لە نامەردیدا
بە قسەی ئەو ئەوی خێرەسەر بێ
دەیکوژێ با کوڕی پێغەمبەر بێ

***

## جێژوان

ئەو پەنجەی وا لە بێ هێزی دەلەرزێ
کوشیویەتی مەمکۆڵەی بالابەرزێ
ئەو ددانەی ئێستێ نەماوە تاقی
گەستوویەتی زۆر جار چەنەگەی ساقی
ئەو چاوانەی سۆمایی لێ بڕاوە
هێند لە جوانان داگیرا، داگیراوە
ئەو لێوەی وا ئێستێ باری گرتووە
کوڵمەی نەرم و نۆڵی یاری گرتووە
ئەو باهۆیەی زەمانە لێی بڕی هێز
کام کیژ جوانە گرتوویەتە نێو ئامێز
ئەو دڵەی وا ژوانی دەویست و جوانی
ئێستا پڕە لە غەم و لە نیگەرانی
ئەو پێیانەی شەرزەی کردووە کوتر و کوان
ماندوو نەبوو قەت لە هاتوچۆی جێ ژوان

١٣٤٧

لە چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز دا بڵاو کراوەتەوە




## دەسڕێژی لاوان

بڕۆ ڕێوی بەسیەتی چاو نەزێری
پەلاماری مەبە بۆ لانی شێری
گوتوویانە لە لانێ دەرپەڕێ شێر
هەموو دژمن بەزێنە مێ و نێری
مەیە بۆ ئەم چیا نینۆک شکێنە
دزی سیرمە و گەرۆکی گەرمەسێری
بەتیکی سەخت و ئەستەم هەڵمەڕۆسکێ
خەریکی شاخەوانان هەڵبدێری؟
ئەتۆ و ڕژد و رکە و هەڵدێر و تیرەگ
لە گیانی خۆ مەگەر بێزار و تێری؟
بچۆوە بن گڕاڵک و کەندەڵانت
ئەتۆ کەی فێری نێو سویسن و کنێری؟
بڕۆ کلکت بنێوە نێو گەڵۆزت
هەلاتن ئیشی خۆتە باشی فێری
لە پێش تۆشدا شەهەنشاهانی خوێنڕێژ
خەریک بوون پێی نەهێڵن خێر و بێری
لەمێژە فێرە کوردی پاکی لاشەڕ

بەرەنگاری، فیداکاری، دلێری
ئەتۆ هەر قاتڵی زارۆک و چووکی
بە دیل و پیر و بێ ئەنوا دەوێری
دەنا بێ شک لەبەر دەسرپێژی لاوان
دەبێ وەک بارەکەو هەر خۆت وەشێری
حیسابی کاری خۆت گەر باش دەزانی
لە مافی ئێمە بۆچی خۆ دەبوێری؟
کە لێت ڕووناکە ناهەموارە ڕێگا
ئەدی بۆ ڕێ بە ڕێدار ناسپێری
ئەگەر باڵی هوماش بێ، سێبەری تۆ
کە مافی کورد نەدەی ناچیتە ژێری
عەداڵەت گەر هەبێ پێویستە هەرکەس
لە ماڵی خۆی بکا خۆی چاوەدێری
چیای زاگروسە زورگ و بەردەڵانە
فەلەک نەیکرد و ناکا بەردبژێری
بە تانک و تۆپ و مێکی خۆت مەنازە
کە شوان کردی بە سەنگەر بەردەبێری
دەنێری چۆلەکە بۆ ڕاوی باشوو
کە جوندی بۆ شەڕی جووتێر دەنێری
کە ڕووناکبیر قەڵەم ڕۆکا لە چاوت
کەڕولاڵی نەوەک هەر کوتر و کوێری
لە بوختان و درۆت بێزارە یەکسەر
لە شێخی خانەقا تا پیری دێری
گەلی کورد دەستی دا چەک هاتە مەیدان
تەماشای گەورە شوان و شەنگەبێری



که ترسابا له کوشتن تۆرەمەی کورد
له ئاسمانی ژیان ونبوو ستێری
فیدای کۆڕی خەباتت بم کچی کورد
که گیانباز و فیداکار و بوێری
ئەتۆ سەربەرز و ڕووسووووری و بە خوێنت
گولاڵەی سووری ئازادی دەدێری
فیدای لوولەی تفەنگت بم کوڕی کورد
که دوژمن بەو تفەنگەت نابوێری
بە خەڵکی ڕاگەیاند دەست و تفەنگت
دژی زۆرداریی و داخوازی خێری
بژی پێشمەرگە ڕۆڵەی باوەفای کورد
که ناترسی له ڕەنج و تاڵ و سوێری
له ئاشتی خوازیی و سوڵحا نموونەی
له حەملە و هەڵمەتا بێ باک و مێری

١٣٤٢ ـ ١٩٦٣
له پاشەرۆک دا بڵاو کراوەتەوە

## چوارینە

بۆپۆستەری عومەر خاوەر

قـــارەمـــانـــی قادیســـــــە نامـــــەردە
مـــرۆکـــوژە، دزە، ڕێگـــــــرە، جـــەردە
نەتبیســـتووە چی کـــرد لە کـــوردی ئـــەودیو
ئـــەو زۆردارە فاشیســـتەی مێشـــک ڕزیـــو

گۆڤاری سروە، ژمارە٢، بانەمەڕی١٣٦٧

***





## گریانی ڕنوو

**بۆ شەهیدانی کوردی تورکیا**

ئـەی دایکـــی شـــەهیدی کوردی

تـــــۆ وەکـــو چیـــای ئاگـــری

لەبـــەر تـــەوژم و بـــا و تـــۆفـــان

ســـەخـــت و ڕەق و پێـــداگـــری

لـــە ئاســـت ئـــەم داخ و دەردانـــە

بـــە هیممـــــەت و خـــۆڕاگـــری

ســـەرت ســـپی و بـــەفـــراوییـــە

دەروونـــــت کڵـــــــی ئاگـــــری

کـــێ دەکا مـــــەنعـــی گریانـــــت

بـــۆ ڕونـــووی کوێســـتان ناگـــری؟

**لە پاشەڕۆک دا بڵاو کراوەتەوە**

***



# کوردم و...

کوردم و داوای حقوقی پایەماڵی خۆم دەکەم
ماڵی خۆمە موڵکی کورد؛ داوایی ماڵی خۆم دەکەم
موڵکی کوردستان ئیرسی باب و باپیری منە
ئیدعای حەق و میراتی حەلاڵی خۆم دەکەم
هەروەکو باران لە چاوم دێتە خوارێ ئەشکی خوێن
هەر زەمانێک بەرژەوەندێکی لە حاڵی خۆم دەکەم
گەرچی لای ئاغا خەیاڵی خاوە میللیەت
من لەلام باشە هەتا ماوم خەیاڵی خۆم دەکەم
من لەدەس بێگانە قەت ناکەم شکایەت ئەی ڕەفیق
گەر شکایەت کەم لە چەنگی مام و خاڵی خۆم دەکەم
ناسیحا بەس پێم بڵێ فیکری مەحاڵە فیکری تۆ
نسحەتم ناوێ ئەمن فیکری مەحاڵی خۆم دەکەم
ڕۆژێ شێخم دیت و پێم گوت هەتبێ حیسی میللیەت
پێی گوتم من چیم لەوانە داوە سەواڵی خۆم دەکەم
من ئیتر ماهوت و شاڵی ئەجنەبی ناکەم لەبەر
ڕانکوچۆغەی خۆم لە بووزووی ڕەنگی شاڵی خۆم دەکەم
چیدیکە زەحمەت لە بۆ منداڵی خەڵکی ناکێشم




عیلــم و زانســـــت و هــــونەر فێری منــداڵـــــی خــۆم دەکـــەم
یـــا دەڕێــژم خوێنـــی پاکـــی خــۆم لەســـەر ئـــەم مەقســـەدە
یانـــە فیکرێکـــی بـــۆ بـــرای ڕووت و ڕەجاڵـــی خــۆم دەکـــەم
چاوەدێـــری ڕۆژی خۆشـــی جێژنـــی ســـەربـــەســـتیم ئـــەمـــن
گـــەر مـــودارا وا دەگـــەڵ ئـــەمـــڕۆژی تاڵـــی خــۆم دەکـــەم

**گۆڤاری نیشتمان، ژمارە٢، ساڵی یەکەم،خەزەڵوەری ١٣٢٢ـ ١٩٤٣**

***





## مەحکەمەی ئیستیقلال

«ئەم هەڵبەستەی ژێروو چەند دڵۆپە فرمێسکێکە کە لە شینی شەهیدانی ڕێگای سەربەخۆیی کورددا ڕژتوومە و پێم وایە هەموو کوردێک چ خوێن گەرم بێت چ خوێن سارد بە خوێندنەوەی شـێعرەکان بێ ئیختیار فرمێسـک دەڕێژێ و تووک و لەعنەت لەم مەحکەمە مەنحووسە ( کە تروسکەی هیوای کوردی کوژاندەوەو سەربەخۆیی کوردستانی وەدواخست، بێ سووچ و تاوان ئەمری هەڵواسـینی جەنابی شێخ عەبدولقادر و هاوڕێکانی دەرکرد و لە شینی ئەواندانەتەوەی کوردی بۆ هەمیشە دەسوئەژنۆ دانا) دەکا»

دوێ شـەوێ گریـام هەتـا ڕۆژ، پێـت بڵێـم بـۆچی برا<br>
مەحکەمەی مـەنحووسـی ئیسـتیقلال وەبیـرم هاتـەوە<br>
ڕیزەیـان بەسـتبوو لە پێش چـاوی منا گشـتی هـەموو<br>
ئـەم شـەهیدانـەی کـە خنـکاون بـە سـەد ئاواتەوە<br>
پاک بـە کفنێکی لە خوێنا شـەتڵ و لێوێکـی بـەبـار<br>
پـاک بـە ڕەنگێـک و قیافێکـی پەڕیـوو و ماتـەوە<br>
هاتـە گوێم لێکـرا دەیانگوت ئێمـە کوژراین بێ خەتا<br>
میللەتـی کورد تا بـە کـەنگـی تـۆڵـەمـان ناکاتەوە

من لـەســـەر لـوتکەی بڵیندی کێـو لە حـەق داوا دەکـەم
تـۆش بپاڕێـوە جەنابـی شـێخ لەسـەر ڕووی تاتـەوە
بـەڵکـو ڕوحمێکـی بـکا پێمـان خـوداوەنـدی ڕەحیم
چیدیکـە ژێـر دەس نـەبین دیسـان وەسـەرمانخـاتەوە
(هێمنا) پێـت وانـەبـێ یـەزدانی بێ هـاواڵ و فـەرد
کـەیفـەری ئـەم زوڵـم و زۆرە، بـێ حیسـاب ناداتەوە

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە٢، ١٣٣٢ ـ ١٩٤٣

***



## هەڵدەکەم

مـــن کـــە بێـــدەنگـــم ئەوێـــستا چاوەنـــۆڕی هـــەل دەکـــەم
هەل کـــە بۆم هەڵکـــەوت ئەنجا باســـکمی لـــێ هـــەڵدەکـــەم
زۆر بـــە ئومێـــدی خـــودا لـــەو خاکـــە پاکـــەی دەردەکـــەم
دوژمنـــە بێگانـــە ئاخـــر چـــۆن دەگـــەڵ وی هـــەڵـــدەکـــەم
نابـــی چیـــدی داری مـــن بخوات و لێـــی ســـوار بـــێ حەریف
داری دامـــەی خـــۆم لەبـــۆ لای خانـــی ئاغـــا هەڵدەکـــەم
نایـــەڵـــم تاریکـــــی چیدیکـــــە ولاتـــــم داگـــــرێ
خـــوا مەدەدکار بـــێ چـــرای زانســـتی تێـــدا هـــەڵـــدەکـــەم
وەک جگێـــن وایـــە زەمـــان هەرکەس جگـــی خـــۆی تێـــدەخا
تـــا چەقـــی هەمـــووان بهینێ مـــن جگی خـــۆم پـــەل دەکەم
نامـــەوێ مـــن ســـەربڵنـــدی خـــۆم و دایـــم کـــۆشـــش
بـــۆ بڵینـــدی و بـــەرزی و ئازادبـــوونـــی گـــەل دەکـــەم
قـــەت دەگـــەڵ بێگانـــەکان وەڵلاهـــی دانـــوم ناکـــوڵـــی
مـــن کـــە شـــاهێنم چلـــۆن ئاخـــەر ڕەفیقیَـــی قـــەل دەکـــەم
هـــەرکـــەســـێ دەربـــارەی ئـــەو قـــەومـــە بـــەد بـــدوێ بـــرا
وا دەدەم مســـتێک لـــە زاری مـــن ددانـــی کـــەل دەکـــەم
هەرکەســـێ بـــۆلای ســـنوور و ســـەرحـــەدی خاکـــی وەتـــەن

بــێ، دەدەم بــەردێک لە لاقی دەســـبەجـێ ئەو شـــەل دەکــەم
هێنـــدە فێڵاویـــم کە دوژمـــن وێم کــەوی تا هــەردوو گــوێ
قــوم دەبێ، چــونکە بە فێڵ ئــەو تــووشـــی لیتە و زەل دەکەم
خۆش بـــی بووزووی خۆم چ محتاجم بــە پــەشـمی خاریجــە
تاکـــو جـــاوی خـــۆم هەبـــی بـــۆ جامەیـــی مەلمـــەل دەکەم
ســـاردی و گـــەرمی ڕۆژگـــارم چێشـــتووە بـــەخـــودا گەلێک
بـــێ ئـــەوەی محتاجی کـــەس بم مشـــکلی خۆم حـــەل دەکەم
دوێ شـــەوێ دایکـــی وەتـــەن «هێمـــن» لەخەودا پێـــی گوتم
ڕۆڵـــە کردارت حیســـابە، کـــەنگـــی گـــوفتار حـــەل دەکــەم

گۆڤاری کوردستان، ژمارە٢، ساڵی یەکەم،
٣٠ سەرماوەرز ١٣٢٤، دیسامبر ١٩٤٥

***




## بەهاری زانین

ئەوا هـــات مانگی خــــۆشـــی خاکەلێوە
نـــەمـــا ســـەرما و بـــووران و کـــرێوە
پـــەڵـەک ڕەش کـەوتــە کوێستانی ولاتمان
بـــە با و بـــاران و لـــەنگێـــزە و شـــڵێوە
لـــەکێـــو و کەژ گیـــا و گـــژ بـــەبـــارە
ئیتـــر دەرچـــوو مەڕومـــاڵات لـــە لێـــوە
لـــە لێـــوی جوگەلـــە مێلاقـــە ئـــەورۆ
لە گوین ســـەربازی سوور وێســـتا بە پێوە
نـــەوەک کاکۆڵی یارم بـــەڵکە ســـونبوڵ
وەکـــو ژاپـــۆن و ئەڵمانـــی پـــەشـــێوە
نەهـــەر دێوانـــە بـــۆ ســـەیر و تەماشـــا
ئەوێســـتا عاقـــڵ و زانـــاش لـــە کێـــوە
تەماشـــای مامی جووتێر کە لە دەشـــتا
بـــەدڵگـــەرمی خـــەریکی وەرد و شـــێوە
بەهـــارە گوڵ ســـەری هێنـــا دەرێ تۆش
هەڵســـتە کـــوردە چیـــدی ســـەر مەنێوە
هەموو قەومێک وەســـەرکەوتووە لە هەوراز

بەشی تۆ کوردە تا کەی هەر نشێوە
بخوێنە فێری زانست و هونەر بە
لە لای کوڵلی کەسێ جاهیل دزێوە
وەرە فێری تەمەدون بە عەزیزم
هەتا خەڵکی نەبێژن کوردە دێوە
مەبە مەئیووس و ئومێدت قەوی کە
فریشتەی جوانی سەربەستیت بەڕێوە
ئەوەندەت فەرقە ئازاد نیت وەکو خەڵک
دەنا فەرقت نییە زمڕێک بەشێوە
ئەوەش مۆژدەت دەمێ هەر بەو زووانە
دەبێ ساز، هەڵپەڕە جا تۆش لە جێوە
هەتا پێیێک لە بێرلین بچنە پێشێ
سوپاس سوور، دێتە پێش ئازادی ئێوە
بژی مارشال ستالین پێشەوای ڕووس
کە ئازادی لە گێتی دابەشێوە

گۆڤاری هەڵاڵە، ژمارە ١
ڕەشەمەی ١٣٢٤ـ ١٩٤٥

***




## جێژنی ئازادی

نەوجەوانانی ژیر و وریای کورد
پیرەپیاوانی پیاو و ئازادی کورد
بێچوە شێرانی چاپک و بێباک
تازە لاوانی میللی و خوێنپاک
نەونەمامانی باغچەی ئاوات
کاربەدەستانی حیزبی دیموکرات
ئەی ئەوانەی چاو بە گریان بون
دڵ ودامـاو، کز و پەرێشان بوون
بۆ وەتەن ڕۆژ و شەو دەگریان زار
دیتو لەو ڕێیەدا هەزار ئازار
بەش براو بوون لە خۆشی و شادی
دەرکرابوون لە باغی ئازادی
مـوژدەبێ لێو کە پاش گەلێک زەحمەت
پاشی زۆر ڕەنج و تاڵی، و مەینەت
پاشی تالان و جەنگ و دەربەدەری
پاشی کوشتار و شین و قوڕبەسەری
پاش وەی سەد مەزن، هەزار سەردار

لـەسـەر ئـازادی رۆوینـە سـەردار
پاشی وەی سەد هەزار کـوڕی لاوچـاک
دەسـتی دوژمنـان: لـە خوێـن و خاک
گەوزی بـوو دایکی بۆی لە سـینگی دا
بەزەیـی هـات بەحاڵـی ئێمـە خـودا
یاریـدەی دایـن و کـردیـە مـەئمـوور
بۆ نـەجاتدانی کـوردی، هـۆردووی سـوور
میـللەتـی کـوردی بێـکەسـی ڕزگار
کرد، لـەژێر چـەنگـی دوژمنی زۆردار
کـوردەواری بـەجـاریَ ئـازاد بـوو
کوردی غەمگین بـەکـەیف و شـاد بوو
ئاشـکرا هـەڵکـراوە بەیرەقـی کـورد
هاتـەوە دەستی لاوی کـورد حـەقی کـورد
تێپـەڕی ڕۆژی ڕەش نەمـا دەمـی خەم
ڕۆژی کـورد هاتـەدەر لەژێر مـژ و تەم
بۆمـە ئـەو سـاڵەکە چلـۆن زسـتان
خۆشـترە زۆر، لـە مانگـی جـۆزەردان
گەرچی ئێستا نـەماوە گـوڵ لە چـەمەن
وەک گوڵـە ڕوومەتـی کوڕانـی وەتەن
ئیسـتەکانە تـەواوی میللەتـی کـورد
کـچ و کـوڕ پیـاو و ژن درشـت و ورد
بـێ خـەم و لێـو بەخەنـدە و شـادن
بـۆچـی چـونکـو ئـەوێستە ئازادن
ئـەی بـرایانـی میللـی و دڵسـۆز
ڕۆژتان بـاش و جێـژنـەتـان پیـرۆز



ئـەوی ئاواتـــی ئێـــوە بـــو دیتـــو
نیشـــتمان سەربـــەخـــۆ و ئـــازاد بـــوو
بـــەیـرەقـــی جـــوانی ئێمـــەیـــە ئێســـتا
دەیشـــەکێنی لـــەهـــەر بڵیندێـــک بـــا
کاری خـــۆمـــان بـــەدەســـتی خـــۆمانە
ئێســـتە بـــا کـــوێـــر بێ چـــاوی بێگانە
تـــا هـــەزار ســـاڵی دیکـــە ئیســـتالین
هـــەربـــژی یـــارەبـــی: بڵێـــن ئامین
چـــونکـــە دەربەســـت حـــەقـــی زەعیفانە
لاگـــری دیـــل و بـــێنـــەوایـــانـــە
بـــۆ ئـــەوەی بێکەســـان بـــکا مەســـروور
پایەداربـــێ و بمێنـــێ هـــۆردووی ســـوور
پێشـــەوامان بـــژی لـــەبـــۆ خـــزمـــەت
کردنی، دیـــن و مـــەزهـــەب و میللـــەت
ڕەبی هـــەرکەس کـــە دوژمنی کـــوردبی
هـــەردوو چـــاوی دەرێ و ملـــی وردبـــی
بمرە (هێمـــن) کـــە تـــۆ لـــەســـەر زیادی
مایـــەوە، چـــونکـــو دیتـــت ئازادی

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارەی ١٢
٢٠ی ڕێبەندان ١٣٢٤، ٩ فوریه ١٩٤٦

# دومەتەقەی دوو خوێنمژ!

سیراج ئۆغلوو:

یاخـــوا بـــەخێـــرێی ســـەرچـــاوەکـــانم

خـــوا دەوامـــــت دا ئـــارامـــی گیـــانـــم

نوری سەعید:

خـــۆ بـــێ ئـــەزیەتـــی، ئەلحەمـــلای چاکی

قـــەزا و بـــەڵا دوور بـــۆ وا خـــەمنـــاکـــی

سیراج ئۆغلوو:

چـــۆن خەمنـــاک نەبـــم زۆر پیـــس قەوماوە

دیســـــان کـــــوردەکان زۆریـــــان هێنـــــاوە

هـــەمـــوویـــان داوای حـــەقی خـــۆ دەکـــەن

گـــەف و هەڕەشـــە لـــە مـــن و تـــۆ دەکـــەن

دەڵێـــن ئـــەو خاکـــە خاکـــی کـــوردانـــە

نایـــەلێـــن چیـــدی بیخـــوا بێگـــانـــە

خـــۆ تـــــۆش دەزانـــی کـــە کـــــوردەواری

لە قیســـمان بچـــی تـــووش دێـــن هـــەژاری

گـــەنـــم و جـــۆی ئـــەوە رزق و بـــژیومـــان

بـــەنـــەوتـــی ئـــەوە ڕووناکـــە دیـــومـــان

ئـــەو گەنمـــە نەبـــێ لـــە برســـان دەمریـــن



ئەو نەوتە نەبێ شەوكوێری دەگرین
تەدبیرێک بکە هەتاکو زووە
تا هەل و فرسەت لەدەس نەچووە

نوری سەعید:

لەمنت نەکەوێ بۆ دابزڕکاوی
بۆچی وەکو کەر لە قوڕێ ماوی
ئەتو لەکنە خۆت تورکی خوێنمژی
بەدفەڕ، شەڕانی، ڕێگر، پیاوکوژی
تورکی لەوەی پێش وا خوێڕی نەبوون
وەک گورگی برسی بە خشەوە دەچوون
هەر ئێوە نەبوون لە دەورەی کەمال
لاقی کوردانو دەگرت وەک گەماڵ
ژن و منداڵ و گەورەتان کوشتن
خوێنی ملیۆن و نیوێکو ڕشتن
ئێستایش نەچووە بچی وەخۆکەونەوە
گەورە گەورانیان لەدار دەنەوە
بیانگرن بیانکوژن بیانخەنە نێوبەند
ئەفەندم بەسم ئەتۆ بدە پەند

سیراج ئۆغلوو

منیش بەشی خۆم جەزرەبەم داون
بەلام داخەکەم دانەمرکاون
کورد گیایەکە هەر چەندی بیدروون
هەڵدەداتەوە دیسان هەڵەسوون
تەدبیرێکی دی بکە ئەفەندی
یابا عەجایب بۆ وا دڵمەندی

نوری سەعید:

بـــرا مــام ئینگلیـس ئاغـای خـۆمانـە
هـــەتـا ئــەومـــان بی خـەمــی چیمـانە
پــەنــای بۆ دەبــەیــن دەیـانـکا چـارە
فـــریـــویـــان دەدا بـــە پـــوولـــول و پـــارە
بـــۆیان ســاز دەکـا سەد شـــێخ و مـــەلا
بـــەســەریان دێنــی ســــەد دەرد و بـــەڵا
عـــەشـــیرەتەکان دینیتـــە ژێـــر بـــار
بـــەدرۆ و دەرەســـە بـــە پـــوول و دینـــار

سیراج ئۆغلوو:

عەجـەب تەرتیبێـک دەســتت بـە...
وەڵاتـــت پیس کـــرد هـــەستە لـــە کنم
بـــاوی نـــەمـــاوە کـــەڵـــەک و دەهـــۆ
کـــورد فـــریو ناخـــوا ئـــەبـــەدی بـــەدرۆ
کوردی ئـــەو عـــەســـرە هێنـــدە شـــەیتانـــن
ئەمـــن و تـــوو و چـــەرچـــل بەکـــەر دەزانـــن
وا لا مـــەزهـــەبـــن کـــوردی ئـــەو دەورە
نـــەشـــێخیان مـــاوە نـــە مـــەلای گـــەورە
عـــەشـــیرەتـــەکان هـــەســـتان لـــە خـــەوێ
پشـــتیان لێـــک بـــەســـتووە ئازادیـــان دەوێ

نوری سەعید:

کـــەوابـــێ بـــرا ســـەڵا لـــە خـــۆمـــان
مانگـــامـــان مـــرد و بـــــڕاوە دۆمـــان

**گۆڤاری هاواری نیشتمان ژمارە ١**
**ساڵی یەکەم، خاکەلیوە ١٣٢٥، ٢٩ مارس ١٩٤٦**



## شینی ژنە کوردێك

### ١

هـەی داد هـەی بێـداد هـەی ڕۆ ڕۆڵـە ڕۆ
هـەی ڕۆڵـە داخـی گـرانـم بـۆ تـۆ
هـەی کـوێنـم دەبـەر ڕۆڵـەی جـەوانم
وەی قـورم وەسـەر مایـەی ژیانـم
دایکـەکـەت بمـرێ ڕۆڵـەی نـازدارم
دەک نـەژیـم پـاش تـۆ شـۆڕەسـوارم
نـەمێنـم لـە بـۆ دەسـت و جلـەوت
کـوانـێ؟ بـۆ نایـە ئـەورۆ هـەوهـەوت
هـەنـاوم ڕەش بـێ بـۆ قـژی ڕەشـت
جـەرگـم خـرابێ بۆ کـوڵمـەی گـەشـت
حـەیـف بـۆ چـاوی وەکـو بـادامـت
درێـغ بـۆ بـەژنـی وەک نـەونـەمامـت
ڕۆڵـە گیـان ئـەتـو هێشـتا جحێڵـی
چ وەختـی وەیـە مـن بـەجـێ بیڵـی
هـەی داد هـەی بێـداد هـەی ڕۆ ڕۆڵـە ڕۆ
بریـا مـردبـام مـن لـەبـاتـی تـۆ

٢

منـــی هــــەژاری پیـــری زگ ســــــووتــاو
چـــۆن پـــاش تـــۆ بژیـــم ئـــاخـــر شـــۆڕەلاو
کـــون کـــونە دڵـــم لـــەت لـــەتـــە جـــەرگـــم
بـــۆ تـــۆ تـــاقـــانـــەی جـــوانـــە مـــەرگـــم
شـــەرتـــە مـــن ســـەرم بـــۆ تـــۆ شـــین بکـــەم
هـــەتـــا بمێنـــم بـــۆ تـــۆ شـــــین بکـــــەم
گوڵـــە گەشـــەکەم بـــۆ ســـیس بـــووی وا زوو
بـــردت بـــۆ ژێـــر خـــاک هـــەزار ئـــارەزوو
بـــۆ بـــە جێـــت هێشـــــتم بـــەدبـــەختـــت کـــردم
ڕۆیشـــتی بـــۆ کـــوێ بـــۆ چیـــت نـــەبـــردم
منـــــت بـــــە جـــێ هێشـــــت لـــــەو کەلاوەدا
بـــۆ خـــۆت ڕۆیشـــــتی بـــۆ خـــزمـــەت خـــودا
هـــەی داد هـــەی بێـــداد هـــەی ڕۆ ڕۆڵـــە ڕۆ
دێ لـــە دەروونـــم لـــە ســـوێی تـــۆ بـــۆ ســـۆ

٣

دەزانـــــی بـــــۆ چـــــی ڕۆڵـــــەی نازەنیـــــن
دەبـــەســـتم لـــەســـەر گـــۆرت کـــۆری شـــین
بـــۆیـــە نـــاگریـــم ئـــەی لاوی خـــوێنپـــاک
بـــە جوانـــەمـــەرگـــی تـــۆیان خســـت لـــە خاک
بـــۆیـــە دەگریم ئـــەو چـــەرخـــی چـــەپگـــەرد
مـــاوەی پێنـــــەدای وەکـــو پیـــاوی مـــــەرد
لەســـەر نیشـــــتمان خـــۆت بـــە کوشـــت بـــدەی

هـاوخـوێنـەکانـی خـۆت ڕزگار بکـەی
بـەخێـوم کـردی ڕۆڵـە وەک بـەران
تـا بـۆ نیشـتمان بتکـەمە قـوربـان
کـەچـی تۆی کوشـت و نـەیهێشـت ئاسـمان
قـوربانییـێک بکـەم مـن بـۆ نیشـتمان
هـەی داد هـەی بێـداد هـەی ڕۆ ڕۆڵـە ڕۆ
مـن و نیشـتمان بـێ کـەسین ئـەوڕۆ

٤

لـە خـاک و خـوێنا ئـەگـەر گـەوزیبای
لـەسـەر ئازادی و سـەربـەستی: بە خـودای
غـەمـم نـەدەبووی بـۆت نـەدەگـریام
چـون مـردنـی وا زۆر خـۆشـە بـەڵام
ڕۆڵـە بـەمـەرگـی تـەبیعی مـردن
ئـەویش بـۆ کوردان عـەیبـە لـەکـن مـن
حـەیـف گیـانـەکـەم حیـزانـە مـردی
حـەیـف وەک پیـاوی ئـازا نـەمـردی
حـەیـف ئـەی گەنجـی خاوێن وەکـو گـوڵ
مـردی و ئـارەزووی مـن نـەبـوو حـاسـڵ
ئـۆف ڕۆڵـە مـردی نـەگـەییـم بـە مـراد
ئـۆف ڕۆڵـە مـردی و کـورد نەبـوون ئـازاد
هـەی داد هـەی بێـداد هـەی ڕۆ ڕۆڵـە ڕۆ
برینـی جـەرگـم قـەت نـاکـرێ پـەڕۆ

**گۆڤاری هەڵاڵە، ژمارە٣،**
**ساڵی یەکەم، بانەمەڕی ١٣٢٥ ـ ١٩٤٦**




# کوردەگیان

لــە غــورابی خـەوێـدای دوژمنـت بێـداره کـوردەگیان
هـەڵســـتە لـەم خـەوە ئیمرۆکە جـەنگەی کارە کـوردەگیان

**نیشتمان ،ژمارە٧،٨،٩، بەهاری ١٣٢٤ـ ١٩٤٥**



## نامەیەکی هێمن بۆ هەژار

خۆشەویستەکەم پیرە هەژار

بۆیە پێت دەڵێم چونکە ئێســتاکە شوکر هەر زەق و زیندووی (هەزاران منداڵە کوردت بەناوکراوە) ئەدی چیت لەو نەتەوە لێقەوماوە، داماوە دەوێ، هەرئەوەندەی لەدەســت دێ. دەنا ئەگەر پێی کرابا کۆتەڵیشــی بۆ دەڕازاندیەوە، بۆهــەر گلەیی لە کورد دەکەی؟ ئەو شاعیرە عەرەب و فارسانەش کە ئێستا هێندەیان پێ هەڵدەڵێن مەگەر لە خزمەت خەلیفە یا بارەگای شــا بووبن دەنا بە زیندی سەری فسیان پاک کردووە، ڕاستە سواڵ کیمیایە، بەڵام بۆ شاعیر نا. لەبەر چاوی خۆمان ‥ زۆری بە خوێڕی و پیریان هەڵکوت و لە برسان مرد. کێ من و تۆی ناچار کرد ببینە شــاعیر؟ خۆمان ئەوەمان بە خۆمان کردووە. باوکی من کەمی بۆ من بە جێ هێشت؟ بۆ خۆم لەقوماری شیعردا دۆڕاندم.

باوکی تۆ پێی خوێندی ویســتی بتکاتە مەلا (بەرخــی بابم بۆ نەبوی؟) دەزانی ئەو فەقێ قادرەی تۆ ونت دەکرد ئەلان چەند دەوڵەمەندە؟ ئاواڵەکانی خۆمان کە بەقەد حەمە ئاشەوانیش لە عیلم و شەرع ناگەن، بە ڕیش و پەشم و کەوا و سیواکەوە، ئی وایان هەیە میلیاردێرە.

من لە میژە دەوەی گەییوم قەڵەم نانی پێ پەیدا نابێ. ئەو ساڵ لەو مڵکەی باوکم بۆی بە جێ هێشتووم، تەواو بێ کەم و زیاد بە قەد شوانێکم پێ گەییوە، بۆ خۆم شاهید بووم ئەمســاڵ مەلایەک کە پێم وایە لەتەواوی عومریدا دوو پەڕی کاغەز نەتوانیوە بە چ زمانی

دنیایە ڕەش بکاتەوە، ســـوێندی خوارد گوتی بەسەد هەزار تمەن نابمە پێشنوێژ. جگە لە ســـەر فترە قەراری کرد میوە و تەڕەکاری و ماســـت و پەنیری لەسەر دێ بێ. بۆ خۆشت دەزانی ســـەر قەڵەمانە (ئاشی پێ دەگەڕێ) دبڕۆ بابی بابم هەر (قانون) وەرگێڕە. لەبیرمە جارێکی (وردی) ڕەحمەتی ڕەخنەیِ لە (کۆڕ) دەگرت کە بۆ وەرگێڕانی (شەرەفنامە) زۆریان پـــارە داوە بـــە تۆ، خەڵکی زۆر لـــێ بوو، گوتم کوڕینە و کچینە ئێوە شـــاهیدبن من دوو ئەوەندەی کۆڕ داویە بە هەزار دەدەم بە مامۆستا بەو شەرتە بتوانێ شەرەفنامەی کوردی و فارســـی لە (ســـەقافەی کوردی) بۆ ئێمە بخوێنێتەوە. ئێســـتایس حازرم حاسڵی ساڵی داهاتووم بدەم بەو مەلایە کە قانوونی عەرەبی و فارسی بتوانێ بێ غەڵەت بخوێنێتەو. تازە تۆ قوڕی بۆ مامۆســـتا (عەلا)ی ڕەحمەتـــی دەپێوی کە خوا هەڵناگرێ لە هەموو کوردێکی باشتر حەقی قەڵەمی چەپرەکی وەرگرت.

بـــا دەس لەوانە هەڵگرین، گۆواری ئەمجارەمان فیدای کتێبی دەرســـی بوو. چاپخانە وەگیر نەدەکەوتن. کەچی ڕمێنی یەکجار لەســـەرە. ڕۆژێ هەر پێمان دەکرێ کاغەزی کوڕ و کچە لاوەکان بخوێنینەوە. شـــتی باشیشمان بۆ دێن. گەیوەتە زۆر جێگایان و سەرەنجی زۆرانی ڕاکیشاوە. ئەم ئەژمارەشمان ئەوە نێزیک بە تەواو بوونە، تۆ نەفەری حەوتەمی تا پێـــرێ کە جەدوەلی حەلکراوی بـــۆ ناردووینەوە، پیم وایە خوا یاربێ بۆ بەهارێ دەیکەینە مانگانە، چونکە جگە لەو هەمو نووســـینانەی بۆمان دێ شـــتی درێژیش زۆر دەنوسن کە لـــە ژمارەکەیدا ناحاوێتەوە و بۆ دوو ژمارەش نابێ. بەداخەوە کادرمان زۆر کەمە و هەموو شتێک دەبێ بۆ خۆمان جێبەجێ بکەین کە سەد دەردی تایبەتیشمان هەیە.

کتێبێکی پچووکی فارسی و یەکی باشی کوردیشمان هەیە کە خەریکین چاکیان بکەین و بۆ چاپیان بنێرین.

بەڕاســـتی (فەیزی زادە) شتێکی باشی کردووە و ئیزنیشـــی داوە دەستی تێوەردەین، ئێمەیش بەدڵوداو خەریکین بەڵام کارمان هێندە زۆرە دەرۆست نایەن.

دوێنێ « از قضای رحمت» شێخ عەبدولقادری شەمزینی بەسەری کردبووینەوە. پێمان گوت ئێمە دراومان نییە، بەڵام ئەگەر تۆ دراومان بۆ لە مریدان بســـتێنی مەسنەوی (شێخ عوبەیدیللا) چاپ دەکەین. قەولی دا ئەوی پێی بکرێ بیکا. کاک (ساڵح مەحموود) فەرمووی من نوسخەیەکم لە لا هەیە ئەگەر لە لای ئێوەیە تەماسی دەگەڵ بگرە منیش لێرە سۆراخی دەکەوم. دەنا قازی نایدا.

هێمن

لە چەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز ـدا بڵاوکراوەتەوە





## نامەیەکی هەژار بۆ هێمن

مام هێمن گیان سڵاو، دەم و لەوست دەلێسمەوە

تا ئێستا دووجار بەهەزار دەردی سەری تەلەفوونەکەتم گرتووە، هەردووک جار تەشریفی شەریفت لەوێ نەبووە. دەگەڵ کاک ئەحمەد شەوێکی تا زۆر درەنگ خەریکی دیوانی نالی بووین، خودا ئەویشی وەک ئێمە تێدا گێژ کردووە. بەڵام قسەی خۆمان بێ غەڵەت پەڵەتی تێدا هەن و جاری وایە لامان سەیر بوو ئەتۆ چۆن لەبیرت چووە چاکی کەی... بەهەرحاڵ بەتەمام گەشتێکی پێدا بکەم و نەقدێکی لەسەر بنووسم چونکە نالی تا لێی وەکوڵی لێی پەیدا دەبێ.

کاکە گیان، زۆرتان قەرزارم تکایە وردە حیســـابێک بکەن تا بۆتان بنێرم و قەرزداری نەمێنمەوە.

وەک ئێرانی دەڵێن: « بالاجازە» شیعرەکانتم تەخمیس کردووی بەڵام گاڵتەوگەپێکیان لێ پەیدا بووە ڕەنگە خوێندەواران زۆریان کەیف پێ بێ، جا بەقەوڵی کاک ئەحمەد، ئەگەر گیانی سپۆرتت هەبێ و لیمان قەڵس نەبی و چاپی بکەی خراپ نییە، ئیتر کەیفی خۆتە. ئەرێ تۆ دەنگ: نووسراوە (کرد در تاریخ همسایگان) دەترسم هەر ئەوەکەی (ناکام) بێ و بکرێتە فارسی، ئەگەر (کاک فاڕووق) بەشێکی دیکە لە تورکیەکەی (ئەولیاچەلەبی) کردبا بە کوردی یان فارســـی زۆرباش بوو. دەنا ئەوەم پی شـــت نییە، سەیاحەتنامەی چەلەبی پێنج جلدە زۆری باسی کورد تێدایە.




تو خوا خۆتان هەڵکوشن تا زستان ماوە ژمارە چوار دەرکەوێ چونکە بەهار بۆ باسی زستان نابێ. لەسەر دیوانی وەفایی کە (شیرین تەشیەکەی) لێ دەرهاێژراوە و تەڵاقی لەسەر خوراوە کە هی وەفایی نییە، زۆر دڵتەنگ بووم، هەموو دونیا بیستوویە کە هی وەفاییە وئەمەش شاکاریەتی. دەئەگەر ئی ئەو نییە ئی کێیە؟ دەبوو پینەیەکی بۆ بدۆزنەوە کە دایپۆشێ... دەبوایە تەنیا لە جیی وشەی (ڕانی لووسی) کە (موحارەبە دەگەڵ خودا) یە نوختە دانێن و چاپی بکەن.

ئەوا ئەمڕۆکە ٦٤/١/٢٥ ە، کاک ئەحمەدی قازی لە ماڵی ئیمەیە زۆر سەلام و عەرزی ئیخلاسی هەیە، سەلامی من و دایکی خانی بۆ دایەخانم، چاوی سەلاح ماچ دەکەم. ئەگەر خات نەسرینی جەعفەریت دیت بەسەرتە پێی بڵێ مەرد و نامەردەکەی هەر ئەو داستانی خێر و شەڕیە کە نیزامی لە (حەوت پەیکەر) دا باسی دەکا، بەڵام فەرقەکەی هەر ئەوەیە کە قارەمانی داستانی نیزامی کوردێکی مەڕدار بووە و زۆریش خۆشترە لەم مەرد و نامەردە. بریا هەر ئەوی تەرجەمە بکردایە. زۆرم ڕست بمبەخشە.

برات هەژار ٦٤/١/٢٥

لەچەپکێ گوڵ چەپکێ نێرگز ـدا بڵاوکراوەتەوە

**تەخمیسی بارگەی یاران**

**هەژار شێعری هێمنی تەخمیس کردووە**



بارگەی یاران



١

بەربەرۆچکەش هەیە سەرمامە! شەوان من چبکەم؟
ئەم منداڵە کە بێ کراس و کەوان من چبکەم؟
دڵی بردووم کچەتیوی کەرەوان من چبکەم؟
دێت و ڕادەبرێ وەکو سەروی ڕەوان من چبکەم؟
کە بەقوربانی نەکەم ڕووحی ڕەوان من چبکەم؟

٢

من نە شەرقیم و نەغەربیم و نە ئەمریکی، نەڕووس
نە موسوڵمانی بەڕاستیم و نە جووم و نە مەجووس
پیر و زورهانم و خورپەی دێ دڵم بۆکچی لووس
قەدی ئەو شۆخە وەکو دووخ و خەدەنگە ئەفسووس
پشتەکەم کۆمە وەکو ماڵی کەوان من چبکەم؟

٣

سەرە لەرزۆک و قوڵ و جۆکە سل و زگ پەنەماو

لاملـم خـواره، پشـووم سـواره، پـرووش و كـزەچـاو
چـوار پەلـم مـل بـوو، لەشیشـم بووەتـە لانكـە شـكاو
تـازە هەنـگاوی شـلم كوانـێ دەبـێ بـۆ شـەوڕاو؟!
جوانـە زۆر جوانـە بەڵـێ ڕەوتـی كـەوان مـن چبكـەم؟

۴

بـەزگـی بـرسـی خـەوم نایـە هـەرچـەنـد وەربكـەوم
ئـارەزووم هـەر ئـەوەیـە نانـی گـەرم بێتـە خـەوم
وەكی ڕەشـكێكی ڕزیو پس پسـە گـش قـەڵـف و گـەوم
زەبـری ئاوزەنگـی بـڕا و شـل بـووە دەسـتی جڵـەوم
دێ دەنـا پـرمـەیـی بـۆر و بـدەوان مـن چبكـەم؟

۵

دم دمـی چـی؟ ئـەوە دوێنـێ بـوو ئەمـن زۆر كەونـم
دایكـە وای ڕەحمـەتـی ئەو سـایـە كـوتابـووی تـەونم
وشـك و ڕەق بـوومـەوە تـازە دەگـەڕێـم بـۆ شـەونم
ژوانـی خـۆشـی هـەڕەتـی لاوەتـی دێتـە خـەونـم
كاتـی ئـاویلكـە دەگـەڵ زینـدەخـەوان مـن چبكەم؟

۶

خەڵكـی پێـی وایـە لەخـۆشـیانە هـەرا و گاڵـەم دێ
نـا بـراكـەم لـە دەسـی زاڵمـەكان زاڵـەم دێ
ورتـەیـی كـۆنـە بـرینانـی دەم ئـاواڵـەم دێ
شـەو هـەتـا ڕۆژی لـەبـەر ئێشـی لـەشـم ناڵـەم دێ
دێتـە گوێـم دەنگـی گەلـۆ و نیوەشـەوان مـن چبكـەم؟

٧

لــە چیایـــان و لـــە دەشـــتیان و لـــە لادێ و شـــاران
هیـــچ شـــتێک ئێســـتە نـــەمـــاوە وەکـــو جـــاری جـــاران
دەوەرە ســـەیـــرێ بـــەڕۆژی مـــــژ و گـــــۆپـــاڵ بـــاران
بارگـــەیـــان تێکـــەوە پێچـــا و بـــــەرێ بـــــوون یـــاران
لـــە دنـــــێ وا بـــەتـــەنـــێ پاشـــی ئـــەوان مـــن چبکـــەم؟

٨

دەچمـــە لای هەرکەســـێ بـــۆ کارێ دەڵێـــی کوێـــر و کـــەڕە
یـــەک دەڵێ لاچـــۆ لـــەبـــەر چاو ئـــەوی تـــر ئێـــژی هـــەڕە
ئـــەوی بـــۆم ماوتـــەوە چـــاوی تـــەڕ و پێســـــی گـــــەڕە
ژیانـــی مـــن ئێســـتە وەکـــو خـــۆری دەمـــی زەردەپـــەڕە
پێـــم نەمـــا تیـــن و گـــوڕ و هێـــز و تـــەوان مـــن چبکـــەم؟

٩

خۆم وەکـــو زەڕنـــەقـــووتـــە و زارۆڵـــەکانیـــش ڕووتـــن
حەوتـــی وام هـــەن کە دەمی خواردنـــێ وەک حـــەو حـــووتون
دوێنـــێ ئێـــوارێ لـــە ســـەربانێ هـــەڵـــم خســـت تـــووتن
ســـروە هـــات خـــونچـــە گـــوڵی باخـــی ئـــەدەب پشـــکووتن
باخـــەوانـــی گـــەرەکـــە تـــازە جـــــەوان مـــن چبکـــەم؟

١٠

خاڵـــە بـــاس یـــادی بـــەخێـــر ئـــەودەمـــی دایکـــی مردبـــوو
هـــەروەهـــا وشـــک و برینـــگ نایـــە قـــەبـــر نەیشـــــردبوو
دێیـــەکـــەی ئێمـــە هەمـــووی دێـــم و تـــەڵان و گـــرد بـــوو





ئـــاو نـــەبـــوو ئـــەودەمـــی هێمـــن مـــەلـــەوانـــی کـــورد بوو
ئـــاو شـــوکـــور زۆرە وەرن زوو مـــەلـــەوان مـــن چبکـــەم؟

# ئا

ئادی: بەڵێ، ئەرێ

ئاران: گەرمیان، بەرانبەری زۆزانە

ئاژواندن: لێ خوڕین

ئاسۆگ: ئاسۆ، سوێ

ئاکار: ئەخلاق، رەوشت

ئاڵوودە: پیس، ئاڵوودەداوێن، داوێن پیس

ئاڵوودە: تێکەڵاو

ئامێز: باوەش، باخەڵ

ئاودەنگ: هاودەنگ، هاونشین

ئاور:ئاگر

ئاورگ: ئاگردان، وەجاخ، کوانوو

ئاورینگ: پریشکی ئاگر(بەتایبەتی پڕیشکێک کە لە ئاستی سووربووە بێتەوە

ئاونگ: شەونم

ئاوەڵا: ئاواڵە، کراوە

ئاویتن: هاویشتن

ئاویلکە: ئاوزەنگی، ئاوزنگ، هەنیسک، دوا پشووی ژیان

ئاویلکەدان: دواپشوودان، حاڵی سەرەمەرگ

ئۆخژن: هەست بە خۆشی کردن

ئۆگر: هۆگر

ئۆیە: پووڵەکە

ئەسپۆن: گیایە کە ریشەکەی وەک سابوون کەف دەکا. جاران لادێی هەژارەکان جلیان پێ ئەشوت




ئەستوندەگ: كۆڵەكەی رەشماڵ

ئەستەم: زۆر سەخت

ئەستێر: گوڵی دەستكرد، ئەستێرگ، ئەسێلك

ئەشك: فرمێسك

ئەنگاوتە: پێكراو

ئەنگڕان: زۆر قەڵەو بوون، زۆر دەوڵەمەند بوون

ئەوك: قورگ، گەروو

ئەوین: ئەڤین، عیشق، دڵداری

ئێخە: یەخە

ئیروو: تێر و پڕی، ئاسوودەیی، خۆش گوزەرانی

## ب

بابردەڵە: لاواز، لەئەسڵدا واتە بابردوو

بابۆ: بۆن هەڵگرتنی مۆڵە

باڕ: بێچووی یەکساڵەی باڵندە

باز: ڕێگا، ڕێباز

باڵۆرە: ئاوازێکی تایبەتی گۆرانی کوردیە بە شێوەی گفتگۆ لە نێوان کیژ و کوڕدا

بانوو: بستوو، زینوو، زیندوو

بانەمەڕ: کاتی ڕۆیشتنی خێڵ بۆ هەوار

باوێ: بهاوێ

بڕەک: بەرازی نێر

بڕست: توانا

بژانگ: برژانگ، مژۆڵ

بژوێن: شوێنی گیا و گوڵی زۆر بێ، لەوەڕگەی زەمەند

بژیو: مایەی ژیان، ئەوەی مرۆڤی پێ بژی

بستۆکە: کەلێکی بچووک، کێو یا بستوێکی بچووک

بستوو: بانو، زینوو، زیندوو

بستە: ئاسنێکە بەسەر ئاگراندا رادەهێڵدرێ

بسک: زولف

بڵا: با، دەبا

بن پشک: خوشکی بچووک کە بۆ ژن بە ژن دیاری کرابێ

بنکۆڵ: کۆڵینی بن برکەی بێستان

بنە: ئەو جێگایەی کە کەوی ڕاوی تێدا دەشارنەوە

بوکشن: بگوشن، بووشێرن

بوولێڵ: تاریک و ڕوونی ئێوارە، بەرانبەری کازیوە

بۆدراو: چێشتێکە لە نیوە بریشکەی هاڕاو دروستی دەکەن

بۆرچین: مراوی مێ

بۆسە: کەمین، خۆ لە دوژمن داگرتن

بۆکڕووز: بۆنی سووتانی کوڵکە، خوری، موو

بەردەبێر: بەردێکە لە جیاتی کورسی لە کاتی مەڕدۆشیندا شوان لەسەری دادەنیشێ

بەرکۆژە: دوگمەی بەرۆک

بەرەڵبێن: بەربێنکە، بەرهەڵبێن، بەرڵبێنە، ئەو قوماشـــەی ژنان لە کاتی کارکردندا لە پشتێنەوە بەرەو خوار بەخۆیانەوەی دەگرن

بەرموو: ملوانکە، گەردەن بەند

بەڕۆچکە: بەرهەتاو، شوێنی هەتاوگر

بەڕەزا: گیایەک لە کوێستانان دەبێ

بەزە: بەزەیی

بەستە: داخراو، بەسراو

بەستێن: بەست، بەستوورە، کەناری دەریا و ڕووبار

بەسپایی: بەئەسپایی، بەهێواشی

بەرگن: لووا خوریی بەرخ

بەروو: بەرۆک، سینگ و باخەڵ

بەکرە شۆفارە: مەبەست لەبەکری مەرگەوەڕە

بەلەک: نێوانی ئەژنۆ و پێ

بەندەک: ئەو پەتەی مرۆڤی پێ دەبەستن

بەندەگی: بەندەیی

بەندەن: کێو و تەلان

بەیان ئەنگوتن: دەرکەوتنی سەرەتای بەیان

بەیبوون: گوڵێکی سپیی بۆن خۆشە

بەیدەست: ڕەوەک، ئەو ئاژەڵەی بە ئاسانی نەگیرێ، بۆ مرۆڤیش بەکاردێ

بێر: ڕیزکردنی مەڕ بۆ دۆشین




بێروون: بیابان

بێری: مەڕدۆش

بێزراو: لەبەرچاو کەوتوو، ناخۆشەویست

بێلا: بەرهەیوان

بێوەی: بێ ئەوەی

بێن: بۆن

بیزا: گیایەکە کوێستانی، بڵندە و بۆنێو ژاژ و ترشیات بەکاردێ

# پ

پاراو: تێرئاو

پاردە: دیواری وشکەبەرد ( وشکەکەڵەک) کە لەدەوری کانی و شتی وای دەکێشن

پارێز: بەئەسپایی و بەدزی خۆ بۆ شتێک مەڵاس دان

پاشـــبارە: ئامرازی جووتە، دارێکە لە دەند و باســـکێش دەدرێ و دەستەکەوشەی تێ دەکوترێ بۆ ئەوی جووتیار دەستی پی بگرێ

پاناوک: تەختان و گۆڕایی لاقەدی چیا، پانکەشی پی دەگوترێ

پاشەرۆک: پاشماوە، پاشخوانە

پالوودە: خواردەمەنییەکە لە نیشاستە دروست دەکرێ

پالێن: پاش نیوەڕۆ، دوای نیوەڕۆ

پاوان: قەدەغە

پرزە: پێخوست

پرزەبڕان: بێ بەش، بوون، پەککەوتن

پروین: هەڵپروین، وەرین، هەڵوەرین

پۆتڕاک: سەروپۆتڕاک، سەروپێچ، سەروگوێلاک

پۆلوو: پشکۆ

پەپوو: پەپوەسلێمانە

پرینگانەوە: سڵەمینەوە، ڕەوینەوە، مەپرینگێوە: مەڕەوێوە

پزوو: ڕەنوو بەفری بچووک

پلالر: دارێک کە بهاوێژرێ

پەراکەندە: پرژوبڵاو

پەرستار: هەمشیرە، ئافرەتی سەرپەرشتیکەری نەخۆش

پەڕپەڕۆچکە: پەڕەکەی ئاسمان، بەرزترین جێ لە ئاسماندا

پەڕەڕ: لای سەروو

پەڕکوو: جوورە هەڵۆیەکی بچووکی دڕ و بەهێزە کە ڕەشە و سەربالّی سپییە

پەروا: باک، ترسان، سام

پەڕیوە: ئاوارە، دەربەدەر، ئاوەکی، ئاوگەلە

پەژارە: خەم، کەسەر، خەفەت

پەستوان: پەستانەوە، توند داگرتن

پەسیو: حاشارگە، نەدیو، پەنا، جێگایەک کە خۆی تێدا بشاررێتەوە

پنــج و مۆر: ئافرەت کە نەهێڵن لە ژوور بێتەدەر، ئەڵین پنج و مۆر کراوە، لەبنەڕەتدا پنج بەوە ئەڵێن کە گۆزە ئەشـکێ یا ئەقڵەشـێ، بە قسـڵ و موو پینەی دەکەن وەک بیدروونەوە

پێ بەقوونە: باڵدارێکە لە ئاودا دەژی و ناتوانێ بفڕێ

پێترووو: ئەستێرەی کۆ

پیل: لایەکی لەش لە شانەوە تا پەنجەی دەست

***

# ت

تات: بەردی پانو ساف و لووس

تاوگە: تاڤگە، ئاوهەڵدێر، سەروەشێن، سۆلاڤ،

تاوڵ: ڕەشماڵ، چادر، کۆن

تاوەسووت: هەرچی لەبەر هەتاو سووتابێ

تامان: تەیمان، پەرژین

تخێڵ: کەوتن لەبەر ناڕەحەتی و بێ هێزی یان لەبەر مەستی

ترەختان: ڕاکردنی لە غار توندتری ئەسپ و ماین

ترۆپک: ترۆپ، پۆپە، دوندی کێو، لووتکە

تفڵ: تڵف، مناڵ

تل ئاسا: تلاسا، تلاسابوون: خلیسکان، توو، توو: هەرگیز، قەت، بەهیچ جۆرێک

تۆ: تۆو، توو

تۆرەمە: نەسل، بەرە، تۆر، تۆرە

تووش: دژوار، سەخت، ناخۆش، بەدفەڕ

تووڵ: نەمام، خەڵف

توڵە: سەگی بچکۆلە (جۆرێکی تایبەتییە بۆ ڕاو بەکاری دێنن)

تەبایی: نێوان خۆشی، ڕێککەوتن

تەریدە: خراپە، تەریدە، ڕێگر

تەزوو: مچوڕک

تەشق: بەرزایی، پانایی، نێوەڕاست

تەشی ڕێس: ماستاوکەر و ڕیاباز و شان تەکێن

تەلان: هەرچی دەشتایی نەبێ

تەماڵ: دیاردە، دیاردی، دیتنەوەی کەروێشک لە لاندا

تەنێ: تەنیا

تیتۆڵ: پرزۆڵ

تیرەگ: یاڵ، تیلاک، تیلەگ

تیف تیفە: زۆر لووسکردن و جوانکردنی دەم و چاو

تێک دەڵقا: بەیەکدا دەچوو و یەکی دەگرتەوە

***

## ج

جاکەش: قورپومساخ

جدەو: سەقەتبوونی شان و قۆڵ، دەڵێن ئەو وڵاخە بارەکەی ئەوەندە قورس بوو جدەو بوو

جگەگورگ: میچەگورگ کە بۆ شیرینی و بەختەوەری هەڵی دەگرن

جمین: ڕووخان، ڕمان، هەرەسهێنان، جمیو: ڕووخاو، هەرەسبردوو

جواناو: ئارەقەی سەرەمەرگ

جۆم: قووڵایی بەرین و گەورەی قەدی چیا

جۆماڵ: پاککردنەوەی جۆگە

جەفەنگ: گەپ و گەمە و قسەی خۆش

جەمام: ئەستووربوون و ئێشانی مەچەک لەبەر کاری زۆر

جەندەک: کەلاک، تەرم، لەش

جێژوان: ژوانگە، شوێنی پیکگەیشتن

***

# چ

چارشێو: سەرپۆش، ڕووپۆش، ڕووبەند

چاك: پیر، شەخس، پیاوچاك، مەزار

چڕ: دارستانی پڕ، لێڕەوار

چڕگ: چرگ، باڵندەیەكی گەورەی كێوییە

چرووك: پووچ، بێ نرخ

چزیلك: چزڵیك، ئەو پارچە دووگەی لەسەر ئاگر هەڵچزابێ و چەورایی پێوە نەمابێ

چلوان: چلەكانی زستان

چڵووك: پۆپەی دار

چورە پۆپنكەی: جۆرە چۆلەكەیەكە بەیانان زوو دەست بە خوێندن دەكا

چەلەنگ: شۆخ و شەنگ، جوان، دەلال

چۆڵەپێچە: توند بەستن

چێنكە: ئەو شینایی تەرەزنەی كە هەمیشە شینە بە چیاوە

***

# ح

حەرمخانە: ژوورە تایبەتییەکانی ژن و خێزانی پیاوی گەورە

حەوسـین: لەنێو بەشـێکی زۆری خەڵکی ئێراندا باوە شـەوی جێژنی نەورۆز حەوت خۆراک کە بە پیتی سین دەس پێ بکرێن دادەنێن

***

# خ

خاپوور: وێران، کاول، کەلاوە

خانە بگیری: لە ماڵدا گرتنی کەسێک

خانومان: جوان، لەبار، شۆخ و شەنگ، چەلەنگ

خاو: گیایەکی زۆر گەرمی کوێستانییە

خڕ: شیو، دۆڵ، دەرە

خرمژن: دەنگی خشڵ

خرینگە: دەنگی خشڵ

خرینگەی بازنە: زڕەی بازنە

خلێنە: ددانی گەورەی لا سەروو

خم: خوم، هەش، هەژ

خواجە: لێرەدا بەواتەی ئەو کۆیلانە بە کارهاتووە کە دەرەبەگ و کۆیلەدار دەیانخەساندن و لە ماڵەوە لە نێوان ژن و کچەکانیاندا کاریان پێ دەکردن

خودان: خاوەن

خوول: غوول، گیاندارێکی ئەفسانەیی بەسامە

خووناوە: خوناوکە، وردەباران، نەرمەباران، بەواتەی ئارەقیش بەکاردەهێنرێ

خوونکار: حوکمران

خوڕێن: ئەو جێگایەی ئاوی بەخوڕ بڕوا

خومپارە: تۆپێکەی کە کەوانی دەڕوا

خۆرشت: شلە

خۆشخوان: دەنگخۆش

خوێنگر: خوێن داواکەر، خوێن ئەستێن، تۆڵەئەستێن

خۆشبەز: خۆشدەو، توندڕەو

خۆشخوێن: دەنگخۆش

خۆیان: کا و دەغلی وردکراو و لێک جیانەکراوە

خووساو: زوقم، سیخوار

خەرتەل: داڵ

خەسیبێ: خەسێنرابێ

خەڵف: نەمامی یەک ساڵە

خەنی: شاد، بەختیار، کامەران، ڕازی، دڵخۆش

خەوش: لەکە، غەور، خەش

خیز: زیخ

خێو: خودان، خاوەن

خێڵات: ڕەوەند، کۆچەر، ئەوکەسانەی دەچنە هەوار

***

د

دابا: بدایە

دابێژ: کون کون کردن

داپەڕاندن: سەربەرەوخوار ڕادان

داسوو: قەڵچغ، گوڵەگەنمی تازە لە بۆقە هاتووەدەر

دانگەڕێزە: داگەڕانەخوار

داروغە: حەســحەس، پۆلیس، ســەرۆکی ئەو کەسانەی ئێشکی شار دەکێشن، وەختی خۆی بەوانە وتراوە بە بازاڕدا گەڕاون بۆ ئاگاداربوون لە خەڵک نەوەکا ناڕەواییەک بکەن

دزێو: ناشرین، کرێت، دژی جوان

داهێنراو: داهێزراو

داوەستان: مەیین، نەبزووتنی دووکەڵ و مژ و شتی وا

داوەڵ: بووکە سەماکەر

داوێ: دەهاوێ

دڕدۆنگ: بەشک، دوودڵ

دژوێن: ئەسپێون، چڵکنی و ئەسپێونی

دڵبەستە: ئەوەی دڵی بە شتێکدا چووبێ

دڵۆ: ئەو توێژەی دەستی ڕەنجدەر هەڵی دەدا بە هۆی کارکردنی زۆر

دورج: سندووقی بچکۆلەی شتی گرانبا

دوند: بەرزترین شوێن، لوتکە

دووروابێ: دوورابێ

دۆ: ئەو کیژەی لە شاییدا لەدەستی کوڕدا بێت




دۆک: ئافەتێکە لە شێوەی شێردا بەسەر گەڵای تووتنەوە پەیدا ئەبێ

دەروو: ڕێبازی تەنگ

دەڕۆست هاتن: پێ وێران

دەســبێن: ڕستەیەکە شوان لە ئەســتۆی مەڕی دەکا تا ئەگەر نووست و مەڕ وەرگەڕا پیێ بزانێ

دەستەمۆ: کەوی، ڕام

دەسکەنە: ڕنینەوە، دروێنەی بەدەست

دەسگر: دەسکرد

دەگروێن: لە پێست دەردێن

دەگووێن: بڵ دەبن

دەغەڵکار: ساختەچی

دەمان: تووڕە، یاخی، سەرکێش

دیبا: قوماشێکی گرانبایە

دین: دیتن

دێد: خوشکی گەورە

دێرنشینی: دانیشتن لە دێری عیساییياندا، مەبەست لە تەنیایی و دوورەپەرێزییە

***

ڕ

ڕابوون: هەستان

ڕاز: شاخ

ڕاوێچکە: هاتوچوی بەپەلە و بەردەوام

ڕام: دەسەمۆ، کەوی

ڕامووسێ: ماچ بکا

ڕژد: سەختترین هەوراز، ڕکە، هەورازی کووڕ

ڕنوو: کەوی بەفر

ڕکێفکوت: ڕاکردنی زۆر توندی وڵاخ لەگەڵ ئاوزەنگیدان لە لاقەبرغەی

ڕەپسە: ئاوەنیا، بەراو

ڕەشداڵ: قاڵاو، قەلەڕەشە

ڕەمانە: ڕەفیسکە، دیوی پشتەوەی ئەژنۆ. داسی ڕەمانە داسێکی باوێژرێتە ڕەفیسکە

ڕەو: هەڵاتن، هێرش، پەلامار

ڕەوە: گەلە

ڕەوەز: کەڵەکەبەردی قەدباڵی شاخ

ڕەوەک: سرک، سڵ، ڕمۆک

ڕەند: نەترس، ئازا، جوانچاک

ڕێژنە: تاوە بارانی توند کە زۆر نەخایەنێ

ڕووان: ڕوانەوە، سەوەزبوونەوە

ڕوو: خار، هەردی زۆر ڕەق، بە بەفری زۆر بەستوویش دەڵێن

ڕووبەستە: ڕووداپۆشراو




ڕووپەڕ: پەڕە

ڕمووزن: شتێکی ئەفسانەیی ترسناک و بەسامە

ڕمووزنە: ڕمووزن

* * *

# ز

زاکوون: ڕێکوپێک

زرتەسوور: زرتەبۆر، زەبەللاح

زریان: بۆرانی سەخت

زرێبار: دەریاچەیەکە لە مەریوان

زگار: پەرێشان، لێقەوماو، وەڕز، بێزار

زنە: تەڕزن، کانی زۆر بچووک

زورهان: زۆر پیر و کەنەفت

زوورک: گردی بچکۆلە بچکۆلە

زۆنگ: زەلکاو

زەڕ: زیان

زەرد: ماە، شاخی زۆر سەخت و بەردەڵان

زەردە: تیشکی خۆر لە کاتی ئەنگوتن و ئاوابووندا، بزە، زەردەخەنە

زەرەند: پیشەگایەکە پێی دەڵێن کاڵەکە مارانە زۆر تاڵە و کرمی ئاژەڵە

زەندۆڵ: کەلەبەری ناو تاشەبەرد، قلێشی گەورەی زەوی

زەنگوڵ: زەنگوڵ، تک،تک

زەنوێر: ناوچەی تەڕ و سازگاری کوێستان

زیبک: توانایی، هێز، بڕشـــت، دەڵێن فلانەکـــەس پیاوێکی بەزیبکە، واتە دەتوانێ کار بەڕێوەببا، کارامەیی

زێد: شوێنی لەدایکبوونی مرۆڤ

زیانی خورۆ: زیانبەخش و خراپە لێ وەشاوە




زێڕخڕید: بەپارە کڕاوە، مەبەست لە بەندەیە

زێڕوەشانکردن: زێڕ بەسەردا هەڵدان

زیز: زوێر، تۆراو

زیل: زۆر ڕەش

زیل و بەم: دوو دەنگی مۆسیقای بەرز و نەوی

***

## س

ساتۆر: ئەنجنی گەورە

ساغر: پیاڵەی شەراب

ساك: باوڵ یان جانتای دەستی

سامرەند: کوێستانێکە لە کوردستانی ئێران

سانی: هاسانی، ئاسانی

ساو: ساماڵ، ئاسمانی بێ هەور

ساوین: سوون و تیژکردنی داس

سایە: کەوای شۆڕ و ئاودامێنی ژنانە، سێبەر

سبات: خۆڕاگرتن، هونەرنواندن

سرتە: چپە

سروە: شنەبای نەرم

سەهەندە: خوێڕوو

سواڵە: چەپکە گەنمی دورراوە

سوانە: گوێسوانە

سووتمان: ئاگرکەوتنەوە

سۆدرە: فیتنە، سەربەسۆدرە: فیتنە هەڵگیرسێن، هاوواتەی سەهەندەشە، دەڵێن فلان کەس سۆدرە و سەهەندەیە

سوڕکە: گاشە، خڕکە، بەردی ئاماڵ زل کە بهاوێژرێ

سۆرانی: فەقیانە، ئەنگوچك

سۆنگە: هۆ، ئەسباب

سوێ: ئارەزوو، تاسە، هەوەس، ئاسۆ، ئاسۆگ

سوێنە: دەفرێکە لە گڵ دروست دەکرێ و لە باتیی تەشت بەکاردێ

سەر: سەرپۆتاک

سەرگەشتە: سەرلێشێواو

سەنگچن: وارش، پاردە، دیوارێک کە بەوشکەبەرد داندرابێ

سیاچاڵ: چاڵی ڕەش، بەندیخانە

سیاسووت: کاتی ڕاوەکەوی سەرەتای بەهار

سێبەنگی: پرچ ئاڵقەکردن

سیخوار: زوقم، خوسار

سیرە: دەنگی هەڵۆ و سەقر و باز

سێرەگرتن: نیشانەگرتن

سێروو: ڕیشۆڵە

سیلە: گۆشە، سووچ، قولینچک

***

## ش

شرت و شۆ: زۆر ناوزڕاندن

شنە: سروەبای نەرم

شەڵاڵ: ئەڵێن فڵان کەس شەڵاڵی خوێن بووە، واتە لە خوێندا نوقم بووە، یا فڵان کەس شەڵاڵی ئارەقە، واتە ئارەقێکی زۆری کردووە

شلوێ: لیخن، قوڕاو، گۆڕاو، لێڵ، ڕەنگ

شۆرابە: شۆڕبوونەوە

شۆفار: بەدکار، خەفیە

شۆنە: زەوی ئاونەگر

شوور: گاکێوی

شەتەک: توندبەستن، توندپێچان

شەک: کاوڕی یەکساڵە

شەکۆ: پێمەڕەی بچووک بۆ ئاوداشتنی جێگای لێژ بە ئاوی کەم

شەم: مۆم

شەم و شەمزین: دوو دڵداری مێژوویی لە فۆلکۆری کوردیدا شەم (کچ) و شەمزین (کوڕ) بەیتێکی خۆشیان لەسەرە

شەمزاو: تێکچوو، بزرکاو، شێواو

شەنگەبێری: ئافرەتی جوانی مەڕدۆش

بێری: مەڕدۆش

شەوبا: بای شەو

شەوپەڕ: فڕینی شەو، (بەتایبەتی فڕینی شەوانەی نێرەکەو لە جەنگەی مێ ڕۆژدا)

شەوڕن: ڕنینەوە بەشەو
شەوگورد: ژوانی شەوانە
شەوێن: لەوەڕاندنی مەڕ لە ئاخری شەودا
شێلگیر: سوور، پێداگری، وچان نەدان
شێلەگە: ئەو جێگایەی لە جۆگە ئاوی لێ دەشکێنن
شێو: کێڵانی هەوەڵ، یەکەم کێڵان
شیو: دۆڵی چکۆلە

***




# غ

غەزرین: مانگرتن، بەتایبەتی مانگرتنی بەراز

غەنیم: دوژمن

غەور: ژەنگ، تەم، لێڵایی

***

## ف

فیئودالّی: دەرەبەگایەتی

فێرگە: قوتابخانە

فێڕ: پرچ لوولکردن

***

## ق

قرخەمەرەسی: بەزۆر ڕاکێشان، لە دوونەچوون

قرمژن: دەنگی تەقەی چەک

قورینگ: قوڵنگ

قوڵەشین: بە کەروێشک دەڵێن

قەدەم: ئەو هەڵمەی لە بەفری بەرهەتاوی گەرم هەڵدەستێ

قەڵەسابوونی: جوورە قەلێکی بۆر و ڕەش و دەنگ ناخۆشە

قەقنەس: باڵندەیەکی ئەفسانەییە دەڵێن لە ئاگردا دەژی

***

# ک

کابە: کەعبە

کازیوە: تاریک و ڕوونی بەیانی

کاو: مراد، ئاوات، ئارەزوو، تاسە

کاولاش: ئاشی وێرانە، کینایەشە لە ماڵی هەژاران، لە خۆ بەکەم گرتندا ئەڵێن «ماڵی من بە کاولاشی خۆت بزانە»

کڵ: خەرمان و کۆمەڵی ئاگر

کل کردن: لادان

کڵۆش: دەغڵی وشک بوو

کوڕکوڕ: کەت، قەتی

کوڕەحەیران: یاری کچە حەیران

کوڕیژگە: کوڕی بچووک، لەبەر خۆشەویستی بە پیاو دەڵێن

کوڵ: جل شتن

کولێن: گەنجینەی نێو ڕەشماڵان

کوند: کوندەبەبوو

کوێن: تەختەی ڕەشماڵ کە لە مووی ڕەش تەنراوە. بەچەند کوێن تاوڵ و ڕەشماڵێکیان لێ دروســـت دەکرێ. نیشـــانەی ماتەمباری لە کوردەواریی کۆندا ئەوە بووە کوێن لە مل بکەن.

کۆ: پێروو، پەروین، کۆمەڵە ئەستێرەیەکە

کۆتەڵ: پەیکەر

کوچک: بەرد. ســـێ کوچکەیش لە بنەڕەتدا بەو سێ بەردە وتراوە کە ئاگریان لە نێودا

کراوەتەوە و مە نجلّیان لەسەر دانراوە. دڵ بە کوچکەوە دان کینایەیە لە دڵ سووتاندن

کۆچکە: کڵاوی ژنەبڵباسان و منداڵانی موکریان

کۆختە: کۆخ

کۆدە: زەوییەکی نەرمە کە گیای لێبدروێ، گیای نەبەستراو

کۆست: زاوا، کۆست کەوتوو: زاوامردوو، ماڵ وێران بوو

کۆستەک: بەندی تیغ لەکالان ڕاگرتنی خەنجەر

کۆلارە: باڵندەی جووجەڵەخۆر

کووت: سەماد، زبڵ، پەین

کوور: گیسکی یەکساڵەی نێر

کەحلان: ئەسپی ڕەسەن، حدوود، کەحێل

کەسەر: خەم، خەفەت، پەژارە

کەرکیت: ئامرازێکە تەونی پێ دەکوتن

کەروێشکە: شەپۆلی دەغل و گیا لەبەر با

کەڕەسیسە: پرووشە، پەلەتاتە، وردەبەفرێکی ڕۆژی زۆر سارد بباریّ

کەزی: پەلکە، پرچی هۆنراوەە،پرچ

کەشم و نەشم: ناز و عیشوە، لەنجەولار

کەکرە: گیایەکی یەکجار تاڵە

کەڵپ: کەڵبە، ددانی پێشوو

کەما: گیایەکی بڵیندی گەڵادەرزییە

کەمانە: تیرێک کە وەشتێک بکەوێ و بگەڕێتەوە

کەمرە: پشکەڵی پەستراو لە ئاغەڵدا کە بۆ ئاوردوو بە کاری دێنن

کەند و لەند: بەرز و نزم، دەڵێن: ئەم ڕێگایە کەند و لەندی زۆرە

کەنێرە: گیایەکی گەڵا سێ پەلکەیە و گوڵی زەرد دەکا

کەودەری: کەوێکی گەورەیە و لە نزیک بەفری نەبڕاوی

کەوشەن: سنوور

کەونەلان: کۆنە لانە، شوێنی جاران، مەبەست جێژوانە

کەوی: کلێڵە،ڕنووبەفر، دەستەمۆ، ڕام، بەربار

# گ

گاشه: بەردی گەورە

گاڵەدان: داخستن

گاووگەردوون: قوربانی، سەربڕینی حەیوان بۆ پێشوازی

گرانەوە:گیرانەوە

گراوی: دۆست، یار

گردەنشین: دوورەپەرێز و خۆ لەخەڵک بە دوورگر

گریمانە: گرێ

گڕووگر: منالّی گرینۆکی بە بیانووی وڕک گر

گزرە: گیای گێرەکراو

گزیر: کاربەدەستی ئاغا

گزینگ: گزنگ، یەکەم تیشکی هەتاوی بەیانیان

گشتەک: بەنی بادراوی دوعا لێ خوێندراو

گلێنە: جامێک کە لە قوڕ دروستکرابێ

گۆپاڵ: گورز

گۆکەم: گیایەکی بەرزە گوڵی زەرد دەکا و بۆ ئاوردوو دەبێ

گوان: بڵ بوون

دەگوێن: بڵ دەبن

گورگەمێش: سەگێک کە هاوکاریی گورگ بکا

گوڵمەی ڕان: شلکەی ڕان، نەرمەی ڕان

گوڵووک: شاگوڵ، گوڵی هەرە گەورە و گەش

گوڵەشللێرە: گوڵێکی سوورە کە لەسەر گۆڕان دەنێژرێ

گۆد:گۆج، گێڕ

گۆشتە زوون: وەڕووهاتنی برین، چابوونەوەی برین

گۆڵەتاجی: تاژیی نێر، نێرەتانجی

گووەند: شایی، چۆپی، داوەت، زەماوەند، هەڵپەڕین

گەرمک: ئاوێکی گەرم و مەند و تەنک کە زستانان نەیبەستێ و مراوی تێدا کۆببنەوە

گەدە: کوێستانێکی بەناوبانگی کوردستانی ڕۆژهەڵات

گەرمەشین: ماتەمێکی تێکڕایی، گریانێکی بە کوڵ

گەریدە: گەڕاڵ

گەماڵ: سەگ، کسۆک

گەوز: بڕی داس

گەواڵ گەواڵ: دەستە دەستە هاتنی هەور بە دوای یەکدا

گەوە: پێچی کێو، قۆرت، خوارەپێچە، لابەلا، بەر و نەوی لە قەدی کێودا

گێل گێلە: ئەو گوڵنگانەی ژن لە شەدەی دەپێچن

گیابەند: گیایەکی کوێستانی بۆنخۆشە

گیا سەری پێوەناوە: گیا لە هەڵدان و گەشەکردن دایە

گیشە:باقە و مەڵۆ گیای لەسەریەک دانراو

❊❊❊

## ل

لاپاڵ: قەدی کێو

لان: جێگای جانەوەری چوارپێ

لووربوونەوە: هێرش هێنان لە سەرەوە بۆ خوارێ

لوێچ: مشت، گوڵمە، مست

لۆدە: شتی وردی کۆکراوە کە درێژاودرێژبێ

لۆک: وشتری نێر

لووزەو: بە توند هەڵڕژان

لەدوڕ: لەناو

لەنگێزە: با و بارانی توند و بەهێز

لێڕ: دارستانی چڕ، لێڕەوار، جەنگەڵ

لێمشت: لافاو، سێڵاو، لەهی

***

# م

ماتیک: دەرمانی سوورکردنی لێو، وشەیەکی بیانییە

ماشە: پەلەپیتکە، ماشەی تفەنگ، پەلەپیتکەی تفەنگ

ماشەر: کەڵافەی گەورەی بەنی ڕێسراو

مافنگی: نابووت، ڕووت و قووت

ماک: مادە، ئەسڵ، ماکە

مالۆس: بەرازی مێ

ماڵوو: ئامرازی لووسکردنی و تەختکردنی زەوی دوای کێڵان

مامەخەمـــە: قارەمانی چیرۆکی فۆلکلۆری، کەســێک خەمی خەڵک بخوا و خەباتی بۆ نەکا

ماە: زەرد، شاخی زۆر سەخت

مچ و مۆڕ: ڕووگرژ

مشتە: چەرم کوتی پینەچی

ملە: ڕکابەری، دەڵێن ئەم ئەسپە ملە دەکا واتە پێش دەکەوێ

ملانە: زۆرانی، بەربەرەکانی، ملە، خەبات، ڕقەبەری

مژۆڵ: برژانگ، بژانگ

موغ: پێشەوای ئایینی زەردەشتی

مووخ: مۆخ

مۆتە: مۆتەکە

مۆرە: زاری نەردێن و تاوڵە

مۆڵگە: شوێنی کۆمەڵبوونی ئاژەڵ

مەتەرێز: سەنگەر

مەشکەی گاوس: مەشکەی چەرمە مانگا

مەشکەژێن: ئافرەتی مەشکەهەژێن

مەلاس: خۆماتکردن

مەندۆک: گیایەکی کوێستانی جوان و تام و بۆن خۆشە

مەهوەش: وەک مانگ

مەیزەدە: ئەوەی مەی زۆری سەرخۆش کردبێ

مـــێ ڕۆژ: کاتی ڕاوی مێ کەو، ئـــەو کاتەیە کە مێ کەو لە نێرەکەو ون دەبێ و کورک دەبێ

مێری: مێردی، پیاوەتی

مێز: ئامێز، باوەش، باخەڵ

مێژوود: گیایەکی گوڵ شینە

مێشە: بێشە، دارستان

مێلاقە: گوڵێکی سووری پیاڵەییە کە نێوەکەی ڕەشە

***

## ن

نارەنار: گۆرانی گوتن بەدەنگێکی کپ و خەمگین

ناسۆر: برین، زامی کون

نامۆ: غەریب

نابیسێ: ناسووتێ، ڕووناکی نادا

نسار: لای سێبەر لە چیا

نسکۆ: ڕەتبردنی توند، خراپ سەرسمدان

نمەک خوردە: نمەک کردوو

نواڵە: جێگای نەرمان و بژوێنی چیا

نووسەکە: درکێکە بەشتەوە دەنووسێ

نوشتوو: نوشتە

نەترە: ورە، هەترەش

نەتەوی: دوژمن، بەدخوا، نەتویست

نەڕ: وشتری تووکنی نێر

نەرد: تاوڵە، نەردێن

نەوەندە: ساردەکێڵ، دەغڵێکی پایزی درەنگ چێنرابێ

نێسکە: لەنجەولاری ئەسپ و تاژی

نێڵە: دەنگ و هاڵاوی بەتینی ئاگر

و

وریّنگه: دەنگێکی نەرم و خۆش

وەتی: لەوەتی، لەوەتا

وەرد: دووبارە کێڵانەوەی زەوی پاش شێو

وەرهەم: نەخۆشییەکە لەبەر خەمی زۆر تووشی دەبن

وێت: پێت

وێرە: دەنگی هاوێشتنی بەرد و دار

ویزە: دەنگی گوللە

***

# هـ

هات: بەخت، شانس، هێنان

هارووژان: وروژان، هارووژا، وروژا

هاوێر: لێک جیاکردنەوەی بەرخ و مەڕ

هۆبە: شوێنێک کە چەند ڕەشماڵی لێ کۆببێتەوە

هەترەش: ورە، نەترە، زەهلە

هەتوان: دەرمان، مەڵهەم

هەدادان: ئارام گرتن، ئۆقرەگرتن

هەرزە: سووک، جلْف، پەنتی

هەرزەگۆ: ئەوکەسەی قسەی سووک و هەرزە بکا

هەزاردەستان: بولبول، بلبل، شالوور

هەش: خوم، خم، سەربەهەش، ماتەمبار

هەڵپەرتاوتن: لک بڕینی درەخت

هەڵز: گیایەکی کوێستانییە بۆ خواردن و دەرمان بەکاردێ

هەڵکورمان: خۆماتکردنی باڵندە لە کاتی حەسانەوە یا کورکبووندا بەمەجاز، بەکەسێ دەوترێ بەورەزی هەڵترووشکابێ

هەڵکورمان: ماتبوونی باڵندە

هەڵەتانج: باڵندەیەکی ئاوی سـوور و سپی لە قاز بچووکتر و لە مراوی گەورەتر و زۆر جوانە

هەڵەمووت: کێوی زۆر سەخت، هەزار بە هەزار

هەمزەل: دایمەسۆن




**هەنی:** تەختی نێوچاوان

**هەنیە:** ناوچاوان، نێوچاوان، ئەنی، تۆیل

**هەوێردە:** باڵندەیەکی بچووکی زۆر قەڵەوە لەناو شیناوەرد و هەرداندا دەژی

**هەی دێ:** دەنگدان، دەرکردن

***

## ی

یاڵ: پاڵ، لاملەی کێو
یەساوڵ: یاساوڵ، پاسەوان
یەڵدا: درێژترین شەوی ساڵ
یەکانە: بڕەک: بەرازی نێر
یەکسەری: ڕەشکەی گەورە

***



# هێمن، شاعیر و مرۆڤ

لەم کوردستانە گەورە و گرانەدا، کە دوژمنان بە چەقۆی سیاسەت وایان بەسەر خۆیاندا بەشبەش کردووە کە هەر پارچەی بە قەدەر چنگێکی نووقاوی ماوەتەوە، دەیان ساڵە پیاوانی لێهاتووی دەیانەوێت ئەو چنگانە لێکبکەنەوە تا ببنەوە بە دەستێکی کامڵی لەبار و خێر و بیریان بەسەر لە پیدا داچوڕێتەوە سەرلەشی وشکی خەڵکانی تریشەوە، ئا لەم کوردستانەدا گەلێک مێرخاس و ئازا و شاعیر و زانای وا هەڵکەوتوون کە بە ئەندازەی سەختی چیاکانی خۆی و ڕقی دوژمنانی خۆشەویستیان لە دڵدا بووە، گۆرانییان نەک تەنیا بۆ ئەواڵە و زەنوێر و تاڤگە و گوڵ و زەماوەند و سروشتی وڵاتی خۆیان وتووە، بەڵکوو بەردەوام درووديان بۆ دەریا و بیابان و سروودیان بۆ سەربەستی خەڵکانی تریش وتووە، ئەو سنووربەندە فەرهەنگی و کلتووریە دزێوەی کە نەیاران بە مەبەستی چەقبەستن و شێواندنی ڕووی ڕاستەقینەی ئەدەب و مێژوو و سەرجەم کلتوور و ئایندەمانیان ڕەخساندووە ئێمە خۆمان لێی نەبان کردوە، هیچ کەناڵ و بوارێکی ژیانیان نیە جێ دەستی ئەفراندنی کوردێکی پیوەنەبێت، تەنانەت لەسەر تەختی گیانەلانیشدا خوێنی بەهانا چوونی خۆمانمان داونەتێ، ئەگەرچی پاشان نە قەدرزانیان لی کردووین نە شەرمی خوێنەکەیان بە ڕووەوە ماوە! ئەمە تەنیا باسی ئەدەب و هونەر نیە، بەڵکوو باسی ئەو سەردەمانەیشە کە باهۆزی سیاسەت و ڕووداوە سەختە جیهانیەکان لە بۆسەی ون کردن و نشوستیاندا بوون، کە چی ئێمە بووینەتە قەڵا و سەنگەر و پشکۆی نێوکوانووی خەفەکراویان،

مێژوویی کۆن و نوێی ئێمە و خۆێشیان شایەتی دەیان نموونەی لەم بابەتانەن، ئەوەندەی ئێمە بۆخەڵکیمان کردووە، ئەوەندەی سەری خۆمان بۆفەرهەنگ و ئەدەب و چارەنووسی کەسانیتر ئێشاندووە و قوربانی ماڵ و گیانمان بۆداون هەرگیز بۆ خۆمان نەکردووە، تەنانەت تێماندا هەڵکەوتووە کە لە بێ بڕوایی بە خۆ و هەستی بچووکیەوە حاشای لە رەگەز و بنەچەی کردووە و وەک هەتیوی لانە شێواو بەسەر خوانی بێگاناندا دابەش بووە و بۆتە یەکێک لەوان، ئەمە ترازیدیترین خەتای مێژووی ئێمەیە.

لە نێو ئەم قەدەرە نەگریسەدا، کە دوژمنانمان بازووبەندی کۆیلایەتی لە قۆڵ بەستووین و گیانی هەست بە بچکۆلەیی خۆیشمان بڕستی لێبڕیوین و لە زۆر شوێندا زمانی دایکی لە بیر بردووینەتەوە، کەسانێک هەڵکەوتوون وەک گەلاوێژی دەم ئاسۆ لەو تاریکستانەدا جریوەی ڕێنمایی بۆ پێکردووین و وەک عاشقە ئەفسانەییەکان بەرەو ئەو خەونانەی بردووین کە ئاوێزی تریفەی مانگ و بەهەشتی ئازادی و ئارامی سەرزەوی بوون، عەشقی وڵات و ڕووناکی کردووین لە بواری ڕووناکبیری و ئەدەبماندا جوانی و سیحرێکی هێند دەگمەنیان بە زمان و موسیقایەکی ئەوەندە بەلەزیان بە گیان بەخشیوین کە تا سەر ئێسک خۆشەویستی خاک و خەڵک و نەتەوەیان پێبەخشیوین.

هێمنی شاعیری گەڵ و جوانی و خۆشەویستی و خەبات یەکێکە لەو سەرقافڵەچیانە. ئەو تەنیا شاعرێکی داهێنەری سەردەمی خۆی نیە، بەڵکوو فیداکارو شۆڕشگێڕ و مرۆڤ و سەوداسەی دنیای ئەفراندن و عاشقێکی سەردەستەی سروشت و جوانیشە، بڕیاری خۆشەویستی کوردی لە دڵەوە داوە و بە کوڵ فرمێسکی شادی بۆ سەرکەوتنەکانی ڕشتوە. لە ناو جەرگەی شکستەکانیدا مرۆڤی خۆگر و بە شیعرە حەماسیەکانی هانی بەرەنگاری و هەستانەوەی نوێی داوە. هەر لە سەرتای تەمەنیەوە تێکەڵی سیاسەتی کوردی بووە و شیعرەکانیشی لەبەری ئەو درەختەن.

ساڵی ١٩٤٢ کە لە خۆرهەڵاتی کوردستاندا ژ.ک دامەزرا، هێمن بە تاسەوە پێشوازی لێکرد و بە پەرۆشەوە بووە ئەندامیکی هەرە چالاکی کۆمەڵە، ئەوسا هێمن لاوێکی تەمەن بیست ساڵ بوو. ئەمە یەکەمجاری بوو بچێتە ناو ڕێکخراوەیەکی سیاسیەوە، بە تایبەت حیزبێکی نەتەوەیی کورد کە هەموو خەونە خۆشەکانی و ئومێد بە ئایندەی ڕزگاری لەسەر بنیات نابێت، بۆیە بە کۆڵ و دڵەوە دەرگای لەسەر گەلێک لە خولیای تایبەتی و ئارزووە شەخسیەکانی خۆی داخست و گشتی بەخشیە ئەو ئاواتانەی کە حیزبەکەی بوی بەدی دێنێت، ئەوەتا خۆی لە (لە کوێوە بۆ کوێ)ی پێشەکی دیوانی تاریک و ڕووندا دەنووسێت:

(ئەندامەتی کۆمەڵەی ژ.ک گۆڕانێکی ســەیری بەســەر مندا هێنا، شەو و ڕۆژ لە بیری کۆمەڵەدا بووم، کە ئەویش ئامانجی ڕزگار کردنی نەتەوەکەم بوو، هەموو ئاوات و ئارەزووی تایبەتی خۆم وەلانا، ئیتر نەک تەنیا دەســتم لە شــەوداوەت و هەڵپەڕین و ڕێباز گرتن و لەســەر سوانە وەستان هەڵگرت، بەڵکوو وەک ســۆفی تۆبەکار تووشی هەر کیژ و ژنێکی کورد دەهاتم ســەرم دادەخست و چاوم لێ نەدەکرد، چونکە ئەمەشم بە خیانەت دەزانی، بۆ خاتری کۆمەڵە من دەســتم لە یارێک هەڵگرت کە بە گەورەترین مەحروومیەتی ژیانمی دەزانم و رابردنی زەمانیش لە بیری نەبردوومەوە و ناسۆری لە دڵمدا هەر ماوە)

لە گۆڤاری (نیشــتمان)دا کە ئۆرگانی حیزب بوو هێمــن زۆر چالاکانە کاری دەکرد و شــیعر و نووسینی بڵاو دەکردەوە،پاشان بووە ئەندامی دەستەی نووسەرانی گۆڤارەکە. لە هەموو چالاکیە ڕووناکبیری و چاپەمەنیەکانی حیزبدا هێمن سوارچاک بوو.

لە ســاڵی ١٩٤٥ دا کە یەکەم کۆماری کورد لە مەهاباد دامەزرا شــەهید قازی محەمەد بووە ڕابەری، هێمن هەر دەنگی دلێری شیعری و نووسەری باڵادەستی ئەو کۆمارە کۆرپەیە بوو، هەر لەبەر ئەو ناوداریەی بوو کە قازی شــەهید ناوی شــاعیری میللەتی پێبەخشی. ئەو کۆمارە تاقانەیە کە خەونی دەیان ساڵەی کورد بوو هێند لە دڵی هێمن خۆشەویست و شکۆدار بوو کە زۆربەی شیعر سروودی ئاوازەی بۆ ئەو ڕسکا و دەیویست بەو زەخیرانەی مێشــکی زۆر زۆر باڵای پێبکات و لە خەمی برەخســێنێت. کە دوژمنە دوور و نزیکەکانی کوردیــش دوای تنیا ســاڵێکی تەمەن چەقۆی بێ ئابروویــی و نامەردیان لە گەردنی نا و پیلانی ســاختە سیاســەتی بە مەرام نەگەیشــتنی کوردیان پیادە کرد و داخێکی هەرە گەورەیان لە دڵی نیشــتمان پەروەر و شۆڕشــگێڕەکاندا نا، ئیتر هێمن دنیای لەبەر چاو تەڵخ و زرینگەی پیاڵە و ئاهەنگی گۆرانی لێبوونە چەمەر. سێدارەکانی مەیدانی چوارچرا کە بۆقازی و هاوڕێکانی هەڵخران ئەمەندەیان کار لە هێمن کرد کە وەکخۆی دەڵێت: (دڵی منی بە ناســۆر ئەنگاوت، ناســۆرێک کە بۆتە تێراوێ و ئێســتایش هەر وەبن دەداتەوە و هەڵدەداتەوە و بێ گومانم سارێژ نابێت و لەگەڵم دێتە بن گڵ) چونکە هێمن لە دڵەوە قازی خۆشدەویست و بەڕابەری ژیر و کوردی چاک و نەتەوە پەروەری دادەنا.

ئەم کارەساتە جگەربڕە سەری هێمنی بەرەو تاراوگە پێهەڵگرت . کۆستە گەورەکەی لە دڵ ئاخنی و بەرەو ماڵێکی هەتیوو کۆست کەوتووتر، بۆلای کەسانێکی لە خۆی دڵشکاوتر، بەرەو باشــووری کوردستان هەڵفڕی، بەڵام ئەو ڕاســتیەی دەزانی کە لە هەر جێگایەکی کوردستاندا، لە ناو دڵی هەر کوردێکی مەینەتباردا ئەو خانەخوێ و سەردەستەیە. بۆیە بۆ

ماوەیەک لەم هێلانەی دوای شەڕی جیهانی دووهەمدا کە برسیەتی و نەبوونی و ماندوویەتی تا سەر ئێسک کاری لێکردبوو حەسایەوە، ترسی ژاندارم و سیخوڕانی ڕژیمی شاهەنشاهی لەسەر ڕەویەوە، چونکە خوڵکی ئەم دیو هاودەرد و پشتوانی بوون. بەڵام خولیا و خەونەکانی هێمن هەر لە بڵێسەدا بوون. ئەو دەیزانی وڵاتی داگیرکراو وەک مرۆڤی زیندانی وایە، هەست دەکات و چی لەدەست نایەت، ئەگری و کەسی بە فریادا ناگات، تەماشای زنجیرەکانی پێوپلی دەکات و توانای پساندیانی نیە، بە کورت ئەمەندە لە گەمارۆدایە کە بێجگە لەوەی خەم و ئازارەکانی بکاتە شیعر و پەیام چی تری لەدەست نایەت.

دوای ماوەیەک کە باری لای خۆیان ئارام و ترسی گرتن و تۆقاندنی نابێت دەگەڕێتەوە و بە کشت و کاڵ کردنەوە خۆی سەرقاڵ دەکات. بەڵام نە واز لە شیعر دێنێت و نە سەنگەری کوردایەتی چۆڵ دەکات.

ساڵی ١٩٥٢ کە شۆڕشی گەلی ئێران بە سەرۆکایەتی دکتۆر موسەدق لە دژی شا و هاوپەیمانەکانی هەڵگیرسا، کوردستان کڵپەی سەندەوە و لە شارەکانیا بووە ئاهەنگ و شادی سەرکەوتن، هێمن لە شاری مەهابادا بووەوە بە شاعیرە شۆڕشگێڕ و دەرکەوتوەکەی جاران و هەزاران کەس شیعری (دەبرۆ ئەی شاهی خائین بەغدا نیوەی ڕێیەت بێ)ی بۆدەسەندەوە. کە دوژمنانی گەل و دەوڵەتە ئیمپریالیزمەکانی دۆستی شا پیلانی شکستی شۆڕشیان دانا و شایان گێڕایەوە ئێران ئیتر هێمن بە ناچاری ڕووی لە چیا و ڕێگای سەختەکان کردەوە و لە ناو خەڵکانی گوند و کون و ئەشکەوتاندا خۆی حەشاردا. ماڵ و منداڵی تووشی گێرمە و کێشە و ناڕەحەتیەکی زۆر هاتن و هەر لە دوای ئەو کارەساتەوە ئیتر باوک و دایکی مردن و خۆی و ژنەکەی و سەلاحی کوڕی مانەوە.

لە کۆتایی سالانی شەستا، دوای ئەوەی بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا پەرەی سەند و ڕژیمی شایش بە ئاگر و ئاسن لە ڕوویا وەستا و گەلێک تێکۆشەری شەهیدیان لە بەندیخانەکانی توند کرد، ئیتر هێمن خۆی بۆ نەگیرا و لەگەڵ کۆمەڵێک لە ڕابەرانی حیزبی دیمۆکرات و تێکۆشەرانی ڕێگای کوردایەتی هاتنە باوەشی باشووری کوردستان و دەوامیان بە خەباتی خۆیان دا، پاشان لە سلێمانی و شارەکانی تردا نیشتەجێ بوون.

من لە دوای هەرەسی ساڵی ١٩٧٥ی، شۆڕشی کوردەوە مامۆستا هێمنم بە چاکی ناسی، چ لە بەغدا و چ لە سلێمانی دەمبینی، چونکە منیش ئەوەندەم تامی ئەو شکستە لە دەمیدا تاڵ بوو کە مەگەر ڕووخانی کۆمارەکەی مەهاباد ئەوەی بە هێمن چێشتبێت،

منیـــش بریندارێکی تازەی چەقۆی ئـــەو دوژمنانە بووم کە هێمنیان تاراندبوو، گەلێک جار بەدەم ســـکاڵا و بادەی تاڵەوە شـــەومان بە ڕۆژ دەگەیاند، لە نیوەشـــەوی درەنگدا ئێمە دەکەوتینە ورینگە ورینگی مامڵێ و و بەدەم (منیش مەحکوومی حەبســـی ئینفرادی)یەوە خەمی خەستمان هەڵدەڕشت، خەمی ئەوسای ئێمەی تازە کۆست کەوتوو تا سەر ئێسک و بە خەستی نائومێدیەکانی ناو چاوی بێوڕە و پرشنگە پڕ لە درەوشاوەکانی خەبات گێڕان بوو، هێمن بەردەوام بەدەم هەناســـەی پڕ لە دووکەڵیەوە دەیوت «ئێوە دەتانەوێت مامڵێم لە بیر بەرنەوە» ئەو ساڵانە هاوخەم زۆر بون، بەڵام زیاتر لەگەڵ شێرکۆ بێکەس و حەمەی حەمە باقی و هاشـــمی کەریمی و کەریم شێخانی و سەباحی غالب و چەند برادەرێکی دی سەرمان بەسەر کوانووە ڕووخاوەکەدا دەژەند و وێڵی دوای (گۆدۆ)یەک بووین کە بێگومان بووین هەردەگات.

مام هێمن زۆر جار فرمێسکی لە چاوان بە قەتیس دەوەستا. یان دڵۆپەکان هورووژمیان دەهێنا و دادەکەوتن، یادگارەکانی زیندووتر دەبوونەوە، ئێمەی لە خۆیدا و خۆی لە ئێمەدا دەبینی. کورد لە کوێ بێت باری شکســـت و خەمەکانی بە کۆڵیوەیە و شاری یادگارەکانی پـــێ ئاوەدان دەکاتەوە، بـــە داخەوە ئەمە مێژووی ئێمەیە، لە هەر ســـوچێکدا خیانەتێک کروشکەی کردووە و لە ژێر هەر بنچکێکدا دەیان شکست و هەرەسی مەڵاسن. ئەو وڵاتەی بە بەهەشتی ناوزەد دەکەن بیجگە لە بۆکرووزی هەناوی وێرانی گوند و شاری، دەربەدەری و لە ســـێدارەدانی خودانەکـــەی، کیمیاباران و ئەنفالکردنی خەڵکەکـــەی چ بۆنێکیتر بە هەناســـان دەدات؟ بۆ کرووزی ئەم دووکەڵە لە ســـنگی هەر کوردێکی ئێرە و ئەوێدا کە هەســـتی کوردایەتی بـــەردەوام کێنگڵی پێبدات و خەوی لە چـــاو بتارێنێت. هێمن لەوانە بوو کە ئەم هەســـتە گەرای لە گیان و خوێنا دانابوو، مەیخۆشـــی بۆ ئەوە بوو خەمەکانی خەســـترین و برینەکانی زیاتر بێنەوە ســـوێ، بادەی بە پیرۆز دەزانی، چونکە هاودەم و دۆستی خەمەکانی بوو!

بـــۆ کـــەسـێکە مـــەی کـــە دەردی کاریـیـــە
بـــێ خـــەمێـــک بیخـــواتـــەوە زۆرداریـیـــە
بـــۆ کەســـێکە مـــەی دڵـــی پـــڕ بـــێ لـــە داخ
بـــۆ چـــی لێـــی بخواتـــەوە بـــەرزە دەمـــاخ

کە (ناڵەی جودایی) و (مەتەڕێزی شـــەرەف) و(شـــەنگە بێریمـــان) لا دەخوێندەوە

ئۆخژنـــی دەهاتـــن و ئارەزووی ئازادیەکەی باڵی دەگرت و ســنوورەکانی دەشــکاند پێی دەوتین: «من لێرە هەست بە ١٩٧٦ ناکەم، وادەزانم لە مەهابادم.»

ســاڵی ١٩٧٦ یەکیەتی نووسەرانی کورد/ لقی ســلێمانی لە هۆڵی یانەی مامۆستایان کۆڕێکی شــیعر خوێندنەوەمان بۆ هێمن ساز دا. ئەوسا نووسەران لە گوڕوتینێکی سەرنج ڕاکێشــدا بوون، دەیان ویست ڕەنگی شکست زەدەیی خەڵک و باری گڵاوی سیاسی کورد بە ئەدەبی بەرگری قەرەبوو بکەن، بێ دەنگی چیا لە شاردا بتەقێننەوە، چالاکیە ئەدەبی و ڕووناکبیریەکانی نووســەران سەرشــاری ورە و هەســتانەوەی پڕ لە ئیرادە بوون، چ بە خوێندنــەوەی شــیعر و چیرۆک چ لــە کۆڕ و چ لە بڵاوکراوکاندا بە ڕاشــکاوی پلاریان لە بەعس و پیاوە بوودەڵەکانی ناو سیاسەتی کوردی و هەڵخەڵەتاوەکانی فێڵی ڕژێم دەگرت، بانگەشەی لە دایک بوونێکی نوێ و گەش بینیەکی بابەتیانەی تریان دەکرد.

لــەو کــۆڕەدا کە ســەدان کەس لە ناو هۆڵەکە خــزا بوون یان لەبــەر بێجێگایی بە پێوەوەســتابوون هێمن شــیعری خوێندەوە، ئامادە بووان تەنیا کەسانی ئەدیب و ئەدەب دۆســتانە نەبوون بەڵکوو خەڵکانێکی سیاسی و شۆڕشــگێڕ و نیشتمان پەروەریش بوون کە دەیانویســت لە ڕێگای شــیعرە بڵندەکانی هێمنەوە چاو و دڵیان ڕووناکتر بێتەوە کە پاریزگای ئەو ســای ســلێمانی و پیاوی متمانە پێکراوی دەوڵەت هاتە هۆڵەکە هیچی بۆ نەکرا، زۆر بە ساردی پێشوازی لێکرا، کەچی کە هێمن هات لەبەر چەپڵەڕێزان هۆڵەکە بە لەرزە کەوتبوو، کۆڕەکە شاعیری گەورە- کامەران موکری دەگێڕا و لە ژێر فشاری داواکردنی خەڵکێدا شیعرێکی خۆیشی خوێندەوە.

کۆتایی کۆڕەکە بە هوڕاو خۆپێشــاندانی خەڵکەکە شــکایەوە، بەدەم سروودی «ڕێی خەباتمان چەند سەخت و دووربێ» لە هۆڵەکە هاتینە دەرێ، کەس لەبەر ئەو حەماسەتە پڕەدا خۆی بۆ نەدەگیرا، تەنانەت هەبوو دەگریا و فرمێســکی شــادی و دڵخۆشــیەکەی بەســەر ڕوویەوە دەدرەوشایەوە، یەکێک بوو لەو کۆڕانەی ئۆخژنی دایە دەروونی خەڵکانی مەرد و چاو داگیرکەرانی ســوور و دڵی شۆفارەکانی کەیلی ڕق کرد، پیاوانی ڕژێم کەوتنە چاودێری کۆڕەکان و نووسەرە بە هەڵویستەکان، هێمنیش لەو چاوسوور کردنەوەیە دەرباز نەبوو، داوایان لێکرد جاری دی کۆڕ لە کوردستاندا نەگرێ و زوویش بگەڕێتەوە پایتەختی زیندانەکەی خۆیان.

هێمن لای خەڵکی کوردســتان سونبولی موقاوەمەت و شاعیری ئازادیخواز و ئاوارەبوو، چامەی ناڵەی جودابیەکەی ئەگەرچی بە ڕواڵەت وەک شــیعرێکی ڕۆمانسی و سۆزی تاکە

کەسێک خۆ دەنوێنێت، بەڵام لە گەوهەردا سکاڵا و ئازار و بڵێسەی ئینسانێکی کوردە کە مل بە کوێن و ڕوو لە ئاسـۆیە، هاواری گەلێکە نوقمی بەدبەختی وسەری گێژی یاریەکانی سیاسەتی دنیایە بەڵام نەمردووە و گیانێکی بە بزاوت و زیندووە. لەو شیعرەدا چەند زیانی تایبەتی هێمن ئەبینرێت ئەوەندیش ڕەنج و ئەمێدەکانی نەتەوەکەی بەرجستە ئەبن!

بـــۆیـــە ناڵـــەم تێکـــەڵـــی نـــەی کـــردووە
شـــێوەنێکـــم پێیـــە نـــــەی نـــەیکـــردووە
لێـــم گــــــەڕێ بـــا دەربــــــرم ســـۆزی دەروون
لێم گـــەڕێ بـــا هـــەڵـــوەرێنم ئەشـــکی روون
شـــــیوەنی مـــن شـــــیوەنی ئینســــــانی‌یە
بانگــــی ئـــازادی و گـــروێ یـــەکســـانیە
شـــیوەنی من شـــینی کـــوردی بێ بـــەشـــە
ئـــەو گەلەی حاشـــا دەکـــەن لێی و هـــەشـــە

هێمنی مرۆڤ و شـــاعیر و شۆڕشـــگێڕ زۆر لەوە زیاترە کە بە چەند ووشـــەیەکی لەم بابەتە هەقی ڕەوای خۆی بدرێتێ، شیعرەکانی شایستەی دەیان لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگانی زانســـتی و ئەکادیمین، خوێندنەوەیەکی بابەتیانە و ســـەردەمانەی گەرەکە کە پسپۆڕێکی بواری ڕەخنە و توێژینەوەی لێبێتەدەســـت، هێمن وەک خۆی هەڵوێســـتی وەک شـــیعر و ئەدەبی.

(بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ) بە شانازییەوە لە پڕۆژەی چاپ کردنی کتێبیدا ئـــەم بەرهەمەی کردە نۆبەرە و پشکێشـــی ئەدیـــب و خۆشەویســـتەکانی هێمنی نەمری دەکات، (چەپکێ گوڵ، چەپکێ نێرگز) ڕەنگاڵەیەکی ئەدەبی یاداشتنامە، شیعر، پەخشان و چیرۆکی جوانی هێمنن، لە ژیانیدا و لە دوو تۆێی کتێبێکدا بە چاوی نەیدیتن، بەڵام چاو لـــە ڕێیە، ئەمە یادگاری دوای مەرگیەتی کە بەریز کاک (ســـەلاح)ی کوڕی مام هێمن کۆێ کردوونوتەوە، قەرزێکە لەسەر هەر دام و دەزگا و بنکە و مەڵبەندێکی ڕووناکبیری کوردی کە چاوی خوێنەرانی پێبگەشێنێتەوە. بنکەکەمان ئەم دەست پێشخەریەی بە ئەرکی زۆی زانـــی، ئەم کارە لە چوارچێوەی ئەو دەیان خولیا و ئارەزوو ڕووناکبیری و ئەدەبیانە دایە

که لە پێشـــماندایە و بەخت یار و کورد بەرقەرار بێت بە ئەنجامیان دەگەیەنین، ئەمە بەر کوڵە، بەڵام بەرکوڵێکی ناوازە.

درووود بۆ گیانی نەمری هێمنی خەباتگێڕ و شـــاعیری گەورەی کوردایەتی و جوانی و سروشت.

ڕەووف بێگەرد

سەرۆکی بنکەی ئەدەبی و ڕووناکبیری گەلاوێژ

سلێمانی، ئابی ١٩٩٧



## شاعیری گەل

ئەوڕۆ هەرکەس لە ئەدەبی کوردی شارەزا بێ ناوی هێمنی بیستووە. شیعرەکانی خوێندۆتەوە و بێگومان دەزانێ کە هێمن یەکێک لە شاعیرە هەرەبەرزەکانی کوردی سەردەمی ئێمەیە؛ بەڵام شیعری هێمن هەر لە سەرەتاوە لە چوارچێوەی ئەدیب و نووسەران دەرچووە؛ لە ناو کۆمەڵانی خەڵکی کوردستاندا بڵاوبۆتەوە و هەر لە سەرەتاشەوە لە دڵی هەموو کوردێکی دلسۆز و نیشتمانپەروەر کاریگەر بووە و ئەوانی بەرەو خەبات لە پێناوی ڕزگاری گەلی کوردا هان داوە. هێمن لە سەرەتاوە شاعیری گەلە و هەر بە شاعیری گەلیش ماوەتەوە. سی ساڵ زیاترە هەزاران خەباتکەری کورد پێکەوە لەگەڵ هێمنی شاعیر هاوار دەکەن:

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لەدەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن
من لە زەنجیر و تەناف و دار و بەند باکم نیە
لەتلەتم کەن، بمکوژن، هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن

هێمن عاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردی کوردستانە. نیشتمانی، تەبیعەتی وڵاتەکەی

باش دەناسێ و لەگەڵی پەروەردە بووە. لە «بەهاری لادێ» «بەهاری کوردستان»، «شەنگەبیری»، «فریشتەی پەڕیوە» و زۆر شعیری تریشدا نیشانی دەدا کە لە ناسین و ناساندنی تەبیعەتی کوردستان و جوانیەکانیدا چەندە شارەزا و مامۆستایە. جێگای سەرسوڕمانیش نیە هێمن لەگەڵ تەبیعەت گەورە بووە لە تەبیعەت ئیلهامی وەرگرتووە. کەسێک تەبیعەتی کوردستانی دیتبی و نەک هەر دیتبێ بەڵکوو لەگەڵی تێکەڵاو بووبێ، هێمن بە ناهەق نازانێ کە دەڵێ:

بەهەشتە کوردەواری من بەهەشتە

هێمن لە شیعری خۆیدا زۆر جار باسی زۆرلیکراوی نەتەوەی دەکا، لە مافی خوراوی گەل دیفاع دەکا، ئارەزووی ئەوەیە کورد هەرچی زۆرتر لە ستەمی نەتەوایەتی رزگار بێ، بوونی ئەو ستەمە بەسەر چاوەی زۆر بەدبەختی و کوێرەوەری و بێبەشی دەزانێ. لە «دواڕۆژی ڕووناک»دا دەڵێ:

لەمێژ بوو هەقی کورد دەخورا بە فیڕۆ
لەمێژ بوو کورد بوو دەیکرد شین و ڕۆڕۆ
لە مەیدانی شەقێنی دوژمنیدا
سەری سەرداری کوردی بوو وەکوو گۆ

هێمن بە تایبەتی زۆر پەرۆشی ئەوەیە کە لە کوردستانی ئێران زمانەکەی ئازادی پەرەئەستاندنی نیە، ئەدەبەکەی بڵاوناکریتەوە، فەرهەنگەکەی پێشێل دەکرێ. لە «ڕۆژگاری ڕەش»دا دەڵێ:

داخرا دەرکی ڕۆژنامە
شکاون نووکی خامە
کوردی نووسین حەرامە
دوژمن دەڵێ بێتامە

دڕان کاغـــەز و دەفتـــــەر
گیران شـــاعیر و نـــووســـەر

هێمـــن نەتەوەکەی خۆی خـــۆش دەوێ؟ لەوەش زیاتر نەتەوەی خۆی دەپەرەســـتێ، بەڵام ڕقیشـــی لە هیچ نەتەوەیەکی‌تر نیە. لە هەموو دیوانی هێمن‌دا شـــیعرێک کە باســـی نەتەوەیەکی‌تـــر بە خراپە بـــکا یا کورد لە نەتەوەیەکی‌تر بە بەرزتـــر دابنێ بەدی ناکرێ؛ دیاردەیەک کە بە داخەوە لە دیوانی زۆر شاعیری کورددا بەرچاو دەکەوێ. نەک هەر ئەوە، بەڵکوو بە شەردۆستی یەکێک لە سروشتە تایبەتیەکانی شیعری هێمنە.

هێمن زۆر جار باســـی پیشەوا قازی دەکا و لە شـــیعرەکانی‌ڕا دیارە کە چەند ئە ڕۆڵە بەنرخ و هەڵکەوتووەی گەلی کوردی خۆش ویستووە. پیشەوای خۆش‌دەوێ چونکە:

زانـــا بـــوو، کـــوردپـــەروەر بـــوو
پێشــــەوا بـــوو، ڕابــــەر بـــــوو

بەڵام بۆیەش پێشەوا بە مەزن دەزانێ چونکە:

هـــــەر کـــــورد نـــەبوو، بـــەشـــەر بـــوو
خـــەمـــی خـــەڵکـــی لـــەبـــەر بـــــوو

هێمن گەلانی‌تری ئێرانی بە دۆستی گەلی کورد دەزانێ و لە خەبات و تێکۆشاندا بە برا و هاواڵیان دادەنێ. لە «کورد و ئازەربایجانی»دا دەڵێ:

کـــورد و ئـــازەربـــایجانـــی هـــەر دوو داوایـــــان ڕەوایــــە
هـــەر بـــژیـــن و پایـــەدار بـــی یـــەکیـــەتی ئـــەم دوو بـــرایـــە

هێمن دیســـان لە ســـەرتاوە لە ناو نەتەوەی خۆشـــیدا هەموو چین و توێژێکی بە یەک چاو تەماشا نەکردووە و ناکا. لە شیعری بە ناوبانگی خۆیدا «دەیڵێم و بێباکم» دەڵێ:

ئــــەوی ئاغـــا بــێ بیـــکارە
جــەبـــوون و قــەڵــس و لاســـارە
دزی و ڕێگـــــرتنــــی کــــارە
ئــەمــن دەیڵێــــم و بێبـــاکـم
لــە شــــەرم و شـــوورەیی مـــردم
بــە خــۆم من چـۆن بڵێـم کــوردم
کــە ئاغــا ئابـــرووی بـــــردم
ئەمـــــن دەیڵێـــــم و بێباکـــم

لە «ئارەق و تین»دا زۆر بە جوانی و بە زمانی سادەی جووتیاران باسی نرخی کاری جوتیار بۆ کۆمەڵ دەکا و چەوســانەوەی جووتیاری نیشان داوە و دەریدەبڕێ کە ئینسانی زەحمەتکێش لە لای زۆر خۆشەویستە:

مـــن جــووتیـــارم، مـــن جـــووتیارم
مـــن لـــەگـــەڵ هاوتـــا هـــاوکارم
مـــن بـــە ئـــارەق و ئـــەو بـــە تیـــن
دامانـــــڕشـــتوە بناغـــــەی ژیـــن
باســـــکی مـــن و تیشـــکی ئەوی
بـــژیـــو دەســـــتێنن لـــــــە زەوی
گـــەر جووتیـــار ئـــارەق نەڕێـــژێ
گـــەر هـــەتـــاو تیـــشـــک ناوێژێ
دانیشـــتوی نـــاو کۆشــک و قـــەڵا
دەخـــــۆن نانــــــی گـــەڵاگـــەڵا؟!

لەشـــیعرەکانیڕا بە هاسانی دەردەکەوێ کە هێمن لە ژیانی زەحمەتکێشانی کوردستان




بە تایبەتی جووتیاران لە نزیکەوە شـارەزایە. لەوەش زیاتر خۆی تا ڕادەیەک لەم ژیانەدا بەشدارە. خۆی دەڵێ: «چاک خەریکی کاسبی بووم زۆر زوو فێری کشتوکاڵ بووم.»

فەلسـەفەی ژیانی هێمن ئەوە نیە کە دانیشێ و لە دوورەوە تەماسای ژیان و خەباتی گەل بکا و بۆ خۆی و یان بۆ گەل شیعر بڵێ. هێمن ئەو ئەسڵەی قەبووڵ کردووە کە ئەرکی شـیعری شاعیری گەلێکی زۆرلێکراو و تەنیا لێکدانەوە و خستنە ناو هۆنراوەی تەبیعەت و جوانی نیە. شـاعیر لە پێشدا ئینسانە، ئینسانێکە کە هەستی ناسکە و زوو دەجوڵێتەوە. چۆن شـاعیر بە مانای ڕاسـتی ئەم وشـەیە، دەتوانێ بەرامبەر بە هەژاری و کوێرەوەری و بێبەشـی گەلەکەی بێ لایەن بێ؟ لە نێوان ڕاسـتی و درۆدا، لە نێـوان ئاهورامەزدا و ئەهریمەندا، لە نێوان هەق و ناهەقدا ڕاستی هەڵنەبژێرێ، بە گژ ئەهریمەندا نەچێ و دیفاع لە هەق نەکا؟ بۆیە هێمن تەماشـاچی نیە و ناتوانێ تەماشـاچی بمێنێتەوە. بە هەموو هێزی خۆیەوە بە شـیعر و بە نووسـین هەنگاوی ناوەتە ناو مەیدانی خەبات و تا سـەر بەرەو ئاسـۆی ڕون، تا ترۆپکی ڕزگار بوون یاریدەی گەلی خۆی دەدا. هێمنی شـاعیر لە هێمنی خەباتکەر جیا ناکرێتەوە.

بـزانـە تـۆ ئـەوەی ئـەهلـی هـونـەر بـێ
دەبـێ یـا دەسبـەسـەر یـا دەربـەدەر بـێ
هـونەرمەنـد و ژیانـی خـۆش مـەحـاڵـە
هـونەرمەنـد ڕەنجـەڕۆیـە، ژینـی تـاڵـە
منیـش بابـردەڵـەی بـەر گێـژەڵـووکـەم
دەمێک لـەو قـولکە، تاوێـک لـەو چڵـووکـەم
منیـش زۆرداری پـرزەی لـێ بـڕیـوم
منیـش بـەدکاری بـواری لـێ تـەنیـوم

یا لە «فرمێسکی گەش»دا کە بە قسەی خۆی لەو پەڕی تەنگانە لیقەوماندا گوتوویە، دەڵێ:

کــوشــتمی و شــەش خانــی ئومێدی لــە من گرتــن حــەریف
مــۆرە هــەڵداوێــم و بیهــوودە بــە تــەمــای دووشــەشــم

هێندێ شــیعری تریش وەک «گریانی نیوەشەو» و «ئارەزووی فڕین» هەر نیشانەی نائومێدی شــاعیر و ڕاکردنی لە ڕاســت ژیانی تاڵە. لە ســاڵی ١٣٢٥وە هەتا ساڵی ١٣٣٠ سەردەمی پاشکشەی جووڵانەوەی گەلی کورد و هەموو گەلانی ئێرانە. لە ساڵی١٣٣٢ دا کە ئاسۆی خەبات ڕوونتر بووە، هێمن لە «ئاواتی بەرز»دا جارێکیتر دێتەوە مەیدانی خەبات. هیوای بە خەباتی گەل زیاتر دەبێ و دەیەوێ بە شیعری خۆی لەم خەباتەدا بەشدار بێ:

فێــری زۆر دەرســــی بــەکــەڵک و باشــی کــردین تێشــکان
جــا ببینــە ڕاپــەڕیــن و شۆرشــی ئــەم جــاری کــورد
وا گـــزینگیــدا بــەیانــی جــوانــی ئــازادی بــە شــــەر
ڕۆژی ڕووناکــە، نــەمــاوە، زوڵمــەتی شــــەوگاری کــورد
ئــەو زمانــە شــیرنەی ئێمــــە پــــەرەی دەگــرێتــەوە
نــادرێ چیـــدی کتێــب و دەفتــەری ئەشــعاری کــورد

قۆناغێکی نوێ لە ژیانی گەل و شــاعیردا دەست پێدەکاتەوە. ماوەی پاشەکشە دوایی دێ و گەلی کورد خۆی بۆخەبات دواڕۆژ ئامادە دەکا. نفووزی حیزبی دێموکراتی کوردستان کە بە نهێنی تێدەکۆشێ، ڕۆژبەڕۆژ لە ناو کۆمەڵانی کوردستاندا زیاتر دەبێ. بەرەو هەوراز ڕۆیشــتنی جووڵانەوە هەتا ڕۆژەکانی گەلاوێــژی ١٣٣٢ درێژەی هەیە، لە ٢٥ی گەلاوێژەوە هەتا ڕۆژی شــوومی کودیتای ٢٨ی گەلاوێژ خەڵک لە شاری مەهاباد حوکمداری دەکا. لە ڕۆژی ٢٥ی گەلاوێــژدا خەڵکی مەهاباد بە درشــت و وردەوە هەمــوو لەگەڵ هێمن کە بۆ یەکەمجار پاش چەند ســاڵ لە کۆبوونەوەیەکی چەن هەزار کەســیدا شیعر دەخوێنێتەوە، هاوار دەکەن:

بــڕۆ ئــــەی شــاهی خائــــن! بەغــدا نیــوەی ڕێیــەت بــێ

**ئەو سەردەمە، سەردەمی نیوە دیموکراسیش زۆر ناخایەنێ. دەورانی ڕەشی پاش کودیتا دەست پێدەکا و هێمنی شاعیر جارێکی‌تر تووشی نائومێدی دەبێ و لە «تووڕەیی»دا دەڵێ:**

لەو وڵاتە کەسێک لە خەو ڕابێ
بەشی چارەڕەشی و خەم و سینە
تێگەییشتم عیلاجی دەردی من
مەستی و شێتی و نەزانینە

**یا لە «چارەنووسی شاعیر»دا دەڵێ:**

دەزانی بۆچی من هێندە پەریشان و خەفەتبارم
لەگەڵ بازاڕی ژیان غەیری هونەر نیمە چ سەرمایە
لەگەڵ چارەڕەشی و دوورەبەشی و نەگبەت دەبێ هەڵکەم
لە مێژە چارەنووسی شاعیرانی کوردی هەر وایە

**تاقی کردنەوەی ساڵانی درێژی خەبات بە هێمنی سەلماندووە کە خەبات دوور و درێژە، هەوراز و نشێوی هەیە، سەرکەوتن و شکستی تێدایە؛ بەڵام هێمن کۆڵنەدەرە:**

ڕۆڵەی کوردم فێری هەوراز و لێژم
تا زۆر بڕۆم، زیاتر ئارەق بڕێژم
کورتتر دەبێ ڕێگای دوور و درێژم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆی ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی رزگار بوون
من پەروەردەی بن سێبەری ئەشکەوتم
گەلێک جاران لە چاڵاوی ڕەش کەوتم




هاتمە دەرێ، هەدام نەدا، نەسرەوتم
دەڕۆم بەرەو ئاسۆ، بەرەو ئاسۆ ڕوون
دەڕۆم دەڕۆم تا ترۆپکی ڕزگار بوون

هەوراز و نشێوی ژیان و خەباتی گەل لە شێعرەکانی هێمن‌دا زۆر جوان دیارە. لەو کاتەوە کە دەستی بە شێعر گوتن کردووە هەتا ئەمڕۆ، شێعری هێمن ئاوێنەی قۆناخەکانی خەباتی گەلی کوردە. لە ساڵی ١٣٢٤ (١٩٤٥)ڕا هێمن بە پێشوازی پێکهاتنی حیزبی دێموکراتی کوردستانەوە دەچێ و دەڵێ:

لە سایەی حیزبی دێموکراتی خۆمان
لە باڵدار تێپەڕی ئەوڕۆکە پێ‌ڕۆ
نەما داخ و پەژارە و ماتەم و خەم
زەمانی هەلپەڕین و بەزمە ئێمڕۆ

لە ڕێبەندانی ساڵی ١٣٢٤دا کۆماری مەهاباد دامەزرا هێمن «ئەوساڵ بەهارە بۆ ئێمە زستان» یا لە «ڕۆژی خۆشی»دا دەڵێ:

گەرچی زستانە بەفر داپۆشی ئەوڕۆ گشت وڵات
خاکی پاکی ئێمە خەملیوە وەکوو باخی ئیرەم

بەڵام کۆماری مەهاباد تەمەنی کەمتر لە ساڵێک بوو. جووڵانەوەی گەلی کورد لە ئێران هەر وەک جووڵانەوەی سەرانسەری ئێران تووشی شکست بوو. هێمن لە «ڕۆژگاری رەش»دا تووشی نائۆمێدی دەبێ، وەک کۆمەڵانی خەڵکی کوردستان کە تووشی نائومێدی ببوون:

بــەفێــڕۆ چــووخــەباتمان
داگیـــــراوە ولاتمـــــان
تێپـــەڕی ڕۆژی هاتمـــان
ڕووخـــا کـۆشکی ئاواتمـان
لە پیاوی ئازا و ســەرکــەش
لە زەحمـــەتکێشـــی بێبـــەش
ئاخنـــــراوە کـــونـــە ڕەش
نابینی کەســێ ڕوو گـــەش

بەتایبەتی شـــەهید بوونی قازی، هێمنی داخدار کردووە. هەم دۆســـت و مامۆســـتای لەدەست داوە و هەم پێشەوا و سەرکۆمار.

لـــەچـــوارچرای مـــەهـــاباد
لـــە کانـــگای بیـــری ئازاد
دەســـتی ڕەشـــی ئیســـتیبداد
چـــەقانـــدی داری بێـــداد
لـــەکـــاتی نیـــوەشـــەوا
لـــە جەنگـــەی شـــیرین خـــەوا
کـــرا کـــاری نـــاڕەوا
لـــــە دار درا پێشــــــەوا

هەر لەو ســـاڵەدا هێمن لەبەر خەباتی رابردووی خۆی تووشـــی دەردی سەر دەبێ و بۆ ماوەیەک ولات بە جێ دێڵێ. دیارە وەزعی سیاســـی تەئسیری کردۆتە سەر شێعری هێمن. لە «بابردەڵە»دا دەڵێ:

منیـــــش ئــەی بلبلـــی بـــەنـدی وەکـــوو تـــۆم
وەهـــــا دوورم لـــە هێـــلانـــە و گـــوڵـــی خـــۆم
منیش وەک تـــۆ لـــە کیسـم چـــووگـــوڵی ســـوور
منیـــــش هێلانـــەکـــەم لێکــــراوە خاپـــــوور
منیـــــش بابـــــردەڵـــەی بـــەر گێـــژەڵـــووکـــەم
دەمێــــک لـــەو قولکـــە، تاوێـــک لـــەو چلووکەم

ئەو توورەیی و ڕەشی چارەنووسی شاعیر لە شێعرەکانی تریشدا هەر بەر چار دەکەوێ و هەتا ساڵی ١٣٤٠ (١٩٥٩) هەر بەردەوامە. لە «لە گلێنەی شاعیر»دا دەڵێ:

ئەگـــەر خـــەرمانـــی عـــومـــرم ئێســـتەکانێ پاکـــی بـــا بیبـــا
بـــە مـــەرگـــی تـــۆ مچـــوڕکیشـم بـــە دڵـــدا نایـــە بـــا بیبـــا
هەمـــوو عومـــری ئـــەبـــەد تێیـــــدا نییە خـــۆشـــی دەمێک مـــەســـتی
خـــــدر ئـــاوی حـــەیاتـــــی بـــۆ چبـــــوو؟ فێـــری شـــەرابی بـــا

لە «ناســـۆری تەشـــەنا»دا ڕاکردن لە ژیانی واقیعی، لەو حەقیقەتە تاڵەی کە شاعیر تووشـــی بووە و نایەوێ قبووڵی بکا، بە تەواوی دیـــارە. هێزی ئەوەی نییە ژیان بگۆڕێ، ڕێـــگای نییە خۆی دوور بخاتـــەوە، دەیەوێ ڕا بکا و بە یارمەتی مـــەی روو لە دنیایەکی خەیاڵی دەکا:

چـــۆن نـــەبـــەم بـــۆ مـــەی و مـــەیخـانـــە پـــەنـــا، تێگـــەیـــوم
لـــەو ولاتـــە هـــەمـــوو شـــــت زۆرە، بـــەنـــی ئـــادەم کـــەم
شـــەڕبـــایـــە لـــە چیـــــاکان و هـــــەوا تـــووشـە دەنـــا
وەکـــوو شـــەیتان دەمـــەویســـت ڕوو لـــە چیـــای ئەســـتەم کـــەم

ســاڵەکانی ٤٧ ـ ١٣٤٦ کە ڕاپەڕینی چەکداری لە کوردستانی ئێران بەرپا دەبێ هێمن خۆی تێیدا بەشــدار نییە، بەڵام لەگەڵ ئەو ڕاپەڕینە دەژی. هیوای بە خەباتی گەل زۆرە، باوەڕی بەهێزترە. بۆ شــەهیدانی ئەو ڕاپەڕینە دەگری، بەڵام شــێعرەکانی پڕە لە هیوا و ئاوات بۆ ســەرکەوتن. نیشتمانپەروەران بۆ تێکۆشــان هان دەدا. هێمن بیەوێ و نەیەوێ، دیسان و ئەو جارە بۆ هەمیشە لەناو مەیدانی خەباتدایە:

بـــۆ شــەهیــدێکی کە گــەوزیــوە لــەنێو خــوێــن دەگـــریم
بــۆ هــەڤاڵێکــی کــە چــوو بێ‌ســەر و بــێ‌شوێن دەگـــریم
تــا بــە دەســتی پــەری ئــازادی لەســەر گــۆڕی شــەهید
گــوڵــە شــللێرە لــە گشـــت لایــەکــی نەڕوێــن دەگـــریم

شــێعرەکانی هێمن ئیتر بۆنی ناهومێدی لێنایە. چەند ساڵە قۆناخێکی دی لە خەباتی گەلی کورد لە کوردســـتانی ئێران دەســـتی پێکردووە. قۆناخێک کـــە جێی هیوای گەلی کوردە. هێمنیش شــاعیری وەفاداری گەلی کورد، هەم لە پێکهێنانی هەم لە دەربڕینی ئەو هیوایەدا بەشدارە. لە «مەتەرێزی شەرەف»، «شەنگەبێری»، «ئامێزی ژن»، «ترۆپکی رزگاری»، «شەپۆلی تۆڵە»، «شەو و شەیتان»، «گا و گەردوون»، «کاروانی خەبات» و لە «دەسکەوتی خەبات»دا شێعری کۆمەڵایەتی و شۆڕشگێڕی چ لە باری ناوەڕۆک و چ لەباری شــێوەوە گەیاندۆتە پلەیەکی بەرزی ئەوتۆ کە کەمتر شاعیری کورد گەیاندوویەتی. هێمن ئامادەیە بۆ بەجێ گەیاندنی ئەم هیوایە خۆشی بەخت بکا:

خــۆم دەســوتێنــم هەتــا بەزمــی خــەڵــک ڕۆشــن بکــەم
کــێ لە ڕێــی خەڵــکا وەکو شــاعیر دەســوتێ، شــەم نەبــێ؟

لە ســەرەتادا شێعرەکانی هێمن لە ژێر تەئسیری دوو ڕەوتی ئەدەبی دایە. وەک هەموو شــێعری شاعیرانی کوردی سەردەمی ســی ـ چل ساڵ لەمەوبەر تەئسیری ئەدەبی فارسی لەم شــێعرانەدا دیارە. زۆربەی شــێعرەکانی شــێعری عەرووزین، وەزن و قافیەیان لەگەڵ

دەستووری شێعری فارسی ڕێک دەکەوێ. لە لایەکی‌تریشەوە شیعری شاعیرە کوردەکانی بەناوبانگ وەک «نالی» کە خۆی لە ژێر تەئسیری شێعری کلاسیکی فارسیدا بووە، تەئسیری کردۆتە سەر شێعرەکانی هێمن. بۆیە لە سەرەتادا هێمن شێعرەکانی شێوەی غەزەڵ و قەسیدە و جارجاریش مەسنەوی و دووبەیتی و هی‌تریان هەیە. هێمن ئێستاش هەر جار ـ جار دەگەڕێتەوە سەر ئەو شێوە کلاسیکە و هێندێ لە شێعرە تازەکانیشی هەر بەم چەشنە گوتراون. وەک «ئاواتی بەرز»، «گلێنەی شاعیر»، «دەسکەوتی خەبات» و هتد. لەم شێوە شێعر گوتنەدا هێمن دەستێکی باڵای هەیە. شێعرەکانی ڕەوانن، بە زمان جوان و بە مانا دەوڵەمەن.

پاش ماوەیەکی سەرەتایی شیعر کوتن، هێمن بەرەبەرە دەگەڕێتەوە سەر شێوەی ئەدەبی ڕەسەنی کوردی. خۆی لە قافیە و وەزنی شیعری کلاسیکی ڕزگار دەکا و شیعرەکانی لە بەستەی کوردی دەچن، لەو بەستەیەی کە شاعیر هەموو ڕۆژێ لە لادێ دەیبیسێ؛ بەستەیەک کە چوارچێوەی بۆ داڕشتنی شیعری کوردی لەبارترە و زمانی کوردی لە تەنگ و چەڵەمە ڕزگار دەکا و وەک چۆمێکی خرۆشانی لێدەکا کە بۆ لای دەریای بێ سنوور دەڕوا.

جار ـ جار کە ئینسان شیعری هێمن دەخوێنێتەوە، گۆرانی وەبیر دێتەوە. وا دیارە کە بە هەڵبژاردنی ئەم شێوە شیعر گوتنەدا «گۆران» لەسەر هێمن بێ تەئسیر نەبووبێ. لەم شیعرانەدایە کە هێمن دەگاتە ترۆپکی ئەدەبی کوردی و بە ڕاستی ئەدەبی کوردی پێش دەخا.

هێمن شاعیرێکی ڕیئالیستە، ڕیئالیزمی ڕەخنەگرانە لە ناوەڕۆکی شیعرەکانی هێمن‌دا بە تەواوی بەرچاو دەکەوێ. هێمن بارە هەرە گرینگ و ئەساسیەکانی تەبیعەت و ژیان و ئادەمیزاد بە چاوێکی ڕەخنەگرانەی شاعیرانە باس دەکا و کۆمەڵ بۆ بەرەوپێش چوون هان دەدا. هێمن زۆرجار لە هێندێ شیعری خۆیدا لە ناتورالیزم نزیک دەبێتەوە، ئەوەی کە دەیبینێ باسی دەکا و بە چاوی ڕەخنە سەیری تەبیعەت یان کۆمەڵ ناکا. هەروا بزانە دەیەوێ تابلۆیەکی تەبیعەت بکێشێ و بیخاتە بەرچاومان. بەڵام شیعری وای کەمە؛ وادیارە خۆشی ئاگای لێیە کە لە ڕیئالیزم دوور کەوتووەتەوە، زوو ناتورالیزم بەردەدا و دەگەڕێتەوە سەر ڕیئالیزم کە سەبکی بنەڕەتی ناوەڕۆکی شیعرەکانیەتی. ئەو ناتورالیزمە بە تایبەتی لە «بەهاری کوردستان» و «لەبیرم مەکە» و چەند شیعری‌تردا خۆی دەنوێنێ.

ژن لە شیعری هێمن‌دا ڕۆڵێکی زۆر گرینگی هەیە. جوانی ژن ئیلهام‌دەری شاعیرە. سەرانسەری دیوانی هێمن ئەو ڕاستییە دەر دەخا کە وێڕای تەبیعەت و ژیان و خەباتی

گەل، ژنە کە هێمن بۆ شیعر گوتنهان دەدا. شیعرەکانی هێمن لە سەر ژن نموونەی شیعری بەرزی کوردین. لە «کیژی لادێ»دا بە کچی کورد هەڵدەڵێ:

لاجانگت وەکوو گزنگی تاوێ
هەر بۆ خۆی جوانە، تیف تیفەی ناوێ
کوڵمەکەت وەکوو گوڵاڵەی گەشە
بێ سورمەش چاوە مەستەکەت ڕەشە
وەکوو فرمێسکی ئاشق ڕووناکی
وەکوو ئاونگی بەیانی پاکی

ئەو تابلۆیەی کە لە «بیرم مرکە»دا لە ژنی دەکێشێ، بەڕاستی جوان و نایابە، هەروەها لە «پەری شیعر» و لە «شەنگەبێری» و زۆر شیعری تردا هێمن مامۆستایی خۆی لە هۆنراوەدانان بۆ ژندا دەسەلمێنێ.

بەڵام ژن، بۆ هێمن تەنیا سەرچاوەی ئیلهام نیە. هێمن بۆ ڕزگاری ژنی کورد خەبات دەکا. لە «یادگاری شیرین»دا دەڵێ:

لادە چارشێوی ڕەشت بە دەرکەوێ کوڵمی گەشت
چون لە قەرنی بیستەما زۆر عەیبە ئەو ڕووگرتنە

هێمن دەیەوێ ژن بەرلە هەموو شتێک خاوەنی مافی ئینسانی خۆی بێ و زۆرجار دژی زۆرداری و بێحورمەتی سەبارەت بە ژن دەنگی خۆی هەڵدێنێ. هێمن ژنی خۆشدەوێ، دەیپەرەستێ و نرخی هەموو جوانیەکانی ئەو دەستکردە نایابەی تەبیعەت دەزانێ؛ بەڵام لە لای هێمن خەبات بۆ ڕزگاری گەل، بۆ ئازادی کۆمەڵانی خەڵک لە ژن خۆشەویستترە. لە «ئامێزی ژن»دا دەڵێ:

بەڵێ سەختە یەکجار سەختە، دووری لە ژن، نامرادی
بەڵام لە ژن خۆشەویستتر لەلای من ئەتۆی ئازادی!

زمانــی هێمــن زمانی کوردی پەتی و جوانە. نە پڕە لە وشــەی بێگانە و نە وشــەی دەســتکردی تێدایە. زمانەکەی زمانی کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانە. بەڵام هێمن کە خۆی خەڵکی موکریانە، تەعەســوبی بــەکار نەهێناوە و بە زاراوەی موکریانی شــیعر ناڵێ. بە تایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا زمانی هێمن نموونەی بەرزی زمانی ئەدەبی کوردییە و بێگومان لە پێکهێنانی زمانی پەسەندکراو (ستاندارد)ی کوردیدا تەئسیری هەبووە.

زمانی هێمن سادە و پەتی و ڕەوانە، هەم ئەدیب و نووسەری کورد پێی خۆشە و هەم نەخوێندەواری کورد لێی حاڵی دەبێ:

هـــەزار خــۆزگــەم بــە خــۆت شــــوانە
کــە بـــەو مانگــەشــەوە جـــوانــە
دانیشـــــتووی لــــە ڕژد و هــــەڵــدێــر
پـــەنجـــە دەبـــزوێ لـــە بلـــوێــــر
لــەگــــەڵ تــــەبیعــــەت هـــاودەمــــی
شــــادی، بــەکــەیفــی، بێخــــەمــی

«بەهاری کوردســـتان» فەرهەنگێکی بچووکی زمانی کوردییە، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی هەر لە شار ژیاون و لە زۆر باری ژیانی لادێ ئاگادار نین، تابلۆیەکی ڕاستەقینە بە زمانێکی دەوڵەمەند و بێهاوتا دەخاتە پێش چاو. ئەو شیعرە و چەند شیعری تر کە باسی تەبیعەت و ژیانی لادێ دەکەن، بۆ شارســـتانی ئەوەندە وشــەی نەبیســـتراویان تێدایە کە زۆرجار خوێنەر ســەری سووڕ دەمێنێ و ناچار دەڵێ زمانی کوردی چەند دەوڵەمەندە و بەداخەوە خزمەتی نەکراوە. لە دیوانی وەک هێمندا شــیعرە وەک «بەهاری کوردســـتان» بەڕاستی فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی زمانی کوردییە. شیعری هێمن لە تەشبیهی جوان ئاخنراوە:

خــۆشەویســـتی گــۆشــەکــەی تــەنیایی هەر ئــەژنۆکــەمــە
بۆیــە ڕۆژ و شــەو وەهــا گــرتــوومــەتــە نێــو باوەشــم

لە «شەنگەبێری»دا ئەنجامی شیعرەکەی ئەمەیە:

زۆری نەماوە بێتە بەر، نەمامی هەوڵ و خەباتم
لە داگیرکەر پاک بێتەوە خاکی پیرۆزی وڵاتم
چەک دادەنێم، گۆچانەکەی جارانم هەڵدەگرمەوە
تۆ هەر بێری بە، من هەر شوان، فریشتەی تاسە و ئاواتم

**هێندێ شیعری هێمن گەیشتووەتە پلەی هەرەبەرزی ئەدەبی کوردی کە یەکێک لەوانە «کاروانی خەبات»ە. بڕوانە چۆن باسی شەهیدبوونی رووناکبیرێکی خەباتکەر دەکا:**

هەر چوار تەنشتی گیراوە
لە سەنگەرێکدا بە تەنێ
ئەو لاوەی بەڵێنی دابوو
هەتا مردن چەک دانەنێ
رووناکبیرێکی تا ئەمڕۆ
دەچوو بەرەو ئاسۆگی روون
هێشتا هیوای بە بوولێڵ بوو
بۆ لە گەمارۆ دەرباز بوون

**بەڕاستی ئەوەی هێمن لەسەر گۆران دەیڵێ لەسەر خۆیشی راستە: «تاکی لە جوانی پەرەستیدا کەمە و وشە لە دەستیدا وەک مێوە، دڵتەڕە و خۆش خەیاڵە و ناسک بینە، بە هونەرە و شارەزا و وشە رەنگینە»**

**هیوام ئەوەیە کە: هێمن ساڵانی درێژ لەناو گەلی کورددا، لە ریزی خەباتکەرانی رێگای ئازادی گەلی کوردا، تێکۆشانی خۆی لە پێناوی رزگاری گەلەکەمان، لە پێناوی پێش خستنی زمان و ئەدەبی کوردی، هەر درێژە پێ بدا.**

**دڵنیام کە لە دوارۆژدا هێمن زۆرجار پەری شیعر دێنێتە ژوانی خۆی و دیوانێکیترمان**




پێشکەش دەکا کە شیعری کوردی جوانی تێدا بێ:

شـــیعرێک وەک خـــوناوەی بـــاران
شـــیعرێک وەک ســـــرتەی دڵـــداران
شـــیعرێک وەکـــوو دەریـــای بـــێ بن
گـــەرمتـــــر لـــە باوەشـــــی ژن
شیعرێک ســـــروودی شـــادی بـــێ
شـــیعرێک دەنگـــی ئـــازادی بـــێ

به هیوای ئەو رۆژە
عبدوالرحمان قاسملو




شــارەکەمان، شارە بچووک و تووک لێکراوەکەمان ســەقز یەکێکە لەو شارە کاولانەی کوردســتان کە لە مێژووی تاریک و پڕ کارەســاتی خوێناوی خۆیدا گەلێک جار تووشــی پەلاماری دڕندانەی دوژمن و تالآن و بڕۆ و کوشــت و کوشتار و هەڵات هەڵات و سووتمان، خاپــوور کران و چۆل بوون بووە. ڕووی خۆشــی کەمتر بە خۆیــەوە دیوە دەتوانم بڵێم هەر نەیدیوە. بەڵی شــەقز شــارێکی تووک لێکراوە. تەنانەت پاش تێکچوونی حکوومەتی ڕەزاخان پاش فەوتانی ئەو قازاخە چەکمەڕەقە و ئەو دیکتاتۆرە خوێنمژە کە خەڵکی ئێران پشوویەکی هاتەوە بەر و ئاهێکی خۆشی لە دڵی گەڕا دیسان سەقز شوومترین و ڕەشترین ڕۆژانی تاریخی ڕابوارد.

ئەڕتەشی شاهەنشاهی پەهلەوی کە دەیانگوت ئاسمانی بە سەرنێزەوە ڕادەگرێ و زەوی لە بەر پێیدا دەلەرزێ لە ڕاســت ســپای هاوپەیمانانداا بەری فوویەکی نەگرت.دەســتی بۆ چەک نەچوو،تاوێکی بەربەرەکانی نەکرد،وەک تۆوی هەرزن بڵاو بوو، وەک بڵقی ســەرئاو پووچــاوە. چەک فرێدان. بەجلــی ژنانەوە ڕاکردن و خۆ لە تەویلــەی ئاغا و دەرەبەگان ئاوێتــن، تاکتیکی ئەو فەرماندە لــووت بەرزانە بوو کە خەڵکیان بە دیل و کۆیلەی خۆیان دەزانی و لە سەردەمی دەسەڵاتی بیست ساڵەی ڕەزاخاندا کاریان زگ دڕین و گیرفان بڕین و هەژار چەوساندنەوە و دارا ڕووتاندنەوە بوو. بەلام ئەو قارەمانانەی کە لە لێقەومانەکەی شەهریوەر دا دەمانچە و شمشیرەکانیان بە چارشێوێکی ژنان دەدا و چەکمە بریقەدارەکانیان بە کەڵاشــێکی کرچ و کۆن دەگۆڕییەوە و باقیشیان دەداوە و خۆیان دەشاردەوە و لە بەر

دەستی خەڵک، خەڵکی تووڕە و داخ لە دڵ هەڵدەهاتن،نازانم چۆن بوو پاش ماوەیەکی کەم سەروسـەکوتیان لە سەقز پەیدا بۆوە؟ نە حەیا و نە شەرم، وەک نە بایان پێدا هاتبێ نە بۆران، بە بەرگی بە زەرق و بەرقەوە، بە سەردووشـی مەنگوڵەدارەوە، بە چەکمەی ڕەش و خرینگە خرینگی مامزانەوە وەک ڕۆمێل لە خەیابانەکانی سەقز دا بە گەڕان و خۆ بادان و قەمچی هەڵسووڕاندن و پۆز لێدان.

بێجگەلە ڕۆمێلەکانی خۆ وڵاتی و خۆماڵی قیافەی نامۆ و سـەیر سـەیریش وەبەرچاو دەهاتن. ئەفسەری سوورە زرتە و قەڵەو و درێژ و زەلام، سەربازی ڕەشی،لاوازی مردەلۆخە، وا دیـار بوو بێگانـەن، هێندێکیان لەو بەری دەریاوە بۆ پاراسـتنی خۆیان هاتوونە ئێرە ئەوانی دیکەش لەئاسـیای دوورەوە ڕست کراون و بە زۆری زۆردار هێنراونە ئەم وڵاتە کە لە پێناوی سوودی «ساحێب» دا ببنە قۆچی قوربان.

من ئەو دەمی نا کە مێرمنداڵێکی چاو نەکراوە بووم، بەڵکە ئێستاش کە هەزار پەند و گۆڵمەزم بە سەر هاتووە و زۆرم چەرمەسەری و کوێرەوەری و دەربەدەری دیوە هیچ سەرم لە زاراوەی لەشکری دەر ناچێ. بەڵام لە بیرمە ئەو کەسانەی لەو سەردەمە دا سەریان لە سیاسەت دەخورا و دەمیان لە شتی وا وەردەدا دەیانگوت:

وەزعی سـتراتێژیکی سەقز ئەوە هەڵدەگرێ. دەیانگوت هۆی گرینگی چارەڕەشی ئێمە هەڵکەوتنی جوغرافیایی ئەم شارەیە. دەیانگوت سەقز دەروازەی کرماشان و قەسری شیرین و تەنانەت ئەو دیوی سـنووری ئێرانە کە کانگا نەوتەکانی دەربەسـت لەدەستی ساحێب دان. دەیانگوت شەپۆلی تووڕەیی و بیری دژی ئیمپریالیستی خەڵکی ئێران و جووڵانەوەی ئازادیخوازانەی گەلانی ئەم وڵاتە نەترەی ئیمپریالیسـمی بردووە و مەترسـی گەورەی بۆ ئیستیعمار پەیدا کردووە. زۆر شتی دیکەیان دەگوت کە من سەرم لێ دەرنەدەچوو و تێی نەدەگەیشتم.دەیانگوت هەر بۆیەش ئیستیعمار ناچار بووە ئەم ئەرتەشەی بە دەستی خۆی تەفر و تونای کردبوو سـەرلەنوێ زیندوو بکاتەوە و گەورەکانی بکاتە نۆکەری خۆی و لە سەقز مۆڵیان بداتەوە. چونکە مردووی خۆیەتی و بە دەستی خۆی ناشتوویەتی و دەزانێ چییە و تێی ڕانابینێ دەس بکاتەوە، ئەم سـوورفلانەی هێناوە نەخشەی بۆ بکێشن و ئەم دیلانەی هێناوە پشتی بگرن و خەریکە بە هەموو هێزی خۆی ئەم دەروانە، بپارێزێ.

لەو سـەروبەندانە دا کە ئێمـەی خەڵکی لێقەوماوی هەژاری سـەقز لە ژێر جەزرەبە و ئەشـکەنجەی ئەرتەشـی شاهەنشـاهی و ئاغاکانیدا لە ئاویلکەی گیان کێشاندا بووین، جووڵانەوەی ئازادیخوازی لە سەرانسـەری ئێراندا برەوی ئەسـتاندبوو بەتایبەتی فیرقەی



دێمۆکراتی ئازەربایجان ڕۆژ بە ڕۆژ زنجیری کۆیلەتی لە دەس و پێی گەلەکەی دەپساند و بەن کەڵەوەی نیری دیلی هەڵدەبڕی و حیزبی دێمۆکراتی کوردســتان ئاڵاهەڵگری خەباتی گەلەکەمان،بە ڕابەری ڕۆڵەی بلیمەت و هەڵکەوتی کورد پێشــەوای خۆشەویســت قازیی موحەمەدی نەمر، تەنگی بە ئیستیعمار هەڵچنیبوو و ڕەگوڕیشەی لە هەموو لایەک دا کوتا بوو و، لک و پۆپی بۆ هەموو مەڵبەندێکی کوردستان هاویشتبوو.

ڕێکخراوی حیزبی شــارەکەی ئێمەش سەرەڕای ئەو هەموو کەند و کۆسپەی لە پێشدا بوو،لە ژێر چاوەدێری توندی شــا و ئیستیعمار دا ئازایانە خەباتی دەکرد و ژیرانە چالاکی دەنوانــد و پەیوەندی نهێنــی و بەردەوامی دەگەڵ مەرکەزی حیزب لە مەهاباد نەدەپچڕا و پەیکەکانی حیزب بە شــەو و نیوەشەو هەر لە هاتوچۆ دا بوون، بەیاننامە و ڕۆژنامەکانی حیزب بە نێو خەڵکدا بڵاو دەکرانەوە.

پاش ئەوەی حیزبی دێمۆکراتی کوردســتان بە یەکجاری ســەرکەوت و کاربەدەستانی تارانــی لە موکریان و ئەولاتریش دەرپەڕاند و جمهووری کوردســتان دامەزرا،هێزی گەل و پێشــمەرگە گەمارۆی سەقزی دا ئیتر حکوومەتی تاران بە جارێکی زراوی تۆقی و حەزیای برینداری ئیســتیعمار بە تەواوی ئاوڕووژا و گەزارەی دەرکێشــا و ژەهری پیسی خۆی بە سەر ئێمە دا ڕژاند.ڕۆژ نەبوو پۆلێک لاو نەگیرێن، نەخرێنە بەندیخانەوە یا بەرێ نەکرێن بۆ پشتی جەبهە.شەو نەبوو دەستەیەکی دیکە خۆ ڕزگار نەکەن و پەنا نەبەن بۆ کوردستانی ڕزگارکراو کە ئامێزی بۆ هەموو کوردێکی نیشــتمانپەروەر و هەموو ئازادیخوازێکی جیهان ئاواڵا بوو،لەو لاشەوە ئەو دەرەبەگ و خاین و خۆفرۆشانەی کە حیزب دەرتانی خەیانەت و خراپەی لێ گرتبوون و ماوەی نەدەدان خوێنی مسکین و هەژاران چیدی بمژن و ئێسکیان بکرووســنەوە بە پەلە پڕووزە خۆیان لە ئامێزی شاهەنشــا دەهاویشت. ئەم حەمەڕەزایەی ئەمڕۆ بێ شــەرمانە دەڵێ من شــای پێخواسانم و بەردی دڵسۆزی بۆ جووتیار و کرێکارلە ســینگ دەدا.ئێستاش ئەو دەرەبەگانەی ئەو ســەردەمی خەیانەتیان بە گەل و نیشتمانی خۆیان کرد بە زەبری نووکی نێزە دەکاتە نوێنەر و سەناتۆر.

بە کورتی ســەقز بوو بە کەشــتی نووح و لە هەموو تۆ و تەرەمەیەکی تێ خزا.چونکە تەویلەش نەمابوو جاشی تێ بکرێ ئاغاوەتەکانیان وەک گا و گۆل بە سەر خەڵکدا بڕی و بەزۆری لە ماڵان دایان مەزراندن. خاوەن ماڵ ناچار بوو لەو قات و قڕ و گرانییە بەسامەی کە لە کاتی شەڕ لە هەموو جێگایەک بە تایبەتی لە سەقز دا هەبوو لە زاری ژن و منداڵی خۆی بگرێتەوە و گا و گۆلی شــا دابەســتێ. ئەگەر ئاغا بەرچایی ڕۆنی کەرە و هێلکە و هەنگوین و مرەبا و نیوەڕۆژی چلاوکەباب و شــێوی شەوانەی گۆشت و فرووج و قەلەموون

نەبوایە و شەو چەلەشی لێ بڕابا خاوەن ماڵ پێشمەرگە یا بە قەولی ئەوان «موتەجاسیر» بوو. دەسبەجێ ڕاپۆرتی لێ دەدرا و دەیانبردە دیژبان و تێر و تەسەل دەیان کوتا و سەر و گوێلاکیان دەشکاند و زۆر جاریش بێ سەروشوێن دەچوو.

لەو ســەردەمیدا کە لە سایەی خەباتی حیزبێکی شۆڕشــگێڕ و ئازادیخواز و زانایی و دڵسۆزیی پێشــەوا و ڕابەرێکی بلیمەت بەشێکی کوردستان هەر لە بەستێنی ئاراسەوە تا نیزیکترین گوندی سەقز ئازاد ببوو و گەلەکەمان لەو پەڕی خۆشی و ئازادی و سەربەرزیدا دەژیا و وەک دەڵێن «گورگ و مەڕ پێکەوە ئاویان دەخواردەوە» حاڵی خەڵکی شارەکەی ئێمە لە حاڵی کۆیلەکان گەلێک ناخۆشــتر بوو. بۆیە من ســەقزم نێو ناوە شــاری تووک لێکــراو. ڕۆژ نەبوو دیژبان، کاســب لە دووکان نەهێنێتە خوارێ وەبەر شــەپانی نەدا یا گزیری ئاغا کەشیدە لە ئەستۆی چەند حاجی نەکا و ئاتەگی چەند مەلا نەبڕێ. خۆ ئەوەی ڕاوێژکاران و کارناسانی بێگانە دەیانکرد ئەگەر لە ڕووم هاتبا بیگێڕمەوە مچوڕک بە لەشی هەموو ئینسانێکی خاوەن شەرەف و بە نامووس دا دەهات.

ئیستیعمار هەمیشە لە شارەکەی ئێمەوە نەخشەی ڕووخاندنی جەمهووری دێمۆکڕاتیکی کوردستانی دەکێشا. چەند جار ئەرتەشی شاهەنشاهی شنگڵی لە خۆی دا و هێرشی بردە ســەر سەنگەری ئازادی و بەرەنگاری پێشــمەرگەی کورد بوو.بەڵام دیتمان چۆن بە شڕ و وڕی گەڕایەوە وڕقی خۆی بە ئێمەی بێ چەک و بێ دەرەتان ڕشت.

داخــی بە جەرگەم گەندەڵ فێڵی ئیمپریالیزم کاری خۆی کرد و شــای خایین کوتوپڕ هێرشــی هێنا سەر حکوومەتی ئازەربایجان وپاش ساڵێک تەورێزی قارەمان داگیر کراوە و ســێڵاوی خوێنی تێدا جاری بوو.مەهاباد قیبلەی ئاواتی نەتەوەی کورد، لە هەر چوارلاوە ئابلۆقە درا و بێ پشــتیوان ماوە. جا ئەمجار ئەرتەشــی شاهەنشاهی لە سەقزەوە بەرەو مەهاباد کەوتە ڕێ.ئەوەی نەدەبوو ببێ، بوو. کۆمارە خۆشەویســتەکەمان ڕووخا، پێشەوا مەزنەکەمــان بــە خۆی و هاوڕێیەکانیەوە گیران. پێتان ســەیر نەبــێ ئەودەمیش یەکەم زەربەتی جەرگبڕ وەشارەکەمان کەوت و هەوڵ ڕیزی سێدارە لە سەقزی بێ فەڕ چەقی.

بەیانییەکی ســاردی زستانی ســەقز بوو،کاتێ خەڵک لە ماڵ وەدەرکەوتن چ ببینن؟! کافــر نەبینێ، یازدە ســێدارە چەقیبوو، یازدە ڕۆڵەی نەبەز، یــازدە قارەمانی کۆڵنەدەر، یازدە پیاوی تێکۆشــەری کوردیان پێوە هەڵاوەســرا بوون. بەشــی زۆری ئەم شەهیدانە لە عەشــیرەتی پێشــکەوتوو و نیشــتمانپەروەری بەگزادەی فەیزوڵابەگی بوون کە مێژوو شاهیدە ئەم عەشیرەتە لە پێکهێنانی حیزبی دێمۆکڕاتی کوردستان و دامەزراندنی کۆماری




کوردستاندا چ نەخشێکی گەورە و بەرچاوی هەبووە. لە نێو ئەم شەهیدانە دا ئەحمەدخانی فاروقـــی مەزنـــی بەگزادان و دوو برا نۆجوانەکەی دەبینران کە هێندە لە مێژ نەبوو بە فێڵ گیرابوون و بە تاوانی کوردایەتی بێ موحاکەمە و لێپرسینەوە حوکمی ئێعدامیان درابوو.

ئەفسەرێک کە ئەو حوکمەی پێ ڕاگەیاندوون لە زۆر جێیان و بۆ زۆر کەسی گێڕاوەتەوە:

نیوەشـــو بۆ خۆم و چەنـــد گرووبان لەو ژوورەی ئەو ســـێ برایانەیان تێدا بەند کرد بوو وەژوور کەوتم، چرایان دایســـا تەماشام کرد ئەحمەدخان ئانیشکی داوەتەوە و سیغار دەکێشێ و براکانی لە خوارەوە بە ئەدەب لە سەر چۆک دانیشتوون.سام گرتمی، بە مینگە مینگ حوکمەکەم پێ ڕاگەیاندن.پێم سەیر بوو هیچیان نەبزرکان، هیچیان ڕەنگیان نەگۆڕا و ڕانەچەنین. ئەحمەد خان بە شێنەیی سیغارەکەی کووژاندەوە و گوتی:

«مـــن بیرم لـــەوە کردبووەوە، ئـــەم ڕۆژەم لە پێش چاو بوو و دەمزانی لەســـەر ئەم بیروڕایەی هەمە تووشـــی شـــتی وا دێم. بەڵێ، من کوردم، دێمۆکراتـــم، ئازادیخوازم، من دژی ڕێژیمی بۆگەنی پاشـــایەتیم و دژی دەسەڵات شوومی بێگانەم و چارەنووسی پیاوێکی وەک من لە ئێرانی ئێســـتا دا هەر ئەوەیە. هیچ چاوەنۆڕی بەزەییم لەو ڕێژیمە نەکردووە و ناکەم. بەڵام شایەکەی ئێوە کە لافی کۆمەڵناسی لێ دەدا، دەبوو ئەوەندەی زانیبایە ئێمە عەشیرەتین و لە نێو عەشیرەتاندا تاوان هەر ئی مەزن و برا گەورەیە چونکە برای بچووک بە پێی ڕێوشوێنی عەشیرەتی ناچارە وەدوای براگەورە بکەوێ و لە قسەی نەچێتە دەر، لە بەر ئەوە نەدەبوو حوکمی وا زۆردارانە و بێ ڕەحمانە و ناپیاوانە لە سەر براکانم بدا.»

هێشتا ئەحمەد خان قسەی مابوو بیکا کە عەوڵاخان وەجواب هات و گوتی:

« کاکە گیان! کاکی بەڕێز و بەرزم! مایەی ســـەربەرزی بنەماڵەکەمان! زۆر جێی داخە کە لە ئاخری ژیانمدا قســـە لە قســـەی برا گەورەی خۆمدا بکەم و ئەم ڕاســـتییە بدرکێنم کە ئێمە زۆر لەپێش جەنابتدا ئەم بیرو براوەیەمان پەســـند کردبوو وچووبووینە نێو ڕێزی حیزبـــەوە. ئەگەر خودای نەکردە تۆش نەچووبایەی نێو ڕیزی حیزبەوە و ئەم بیروبڕوایەت قبووڵ نەکردبایە و ڕێبازی شەرەف و کوردایەتی و ئازادیخوازیت نەگرتبایە و بۆ پاراستنی موڵک و ماڵ و شـــتی وا پشـــتت لە نەتەوەکەت کردبایە ئێمە لە ڕەســـمی عەشیرەتیمان هەڵـــدەدا و قەت شـــوێنت نەدەکەوتین. بەڵکوو پێم وایە یەکـــەم لوولەی تفەنگ، تفەنگی پێشمەرگەی کوردستان کە بەرەو سینگی تۆ ڕادێرابایە لوولەی تفەنگی براکانت دەبوو.»

حەمە خان کە تائێستا بێدەنگ بوو گوتی:

« ئەرێ ئەم کەند و کۆژەی بۆ چییە؟ هەســـتن هەر ســـێکمان بڕۆین، بەرەو شەرەف،





بەرەو شانازی، بەرەو مەرگی پیاوانە، یان باشتر بڵێم بەرەو ژیانی ئەبەدی».

ئەحمەدخان هەستا لاچاوی براکانی ڕامووسی و ئەوانیش دەستی ئەویان ماچ کرد و کەوتنە ڕێ.

تا ئێرە لە زمانی ئەو ئەفسەرە بیستراوە کە خۆشی کورد بووە.بەڵام لە بن دار دا زۆر کەس ئاگای لە ئازایەتی و پیاوەتی و نەترسیی ئەوان بووە و شیعاری کوردانە و ئازادیخوازانەی ئەم سێ برا قارەمانانەی بیستووە.

کاتێک ئەم هەواڵەدڵتەزێن و جەرگبڕە بۆ «زێڕوەشان» خانمی دایکی شەهیدەکان کە لە سەر بەرماڵ خەریکی نوێژ و دۆعا بوو دەبەن، لە پێشدا عاتیفەی دایکەتی تینی دەدا و بە نینۆک هەر دوو لا ڕوومەتە قەڵەوەکانی وا دەڕنێ کە خوێن لووزەو دەبەستێ. بەڵام زوو دێتەوە سەرخۆ و کوڵی دەنیشێتەوە و زۆر بە ویقار و ئارامی بەرەو مەیدانی ئێعدام دەکەوێتە ڕێ. لەو ئاپۆرە نیزیک دەبێتەوە کە بە خەم و پەژارە و گریانەوە کۆ بوونەوە.خەڵکەکە بە دیتنی ئەم خانمە بەڕێزە و ئەم دایکە دڵسووتاوە کە بە دەستی شا قەت کەسی نەماوە و وەجاغی کوێربۆتەوە لە گابۆڕ دەدەن.بەڵام ئەو ناگری،نێوچاوانی گرژ دەکاو لێوی دەکرۆژێ و سەربەستانە دەچێتە پێش. ڕێی بۆ دەکەنەوە تا دەگاتە ئەو ئەفسەر و سەربازانەی کە لە دەورەی سێدارەکان کێشک دەکێشن. ئەوانیش بێ ئیختییار دڕ دەدەن. دەگاتە بن داری کوڕەکانی کەمێک لەژێڵلا تێیان دەفکرێ و دەڵێ:

« دەک ڕۆڵە ڕووتان سپی بێ وەک ڕووی دایکی خۆتان سپی کردووە. من بۆتان ناگریم، قوڕتان بۆ ناپێوم، شینتان بۆ ناگێڕم. چونکە ئێوە پیاوانە ژیان و پیاوانە چوونە سەر سێدارە. ئێوە لە سەر دزی و پیاوکوژی و خەیانەت و جاشەتی نەکووژراون. ئێوە لە ڕێگای ئازادی مە دا، لە سەر کوردایەتی، لە سەر ئابڕوو و شەڕەف و لە پێناوی ڕزگاری ئەم گەلە زۆرلێکراوە شەهید کراون و هەرگیز بە مردووتان نازانم.»

لەو حاڵەتە دا فەرماندە مچ و مۆڕەکەی سەقزیش تەریق دەبێتەوە ولێی دەچێتە پێش و سەرەخۆشی لێ دەکا، شێرە ژن بێ ئەوەی سپاسی بکا پێ دەکەنێ و دەڵێ:

« داخوا ئەم شۆڕە سوارانە دانابەزن؟»

گۆیا ئەمری شاهەنشا وا بوو سێ ڕۆژ تەرمی شەهیدەکان بە هەڵاوەسراوی بمێنێتەوە بەڵام فەرماندە وا لە بەرامبەر ئەم غیرەتەی شێرەژن دا شەرمەزار دەبێتەوە دەستوور دەدا تەرمەکان داگرن. «زێڕوەشان خانم» کوڕەکانی ماچ دەکا و لەو خوێنەی بە ڕوومەتیدا دێتە خوار لە کوڵمەیان هەڵدەسوێ،مەلایەک لەوێندەرێ دەبێ و دەڵێ: «خانم بۆ وا




دەکەی؟» جوابی دەداتەوە: « مامۆســـتا! کوڕێکی لە من بووبێ و شـــیری منی خواردبێ و لە کۆشـــی من دا پەروەردە بووبێ دەزانم لە مردن ناترسێ... بەڵام خۆت دەزانی پیاوی بـــێ گیان ڕەنگی دەپەڕێ. بۆیە کولمەیان ســـوور دەکەم تـــا دوژمنان بیرنەکەنەوە کوڕی زێڕوەشان لە مردن ترساون!».

١- ساڵی ١٣٥٠/ ١٩٧١ بە بۆنەی ٢٥ ساڵەی کوشتارەکەی سەقز ئەم داستانە لە کۆڕی یەکێتی نووسەرانی کورد لە بەغدا خوێندراوەتەوە و لە ژمارە ٢ی گۆڤاری «نووسەری کورد» دا چاپ کراوە.

٢- خەلیل خانی باوکی ئەم شـــەهیدانە ســـۆفییێکی بە ناوبانگ بووە، ڕەنگە داســـتانی حوسێنی حەلاجی بۆ خێزانەکەی گێڕابێتەوە،خوێن تێ هەڵســـوونی ڕوومەتی شـــەهیدەکان لە داستانی حوسێن دەچێ.

هێمن



## یەکەم ڕۆژنامەی کوردی

کەم مێژوونووسی ئێرانی هەیە ددانی خێری پێدا هێنابێ، شتێکی وێچووی لەبارەماندا نووسیبێ، کەم یا زۆر سەروسەکوتی نەکوتابێ، سەیرە، بەراستی سەیرە، لەوەتی مێژوو نووسراوەتەوە ئێمە وەکەس نەڕژاوین، هەڵمان نەکوتاوەتە سەر مڵک و ماشی کەس، دەستمان بەکڵاوی خۆمانەوە گرتووە با نەیبا. هەر دوژمن گەمارۆی ئێمەی داوە، هەر نەتەوەی تر پەلاماری بۆ ئێمە هێناوە، هەر بێگانە بەگژ ئێمەدا هاتووە، هەر زۆردار ویستوویەتی بمانگرێ، بمانکوژێ، بمانکوتێ، تالانمان بکا، خاو و خێزانمان وەدەشتێ بخا و ماڵ و حاڵمان لێ تێکوپێک بدا و ژیانمان بشێوێنێ. هەمیشە هەر داگیرکەران هێرشیان هێناوەتە سەر نیشتمان و زێدەکەمان و ویستوویانە وڵاتی باب و باپیرمان لێ داگیر بکەن. ئێمە ئەگەر دەستەوەکەریمان کردووە، ئەگە بۆ بەربەرەکانی ڕاپەڕیوین، ئەگەر داومانەتە چیا، ئەگەر ڕۆبووینە چەک، پێشی زۆردارمان گرتووە، بەگژ داگیرکەر داهاتووینەوە، تەنیا و تەنیا بۆ پاراستنی گیان و ماڵ و ناموسی خۆمان بووە.

جا جاری وا بووە قوربانیی زۆرمان داوە، خوێنمان بەلێشاو ڕژاوە، لەشمان بەکەڵەکە لە مەیدانێ بەجێ ماوە و منارە لە سەری شەهیدانمان دروست کراوە. جاری واش بووە بەدەستمانەوە هاتووە بەرسینگەمان لە دوژمن بڕیوەتەوە، دامان پەلۆسیوە، دابڕ دابڕمان تێ خستووە، تەنانەت جوقەوارمان لێ بڕیوە، بەڵام لە هەموو حاڵێکدا هەق هەر بەلای ئێمەوە بووە. چونکە بەرگریمان کردووە، لە بناری چیا سەخت و هەزار بەهەزارەکانی

خۆماندا وەدەست هاتووین. بەرگریش مافی ڕەوای هەموو زیندەوارێکی سەر ئەم جیهانەیە و بەتاوان ناژمێردرێ. کەچی مێژووی زۆرداران بخوێننەوە، تەماشا بکەن، هەر ئێمە تاوانبار و گوناهکارین، هەر ئێمە پیاوخراپ و بەدناوین. بۆ؟ چونکە بێ هێز وبێ دەسەڵاتین. چونکە قەڵەم بەدەس دوژمنانەوە بووە. مێژوونووسەکانی بێگانە کە زۆربەیان بەنانی زۆرداران چاویان پشکوتووە و بەورکەی داگیرکەران بەخێوکراون پێیان لە ڕاستی خستووە و واقیعیان شاردۆتەوە. هەزاران جنێوی سەر بەکوڵکەیان پێداوین و قسەی سارد و سووکیان لە پارسەنگ ناوین و تووک و لەعنەتیان لێ کردووین، کە بۆچی دەستمان لەسەر دەست دانەناوە تا خاوەن شکۆیان بەهاسانی بمانکوژن؟ بۆچی چاومان دانەیەشتووە تا بەکەیفی خۆیان دەستدرێژی بۆ ماڵ و گیان و نامووسمان بکەن؟ بۆ وەدەست هاتووین؟ بۆ بەرگریمان کردووە و بۆ بەجارێکی نەتواوینەوە؟ سەرانسەری کتێبی ئەو مێژوونووسانە پڕن لە هێرشی ناڕەوا بۆ سەر نەتەوەی زۆرلێکراو و بەشخوراوی کورد. بەڵام لە لابەلای لاپەڕەکانی ئەم کتێبە پڕ لە تەوس و پلار و لاتاوانەشدا جاروبار دەتوانین ترووسکایی ڕاستی بدۆزینەوە.

بۆ نموونە لە نیوەی دووهەمی چەرخی بیستەمدا لە ساڵی ١٣٥٠ی هەتاوی ١٩٧١ی زاینیدا کتێبێک بەناوی «اوضاع ایران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه» نووسراوی (محمد تمدن) بڵاوبۆتەوە کە بەڕاستی پەڵەی شەرمە بەداوێنی زانستەوە. ئەم کتێبە کە کابرایەکی ئازەری بە فارسییەکی نارێک و نالەبار و پڕ لە غەڵەت و پەڵەت نووسیویەتی، پڕە لە جنێو و قسەی سووک و گاڵتەکردن بەگەلی کورد لە کوردستانی ئێران کردووە و وەک گوتوویانە «کارێکی پێ کردووین با بەدەواری شڕی ناکا». بەتایبەتی هێرشی وای بردۆتە سەر شەهیدی ڕێگای ڕزگاری گەلی کورد، قارەمانی کۆڵنەدەر سمایل ئاغای سمکۆ کە قەت ئەسکەندەر بەگی تورکمان خاوەنی «عالم آرای عباسی» نەیبردۆتە سەر ئەمیرخانی برادۆست، خانی لەپ زێڕین. بەڵام دەکرێ مێژوونووسێکی ورد و وریای کورد زۆر ڕاستی وا کە نووسەر بەراوەژووی نیشان داون لە لابەلای ئەم کتێبەدا بدۆزینەوە. بۆ نموونە ئەم نووسەرە باسی یەکەم ڕۆژنامەی کوردی دەکا کە پەنجا و چوار ساڵ لەوەی پێش (١٣٤٠ی کۆچی) لە کوردستانی ئێران بڵاوبۆتەوە وئێمە زۆرمان لەسەر نەدەزانی، کلێشەی ڕۆژنامەکەشی چاپ کردووە. من لێرەدا دەمەوێ ئەوەی ئەم کابرایە لەسەر دەرچوونی ئەم ڕۆژنامە نووسیویەتی بکەمە کوردی. لە لاپەڕەی ٣٦٩ لەژێر عینوانی «سمیتقو و روزنامه کردی»دا نووسیویەتی:

ڕۆژێک شێخ عەبدوڵڵا «لەو پیاوە تێگەیشتووەکانی سمیتقۆ لە خزمانی سەید تەها»

هاتە لای من و لەنێو قسـاندا گوتی: ئاغا «یانی سمیتقۆ» دەیەوێ لە ورمێ ڕۆژنامەیەک بـڵاو بکرێتەوە، ئایا بەڕای تۆ بەچ ئەندازە و تیراژێک دەتوانین ڕۆژنامەیەک لەو شـارەدا بڵاوبکەینەوە؟ کە هەم سەنگین بێ و هەم جوان و سەرنج ڕاکێش؟

نووسەر لە جوابی شێخ عەبدوڵلادا وای گوت:

«بەداخەوە پیتەکانی چاپخانەی ئێمە زۆر کەمن، بەشـی چاپی ڕۆژنامە ناکەن. شێخ عەبدوڵلا کە ئەم وەڵامەی بیست، بەتوندی گۆڕا و حاڵی شێوا. منیش ترسام و لە هەڵەی خۆم گەیشتم و گوتم:

ئەگەر وێـڕای کرێکارانی دەزگای خۆمان تێ بکۆشـین لەوانەیە کـەم و کورییەکانی نەهێڵین و بتوانین ڕۆژنامەکە بڵاوبکەینەوە. بەڵام دەبێ زۆر زەحمەت بکێشـین تا ئامرازی پێویست ئامادە بکەین».

لێرەدا ڕەنگ و ڕووی شێخ عەبدوڵلا کرایەوە و هیچ جوابی نەداوە. ئەگەرچی ئەو بەڵێنی دا کە هەقدەسـتی کاریەدەسـت و کرێکارانی چاپخانەکە بدا، نەدەکرا لەو ڕۆژیدا پشت بە بەڵێنی کوردەکان ببەسـترێ. چونکە سەرپێچی لە فەرماندە سـمیتقۆ لەو هەلومەرجیدا گاڵتـە بەگیانی خۆکردن بوو. پاش ئەوەی چەند ڕۆژێـک لەو بارەدا بیرم کردەوە، عەقلم بە هیچ کوێ ڕانەگەیشـت. ناچار کتێبخانە و چاپخانەکەی خۆم داخسـت، شەوێ دەگەڵ نۆکەرێکم و چەند بەڵەدی دیکە لە شـاری وەدەر کەوتم). لێرەدا نووسـەر باسی ڕاکردنی خۆی دەکا و پێوەندی بەئێمەوە نییە و لە ئاخری لاپەڕەی ٧٣٠ دا دەست پێ دەکاتەوە:

بەڵێ پاش ڕاکردن و ئاوارەبوونی بەناچاری من، سمیتقۆ دەستووری دابوو کە کتێبخانە و چاپخانەکەم داگیر بکەن. مەلا محەممەدی تورجانی ناوێکیشی مەئموور کردبوو ڕۆژنامەی کـوردی چاپ و بڵاو بکاتەوە و ئاغای مەلا موحەممـەدی تورجانیش نەیکردبووە ناپیاوی بەشـێکی لە کتێبە بەنرخەکانی کتێبخانەی من هەڵگرتبوو و بردبوویەوەماڵە خۆی. هەر بەوەندەوە ڕانەوەستابوو، ناوی چاپخانەکەشـمی گۆڕیبوو. تابلۆی چاپخانەی «تمدن»ی فڕێ دابوو و تابلۆی چاپخانەی «غیرەت»ی هەڵاوەسیبوو. ڕۆژنامەیەکیان بەزمانی فارسی و کوردی بڵاوکردبۆوە کە حەوتووی جارێک دەردەچوو. ناوی «ڕۆژی کورد شەوی عەجەم» بووە کە دوایە بۆتە «ڕۆژی کورد» و ئاخری بۆتە «کورد».

نووسـەر چەند لاپەڕەی دیکەی بەباسی شەڕ و کێشـە و کارەساتەکانی نێوخۆی ئەو سەردەمی ئێران ڕەش کردۆتەوە و دیسان بای داوەتەوە سەر باسی سمکۆ و نووسیویەتی:

«خەڵک کە بە هیوا بوون هێزی دەوڵەتی سـمیتقۆ ڕام و بەردەست بکا، کە خەبەری

ڕاپەڕینــی (لاهووتی) و کوژرانی (خالۆ قوربان) و ڕاکــردن و بڵاوبوونی چریکەکانی ئەو و هاتنی ســەید تەهایان بیســت بەجارێکی ناهومێد بوون. لەو لاشەوە کوردەکان بەو زاڵ بوونانە ئازاتر و باو خۆشتر و لەخۆباییتر دەبوون.

ئەمجار سمیتقۆ بێجگە لە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی کوردی «کورد» لە ورمێ ڕێکخراوێکی بۆ وەرگرتنی گومرگیش دروســت کردبوو، لەهەر شــتێکی کە خەڵک لە ورمێڕا دەیانبردە شارەکانی تر (مراغە - خۆ - تەورێز) گومرگی دەستاند و پەتەی چاپی بەکوردی دەدانێ. کوژرانی خالۆ قوربان لە ڕۆژنامەی کوردەکان، کە بەناوی کورد چاپ کراوە و بڵاوبۆتەوە، بەڵگەی بەنرخی تێدا هەن، ئێمەش لێرەدا بڵاوی دەکەینەوە.

نووسەر ئەسڵی پاشکۆی فارسی ڕۆژنامەکەی لە لاپەڕەی ٣٨٠ دا چاپ کردووە. ئەوەتا منیش دەیکەمە کوردی.

## *کارەساتی کوژرانی خالۆ قوربان*

لە پاشکۆی ژمارە دووی ڕۆژنامەی «کورد» چاپی ورمێ «هەواڵنووسی ئێمە دەنووسێ: کوژرانی خالۆ قوربان و شــکانی لەشــکرەکەی بۆ ئاگاداری خوێنەرانی خۆشەویست ڕوون دەکەمەوە. ڕۆژی ٢٨ ی ڕەمەزانی ١٣٤٠ لە کاتێکدا کە لەشــکری کورد لەژێر فەرماندەیی «ســەید تەها ئەفەندی» لە دەوروپشــتی گوندی «قوزلو»ی خاکی هەوشــار خۆی بۆ پەلاماربردنە ســەر «ســایین قەڵا» ساز دەکرد، خەبەری دەســتدرێژی «خالۆ قوربان» لە «میاندواو»ەوە بۆ «شــاروێران» و «ســابڵاغ» بەهۆی دوو سواری سەرداری موکری گەیشــت. هەر دەســبەجێ ڕوو لە ســابڵاغ کراوە. شــەوی ٢٩ ی ڕەمەزان لە «بۆکان» مانەوە، بەیانی زوو ڕۆیشــتن. دوو ساعەتی ڕۆژ مابوو مەزنی عەشیرەتەکان لە دەوروبەری گوندی «دەرمان» دەگەڵ ســەید تەها ئەفەندی کۆڕی ڕاوێژ و وتووێژیان گرت، نەخشەی پەلاماربردنە سەر خالۆ قوربانیان کێشا، ئاوایان دانا:

«جانگیر بەگ» لە عێلی هەرکی، «ئەسکەندەر خان» لە خەڵکی برادۆست «هەمزاغا» لە عێلی مامەش «ئەمیر ئەسعەد»ی دێبۆکری و «سالار سەعید» لە خەتی «لاچین»ەوە بچن. بڕیاریان دا لە جەنگەی بوولێلی بانگی شــێواندا، لە ســاعەتی دیاریکراودا، لە سێ لاوە پەلامار بەرن و تەقە دەســت پێ بکرێ. «ئەمیرولعەشــایر» و «ئەمیر ئەسعەد» و «ســالار ســەعید» بەپێی بڕیاری گشتی لە تاریک و ڕوونی بەیانی ٢٩ ی ڕەمەزاندا لەسەر

کێوی «زاوا و بووک»ڕا لەشکری خالۆ قوربانیان کە لەسەر تەپکی «داشا مەجید» لەنێو سەنگەراندا دامەزرابوون، دایە بەردەسترێژ. لە هەردووک لاوە شەڕ دەست پێ کرا.

سوارانی کورد نەیانهێشت شەڕەکە درێژەی بکێشێ، لەسەر جڵەوان ڕکێف کوت هەڵیان کوتا سەر لەشکری عەجەمان، خۆیان دەپاڵ هاوێشتن، بەلوولەی تفەنگان وە دەریان نان. هێندێک بەدیل گیران. هێندێک کوژران و سوارەکانی ئەمیر ئەسعەد «مترالیوز»ێکیان وەدەست کەوت. ئەسپ و یەستر و تفەنگێکی زۆریش گیرا. ئەمیرولعەشایر، ئەمیر ئەسعەد، سالار سەعید لەپاش ئەوەی لە کوشتن و بەدیلگرتنی سەربازەکانی «داشا مەجید» بوونەوە، چەند سوارێکیان بەدووی سەربازە ڕاکردووەکاندا نارد. بۆ خۆشیان پەلاماریان دا قۆڵێکی دیکەی لەشکەری خالۆ قوربان کە لەسەر کێوی «خەزایی» بوون. ئەوانیش پاش تەقەیەکی کەم سەنگەریان بەتاڵ کرد و هەڵاتن.

هێندێکیان وەبەرهاتن کوژران و هێندێکیش بەدیل گیران. لەوێش ئەسپ و تفەنگێکی زۆر وەدەست کەوت. سوارەکانی سالار سەعید مترالیوزێکیان گرت. دەگەڵ کوو شکەستەی لەشکری ئەو دوو شوێنە وا بەشپرزەیی گەینەوە ئیندرقاش ترس لەنێو لەشکری خالۆ قوربان کەوت و پاک هەڵاتن. ئاغایانی مەنگوڕ و هەرکی و زەرزا جڵدانە لێیان وەخۆکەوتن و ئازایانە دایان گژانێ. لەو شەڕەدا خالۆ قوربان و چەند ئەفسەر و سەرباز کوژران. زۆریش بەدیل گیران. پیاوەکانی سەید تەها ئەفەندی ٣ تۆپ، سوارەی مەنگوڕی تۆپێک و سوارەکانی هەرکی ٢ تۆپی گەورە و مترالیوزێک و ئەسباب و تفەنگێکی زۆریان بەتاڵان گرت. هێندێک دەڵێن سوارەی ئەحمەدی گوڵاوی ئاغای مەنگوڕ و هێندێک دەڵێن ئەحمەد خانی هەرکی خالۆ قوربانی کوشتوە.

شکستەی لەشکری خالۆ قوربان زۆربەیان گەڕانەوە بۆ وڵاتی خۆیان و دووسەد کەسێکیش چوونە تەورێز. کۆلۆنێل «نصرالله خان» فەرماندەی ژاندارمیش لە «صاین قلعه»وە بەرەو موکری وەڕێکەوت، بەتەواوی لەو ڕووداوە بێ خەبەر بوو. بۆ ئەوەی دەگەڵ خالۆ قوربان یەک بگرنەوە زۆر بەفیزەوە بۆ لای بوکان هات. ئەمیر ئەسعەد کە ئەو خەبەرەی بیست زۆر بەپەلە خۆی گەیاندە «ئەمیر ئاباد»ی تەنیشت بۆکان. کۆلۆنێل کە دەگاتە بۆکانێ و خەبەری کوژرانی خالۆ قوربان و شکان و بڵاوبوونی لەشکرەکەی دەزانێ، فیزماڵکی دەداتێ، بۆکان بەجێ دێڵێ، بۆ «ساین قەڵا» دەگەڕێتەوە. سوارەکانی بەگزادە و سەرداری موکری وەدوویان دەکەون، ئەمیر ئەسعەد و ئاغاکانی دیکەی دێبۆکری بەڕکێف کوت خۆ دەگەیەننە یارمەتی سورانی موکری و بەگزادە. ئۆردووی ژاندارمری لە کێوی پشت

گوندی «ئاڵبلاغ» گەمارۆ دەدەن. زۆران دەکوژن و بەدیل دەگرن دەسـتـەوتیش گەلێکە. لەو پەلامارەدا «سـوڵتان عبدالحمیدخان» ئەفسەری ژاندارمری کوژراوە. کۆلۆنێل دەگەڵ پاشماوەی لەشکەرەکەی شەوانە لە کێو دێتە خوارێ و بەلاڕێدا هەڵدێ. ئاغایانی بەگزادەی فەیزوڵـلا بەگی تۆپێکی گەورەیـان گرت و ناردیان بۆ «چهریق». بەڕاسـتی ئازایەتی و لەخۆ بوردنی گشـت ئاغایانی موکری بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی نیشـتمانی و نەتەوایەتی جێگای سوپاسـە. هیوادارم لەڕێگای هەق ناسییەوە ئەوەی لەو ڕۆژنامە تاقەکەماندا چاپی بفەرموون. ع. ش».

دیـارە ئاغای «تمدن» ئەم باسـەی بۆیـە نەهێناوەتە گۆڕێ گۆشـەیەک لە مێژووی ڕۆژنامەگەری گەلی کورد لە کوردسـتانی ئێران ڕووناک بکاتەوە، بەڵکو مەبەستی شتێکی دیکەیە و ویسـتوویەتی ڕق و قینی تایبەتی خۆی بەرامبەر بەسـەرکردایەتی ڕاپەڕینی ئەو سـەردەمی گەلی کورد دەرببڕێ و بۆمان بگێڕێتەوە کە چۆن چاپخانەکەی لێ موسـادەرە کراوە. جا بۆیە هیچ نەینووسـیوە ئەو ڕۆژنامەیە چەند لاپەڕە بووە، ئەندازەی چەند بووە، کەی دەرچووە، کەنگێ پەکی کەوتووە و لەسـەریەک چەند ژمارەی بڵاوبۆتەوە. بەداخەوە ئەم کلێشـەش کە چاپکراوە، دەگەڵ ئەوەشـدا کە سـاڵ و مانگ و ڕۆژی دیارە، ژمارەی بەسـەرەوە نییە. ئێمەش جـارێ هیچ بەڵگەیەکی ترمان بەدەسـتەوە نییە. مەگەر لەبەر خۆمانەوە بێ بەڵگە لێکی دەینەوە و کەمێک لە ڕاستی نیزیک بینەوە.

ئەگەر قسـەی ئەم نووسەرە بەڕێزە ڕاست بێ و ئەو ڕۆژنامە سێ جار ناوگۆڕی کردبێ. ئەوە دەردەکەوێ کە ئەو ڕۆژنامە لانی کەم دەبێ سێ ژمارەی لێ دەرچووبێ. ئەم ژمارەش کە کلێشـەکەیمان لەبەرچاوە لە ڕۆژی ١٢ ی شـەوالی ١٣٤٠ دا بـڵاو کراوەتەوە. ئەگەر دڵنیابیـن هەموو جارێ لە ڕۆژێکی دیاریکراو لە حەوتوودا چاپ کرابێ، ئەوە دەبێ ژمارەی یەکەمی لە ڕۆژی (٢٧، ٢٨)ی ڕەمەزان و ژمارەی دووهەمی لە ڕۆژی ٥ ی شەوال و ژمارەی سێهەمی لە ١٢ ی ئەم مانگەدا بڵاو بووبێتەوە. بەڵام من بۆ خۆم بەچەند دەلیل لەو حیساب و لێکدانەوەیە دڕدۆنگم:

١ ـ هەرچەنـد مـن بۆ خۆم نەمدیوە، بـەڵام لە گەورە پیاوانی ئـەو دیو و ئەم دیوم بیسـتووە کە مامۆسـتا مەلا موحەممەدی تورجانی یا قزڵجی زانایەکی گەورە و ئەدیبێکی شـارەزای کورد بووە. هیچ وێ ناچێ ناوێکی وا نالەبار «ڕۆژی کورد ـ شـەوی عەجەم»ی بۆڕۆژنامەکەی هەڵبژاردبێ، با زۆریشـی ڕق لە عەجەم بووبێ. لێرەدا دەمەوێ ئەو نووکتە ڕووناک بکەمـەوە کە کوردی ئێران بەتایبەتی خەڵکی موکریـان، کە گوتیان «عەجەم» مەبەسـتیان کاربەدەسـتی دەوڵەتە نەک ڕەشـوڕووتی میللەت. دوور نییە یەکەم ژمارەی




ڕۆژنامەکە «ڕۆژی کورد» بووبێ، دوایە ناوی گۆڕیبێ و بووبێ بە «کورد».

٢ ـ نووسەر بەڕاشکاوی دەقی ڕیپۆرتاژی کوژرانی خالۆ قوربانی لە پاشکۆی فارسی ژمارە دووی ڕۆژنامەی «کورد» ڕاستەوخۆ نەقل کردووە. لە ڕیپۆرتاژەکەدا نووسراوە شەڕی دەوری شاری سابڵاخ لە ڕۆژی ٢٩ ی ڕەمەزاندا کراوە و خالۆ قوربان لەو ڕۆژەدا کوژراوە. هەروەها هەر لەو ڕیپۆرتاژەدا هاتووە کە یەکێک لە سەرکردەکانی شەڕی دەوری سابڵاخ (ئەمیر ئەسعەد) خۆی گەیاندۆتە شەڕی کێوی ئاڵبلاغ. ڕێگای نێوان سابڵاخ و ئاڵبلاغ بۆ لەشکری هیچ نەبێ دوو ڕۆژی دەوێ، کەوابوو دیارە شەڕی کێوی ئاڵبلاغ لە ڕۆژەکانی هەوەڵی مانگی شەوالدا ڕووی داوە. بەینی ئاڵبلاغ و ورمێش بۆ پەیکی سوار چوار ڕۆژ دەبێ. بۆیە وام لێک داوەتەوە کە ئەم ڕیپۆرتاژە بۆ ڕۆژی ٥ ی شەوال نەگەیوەتە ورمێ و لە ژمارەی دووهەمدا کە بەحیسابی سەرەوەمان دەبێ لە ٥ ی شەوالدا بڵاو بووبێتەوە، چاپ نەکراوە. مەگەر وای دانێین کە لە نێوان سابڵاخ و ورمێدا خەتی تەلگراف بووبێ و ئەم ڕیپۆرتاژە بە تەلەگراف ناردرابێ، کە ئەویش جێی گومانە، یان پاشکۆیەکە لە پاشان چاپ کرابێ.

٣ ـ نەک هەر ئەو سەردەمی بەڵکو بەداخەوە ئێستاش ئەم شوێنە ماوە کە کورد سەروبەندی جێژنان دەست لە ڕەش و سپی نادا و لێی ڕادەوەستێ بۆ پاش جێژن. مەگەر پێمان وابێ مەلا محەممەدی تورجانی زادە ئەم ڕۆژنامەی وەک جێژنانەیەکی بەنرخ پێشکەشی نەتەوەکەی کردبێ.

بەهەر حاڵ پاش ئەم لێکدانانەوە دەگەینە ئەم ڕاستییە کە ڕۆژنامەی کوردی چاپی ورمێ لە ئاخر و ئۆخری ڕەمەزان یان لە هەوەڵ ڕۆژەکانی شەواڵی ١٣٤٠ی کۆچیدا بڵاو بۆتەوە. بەڵام جێی داخە کە نازانین چەند ژمارەی لێ دەرچووە و چۆن و بۆچی و کەنگێ پەکی کەوتووە[1].

---

١ ـ سەرنج: نووسەر لە سەرتاسەری کتێبەکەیدا، ناوی (سمکۆ) بە (سمیتقۆ) دەبا.

ڕوونکردنەوەی هەندێک لەو ناوانەی لەم وتارەدا هاتوون:

ئاڵبلاغ: گوندێکە لە نێوان سەقز و بۆکاندا.

ئەمیر ئاباد: گوندێکە لەلای ڕۆژئاوای نیزیکی بۆکان.

ئەمیر ئەسعەد: عەلی ئاغای عەلی یار سەرۆکی عەشیرەتی دیبۆکری.

ئەمیرولعەشایر: قەرەنی ئاغای مامەش سەرۆکی عەشیرەتی مامەش.

ئیندر قاش: گوندێکی زۆر گەورەیە لە شیمالی شاری مەهاباد، نیزیک بە فەخرەقا.

خالۆ قوربان: یەکێک لە کوردە ئازادیخوازەکانی گێلان بوو کە دەگەڵ کوچک خانی جەنگەڵی لە ڕاپەڕینی جەنگەڵدا هاوکاری دەکرد، دوایە بای داوە و لای دا و بوو بە پیاوی دەوڵەتی ئێران.

خەزایی: کێوێکە لە شیمالی شاری مەهاباد هەڵکەوتووە.

داشا مەجید: تەپکێکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد.

دەرمان: گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد.

زاوا بووک: کێوێکی بەرز و سەختە لە ڕۆژهەڵاتی شاری مەهاباد.

سالار سەعید: عەلی بەگی حەیدەری برای شاعیری ناودار عەبدوڵڵا بەگ (ئەدەب).

سەرداری موکری: عەلی خان کوڕی محەمەد حسین خانی شەهید.

سوارەی ئەحمەدی کوڵاوی ئاغای: ئاغایەکی بەناوبانگی عەشیرەتی مەنگوڕ.

شاروێران: ناوچەیەکی گەورە و پڕ پیت و بەرەکەتە لە دەوروبەری مەهاباد. کەلاوەکانی دریاز پاتەختی موکریان لەو ناوچەدایە.

«صاین قلعە» ساین قەڵا: شارێکە لەبەری هەوشار.

فەیزوڵڵابەگی: عەشیرەتێکی بەناوبانگە کەوتۆتە نێوان سەقز و بۆکان.

لاچین: گوندێکە لە ڕۆژهەڵاتی نێزیکی مەهاباد.

لاهووتی: شاعیری بەناوبانگ و شۆڕشگێڕی ئێران.

هەمزاغا: برای قەرەنی ئاغای مامەش (ئەمیرولعەشایر).

## نامەیەکی ئەدەبی

برای زۆر بەڕێز و خۆشەویستم کاک محەممەد مەلا کەریم!

دیارییە بەنرخەکەت گەیشت. ماڵت ئاوەدان بێ وەک ماڵی وێرانی منت ئاوەدان کردەوە. دەسـتت نەڕزێ وەک ئۆخژنت خسـتە نێو دڵ و دەروونی ئاگرینـم. هەر خۆش بی وەک خۆشیت هێناوە بۆ لای من.

لەمێژ بوو ماڵەکەم چۆڵ و هۆڵ و بێ هەستوخوسـت بـوو، وەک مەکۆی دزان چرای لێ نەدایسا. وەک دەروونی تاوانباران تاریک و تنووک بوو و وەک بسکی نازداران ئاڵۆز و پەشێو. کەس سەرانسوێی نەدەکردم. کەس دەرکی لێ نەدەکرمەوە ئەگەر میوانێکم هاتبا، خەم بوو، پەژارە و کەسەر و دەرد و ژان و ئازار و خەفەتیشی بەدواوە بوون. هەموو شەوم شـامی غەریبان بوو و هەموو ڕۆژ بەرەبەیانی لەداردان. بەڵام لە سایەی ڕەنجی زانایانە و بەفیڕۆ نەچووی تۆوە دیسان شادی بەماڵم وەربۆتەوە. خەم بۆی دەرچووە و دیزەی ڕەشم لە دوو شـکاندووە. میوانم هاتوون. شیرینی شۆخ و شەنگ، شیرینی دەلال و چەلەنگ کە بەنازەوە لەسـەر تەختی زێڕ دانیشتووە و خودای جوانی ڕەبیر دێنێتەوە. شەکەر دەبینم، شـەکەری دلڕفێن و تۆبە شکێن جامێ شەرابی یاقووتی لەسەر دەستە و مەیگێڕی کۆڕی دڵدارانە. سـاز و ئاوازی «باربـود»ی هونەرمەندی پەنجە ڕەنگین لـە ماڵەکەمدا دەنگ دەداتەوە، کیژە جوان و نەشـمیلانەکانی ئەرمەنی و گورجی لە دەسـتمدا هەڵدەپەڕن و پێ دەکەنن. شـاپووری زانا سەرگوزشتە و چیرۆکی کۆنم بۆ دەگێڕێتەوە. دەنگی کوڵنگی

فەرهادی بێ موراد لە گوێمدا دەزرینگێتەوە. نەخش و نیگاری (تاق وەسان) شوێنەواری کۆنی وڵاتەکەم وەک پەردەی سینەما بەپێش چاومدا هاتوچۆ دەکەن. شەودێز لەبەر دەرکم نێسکە و سمکۆڵ دەکا و دەگورێنێ. بەڵام خوسرەوی بەپشتەوە نییە تا جلیت و تەقڵە و ڕمبازی بکا. ئاخر خوسرەوان ئێمەمانان ناخوێننەوە و ڕوو لە ماڵە هەژاران ناکەن. نیزامی و خانا بەسەر و سیمای ئاسمانی و شاعیرانەوە لەلای سەرووم دانیشتوون و شێعری تەڕ و ناسکم بۆ دەخوێننەوە، ئەمەیان بەفارسی دەڵێ:

پریدختی، پری بگذار ماهی
بزیر، مقنعه صاحب کلاهی
شب افروزی چو مهتاب جوانی
سیه چشمی چو آب زندگانی
کشیده قامتی چون نخل سیمین
دو زنگی بر سر نخلش رطب چین
ز بس کاورد یاد آن نوش لب را
دهان پر آب شکر شد رطب را
به مروارید دندانهای چون نور
صدف را آب دندان داده از دور

ئەویان بەکوردییەکەی خۆمان دەڵێ:

قامەتش قیام قیامەت خێزن
خەرامەش ئاشووب ڕووی ڕەستاخێزن
پێشانیش پڕشنگ نوور جێش مەخێزۆ
حوسنش بووم قورس قەمەر مەبێزۆ
موژەش چون خەدەنگ شەهابی ئەنجوم
ئەر بگنۆ وە سەنگ تا پەرمە بۆ گوم




بەڵێ لە دەریای بێ لێوار و کەنار و پڕ شەپۆلی شیعر مەلە دەکەم و لە گوڵزاری ڕەنگاوڕەنگی ئەدەبدا گوڵ دەچنم، هەر باسی جوان و ئەوین و دڵداری دەبیسم. دەڵێی تەمەنم لە نوێ نووسراوەتەوە و هاتوومەتەوە سەر حەدی چاردە ساڵە.

کاکی خۆم:

ئەو بەزم و ڕەزمە، ئەو خۆشی و شادییە هەموو شیرین و خوسرەوەکەی خانای قوبادی بۆ منی هێناون. جا چۆن سوپاست نەکەم و ڕێزت لێ نەگرم؟ کە ڕەنج و تێکۆشانی تۆ بۆتە مایەی خۆشی و شادی من. بەڕاستی بەساغکردنەوە و لەچاپدانی ئەم کتێبە نایابە کتێبخانەی ماڵانت ڕازاندەوە و ئەدەبی کوردیت بووژاندەوە.

ڕاست بڵێم من خانام نەدەناسی زۆر زوو چەند پارچە شیعرم خوێندبۆوە و تێی نەگەیشتبووم. بیستبووم خەسرەو و شیرینی نیزامی وەرگێڕاوە و باشیشی وەرگێڕاوە.

بەڵام بڕوام نەدەکرد. چونکە یەک دوو شاکاری ئەدەبی فارسیم دیون کراونە کوردی و دەزانم چەند ناشیانە و بێ دەسەڵاتانە وەرگێڕدراون. دەترسام ئەوەش هەر وابێ. هەرچەن دەمزانی «ئەوڕەنگ» چاپی کردووە، هیچ هەوڵێکم بۆ پەیداکردنی نەدەدا. بەتایبەتی لە شێوەی گورانیشدا زۆر کۆڵم و بەزەحمەت تێی دەگەم. بەڵام پاش ئەوەی شیرین و خوسرەوت بۆ ناردم زۆر شتم بۆ روون بۆوە و تێ گەیشتم خانا چ نەهەنگێکە لە دەریای شیعر و ئەدەبدا و لەخۆی ڕادیوە بچێتە مەیدانی نیزامی گەنجەوی کە بەخوای شیعری فارسی ناسراوە و ناوبانگی جیهانی هەیە. شاعیرێکی فارس گوتوویەتی:

در شعر سه کس پیمبرانند
هر چند که «لانبی بعدی»
وصاف و قصیده و غزل را
فردوسی و انوری و سعدی

کابرایەک لێی پرسیوە:

«ئەدی بۆ ناوی نیزامیت نەهێناوە؟»

گوتوویەتی:

«باوکم من باسی پێغەمبەرانم کردووە و هەقم بەسەر خواوە نییە».

خانای ئێمە چۆتە مەیدانی ئەو کەڵە شـاعیرە. لەوەتی شـیرین و خوسـرەوی خانام وەگیـر کەوتووە. خەوم لە خۆم حەرام کردووە و خەریکی خوێندنەوەی ئەو خەسـرەو و شـیرینەی نیزامیم. ڕاستە شـێوەی گۆرانی بۆ منی موکریانی گرانە. بەڵام بەیارمەتی ئەم فەرهەنگەی تۆ بۆت کردووە و بەکۆمەگی ئەو وشـە فارسـی و عەرەبییانەی خۆی بەکاری هێناون و بەیاریدەی خوسـرەو و شیرینەکەی نیزامی هیچ نەبێ تا ڕادەیەک لە مەفهوومی شـێعرەکانی دەگەم و چێـژی لێ دەکەم. ڕەنگە وەک خەریکم لە داهاتوودا باشـتری لێ ڕابێم. جارێ ناتوانم بەتەواوی ڕای خۆم دەرببڕم. بەڵام لەم ماوە کورتەدا ئەوەندەم بۆڕوون بۆتەوە ناهەقت نەبووە ناوی شاکارت لێناوە. بەڕاستی خانا کەڵە شاعیرێکی مەزنی کوردە و کتێبەکەشـی شـاکارێکی ئەدەبی بەرز و نایابە. پێوەم ئەگەر مەرگ بەربینگم نەگرێ و ڕۆژگار برستم لێ نەبڕێ، شێعر بەشێعری شیرین خوسرەوی خانا و نیزامی لەبەریەک ڕانێم و بەراوردیان کەم و ئەگەر لە توانامدا بوو شـتێکیان لەسەر بنووسم. ئێستا ئەوەندەم بۆ ڕوون بۆتەوە خانا خوسرەو و شـیرینی نیزامی ڕاستەوڕاست وەرنەگێڕاوە. بەڵکو ئازادانە چیرۆکەکـەی کردۆتە کوردی. بەڵام زۆر لە ئەسـڵەکە دوور نەبۆتەوە. نەک نەمدیوە هیچ لە چیرۆکەکە بپەڕێنێ. بەڵکو هەسـتم کردووە لەجێ جێیان هەناسەی درێژتر بووە و پتر لەسـەر مەبەست ڕۆییوە. جا لە کوێدا سـەرکەوتووە و لە کوێدا سەرنەکەوتووە پێویستی بەلێکۆڵینەوەی زیاتر هەیە.

دیـارە فەرق لەنێوان دانان و وەرگێڕاندا زۆرە. هەرچەند دەزانین چیرۆکی شـیرین و خوسـرەو زادەی خەیاڵی نیزامی نییە و لە پێشیشدا گوتراوە. نیزامی سەرچاوەی وەک شـانامەی فیردەوسی لە دەسدا بووە و سـوودی لێ وەرگرتووە. بەڵام دیسان ئەو دانەرە و خانـا وەرگێـڕ، و دەبێ ئەو فەرقەمان لەپێش چاو بێ. ئەوەندەی بەتێگەیشـتنی خۆم بـەراوردم کردوون، لەباری نێوەڕۆکەوە خانام لـە بەرامبەر نیزامیدا بەداماو نەدیوە، بەڵام زمانی نیزامیم پێ ڕەوانتر و شـاعیرانەترە. ڕەنگبێ بڵێی لە فارسییەکە باشتر ڕاهاتووی، ڕاسـتە من خوسرەو و شـیرینی نیزامیم زۆر جار خوێندۆتەوە و تەنانەت شێعری نیزامیم بەدەرس خوێندووە و ئی خانام بۆیەکەم جار دیوە و زۆر شـارەزای زبانەکەی نیم. ئەمما هێندێک وشـەی عەرەبی خەتیبانە و ناشـاعیرانەم لە شێعری خانادا دیون کە لە شێعری نیزامیدا بەدی ناکرێن.

من وەرگرتنی وشە بۆ دەربڕینی مەبەست لە زمانی دەر و جیرانان ئێستاش بەشوورەیی نازانم، چ دەگا بەسەردەمی خانا. نیزامی بۆ کەمی کۆمەگ لە وشەی عەرەبی وەرگرتووە؟

بەڵام هێندێک وشە لە هەموو زمانانداا هەن کە وشەی شێعر نین، لەو وشانە تەک و تووک کەوتوونە نێو شێعری خانا وەک ئەم شێعرە:

چـۆن بـە حوکـم ڕات «لااحصـی» صیفات
جـەنـاب ئـەقـدەس «جاعـل الظلمـات»

لە شێعری خوارتردا وشەی عەرەبی زۆر بەکار هێناون. بەڵام وشەکانی وشەی شێعرین و مۆسیقایان تێدایە و شێعرەکانیان دزێو نەکردووە.

سـیمای وێنـەی شـەمع تـەجـەلـلای کـۆی طوور
مـدە ڕەوشـا بـەلـوطـف خـوداوەنـد جـە نـوور

ئەم کێشەی نیزامی بۆ هۆندنەوەی شیرین و خوسرەو هەڵی بژاردووە کەمێک لە کێشی شـێعرەکانی خانا گرانترە. دەتوانی بڵێی ئەوە بەڵگەی بێ هێزی نییە. خانا بەئانقەسـت کێشی خۆماڵی هەڵبژاردووە. ئەمما من ئیقناع نابم. چونکە دەزانم شێعری خانا ئەوەندەش خۆماڵی نییە و لە دیوانی شـاعیرەکانی فارسدا نموونەی هەیە و ڕوون نییە کاممان لەوی دی فێربووین. حافیزی شیرازی دەڵێ:

گـر تیـغ بـارد از کـوی آن مـاه
گـردن نهادیـم الحکـم للـه

کێشی شێعری نیزامیش ئەوەندە بۆ شاعیرانی کورد ئەویش بۆ شاعیرانی گۆران نامۆ و بێگانە نییە. چونکە یەکەم شـاعیری ناسراوی کورد کە بەشێوەی گۆرانی شێعری گوتووە «بابەتاهیر عوریان» چوارینەکانی لەسـەر ئەم کێشە داناون. بەلای منەوە خانا لە خۆی ڕانەدیوە خۆی لە قەرەی ئەم کێشـە بدا. ئەم لەخۆڕانەدیتنە لەباری ڕواڵەتەوە کەمێک لە نرخی کارەکەی کەم کردۆتەوە. چەند خۆش بوو هەر لەسـەر کێشـی نیزامی بایە. شتێک کە سـەرنجی منی ڕاکێشا و ڕەنگبێ سەرنجی هەموو شێعرناسێکیش ڕاکێشێ، ئەمەیە: کە




خانا زۆر شاعیرانەتر و ئاشقانەتر دەستی بەکتێبەکەی کردووە و موناجاتەکەی تەڕتر و پڕ سۆزترە لە ئی نیزامی:

بەنام ئەوَ کەس شیرینی ئەرمەن
پەیدا کرد (فەرهاد) پەیشی بێ کوکەن
هەر سوب تا ئیوار نەپای بێستوون
تەقەی قولنگش یاوا بە گەردوون
ئەراش چەندین جەور، چەند جەفا بەردش
ئاخر بەناکام ئەڕوا سپەردش
تعالی جە صونع پەروەردگاریش
جە کاری شیرین شیرین کرداریش

کاکە گیان!

دیسان سوپاست دەکەم کە ئەم گەنجینە دارماڵەت بۆ ناردووم و بە مرواری و گەوهەرانت خەنی کردووم. بەڕاستی ڕەنجێکی زۆرت کێشاوە و کارێکی تەواوت لەسەرکردووە. یا من نەمدیوە یا تا ئێستا کتێبی هیچ شاعیرێکی کورد ئەوەندەی کار لەسەر نەکراوە. پێشەکیت بۆ نووسیوە. هەرچەندە بەبڕوای من کورتە و دەکرا پتری لەسەر بنووسی. ئەم جۆرە پێشەکی نووسینانە لەمێژە لە ئەدەبیاتی فارسدا بۆتە باو و ڕەنگبێ ئەوانیش لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوایان وەرگرتبێ. لە هێندێک بۆچوونیشدا ڕەنگە زێدەڕەویت کردبێ. بۆ نموونە هەر بەوەندەی باسی مۆسیقا لە شێعری خانادا هەیە مەرج نییە بیر بکەینەوە کە ئەو مۆسیقای زانیوە. چونکە باسی مۆسیقا لە شێعری نیزامیشدا هەیە و وێدەچێ لەوی وەرگرتبێ.

ڕەخنەیەکی ترم ئەمەیە سەرباسەکانت هەر بەفارسی هێشتوونەوە، دیارە مەبەستت ئەوە بووە ڕێز بۆ تێکستەکە دابنێی. بەڵام ئەو کەسەی ئەو سەرباسانەی نووسیوە فارسی باش نەزانیوە و هەڵەیان تێدان. براگیان! خۆ تۆ فارسی دەزانی تۆ خواکەی «توڵدشدن»تەعبیرێکی فارسانەیە؟

دیارە هەر دوو نوسخەی تێکستەکەت لەدەستدا بوون و زۆریش ئەمانەتت ڕەچاو کردووە. دەبوو کاتێک تووشی ناوی شوێن و مرۆڤان دەبووی چاوێکت بە خوسرەو و

شـــیرینەکەی نیزامیدا گێڕابایە تا هەڵەکانی تێکستەکانت ڕاست کردبایەوە. من کە تووشی ئەم شـــێعرەی خوارەوە هاتم سڵەمیمەوە. چونکە پێم سەیر بوو شاعیرێکی بەرزی خاوەن دەســـەڵاتی وەک خانا لە خۆڕا و بێ ئەوەی پێویســـت بێ قافیەی شـــایگان لەکاربێنێ و شێعرەکەی پێ دزێو بکا:

هـــەر جـە خـــوررەم کـــو تـــا ســـەرای بـــەغـــدا
نـــەقـــش گـــوڵ کـــەفتـــەن چـــون طـــوورەی طـــوغـــرا

چوومە سەر خوسرەو و شیرینەکەی نیزامی تەماشام کرد لەوێدا وا هاتووە:

زجـــرم کـــــوه تـــا میـــــدان بغـــرا
کشـــیده خط گـــل طُغـــرا به طُغـــرا

گومـــان لەوەدا نییە «خـــوڕڕەم» و «بەغدا» هەڵەی ئەو کەســـەن کـــە کتێبەکەی نووسیوەتەوە نەک هەڵەی شاعیر. ئەمجار ترسام و تووشی هەر ناوێکی گومان لێکراو ببام سەیرێکی فارسییەکەم دەکرد. دیارە ئی دیکەشی تێدان وەک (مهستان) لەباتی (کهستان) کە دەزانی مانانیان تەواو دژی یەکترە.

فەرهەنگەکەی کارێکی باشە و گەلێک یارمەتی خوێنەر دەدا وشە فارسییەکانت ناتوانم بڵێـــم زۆر باش بەڵام بـــاش مانا لێداوەتەوە. لە دواییـــدا پیرۆزبایی ئەم کارە گرنگەت لێ دەکەم و هیوادارم خزمەتی گەورەتر بەئەدەبی نەتەوەکەمان بکەی.

برات هێمن، ١٩٧٦/١/١٢



## ئەرکی بەیان لە هەلومەرجی ئێستادا

پاش بڕانەوەی شەڕی یەکەمی جیهانی، پاش لەبەریەک هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانی کەمالیستەکانی تورکیا بە هەلەهەل و پەلەپەل تێ دەکۆشان خەڵکی وڵاتەکەیان فێری ڕێوشوێنی ئەوروپایی بکەن. توند بەگژ ڕێوشوێنی کۆندا چوون. جلوبەرگی نەتەوایەتییان لە هەموو گەلانی ئەم وڵاتە قەدەغە کرد. خەریک بوون وشەی بێگانە، بەتایبەتی عەرەبی لە زمانەکەیان وەدەرنێن، خەتیان گۆڕی.

کاریکاتۆرێکی ئەو سەردەمیم دیوە کارێکی هونەرمەندانەی زۆر سەیرە. کاریکاتۆریست، زەلامێکی تورکی کێشاوە، پیتەکانی (ص، ض، ط، ظ، ث، ذ)ی لە تێرێکی خستوون، سەریان لە تێرەکە دەرهێناوە، لە وشترێکی ناون، بە تێڵا لە وشتر ڕاساوە و تێی ڕاخوڕیوە «گێدن عربستانە!»

هونەرمەند هونەری نواندووە، هەستی خۆی دەربڕیوە، خەڵکی وەپێکەنین خستووە. بەڵام ئایا کارەکە وا بە هاسانی بڕاوە؟ هەر کەس چ بڕ ئاگای لە نووسینی ئێستای تورکی بێ، ناچارە جواب بداتەوە «نەخێر».

ڕاستە خەتیان کردە لاتین و ئەم پیتانەشیان ناردەوە عەرەبستان. بەڵام هەرگیز نەیانتوانی ئەو وشانەی لەم پیتانە دروست دەکرێن لە زمانی خۆیان دەرباوێژن. پاش ماوەیەک هەڵسووڕ، داسووڕی شێتانە و تەپوتۆزی منداڵانە هاتنەوە سەر ڕەوتەکەی جارانیان. ئێستا نووسەرانی تورک بەزمانێکی تێکەڵاو دەنووسن. بۆ نموونە ئەم چەند

**دێڕانە لە تازەترین ڕۆژنامەکانی تورکی دەرهێناون:**

«اجتماعی عدالت تامین یاسـایش ساغلام محیط یاراتماق ایچون عموم خلق کتلەلری متحدا چالیشمار ایدلار».

یا:

**«سـنین عشـقی منی مجنون ایتدی. مشرق و مغربی سـیراتیدم آخر داسنی سوییدم عزیزم». قسـەی خۆمان بـێ، دار و بەرد گوێی کەڕبێ، دوور لە ڕووی کەمالیسـتەکانی خۆپەرسـت ئەم دێڕانە بەتورکییێکی زۆر پەتی نەنووسراون! بەڵێ شاعیر و نووسەرەکانی تورک بەم زمانە تێکەڵاوە دەنووسن و ئی واشیان هەیە ناوبانگیان بە دنیادا بڵاو بۆتەوە و نووسینەکانیان بە زمانی زیندووی جیهان وەرگێڕدراون.**

**پان ئێرانیسـتی واش لە ئێران پەیدا بوون کە دەیانویست، بە فارسی پەتی بنووسن. ئەوانیـش بڕێکیـان تەپوتۆز کرد، بەم لاو ئەولادا هەڵسـووڕان و گێچەڵیان نایەوە. بەڵام فارس گوتەنی: کسـی تره برایشـان خرد نکرد. «کەس بە ڕەی نەپێوان»، کەس گوێی نەدانێ، کەس لاسای نەکردنەوە. کەم کەس وێرای ئابڕووی خۆی بەرێ و ڕێبازی سەعدی و حافیز و نیزامی و مەولەوی بەربدا و وەشـوێن چەند کەسـی شێت و شووری بێ مایە و سەرلێشێواو بکەوێ، خۆیان پێ ڕانەگیرا و وەک بڵقی سەر ئاو پووچانەوە و ناویان لەنێو ناواندا نەما.**

**بیستوومە ئەفسەرێکی سیاسی ڕاپۆرتێکی زۆر گرنگی بەخەیاڵی خۆی بەفارسی (سره) بۆ دوکتۆر موسـەدیق نووسـیوە، موسـەدیق هەرچی خەریک بووە تێی نەگەیشتووە، لە پەراوێزی ڕاپۆرتەکەدا نووسیویەتی: «خواهشمندم کاملا عربی بنویسید».**

**ئێسـتا شاعیر و نووسەری فارسـی وا هەن بەم زمانە تێکەڵاوە شاکارە ئەدەبییەکانی بێگانە دەکەنە فارسـی و بۆخۆشـیان شاکاری تازە و نوێ و پڕ نرخ و جوانی دەخوڵقێنن و نووسـەری وەک: هیدایەت، عەلەوی، چوبک، ئەفغانی، سـاعیدی و سەمەدیان لێ پەیدا دەبێ، شاعیری وەک بەهار، شەهریار، نیما، پەروین، سیمین و فروغ و شاملوو و نادر پوور و سوپهری کەلێنی شـاعیرە گەورەکانی پێشوویان پڕ دەکەنەوە. بۆ ئەوەی بزانن فارسی ئەمڕۆ چۆن دەنووسـرێ چاوێک بەم چەند دێڕانەی خوارەوەدا بخشـێنن کە لە تازەترین ڕۆژنامەکان دەرهاتوون: «تفکیک و تقسیم اراضی کشاورزی ممنوع اعلام شد».**

«مالیات خرید و فروش در اراضی بایر خارج از محدوده شهری بطور تصاعدی دریافت میشود. معاملات شـرطی و رهنی زمین برای اخذ وام ساختمان یا فعالیت صنعتی از موسسات دولتی مجاز بلامانع اعلام شد».

ئەو کەسانەی عەرەبی دەزانن بەهاسانی دەتوانن وشە عەرەبییەکان لەنێو ئەم دێڕانەدا بدۆزنەوە. بەڵام ئەگەر فارسی نەزانن لە مانای ڕستەکان ناگەن. چونکە لەسەر ڕێزمانی فارسی داڕێژراون و وشە عەرەبییەکانیان لەنێو خۆدا جۆش داوە.

ئازەربایجانی، ئەفغانی، پاکستانی، تاجیک، ئۆزبەکستانی و بلووچیش هەر وا تێکەڵاو دەنووسن. عەرەبیش کورد گوتەنی «بازە دەشگری و بەریش دەدا ئەگەر دەبەخشێ وەریش دەگرێ». زۆر تەبیعییە هەموو گەلی دنیا دەبێ ببەخشێ و وەربگرێ و تا بژی و نەمرێ.

لەم نێوەدا تەنیا ئێمەین وەک کەڵی کۆتانێ لە مەیدان چەقیوین، چاومان لە هەوا بڕیوە، فیزمان ناهێنێ لە کەس وەربگرین و ئاگاشمان لێ نییە چۆنمان لێ وەردەگرن. نازانم ئەم فیز و هەوایە، ئەم بەرزە دەماخییە و ئەم لەخۆبایی بوونە، لە کام پلەمان هەڵدەدێرێ، نازانم کەی سەرەنگرێ دەبین؟ نازانم چمان بەسەردێ نازانم بەم حاڵە دەگەینە کوێ؟ هەر ئەوەندە دەزانم زیانمان زۆر لێ دەکەوێ و زۆر شتی جوانمان لە کیس دەچێ.

مێژووی ڕۆژنامەنوسی ئێمە زۆر لە گەلانی دەوروبەرمان بەجێ نەماوە، «کوردستان» یەکەم ڕۆژنامەی کوردی کە لە ساڵی ١٨٩٨ ـ ١٩٠٢ دا بڵاو بۆتەوە فەرقێکی ئەوتۆی دەگەڵ ڕۆژنامەکانی گەلانی هاوسێ و دەوروبەرماندا نییە. لە سەرەتای ڕۆژنامەنوسییەوە ڕۆژنامەنوسەکانی ئێمەش وەک ڕۆژنامەکانی تورک و فارسیان نووسیوە و پێیان شوورەیی نەبووە وشەی بێگانە لەکاربێنن.

ڕۆژنامەکانی سەردەمی شێخ مەحمودی نەمر کە لە سایەی ڕەنج و تێکۆشانی لاوی ڕۆژنامەنووسی زرینگ و پیتۆڵی کورد کاک جەمال خەزنەدارەوە سەرلەنوێ ژیاونەوە و ئێستا لەبەر دەستماندان، ئەو ڕاستییە بەتەواوی ڕوون دەکەنەوە.

پیرەمێردی نەمر ڕۆژنامەنووسی هەرە گەورە و شاعیری بەناوبانگی کورد لە «ژین و ژیان»دا ئارام و لەسەرەخۆ گۆڕانێکی باشی بەسەر نووسینی کوردی داهێنا. ئاگایانە و وشیارانە خەریکی بژارکردن و خاوێنکردنەوەی زمانەکەمان بوو وەستایانە وشەی عەرەبی و فارسی و تورکی لێ هەڵاوارد و وشەی ساکار و ڕەسەنی کوردی لەباتی ئەوان بەکارهێنا.

گەلاوێژ، گەلاوێژی گەش و بەرز، بە پرشنگی ڕوون و جوانی ئاسمانی ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی کوردی ڕۆشن کردەوە، خەواڵووی ڕاپەڕاندن و شۆڕشێکی پیرۆزی ئەدەبی هەڵگیرساند. ڕێبازێکی ڕاست و ڕەوانی گرتەپێش، نووسەر و شاعیری پێگەیاندن و بەخەڵکی ناساندن و وەک درەختێکی بەبەر و سێبەر ڕەگاژۆی کرد و وەچەی وەک «نیشتمان» و «کوردستان» و «هەڵاڵە» و ڕۆژنامەکانی دیکەی سەردەمی کۆماری




کوردستان لە مەهابادێ دەرکردن.

ناڵێم ئەویش زۆر تەواو بوو، ناڵێم کەموکوڕی نەبوو، ناڵێم کە ئەویش شــتی بێ تامی تێدا چاپ نەدەکرا. بەڵام دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەو ئەســتێرە گەشــە وا زوو ئاوا نەدەبوو تووشی ئەو شەوەزەنگە نەدەبووین کە سەرەدەری تێدا ناکرێ.

بەداخەوە ئەو تەپ و تۆزەی کە پاش شــەڕی یەکەم لە تورکیا و ئێران هەســتا و لەو وڵاتانە خۆی نەگرت. پاش شــەڕی دووەم ڕووی لە کوردســتانی عێــراق کرد، ڕووی لەو پارچەی نیشتمانەکەمان کرد کە تا ڕادەیەک دەرەتانی کوردی نووسینی لێ هەبوو. لەوێدا وەستا، نەڕەوی، نەڕەوی و مەیی تا ڕۆژی ڕووناکی لێ کردینە شەوەزەنگ. شەوە زەنگێکی تاریک و تنووک و ئەنگوست لەچاو.

پیــاوی بێ مایە و لەخۆبایــی دەرفەتیان هێنا و قەڵەمیان فڕێ دا و ڕۆبوونە (بنووس) و (پێنــووس) و (کتێب)یان دڕاند و (پەرتووک)یان بۆ لەبن هەنگڵ نایێن. کاغەزەیان بەدەم بادا دا و (تیانووس)یان خســتە بەردەس. شێعریان بەدرۆ و هەڵبەست زانی و هەزار ناوی ســەیر و سەمەرەیان لە شــاعیری کڵۆڵ و چارەڕەش نا، تا ئاخرەکەی بەهەستیاری برای بیســتیاری ئامۆزای هەڤــی کەمتیار دەرچوو. قافیەیان بەتەنگی زانی و (ســەروا)یان پێ بەراوەڵاتر بوو. لە قانوون دەرچوون و یاســای چەنگیزخانی مەغوولیان بۆ خۆیان بەڕاست زانــی. چونکە پۆلیس خزمەتی خەڵکــی نەدەکرد (حەیتە ...)یان بۆ ڕاژەی گەل هەڵبژارد. ئیمزایان نەخوێندراوە و (واژوو)ی پیرۆزیان لێ دا.

هەرکەس لەبەر خۆیەوە دەســتی کرد بەوشە داتاشین و هەرچی بەقەڵەمی چەپرەکی داهات نووسی. بێ ئەوەی هەست بە بەرپرسی مێژوویی بکا. بەتایبەتی پاش ئەوەی رادیۆی کوردی لە ئێران و عێراق دامەزران، سەرلێشــێواوی پتری پەرەگرت، نووســەری بەرنامەی کوردی ناچارە تەرجەمەی دەقاودەق بکا. ناچارە ئەوەی بۆی دەنووســن موو بەموو بیکا بەکوردی. بۆیە شتێکی لێ دەردەچێ کە کەس نازانێ چییە؟ من بەش بەحاڵی خۆم وەبیرم نایە جارێکیش گوێم دابێتە دەنگوباســی ئەم ڕادیۆیانە چونکە هەر چۆنێک بێ لە فارســی و عەرەبی و تەنانەت تورکی باشتر تێ دەگەم تا ئەم زمانەی پێی دەڵێن: کوردی!!!

هەرچەند لەم ســاڵانەی دوایی خەڵک وشــیار بۆتەوە و تەنووری نەزانانی لە خۆبایی دامــرکاوە و بازاڕی بێ چاوڕوویی ئەوان لە برەو کەوتووە و ئیتر نووســەرە لاوە خاوەن بەهرەکان بەشــوورەیی دەزانن ڕەوتی مامۆســتایانی نەزان هەڵگرن و ئەم وشە ناڕەسەنە دزێوانە لەکاربێنن. بەڵام داخی گرانم هێشتا بەتەواوی فڕێ نەدراون و جاروبار لەلایەک سەر هەڵدەدەنەوە. ڕاستیان گوتووە، بەردێک شێتێک لە چاڵاوی باوێ بەسەد ئاقڵ نایەتەدەر.

لەمێژ بوو بەئاواتەوە بووم شێعرێکی نوێی خۆش بخوێنمەوە، دەزانن ماوەیەکە شێعری شاعیرە لاوەکانمان ئەوەندە وێک دەچن کە پیاو تەنیا بەئیمزای شاعیر لێکیان دەکاتەوە. زۆربەیان بە (ئازیزەکەم) (دڵدارەکەم!) (خۆشەویستەکەم!) دەس پێدەکەن و ئەم وشە ناسک و جوانانە ئەوەندە دووپاتە کراونەوە، پیاو چ چێژی خۆشیان لێ ناکا. تا ماوەیەک لەمەوپێش وا بزانم لە (هاوکاری)دا بوو شێعرێکم خوێندەوە هەرچەند هەر لەسەر ئەم تاقە کێشە بوو کە ئێستا باوە و بۆتە (بەیتی بلە و نابرێتەوە) و ئەگەرچی دیار بوو، شاعیر لاوە، بە پەلەیە، کەم ئەزموونە، بەڵام شێعرێکی جوان و ساکار و پڕ لە سۆز و هەست بوو. هەر دێڕێکم دەخوێندەوە هەزار ئافەرینم بۆ شاعیر دەنارد، ڕۆڵەم! چاوم! کەسی مامی! و شتی وام لە زاری دەردەپەڕین.

دەمگوت: ئۆخەی ئەگەر شاعیری وامان هەن کە ڕستەی «پێمان خاوس بێ» دەکەنە قافیە، ئی واشمان هەن کە مایەی هیوای دوارۆژن. لەپڕ وەک گۆزێک ئاوی ساردم پێدا بکەن ڕاچەنیم، تێکڕا بووم، نەشەکەم شکا. خاوبوومەوە. نازانم ئەم شاعیرە خۆشەویستە چۆنی بێز هاتبوو وشەی داتاشراوی ناشیرینی ئێسکگرانی وەک «پەرتووک» بخاتە نێو شێعرەکەیەوە؟

نازانم بۆ بیر ناکەینەوە، ئێمەمانان کە خۆمان دەکوژین زامی ڕەش دەکەین، ئاوی چاومان ڕۆ دەڕژێ تا شێعرێکی بەکوردی دەڵێین. بۆچی ناوبانگمان لە چوارچێوەی شارەکەمان دەرناچێ. بەڵام ئەحمەدی خانی، کە پێویستمان بە قاموسی عەرەبی و کوردی و فارسی هەیە تا بتوانین شێعرە گران و قووڵ و جوانەکانی ساغ بکەینەوە تا ئێستا مەم و زینەکەی بەچەند زمانی زیندووی جیهان تەرجەمەکراوە؟

ئەگەر هێندێک کەسی نەخوێندەواری ساویلکە، بەڵام پاک و بێ فێڵ، هەستی توندی نەتەوایەتی و بیروڕای چەوت و نەزانانەی سیاسی، تووشی هەڵەی کردن و ئەم تەپوتۆزەیان بەرپاکرد. پیاوی فێڵاوی و خۆپەرست و تەنانەت ناپاکی وا هەبوون کە زانیمان فارسی زانی باش لە کوردستانی عێراق کەم بوون. لە فەرهەنگە کۆنەکانی فارسی گەڕان و وشەی سواو و لەکارکەوتە و فەرامۆشکاری فارسییان لەنێو قاموسە کۆنەکاندا دۆزییەوە و نابەجێ لەکاریان هێنان.

دیارە من پێم وا نییە ئەگەر نووسەرێکی ئێمە لەکاتی پێویستدا بۆ دەربڕینی مەبەست وشەی بێگانە لەکاربێنێ قیامەت ڕادەبێ، دنیا بەقوڕ دەگیرێ، پردی سیرات دەپسێ و ڕووگە وەردەگەڕێ. بەڵام خۆ فریودان و خەڵک فریودان بە گوناهێکی گەورە و تاوانێکی خراپ دەزانم.

ئێمە نابێ گوێ بدەینە شۆوینستەکانی فارس کە دەڵێن کوردی شێوەیەکی فارسییە، بۆ خۆمان دەزانین زمانەکەمان زمانێکی سـەربەخۆیە و ناترسین و نایشارینەوە کە خزمایەتی دەتەک فارسیشـدا هەیە. زۆر باش دەتوانین وشـەی فارسی وەربگرین وەک ئەوان کە لە وەرگرتنی وشـەی کوردی و هیچ زمانێکی دیکە سڵ ناکەن. بەڵام هەق نییە لەباتی وشەی مەزن و گەورە، زەلام، زل، وشـەی «بزرگ»ی فارسـی بنووسـین. یا لەجیاتی، جوان، چەلەنگ ، دەلال و شـەنگی خۆمان. وشـەی «قەشەنگ» لە کاربێنین کە تورک و فارس کێشەیان لەسەر هەیە.

جگە لەوە ئەگەر پێویست بێ وشە وەربگرین، بۆ چی واز لەو وشانە بێنین کە لە مێژە تێکەڵی کوردی بوون و لە کوردەواریدا بوونە باو و وشەی نامۆ بکەینە باو. لێتان دەپرسم. دنیـا، قەڵەم و غەزەلی عەرەبی، زیاتر بوونە کوردی یا گێتی، خامە و چامەی فارسـی، سەیر ئەوەیە فارسەکان بۆ خۆیان پتر، وشە عەرەبییەکان دەکاردێنن بەبڕاوی من فرێدانی ئەو وشـانەی لە کۆنەوە تێکەڵی کوردی بوون و نەخوێندەوار دەیانزانی کارێکی خۆڕاییە. ڕەنگە بەکوردێکی نەخوێندەوار بڵێی سـەماوەر ڕووسـییە و تەمانە ئینگلیزییە تێر و پڕ پێبکەنێ. کام کوردی نەخوێندەوار دەزانێ پێنووس و بنووس و خامە بەقەڵەم دەگوترێ و پەرتووک کتێبی مەلایە؟ خۆ باسی تەرخان و قاچاغ و ئاغا و خان و خانم و بیگ و بیگمی مەغوولی هەر نەکەین باشترە.

وشەی وا هەن ڕاستە زۆر بەڕەسەن کوردی نین. بەڵام ماڵی کوردن چونکە نەخوێندەوار دەیانزانێ و لێیان حاڵی دەبێ و بشمانەوێ لەبیریان ناچێتەوە.

بەڵای لە وشـە داتاشینی نەزانانە کوشندەتر، ڕستە داڕشـتنی هەڵەیە، ئەوەیان پتر جێگای مەترسـییە. چونکە ڕێزمانەکەمان دەشـێوێنێ. بژار کردنی وشەی ناڕەسەن گران نییە بەڵام هێنانەوە سەرەخۆی ڕێزمانی شێواو، ئەستەمە، دژوار بەڵکو ترسناکە.

دیـارە ئەدەبی خۆمان ئەوەندەی خزمـەت نەکراوە و پەرەی نەگرتووە کە هەسـتی فێربوونـی ڕووناکبیـر و خوێندەوارانی کوردی عێراق ڕازی بـکا. ناچارن لە ڕێگای زمانی عەرەبییەوە فێربن و زانستیان بەرەو ژوور بەرن بیانەوێ یا نەیانەوێ دەکەونە ژێر تەئسیری زمانی عەرەبییەوە. بۆیە کاتێک دەنووسـن ڕسـتەکان وەک عەرەبی دادەڕێژن. یا باشتر بڵێم بەعەرەبی بیردەکەنەوە و بەکوردی دەنووسـن. ڕسـتەی وا دەبینم هەموو وشەکانی کوردی ڕەسەنن کەچی تێی ناگەم. چونکە لەسەر ڕێزمانی زمانی عەرەبی داڕژاوە. ئەویش زۆر لە ڕێزمانی کوردی دوورە. لەم ڕسـتانەی خـوارەوە وردبنەوە کە هەموویانم لە وتارە پەسـندکراوەکانی ئەم گۆوارە دەرهێناون، کارتان بەوە نەبێ کێ نووسـیونی بزانن ڕاست




نووسراون یا ناڕاست:

«وە کاتێک مرۆڤ جێگایەک بۆ خۆی دەگرێ لەناو ئەو جیهانە زەمانییەوە».

«لەبەر ئەوە سەرنەکەوتوون لە هیچ شتێکا لەم بارەیەوە».

«لەو کاتەوە مرۆڤ توانی لە دوورەوە بەکاروباری خۆی هەڵسێ».

«بەخێرایی بوونی مرۆڤ دەرچوو لە دەور و پشتی ئاژەڵی».

«کەڵکی چییە ئەو هەموو باسکردنە لەسەر زمانە».

زۆر ڕستەی لەوانەش شێواوترم دیون کە ئەگەر ڕیزم کردبان جێگایان زۆر دەگرت. تەنانەت وتارێکم هەر لەم گۆرارە خۆشەویستەدا خوێندۆتەوە کە بەشی هەرە زۆری پاراگرافەکانی بە (وە) دەس پێ دەکەن کە بە هیچ جۆرێک دەگەڵ ڕێزمانی کوردی ناگونجێ.

تا ئێستا هەر زامم دەسنیشان کردوون و دەرمانم بۆ نەدۆزینەوە. بەڕاستی ئەگەر دەرمانێک بۆ ئەم دەردانە نەدۆزینەوە. هەر وا دێن وەبن دەدەن و تەشەنەی دەکەن و دەبنە تێراوی و بەهەزار شەخس و شێخ و پیر چارە ناکرێن.

بەبڕوای من نووسەری ئەمڕۆی کورد دوو ئەرکی لەسەر شانە و دەبێ هەر دووکی لە پێش چاو بێ. یەک نووسینی شتی چاک و پاک و جوان و بەکەڵک. دوو پاراستنی ڕێزمان و بووژاندنەوەی و بژارکردن و پەرەپێدانی زمانی کوردی. دیارە کەسانێکی بەزمانە زیندوو و خزمەت پێکراوەکان، کە قامووسی گەورەیان هەیە دەنووسن ئەرکی دووەمیان لەسەر شان نییە. بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی یەکەم من وەرگێڕانم پێ باشترە. بەتەرجەمە هەم شاکارە ئەدەبییەکانی جیهان دەکەینە کوردی و هەم مەیدانی بەرفراوانترمان لەبەر دەس دایە و دەرفەتمان هەیە خزمەتی زمانەکەمان بکەین و بیری خەڵک ڕووناک بکەینەوە. بۆ بەجێگەیاندنی ئەرکی دووەم دەبێ بەهەموو هێزمانەوە تێ بکۆشین ڕێزمانەکەمان بپارێزین، وشەی ڕەسەنی کوردی بەکاربێنین، وشەی داتاشراو فرێ بدەین. لەبەر خۆمانەوە وشە دانەتاشین. لە شێوەی شار و نیشتمانی خۆماندا گیر نەخۆین، لەهەر شێوەیەکی کوردیدا وشەی جوانتر و سووکترمان وەپێش چاو هات هەڵی بژێرین. لەبیرمان بێ وشەی کوردی هەتا کورتتر بێ خۆماڵیترە. بۆ ئەوەی ڕستەکانمان کورت بن هەتا دەتوانین (واوی عطف) کەمتر بەدوای یەکدا ڕیز بکەین. لەکاتی پێویستدا لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە نەترسین. لە نووسیندا بەپەلە نەبین کەم بنووسین و باش بنووسین. هەرچی نووسیمان بەجارێک و دووجار لە کۆڵی نەبینەوە. چەند جار دەس تێ وەردەین لەپێش ئەوەی نووسین بۆ چاپ بنێرین، پێمان شوورەیی نەبێ بەچەند کەسی لێزان و پسپۆری نیشان بدەین. ڕەخنە و

تێبینی دۆستانەی ئەوان قبووڵ بکەین. خۆپەرەست و بەفیز و بەرچاوتەنگ نەبین، لە خەڵک فێر بین و بۆ خەڵک بنووسین. ئەوەی بۆ چاپمان نارد ئەگەر دەسکاری باش کرا ئاگر نەگرین. ئەگەر جارێک بڵاو نەکرایەوە ناهومێد نەبین، چاومان نەچێتە پشت سەرمان، بەڕقدا نەچین و دەس لە تێکۆشان و نووسین هەڵنەگرین. ئەرکی سەرشانی هەموومانە بۆ بووژاندنەوەی ئەدەب و خزمەتی زمانی کوردی تێ بکۆشین.

بەڵام ئەرکی بەیان لە هەلومەرجی ئێستادا چییە؟

١ ـ تێ بکۆشین پاک و خاوێن و بێ غەڵەت چاپ بکرێ.

٢ ـ کورتە چیرۆکی باش و وتاری بەکەڵک و چاکی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و زانستی و مێژوویی و رەخنەی بێ غەرەز و دۆستانە بڵاوکاتەوە.

٣ ـ زانایان هان بدا شتی باش لە زمانەکانی بێگانەوە وەرگێڕنە سەر کوردی.

٤ ـ وتاری هیچ نووسەرێک بۆ خاتری جێ و پایە و ناوبانگ و دۆستایەتی بڵاو نەکاتەوە. خوێنەر ڕازیکردن باشترە لە تۆراندن و دڵ یەشاندنی گەورە پیاوێکی شتی باش یا کوردی ڕەوان نانووسی، خزمەتی گەل لە خزمەتی تاقە کەسێک چاکترە.

٥ ـ پاراستنی زمانی کوردی لە هەموو حاڵێکدا لەبەرچاوبێ و بەگرنگی بزانێ.

٦ ـ هەموو وتارێکی سەرلەنوێ بەئیملایەکی یەکدەست بنووسێتەوە جا بیاننێرێتە ژێر چاپ و خەڵکی لە پاشاگەردانیی ڕێنووسی کوردی رزگار بکا.

٧ ـ لە لاپەڕەی دوایی هەر ژمارەیەکدا چەند شت هەڵبژێرێ و داوا لە زانایان بکا تەرجەمەی بکەن و باشترینیان چاپ بکا. هەروەها هێندێک مەوزوعی خۆمانە بەگرێو دابنێ تا نووسەرەکان لەسەری بنووسن و جوانتریان هەڵبژێرێ.

لە هەمووان گرنگتر ئەوەیە دەستەیەک لە زمانزانەکان پێک بێنێ، ئەگەر بکرێ خەڵکی ناوچە جۆربەجۆرەکانی کوردستان بن، تا ئەم نووسراوانەی دەستەی نووسەران لەباری نێوەڕۆکەوە پەسندیان کردوون لەباری زمانەوە تەماشا بکەن و ئەگەر پێویست بوو دەسکاری بکەن. پێم وایە ئەم کارانە زۆر گران نەبن. بەڵام زۆر بەسوود دەبن. بێگومان ئەگەر نووسەرەکانمان بزانن نووسینەکانیان ئاوا لە بێژینگ دەدرێن و تەتەڵە دەکرێن، بەسەرنجەوە دەنووسن.



## مامۆستای شاعیرانی موکریان

وەک ئاگام لێ بێ بەسەرهاتی ئەم شاعیرە مەزنە لەلایەن لاوێکی زانا و ئەدەبدۆست و لێزانەوە بەدوور و درێژی نووسراوە و شێعرەکانی بەوردی شی کراونەتەوە و نەخشی بەرچاوی ئەم گەورە پیاوە لە ئەدەب و سیاسەتی نیوەی یەکەمی چەرخی بیستەمدا، بەتەواوی ڕوون کراوەتەوە. با ئەم نووسراوەش جارێ چاپ نەکرابێ و بڵاو نەبووبێتەوە. من لەخۆم ڕانەدی لەم بارەدا بۆ خاتری دوو شت چ بنووسم. یەک نەمویست ڕەنجی ئەو بەفیڕۆ بدەم، دوو، من لەو بابەتە نووسینەدا شارەزانیم. لەم بڕوایەدام هەر کارێک دەبێ پسپۆڕی خۆی بیکا.

هەتاو هەروا لەبن هەوردا نابێ، کورد هەر وا بەبێ بەشی و چارەڕەشی و لێقەوماوی ناژی. ئەویش هەر وا بەنەناسیاوی نامێنێتەوە ڕۆژێک هەر دێ دیوان و بەسەرهاتی چاپ بکرێ و لەنێو نەتەوەکەیدا باشتر بناسرێ و تەنانەت پەیکەریشی بۆ دروست بکرێ. هەر ئەوەندەم ویست چەند نموونە لە شێعرەکانی بخەمە پێش چاوی خوێنەران.

بەشانازییەوە دەڵێم من بەمێرمنداڵی و لاوەتی زۆر جار ئەم شاعیرە مەزنەم لە نیزیکەوە دیوە. لە قسە خۆش و جوان و بەتامەکانی، لە شێعرە بەرزەکانی لە پەند و ئامۆژگارییە بەنرخ و بەسوود و دڵسۆزییەکانی گەلێکم کەلک وەرگرتووە.

بەش بەحاڵی خۆم و پێم واشە بەهەڵە نەچووم. ئەم شاعیرە بەمامۆستای شاعیرانی نیوەی یەکەمی ئەم چەرخەی کوردستانی ئێران و بەتایبەتی مەڵبەندی موکریان دەزانم.

شـــاعیرەکانی پێش ئێمەی موکریان وەک شێخ ئەحمەدی سریلاوا و دوکتۆر شەوقی و خاڵەمین و ســـەید کامیل، ئەگەر نەشڵێن بیری نەتەوایەتی لەوی فێر بوون و جووتیاریان لەوی وەرگرتووە. ئێمەش شـــاعیرەکانی پاش ئەوان وەک هەژار و عەتری گڵۆلانی و هێمن پەیڕەوی ئەوانمان کردووە و دیارە شـــاعیرەکانی لاویش وەک سوارە و هاوار و مەحموودی و مەلا غەفوور، ئەم ڕێڕەوەیان بەرنەداوە.

ئەبولحەسەنی سەیفی قازی کوڕی میرزا قاسمی قازی براچوکەی میرزا فەتتاح و قازی عەلی و مامی پێشـــەوا قازی موحەمەدی نەمر و ســـەدری قازی شـــەهید و باوکی حەمە حوســـین خانی نەبەز و تێکۆشـــەر بوو. گـــەورە پیاوێکی زانـــا و ڕووناکبیر و خوێندەوار و کارامـــە و بەئەزموونی موکریـــان بووە. زیاتر خەریکی کاری سیاســـی و کۆمەڵایەتی و کشتوکاڵ و مڵکداری بوو. سووفی و دڵتەڕ بوو، شاعیری پیشەی هەمیشەیی نەبوو. کەچی لە ڕیزی شـــاعیرە هەرە بەرزەکانی کورد دەژمێردرێ، جگە لە زەوقی شاعیری، کۆمەڵناس و مێژووزان بوو.

لە شـــێعری دڵداریدا کە کەمی بەدەســـتەوە هەن، شـــاگردی قوتابخانەی شاعیری بێ وێنەی، پایە بەرزی، هەڵکەوتـــەی کورد (نالی) بووە. ئەگەرچی غەزەلە تەڕ و پاراوەکانی ناگەنە غەزەلی نالی بەڵام بەڕاشکاوی دەتوانم بڵێم شاگردێکی باشی ئەم قوتابخانەیە و زۆر کەمتر لە شـــاعیرەکانی دیکەی لاسایی کردنەوەی لە شێعردا هەیە، پێشینیان گوتوویانە: «لە شـــێر ترسان عەیب نییە» شـــاگردی باشی نالی بوونیش پایەکی کەم نییە. نالی لەو ئەســـتێرە پڕشـــنگدارانەیە کە هەر بەچەند چەرخ جارێک ئاسمانی ئەدەبی گەلێک ڕووناک دەکەنـــەوە و نموونەیان لەنێو هەموو گەلێکدا هەیە. مەرج نییە هەموو کەس وەک من بیر بکاتەوە. ئەمما منیش بۆم هەیە بڵێم هەرچەند پاش نالی گەلی ئێمە شاعیری زۆر بەرزی هەبوون. بەڵام هێشتا لەنێو کورددا شاعیرێک هەڵنەکەوتووە جێی نالی پڕ بکاتەوە، مەگەر دایکی نیشـــتمان لەداوڕۆژدا ڕۆڵەیەکی وا شـــیرین و نـــازدار و بلیمەتێکی وا گەورە و بێ وێنە لە ئامێزی خۆیدا پەروەردە بکا. بەڵام شـــاگردی باشی نالی بوون هونەرە. سەیفیش بەشاگردێکی گەورەی نالی دەناسم کە قوتابخانەکەی بەهۆی حەریق لە موکریاندا بۆتە باو. سەیف هاودەم و دۆست و شاگردی حەریق بووە.

سەیفی قازی لە شـــێعری نیشتمانی و شۆڕشگێڕانەشـــدا یەکەم شاگردی قوتابخانەی شاعیری نەمر فەیلەسووفی زانا و ڕووناکبیری کورد حاجی قادری کۆیی بووە. لە مەڵبەندی موکریان شاعیرێک ناناسین پێش ئەو شێعری نیشتمانی، ئەویش ئەوەندە حەماسی دانابێ.

سـەیفی قازی خۆی قوتابخانەیەکی نوێـی لە ئەدەبی کوردیـدا کردۆتەوە. بەیەکەم شاعیری کوردستانی دەناسین کە بای داوەتەوە سەر ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی و بەزمانی زەحمەتکێشان و ڕەنجبەرانی لادێ شێعری گوتووە. تێکۆشاوە تەعبیری ناسک و ڕەسەنی کوردانە لە شـێعری سـاکار و ڕەوان و جوانی خۆیدا بگونجێنێ. وشەی پەتی و ڕەسەنی کوردی لە کاربێنی و زمانەکەمان بەچەشـنێکی وەستایانە و شارەزایانە بژار بکا و وشەی بێگانە و نامۆی لێ دەرباوێژێ و بەشایەدی هەموو زماننا‌سێک لەم کارە بەنرخ و بەکەلکەدا زۆر سەرکەوتووە.

ئەم شـاعیرە بەرزە بڕوای وا بو و بڕوایەکی ڕاسـتیش بوو، کە دەبێ وشـەی پەتی و ڕەسـەن لە دێ و لە نەخوێندەوار فێربین و کێشـی شـێعر لە فۆلکلۆری کۆن وەرگرین و تەعبیـر و ئەزموونی کوردانە بەکاربێنین. بەڵام دەیگوت ئەم وشـە بێگانانەی لە کۆنەوە لـە کوردیدا جێگای خۆیان گرتـووە و نەخوێندەوار تێیان دەگا تازە بوونە کوردی و هەق نییە بیانگۆڕین یا وەدەریان نێین. ئەو دوژمنی بێ ئامانی وشـە داتاشـینی ناشیانە بوو و ئەو ناشـیانەی لە خۆوە نەزانانە، وشە دادەتاشن بە دوژمنی زمانی کوردی دەناسی. لەم ئاخرانەدا کە هێشـتا مابوو و وشە داتاشین ببووە باو. بۆ ئەوەی تووڕەی بکەی بەس بوو کە وشەیەکی داتاشراوی ناڕەسەنی نیشان بدەی و بۆ ئەوەی خەنی بکەی دیسان بەس بوو وشـەیەکی ڕەسـەنی کوردی بۆ بدۆزیەوە. تەنیا ڕەخنەیەکی لەباری زمانەوە لێی دەگیرێ ئەوەیە کە هەر لە لەهجەی موکریاندا زۆر شارەزا بوو و لەبەر نەبوونی قامووسێکی کوردی کەمتر ئاگای لە وشە جوان و ڕەسەنەکانی شێوەکانی دیکەی کوردی بوو.

قوتابخانەی سەیفی قازی لە کوردستانی ئێران بەتایبەتی لە موکریاندا شاعیری ئەوتۆی پێگەیاندن کە زۆریان بەمامۆسـتای گەورە ناسـراون و لە مامۆسـتاکەیان تێ پەڕاندووە. بەڵام هەقی مامۆسـتایی بەسـەریانەوە هەیە، چونکە ئەگەر ئەو ئەم ڕێچکەی نەشکاندبان دیارە هەر لەسـەر ڕێبازی وەفایی و ئەدەب و حەیدەری و ئەو جۆرە شاعیرانە دەڕۆیشتن کە لەباری زمانەوە پڕن لە وشـە و تەعبیری بێگانە. دیارە کارم بە پلەوپایەی شـاعیرانی هاوچەرخی ئەو نەداوە بەڵکو مەبەستم ئەوەیە ئەوان بۆ بووژاندنەوەی زمانەکەمان هەوڵێکی ئەوتۆیان نەداوە.

بەڵام سـەیفی قازی بەخۆی و شـاگردەکانیەوە لە ژیاندنـەوە و بووژاندنەوەی زمانی کوردیدا نەخشێکی دیار و بەرچاویان هەیە.

تـا ڕادیـۆ چەپرەکەکانی کوردی بەوەرگێڕانی ناپوخت و دزێو و وشـە داتاشـەکانی

شارنشین و خۆپەرەست، بە داتاشینی وشەی ناشیرین و نالەبار و ناڕەسەن زمانی کوردییان وا شپرێو و شپرزە نەکردبوو. قوتابخانەی سەیف خزمەتی بەکەلکی بەزمانی کوردی کرد. وێستاش لە موکریاندا شاعیر و نووسەری وا هەن ڕێبازی ئەویان هەر بەرنەداوە و پەرەیان پێ داوە.

ئەوەش چەند نموونە لە جۆرەکانی شێعری ئەم شاعیرە کە پێم وایە ناتەواوییان تێدا هەیە. بەڵام لە دوور وڵات هەر ئەوەندەم بۆ پەیدا بوو بەهیوای ڕۆژێک کە دیوانی تەواوی چاپ بکرێ.

## کوردینە

کوردینە! تا کەی ئێمە لە شاخان میسالی دێو

بێین و بچین و بۆمە نەبێ قەت خودان و خێو

خەڵکی هەموو لە شار و لە باخانە کەیفخۆش

ئێمە بڵاو و بێ سەرە ماوین لە دەشت و کێو

بۆ وانە هەرچی جوانە، لە جێ، دێ لە ژن، لە ماڵ

هەر شاخ و داخە بۆمە کوڕی ڕەش، کچی دزێو

بۆ ئاسمان دەڕۆن و لە بەحرا دەکەن سەفەر

هەر هەردە نیشتەگاهی مە، سەنعاتە وەرد و شێو

ڕەشماڵە ماڵ و کەشک و پەنیرە مەتاعی مە

قەسر و سەرایی خەڵکی دێیە پڕ لە زێڕ و زێو

هەر میللەتێک لەلاوە هەقی خۆی بەدەستەوە

کوردێک کە سەر هەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو

بۆ چمانە ماڵ و سەر کە لەسەر سەروەری نەچێ

کوڕ نابێ قەت بترسێ لە زیندان و دار و چێو

گوردانی کوردەکان بەخودا ڕۆژی غیرەتە

دەسدەنە خەنجەران و پیاوانە وەرنە نێو

سەرچوونی تەخت ڕۆینی سەرداری پێ دەوێ
خۆشیمە لەو شەهادەتی شێخانە نێو بە نێو
فیکری لە حاڵی خۆکەن و بگرین بەحاڵی خۆ
شاهان بەمەحوی ئێمە دەبەستن گرێ و گرێو
ئەو ژینی بەو زەلالەتە بۆچمانە چاوەکەم!
بمرین لە ڕێی نەجاتی وەتەن با بەنێر و مێو
تا کەی لە باخی خەڵکی بەزیزی و بەملکەچی
خۆشە لە باخی ملکی چینی هەنار و سێو
هەرچی دەبێ بلا ببێ حەق هەر حەق «حەسەن»
نینە لە ڕێی وەتەن خەمی دەرکردن و جنێو

ئەمە نموونەی شێعری نیشتمانی و شۆڕشگێڕانەیەتی وا دیارە شینی بۆ شەهیدانی کوردستانی تورکیا گێڕاوە. جگە لەوەی زۆر پڕ سۆزە، زۆریش هاندەرە. ئاشکرایە وەک پیاوێکی سیاسی و پسپۆڕ لە گرێکوێرەی مەسەلەی کورد گەیشتووە و ئاگای لە فێڵ و دەهۆی دوژمنان بووە، بەو حاڵەوە نەتەوەکەی بۆ خەبات هان داوە. ئامۆژگارییەکانی لە بنەماڵەی نیشتمانپەروەری خۆیدا پتر کاریگەر بووە. وەک دەزانن جگە لە دوو برازا و کوڕێک، چەند خزمی زۆر نیزیکی لە عەشیرەتی بەگزادەی فەیزوڵلابەگی لەپێناوی ڕزگاری کوردستاندا چوونە سەردار و بوونە قۆچی قوربانیی ئازادیی گەلی کورد. ئەمەش نموونە شێعری ئاشقانە و دڵداری سەیفە و دیارنییە کەی گوتراوە، شێعرناس دەزانێ چەن وردەکاری شاعیرانەی تێدا بەکار هاتووە و وشەی چەن ڕەسەن و جوانی کوردی تێدایە و قافیەیەکی هەڵبژاردووە وەک قافیەی شێعرە نیشتمانییەکەی ڕەنگبێ پێش ئەو هیچ شاعیرێکی کورد خۆی لێ نەدابێ.

## داوەڵی دڵ

دایــــم دڵـــــم بـــەنـــاڵـــە و زاری و فیغـــــان دەڵـــــێ:
خـــــۆش بـــەو شـــــەوە کـــە ڕۆژی ڕوخـــی دڵبـــەرم هـــەڵـــێ
زولفـــــــت وەلادە ڕووت بنـــــوێنــــــە بـــا دەفعـــــەیـــە
شــــــەو ڕابـــرێ، ســــــتارە نـــــەمێنـــــێ، قـــەمـــەر هەڵـــێ
تفڵـــــــی دڵـــــم گـــــڕووی شــــــەکـــەری لێـــوی گـــــرتووە
بـــەو زولفـــی میروەحـــەت مەکـــە مەنعـــم لـــە شـــەهدی لێـــو
تفڵێکـــــــە دڵ زەعیــــــف و دەتـــــرســـــێ لـــە داوەڵـــــێ
ئەو قافیـــەت بـــەســـــانی دڵـــی مـــوددەعـــی حـــەســـەن
تـــــەنگە، درەنگـــە، مـــــەیلی بـــەجـــەنگە، هـــەڵـــێ، مـــەڵـــێ

**شـــاکاری هەرە بەناوبانگی سەیفی قازی بەڵکو یەکێک لە شاکارەکانی شێعری کوردی پارچە شـــێعری زســـتانە، بەشی زۆری کوردستان زۆزان و ســـارد و بەفرگرە، کەچی کەم شـــاعیری کورد دەناسین وەســـفی زستانی کردبێ. مامۆستا لەم شـــێعرەدا تابلۆیەکی لە زستان و لە ژیانی لادێ نشین و ئاژەڵدار و زەحمەتکێشانی کورد کێشاوە کە بێگومان بێ وێنەیە. جگە لەوە بەزمانێکی سادە و ڕەوان و لادێیانە گوتراوە و فەرهەنگۆکێکە لە وشەی ڕەســـەن و پاکی کوردی، پڕە لە ئامۆژگاریی سیاســـی و کۆمەڵایەتی و تەنانەت ئابووری بۆ زەحمەتکێشـــان و دێنشـــینانی کورد. وردبوونەوە لەم شـــێعرە بۆمان ڕوون دەکاتەوە، شـــاعیر چەن ڕووناکبیر و ئازادیخواز و کۆمەڵناس و گەلپەروەر بووە. سەیر ئەوەیە سەیف خۆی لە چینی تەسەل و دەوڵەمەند بوو و لە کشتوکاڵ و مڵکداری و دار چەقاندن و ماڵ بەخێوکردندا ناوبانگی ئێستاش هەیە و شوێنەوارەکانی هەر ماون، کەچی دەبینین شارەزای**

ژیانی چینە هەرە هەژارەکانی ئەو سەردەمی کوردستان بووە و دڵی بۆیان سووتاوە و شینی دەگەڵ گێڕاون. ئەم شێعرە وەک بۆ خۆی ئیشارەی کردووە لە ساڵی ١٣١٢ی هەتاویدا گوتراوە کە زستانێکی زۆر درێژە و سەخت و قڕانێکی گەورە بووە و زۆر ماڵ لە ماڵ کەوتوون و زۆر دەوڵەمەند بێڵیان لە بن میچ چەقاندووە. شێعرەکەی وەک نامەیەک بۆ دۆستی خۆشەویستی عەزیز ئاغای عەبباسی کە ئەویش ئەهلی زەوق و حاڵ و سۆفی و دڵتەڕ بووە نووسیوە:

## زستان

ئازیز ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو زەردی ڕووی لێنام
دیسان بەئاوری دووریت کەوتمە گیر
دنیام لێ ساردبوو بوو بەزەمهەریر
تا ناهومێد بووم لە هاتنی زووت
جەرگم بووە پولوو هەناسەم بزووت
هەوا بۆ حاڵم وەک شێتان دەگری
بەتەرزە و بەفر و باران و هەوری
هەردیش لەبۆ من هێندەی قوڕ پێوا
بەهاری دەگەڵ زستان لێ شێوا
گیا وگوڵی مێرگان بۆم سیس و زەرد بوون
بۆ شینی کەوان کەویان هاودەرد بوون
شینی بەهارە ئاسمان هەر دەگری
هەوریش ناڵە ناڵ ڕووی خۆی دەپچڕی

بزن و مەڕ ڕووتن وەک سوورە ساقە
یەک دانوو دەیکوشت یەک بەلەباقە
لەبەر بێ هێزی لە ترسی سەرما
پشتینیان بەستن هەمووی جل کرا
با لە کێو و چۆڵ خۆڵ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا
داری مێشە و باخ بەفر داپۆشین
پاک دەڵێی مردوون کفنیان پۆشین
کەوی کوێستانێ لە قاسپە کەوتن
بێهۆش بوون یاخو خەویان لێ کەوتن
جریوە و زریوەی چوورە و چۆلەکە
نایە و نەیانما هێلانە و هێلکە
لەگلەگ گەل کەوت، نەما تەق تەقی
سێرووش لە سیرە و فیتنە و چەق چەقی
پاک پەشیمانن لە بۆ گەرمێنێ
بۆ دەهاتنەوە عەمرو نەمێنێ
قاز لە شەتاوان قارەی لێ بڕا
دورنای چۆماوان زورنای لێ دڕا
لە درزی ئەرزی هەوێردە دامان
بێ هۆش بوونەوە سڕبوون لە سەرمان
وشک بوو دووپشک ئەو خواری ناڕاست
مشک کونی خۆی بەئاوات دەخواست
بۆق کە دەی قڕاند دەویی کردەوە
کەریش زەرینی لەبیر بردەوە
مار پاپۆکەی خوارد خۆڵی وەڕووی کرد

ژووشک ئارەزووی کەولێکی مووی کرد
لاڵ بم نابینم لە چیا و لە ڕازان
سیرەی هەڵۆ یان چریکەی بازان
لەبن بەردان مان هەر سەر مازەڵە
لە باخ و باخچان قەل و قشقەڵە
پووشی داپۆشی داڵدەی پاک بڕی
کەروێشک ڕیشەی پاک کرد و بڕی
بەفری بێ وادە ڕەشانگی بڕی
ڕەشانگ و سپی پاکیان سەر بڕی
سەر بڕا گاشین پاش مانگا بۆرە
لەباتی گاڕان ڕۆیی گابۆرە
ڕۆژ هەتا شەوێ گەورە و بچووکیان
خێزانی ماڵێ گەورە کچ بووکیان
خەریکن لە باخ فریزوو دەردێنن
وەک شەونەمی گوڵ ئارەق دەڕژێنن
ئارەق لە هەنیان بەرێز بژمێرە
کێ دی لە ئاسمان بەرۆژ ئەستێرە
لە دەوری سەریان دەسرۆکەی هەوری
وەک مانگی چاردە لەنێوان هەوری
کەوتە سەر پیلان دەسرۆکەی نوێژێ
کەژە هەوری گرت لە دەوری ڕۆژێ
دەسماڵی ملیان پشتێنی شلیان
چنار و لاولاو چاوی بە کلیان
زولفیان لەدوویان وەک ڕەشمار دەخشان
ڕەش بوون وەک شەوە بەرۆژ دەدرەوشان

بەلەرزە دەچنە فریزوو ڕنین
گریان کاریانە لە جێی پێکەنین
بۆ چنینەوە کەڵەکەی دەکەن
پۆلی کەوانن کە چینەی دەکەن
پاچ و پێمەڕە و بێڵ لەسەر شاندا
وەک فەوجی حازر لەژێر فەرماندا
هێندە لاوازە مەڕ و ماڵاتیان
قوربانی ناکرێ نادرێ زەکاتیان
گا لەبەر لەڕی هەڵناگری نیری
نە مەڕ ماستی ما، نە مانگا شیری
لۆک چەمبەری بوو، مایین مشمشە
گا گوێ ڕەپەی گرت گامێش خشخشە
کەڵ و گامێشیان بوونە چەکچەکی
وشتریان عەینی بێچووی لەگلەکی
نایە فیتووی شوان لەسەر شەوینێ
مێگەلی چێشتاو لە کوێ دەنوێنێ؟
کوان شەنگەبێری لە هۆبە و بانان
شلقەی مەشکەیان بەری بەیانان؟
قۆڵیان هەڵدەکەن دەڵێی بلوورە
سینگیان دەردەخەن پارچەیەک نوورە
دەرزی بەرۆکیان کە دێن دەرێنن
مانگ لە ئاسمانێ بۆ زەوی دێنن
زولفان لابەلا دەکەن بەلادا
ڕۆژ هەوری لەسەر ڕووی خۆی وەلادا
قەد و بالایان وێنە نەمامان

کـــێ دی ئــەمامــان بگــرن شــەمــامــان؟
کـــوێریـم نابینــم خێــل بـــەرەو خـــواران
تـــەقڵـــە و ڕمبـــازی و هەو هـــەوی ســـواران
کوا «پیـــرووت ئاغا» ســەرخێڵــی کـــوردان؟
لـــە «قـــوڵەســـەنی» ڕا بچێتـــە کـــوێستان
لـــە کوێیە «ئاغـــی» ئـەو چـــادری جـــوانی؟
تیـــپ تیپ میوانـــی ســـەر ســـفرە و خـــوانی
کـــوانـــێ ســـەید ســـەمەد ئەو مەردی ڕەشـــید
بـــۆ «مایـــن بلاغـــی» بچـــێ بـەتـــەمهیـــد
دێهـــات لێکـــی دەی چـــادر و هـــۆبـــانـــی
گیـــر ناکـــەوێ ڕۆن بـــۆ چـــەورەســـانی
وەگیـــر ناکـــــەوێ، ماســـت بـــۆ هـــەوێنـــی
دۆی هــــەڵگێـــڕیـــەوە یـــا بیکـــــولێنـــی
پـــەنیـــر بووە ئیکســـیر شـــیر ئـــاوی حـــەیات
هەر وەک ئەســـکـــەنـدەر کـــەوتینە زوڵمـــات
شـــەمـــاڵ و زریـــان دایـــم شـــــەڕیانـــە
ئاغـــــاوات شـــــڕن کـــرمانـــج قـــڕیانـــە
زســـتانی ئـــەمســـاڵ دیـــارە پێنـــج مانگـــە
کـــا و گیـــا و مـــەڕ، بـــڕا لـــە دانگـــە
تـــەویلـــە و هـــۆڵ و هـــەیوان هـــەڵـــوەشـــان
پـــــووش و قامیـــــش و ئـــاڵاش دەرکشـــان
دران بـەگـــاڕان وەک وێنجـــەی نـــوخشـــان
خـــرانـــە بـەرمـــەڕ لـــە دانگـــە و حـــەوشـــان
کـــرمانـــج دەوڵـــەتـــی پـــڕ و پاتـــاڵ بـــوو
کۆچـــی دێ بەدێـــی بەمانـــگ و ســـاڵ بوو

ئــەویش لە دەس چــوو هێنــدە کــۆچ مــەکەن
کای ســەر و نوێ کــەن جووتــی زۆر بکــەن
حاســڵی عــومــر و لــە زۆر و کــەمــی
داتان بەکـــا و گیـــا لــەنێــو عــەجــەمــی
ڕێــی کاکێشـــانی وەک کــەهکــەشــانە
قــەتــاری وشـــتر وەک ئــەســتێرانــە
کـــای زەرد و ڕزیــو وەک لیــرەی ســووره
وێنجەی ڕەش و شـــین پێســتی ســەمــووره
قیمــەتــی کایــە وەک کــارەبــایــە
بــۆتــە قــووتــی ڕووح وێنجەی ســەحرایــە
بـــاخـــان دابنێـــن داران بنێـــژن
نــەجیــب و ئــەســڵ و کۆن و لــەمێــژن
حــەیفە میللــەتێ شــەش هــەزار ســاڵ بــێ
نــۆکــەری مــاڵان ڕووت و ڕەجـــاڵ بــێ
نـــۆکــەری مـــاڵان عەیبــە لــە بــۆ مــە
کــۆڵان هەڵگریـــن بــە کۆمــە کۆمــە
چیــدی دوژمنـــان بەخــۆ خــۆش مەکــەن
بــۆ بــووزوو و کەپەنــک باڵا پــۆش مەکەن
تاکــەی لــە دەرکـــان کــز و دامـــاو بیــن
بــێ مــەزن و گــەوره و ســەر بــێ کڵاو بین
هــەر کــەس ئــارەزووی ماڵانــی هــەبــێ
وەجاغــی کــوێــر بــێ منداڵــی نــەبــێ
ئــەو بــەدبــەختیەی لە کــورد ڕووی دابــوو
لــەبــەر نــەخوێنــدن کــۆزیان ســاوابــوو
واجبـــە خـــوێنـــدن بــۆ دنیـــا و دینـــی

پێغەمبەر فەرمووی بۆچوونە چینی
بەکوتە و شانامان میللەت دەمێنن
بەمیر و مەزنان شان دەشەکێنن
دەردی دڵ دەکەم کورت و کرمانجی
حەسەن کرمانجی چت لە دیلمانجی؟

***

خوسرەو جوانەگا بۆری مردار بوو
خواردنی فەیزوو و گەڵای بندار بوو
دەگەڵ خونچە گیان شینیان دەگێڕا
ساڵح و قادریان دەسەر دەگێڕا
کەرە بۆزیشیان لەسەر وەستایە
کوڵی گریانیان لە ئەوکی دایە
تازە ماڵانی تۆ داخوا چۆنن
ئەوانیش خەریک فەریزوو و کا کۆنن
دڵت تەنگ نەبێ تفاقت هەبێ
ئەوی تۆی نەبێ یاخوا هەر نەبێ
عومەر و عوسمان بووبەکری نازدار
بەناز گەورەبن ها نامە چوار یار
جێژنی قوربانە خۆم قوربان دەکەم
خۆم بەقوربانی عەزیز گیان دەکەم
تاریخ هەزار و سێ سەد و دوازدە
بیستی فەروەردین داد و بێدادە

***




## حاجی قادری شۆڕشگێڕ

ژیان ناپسێتەوە، تەبیعەت ئەستێور نابێ، ڕۆژ و مانگ و ساڵ و چەرخ بەدووی یەکدا ڕێچکە دەبەستن. زۆر ئەحمەد، چاو دەکەنەوە، دەگەنێ، ژن دێنن و دەبنە باوک. زۆر فاتێ بەخۆدا دێن، بەبووک دەچن و زگ دەکەن. زۆر قادر لەدایک دەبن، پەڕەوازە دەبن، پیر دەبن و دەمرن. بەڵام کەم قادر بە حاجی قادری کۆیی دەبن، بوونە حاجی قادری کۆیی هەروا سووک و هاسان نییە. بەخۆ هەڵمساندن، با فیشکردن و لە خۆباییبوون پێک نایە، بەچەند دێر نووسین، چەند قسە کردن و چەند شێعر گوتن تەواو نابێ. فیداکاری، گیانبازی و لەخۆبووردنی دەوێ. دەس لەخۆ بەردان دەگەڵ سوێری و تاڵی ڕاهاتن دەگەڵ سەختی و بەرەنگاربوونی دەوێ. پێویستی بەچاوی نەترس و کۆڵنەدان و نەبەزین هەیە.

حاجی قادر مەلایەکی زانا و شاعیرێکی ناسک خەیاڵ بووە. ئەگەر نیشتمانپەروەرێکی وا دڵسۆز و ڕاست و تێکۆشەرێکی وا گەرم و گوڕ و ئازادیخوازێکی وا کۆڵنەدەر و نەبەزیش نەبوویایە و لە گۆشەی مزگەوتێک یا کونجی خانەقایەک دەرسی گوتباوە و نوێژ و تاعەتی خۆی کردبایە و چەند غەزەلێکی کوردی لەپاش بەجێمایە. دیسان ڕەنگ بوو لەنێو نەتەوەکەی خۆی ناوبانگی بکردبایە. - بۆ ئی وامان کەمن - بەڵام خۆشەویستیی حاجی هەر لەبەر زانایی و شاعیری نییە. حاجی کوردێکی پاک، تێکۆشەرێکی چاک، ڕەخنەگرێکی ئازا و بێ باک بووە. نەترساوە، نەبەزیوە، ناهومێد نەبووە، ماندوویی نەزانیوە، هەلپەرست نەبووە، ئیمانی تەواوی بەم شێعرە بەرزەی خۆی بووە کە دەڵێ:

مــەرگ و ژین میســـلی ســـێبەر و تــاوە
ئــەوی باقـــی بمێنـــێ هــەر نـــاوە

حاجی لە قووڵایی دڵەوە نەتەوەکەی خۆشویســـتووە و نیشـــتمانەکەی پەرســـتووە. شارەزای مێژوو و جوگرافیای وڵاتەکەی بووە و بەتەواوی هەستی بەبێ بەشی و چارەڕەشی نەتەوەی زۆرلێکراوی کورد کردووە. دەسەوەستان و تەوەزەل و ترسەنۆک نەبووە، گەڕێدە و کارامە و ئازابووە و هێز و توانای خۆی بۆ ئازادیی نەتەوەکەی تەرخان کردووە.

حاجی لەنێو خەڵکدا ژیاوە، کۆمەڵی خۆی باش ناســـیوە، کەم و کورییەکانی بەچاوی خۆی دیوە، لە دەرد و ئازارەکانی گەیشـــتووە و نەک هەر دەرمانی بۆ دۆزیوەتەوە بەڵکو زانایانە و ئازایانە باسکی لە تیمارکردن و چارکردنی هەڵکردووە.

حاجـــی لەو ڕێـــگا پڕ خەتەرەدا، بەرەو ئەو ئامانجە بەرزە ڕۆیشـــتووە. هەموو ڕەنج و کوێرەوەری و تاڵ و ســـوێری و گیروگرفتێکی بەگیان و دڵ قبووڵ کردووە. نە وەستاوە و نە وچانی داوە و نە ترســـاوە و نە ســـارد بۆتەوە. گاڵتەی بەمەرگ کردووە و لە داوەڵێک نەپرینگاوەتەوە و لەبەر هیچ ڕووداوێک چۆکی دانەداوە.

حاجی بەگزادە و شێخزادە نەبووە، بەشیر و شەکر پەروەردە نەکراوە، لەسەر دۆشەگی پـــەڕی قوو پێ نەگەیشـــتووە، بەهەژاری و نەداری و بەهەتیوی و هەناسەســـاردی گەورە بووە. بەپێخاوســـی و لینگ ڕووتی وەدووی خوێندن و فێربوون و خۆ پێگەیاندن کەوتووە و دەڵێ:

بـــەبیـــرت دێ زەمانێـــک چـــووینـــە باڵـــەک
بـــەپێخاوســـی نە کـــەوشـــم بـــوو نـــە کاڵەک

حاجی ئینسانێکی واقیعی، ڕابەرێکی زانا و مەزن و ڕووناکبیرێکی شۆڕشگێڕ و بەجەرگ بووە، ئەو ویســـتوویەتی شۆڕشێکی قووڵی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و فەرهەنگی لە کوردســـتان بەرپا بکا. نەتەوەکەی لە ژێر دەستی و کۆیلەتی، لە هەژاری و نەداری، لە نەزانی و نەخوێندەواری نەجات بدا. ئەو ویستوویەتی بۆ بەجێگەیاندنی ئەو ئامانجەی خۆی لە هێز و توانای هەموو توێژ و چینەکانی کۆمەڵ کەڵک وەربگرێ.

حاجی بڕوای تەواوی بەمافی دیاریکردنی چارەنووسی گەلان هەبووە و کاتێکی دیویەتی کورد لەو مافە ڕەوایە بێ بەشە هاواری لێ بڵیند بووە:

هەر کــوردە لــە بــەینــی کــوللــی میللەت
بــێ بــەهــرە لــە خــویـنــدن و کیتــابــەت

یا:

میللــەتــی بــێ کتێــب و بــێ نــووســین
غــەیــری کــوردان نییە لــە ڕووی زەمــین

هۆی ئەم بێ بەشییەی زانیوە و ڕێگای نیشان داوە. چونکە تێگەییوە کە بەشی هەرە زۆری لێقەومانی گەلی کورد نەبوونی یەکێتییە. وای گوتووە:

تــــا ڕێک نــەکــەون قــەبیلــی ئــەکراد
هــــەر وا دەبنــــە خــــرابــە ئــابــاد
ئــەنــواعی میللەل لــە گــەورە تا چــووک
خــەملیــوە مــەمالیکــی وەکــــو بــووک
هەر کــوردن ئــەگــەرچـــی پاکی مــەردن
پامــاڵــی زەمــانــە مــەحــوی کــردن

حاجی ویستوویەتی پێ بەپێی شۆڕشی سیاسی و جوولانەوەی ڕزگاریخوازی، شۆڕشی کۆمەڵایەتیش دەس پێ بکرێ. کۆت و زنجیرەکان بپسێنن، ڕێوشوێنە کۆن و ڕزیوەکان لە نێــو بچن. لە زەمانێکدا کە ژن یانــی نیوێکی کۆمەڵی کوردەواری وەک پیواز لەبن حەوت توێکڵدا شــاردراوەتەوە، لە ســەردەمێکدا کە ژن وەکوو کۆیلە و ئێخسیر چاو لێکراوە. لە حاڵێکدا کە ئەندەروونی شێخ و ئاغا و بەگەکان بەتەقلیدی «بابی عالی» پڕ بووە لە ناسک

و نازداری زێڕ خرید حاجی ڕووناکبیر چ بڵێ باشە؟

بـــۆچـــی فـــەرمـــوویـــەتی نـــەبی ئـــەمین
اطلـــب العَلـــم و لـــو بالصیـــن
نێـــر و مـــێ لـــەم حەدیســـە فەرقـــی چییـــە؟
گەر مـــەلا نـــەهـــی فـــەرموو دینـــی نییـــە

حاجـــی بێ باک و ئازا، حاجی گەلپەرســـت و نیشـــتمانپەروەر، حاجی تێکۆشـــەر و لەخۆبـــوردوو هەر بەوەندە ڕانەوەســـتاوە. بەتوندی و تووڕەیی، بەبێ پەروا و ســـڵکردن، ئازایانە و بێ باکانە بەڕاشـــکاوی لە چەرخی نۆزدەدا و پلاری وای لە شـــێخ و خەلیفەی درۆزن و دەســـبڕ و سۆفی و دەروێشـــی بێکارە و خوێڕی و ڕەممالْ و مارگری تەوەزەل و مفتەخۆر گرتوون، کە ڕەنگبێ دوو پاتەکردنەوەیان لە بەشی سێهەمی قەڕنی بیستەمدا بۆ ڕووناکبیرێکی کورد لە زۆر شوێنی کوردستاندا بەگران تەواو بێ وەک:

خانـــەقـــا و شـــێخ و تـــەکیەکان یـــەکســـەر
پێـــم بڵێـــن نـــەفعیـــان چییـــە ئاخـــر؟
غـــەیـــری تـــەعلیمـــی تـــەمبەڵـــی کـــردن
جـــەمعـــی ئـــەملاک و خـــەزنـــە کـــۆکـــردن

یا:

وشـــکە ســـۆفـــی بڵێ بـــەشـــێخی تـــەرەس
بـــا بـــەســـەرما نـــەیـــە میســـالی هـــەرەس
کـــەر نـــەبـــێ کام مـــونـــەووەری خـــەڵـــەتان
بـــەن گـــرێ دان و تـــا بـــڕینـــو نـــەفـــەس؟

ئەم شـــاعیرە ڕاستگۆیە بەڕوونی لە فەلسەفەی ژیان دواوە و تەوژمی مادیياتی لەسەر

بیروبڕوای ئینسان بەڕاست زانیوە و ئەم پەندی پێشینیانی باش وەرگرتووە: «زگی برسی لە خواش ناترسێ» و وەستایانە تەعبیرێکی دیکە خستوویەتە ناو شێعری خۆیەوە:

سۆفی وەک خەستەبوو لە زیکری هەناو
سەد نوێژی دەدا بەکاسەیە ئاو
شیعە وەک تەشنە بوو لەسینە زەدەن
بەدە قەترەی دەدا حوسێن و حەسەن

یا:

خواردن و سەتری عەورەت و سوکنا
باعیسی ژینە بۆ گەدا و پاشا
حاڵەتی وایە چی لەسەر خاکە
غەیری عیسا دەڵێن لە ئەفلاکە

حاجی وێڕای نیشاندانی ڕێگای شۆڕشی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ڕێگای شۆڕشی ئابووریشی وەک پسپۆڕێکی شارەزا زۆر ژیرانە بەنەتەوە پاشکەوتووەکەی نیشان داوە ڕەنگە ئەم فیکرەی لەم شێعرەی خوارەوەدا هەیە لە قەرنی نۆزدەدا بەبیری کەم زانای ڕۆژهەڵاتدا هاتبێ:

لە بەینی میللەتی خۆتان بەیاری
بکەن تەقسیمی شاخ و داروباری

یا:

ئەمەش تەنیا نییە سووچ و خەتاتان
لە کەسبیش خافڵن میسلی مەلاتان

یا:

لــە بەغــدا بــۆچــی خورمــا بێــت و لیمــوون
لــەبــۆ دەرمــان لــە ماڵ بــێ ڕۆنــی زەیتــوون
لــە ئێــوە کامتــان بــوو؟ یــەک دوو جارێــک
بکاتــە کیســەیــەک یــاخــو خــەرارێــک
دوو پێــی لێــدا لــە کــۆلا میســلی دۆشــاو
وەکــو ڕۆن ڕۆنــی زەیتــوون بێتــە ســەر ئــاو
وەیــا پێــی نێــژراوە چــەنــد نــەمــامێک
لە نارنــج و تــورنــج و چــەنــد مــەقامێــک
بزانــن شــین دەبــێ؟ نابــێ؟ بــەبــەر دێ؟
لــە جێــگای ســاردوگەرمی چــی بەســەر دێ؟

***

بــەراو دێمــی ئێــوە کیمیــایــە
دوڕ و گــەوهــەر، گــەز و مــازووی چیــایە؟
مــەعادیــن خاتری تــۆ بــێ لــەگــەڵ کان
گــەنمتــان زێــڕە، حــەتتــا زیــوە، زیــوان
ڕەژووی پاپــۆڕ و خــۆی و نــەوت و گۆگــرد
لــە کێــوی ئێــوەدا کــۆیــە وەکــوو گــرد

**حاجی بڕوایەکی تەواوی بەشۆڕشی فەرهەنگی هەبووە و دەردی نەزانی و نەخوێندەواری بەدەردێکی کوشــندە زانیوە. تەنانەت خوێندنی کۆنیشــی بەدڵ نەبــووە و ڕەخنەی لێ گرتووە:**

عولــەمامــان بــەقەولــی بــێ ســەر و پــا

پاکــی خنــکا لــه بــه‌حــری وشــکی هــه‌وا
ســه‌نعــه‌تێ فێــرنــه‌بوون لــه‌پاش تــه‌حسیل
ســه‌یری چــۆن بــۆ مــوناهــی بــوونه ده‌لیل

یا:

ئــه‌ی خــه‌ریکــی ڕمــووز و ڕاز و نیــاز
ئاوروپــا فــه‌ننــی گــه‌یــوه‌تــه ئیعجــاز
قــوللــه‌ی ئیڤلــــی لــه ئــه‌فلاکــه
عــه‌کسی ئه‌و گــه‌ردیشــی لــه‌ژێر خــاکــه

حاجی زۆر به درێژی و ڕوونی باسی زانستی تازه و سه‌نعه‌تی نوێ ده‌کا و بۆ نموونه‌ی زاڵبوونی نوێ به‌سه‌رکۆندا ده‌ڵێ:

بــه‌قســه‌ی مــوخبیــر و ومــوئــه‌رخی کــۆن
میلله‌تــی چینــه چــوار ســـه‌د میلیــۆن
ســه‌ربــه‌ســه‌ر میللــه‌تی هــه‌مــوو ژاپــۆن
زۆر بــه‌زه‌حمــه‌ت ده‌گــاتــه چــل میلیــۆن
ئه‌هلــی ژاپۆن له ســایه‌ی ســه‌نعــه‌تی چاک
ســه‌یری چۆن چینــی گــرت و کــردیه خاک

له‌م شــێعرانه‌وه ده‌رده‌که‌وێ حاجی هه‌ر خه‌ریکی خوێندنــه‌وه‌ی کتێبه په‌ڕ زه‌رده‌کان نه‌بووه و زۆر خه‌ریکی پێگه‌یاندنی خۆی بووه و له ئه‌سته‌مبووڵ ڕۆژنامه و گۆوار و چاپه‌مه‌نی ئه‌و سه‌رده‌می باش خوێندۆته‌وه و ئاگای له وه‌زعی جیهان و ده‌نگوباسی هه‌نده‌ران بووه. ئه‌مه‌ش نیســبه‌ت به‌مه‌لای قه‌ڕنی نۆزده‌ی کورده‌وه شتێکی سه‌یره. به‌داخه‌وه ئێستاش له کوردستان مه‌لای وا ماون که ڕادیۆیان نه‌چۆته ماڵ. هه‌ر له‌و ساڵانه‌ی دواییدا دیتمان مه‌لای وای کورد هه‌یه که چوونه سه‌ر مانگی «ئاپۆلۆ»ی به‌درۆ ده‌زانی.

حاجی ئەوەندەی میللەتەکەی خۆش دەوێ وەک باوکێک لە ڕۆڵەی شیرین تووڕە دەبێ و قســەی ســووک لە پارسەنگی ئەو کەســانە دەنێ کە منداڵی خۆیان نانێرنە مەکتەب و باسی بێگانەکان دەکا کە منداڵی خۆیان لەبەر خوێندن دەنێن تا لە ئەنجامدا ببنە گەورەی کوردان:

ئێســتەکــە ئامــیرانی کــوردســتان
هــەر لــە بــۆتــانــەوە هــەتــا بابان
ئــەو هــەتیوانی مــەکتــەبن یــەکســەر
کوردەکـــان باردەکــەن وەکـــوو ماکەر

حاجی تەوس و پلار دەگرێتە ئەو زانایانەی کە کوردن و بەزمانی کوردی نانووســن و ئەم میساله بەجێ و جوان و کەمێک توند و تیژەیان بۆ دەهێنێتەوە:

وەک مــریشــکێ کە ئــەقڵــی نەیهێنــێ
بێتــوو جــووجکــەی مــراوی هــەڵبێنــێ
وەک بگاتە کـــەناری جــۆگــەلــەیــەک
نایــەتە شــوێنی بمری جــووجــەلــەیــەک
جێــی ئــەمــی وشــکە، جێی ئــەوی ئاوە
تێـــدەگا، قـــوون دڕانـــی پــێ مـــاوە

حاجی ئەو شایەر و بەیت بێژانەی کە شێعر و بەیتی کوردیان داناوە زۆر خۆشویستوون و ڕێزی لێ ناون و پێی هەڵگوتوون:

دوو عــەلیـــن شـــاعیرن وەکـــو حەســـان
بـــەردەشـــان و حـــەریرە مـــەسـکەنیان

ئەوهێرشی بردۆتە سەر ئەوخوێندەوارە کۆنەپەرستانەی نەخوێندەوارە هونەرمەندەکانیان لەپێش چاو سووکە:

ئێستە مەعلوومە بۆ هەموو میللەت
ئەی مەلای دەرس و موفتی ئوممەت
ئێمە بێ غیرەتین و بێ عارین
ئەوی نەیخوێندووە لەمە عارین

بەمەڕا دیارە حاجی چەند نرخی بۆ ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی داناوە. حاجی ناوی زۆر شاعیر و خۆشخوانی کوردی بەنەمری لە دیوانەکەیدا هێشتوونە، کە داخی گرانم بەشی زۆریان شوێنەوارەکانیان فەوتان و ناویشیان لە بیر چوونەوە.
حاجی قادری هونەری زانیوە و لە نێوان بەرهەمی هونەرمەند و ژیانی تایبەتی ئەودا فەرقی داناوە و دەڵێ:

مەلکەقۆڕ و حیماری با بەدناویش بن
شێعریان جوانە بەس نییە کوردن
گەرچی بەدناون و گەلێ وردن

حاجی نەمر لە نامەیەکدا کە بۆ دۆستە خۆشەویستەکەی، «جەلی زادە»ی نووسیوە باسی میکرۆب دەکا. ئەوە لە زەمانێک دایە کە دەرمانی دەردی منداڵە نەخۆشەکانی کورد بەڵغەم و تفی شێخ و تۆز و خۆڵ و داروبەردی سەر چاک و کوتەشالی سەید بووە.
حاجی قادر لە قووڵایی دڵیەوە ئیمانی بە دێموکراسی هەبووە. باسی دێموکراسی لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا دەکا و دیارە ئەوپەڕی ئاواتی ئەمە بووە ڕۆژێک ڕێژیمێکی ئەوتۆ لە وڵاتە پاشکەوتووەکەی ئەو، دابمەزرێ:

لە تەگبیری ئومووری ملکی خۆیان
شەریکن پینەدۆز و شوان و گاوان

له جـۆشـين و خـرۆشـين پـووره هـەنگن
بـەمـن چـی کافـرن یاخـۆ فـەڕەنگـن

وا دیاره حاجی لەبارەی سۆسیالیزمدا شـتی زانیوه. ئەوه بۆ من گەلێک جێی ڕامان و بیرکردنەوەیـە. ئایا نووسینەکانی (مارکس) و (ئینگلس) و هاوبیرەکانی ئەوان لەو سـەردەمەدا بەزمانی عەرەبی و تورکی و فارسـی که حاجی لەو سـێیانەدا شارەزا بووه تەرجەمه کراون؟ یا حاجی بەپیری فێری زمانی دیکەش بووه. هیچ کام لەم دوو شـکانه دوور نیـن. چونکه ئەسـتەمبووڵ لەو کاتەدا ناوەندی ڕۆشـنبیری ڕۆژهـەڵات بووه. ئەم شێعرانەی خوارەوه تەماشاکەن تا ئێوەش وەک من بکەونه دوودڵییەوه:

وەکـو بیسـتوومـه بـۆ دەفعـی مـەسـائب
وەهـای تـەگبیـر کـرد ئـەو فکری سـائیب
هـەمـوو گـەورەی ویلایـەت ببنـه ئەحبـاب
وەکـو شەخسـێکی واحیـد بـن لەهـەر بـاب
هـەموویـان ببنـه یـەک تەعلیـم و نووسـین
وه یـەک بـەرگ و زمـان و ڕەسـم و ئاییـن

ئایا ئەم کەسـانەی حاجی بەشـاعیرێکی ناسیونالیسـتی توند دەناسـن هیچ بۆنی سۆسیالیسـتی لەو شـێعرانه، ناکەن؟ گوتم حاجی قادر زۆر وریا بیرتیژ و دووربین بووه دووری بیرکردۆتـەوه و باش له مەسـائیل گەییوه. فکری زۆر لەپێش خەڵکی سـاکاردا بووه. ئێستا بۆ سەلماندنی قسەکەم دەبێ گەلێک بگەڕێمەوه دواوه و لاپەڕێک له مێژووی خوێناوی نەتەوەکەمان هەڵبدەمەوه.

وەک دەزانین له ساڵەکانی ١٩١٤ ـ ١٩١٨ دا ناتەبایی نێوان ئیمپریالیستەکان شەڕێکی جیهانی گەوره و ماڵ وێرانکەری هەڵگیرسـاند. پریشـکی ئاگری بێ ئامانی شـەڕ کەوته کوردسـتانی خۆشەویستیش و وڵاتەکەمان بوو به مەیدانی شەڕی نێوان تەزاریزمی ڕووسا و داگیرکەری عوسـمانی لەلایەکەوه و ئیمپریالیزمی فێڵاوی ئینگلیس و عوسمانی لەلایەکی ترەوه.

عوســـمانییەکان کە دۆســـت و هاوپەیمانی ئیمپریالیزمی ئاڵمان بوون، بەئاشکرایی بۆ قازانجی ئەوان بەشەڕدەهاتن. ئەو شەڕەیان ناو نابوو «خەزا» و بەبیانووی دینەوە شێخ و مەلا و مەزنەکانی کوردستانیان فریو دا و کردە تۆکەری بێ جیرە و مواجیبی خۆیان. لەو شەڕەدا وڵاتەکەمان سووتا و خاپوورکرا. نەتەوەکەمان قڕ بوو و لەبرسان مرد و گەورەترین زیانی مێژووییمان پێگەیشت.

تەنیا لە موکریان چەند کەس بەرابەری ســـەرداری موکری و شـــێخ بابا نەچوونە ژێر باری پڕوپاگەندا و درۆ و دەلەســـەی عوسمانی، سەرداری موکری «حەمە حوسێن خان» کە نیســـبەت بەزەمانی خۆی پیاوێکی ئاگا و سیاســـی و خوێندەوار بووە. لە مەســـەلەکە گەیشـــتووە و زانیویەتی «شـــەڕ لەســـەر لێفەی مەلایە» نەک لەســـەر دینی ئیســـلام و ویســـتوویەتی ئەوەندەی بۆی دەکرێ نەتەوەکەی بێ لایەن بهێڵێتەوە. بەڵام ئاڵاهەڵگرانی ئیســـلام و خەزاکەرەکانی عوسمانی ئەو و شێخ بابا و حەمەخانی بانی و سەیفەدین خانی سەقزیان بەو تاوانە ئیعدام کرد.

جـــا بزانین حاجی نەمەر، حاجی زانا و پێشـــکەوتوو کە لەو ســـەردەمەدا ئێســـک و پرووسکیشی ڕزیون چەند لەوەی پێشدا لە فێڵ و تەڵەکە و خراپەی خەلیفەکانی عوسمانی گەیشتووە کە دەڵێ:

ئـــەمـــە کـــەر میـــزە دەڵێـــن واریســـی شـــەرعی نـــەبـــەوین
هـــەموو عـــەبدی ســـەنـــەمن باســـی مـــەکە گـــەورەکـــەیان

یا:

تـــا لـــەژێر بـــەنـــدی ڕۆمیـــان نـــەگرن
زەحمەتـــە قـــەدری بەیتـــی مـــن بگـــرن

یا:

ڕوومـــی وکـــو گرێـــی مـــوون کـــەس پشـــتیان پێ نەبەســـتی
کـــەوتوونـــە داوی خۆیـــان پـــەژمـــوردە مـــان و حـــەیـــران

گەورە گەورەکانی ئەو سەردەمی کورد قەدری بەیتی حاجییان نەزانی و دیمان چۆن لەژێر باری ڕوومیان مردن. دیارە مەبەست لە گەورە گەورەکان، شێخ و مەلا و خان و ئاغا و بەگ و پاشاکانی کوردە. چونکە نابێ لەبیرمان بچێ کە لەو سەردەمیدا کۆمەڵانی خەڵک چ ڕۆڵیان نەبووە.

حاجی ئەو هەموو بێ ئاگایی و کەمتەرخەمییەی دیوە. لە نەزانی و نەخوێندەواری و دواکەوتەیی نەتەوەکەی گەییوە، کەچی ناهومێد نەبووە و بەهیوا بووە ڕۆژێک لە شێعرەکانی بگەن، خەبات بکەن و ڕزگار ببن و قەدری ئەو بزانن. خەمی ئەوەی بووە کە ئەو ڕۆژە بەچاوی خۆی نابینێ:

حەسرەتم هەر ئەوە لە دنیادا
حاجی دەمرێ بەدەورەتان ئاگا

ئەو چاوەنۆڕی هیچ پاداشتێکی مادی نەبووە و بەڕاستی لە پێناوی گەیشتن بە ئامانجی پیرۆز و ئاواتی بەرزی خۆیدا وازی لە هەموو خۆشییێکی جیهان هێناوە و لەو بارەدا دەڵێ:

من لە دڵسۆزی ئەم قسانە دەکەم
ومر نە، پەشمە لەلام، هەموو عالەم

حاجی زانیویەتی نەتەوەی کورد، با پاشکەوتووش بێ، با لە کاروانی شارستانیش بەجێ مابێ، تەوژمی مێژوو پاڵی هەر پێوە دەنێ و بەرەو پێشی دەبا. جا ئەو دەمی خەڵک لە قسەی حاجی دەگا:

ئەم قسەی ئێستە عەیبی لێ دەگرن
ئەو دەمەش دێ زەمانێ بۆی دەمرن
ئەم بەئەو ئەو بەئەم دەڵێ کاکە
سەیری قانوونی حاجی چەن چاکە
هەر چلۆنێ ئیشارەتی فەرموو

وەک کەرامەت هەمووی وەها دەرچوو

بەڕاستی حاجی لەو زەمانیدا قانوونێکی نوێی هێناوەتە کایەوە و خۆشی نرخی کاری خۆی زانیوە و تێگەیشتووە شێعرەکانی لە کوردستاندا شۆڕش بەرپا دەکەن:

حاجییە و شێعرەکانی وەک کاوە
ڕۆژێ دێتن دڕەفشی هەڵداوە

دیسان لە جێگایەکی دیکە بەبەیانێکی شاعیرانە و جوان دەڵێ:

ئیتفاقی دڵبەرێکی بێ کەدەر
حاجی ئەنواعی لیباسی کردە بەر
بێ جیاز و مارەیی دەیدا بەشوو
لەو هەموو کوردانە داخوازی نەبوو
عاقیبەت دەیخوازن و ئەمما دەمی
پیر بووە نازێ، کەل و کۆمە دەمی

حاجی عیشقی گەل و نیشتمانی لێ بۆتە سەودا و بەهیچ جۆرێ خۆی بۆ زەوت نەکراوە و نەیتوانیوە بێدەنگ دانیشێ و قسەی چاکی هەر بۆ کردوون و تا مردن وازی نەهێناوە:

بەسە حاجی دووسەد هەزار دەفعە
پێم گوتی: ئەم قسانە بێ نەفعە
چاکە هەر چۆنی تۆ دەڵێی وایە
تێبگە ئەم قسانە خۆڕایە
قوڕی کام جێ بکەم بەسەر خۆمدا

ئـــەوە لێــم بــۆتــە عیللــەتـــی ســەودا
بــەقســەی چــاکــە دەســـتیان دەگـــرم
تــەرخـــی ناکـــەم بـــەلــۆمــە تــا دەمـــرم

حاجی زۆر باشـــی زانیوە کە چوارچێوەی نەزم بۆ دەربڕینی بیروڕای سیاسی و تیۆری فەلسەفی تەنگەبەرە. یەکەم شێعر لەبەر دەکرێ و دەپارێزرێ و کەمتر لەنێو دەچێ. دووەم حاجی ویستوویەتی زووتر کورد پێ بگەیەنێ. جارێ هەر ئەم وەسیلە بووە. زۆر ئاشکرایە لەو ســەردەمیدا ئیمکانی ئەوە نەبووە هیچ کتێبێکی فەلســـەفی و سیاسی بەکوردی بڵاو بکرێتـــەوە و لەچاپ بدرێ و خەڵک بیخوێننەوە. بۆیە حاجیش لە ئاخری تەمەنیدا بڕیاری داوە هەر بەکوردی بنووسێ و ئەگەر چەند دێرە شێعری فارسی هەیە ئی هەڕەتی لاوەتی و فەقیایەتی ئەون. بەچی دیارە ئەم ئینسانە خاوەن بیرە، بیروڕای فەلسەفی و سیاسی خۆی نەنووسیبێ. بەڵام پاش حاجی چ میراتێکی ئەومان پێ گەیشتووە و دەس کەوتووە؟

حاجی وەک بەهەتیوی و هەناسە ساردی گەورە بوو و پێ گەیشت هەر وا بەهەژاری و نەداری و بێکەسی لە وڵاتی غەریبایەتی سەری نایەوە و تەنانەت نازانین لەکوێ نێژراوە و گۆڕەکەی پێ نازانین. بەڵام تێکۆشەران و ڕووناکبیرانی ئێستای کورد بەمامۆستای شێعری شۆڕشگێڕانەی دەزانن.

## عەلی ئاشوو

هێشـــتا لاو نا، مێر منداڵ بووم، لە کۆنە بەیازێکدا پارچە شێعرێکی فارسیم خوێندەوە و لەبەرم کرد، ئێســـتاش لەبیرم ماوە، چونکە بەدڵمەوە نووســـاوە، ئەگەرچی بەداخەوە، نازانم شاعیرەکەی کێیە؟ ڕاستە ئەم پارچە شێعرە لەچاو سەنعەتی شێعرییەوە زۆر پوخت نییە و شـــاعیری سەنعەتکار هیچ کاتێک «جســـت» و «گفت» ناکاتە قافیە و «افغان» و «شـــتابان» بەقافیەی «شـــایگان» دەزانێ، بۆ خۆشـــم ئەگەرچی وەک جاری دیکەش گوتوومە و دەڵێم قافیە لە شێعردا مەرج نییە، بەڵام کێش مەرجە و ئەوە کە شێعر لە نەسر هەڵداوێرێ. پێم وایە ئەم شـــاعیرانەی، شێعری عەرووزی دەڵێن دەبێ بەتەواوی ڕیعایەتی قافیـــە و ڕەدیف بکەن. ئەمما ئەم پارچـــە لە باری نێوەڕۆکەوە گەلێک پڕ و دەوڵەمەند و بەهێز و هەستبزوێن و کورتە:

شنیدســـتم کـــه مجنـــون دل افـــگار
چـــو شـــد از مـــردن لیلـــی خبـَـردار
گریبـــان چـــاک زد بـــا آه و افغـــان
بـــــــه ســـــوی تربت لیلی شتابان
در آنجـــا کودکـــی دیـــد ایســـتاده

بـه هرجـا چشـم عبـرت برگشـاده
سـراغ قبـر لیلـی را از او جسـت
همـانِ کـودک بخندید و بـدو گفت
کـه ای مجنون تو را گر عشـق بودی
زمـن کـی ایـن تمنـا می نمـودی؟
میـان قبرهـا را جسـتجو کـن
ز هـر خاکـی کفـی بـردار و بو کن
ز هر خاکی که بوی عشـق برخاسـت
یقیـن دان تربـت لیلی در آنجاسـت

بەناوبانگترین چیرۆکی دڵداری لە ڕۆژهەڵاتدا داستانی لەیلی و مەجنوونە، کەم شاعیری عـەرەب، فارس، تورک و کورد دەبینی کە یادی ئەم گـراوی و دڵدارانەی نەکردبێ. کەم کـەس هەیە قەیسـی عامیری کە بەمەجنـوون ناوی دەرکردووە، نەناسـێ و نەزانێ ئەو لاوە عەرەبە ئاشـقی کچە عەرەبێـک بووە، باوکی کچەکە کە لە عێلێکی بەدەسـەڵات و زۆردار و دەوڵەمەنـد بووە، کیژەکەی نەداوە بەمەجنوون و داویەتی بەپیاوێکی وەک خۆی دەوڵەمەند. قەیس لە سوێیان شێت بووە، خێڵ و هۆبەی بەجێ هێشتووە ڕووی لە چوڵ و بێروونان کردووە و لە ئینسـانان بێزار بووە و خووی بەگیانداران و دڕندە و وەحشییەکان گرتووە و شێعری بەگراوییەکەی خۆی هەڵگوتووە.

داسـتانی لەیلـی و مەجنوون بۆتە هەوێنی شـێعری زۆربەی شـاعیرانی ڕۆژهەڵات و لــە ڕێگای ئەدەبی شـەرقییەوە چۆتە نێـو ئەدەبی غەربییەوە. بەبڕوای ئەدەبدۆسـت و شێعرناسـان مامۆستای مەزنی ئەدەبی فارسـی نیزامی گەنجەوی گۆی هونەری لە هەموو کەس ڕفاندووە و گرەوی بردۆتەوە و ئەو داستانەی لە گشت شاعیران باشتر داڕشتووە.

قەومییەتی نیزامی تا ئێسـتا بۆ کەس ساغ نەبۆتەوە و کێشەی لەسەرە. فارس دەڵێ فارسـە و بەڵگەی بەدەسـتەوە: «پنج گنج» و شوێنەوارەکانی دیکەی نیزامی وەباڵی بۆ دەکێشـن. تورک دەڵێ بەم دەلیلەی کە گۆڕی پیرۆزی دەنێو ئێمەدایە و لە شـێعرەکانی ڕا دەردەکەوێ ئافاق خانمی ژنی لە جنسـی ئێمەیە دیارە تورکە، هەر بۆیەش گومبەزمان لەسەر دروست کردووە و ڕازاندوومانەتەوە. کوردی دۆ نەدیوی هەژاریش دەڵێ خوشکەزای خۆمە و ئەم شێعرەش بەبەڵگە دێنێتەوە:




چـون مـادر مـن رئیسـەء کُـرد
مـادر صفتانـە پیـش مـن مـرد

درێژدادڕی دەکا و دەڵێ ئەم پەندی پێشـینیان ڕاستە کە گوتوویانە: «خاڵان خوارزا مەزن کرد، مامان برازا بزر کرد». نیزامی لەژێر سێبەری خاڵۆ عومەریدا، پەروەردە بووە و پێگەییوە کەوابوو کوردە. منیش دەڵێم کابرا گوتەنی هیچیان پیاوی درۆیە نین. هەرسێک دەلیلیان هەیە و کەیخوداییان لەنێوان دەکەم و دەڵێم:

نیزامی لـەوەی مەزنترە لە چوارچێـوەی تەنگی نەتەوایەتیـدا بگونجێ و پەیوەندی بەمرۆڤایەتییەوە هەیە: هونەرەکەی مایەی شـانازی ئینسـانییەتە و بەشاعیرێکی مەزن و پیاوێکی گەورەی بناسن و کێشەی لەسەر مەکەن.

نیزامی بۆ خۆشی هەستی نەتەوایەتی و بەرچاوتەنگی بەشێعرەکانییەوە دیار نییە. بەو هەموو شـوێنەوارە جوانە فارسـییەوە منەت لەسەر فارس ناکا و ناڵێ: «عجم زندە کردم بدین پارسـی». ئەوینی بەتینی ژنەکەی کە دیارە چەندی خۆش ویستووە و پاش مردنی چ شـینێکی بۆ گێڕاوە بەرەو «پان تورکیزمی» نەبردووە. ناز و نەوازیشـی دایکی و نان و نمەک و جلوبەرگ و پەروەردەکردنی خاڵی نەیکردۆتە کوردێکی ڕووت. ڕەنگە هەرسـێک زمانی زانیبن. شێعرەکانی شاهیدن کە نەک هەر فارسی زانیوە بەڵکو لە ڕیزی گەورەترین شـاعیرانی فارسـیدایە. ئەدی بە چ زمانێک دەگەڵ ئافاق خانم دواوە؟ دەزانین تورک زۆر بەزەحمـەت فێری کوردی و فارسـی و زمانی دیکە دەبن، ئەو ژنە خۆشەویستەشـی خۆ کەڕ و لاڵ نەبووە، دواندن و لاواندنەوە و نازکێشـانی ویسـتووە. ئەم چیرۆکانەی دایکی بەمنداڵی بۆی گوتوون بەئاشـکرایی لە شـێعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە وەک لەم شێعرەدا دەردەکەوێ:

کـردی خرکـی بـە کعبـە گـمَ کـرد
خـر بـاز جسـت و اشـتلم کـرد

کەوابوو کوردیشی زانیوە.

خانی شـاعیری مەزنی ئێمەش داسـتانی بەناوبانگ و دڕامی کەم وێنەی مەم و زینی

لەسەر ئوسوولی نیزامی دارشتووە، شێعرەکانی لەسەر کێشی لەیلی و مەجنوونەکەی ئەون و دیارە لەژێر تەئسیری نیزامیدا بووە. بەڵام جیاوازییەکی زۆر لە نێوان ئەم دوو داستانەدا هەیە. لە باری ڕواڵەت و شێوەدا، نیزامی لە پێشترە، هەرچەندە نەزمی خانی چەپی دەبەر نەزمی نیزامیدا نییە، کێش و قافیەی هەردووکیان تا دەستی لەسەر دابنێی سوار و ڕەوان و پاراوە. ئەمما زمانی نیزامی لە زمانی خانی سوارتر و لێک و لووستر و لەبەر دڵانترە. بەداخەوە کوردییەکەی خانی وشەی عەرەبی ڕەقی نامۆی وای تێدان کە قامووسی فێروزابادیش نەیگرتوون. ئەوەش هەروا بێ بنۆس و عیللەت نییە. خانی لە سەردەمی دەسەڵاتی بنەماڵەی سەفەویدا ژیاوە و هەموو فارسی زانێک دەزانێ لەو سەردەمەدا زمانی فارسی تووشی چ پاشەکشە و تەنگانەیەک بووە و دیارە زمانی کوردیشی دەگەڵ خۆی بەرەو هەڵدێر بردووە. دەنا زمانی کوردی ئەوەندەش هەژار و کەم وشە نییە، هێندە قەرزداری زمانی دیکە بێ.

بەڵام لەباری نێوەرۆکەوە بێ تەعەسووب، دەڵێم: «خانی لە پێشترە» ئەوەش لە خۆڕا ناڵێم. قارەمانی چیرۆکی لەیلی و مەجنوونی نیزامی هەردووک عەرەب بوون. ئەویش هەرچەند زۆر زانا بووە، تەبیعییە نەیتوانیوە وەک عەرەبێک شارەزای ڕێوشوێن و چلۆنایەتی ژیان و فەرهەنگی عەرەبی بێ. خانی چیرۆکە نایابەکەی لە بەیتێکی کوردی وەرگرتووە و قارەمانی کوردی هەڵبژاردووە. بۆیە هەتا پێی کراوە خۆی لە ئەفسانە پاراستووە و بەرەو واقیع چووە. تەنانەت ئەگەر بەوردی سەرنج بدەنە درامی مەم و زین بۆتان دەردەکەوێ لەزۆر جێگایان کە هاتووە لە واقیع دووربێتەوە لە ئەستۆی خۆی داڕنیوە و دەڵێ: «بیستوومە، بۆیان گێڕامەوە و یا خەونیان دیوە». خانی هەزارپەروەری و دیفاع لە بێ دەسەڵات و چەوساوانی گەیاندۆتە ڕادەیەک کە هێندێک کەسی دیارە نەزانی هێناوەتە سەر ئەم بڕوایە کە ئەو سێ سەد و پەنجا ساڵ پێشتر بیروباوەڕی چەپی بووە!!!

خانی وێدەچی خەریک بووبێ وەک نیزامی پێنج گەنج بنووسێ. جا توانیویەتی و شوێنەوارەکانی جگە لە مەم و زین بزر بوون و لەنێو چوون، بۆمان روون نییە. هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم ئەو کە لە چل و چوار ساڵیدا مەم و زینی تەواو کردووە، دەبێ پێش ئەو، بەم دڵە پڕ هەستە و بەو تەبعە ڕەوانەوە، شتی دیکەشی نووسیبێ، نەوبەهار بەشی ئەوەندەی مەحتەل نەکردووە تا چل و چوار ساڵی هەر ئەو دوو شوێنەوارەی بێ. چل و چوار ساڵ تەمەنێکی نێونجییە، ئەگەر پتر ژیا بێ کە هیچ ڕوون نییە پاشانیش دەبێ شتێکی دی لە پاش بەجێ مابێ. ئەمما چمان بەدەستەوە نییە دیسان وەک، کوردێک شوکرانە بژێرم، ئەوەندەشمان لەدەسدا هەیە.

بێگومـــان خانی لـــە نیزامی فێر بووە کە لـــە دوایی مەم و زیندا ســالّی تەواوکردنی کتێبەکەی و تەمەنی خۆی بکاتە شێعر و بڵێ:

لـــەوڕا کـــو دەمـــا ژ غەیـــب فـــەک بـــوو
تاریـــخ هـــەزار و شێســـت و یـــەک بـــوو
ئیســـال گـــەهشـــتە چـــل و چـــاران
وی پێشــــــرەوێ گـــونـــاهـــــکاران

پێم وایە مامۆســـتای خوالێخۆشبوو سەججادی کە پاش مردووان هەر ڕەحمەت باشە، خراپ لەم دوو شێعرە گەییوە بەبۆچوونی من، خانی لە ١٠٦١ دا مەم و زینی تەواو کردووە و ئەودەمیش خۆی چل و چوار سالّی تەمەن بووە. ئەو کەسانەی بەگۆترە شت نانووسن و کەمێکی بیر لێ دەکەنەوە و مێژوو دەخوێننەوە دەزانن ئەو سەردەمە ڕەشترین سەردەمی مێژووی کوردە. چونکە سەردەمی کێشە و شەڕی نێوان دوو دەوڵەتی بەدەسەڵات و زۆردار و لەکنەخۆ مســـوڵمانی ئەو کاتە بووە. شـــەڕی بەینی سەفەوی و عوسمانییەکان زیاتر لە کوردســـتان و لەسەر زگی کوردی بەستەزمان و لێقەماو کراوە. زوڵم و زۆری ستەمکاران و لێقەوماوان و بێ هێز و بێ دەســـەڵات لەو ســـەردەمەدا هەستی نەتەوایەتی خانی بزاوتووە کە لە دیباچەی مەم و زینەکەیدا دەری بڕیوە و دەڵێ:

ئەز مامـــــە د حیکمـــەتـــا خـــۆیدا
کـــــورمانـــج د دەولـــــەتا دنێـــــدا
ئایـــا بـــە چ وەجهـــی مانـــە مەحرووم
بیلجوملـــە ژ بـــۆ چ بوونـــە مەحکووم

هەســـتی نەتەوایەتی خانی هەســـتی کوێری ناسیونالیســـتی نییە. هەستی ئینسانی شـــاعیرێکی حەسساس و بەشەردۆستە کە نەتەوەکەی خۆی خۆش ویستووە و بەمەحرووم و مەحکوومی دیوە و زگی پێی ســـووتاوە و دیفاعی لێ کردووە. خانی ئینســـانی خۆش ویستووە و ستەم و ناحەقی ئەم هەستەی تێدا بزواندووە کە لە بەدبەختترین و مەزلوومترین

ئینسانی کورد پشتیوانی بکا.

نیزامی و خانی وەک دوو شاعیری موسڵمان لە پێشەکی کتێبەکانیاندا حەمدی بینایی چاوان و ئاودێری دێمەکاران، خودای مەزنیان کردووە و بەخۆشەویستیی خودا و پێغەمبەری گەورە و نازدار و پیاوچاکیان هەڵگوتووە و هەر دووک لەو باسەدا سەرکەوتوون.

بەڵام کە وەک شاعیرەکانی پێشوو هاتوونە سەر باسی میر و مەزنان، بەتەواوی لێک جوێ بوونەوە، نیزامی پێی هەڵگوتوون یا ئەوپەڕی گلەیی لێ کردوون، بەڵام خانی بەئازایەتی کوتاونی و تاوانی کوێرەوەری و چەرمەسەری هەژارانی بۆ دەرەتانی خستۆتە ئەستۆی ئەوان.

لە باقی مەبەستەکانی پەراوێزی داستانەکەیدا خانی وەک عاریفێکی لێزان و دڵسۆز دواوە و ئەوەندە بەخشندە و بەڕەحم بووە کە تەنانەت بەکرە مەرگەوەڕی بەدفەڕی، پاش کوژران و بوون بەچەقڵی مەم و زینان، بەخشیوە و بەخەونی پیاوچاکێک کردوویە بەدەرکەوانی دەرکی کۆشکی بەهەشتی مەم و زینان. ڕەنگە خوێنەر وەڕەز بووبێ و پێی وابێ زۆرم درێژدادڕی کردووە. بەڵام من پێم وایە زۆرم مێشکی خۆم کوشیوە تا ئەم باسە کورت بکەمەوە و بچمە سەر باسی عەلی ئاشق. ڕاست بێ یا ئەفسانە «دەگێڕنەوە زەمانی زوو لە ئاوەدانییەکی ئەم کوردستانەدا لاوێک ژیاوە کە ناوی عەلی بووە. عەلی گیرۆدەی داوی ئەوینی کچی مەلای ئاوەدانی بووە. مەلازادەی شۆخ و شەنگیش دڵی بەعەلییەوە بووە. ئەوینی ئەو کوڕ و کچە وەک ئەوینی لەیلی و مەجنوون و مەم و زین، ئەوینێکی پاک و خاوێن و ئاسمانی و دوور لە هەوا و هەوەس بووە. خوازبێنیکەری ناردوونە سەر کیژی مەلا. بەڵام شۆفار و ڕیاباز و دووزمان کە هەمیشە بوون و وا زووش بنەبڕ نابن، چوون دەکەڵیشەی مامۆستاوە و نەیانهێشتووە کچەکەی بداتێ و پێیان سەلماندووە مەلازادە بۆ بۆرە پیاو نابێ.

کوڕی سەوداسەر وەک قەیسی عامیری لە سوێی گراوییەکەی کە بەداخەوە ناوی نازانین شێت و دین دەبێ و ئاوەدانی بەجێ دێڵێ و دەس ڕەکێوان دەدا. نەمبیستووە دەگەڵ کێویان ببێتە هاودەم. بەڵام شەو و ڕۆژ بەشاخاندا گەڕاوە و بەیت و باو و لاوک و حەیرانی کوردانەی بەیارەکەی هەڵگوتووە.

جێی داخە لەوانە چمان وەدەس نەکەوتوون. بە چەقالە، بەڵاڵووکە کێویلکە، گێوژ و کرۆسک و گیا و گوڵی کوێستانان ژیاوە، جاروبار شوان و گاوان و ڕەوکەوان نانی ڕەقیان بەخێرا خۆیان داوەتێ، چەند وا ماوەتەوە ڕوون نییە. کچە مەلاش هەموو حەڵاڵی دونیای




لە خۆی حەرام کردووە و قەت لە ژوور نەهاتۆتە دەر و کەسی نەدواندووە و شەو و ڕۆژ گریاوە.

مەلای موسڵمانی کورد زگی پێیان سووتاوە و بەزەیی پێدا هاتوون و کچەکەی بەزۆرەملێ نەداوە بەکوڕی ئاغا یا کوڕە مەلایەکی وەک خۆی، یا بازرگانێکی دەوڵەمەندی شار، بۆ خۆی وەبەندەنان کەوتووە و عەلی کە ئیتر بە عەلی ئاشق ناوبانگی ڕۆییوە و بەهەزار زەحمەت دۆزیویەتەوە، دڵخۆشی داوەتەوە و بەڵێنی داوەتێ چیدی بەقسەی دووزمان و شۆفاران نەکا و کچەکەی بداتێ.

عەلی ئاشق هاتۆتە ئاوەدانی، مەلا نوشتەی بۆ نووسیوە، دایکی سەری دەپلاو و گۆشتی گرتووە، دەستە براکانی دەوریان داوە و قسەی خۆشیان بۆ کردووە تا ژیوەڵە بۆتەوە و هۆشی هاتۆتە سەرەخۆ. مەلاش بۆ خۆی کچەکەی لێ مارە کردووە و بەجلووبەرگ و جیازی خۆی بۆی سوار کردووە. سواری کورد ڕمبازێنیان لە پێش کردووە، تەقڵەیان داکوتاوە و جلیتیان هاویشتووە. دەستە خوشکەکانی سەمایان لەپێش کردووە، دایکی زاوا و پیرێژنەکان ئاوێنەیان بەرەو ڕووی ڕاگرتووە، بەربووک سواری ئەسپی بارگە بووە، خزم و کەسوکاری پیاوی عەلی لە سەربانەوە شاباشیان بەسەردا هەڵاویشتووە، منداڵ تێک وەرووکاتوون و شاباش و نوغڵ و نەباتیان کۆکردۆتەوە، بووکیان لەسەر کورسی دابەزاندووە. دوو برازا پیلیان گرتووە و بەرەو پەردوویان بردووە. لەو حاڵەدا عەلی لەبەر بێڵایە ڕاوەستاوە و دەستی لە بناگۆی ناوە و ئەم بەندانەی پێ هەڵگوتوون:

مەجلیسی ئاشقان گیراوە
ساقی لەنێو ڕاوەستاوە
پیاڵەی عیشق نۆش کراوە
بەخێر هاتی پەریزادە
بەخێرهاتی
بەسەر چاوی دەمن هاتی
بەچیم زانی کە تۆ هاتی
بەدەنگی تۆق و خرخاڵان
عەلیعاشق!

ئەگەر عیشـــقت زمانــی بـێ
سـەد جار عـومرت زوو فانـی بـێ
حـەیفـە ئیخـلاس پـەنهانی بـێ
مـەلازادە بـــەخێـر هـــاتی!
مـــوتریب! لێ دە بینـای سـازت
بەختـت سـووتێ لـە بـۆ نازت
جووتـێ سـاقی گـوارە زێـڕن
مەی لــە مــەیخانـان دەگێـڕن
ئاشـقان لـەڕێ وەردەگێـــڕن
قـوربانـت بـم ئـەی بـای وادە
تـارا لـەسـەر لـەیلـم لادە
بـــەدەســتووری حاکـــم زادە
مـەجنــوون یەکــی دەردەدار بــوو
بـەتیری عیشـق گرفتـار بــوو
چونکــە لەیلـی وەفـادار بــوو
مـەجنـوونەکـەی لـە کێـوانم
دایـم دڵ پـــڕ لــە هیجرانــم
بـۆ خاڵـــی لـەیل پـەرێشـانم
خۆزگـەی بەفەرهـادی چینـێ
خەریکـە لە سـەنگ تاشـــینێ
ئـەویش بـۆ عیشـقی شـیرینێ
قـــوربانــت بـم شـەمـــاڵ وەرە
ئـەو کاغـەزەم لــەبـۆ بـەرە
بیـــدە بـــەدەسـتی دڵبـەرە
ســاقیـم دەوێ شـەراب بێنـێ

عـــەکسی خـــۆی تێـــدا بنـــوێنێ
ئیننـــالیـــلای لـــێ بخـــوێنێ
بـــەو چـــاوە گیانـــم دەســـتێنێ

کە دەگاتە ئێرە شادی مەرگ دەبێ و گیانی پاکی بەخودا دەسپێرێ و لەبەر دەرکی پەردوو دەکەوێ.

ئەوە بوو سەرگوزشـــتەی عەلی ئاشق مەجروومی کوردەواری. لە بەیتەکانی کوردیدا زیاتر گراوی شـــینی بۆ کورە حەیران گێڕاوە، وەک شـــینی زین بۆ مەم، شـــینی خانزاد و خەزاڵ بۆ لاس، شـــینی خەج بۆ ســـیامەند، شـــینی سنجان و ئایشـــە گوڵ بۆ سواری خۆیان لێرەدا شـــینی کچە مەلا بۆ عەلی دیار نییە. دەزانن دەبوو چ شـــینێکی بۆ بگێڕێ؟ بەئاواتەوەم کە دەنگ خۆشە کوردەکان ئەم بەندانە وێڕای ئاهەنگی شمشاڵێکی مەحزوون بڵێن و شـــاعیرە لاوەکانمان ئەم چیرۆکە بکەنە داســـتانێکی شێعری درێژ. بۆ سەرچاوەی داستانی مەم و زین و لەیلی و مەجنوونی نیزامی هەر بەیتێکی وا نەبووە؟



## زۆر زانیش بەهەڵە دەچێ

وتارەکەی مامۆستای مەزن و زانای کورد تۆفیق وەهبی بەڕێزم لە گۆواری پەروەردە و زانســـتدا وەبەرچاوکەوت و سەرنجی ڕاکێشام. پاش یەک دوو جار خوێندنەوە و چەند جار پێداچوونەوە هەر چۆنێک بوو شتێکم لێ هەڵکڕاند.

خودا مامۆستای گەورەمان ڕاوەستاو و پایە بەرزتر بکا. خۆی ڕێچکەی بۆ شکاندووین و فێـــری کردووین ڕەخنە بگریـــن و لە هەڵەی زمان نەبووریـــن. کەوابوو ئەگەر کوردێکی ســـاکاریش ڕەخنەی لە مامۆســـتایەکی زۆرزان گرت. نە بەردی بەکابە داداوە، نە کوفری چوار ئیمامانی کردووە و نە دەبێ سەنگەســـار بکرێ. چونکە جاری وایە زۆرزانیش بەهەڵە دەچێ.

پاش شـــێو و وەردداناوەی پوخت و وردی وتارەکەی مامۆســـتا هاتمە سەر ئەم بڕوایە کە ماشـــاڵڵا، هەزار ماشـــاڵڵا ماموستا لەو دوور وڵاتە وا لە (زانســـتی) خۆیدا سووتاوە و هەڵچـــزاوە و ئەوەندە توند لەبـــەر ڕاچووە کە بێ ئەوەی خۆی هەســـت بکا وەک هەموو ئینســـانێک تووشـــی هەڵە دەبێ، دیارە هەڵەی پیاوی وا بەناوبانگ و جێ گەورەش وەک هەڵەی ئیمەمانان نییە و زیانی گەورە دەگەیەنێ.

لا حیاء فی الدین، پەرژینێکی قایم بێ، وتارەکەی مامۆستام زۆر شپرزە و شپرێو هاتە بەرچاو، ڕەنگە دەریای بێ بەســـتێنی زانستی مامۆســـتا وا شەپۆلان بدا کە ئەدەبی تێدا نوقم بووبێ و مامۆســـتا هێندە زمانی بێگانە فێربووبێ کە کووردییە ساکارەکەی خۆمانی

لەبیــر نەمابێ. یا ئەوەیان پتر وێدەچێ، زمانــی زانا و زمانەوانان لەگەڵ هی بۆرە پیاو و کەرەکرمانجان فەرق و جیاوازییەکی زۆری هەبێ.

من وام لێک دابۆوە کە مامۆستا لە کاتی نووسینی ئەم وتارەدا بەفارسی بیرکردۆتەوە و بەکوردی نووســیویەتی. چونکە شێوەی دارشــتنی رستەکانی زیاتر وەک فارسی دەچن تا کوردی. بەڵام کوردێکی ئینگلیزی زانی خوێندەوار دەیگوت نا مامۆستا بەئینگلیزی بیر دەکاتەوە و بەکوردی دەنووسێ.

جا هەر چۆنێک بێ قســەی من بێ یا هی ئەو مامۆســتا بەفارســی بیــر بکاتەوە یا بەئینگلیزی ئەم راســتییە ناگۆرێ کە رســتەکانی وتارە بەنرخەکەی ماموســتا زۆربەیان کوردانە دانەرێژراون و تامی کوردی نادەن دەڵێن نا، فەرموون یەز دوورە گەز نیزیکە ئەم عیبارەتە ســەرلەنوێ بخوێننەوە و حوکمی لەسەر بدەن. «لەبەرئەوە دان نەنان بەهەڵەی زمانیــدا پاش ئەوە پێ زانــرا گوناهێکە لێ نەبووردنی». جارێ بــا کارمان بەوە نەدابێ رســتەکە مەبەست بەدەستەوەنادا و(دان نەنان) مانای ئیعتراف نەکردن و پێ لێ نەنانە. نەک چاو لێ پۆشین و خۆ گێلکردن کە وادیارە مەبەستی ماموستابووە. من دەڵێم رستەکە کوردانە دانەرێژراوە و چاکی ســەر نەگیراوە. «گوناهێکە لێ نەبووردنی» وشەکانی هەموو کوردین، بەڵام هەر کەس کەمێک فارسی بزانێ تێدەگا مامۆستا «گناهیست نەبخشودنی» فارسی لە مێشکیدا دارشتووە و گوناهێکە لێ نەبووردنی بەقەڵەمدا هاتووە. دەنا بۆ خاتری خودا کوردی چۆن وا دەنووسرێ؟ وتارە بەنرخەکەی مامۆستا بەداخەوە وشەی کلک و گوێ براو و رستەی شێواوی تری تێدا هەن. بەڵام ناکرێ لەسەر یەک یەکی ئەوان بدوێم. کورد گوتوویەتی «چ کەوێژێک چ مەویژێک؟»».

شــتێکی ترم بەلاوە ســەیربوو ئەویش ئەوەیە مامۆســتا کە بەکوردی زانێکی گەورە ناوبانگــی رۆییوە. چۆنــە لەم وتارەدا بێ ئــەوەی دامابێ و ناچار بێ وشــەی بێگانەی بەکارهێناوە. بۆ نموونە لە باتی نەتەوە کە کوردییێکی رەســەنە قەومی عەرەبی و لەباتی نێوان مەیانی فارسی نووسیوە.

دیارە من لەو کەســانە نیم پێم وایە نووســەری کورد هەقــی نییە لە کاتی ناچاری و پێویستیدا وشەی بێگانە بەکاربێنێ و هەر کە وشەیەکی بێگانەم لەناو نووسراوێکی کوردیدا رەچــاو کرد، پێم وابێ ئاســمان کۆڵەکــەی پەرپوە و قیبلە کەچ بــووە و پردی قیامەت پساوە.

بەڵام بەو حاڵەوە بەهەقی خۆمی دەزانم رەخنە لە مامۆستا تۆفیق وەهبی بگرم، چونکە




ئەو لەو کەسانەبوو کە ڕێچکەی پەتی نووسینی تەخت کرد.

مـن لە سـەردەمێکدا خەریکی کـوردی فێربوون بووم کە پرشـنگی گەلاوێژی گەش خەریـک بوو وردە وردە ئاسـۆی لێڵ و تەماوی زمانەکەمـان، ڕوون و ڕوونتر بکاتەوە و فۆلکلـۆری ئەدەبیمان ببووژێنێتەوە و ئەدەبەکەمان بـەرەو پێش بەرێ و بەردی بناخەی زمانی یەکگرتووی کوردی دابمەزرێنێ.

کـوردی سـاکار دەڵێ گوناهێکە بۆ لێ بـووردن نابێ، گوناهێکە لـێ بووردنی نییە، گوناهێکە ناکرێ لێی خۆش بی. بەبڕوای من ئەو کەسـانەی ڕسـتە لەسەر شێوەی زمانی بێگانە دادەڕێژن پتر زیان دەگەیەنن لەو کەسـانەی وشـەی بێگانە لە کاردێنن. بەداخەوە دەبێ بڵێم کە ئەم مەترسییە هەڕەشە لە زمانەکەمان دەکا و زۆریشی پەرە گرتووە.

مامۆسـتای بەڕێز، دیسان نووسیویەتی «من بەم چەند وشە پێشەکییە ویستم زەمین ئامادە بکەم بۆ ئەوە کە گلەیی نەکرێ لێم کە دەس بدەمە کۆڵینەوە لە...»

مـن جوتیاری کوردم دیبوو زەمین ئامادە بکا بـۆ چاندنی توور و گێزەر و چەقاندنی تووتن و تەماتە. بەڵام لە زانای کوردم نەبیستبوو زەمین ئامادە بکا، بۆیە سەرم لێ شێوا و لە دڵی خۆمدا گوتم: خودایا زەمین ئامادە بکەم لێرەد چ مانەیەکی هەیە؟ خودا ڕاوەستاوی بکا مامۆستا لە داوێنی وتارەکەدا مانای لێ دابۆوە.

زەمیـن ئامادە بکەم: حازر کردن «نەمردین و ئەم جۆرە مانا لێ دانەوەشـمان دی» تێگەیشـتم مەبەستی مامۆسـتا دەبێ «زەمینە»ی فارسـی بێ کە زۆر جار لە کوردیدا بەکاردەهێندرێ. بەڵام خوا هەقە ئێسـتاش نەمزانیوە مامۆستا بۆ وەک بەیتاڵی تەڕدەست باسکی لێ هەڵماڵیوە و کلکی پەڕاندووە و نەرگزەی بڕیوە و نژدی کردووە؟

بەڵام هەر لەو کاتەدا مامۆسـتا و هاوکارەکانی لـە دەنگی گێتی تازەدا خەریک بوون فێری کوردی پەتی نووسـینمان بکەن. هەر ئەو پەلە پەلە و کوردی پەتی نووسـینە بوو بەجارێک ڕایەڵ و پۆی تێکداین و سـەری لێ شـێواندین و شاعیر و نووسەرە لاوەکانمانی بەهەڵە برد، تا گەیشتە جێگایەک شاعیر ببێ بەهەستیار و شێعر ببێ بەهەڵبەست و قافیە ببێ بەسەروا و خزمەت ببێ بەڕاژە و ئیمزا ببێ بەواژوو و ئێستاش هەر نەبڕێتەوە و تۆزی هەر بکا.

مامۆستا ئەو دەمی ئێمەی فێر دەکرد کە بەهیچ جۆر توخونی وشەی عەرەبی نەکەوین و وامان لێ هات هەرچی عەرەبی نەبوو بەکووردیمان زانی و ئەو خۆ لە عەرەبی پاراستنە سەدان وشـەی دزێوی بێگانەی خستە زمانەکەمانەوە کە ئێسـتا بۆمان لەگێژەو نادرێن.

کەچی ئێستا خۆی لەباتی وشەی کوردی ڕەسەن و کۆن وشەی عەرەبی بەکاردێنێ، ڕەنگە مامۆستا بڵێ ئەم وشانەی من لەکاریان دێنم زۆر سواون و بوونە کوردی. بەڵام منیش عەرزی دەکەم بۆچی وشەی دنیا نەسواو بوو؟ نەببوو بەکوردی؟ هەموو پڕوپیرێژنێک نەیدەزانی؟ ئەی بۆ (گێتی) فارسێت لە جێ دانا؟

با بێینە سەر ڕایەکەی مامۆستا لەسەر پەروەردە و زانست، ئەگەر پێویست بێ، (التربیە و المعرفە) ڕاست و ڕاست بکەینە کوردی ئەوە ڕایەکەی مامۆستا ڕاستە نە پەروەردە (التربیە)یە و نە زانست (المعرفە)یە. بەڵام بەداخەوە ئەزیش پێشنیارەکەی ئەوم پێ ڕاست نییە. چونکە نە پەروەریشت بەکوردی دەزانم و نە شناسایی.

پەروەریش ناوە چاوگەیەکی فارسییە. ئەم ناوە چاوگانەی کە (ش) دەبێتە پاشگریان لە فارسیدا یەکجار زۆرن و تایبەتی ئەم زمانەن. دیارە هاتوونەتە ناو کوردیشەوە، بەڵام زۆر بەهاسانی دەناسرێنەوە، بڕواناکەم بەو هاسانییەش کە مامۆستا فەرموویەتی بتوانین بیانکەینە کوردی. یانی بەلابردنی ژێر و زیادکردنی (ت) شکڵیان بگۆڕین.

بەڵا لە درۆیەدا من نازانم بەختیاری چۆنیان لەکار دێنن. بەڵام ئەوە چەند ساڵە لە کوردستانی ئێران و عێراقدا وشەی شۆڕیش بۆتە بنێشتە خۆشکە و لە کەسم نەبیستووە بڵێ شۆڕشت. ئەگەر مامۆستا وەک زمانەوانێک ئەم کارەی پێ ڕەوایە کە زمانی گەلێکی تر بڕووتێنێتەوە و زمانی خۆمانی پێ بڕازێنێتەوە لە چی ڕاوەستاوە هەموو ئەم ناوچاوگانە وەبەر دەستوورەکەی خۆی بخا کوردی دەوڵەمەند بکا و فارسی لەسەر ساجی عەلی دابنێ. دەنا ئەم کلک پەڕاندن و کلک لێ نانە بێ سوودە. جا ئەو دەمی مامۆستا دەتوانێ لەباتی پەروەرشت و شناسایی، ئاموزشت و پەروەرشت پێشنیار بکا. هەم خۆی بحەسێنێتەوە و هەم ئێمە. مامۆستا دەزانێ لە ئێراندا (آموزش و پرورش) ئەوە چەند ساڵە جێگای (تعلیم و تربیت)ی گرتۆتەوە ئەگەر دەستوورەکەی مامۆستا ڕاست بێ فەرقێک لە نێوان آموزش، گنجایش آلایش، گرایش و پرورش دا نییە.

لە کوردستانی ئێراندا نەک هەر لە ئەردەڵان بەڵکوو لە زۆر شوێنان وشەی شناسایی بەکاردەهێنن. بەڵام ئەوە بەڵگە نییە بۆ کوردی بوونی ئەم وشەیە. لە کوردستانی عێراقیش بەشی زۆر ئیش بەکار دێنن لەباتی کار، بەڵام ئیش هەر تورکییە.

مامۆستا نووسیویەتی «وشەی زانست لە پاش جەنگی گێتیگری یەکەمەوە بڵاوبۆتەوە لە ناوماندا. بێ ئەوەی لەکوێوە هاتووە و بەپێی کام مادە دروست بووە، ئێمە ئێستا پەیمان بەوە بردووە کە شکلی زانست غەڵەتێکی دەستوورییە. ئەم وشە غەڵەتە، هەبێ



و نەبێ لەلایەن کەسێکەوە هاوێژراوەتە زمانەکەمانەوە کە هەرچەندە ئاگادار نەبووە لە فۆنۆلۆژی کورد و فارسی، زۆر بەپەرۆش بووە بۆ بڵاوکردنەوەی کوردی پەتی لە سلێمانیدا ئەو کەسە یا فەیلی بووە، یا کەلهوڕی یا لەکی»

منیش ئەوەندەی لێ زیاد دەکەم و دەڵێم: ئەو کابرایە هەم زۆر گەڕیدە بووە و هەم زۆر بەدەستەڵات چونکە ئەو وشەی هەر لە سلێمانیدا نەکردۆتە باو و بەشێکی زۆری کوردستانی پێ گرتۆتەوە.

دەگێڕنەوە دەڵێن حەریق شاعیری بێ بەش و چارەڕەشی کورد، جارێک دەردی دڵی دەکرد و دەیگوت: بۆ پاروەنانێک هەموو گوندێکی کوردستان گەڕاوم بەڵام نازانم سەرم بەهەموو ماڵێکدا کردووە یا نا؟ منیش وەک حەریق گەڕیدەم و هەر لە پشت تەپی تەنیشت مەهابادەوە تا دەرگەزنی نیزیکی سلێمانیم دیوە و تەماشا دەکەم ئەو کابرایەش دێ بوێری نەکردووە و بەزەبری کوتک وشەی زانستی بەسەر هەموو دانیشتوانی ئەو مەڵبەندە فراوانە دابڕیوە. بەڵام زۆر پێش شەڕی یەکەم ڕاست یا غەڵەت زانست بەمانای عیلم بەشێکی زۆری لە کوردستان تەنیوەتەوە. بەڵام زانست پێم وایە جگە لە مامۆستا بەزمانی کەسدا نەهاتووە منیش نازانم زانست بەپێی کام مادەی دەستووری دروست کراوە بەڵام هەرچی کێشام و پێوام هەر سێ نوختەی لە زانشت کەمتر بوو. نازانم بۆ ئەوەیان غەڵەتە و ئەوەیان ڕاست.

١٩٧٣/٥/٣٠



## ئەركی نەتەوایەتی ئیمرۆی شاعیر و نووسەرەكانمان



لە خەباتی رزگاریخوازانەی گەلاندا هەمیشــە شــاعیر و نووسەری رووناكبیر و پێشرەو نەخشێكی گرنگ و بەرچاویان هەبووە و ئەركێكی مەزن و پیرۆزیان بەجێ گەیاندووە.

یەكەم هاواری رزگاری نەتەوەكەمان لە گەرووی شاعیرێكی مەزن و هەڵكەوتوو هاتۆتە دەر و لە چیا بەرز و سەركەشەكانی كوردستاندا دەنگی داوەتەوە و باپیرە خەوئالووەكانی ئێمەی لە خەو راپەراندوون و شیری پێ سوون و ناردوونی بۆ كۆرِی خەباتی رزگاریخوازی.

ئێســتاش پاش رابردنی گەلێك مانگ و ساڵ دەنگی نێر و دلێری (خانی) وەك وەحی ئاسمانی لە گوێی تێكۆشەرانی نەبەزی نەتەوەی كورددا دەزرنگێتەوە و ئەو دەنگە زولاڵەیە ناهێڵێ وەنەوز و وێژینگ بدەن و خەو بیانباتەوە و لە كاروانی خەبات بەجێ بمێنن.

خەباتی گەلی كورد لە كوردســتانی ئێراندا ئێمرۆ پێی ناوەتە قۆناخێكی نوێ. خەباتی گەلەكەمان خەباتێكە عادلانە و رەوا بۆ ئەســتاندنی مافی نەتەوایەتی پێشێلكراوی خۆی. خەباتێكە لە دژی دیكتاتۆری و ســەرەرۆیی رژێمی كۆنەپەرســتی پاشــایەتی و بەشێكە لە خەباتــی دژی ئیمپریالیســتی و ئازادیخوازی گەلانی جیهان. گەلی ئێمە تێدەكۆشــێ بــۆ پێكهێنانی ئێرانێكی ســەربەخۆ و دیموكراتیك بۆ كوردســتانێكی ئازاد و خودمختار لــە چوارچێوەی ســنووری ئێراندا. گەلی ئێمە وێرای گەلانی تــری ئێران خەبات دەكا بۆ رووخاندنی دیكتاتۆری و تاراندنی ئیمپریالیزم لە وڵاتەكەمان.

ئەركی شــاعیر و نووسەرە پێشكەوتووەكانیشــمان لە هەلومەرجی ئیمرۆدا پشتیوانی

کــردن و هاندانی تێکۆشــەرانی ئەم قۆناخەی خەباتەکەمانــە. ئەرکێکی گەورە و گرنگە، ئەرکێکی پیرۆز و خاوێنە و ئەرکێکی سووک و هاسانیش نییە.

شــاعیر و نووسەرە نیشــتمانپەروەرەکانمان لە قۆناخی ئیمڕۆدا بۆ بەجێگەیاندنی ئەم ئەرکە پیرۆزە دەبێ لەناو خەڵکدا بژین، لە کۆمەڵانی زەحمەتکێش و چەوســاوەی خەڵک جوێ نەبنەوە. لە پێشەوە ئاگاداری وەزعی ژیان و بەرێچوون و خەباتی ئەوان بن و هەست بەئێش و ژان و ئازاریان بکەن. لە ژیانی ڕۆژانەی ئەوان ئیلهام وەربگرن و لەگەڵ تەجرەبە و زانستی خۆیان تێکەڵی بکەن و بیکەنە مایە بۆ نووسراو و شێعر.

شــاعیر و نووسەری کورد دەبێ ئیمڕۆ قەڵەمی بەقازانجی زۆربەی گەلەکەمان بگەڕێ و بەزمانێک بنووسێ جوتیار و کاسبکار تێ بگا. دەبێ زمانی شوان و گاوان و سەپان بزانێ، دەبێ بۆ زەحمەتکێشان بنووسن و ئەوان هان بدا بۆ خەبات. نووسین و شێعری ئەوڕۆمان تا ساکارتر و بێ گرێ و گۆلتر بێ، زیاتر خزمەت دەکا.

شــاعیر و نووسەری ئیمڕۆمان دەبێ شــوێنەواری شاعیر و نووسەرە پێشکەوتووەکانی جیهــان موتاڵا بکەن و شــتی تازە و نوێ فێربن و لــە تەجرەبەی ئەوان کەڵک وەرگرن و بەرگی کوردی تەواوی لەبەر بکەن. شاعیر و نووسەری ئیمڕۆیان دەبێ لە دژی ڕێوشوێنی کۆن و ناپەســەند خەبــات بکەن و لە کردەوەی دزێو ڕەخنەبگرن و ڕێگای ڕاســتی ژیان بەخەڵک نیشان بدەن.

شاعیر و نووسەری کوردستان نابێ ئەوەندە بەرزەفڕ بن کە خەڵک نەیانگاتێ و لەژێرڕا تێیان هەڵبڕوانێ و لە قســەیان نەگا. لەبیریان نەچێ ڕۆڵەی ئەم گەلەن، لە باوەشــی ئەو چیا و کەژەدا پەروەزەبوون و دەبێ پاداشتیان بدەنەوە، پاداشتێکی مەعنەوی و بەکەڵک، پاداشتێکی جوان و ساکار، پاداشتێکی بەنرخ و بێ پێچ و پەنا.

بەداخەوە ئێستاش لە کوردستانی ئێراندا نووسینی کوردی تاوانێکی گەورەیە و بۆیەش ئەرکی گرنگ و گەورەی ئەدەبی لە ئەســتۆی شــاعیرەکانە. شێعر هاسانتر دەستاودەست دەکا، زووتر لەبەر دەکرێ و چاکتر بڵاو دەکرێتەوە و کەمتر بەڵگە دەداتە دەست دوژمن. ناڵێین ئەرکی شــاعیرە پێشــکەوتووەکانمان لە هەلومەرجی ئێستادا کە دیکتاتۆری باڵی ڕەشی بەسەر وڵاتەکەماندا کێشاوە، کارێکی هاسان و بێ مەترسییە. بەڵام هەر ئەو قسەی شــاعیری گەورە و ئازادیخوازی تورک (نازم حیکمەت) وەبیر دێنینەوە کە دەڵێ: «ئەگەر من نەســووتێم، ئەگەر تۆ نەسووتێی، ئەگەر ئێمە نەســووتێین چۆن ڕووناکی لە تاریکی پەیدا دەبێ».




شـــاعیرە نیشـــتمانپەروەرەکانمان دەزانن گەلەکەمان ئیمڕۆ لە هەمیشە پتر پێویستی بەورینگەی خەمڕەوێن و ئاسمانی ئەوان هەیە. هەستی نیشتمانپەروەری و ئەرکی نەتەوایەتی و ئینسانی ناچاریان دەکا لە سزا و ئازار نەترسن و بێدەنگ دانەنیشن.

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٣٠، سەرماوەزی ١٣٥٢\١٩٧٣



## وەڵامێکی دۆستانە

دۆستێکی زانا و ورد و خۆشەویستم کارتێکی بۆ ناردووم و نووسیویەتی:
«ئەم غەزەلە جوانەی بەم شێعرە تەڕ و ناسکە دەس پێدەکا ئی کام شاعیری کوردە؟

هێندە بێزاری کە زانیومە بەزاری نایەوە
دوور لە باڵاکەت سەرینی ناهومێدیم نایەوە

من هێندە بەهۆش و گۆش نیم هەر شێعرێکی لێم بپرسنەوە بزانم ئی کێیە؟ بەڵام بەهەڵکەوت خاوەنی ئەم شێعرە دەناسم و تەنانەت دەزانم بە چ بۆنەیەکەوە گوتراوە.

چونکە ڕەنگبێ زۆر کەسی تریش بێ نەزانن ئی کێیە؟ بەم وتارە جوابی دۆستەکەم داوە تا هەم ئەو وەڵامی خۆی پێ بگا و هەم خوێنەرانیش کەڵکی لێ وەربگرن.

ئەم غەزەلە بەهەڵە لە دیوانی نالیدا چاپ کراوە، بەڵام ئی ئەم شاعیرە بەرز و ناسک خەیاڵ و نەمرە نییە. بەڵکو ئی شاعیری ڕەنجەڕۆ و چارەڕەش مەلا ساڵحی حەریقە.

دیارە شاعیری سەر بەنەتەوە بێ بەش و زۆر لێکراوەکان بەختەوەر و کامڕەوا نابن. هیچ شاعیرێکی کورد ناناسین ژیانێکی خۆش و باشی ڕابواردبێ. بەڵام لە هەمووان چارەڕەشتر، لێقەوماوتر و هەژارتر حەریق بووە. ئەم شاعیرە مەزنە کە ئەگەر دیوانەکەی

بەڕێکوپێکی کۆکرابایەوە دەمانزانی یەکێک لە شـــاعیرە هەرە باشـــەکانی کوردە، ژیانێکی زۆر تـــاڵ و تفت و پڕ لە کوێرەوەری ڕابواردووە، لە تەواوی ژیانیدا ئاهی خۆشـــی لە دڵی نەگەڕاوە. لە ســـاڵەکانی دوایی تەمەنیدا کوێر و کۆڵەوار و گردەنشین بووە و کەم بەختی پاش مردنیش یەخەی بەرنەداوە و بەنەناسراوی ماوەتەوە. بەشی زۆری شێعرەکانی فەوتان و ئەگەر نەفەوتابن هیچ نەبێ چاپ نەکراون، ئەوی چاپیش کراون ئاداریان بەسەر پادارەوە نییە.

چەند ســـاڵ لەوەی پێش لاوێکی بەزەوق و شێعردۆست و زانا بەشی زۆری شێعرەکانی حەریقـــی کۆکردبۆوە، دەتوانم بڵێم ڕێکوپێک بوون و یەکێک لە شـــاگردەکانی هەرە زانای حەریقیـــش کە هێشـــتا مابوو یارمەتی دابوو منیش تەماشـــام کرد و لێـــی ڕازی بووم و حەریقیشـــم ناسی و پێم وابوو، باشترین شـــاگردی نالییە وەک بزانم نەیتوانی چاپی بکا، بەڵکو لەنێویش چووە. حەریق نەک هەر باشـــترین شاگردی نالی بووە، بەڵکو قوتابخانەی نالی بردۆتە موکریان و شاگردی باشی لەو مەڵبەندەی کوردستان پێ گەیاندوون، ئەدەب، ســـەید ڕەشـــید، عەلی بەگی حەیدەری و ســـەیفی قازی کە خۆی خاوەنی قوتابخانەیەکی شـــێعرییە، هەموو شاگردی حەریق بوون. دەڵێن مشت نموونەی خەروارە ئەوە لە خوارەوە چەن شێعری بەنموونە دێنەوە. جا دەچمە سەر باسەکەی خۆم:

چاوەکـــەم! دوێنـــێ لـــە گـــوڵشـــەن گـــوڵ بەعیشـــوە خـــۆی نوانـــد
نـــەک نمـــەک گیـــر بـــم، بـــەمـــەرگی تۆ قەســـەم هەر نـــەم دواند

یا:

ســـتـــوونی قامـــەتـــی ڕاگـــرتـــووە بـــۆ خێـــوەتـــی دینـــم
خـــودا بـــۆ تـــوولی عـــومـــری، ئـــەو تـــەناف و دارە نەپســـێنی

یا:

بەڵـــەک بـــوو کێـــو و ســـەحرا وەک دەڵـــەک خـــۆی دزیـــەوە زســـتان
زەیســـتان چـــۆن بـــەری خســـت ئیتفاقـــەن هێـــزی پێـــی نابـــێ

**حەریق هەر لە هەرەتی لاوەتی و فەقیایەتیدا سۆزی سۆفیگەری لە دڵدا هەبووە، کاتێ شاکارە بێ وێنەکەی نالی بڵاو بۆتەوە کە دەڵێ:**

عیشــقت کــە مەجــازی بــێ خواهیــش مەکــە ئیلــلا کــچ
شــیرین کــچ و لــەیــلا کــچ، ســەلما کــچ و عــەزرا کــچ
فەرقــی کــچ و کــوڕ ڕەوشــەن، وەک فەرقــی مەهــ و میهرە
ئــەم فەرقــی شــەو و ڕۆژە وەک فەرقــە لــە کــوڕ تــا کچ
مەهــ مەهــ لــە مەهــی ســادە یەعنــی لــە قەمــەر لادە
هــەم شــەمس و ســووڕەییا کــچ، هــەم زوهرەیــی زەهــرا کچ
بیبینــە گــوڵــی ژاڵــە، هــەم بــێ بــەرە هــەم تاڵــە
قــەد ســەر و ســنەوبــەر کــوڕ، چــاو نێرگســی شــەهلا کچ
کــوڕ وەک گــوڵــی گوڵــزارە، ئەممــا ســەمــەری خــارە
وەک هــەنگــی چــزووداره هــەنگــوێنــی موســەففا کــچ
کــچ پەرچەمــی چین چینــە دوو مــەمکی لــەســەر ســینە
وەک شــانەیی هــەنگوینــە بــۆ لــەززەتــی دونیــا کــچ
جــەز لــی ســەمەر و ســایە، بــۆ ســەولــەتی ئەعــدا کــوڕ
نەخلــی ســەمــەری مایــە بــۆ دەولــەتــی دونیــا کــچ
کــوڕ زیبــی دەبســـتانە کــچ شـــەمعی شـــەبستانە
بــۆ بــەزمی تــەماشــا کوڕ بۆ خــەڵــوەتــی تــەنهــا کچ
مــوو ســەنبــوولی ئاشــوفتە دوڕ دانــەیــی نــا ســوفتە
دەم خونچەیــی نــەشــکــوفتە تــێ فکــرە کــوڕە یــا کچ
کــوڕ ئاییــنەیــی حــوســنی تــا وەک کچــە مــەنــزوورە
گــرتــی کــە غــوبــاری مــوو چینــی کــوڕ و مینــا کچ
کــوڕ تــازە و تــەڕ مــادام ســادە، وەکــو خــوشــکی بــێ
ئەممــا کــە ڕوا ســەبزە دیبــا کــوڕ و زیبــا کــچ

بۆ شـــەربـــەت و شـــیرینی فینجانە لـــەســـەر ســـینی
هـــەم تـــوحفەیـــی تـــوففاحی شـــەم عـــەنبـــەری بـــۆیا کچ
هـــەم گـــوڵبونـــی بـــێ خـــارە هـــەم مـــەزرەعـــی ئـــەزهـــارە
هـــەم مـــەخـــزەنـــی ئەســـرارە ئـــەســـبابی مـــوهـــەییا کچ
جـــەنـــنـــەت پـــڕی ویلـــدانـــە خادیـــم هـــەمـــوو غیلمانـــە
خانـــم کـــە تیـــان، حۆریـــن یەکســـەر هەمـــوو حەســـنا کـــچ
گەر ئـــەشـــرەفی مـــەحبووبە یـــووســـف کوڕی یـــەعقـــووبە
کـــچ بـــوو بـــەخریـــداری یـــەعنـــی کـــە زولـــەیخـــا کـــچ
ســـەددیقی عەزیـــز هـــەروەک یوســـف کـــە نەبـــی بـــوو کـــوڕ
ســـەددیقەیی مـــەعســـوومـــە وەک دایکی مـــەســـیحا کچ
بابێکـــی هەیـــە دونیـــا بـــۆ عیشـــقی مەجـــازی و بـــەس
(نالـــی) چییـــە؟ ئـــەو بابـــە ئـــادەم کـــوڕ و حـــەووا کـــچ

فەقێ ســـاڵحی لاو جوابی داوەتەوە جوابێکی وشـــکە ســـۆفییانە کە تەنیا ڕەبەنێکی دێرنشـــین دەتوانێ جوابە جەنگی ئەم شـــێعرەی نالی بکا کە لەسەر بناخەیەکی زانستی ڕەوان شناســـی داندراوە و فەلسەفەیەکی قووڵی تێدا گونجاوە. جگە لە هونەر و سەنعەتی شێعریەکەی کە گەیاندوویەتە ئەوپەڕی.

من جوابی فەقێ ساڵح بەدرۆ و فریو نازانم. بەڵکە بەناشیانە و لاوانەی تێدەگەم. مرۆڤ لە ســـەردەمی لاوەتی و بێ ئەزموونیدا زۆر پابەندی بیروبڕوای خۆیەتی با بیروبڕواکەشـــی دەگەڵ ئەقڵ و زانست و فەلسەفە زۆر یەک نەگرنەوە. وا دیارە حەریق لەکاتی جوابە جەنگی نالیدا زۆر لاو و بێ ئەزموون بووە و بەتەواوی بڕوای بەم قسانە هەبووە کە کردوونی. بەڵام گوتوویانە، شانامە ئاخرەکەی خۆشە. ئەو فەقێ ساڵحە بەگژ ماموستایەکی زانا و خاوەن ئەزموونی وەک نالی دا هاتۆتەوە و گوتوویەتی:

عیشـــقت کـــە حـــەقیقـــی بـــێ، تالیـــب مەبـــە ئیلـــلا کـــوڕ
هـــەم حەزرەتـــی لـــەولا کـــوڕ هـــەم یوســـفی ئـــەولا کـــوڕ




عیشقێ کە بە قووەت بێ، مایل بە مورووەت بێ
نەمدیوە کە تالیب بێ، ئیللا کە تەلەب کا کوڕ
سەد حەیفە کە تۆ نالی بەم پیرییە منداڵی
«بەم تەرزە لە عیشق ئەدوێی زیبا کچ و دیبا کوڕ»

بەم بیروبڕوای وشکە سۆفیانەوە خوێندنی تەواوکردووە و چۆتە خانەقای شێخی بورهان و بۆتە سالیک. سالیک لە خانەقا بەو کەسانەیان دەگوت کە بۆ هەمیشە لە خانەقا دادەنیشن و خەریکی تاعەت و سلووک کێشان بوون و دەستیان لە دنیا هەڵدەگرت و ژنیان نەدەهێنا و بەڕەبەنی دەمانەوە. تەنانەت ئی وا هەبوون کە دەستیان لێ ژن و ماڵ و کەسوکاری خۆیان هەڵدەگرت و بۆ هەمیشە یا بۆ ماوەیەکی درێژ لە خانەقا دەمانەوە.

بۆ کەسێکی وەک حەریق کە تەبیعیترین هەستی ئینسانی بەعەیب داناوە و خۆشەویستی کچی بۆ پیاوێکی وەک نالی بەکاری منداڵانە ئەژماردووە جێگەی لەوەی باشتر کە قەت چاوی بەچاوی کچ نەکەوێ ، باشتر چۆن وەگیرکەوتووە؟ حەریق لە خانەقا ماوەتەوە، لەکن شێخ ماقوول بووە، خەڵک ڕێزی لێ گرتووە، تا بۆتە مامۆستای تایبەتی کوڕە شێخەکان. بەڵام هەوەسی پیاوانە و تەبعی شاعیرانەی حەریق ئۆقرەی لێ بڕیوە، نەیتوانیوە وەک سەید ڕەشید، مام وسێن، مەلا حوسێن، مام جەعفەر، یار مەمەد، کاکی شفەڵی و مەحموود دۆشاو و دەیانیتر تا مردن بەڕەبەنی بژی و بێ ژن و هاوسەر هەڵکا. بەدزی شێخ ژنی هێناوە و ماڵی پێکەوە ناوە. دوو زمان لە هەموو دەور و زەماناندا هەن. ئەم خەبەرە بەگوێی شێخ گەیشتووە و حەریقی لە خانەقا دەرکردووە.

سەرەتای چارەڕەشی حەریق بەتایبەتی لە باری مادییەوە لێرەوە دەس پێدەکا، لەسەر کچ تووشی کوێرەوەری و دەربەدەری هاتووە، عیشقی مەجازی ئەگەر بۆ هیچ کەس موجازاتی نەبووبێ، بۆ ئەو هەیبووە. لە زمانی خۆی دەگێڕنەوە کە: «بۆ پەیداکردنی پاروە نانێک هەموو شار و گوندێکی کوردستان گەڕاوم جا نازانم سەرم بەهەموو ماڵێکدا کردووە یا نا؟».

پاش ماوەیەک دەربەدەری، پێش نوێژی مزگەوتی حاجی حەسەنیان، کە ئەو دەمی لە قەراغ شاری سابڵاخ و مزگەوتی هەژاران بووە داوەتێ. مزگەوتی نێوبراو چ مەلای زانای پێ ڕازی نەبوون. ئێستاش هەر کۆڵکە مەلایەکی پێشنوێژی کوێرە دێیەکی بدەنێ، پێشنوێژی ئەم مزگەوتە ناکا.

سەرەڕای ئەم هەموو سووکایەتی پێکردنە حەریق هەر سۆفی بووە و عەقیدەی بەشێخی بورهان هەر ماوە و نەگۆڕاوە. بۆیە ئەم غەزەلەی داناوە و بۆ سەید ڕەشیدی دۆستی گیانی بەگیانی و شاگردی خۆی و دەمڕاستی شێخی ناردووە. سەید ڕەشیدیش لە هەلێکی لەباردا بۆ شـێخی خوێندۆتەوە، شـێخ بەزەیی بەحەریقدا هاتووە و بەخشیویەتی. بەڵام هەرگیز جێی خۆی نەگرتۆتەوە. ئەوەش غەزەلەکەیە:

هێنـــدە بێـــزاری کـە زانیـومـە بـەزاری نایـەوە
دوور لــە باڵاکــەت ســەرینی ناهـومێدیم نایـەوە
بـۆ پیاڵـەی مەیلـی لەیلـی قەلبـی مەجنـوون قابیلـە
شۆڕشـی شـیرین لە ناڵـەی کـۆهکـەن فامایـەوە
بولبولێکـی خـۆش نـەوا بـووم، بـۆ نـەوای دەوری گوڵت
کـێ وەکـو هـود هـود حیکایاتـی سـەبای گێڕایـەوە؟
بـۆ کەنـاری سـەوزەیی دەوری گوڵـی ڕووت شـین دەکەم
خاکـی کـۆی عیشـقم بەبێژنگـی سـەرم بێژایـەوە
کـەوتـە نێو خەرمانـی عومرم ئاگـری توولـی ئـەمـەل
سـەد کـەڕەت بارانـی وەعـزی لێـدرا نـەکـوژایـەوە
تیری مـوژگان، شـیری ئەبرۆ، تـاق و جـووت دەنوێنێ پێم
تـا بـزانـم ڕووحـی شـیرینەت چلـۆن کێشـایەوە
جێـی نـەزەر بـوو حاشـیەی زولفت لەسـەر ئایەتـی ڕووت
زۆر مـوتـاڵام کـرد، وەکـو دەور و تـەسـەلسـول مایەوە
تاقـی میحرابـی بـرۆت جێـی نـازە بـۆ ئەهلـی نیـاز
سـۆفی پێی وابـوو کەچە، هێنـدە کەر بوو خـۆی گێڕایەوە
شـەمعی خوویان پرتەوێکی شەمسـی ڕووی تـۆی لێ کەوت
هێنـد حەیـا و شـەرمی بەخۆیـا هـات بەجـارێ توایـەوە

گـــوڵبژێـــرێکــی زەریفـــم کـــرد لـــەنێــو باخـــی خەیاڵ
خۆزگـــە مەردێکـــی «ڕەشـــید» بــۆ شـــێخی بخـوێندایـــەوە[1]

هیوادارم دۆســـتەکەم لێی ڕوون بێتەوە ئەم شـــێعرە ئی حەریقە و بەهەڵە ئاوەکی نێو دیوانی نالی بووە. دیارە بۆ کەســـێکی زۆر شـــارەزای شێعری نالی نەبێ هەڵەکە زۆر زەق نایەتە بەرچاو چونکە وەک گوتم حەریق شاگردێکی زۆر باشی قوتابخانەی نالی بووە. بەڵام بەداخـــەوە دەبێ بڵێم غەڵەتێکی زۆر گەورە و دزێو لە ئاخر شـــێعری غەزەلەکەدا کراوە: «ئەکل و شوربێکی زۆریفم کرد لەنێو باخی خەیاڵ» بەڕاستی دەبێ پیاو چەن بێ زەوق بێ تا تووشی هەڵەی وابێ، ئەرێ ئەکل و شوربی نێو باخی خەیاڵ دەبێ چ تامێکی هەبێ[2].

---

١ ـ من کچی حەریقم دیبوو کە پیرێژنێکی گۆج و ئیفلیج بوو. لە دیوی ژنانی خانەقا دەژیا و هەموو بەتایبەتی شێخ مەحموودی کوڕی شێخ و سەید ڕەشید زۆریان ڕێز لێ دەگرت و پێیان دەگوت دێدە.

٢ ـ جارێک حەریق هەجوی یەکێک لە کوڕەکانی شێخ عوسمانی تەوێڵەی کردووە، ئاغایەک بەناوی (اعظـام الملک) لەسەر ئەوە ڕیشی تاشیوە. حەریق شکایەتی بردۆتە کن قازی عەلی مەلای وڵات، بەڕابەری قازی خەریک بوون ئاغاکەی تەمێ کەن. لەو کاتەدا کوڕە کوردێک لە قەباغکەندی کچە ئەرمەنێکی هەڵگرتووە کە باوکی پیاوی ڕووسی تەزاری بووە. ئەم کارە بچووکە زۆر گەورە بۆتەوە و خەریک بووە شەڕی عوسمانی و ڕووس و دەوڵەتە مەسیحییەکانی لێ پەیدا ببێ. ساڵی کچی کابرایەک لە حەریق دەپرسێ ئەرێ مەسەلەی ڕیشکەت چی لێ بەسەرهات؟ حەریق دەڵێ: بابەلێ ڕیشی من لە هینەکەی کچە ئەرمەنیدا ون بوو.




بەڕاستی نازانم چۆن هەستی گرگرتووی دەروونی خۆم دەربیڕم، نازانم بە چ زمانێک شوکرانەی چاکەی ئێوەی خۆشەویست ببژێرم. زمان و قەڵەم لە دەربڕین و نووسینی ئەو لوتفەتان لاڵ و کۆڵن.

ئەگەر لەبیرتان بێ لە بەشی سەرەتای دیوانەکەم «لە کوێوە بۆ کوێ»دا وام نووسیوە:

«لێرەشدا دەمەوێ شتێک بڵێم بەپێچەوانەی زۆر هونەرمەندی کورد، من لە نەتەوەکەی خۆم ڕازیم کەس تا ئێستا بێ حورمەتی پێ نەکردووم. داوای دراو وماڵیشم لە کەس نەکردووە تا بزانم دەمداتێ یا نا؟ لە لێقەومانیشدا نانیان داومێ و ڕایان گرتووم، شێعریشم تەنیا بۆ دەربڕینی ئیحساسی خۆم داناوە و هیچ هەقم نییە منەتیان بەسەردا بکەم.»

لە قووڵایی دڵمەوە بڕوام بەو قسەیە هەیە «کاتێک گەرای شێعرێک لە مێشکمدا دەگوورێ و ڕووداوێکی جیهان سەرنجم ڕادەکێشێ، کاتێک مەسەلەیەکی ژیان هەستی دەروونم دەهاروژێنێ، من بەپەلەم هەرچی زووترە ئەوە هەستە دەربڕم، خۆم لەو تەنگەژە و گێژاوە ڕزگار بکەم و بحەسێمەوە، کەوابوو چ هەقم هەیە منەت لەسەر خەڵک بکەم و بڵێم شێعرم بۆ داناون».

لە ڕێگەی شێعر و نووسینەوە وەک تاکێک لە کۆمەڵ تەنیا توانیومە ئەرکێکی سەرشانم

بەجــێ بگەیەنم و لەباتی ئەوەی بەزمانی خوێندنم کە فارســی بــووە، بەزمانی زگماکیم نووسیوە و ئەوەندەی لە دەستم هاتووە خزمەتی زمان و ئەدەبی کوردیم کردووە. ئەوەش ئەرکــی نەتەوایەتی خۆمە و ئەگــەر بەجێم نەگایاندبا، لەکن ویژدانی خۆم شــەرمەزار و ڕووزەرد دەبووم و دیسان هەقم نییە خەڵک منەتبار بکەم و چاوەنۆڕی پاداش بم. کەچی هەست دەکەم و دەبینم زۆر لە ڕادەی پێویست، زیاتر لەلایەن ڕۆڵەکانی گەلەکەمەوە ڕێزم لێ دەگیرێ هەر ئەم کۆڕە گەورە نیشــانەی ئەوپەڕی ڕێزگرتنی ڕۆڵە پاکەکانی کوردە لە خزمەتکارانی بچووکی گەلەکەمان و دەبێتە هۆی پتر هاندانی ئەوان بۆ فیداکاری و گیانبازی پتر لە ڕێگای ئامانجی پیرۆزدا. لە (لە کوێوە بۆ کوێ)دا کەمێک ژیان و بەسەرهاتی تاڵ و پڕ لە کوێرەوەری خۆمم بۆ گێڕاونەتەوە.

دیارە لە بنی کوولەکەم نەداوە و لێفەم لەســەر هەتیوان هەڵنەداوەتەوە و ئەســکوێم لە مەنجەڵ نەگێڕاوە. زۆر نهێنی گرنگ و ڕازی نەگوتراو هەر وا بەســەرمۆری لە ســنگمدا ماونەتەوە و دەیانبەمە ژێر گڵ. ئەگەر ڕۆڵەی گەلێکی لێقەوماو نەبوومایە و لە کۆمەڵێکی دواکەوتەدا بەڕێ نەچووبام. زۆرم لەو ڕازانەم دەدرکاند.

بەهیوام ئەگەر مەرگ بەربینگم نەگرێ و ڕۆژگار دەرفەتم بدا (کە کوێوە بۆ کوێ) بکەم بە کتێبێکی سەر بەخۆ و پەردە لەسەر ئەو ڕازانەوە هەڵدەمەوە کە زیان و قازانجیان تەنیا بۆ خۆم دەگەڕێتەوە.

بەبیرم نایە بەمنداڵی قەت بیرم لەوەی کردبێتەوە کە بەگەورەیی ببمە شاعیر و نووسەر و ئەدیب، پێم خۆش بوو ببمە دوکتۆر و ئەفسەر و شتی وا.

تا لە قوتابخانەی سەرەتایی بووم فەرقێکم لە نێوان دەرسەکانمدا نەدەکرد و لە ئینشا و ئیملا و حیســابدا دەرجەی وەک یەکەم دەهێناوە. بەڵام کە باوکم هاتە ســەر ئەم ڕایە ئەگــەر لە قوتابخانەی نوێدا بخوێنــم بۆ دینەکەم زەرەرە دەبێ بچمە حوجرەی فەقێیان و ببمــە مەلا و جێی باب و باپیرانم بگرمەوە و کەوای ئاودامێن لەبەر بکەم، مێزەری ســپی ببەســتم و ســەڵتە و جوببە بپۆشم. گۆڕانێکی فیکرم بەســەردا هات کە باری ژیانیشمی گۆڕی.

نازانم ئەو زوڵمەی باوکم لێی کردم و نەیهێشت بەئارەزووی خۆم بخوێنم و پێی بگەم و بمکا بەمەندیل بەسەر و عەبا بەشان وای بەسەر هێناوم، یا هاودەمی و هاونیشانی لەگەڵ ئەو مەلا و فەقێیانەی شــێعری موتەنەببی و ســەعدی و نالییان وەک ئاو لەبەر بوو. بەڵام نەیەندەزانی حەوت جار حەوت حەوت دەکاتە چەند؟ بەرەو دنیای شــێعر و ئەدەبی بردم.

بەکورتی بۆم ناچێتەوە ســەریەک، بۆچی کە چوومە حوجرەی فەقێیان بەجارێک گۆڕام و ئاشــقە شێعر بووم و لەباتی تەسریفی زەنگانی و عواملی گورگانی دەستم بەخوێندنەوەی شێعری خاقانی و قائانی کرد؟ بەڵام فەرقی شێعری باش و خراپم نەدەکرد. هەر شێعرێک کێشی سوارتر و قافیەی گرانتر بایە بەباشترم دەزانی.

قەدیــم لــە وڵاتی ئێمە کە منداڵیان لەبەر خوێندن دەنا لە پێشــدا گوڵســتانیان پێ دەگوت (دیارە هەر تەقەی لەسەری دەهات) و هیچی لێ تێ نەدەگەیشت. بەڵام من کاتێک دەستم بەخوێندنی ئەم کتێبە بەنرخە کرد، تەواوێک گەورە ببووم و پلەی خوێندەواریشم تا ڕادەیەک بەرەو ژوور چووبوو مامۆستاکەشم زۆر باشی دەزانی و خۆی پێوە ماندوو دەکردم. خوێندنی گوڵستان و بۆستان دەرکی ئەدەبی فارسییان لێ کردمەوە.

لە شــازدە حەڤدە ســاڵیدا دەستم بەشــێعر دانان کرد، چونکە زیاتر لەژێر تەئسیری شــێعری فارســیدا بووم، بەفارسیم شێعر دەگوت، شــێعرەکانم کێش و قافیەی تەواویان هەبوو، وشــەی شاعیرانەشیان تێدا دەبینرا. بەڵام لاســایی کردنەوەی شێعری شاعیرانی پێشوو بوون و هەست و عاتیفەی خۆمیان تێدا نەبوو.

بەمنداڵــی ناوبانگی چەند شــاعیری کوردی وەک نالی و کوردی و ســالم و وەفایی و شــێخ ڕەزام بیســتبوو. بەڵام نایشارمەوە شێعری کوردیم زۆر پێ خۆش نەبوو و گاڵتەشم بەفۆلکلۆری ئەدەبی دەکرد. چونکە تا ئەو حەلە هەر لە شار و لە حوجرەی فەقێیان بووم. ئەوانەش هەر گاڵتەیان بەگوتەی نەخوێندەوار دەکرد.

ڕووداوێک گۆڕینێکی ســەیری بەسەردا هێنام. تووشــی زانا و ئەدیبێکی گەورە هاتم، مامۆســتا ئەحمەدی فەوزی یا مەلای ســلێمانی خەڵکی ئەم شارە خۆشەویستە بوو، بەم ئاووهــەوا خاوێنە پەروەردە ببوو. نازانم چۆن ئاوارەی وڵاتــی ئێمە ببوو. لە کتێبەکەمدا نووسیومە:

«دەبێ بڵێم من دەسکردی فەوزیم ئەو هەڵی وشاندمەوە و تێکی هەڵشێلام و سەرلەنوێ دروستی کردمەوە، ئەو دەرکی زانین و فێربوونی بۆ کردمەوە. ئەو ڕێگای ژیانی پێ نیشان دام. بێگومان ئەگەر نەچووبامە خزمەت فەوزی و لەکن ئەو مامۆستایەم نەخوێندبا ڕێبازی ژیانم ئەو ڕێبازە نەدەبوو کە گرتم و پێیدا ڕۆیشتم و ئێستاش بەرم نەداوە. ئەو فێری کردم زەوقی ئەدەبیم چۆن تیف تیفە بدەم و مشــتوماڵی بکەم، ئەو فێری کردم چۆن بنووســم و چۆن شــێعر بڵێــم، ئەو فێری کردم وڵاتەکەم خۆش بوێ و پێــی هەڵبڵێم. ئەو حاڵیی کردم، کوردی زمانێکی ڕەوان و بەربڵاو و دەوڵەمەندە و دەکرێ ئەدەبێکی گەورە و دنیای

پەسندی بێ، ئەو حاجی قادری کۆیی، نالی، کوردی، سالم، مەولەوی، حەریق، مەحوی و ئەدەب و وەفایی پێ ناســاندم و شــێعرەکانی ئەوانی بۆ شی کردمەوە. ئەو فێری ڕۆژنامە خوێندنەوە و ڕۆمان خوێندنەوەی کردم، ئەو دیوانی شــاعیرە شۆڕشــگێڕەکانی فارسی بۆ پەیدا کردم و هانی دام بیانخوێنمەوە و شتیان لێ فێربم. بەڵام سوێندی دام قەت بەفارسی شێعر نەڵێم، منیش ئەو سوێندەم نەشکاند».

هەر لەو سەروبەندەدا کە لە خزمەت فەوزی دەمخوێند مامۆستایەکی دیکەشم هەبوو کە وشــەی ڕەسەنی کوردی فێر دەکردم و بەیت و باوی فۆلکلۆری بۆ دەگوتم. سەید عەولای من لە دەروێش عەبدوڵڵای مامۆســتا (گۆران) ـ کە ئەویشم دیبوو هونەرمەندتر بوو، بەڵام من شاگردێکی ناسوپاس بووم و نەمتوانیوە شێعری بۆ بڵێم.

لە تەمەنی بیست ساڵییەوە بووم بەشاعیر زیاتر هەست و عاتیفەی خۆم دەخستە نێو شــێعرەوە. بەڵام هێشتا دەستم لە گرانترین و بێ سوودترین جۆری شێعر، واتە تەخمیس شــێعری شاعیرە مەزنەکان هەڵنەگرتبوو. ڕۆژێک ئاواڵێکم گوتی دەزانی ئەو تەخمیسانەی تــۆ وەک چی دەچــن؟ گوتم نا، گوتی: «وەک ئەوەیە نانی خۆت لەســەر خوانی خەڵک بخۆی». ئەو ڕەخنەیە وشــیاری کردمەوە و دەســتم لەو کارە بێســوودە هەڵگرت و ئەو تەخمیسانەی کردبوومن نەمهێشتن هەرچەند هێندێکیان ناوبانگیان پەیدا کردبوو.

یەک شــێعرم لە گۆڤاری گەلاوێژدا بەناوێکی موســتەعارەوە بڵاوکردەوە. شــێعرێکی سیاســی ڕێکوپێک و ڕەوانە. ئەودەمی زۆرم شایی بەخۆ بوو کە شێعرم لە گۆڤاراندا چاپ دەکرێ. کەچی ئێســتا خۆم لێ بێ حیســاب کردووە و نامەوێ کەس بزانێ ئەو شــێعرە هی منە. جارێک مامۆســتایەک دەیفەرموو سەرگروشــتە و نموونەی شێعری شەش هەزار شاعیری کوردم (الی ماشاالله) کۆکردۆتەوە و خەریکم چاپی بکەم. ئەو بەشەی کتێبەکەی پێ نیشــان دام کە لە بارەی شێعری شــاعیرەکانی موکریانەوە دواوە. دیتم شێعرەکەمی بەتەواوی وەرگرتووە و چەند دێرێکیشــی لەســەر بیری بەرز و زمانــی پاراو و خەبات و تێکۆشــانی شاعیر نووســیوە. بەڵام مێژووی لەدایکبوون و مردنی شــاعیری نەنووسیوە بەمامۆستام نەگوت ئەوە منم. تا شەش هەزارەکەی نەبێ بە (٥٩٩٩)!!!

دووەم شێعرم لە ژمارە ٢ ی نیشتماندا نیزیکەی ٣٣ ساڵ پێش چاپ کراوە و لەلاپەڕەی ٥٢ ی تاریک و ڕووندا چاپ کراوەتەوە تەنیا شــتێک لە شــێعرەکانی ئێستامی هەڵداوێرێ




ئەویش خۆ هەڵکێشـــانێکی لاوانە و ڕۆشـــنبیرانەیە. بەکچە کوردێک دەڵێم وەک ژاندارکی فرانسەوی ڕابەڕە. ویستوومە بەخەڵک نیشاندەم کە ئاگام لە مێژوی ڕۆژئاواش هەیە. دەنا هێنانی ناوی ژاندارک لێرەدا هیچ جێگای نییە.

هەرچەند لە شـــێعرەکانی پێشـــوومدا سۆزی شـــاعیرانە و خەمناکە تا ڕادەیەک بەدی دەکرێ، بەڵام ئەو ســـۆزە لەپاش ســـاڵی ١٩٤٧ کە توندترین زەبرم لێ درا و گەورەترین موسیبەتم بەسەرهات لەتیفتر و گەرمتر و شاعیرانەتر کەوتە نێو شێعرمەوە، لە (بابردەڵە) دا کە ئەو ساڵی لە وڵاتی غەریبایەتی گوتوومە وا دەگەڵ بلبل دەدوێم:

منیـــش ئـــەی بلبلـــی شـــەیدا وەکـــو تـــۆم
وەهـــا دوورم لـــە هێلانـــە و گـــوڵـــی خـــۆم
منیش وەک تۆ لـــە کیسم چـــوو گـــوڵی ســـوور
منیـــش هێلانـــەکـــەم لـــێ کـــراوە خاپـــوور
منیـــش بابـــردەڵـــەی بـــەر گێـــژەڵـــووکـــەم
دەمێـــک لـــەو قوڵکـــە، تـــاوێ لـــەو چڵوکـــەم
لـــە ئامێـــزی گـــەرم بـــێ بـــەش کـــراوم
وەکـــو تـــۆ تـــووشـــی ڕۆژی ڕەش کـــراوم
ژیانـــم پـــڕ لـــە ڕەنـــج و دەرد و داخـــــە
ئـــەوە گیـــرســـامـــەوە لـــەو کێـــو و شـــاخە
کـــەســـێک ناپـــرســـێ، نـــازانـــێ چلـــۆنم
لـــە یـــادان چـــوومـــەوە چیـــرۆکـــە کـــۆنـــم

ئەم ســـۆزە لە زۆربەی شـــێعرەکانی پاش ئەو ســـاڵەمدا هەیە و هەر بەتینتر بووە. لە فرمێســـکی گەش، گریانی نیوەشەو، بۆسەی ڕۆژگار، تەپڵی ئەماندا بەرەو ژوور چووە. لە شـــەوگاری تەنیایی و شەوی شاعیردا بەجۆشترە. لەو شێعرانەی پاش تاریک و ڕووندا، لە ناڵەی جودایی و ئێوارەی پایز و سازی ناسازدا گڕی گرتووە. لە فرمێسکی گەشدا دەڵێم:

خـــۆشـــەویستی گـــۆشـــەیی تـــەنیایی هەر ئـــەژنـــۆکـــەمـــە
بـــۆیـــە ڕۆژ و شـــــەو وەهـــا گـــرتـــوومەتە نێـــۆ باوەشـــم
نابینـــی زەردە لـــــەســـــەر لێـــــوی کـــــەســـێ لـــەم شـــارەدا
گـــەر خـــەم و دەردی دڵـــی خـــۆمیـــان بـــەســـەردا دابەشـــم

له گریانی نیوەشەودا:

شـــەوانـــە گـــەر نـــەکەم ئـــەم شـیوەن و ناڵیـــن و گریانـــە
دەســـووتێنـــێ وجـــــودم ئاگـــری ئـــەم جـــەرگـــە بـــریانە

له خونچەی سیســـدا که شـــێعرێکی ڕەمزییه و له شـــینی شـــەهیدێکی لاودا گوتراوە دەڵێم:

ناڵینـــــی من بـــۆ خـــونچـــەیـــە
بـــۆ خـــونچـــە پـــەشـــێوە حاڵـــم
ئـــەم داخـــە لـــە دڵمـــدا هەیـــە
بـــۆیـــە هـــــەمیشـــــە دەناڵـــم
ئـــەو پێـــش پشـــکووتن ســـیس بووە
بـــەجـــوانـــە مـــەرگی مـــردووە

له بۆسەی ڕۆژگاردا دەڵێم:

نیمـــە ئاواڵـــێ لە گـــۆشـــەی بێکـــەســـیدا خـــەم نـــەبـــێ
چاکـــە ئـــەو لێرەش وەفـــای هەر مـــاوە ســـایەی کـــەم نـــەبـــێ
لاپـــەڕەی ژینـــم هـــــەمـــوو هـــەڵدەمیتـــــەوە تێیـــدا نییـــە
باســـی فرمێســـک و هـــەناســـــە و شـــیوەن و ماتـــەم نەبـــێ




**لە هێلانەی بەتاڵدا:**

نییە باکم ئەگەر ڕاوچی شکاندوویەتی باڵی من
ئەمە سەختە کەوا ناگاتە گوێی کەس ناڵە ناڵی من

**شێعری وام هەن ئەم سۆزەشیان تێدا نییە و بۆ خۆشم لێیان ڕازیم:**

من کە ناگاتە هەفتەیەک تەمەنم
بۆچی بگریم و بۆچی پێ نەکەنم؟

***

وەبەر من ناهێڵێ لێرە، مەی و ساقی جەنابی شێخ
دەنا لەولا، شەراب و حۆری با هەر بۆ جەنابی با
هەموو عومری ئەبەد تێدا نییە خۆشی دەمێ مەستی
خدر ئاوی حەیاتی بۆ چ بوو فێری شەرابی با

***

بەمنداڵی لە لێوی ئاڵی تۆم ئەستاندووە ماچێ
بەپیریش لەززەتی ئەو ماچە شیرینەم لەبیر ناچێ

***

پیر و زورهانم و ئێستاش دڵەکەم هەر دەیەوێ
سەر و ماڵم بەفیدای خاڵ و خەت و پەرچەم کەم
داستانی مەم و زین کۆنە کچێکم گەرەکە
شلکە ڕانی بگووشم بۆنی لە سینە و مەم کەم

***

شـــێعرێک وەک ســێبەری بــژانگ
وەکــو خـــەرمانـــەی دەوری مانــگ
ڕێکتـــرَ لــە گــەڕی ڕەشــبەڵەک
خــۆشــتر لە خــرمژنی کــرمــەک
وەک شــەراب بگــەڕێ لــە خــوێن
خــەمڕەوێــن بــێ و نــەشــە بــزوێن
شــێعرێک وەکو دەریــای بــێ بــن
گــــەرمتــر لــە باوەشـــــی ژن

***

هــەتــا کــۆمتر دەبێ پشــتم، پتــر هــەڵــدەکشــێ مینی ژۆپ
ئیتــر دەســــتم بــــەداوێنـــی کچـــی ئــەم شـــارە ڕا نـــاگا

من لەمێژە غرووری ئەدەبیم لە خۆمدا کوشتووە و هیچ بەماک و عەیبی نازانم یارمەتی فیکری لە ئاواڵ و دۆستانی خۆم وەربگرم، هەمیشە شێعر و نووسینەکەم بەدۆستانی لێزانم نیشان دەدەم و ڕەخنە و تێبینی بەجێ بەوپەڕی سوپاسەوە قبووڵ دەکەم. لەم ساڵانەی دواییدا بەتایبەتی زۆرم کەڵک لە هاوکاری دۆستانی شارەزام وەرگرتووە.

تا لە دێ دەژیام شــێعرەکانم بــۆ لادێییە نەخوێنــدەوارەکان دەخوێندەوە تا لەباری زمانەوەی لێیان دڵنیابم.

یەکێک لە تایبەتییەکانی شێعری من ئەمەیە کە نەرم و ڕەق و سۆزی ئەوین و فیکری سیاســی تێکەڵ دەکەم لە «شــەنگەبێری»، «مەتەرێزی شــەرەف»، «ئامێزی ژن» و «پەری شــێعر» و «یادم بکەن» و «بناری هەڵگورد» و تەنانەت «شەوگاری تەنهایی» و «ناڵەی جودایی»دا ئەم کارەم کردووە، جا نازانم تا کوێ سەرکەوتووم!!!

مەسەلەی زمانیش بەگرنگ دەگرم و تێ دەکۆشم کام وشە ڕەسەنە بەکاری بێنم. ئەوەی بەئەرکی سەرشــانی خۆم و هەموو ئەدیبێکی کــورد دەزانم، بەداخەوە من جگە لە زمانی




کوردی و فارسی چ زمانی دیکە نازانم. شارەزاییم لە ئەدەبی دەوڵەمەندی فارسیدا کەم نییە، کاتی خۆی زۆرم شیعری شاعیرەکانی فارس خوێندۆتەوە و کەڵکم لێ وەرگرتوون، شیعری شاعیرەکانی خۆشمان دەخوێنمەوە و کارم لێ دەکەن. پێم خۆشە شیعرێک بخوێنمەوە کە هەم ڕواڵەتی جوان بێ و هەم ناوەڕۆک. بەڵام ئەگەر هەر لایەکیشی جوان بێ چێژی لێ دەکەم. وەک ئەم شیعرەی (نالی) کە هەم ڕواڵەتی جوانە و هەم ناوەڕۆک:

دەورانییە وەک هێلەگی سەودا سەری گێژم
بۆیە بەدەقیقی مەسەلە هەرچی دەبێژم
هەر پەرچەم و پیشانییە فیکری شەو و ڕۆژم
هەر گەردەن و زولفە ئەمەلی دوور و درێژم

یا ئەم شیعرەی شێخ ڕەزا کە هەر ڕواڵەتی هەیە و قسەی خۆشە:

خواستی لێی ماچێ (ڕەزا)، زاڵمە نەیدایە گوتی:
ئەی خوا لەم کوڕە شێخزادەیە چەند بێ ئەدەبە

بۆ خۆم هەمیشە خەریکم شیعرێک دابنێم هەر دوو دیوی جوان بێ، جاری وایە توانیومە تا ڕادەیەک سەرکەوم و جاری واش هەیە بەلایەکیان ڕازی بووم.

ناتوانم لە پێشدا نەخشە بۆ شیعر بکێشم. کاتێک ئیلهام لە شتێک وەردەگرم و(گۆران) کوتەنی مەستم دەکا و دەمەوێ بیخەمە چوارچێوەی شیعرێکەوە، ئەمە من نیم چوارچێوە هەڵدەبژێرم. بەڵکو خەیاڵەکەیە کە چوارچێوە و قالبی لەبار بۆ خۆی دەدۆزێتەوە. من قسەم بێ کێش با زۆر جوان و قووڵیش بێ بەشیعر نازانم. شیعر دەبێ کێشی هەبێ تا لە پەخشان جودا بکرێتەوە، جا قافیەی هەبێ یا نا هەر بەشیعر دەژمێردرێ.

ڕاستە قافیە شاعیری بێ دەسەڵات و کەم بین دەخاتە تەنگانەوە و دەبێتە بەرهەڵستی دەربڕینی هەست و بیری، بەڵام هەر قافیەش یارمەتی شاعیری خاوەن بەهرە و بەدەسەڵات دەدا بۆ دەربڕینی هەستی دەروونی بەوشەی جوانتر و شیرنتر. بەکارهێنانی تاقە کێشێک لە پایەی شاعیر کەم ناکاتەوە، بەڵام خوێنەر ماندوو دەکا.

هیچ گومان لە پایەبەرزی مەولەوی ڕۆمی و مەولەوی تاوەگۆزیدا نییە. کەچی من بەش بەحاڵــی خۆم هەم لە خوێندنەوەی مەســنەوی و هەم لە خوێندنــەوەی دیوانی مەولەوی ماندوو دەبم.

دیوانی شاعیران وەک باخچەی گوڵانن. گوڵی باخچە تا ڕەنگاوڕەنگتر بن تەماشاکەران زیاتر ڕازی دەکەن. منیش وەک مامۆســتا (گۆران)ی پایەبەرز پێم وایە کێشــە خۆماڵی و فۆلکلۆرییــەکان، کە لە باوک و باپیرانەوە بۆمان بەجێ ماون باشــتر دەگەڵ تەبیعەتی زمانەکەمــان ڕێک دەکەون. هەر لە منداڵییەوە گوێم بەلایەلایەی دایکی کورد کە لەســەر ئەم کێشانەیە ڕاهاتووە و زمانم بە (هەلوور، بەلوور تەکامە) پشکوتووە کە ئێستاش نازانم مانای چییە؟

لە ســەرەتای شاعیریشمەوە شێعرم لەسەر کێشــی خۆماڵی داناوە (ئەمەگی گوڵان)، (بلوێری شــوان)، (ڕۆژگاری ڕەش)، (بەهاری کوردســتان) لە شــێعرە کۆنەکانی منن، بەڵام وەک خۆم بەوەزنی عەرووزییەوە نەبەســتۆتەوە لە کێشــە فۆلکلۆریەکانیشدا گیرم نەخواردووە.

گومانم لەوەدا نییە ئەگەر (شەنگەبێری)م لەسەر وەزنی عەرووزی دابنایە ئەم چێژەی نەدەبوو و ئەگەر (گەرمەشــین)م لەسەر کێشی مەســنەوی مەولەوی نەگوتبایە عالەمێکم دەگــەڵ خۆم نەدەهێنا گریان و ناڵە. بەکورتی من بڕیارم نەداوە کە لە کام قالبدا شــێعر بگونجێنم لە شێعر دەگەڕێم خۆی قالب بۆ خۆی بدۆزێتەوە و ئارامی تێدا بگرێ.

ڕەنگە هیچ شــاعیرێکی کورد بەزیندوویی سەری بەئەندازەی منی لەسەر نەنووسرابێ، پێم وایە ئەگەر دەزگای (هاوکاری) بێزار نەبووبا و بڵاوی نەکردبایەوە کە هیچی تر لەسەر تاریک و ڕوون چاپ ناکا، تا ئێســتاش نووســین درێژەی دەبــوو. زۆریان پێ هەڵگوتم، مەمنوونیــان کردم، بەڵام خــۆم لێ نەگۆڕا. جنێو! بەڵێ جنێویــان پێدام، بەڵام نائومێد نەبووم.

زۆر شــت لە ڕەخنەکان فێربووم، بەڵام شــتی سەیریشــم هاتە بەرچاو. ڕەخنەگرێک نووســیبووی لە دنیای تەکنیکدا ئیتر شــێعری درێژ باوی نەماوە و بێ ڕەحمانە هەرچی شێعری درێژم هەبوو بەهیچی دانابوو. ڕەنگە ڕاست بێ و لە وڵاتە سەرمایەدارەکاندا کە دراو هەموو شــتێکە کەم کەس وەختی هەبێ نەک شێعری درێژ بەڵکو هەر شێعر بخوێنێتەوە. بەڵام لە وڵاتە پێشکەوتووەکاندا کە وەختی کار دیاری کراوە و ساڵ بەساڵ لە دوایی دەدا وەخت بۆ خوێندنەوەی شــێعری درێژ زۆرە. لە وڵاتەکانی دنیای سێهەمیشــدا کام شێعری




من زۆر درێژە وەختی دەستێک دۆمینە ناگرێ، سەیر ئەوەیە لەو سەروبەندەدا نامەیەکم لەلایەن دۆستێکەوە پێ گەیشت کە لە وڵاتێکی هەرە بۆرژوازیدا دەژی و هەم دەخوێنێ و هەم کار دەکا. نازانم ڕاستی کردبوو یا نا، سوێندی خواردبوو کە سێ جاری تاریک و ڕوون خوێندووتەوە. چونکە خەڵکی لادێیە زیاتر ئەو شێعرانەی بەدڵ بووە کە لەسەر ژیانی لادێ گوتراون. (ئارەق و تین)ی بەباشترین شێعری من دانابوو. نووسیبووی تا ئێستا شێعری وەک ئەم شێعرانەم نەخوێندۆتەوە:

من جووتیارم من جووتیارم
من دەگەڵ هەتاو هاوکارم
من بە ئارەق و ئەو بە تین
دامان ڕشتووە بناخەی ژین
باسکی من و تیشکی ئەوی
بژیو دەستێنین لە زەوی
گەر جووتیار ئارەق نەڕێژێ
گەر هەتاو تیشک ناوێژێ
دانیشتووی نێو کۆشک و قەڵا
دەخۆن نانی گەڵا گەڵا؟

ئارەق و تین شێعرێکی ئاماڵ درێژی منە. کە ڕەخنەگری ئێرە بەتاوانی درێژ بوون ڕەتی کردۆتەوە و لاوێکی کوردیش کە لە وڵاتی ئیمپریالیستیدا دەژی بەباشترین شێعری دەزانێ. کارم بەوە نەداوە قسەی کامیان ڕاستە، دەگەڵ ڕەخنەگری ئێرەم، شێعر تا کورت بێ باشترە، بەڵام ئایا کورتی و درێژی شێعر بەدەستی شاعیرە؟ بێگومان نا. شاعیر دەبێ کوڵ و کۆی هەستی خۆی بڕێژێ، جا ئەو کوڵ و کۆیەی زوو بۆ دەڕژێ یا درەنگ، بەدەس خۆی نییە.

سی و پێنج ساڵێک لەمەوبەر دەستی کچە کوردێکم لە کەلەبچەدا دی کە لە دڵی خۆمدا خۆشم دەویست بێدادی و ئەوین هانیان دام ئەم ڕووداوە بخەمە چوارچێوەی شێعرەوە. خۆم لام وابوو بەهەزار دێر شێعر ناتوانم هەستی خۆم دەرببڕم. کەچی ئەم گڕە بەتینەی

دەروونم بەتاقە شێعرێک دامرکا:

ئەسیری بسکی ئاڵۆزی کچە کوردێکی نەشمیلم
تەماشاکەن چ سەیرێکە بەدەستی دیلەوە دیلم

بەڵام ئێستاش ناڵەی جودابیم بەو درێژییەوە پێ ناتەواوە و دەزانم کوڵ و کۆی دەروونی خۆم نەڕشتووە.

ئیلهامی شێعر بۆ من وەخت و ناوەختی نییە، جاری وایە بەڕێدا دەڕۆم یا سواری پاس بووم و شێعرم بۆ دێ زۆر جار لەنێو جێدا شێعرم بۆ هاتووە کە نەمتوانیوە بینووسمەوە و لەبیرم چۆتەوە بەڵام زیاتری شێعرم لە تاریکی و بێدەنگی نیوەشەودا خوڵقاون.

مرۆڤ هەرچەند بژی و هەرچەند فێربێ هێشتا کەم فێر بووە و زۆر شتی نەزانیوە. وردبوونەوە لە شێعری شاعیرێکی باشی کوێر ئەزموونێکی بەنرخی فێر کردم. لە شێعری ئەو شاعیرەدا وەسفی نەرمی سنگ و گەرمی هەناسە و بۆنی بسک و شیرینی ماچ و ناسکی لێو و تەنگی دەمی یارەکەی کراوە. بەڵام باسی چاوی کاڵ و لێوی ئاڵ و کوڵمی سوور و کەزی ڕەش نەکراوە. وەسفی شنەی با، هاژەی باران، بۆنی گوڵ و ڕەقی بەرد و تامی میوە هەیە ئەمما باسی شەپۆلی ڕووبار، بەرزی چیا، گەشی گوڵاڵە و زەردی خەزان نییە زۆر بەهاسانی لێرەدا دەردەکەوێ کە شاعیری واقعیی ناتوانێ ئەوی هەستی پێ نەکا بیکاتە شێعر.

(گۆران)ی مەزنی خۆمان وەسفێکی چیاکانی هەورامانی کردووە لە ترۆپکە هەرە بەرزەکانی ئەم چیایانە بەرزترە، بەڵام کانی بەر تریفەی مانگەشەوی پێ لە دەریای بێ سنوور جوانترە.

لامارتین وەسفێکی دەریاچە دەکا کە بێگومان ـ بەزمانی فەرانسە ـ دیارە لە شەپۆلی دەریا بەتەوژمترە، کەچی کانی بەر تریفەی مانگەشەوی بەبەرچاودا نایە. هەردوو لاش هەقی خۆیانە نە ئەم لە لێواری دەریا ژیاوە و نە ئەو لە بناری چیا. شاعیر هەر لەو شتانە ئیلهام وەردەگرێ کە لە دەوروبەری هەن، دەیانبینی یا هەستیان پێ دەکا و لە نێوانیاندا دەژی.

ئەزموونی شاعیریش لە شێعریدا زۆر دیارە. ئەم ڕۆژانە من خەریکی بەراوردکردنی شیرین و خوسرەوی خانای قوبادی (خسرو شیرین)ی نیزامیم یا ڕاستەکەی بڵێم خەریکم




لەژێر سێبەری فارسییەکەدا شێوەی کوردی گۆران بزانم. لە وەسفی شەوێکی مەستی خوسرەودا بۆم دەرکەوت کە خانای کوردی دۆ نەدیو تا ئەو دەمەی ئەو شێعرەی گوتووە قەت دەمی لە شەراب نەداوە و شێخی نیزامی هاونشینی شا و شازادایان زۆر جار لەبەر مەستی و سەرخۆشی بەکۆڵ بردۆتەوە ماڵ.

زۆرم سەر یەشاندن. زۆرم «من، من» بەزاردا هات کە قسەی نەزان و خۆپەرستانە. بەڵام ئەگەر نەزانیش بم خۆپەرست نیم و باسەکە ئەوەی هەڵدەگرت. هیوادارم لێم ببوورن. دیسان لە کانگای دڵمەوە سوپاستان دەکەم و خۆشیتان بەئاوات دەخوازم.

## ئاسۆگە

نووسەرانی بەڕێزی ڕۆژنامەی خۆشەویستی پاشکۆی عێراق!

بەداخـــەوە نەمتوانی زوو داخوازی ئێـــوە بدەمەوە. هیوای لێبوردنم هەیە. من ئەوەندە بەفیـــز نیم وەڵامی داخوازی دۆســـتان وە دوابخەم. بەڵام لەبەر دەردەداری و لەش بەباری قەڵەمم ڕۆناوە، کاغەزم ڕاموســـیوە و ماڵ ئاواییم لە دنیای ئەدەب و هونەر کردووە. زۆر شێعر و نووسینی ناتەواوم هەن کە جاریێ وازم لێ هێناون.

کچ و کوڕە خۆشەویستەکانی کورد زۆر نامەی جوان و پڕ سۆزم بۆ دەنووسن کە ناتوانم جوابیان بۆ بنووســـمەوە، دەترسم وا بزانن من لە بورجی عاجدا دەژیم و فیزم ناهێڵێ دوو دێڕیان بۆ بنووســـم. کەچی من خۆم دەناســـم و دەزانم زۆر لەوەی بچووکتر و کەمترم کە ڕۆڵە پاکەکانی نەتەوەکەم ڕێزم لێ دەگرن. بەڵام بێ بڕســـتی و کەم بڕشـــتی ڕووزەردی ئەوانم دەکا.

ویســـتووتانە بیرەوەرییەکی خۆمتان بۆ بنووسم. بەڵام تا ئێستا کام کەسی ڕۆژهەڵاتی لە خۆی ڕادیوە بیرەوەرییەکانی خۆی وەک (ڕۆســـۆ) بنووسێ، تا من بوێرم. هەرچەند لام وایە ئەویش ئیعترافاتی تەواوی نەکردووە. چونکە ژیانی هەموو کەس دەمی وای تێدا هەیە کە ڕووی نایە بۆ نیزیکانی خۆی بگێڕێتەوە تەنانەت دەیەوێ لەبیر خۆشی بەرێتەوە.

من ژیانێکی پڕ کوێرەوەری و سەختم ڕابواردووە ئەڵێن نامەوێ بەبیرەوەی تاڵ و تفت بتانکەمە شەریکی خەمی خۆم لە شێعرێکمدا نووسیومە:

«شـینم گـەلـێ گێڕا خـۆشـیم کـەم دیـوە
شـادی دەڵێـن هـەیـە، بـەڵام نـەمـدیـوە
هـەڵـوەدا بـووم لـە دووی پـەری ئـازادی
تـووشـی نـەبـوم نـە لـەودیو نـە لـەم دیوە»

لە (لە کوێوە بۆ کوێ)دا تا ڕادەیەک خۆم بەخەڵک ناساندووە. با بیرەوەری ئەوەتان بۆ بگێڕمەوە. چۆن هاتمە سەر ئەوەیەی بەسەرهاتی خۆم بنووسم. هێشتا وا پیر و کەنفت و کەلەلا نەبووبووم و ڕەنگی مردووانم لەسـەر نەنیشـتبوو. جارێک کابرایەک کە نموونەی نووسینم دیبوو و دەمزانی ئەم گومبەزە چ شەخسێکی تێدا؟ هاتە لام و کاغەز و قەڵەمی دەرهێنا و خۆی ئامادەکرد پرسی:

«ناوت چییە؟ باوک و باپیرەکانت ناویان چی بووە؟ کەی و لە کوێ لەدایک بووی؟»
زانیم ئەم کابرایە دەیەوێ لەسەر کەوڵی من نانێ بخوا؟ پێ کەنیم و گوتم:
«مامۆستا! ئەدی بۆ نافەرمووی کەی کۆچی دوایی دەکەی؟»

ئەوە هانی دام سەرگورشـتەیەکی کورت و پڕ پێچ و پەنای خۆم نووسـی. شـەوێک دۆسـتێکی زۆر خۆشەویستم گوتی: «هێمن! نەحلەتی خوات لێ بێ ئەگەر (لە کوێوە بۆ کوێ) تەواو نەکەی» گوتم برا: «من لەتۆ باشـتر دەزانم چەن بۆشـایی لە نووسینەکەمدا هەیە، بەڵام وەزعی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەوەی زیاتری هەڵنەدەگرت. ئێستاش لەبەر کەم هێزی کارم بۆ ناکرێ. ناهومێد نیم. بەڵکو دەتوانم زۆر شـتی دیکەی لێ زیاد بکەم بەڵام دڵنیام قەت تەواو نابێ».

با ئەوەشـتان بۆ بنووسـم ئەم ڕۆژانە دەسنووسێکم دی بەسـەرهاتی چەند شاعیری کلۆڵی کوردی نووسـیبوو. هێندێکیان دەناسـم و دەزانم درۆی چۆنی بۆ هەڵبەسـتوون. منیشـی بەسەر کردبۆوە. بڕوام پێ بکەن ئەم نووسـەرە بەڕێزە هەرگیز منی لە نزیکەوە نەدیوە و نامناسـی. کەچی نووسـیویەتی «هێمن لە زمانی عەرەبیدا زۆر شـارەزایە». ئەوانەی دەمناسـن دەزانن مـن عەرەبی هەر نازانم. بیرم کردەوە بەزیندی سـەری ئاوام لەبارەیدا بنووسن دەبێ کە لاقم درێژ بۆوە چ بنووسن؟

هەلم بۆ هەڵکەوتووە وەڵامی ڕەخنەگرێکی ورد و باش بدەمەوە کە گوتی: پاشـماوەی گیانـی چینایەتـی لێت نەگەڕاوە لە پێشـەکی تاریک و ڕووندا ناوی ژنەکەت بنووسـی.






ڕەخنەیەکی یەکجار ورد و بەجێ بوو کورد گووتەیەتی: «خوویەکی بگری بەشیری تەرخی ناکەی بەپیری» ئێستاش نەچووە بچێ ژنەکەم ناوی «ئایشە»یە یادی بەخێر.

١٩٧٧/١٠/٢١



## کورد بۆ گشتی شاعیرە!

ئەم جیهانگەڕ، ڕۆژهەڵاتناس، جوغرافیـــازان، مێژوونووس و تەنانەت فەرماندە دڵڕەق و خوێن خۆرانە و دیپلۆماتە فێڵەزان و چاونەزێرانەی بۆ هەر مەبەســتێکی زانستی و هەر کارێکی لەشکری و سیاسی ڕێیان کەوتۆتە خاپوورە وڵاتی کوردستان، ئەم مەڵبەندە سەیر و سەمەرەی جیهان و کوردی لێقەوماو، زۆرلێکراو و پاشکەوتوویان دیوە و ناسیوە و چاک و خراپ، ڕاســـت یا درۆ، دوژمنانە یا دۆســـتانە شتێکیان لەسەر نووسیوە و هەموو لەسەر ئەم دیاردەیە یەکدەنگن کە «کورد گشتی شاعیرە».

من ناوێرم وا بەڕاشـــکاوی ڕای خۆم دەرببڕم و وشـــەی گشت بەکاربێنم، بەڵام دەوێرم وەباڵیان بۆ بکێشم و بڵێم ڕاست دەکەن و کەم کورد هەیە شتێکی بەناوی شێعر نەگوتبێ تا خەڵک پێی نەبێژن «شەندە لە مەندە کەمترە».

نابـــێ وا بەســـاکاری بڕوانینە ئەم دیاردەیە. ڕەنگبێ هــــەروا بەخۆڕایی نەبێ کە کورد ئەوەندە شێعر دۆستە. ئەم دیاردەیە پەیوەندی دەگەڵ مەڵبەندی ژیان و چلۆنایەتی باری ئابووری، سیاسی و کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی دانیشتووانی کوردستاندا هەیە.

ڕاســـتە کوردستان گەرمەســـێری قاقڕ و کڕاڵ و ڕووتەن و دشـــتی بەیتوون و بیڕوون و کاکـــی بەکاکی، بێ ئاو و کەم باران و دزێویشـــی هەیە. بەڵام بەشـــی هەرە زۆری ئەم مەڵبەندە، جوان و دڵگر و هەست بزوێنە. چیا سەربەرز و گەردنکێشەکانی کوردستان کە

دوندیان دە جەرگی ئاسمان چەقیوە، سەرنجی هەموو ڕێبوارێک بۆ لای خۆیان ڕادەکێشن، ئـــەم کەڵە پیاوانەی لە گیانی خۆیان ببوورن و بەچنگە کرکە بگەنە ترۆپکی ئەم چیایانە، گەواڵـــە هەوران لەژێر پێـــی خۆیاندا بەدی دەکەن. هەوای ســـازگار و بێ خەوش و ئاوی زوڵاڵ و ســـارد و ڕوونی ئەم کوێستان و کەویانە، نواڵە زەنوێرەکان وا دەخەمڵێنێ، گوڵە جوانەکان وا دەپشـــکوێنێ و گیاوگژی مێرگە بژوێنەکان وا تێک دەچرژێنێ کە باشـــترین شاعیریش لە وەسفی ئەواندا دادەمێنێ. خۆ باسی هۆبە و هەواری باسەفا، شمشاڵی شوان بگرە و بەردەی کابانی نازدار و شـــەنگەبێری کێل گەردن لە داوێنی کوێستان، کوا بەزمان و قەڵەم تەواو دەبێ، ســـیرەی ســـەقر و هەڵۆ، قاسپەی کەوی کوڕادە خواردوو، ورینگەی بولبولی سەرمەست، جریوەی چوڕە و چۆلەکە، مۆسیقایەکە کە کوێرانیش لە بەزمی بەهار بێ بەش ناکا، لێڕ و جەنگەڵی کوردستان بەو هەموو زوڵمەی لێی دەکرێ هێشتا فێنکایی دڵانە، کێڵگە و دەشـــت و کانیاو و ڕووبار و زێ و زناوی ئەم وڵاتە وشکەسۆفیش دەخاتە گۆرانی چ دەگا بەشەوگەڕی دڵتەڕی سەوداسەری دەنگ خۆش.

زارۆکی کورد دەگەڵ هاوێژرا ســـەر پشتی لانک و بەدەسرازە پێچرا و سەرسینگەی پێ دادرا، گوێـــی بەئاهەنگی بلاوێنی لایی لایی دایکی زەحمەتکێش و هەژاری کورد ڕادێ. کە گیانی لە چەنگ نەخۆشی منداڵانە کە بۆ خۆتان دەزانن چۆن کۆڕپان لەبەر دایکان دەڕفێنن ڕزگار بـــوو، زمانی بە «حلوور بلوور تەکامـــە» ڕادێ کە گەورەتر بوو چ کچ بێ و چ کوڕ لەنێو زبڵ و زاڵ و پەین و پاڵ «حیلانە» دەکا و دەڵێ: «ئەمن و تۆ منداڵین، بەجووتەی دەسماڵین، لەنێو پەین و پاڵین» هەر دەستی داری گرت، دەچێتە بەر دەسلەوەڕ، بزن و مەڕی شەل و نەخۆش و ئەم بەر ئەوبەر شەڕە باڵۆرە دەکا.

کـــەم کچی وا هەیە کە گەیشـــتە دەوروبەری خۆناســـین بچێتە بەر ئـــاژەڵ، هەرچەند بوختانـــێ ناکەم بەچاوی خۆم دیومە قەیری کچ نەک هەر بەڕۆژی ڕوون بەڵکو بەشـــەوی تاریک چۆتە بەر مەڕ و شێوەخوار و شەوێنی داوە و ئاخری مەڕی باوکی لەچەری لەسەر حەوشـــە بەجێ هێشتووە و ڕەدواکەوتووە. بەڵام شـــتی وا کەم هەڵدەکەوێ. وەنەبێ کچ کە نەچووە بەر ماڵات بحەســـێتەوە، نەخێر شـــیاکە ڕشتن، حەوشە ماڵین، تەپاڵە کردن، لیژەدەوە لێدان و دەوەڵان دانان کاری هەرە ســـووکنی، دەســـکەنە، کێشە، گێرە، خۆیان ماڵین، باڵەکەو و گێژەو دەگەڵ باب و برایان دەکا. مەڕ و بزن و مانگا دۆشـــین و پەنیر کوشین و لۆرک و شیرێژ کوڵاندنەوە و مەشکە ژاندنیش دەگەڵ دایک و خوشکان فێر دەبێ. هێشـــتا ئەستێرە بەئاسمانەوە هەن هەڵدەستێ و ماستی جمک لە مەشکەی گاوس دەکا و وەبەر گورمانی دەدا و بەو حاڵەوە دەس لە شێعر هەڵناگرێ و پێی هەڵدەڵێ:

مـــەشـــکە بژێنە بـــەیـــانـــە
شـــەدە ڕەشـــمان میـــوانـــە
قـــەدری لـــەســـەر چاوانـــە
مـــەشـــکە ســـوورێم نـــەژاوە
وەکـــــەف و ڕۆن گـــەڕاوە
کابانـــم لـــــێ تـــــۆراوە
مـــەشکەم مـــەشکەی مانگایـــە
لـــۆلـــەپ لـــە دار خـــورمایە
شلّقەی گـــەییە بـــەغـــدایـــە
مەشـــکەم مەشکەی گاڕەشی
هـــەڵمان دا لـــە گاگـــەشـــی
مـــەشکەم مـــەشکەی لە بڵیندی
لـــە دەرکـــی دەوڵـــەمـــەندی
لـــە خرینگـــەی بازیبەنـــدی

**ئەم شـــێعرانە و زۆر لەوانەش جوانتر دەڵێ تا مەشکە دەژێ و بەرەمەشکە ڕۆ دەکرێ، ئەم کیژە مەشـــکەژێنە دەگاتێ، باوکی یا ژن بەژنەی پێ دەکا و یا شـــیربایی وەردەگرێ، نۆشـــی گیانی نەبێ، ڕەنگبێ بۆ یەکەم جار شـــەوی خەنەبەندان دەستەخوشکان خاوێنی بکەنـــەوە و چڵـــک و چەپـــەری لە لاق و لەتـــەر و مەچەک و زەندی داماڵـــن و بەقەولی خۆیان بیڕازێننەوە و تارای ســـووری پێ دادەن و کە بووکنی هاتن بیبەن. دیســـان شێعر سەرهەڵدەداتەوە و شایەر دەڵێ:**

نایەتـــە دەر نایـــەتـــە دەر، بـــووک یاخییـــە و نایـــەتـــە دەر
لـــە چیمەنان، لـــە چیمەنان، بـــووک یاخییـــە و نایـــەتە دەر
دایکـــی بووکێـــم دەکورکێنێ، بووک یاخییـــە و نایـــەتە دەر

مانگی هەنگوین و شتی وا کە لە شاران ئێستا باوە لە لادێ نییە، بووک ئەوپەڕی سێ ڕۆژان لە کاروباری ماڵێ مەعاف دەکرێ، دووبارە، سەوەی ڕیخ ڕشتن، لۆلەپ و دوژەنگی مەشکە، وێژینگی گێژەو لە خزمەتی دان، سەرباری ئەوە پرتە و بۆڵەی خەسوو، تەوس و لاتاوی دش و چەمۆڵەی هێوەرَ ژنیشی دێتە سەر، دیسان بووکی تازە پەنا دەباتەوە بۆ شێعر کە پێویست ناکا نموونەیان بێنمەوە.

هێندی پێ ناچێ ئەویش دەبێتە دایک و بەمنداڵەکەی هەڵدەڵێ، بەپێی تەمەنی ناوی دەگۆڕێ: دێد، خات، یای، پوور، دایکە و نەنەی پێ دەگوترێ. ئەو کچۆڵەی حێلانەی دەکرد و شێعری بەپێکەنینەوە دەگوت کە کوڕیان بەئیجباری گرت دەردی دڵی خۆی بەشێعر دەکا و دەڵێ:

هەڵنەگری هەی هەڵنەگری لە پەهلەوی زوڵم و زۆر
ڕەببی شاپور شای بمرێ هێنامە ئەحمەدی کوڕ

یا:

کوڕم گەورە کرد بەقەندی شاری
ڕەزا شا بردی لە بۆ ئیجباری

تەنانەت کە زۆر پیر بوو لە شینگایاندا شینگێڕی دەکا و بەشێعر بەمردوو هەڵدەڵێ: خەڵکی بەتاڵانی دەچۆوە، مەڕە، بەرانە، یەختەیە، شەکە، ئەمن بەتاڵانم چۆتەوە بەژنی باریک و قەدی زراو و چاوی دەبەڵەکە.

کەوابوو ژنی کورد دەگەڵ شێعر دەژی تا گڵەبانی چاوی دەکرێ. هەروەها ئەم کوڕەی کە بەمنداڵی دەگەڵ کیژەکە حێلانە و شەڕە باڵۆرەی دەکرد کە دەستی پاشبارەی گرت و توانی هۆگانێک وەسەرەوە بدا دەکەوێتە زەحمەت کێشان. بەدەنگی بەرزی خۆی و باوک و باپیری گاڕەش و گابەش بەنەقیزە تێیان دەوەژێنێ و دەڵێ: بارە، خەتە، هەڵێنە هۆ وەرە بەقوربانت بم، کە گای وچان دا دەنگی خۆش بێ یا ناخۆش گۆرانی دەڵێ:

بـــریـــا دەرزی بـــام تیـــژ و تــــەنــک بـــام
دەروەزەوانـــی ســـــینگ و مــــەمــک بــــام

**هەواکەی دەگۆڕێ و دەبێژێ:**

هـــەڵـــم گرن ئـەویـــەر ئـەویـەر
بمبەنـــە ماڵـــە بـــاب نـــۆکـــەر
شـــینم بـــۆ بکەن شـــەدە بەســـەر

**دەیکاتە ئایشیلێ مامان و دەڵێ:**

بـــە هــــــەوران بـــەهـــاره
دەیخــــــوێنــــن کــــۆلاره
یارکـــۆڵـــەم لـــێ دیـــاره



## چەند نوکتەیەك لەبارەی مێژووی ئەدەبی کوردییەوە



ڕۆژێکی هەرە گەرمی هاوینی مەهاباد بوو، دەگەڵ کۆنە دۆســـتێکی خۆشەویست، قسە خۆش، خوێن شـــیرین، ڕەزا ســـووک و ئەدەبدۆست و لێزانم دانیشتبووین، کەس ئاگای لە دڵی کەس نییە. منیش نەمدەزانی ئەم دۆستەم کە ماوەیەک بوو، یەکتریمان نەدیبوو چەند بەدیداری من شاد بوو. بەڵام بەدیتنی ئەو، دڵم فێنک بۆوە، کوڵ وکۆی دەروونم دامرکا و خەم و پەژارەی چەند ساڵی تەمەنم ڕەوی.

لـــە ژووره گەرمەکەمـــدا کە هەرگیز پانکـــە و کوولێری بەخۆرە نەدیوە، لە تەنیشـــت یەک دانیشـــتین و گەرمی قســـان بووین، قســـەمان لە گرانی، کۆپین، لە کەسادی بازاڕ، لە نەفرۆشـــانی هێندێک شـــت و لە ڕمێن و برەوی شتەکانی دیکە نکرد. باسی ئەنگڕان و هەڵمسان و دەوڵەمەندبوونی بەعزە کەسێک و داماڵان و هەژاری و نەداری بەعزێکی ترمان بەزاریـــدا نەهـــات. تەنانەت لە جووت و گا، جۆگە و جۆماڵ، بەنـــد و بناوان، باخەوانی و شوانی و گاوانی کە تا ڕادەیەک سەرمان لێ دەردەچوو نەدواین.

ماوە تەنگ بوو، ڕۆژ درەنگ بوو، دەبوو زوو لێک جوێ بینەوە. بۆ بیستنی ئەو چەشنە قســـانەی لەسەرەوە باســـمان کرد ماوە زۆرە، ڕوو لە هەر شوێن و ماڵێک بکەی باس هەر ئەو باسەیە.

دەســـمان کرد بەباســـی ئەدەبی. چ بکەین هەردووکمان ئاشق بووین، نەخۆش بووین، نا نا گێل و گێژ بووین! کەســـێک وەک ئێمە نەخۆش و ئاشـــق و گێژ و گێل نەبێ، دەزانێ

شـیعر و شاعیری و ئەدەبدۆستی لە کوردەواریدا بەهیچ دەور و زەمانان نەبۆتە نان و ئاو. بەتایبەتی بۆ ئەو دوو کەسـە جگە لە ئاوارەیی و دەربەدەری و چەرمەسـەری چ سوود و قازانجی نەبووە.

با فیش و درۆ و دەلەسـە نەکەین، ئێمە ئێستاش مێژووی ئەدەبییەکی ئەوتۆمان نییە جێـی متمانە بێ. بۆ نموونە نالی شـاعیری گەورەی کـورد ڕەنگبێ دیوانەکەی لە هەموو شاعیرێکی تری کورد پتر چاپ کرابێ. بەتایبەتی مامۆستا مەلا کەریم و کوڕەکانی ئەوپەڕی زەحمەت و ڕەنجیان لەسەر دیوانەکەی کێشاوە و ئەوەندەی هێزیان پێ شکاوە شێعرەکانیان شـی کردۆتەوە، بەڵام بۆ ناساندنی خۆی هیچ بەڵگە و سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراومان گیر نەکەوتووە. بەڕاستی من بۆ خۆم زۆر سوپاسی ئەو باوک و کوڕانە دەکەم.

ئەگەرچی لە هەڕەتی لاوەتیەوە خەریکی تێگەیشتنی شێعری نالی بووم، بەخوێندنەوەی کتێبە بەنرخ و نایابەکەی ئەوان پتر مانام لە شـێعرە وردەکانی هەڵکڕاند. ئەوەی هێشـتا تاریـک ماوەتـەوە و بەوتووێژی کاک عەزیز و شـێخ تەهاش ڕوونـاک نەبۆتەوە، ژیان و سەرگوزشتەی ئەم شـاعیرە مەزنەیە. ئەگەرچی دەڵێ: «لێوی تۆ ئاوی بەقا من خدرم» من دوودڵم ناوی خدر بووبێ. چونکە بۆ ئەو کەسـەی کە شـاعیرە سەد داوی ناوەتەوە. ئەوی شـاعیریش بێ دەزانێ ئاوی ژیان و خدر پێکەوە پەیوەندییان زۆرە و بە چی دیارە ئەوەش یەکێک لەم داوانە نەبێ کە ناویەتەوە. گریمان ناوی خدر بووبێ، باوکیشی ئەحمەد شاوەیس بووبێ، ناوی دایکی چییە؟ کام قورئان و کتێبی پەڕزەردمان لەدەس دایە، نەک ڕۆژ و مانگ بەڵکو سـاڵی لەدایکبوونی ئەویان لەپشت نووسرابێ؟ دەزانین لە کوردستانی ئازیز تەرەبووە، سـەری خۆی هەڵگرتووە و ڕۆیشتووە. ڕوونە بەخۆشی خۆی نەڕۆیشتووە چونکە بەئاشکرا دیارە زۆری پەرۆشی وڵاتەکەی بووە. جگە لەم دوو شێعرانەی کە تاسەی خۆی بۆ دیتنەوەی وڵات و دیداری دۆستان تێدا دەربڕیوە لە شێعرە ئاماڵ درێژ و پڕ سۆز و کوڵەکەیدا:

قـوربانـی تـۆزی ڕێگـەم ئـەی بـادی خـۆش مـروور
ئـەی پـەیکـی شـارەزا بـەهـەمـوو شـاری شـارەزوور

ئەوپەڕی هەسـت و سۆز و پەژارەی خۆی دەربڕیوە و سەلماندوویەتی دەردی غوربەت چ دەردێکە؟ لەم دوایانەدا بۆتە باو و دەڵێن و دەنووسن لەو قەسیدەدا کە نالی بۆ سالمی

ناردووە وای گوتووە. بەڵام چۆن دەتوانن بسەلمێنن ئەم شێعرەی بۆ سالم ناردووە؟ دیسان تەماشای شێعرەکە بکەنەوە بزانن نالی تا قافیە مەودای داوە باسی شارەزوور، بەتایبەتی سلێمانی خۆشەویستی کردووە، تەنانەت ڕیشی زووری کاکە سووریشی لەبیر نەچۆتەوە. بەڵام ناوی سالمی نەبردووە کە وا بوو، ئەوە سالمە ئازایەتی کردووە و جوابی نالی داوەتەوە. بەڵێ بەڕاستی ئازایەتی کردووە: یەک وێراویەتی جوابە جەنگی نالی کردووە کە کاری هەموو کەس نەبووە و پایەی شاعیری خۆی بردۆتە سەر، دوو، پەژارە و داخی دڵی لە نەمان و بنەبڕ بوونی بنەماڵەی بابان دەربڕیوە. سێ، ئازایانە زوڵم و زۆری بلّحە ڕۆمییانی ڕوون کردۆتەوە و چەند بەکوڵ و سۆزەوە دەڵێ:

زستانی ئەووەڵین بوو، دڕا بەرگی شێخ هەباس
ڕۆمی ئەوەندە شوومە، لە شەخسیش دەدا زەرەر

دیارە سالم ئەو شێعرەی ناردووە بۆ شام تا بەدەس نالی بگا. بەڵام ناحەقم نییە بڵێم بەچی دیارە نالی نیشتەجێی شام بووە؟

«بۆ مولکی شامە نامەیی من سوویی نالییە»

وێدەچێ ئەو وەختە نالی لە شام بووبێ. بەڵام چوونی نالی بۆ ئەستەمبووڵ جێگای گومانە، چ دەگا بەوەی لەوێ ژنی هێنابێ و ژیانی ڕابواردبێ و هەر لەوێ مردبێ و لە فلان گۆڕستان نێژرابێ، گومانی تێدا نییە نالی چۆتە حەج و زیارەتی مەدینەی کردووە و شێعرناس دەزانێ و تێدەگا چۆنی بەبیابانی بێروونی بێ ئاو و گیای عەرەبستان هەڵکوتووە، چۆن سەنای خوا و خۆشەویستی خوای بەجێ هێناوە و دەگەڵ ئەوەشدا چەند مەزڵوومانە و هەژارانە و کوردانە چارەڕەشی و بێ بەشی کوردایەتی خۆی هەر لەبیر نەچۆتەوە و دەڵێ: «کوردی دەوری شارەزوورم».

زۆر دوور ڕۆیشتم. بۆ باسی حەریق ئەو شاعیرە مەزنە کە مەکتەبی شێعری نالی هێنا موکریان و لەو مەڵبەندە هەر کەس شێعری کوردی گوتووە یا دەڵێ بێ ئەم لاو ئەولا لەوی فێربووە، نەکەم؟ تا ئێستا چی لێ نووسراوە و گوتراوە بەکەڵک بێ؟ من بۆ خۆم لەسەر ئەو شاعیرە گەورەی کە غەزەلی وەک:

هێنـــــــده بێـــزاری کـــه زانیـــومه بـــەزاری نـــــایەوه
دوور لـــه باڵاکـــەت ســـەرینی ناهـــومێـــدیـــم نایـــەوه

یا:

چاوەکـــەم دوێنێ لـــه گـــوڵشـــەن گـــوڵ بـــەعیشـــوه خـــۆی نـــواند
نەک نمـــەک گیر بم، بـــەمـــەرگی تـــۆ قـــەســـەم هیچ نـــەمـــدواند

گوتوه، هەر ئەوەنده دەزانم، ناوی مەلا ساڵح بووه، نیزیکەی چەرخێک لەوەی پێش لەو دیوڕا هاتۆته ئەم دیوه له خانەقای لووســـاوکان یا خانەقای شێخی بورهان گیرساوەتەوه و زۆری عاقیده بەشـــێخ بووه. نازانم له کوێ، بەڵام لەســـەر شێعرێک «ئیعزامولمولک» - فێئۆداڵی مەشـــهوور - ڕیشی لووس تاشـــیوه. ئەوه بۆته هۆی ئەوه بێته سابڵاغ و ببێته مەلای مزگەوتی حاجی سەید حەسەنی خزمی خۆم. ئەو کەسانەی چل پەنجا ساڵ لەوەی پێش چاویان بەو مزگەوته کەوتبێ، دەگەڵ منن ئەگەر بڵێم برسیایەتی و هەژاری و ناچاری نەبووبـــا هیچ کۆلکه مەلایەکیش بەپێش نوێژی ئەم مزگەوته ڕازی نەدەبوو. ڕەنگبێ پێش ســـاڵی ١٣٢٨ی کۆچی که ساڵی وەفاتی شێخه، مردبێ و له گۆڕستانی مەلا جامی نێژراوه و هەر خوا دەزانێ ئێســـتا گۆڕەکەی بناخەی خانووی کام موســـڵمان بێ. خوا بکەم لای سەرووی هاڵ یا میوانخانه بێ و نەکرابێته حەمام و شتی وا.

مەهابادی ئێمه تاقه شـــاعیرێکی بەناوبانگی لێ هەڵکەوتووه که خەیابانێکی خۆشیشی بەنێوکراوه، ئەوه جێگای شـــانازییه. من با خۆم منداڵ نەکەمەوه. زۆرم لەو کەسانه دیون که شاگردی مەکتەبخانەی وەفایی بوون. بەڵام کۆنترین دیوانی دەسخەتی وەفایی له بەغدا ســـەری هەڵدا و مامۆستا قەرەداغی زۆری نووســـی و کەمی لەسەر ژیان و مردنی وەفایی زانی. ئەگەر گوتم تاقه شاعیری مەهاباد میرزا ڕەحیمی وەفایی بووه، تا ئەو جێگایەی من بزانم ئەو شاره دڵگره جوانه، قەت شاعیرگر نەبووه. چەند غەزەلێکی میرزا سەلیم ناوێک لـــه کۆنه بەیازانـــدا هەبوون که پێم وایه لەبیر چوونەوه. ڕەنگه ئەو میرزایەش ســـابڵاغی بووبێ. دەنا شـــاعیرەکانی موکریان وەک ئەدەب، ســـەید ڕەشیدی شەهید، سەیفی قازی، میرزا لەتیفی قازی، خاڵەمین، حەقیقی، ســـەید کامیل، هەژار ئەگەر لەم شارەش له دایک

بووبن، لە لادێ ژیاون جا بۆیە دەڵێم، زمانی کوردی خاوێن و ساکار دەبێ لە دێ فێربین نەک لە شـــار. جا با ئەو شـــارە، سابلاغی پێشـــوو یا مەهابادی ئێستا بێ، کە هەتا بڵێی جوان پەروەرە. جگە لە چەند غەزەل و دوو بەیتی نەبێ لە شێعرەکانی مەلا حیسامەددین زیاتر نەمبیستوون کە خەڵکی بۆکان و دەورووبەری بوو. توخواکەی ئەو تاقە شێعرە بەس نییە:

لێـــوی لـــەعلـــی جنێـــوی دابـــوو بـــە مـــن
قینــــــی بنیادەمـــــە منیـــــش گـــەستم!

کە بڵێین شـــاعیرێکی ناسک خەیاڵ و باش بووە؟ هیوادارم دیوانی تەواوی ئەو شاعیرە کۆ کرابێتەوە و ڕۆژێک بکەویتە بەردەستان.

پێویست ناکا، من خۆم جحێڵ بکەمەوە، نیزامی گوتەنی: لە شەشی شەست ڕزگار بووم و بەرەو حەفتا دەچم و وردە هەنگاوی بەرەو گۆڕ دەنێم. تازە بەهیوا نیم جحێڵایەتی بکەم. گوێ سوانان بگرم. بەڵێ من پیاو بووم کە «شاعیرێک» بەکوێری لە برسان و لە خەمان عەمری خوای بەجێ هێنا. دیبووم دەمزانی چەند زانا و خوێندەوارە، چەند کۆمەڵناسە. لە پێنج خشتەکییە فارسییەکەی و قەسیدە کوردییەکەی: «شاعیر عومووم کەوتنە مەقامات و بۆڵەبۆڵ» دیارە چەند جامیعەناسە.

ئەگەر ددان بەوە دابنێین کە ئەدەبیاتی نووســـراوی کورد، مەبەستم فۆلکلۆری ئەدەبی نییە، ڕەوتی ســـەبکەکانی ئەدەبی فارســـی گرتووە، ناچارین بڵێین کەم شـــاعیری وامان هەبوون لە ســـەبکی خۆراسانیدا بەقەد «شاعیرێک» سەرکەوتووبن. قەسیدەکەی سێڵاوی مەهاباد، ئەو قەســـیدەی کە لە زمانی دەسەڵاتی ڕەزاخانی خوێنڕێژدا ڕەخنەی لە ڕەفتاری نالەباری کاربەدەستانی ئەو زەمانە گرتووە و بەو نیوە شێعرە دەس پێدەکا: «موددەتێکە نەفســـی حیز حوکمی خراوم لێ دەکا» شاهیدی قسەکەمن. ڕەنگبێ ئێستاش ئەو ئاژانانە مابن کە بەئەمری شـــارەبانی ڕەزاخانی، مەندیلی مەلایان؛ شەدەی لاوان، چارشێوی ژنان، نێفەکی ڕانک و پانتۆڵ لەبەرانیان دەسووتاند، فڕێ دەدا، و دەدڕی و دەبڕی و ئەگەر کەس دیار نەبا بەبەرتیل ڕازی دەبوون. کە مەلا مارف لەبارەی ئەواندا گوتوویەتی:

دەچمە سەر چۆم و خەیابان یەک نەفەس ئاسوودە بم
شەهرەبانی حازرە و داوای کڵاوم لێ دەکا

بێ شک ئەو سجیل نووسانە زیندوون و ئەگەر ئەم شێعرە بخوێننەوە، تک تک ئارەق دەڕێژن کە بۆ خۆیان دەزانن ئەو سەردەم چۆنیان خەڵک دەڕووتاندەوە کە مەلا مارف لەباری ئەواندا گوتوویەتی:

سەیری خۆشتر من کە مەعرووفم لەنێو ئەم شارەدا
تازە ئیحسائییە داوای ئیسم و ناوم لێ دەکا

لەبیرمە شەوێکی لە دیوەخانی میرزا ڕەحمەتی شسافیعی، ڕەحمەتی خوای لێ بێ، کۆمەڵێک گەورە پیاو و شێعرناس کە ئەوی لەبیرم مابێ یەکیان مامۆستای مەزن تورجانی زادە بوو، تاریفی ئەو شێعرەیان دەکرد. کە مەلا مارف بۆ شافیعی ناردبوو. من بەئەدەب لەسەر چۆک دانیشتبووم و متەقم نەدەکرد تا گەیشتنە ئەم شێعرە:

جائیزەی شێعرم لە تۆ ناوێ مەگەر باری ڕۆژی
تا سەر و ڕووی دوژمن و بەدخواهی تۆی پێ ڕەش بکەم

ئەو دەم وەدەنگ هاتم و گوتم ئەم شێعرە مانایەکی دیکەشی لە بندا هەیە ئەویش ئەوەیە کە میرزا ڕەحمەت ئەوەندەی دوژمن و بەدخواە هەیە کە بارێک ڕەژیان دەوێ تا مەلا مارف ڕوویان پێ ڕەش بکا. مامۆستا تورجانی زادە تاوێک مات بوو و گوتی: «ئافەریم ڕۆڵە تۆ کێی؟» خۆم پێ ناساند گوتی: «لەکن کێت خوێندووە؟» گوتم: «لە خزمەت مامۆستا فەوزی» گوتی: «ئەوە بۆیە شتی وا دەزانی».

بەڵێ مەلا مارف ئەو کەسە بوو کە بەو هەموو زانست و هونەرەوە بەزگێک تێر و بەدوو زگان برسی بوو. دوایەش کە مرد وەک حەریق لە گۆڕستانی مەلا جامی نێژرا و گۆڕی ئەویش وەک گۆڕی هەزاران مەلا و سەید و پیاوچاک بەدەستی «وەرەهرام» تەخت کرا.

ئای ئەوانەی منداڵن قەبرستانی مەلا جامیان نەدیوە کە بێجگە لەوەی گۆڕستانی موسڵمانان بوو، هەزاران کێلی مێژوویی و جوانی تێدا بوون کە هەموو موسـڵمانان شـاردیاننەوە و لەنێویان بردن. من بۆ خۆم کێلێکم دیبوو کە نەوێکی لوتفعەلیخانی زەند هەڵی کەندبوو و بەخەتێکی زۆر جوان بوو. بەئاواتم گۆڕی مەلا مارف لە حەوشەیماڵێک دابێ و گوڵکاری و چیمەنی بێ.





## پێشەکییەک بۆ «پێکەنینی گەدا»ی
## حەسەن قزڵجی

شـــەو درەنگانە، بێدەنگییەکی بەســـام ژووره ســـارد و ســـڕ و چـــۆل و هۆل و نیوه تاریکەکـــەی داگرتووم. لە خوێندنەوەی ئەم چیرۆکانە بوومـــەوە، لە حاڵێکدا کە کارێکی زۆریان کردۆتە ســـەر مێشـــک و دەمارم و ورده فرمێسکیان پێ هەڵوەراندووم. بەئەسپایی دەفتەرەکـــە دادەنێم. چراکـــە دەکوژێنمەوە، لە جێگاکەم دەخزێم و چاو لێک دەنێم بەڵکو سەرخەوێک بشکێنم و خەم و پەژارەم بڕەوێنم.

کەچی خەیاڵ هەڵمدەگرێ، دەمبا... دەمبا... دەوەناو دەوەن و ڕەوەزاو ڕەوەز بەسەر بەفری ســـەری کوێســـتاناندا، بەنێو دارســـتان و لێره چڕوپڕەکاندا، بەپێدەشت و گۆڕ و نەرمانەکانـــدا، بەنواڵە زنوێر و بڗوێنەکاندا، بەبەســـتێنی چۆمی (تەتەهوو)دا بۆ شـــاره خونچیلانەکەی مامۆســـتا، بۆ بۆکان، بۆ بووکی شارەکانی کوردستان، بۆ کانگای ئەوین و دڵداری، بۆ مەکۆی خەبات و فیداکاری بۆ بەر ســـەلای ســـەرداری شەهید، بۆ سەر حەوز و کانیـــە جوان و بەناوبانگەکەی، بۆ تەماشـــای بـــەژن و باڵا و خاڵ و میل و چاو و برۆ و کەزێ و ئەگریجە و پووز و بەلەک و ســـەر و شـــەده و شـــان و دەسماڵ و قەد و پشتێنی کیژه بۆکانیان، کە دەســـتە دەستە و پۆل پۆل وەک مێگەلی مامز و ئاسک بەلەنجەولار و تاسکە تاسک دێنە سەر حەوز، وەگۆزه سوور و نەخشاوەکانیان بەناز لە کانی هەڵدەدەن و وێنەیان لە ئاوێنەی ڕوون و بێ گەردی حەوزەکەدا جیلوەیەکی ئاسمانی هەیە کە فریشتە و پەری وەبیر دێنێتەوە شعوور و زەوق مشتوماڵ دەکا و هەست و خەیاڵ دەبزوێنێ.

گوێم لە دەنگی ئەو منداڵە ڕەزا سووک و بزۆز و ڕووتەڵە هەڵوا فرۆشانە دەبێ، کە تەبەکی هەڵوا دەگێڕن و بەهەوایەکی خۆش پێی هەڵدەڵێن و هاوار دەکەن:

هەڵوای تەن تەنانی، هەتا نەیخۆی نایزانی

لە جێگاکەمدا ئەم دیو و ئەودیو دەکەم. بەناهومێدییەوە هەناسەیەک هەڵدەکێشم و لەبەر خۆمەوە دەڵێم، خۆزگە و هەزار خۆزگە منیش وا پیر و کەنەفت و شەکەت و کەلەلا نەدەبووم. ئەوەندەم هێز و گوڕ و تین و توانا دەما تا پڕ بەئامێزم لەو چیرۆکانە هەڵگرتبا و بەهەموو شار و لادێ و کووچە و کۆڵان و خەیابان و بازێڕی کوردستاندا گەڕابام و یەک بەخۆم هاوارم کردبا:

خەڵکینە ئەگەر شتی لە هەڵوا شیرینتر و لە گوڵاڵەی نواڵان بەبۆن و بەرامەترتان دەوێ وەرن، وەرن بخوێننەوە، بخوێننەوە تا ئاهی خۆشتان لە دڵ و دەروون بگەڕێ بخوێننەوە تا تامەزرۆییتان بشکێ، بخوێننەوە تا کوڵ و کۆتان دابمرکێ، بخوێننەوە تا کۆمەڵەکەتان باشتر بناسن و لە دەرد و ئازاری بگەن. بخوێننەوە تا پتر شاییتان بەزمانەکەتان بێ. تا نەیخوێننەوە نازانن قەڵەمی سیحراوی مامۆستا قزڵجی چ شوێنەوارێکی بەنرخ و بێ وێنەی خوڵقاندووە. بیری ورد و خەیاڵی بڵیند و هەستی ناسکی ئەم نووسەرە بلیمەتە چ نموونەیەکی ئەدەبی بەرزی داڕشتووە و پەنجەی بەهێز و ڕەنگینی ئەم هونەرمەندە گەورە لیزگەیەکی چۆنی لە دوڕ و گەوهەر و مرواریی نایاب بۆ هۆنیونەوە؟

لە موکریان باوە دەڵێن: «بنەماڵەی قزڵجی وەک بێچووە مرواری وان هەر لە هێلکە هاتنەدەر مەلەوانن». مەبەستیان ئەوەیە ئەوی لەم بنەماڵە بێ، هەر لە منداڵییەوە زانا و پیتۆڵە. بەڕاستیش ئەم بنەماڵە بەڕێزە گەلێک ڕۆڵەی بلیمەت و زانای لێ هەڵکەوتووە، کە بێ ئەوەی بۆ خۆیان ویستبیان ناوبانگی زانست و هونەریان لە دنیادا بڵاو بۆتەوە.

مامۆستا حەسەنی قزڵجی ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتووی ئەم بنەماڵە گەورەیە، کە مایەی شانازی نەتەوەکەمانە. ئەو ڕێبازی باوک و باپیرەکانی نەگرت و ڕێگایەکی تری هەڵبژارد و لەباتی خزمەتی ئایین، کە ڕێگای باوک و باپیرەکانی بوو. خزمەتی ئەدەبی وەئەستۆگرت ئەویش چ ئەدەبێک؟ ئەدەبێکی بەرزی کۆمەڵایەتی.

یەکێک لە سیاسەتە شوومەکانی ڕەزا خانی پەهلەوی لە ماوەی دەسەڵاتی ڕەشی فاشیستی خۆیدا هەوڵی بێ وچان و بێ ڕەحمانە بوو بۆ تواندنەوەی گەلی کورد لە کوردستانی ئێراندا. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە شەیتانییە، داب و شوێن و جلوبەرگ و ئەدەب و زمان و مۆسیقا و سەمای کوردی بەسەختی قەدەخە کردبوو.

بــەڵام بەو هەموو هێزە شــەیتانییەوە. نــەک هەر کوردی کۆڵنــەدەری بۆ نەبەزی و دەرۆســتی نەهات. بەڵکوو ئەم سیاســەتە و ئەم زەبر و زەنگە بــوو بەهۆی ڕاپەڕینێکی بەرینی فیکری لە کوردستاندا.

هەزاران پێچ و پشــتێن و ڕانک و چۆخە و پەســتەی پیاوی کورد و شەدە و هەوری و دەســماڵ و کۆڵوانەی ژنی کورد دڕا و ســووتا، بەڵام جلوبەرگی کوردی وەک سوننەتێکی میللی هەر ماوە.

لە قوتابخانە و ئیــدارە، تەنانەت لە کووچە و خەیابان هەزاران کورد بەتاوانی کوردی گوتــن گیران، ئازاردران و ســووکایەتییان پێ کرا. بەڵام زمانی کوردی وەک ســەرمایەی نەتەوایەتیمان هەر پارێزرا. کورد نەتواوە و ئابڕوو تکاوی و ڕیســوایی مێژوو بۆ پۆلیســی ڕەزاخان مایەوە.

لــەو ســەردەمە تاریک و تنووک و ئەنگوســت لە چاوەدا لە مەڵبەنــدی موکریان بۆ بەربەرەکانی دەگەڵ سیاسەتی تواندنەوەی کورد، کۆمەڵێکی نهێنی لە زانایان و ڕووناکبیران و گەورە پیاوانی کورد بەڕابەریی مامۆستا مەلا ئەحمەدی فەوزی، سەیفی قازی، پێشەوای نەمر، قازیی بۆکان شــێخ ئەحمەدی ســریلاوا و گەلێکی تر لە ڕووناکبیری ئەو سەردەمە پێک هاتبوو کە ئامانجی ئەساسی و هەرە گەورەیان پاراستن و پەرەپێدان و بووژاندنەوەی زمــان و ئەدەبــی کوردی بوو. کتێب و ڕۆژنامەی کوردییان کــە لە عێراق بڵاو دەبوونەوە بەزەحمەت پەیدا دەکرد و بەئیحتیاتەوە بەسەر لاوانی بڕوا پێکراودا بڵاو دەکردەوە تا فێری کوردی خوێندنەوە بن. ئەوان بەتایبەتی مامۆستا فەوزی دەستەیەک لاوی ڕووناکبیریان پێ گەیاندن کە لە دواڕۆژدا شــاعیر و نووســەری زۆر خزمەتکار و بەناوبانگیان لێ هەڵکەوت. یەکێــک لەدەس پەروەردەکانی و هاوبیرەکانی ئەوان کاک حەســەنی قزڵجیی خۆمانە. کە هەر لەو دەمیڕا فێری کوردی خوێندنەوە ببوو. ئەوەبوو دەگەڵ ســایەی شوومی پەهلەوی لاچوو، تەمومژی چارەڕەشی و نەگبەتی کورد ڕەوی. وەک ئەستێرەیەکی گەش و ڕووناک و پڕشنگدار لە ئاسمانی ئەدەبی کوردیدا درەوشایەوە. لاپەڕەی گۆوار و ڕۆژنامەکانی کوردیی بەنووسراوە جوانەکانی خۆی ڕازاندەوە.

لە سەردەمی کۆماری دێموکراتی کوردستاندا مامۆستا قزڵجی بێ ئەوەی سینگ ڕەپێش خا و خۆ ڕانێ، یەکێک لە خۆشەویســترین نووســەران و نیزیکترین دۆســتانی پێشــەوا قازی موحەمەدی ئەدەبدۆســت و هونەرپەروەر بوو. بێجگە لەوەی لە ڕۆژنامەی کوردستان ئۆرگانی حیزبدا دەینووسی سەرنووسەری گۆوارە جوانەکەی هەڵاڵەش بوو.

پێشـــەوا لە ئاخرین ڕۆژانی دەســەڵاتیدا خەریک بوو مامۆستا قزڵجی و چەند شاعیر و نووســەری لاو و تازەپێگەیشتوو بنێرنە دەرەوە تا بەقەولی خۆی چاو و گوێیان بکرێتەوە و شــتی تازە فێربن. بــەڵام بەداخەوە نەگەیشـــت و ئەم ئاواتەشــی وەک زۆر لە ئاواتە پیرۆزەکانی نەهاتە دی.

وەک ئێســـتا لەبیرمـــە و تا گڵەبانی چاوم دەکەن لەبیرم ناچێتەوە. ڕۆژێکی ســارد و ســەهۆڵبەندنی مەهاباد بوو، خۆم کوزوو کردبوو و بەپەلە دەڕۆیشـــتم جێگایەکی گەرم و گوڕ ببینمەوە. تەماشام کرد پێشەوا لەبەر بێڵاکەی هاتوچۆ دەکا و ڕۆژنامەی کوردستانی بەدەســتەوە و یەکێک لە نووســەرانی ڕۆژنامەکەی لەلایە. خەریک بووم فیزماڵکی بدەمێ و خــۆم ببوێرم. دیتمی و بانگی کردم. هێشـــتا دووربووم فەرمووی «دیوتە ئەم قزڵجییە چۆنی نووسیوە؟».

زانیم مەبەســتی ئەم پارچە ئەدەبییە جوانەیە کە قزڵجی لەم ژمارەیەدا نووســیویە. گوتم: «بەڵێ دیومە و بەڕاستی چاکی نووسیوە. کاکی نووسەر هەڵی دایە و گوتی: بەڵێ چاک دەنووســێ بەڵام کەم دەنووسێ. پێشەوا بزەیەکی هاتێ و سەری ڕاوەشاند، ئەم دوو شێعرەی سەعدی خوێندەوە:

خــاک مغــرب شــنیدەام کــە کننــد
بــە چهـــــل ســال کاســەی چینی
صــد بــروزی کننــــــد در بغـــداد
لاجــرم قیمتـــــش همــی بینــی؟

کە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفای سەفوەت ئاوای کردووە بەکوردی:

بیســـــتوومە کــــەوا لــە ڕۆژهــەڵاتــا
بــەچل ســاڵ ئەیکــەن یــەک کاسە چینی
لــەمــەردەشــت ئەکــەن ســەدی بــەڕۆژێ
بــۆیــە قیمــەتــی وایــە ئــەیبینــی

دیســـان ڕووی لە من کرد و فەرمووی: «بریا زۆری وامان هەبان» و پێش ئەوەی من جوابی دەمەوە بۆ خۆی گوتی: «ئەگەر بۆ خۆمان بین زۆری وامان لێ هەڵدەکەون».

داخــی گرانم زۆر زوو هێلانەکەمان لێ شــێوا، ســایەی ئەو پیاوە نیشــتمانپەروەر و ئەدەبدۆست و هونەرپەروەر و قەدرزانەمان لەسەر وەلاکەوت.

قزڵجیش وەک زۆر لە نووســەر و شــاعیرەکانی کورد بێ ئەنوا و بێ داشدار و دڵسۆز مایەوە و لە دەس زوڵم و زۆری ڕێژیم ئاوارە و پەرپووەی هەندەران بوو.

هــەر بۆ خۆی دەزانێ لەم ماوە دوور و درێــژەی لێقەومان و دەربەدەریدا چەن تاڵ و ســوێریی ژیانی چێشتووە، چەندی ســەرما و گەرمای دنیا دیوە، چەندی پەند و گۆڵمەز بەسەرهاتووە. چەن گیراوە و ئازار دراوە، چەن هەوراز و نشێوی پێواوە و ئەم دیو ئەودیوی پــێ کراوە و بــۆ پەیداکردنی پاروووە نانێکی بێ منەت ناچار بووە بەو دەستەوەســتانیی خۆیەوە، کاری چەن ساخت و گرانی بەدەنی بکا و سەر بۆ ناکەسان شۆڕ نەکاتەوە.

مامۆستا لە کۆڕی خەباتدا قاڵ بووە، خاراوە و لە کڵ هاتۆتەدەر. لەو هەموو کوێرەوەری و دەربەدەری و چەرمەســەرییە، شــت فێر بووە، زانستی بەرەو ژوورتر چووە. تەجرەبەی وەســەر یەک ناوە، کۆمەڵی خۆی باشــتر ناســیوە، هەســتی بەئێش و ئازاری کردووە و دەرمانی بۆ دۆزیوەتەوە و بۆتە فەیلەســووفێکی پســپۆڕ و نووســەرێکی ڕئالیست و واقع بین.

پاڵەوانانــی چیرۆکەکانــی قزڵجی هیچ کامیــان بۆ خوێنەرێکی کورد نەناســیاو نین. هەموویانــی لەنێو چین و توێژەکانی کۆمەڵی کوردەواری هەڵبژاردووە. کارەســاتی ژیانی ئەوان بەکوردییەکی ســاکار، بەو زمانەی هەموو کوردێکی نەخوێندەوار و ســاوێلکە لێی حاڵــی دەبێ شــی کردۆتەوە. خوێنەری ورد تێ دەگا مامۆســتا قزڵجیــی تا چ ڕادەیەک شــارەزای زانســتی ڕەوان شناســییە و چۆنی ڕووحی پاڵەوانەکان ناسیوە و چۆتە ناخی دەروونیانەوە.

مامۆستا قزڵجی کۆمەڵی کوردەواریی زۆر باش ناسیوە. خوێنەر لەم کورتە چیرۆکانەدا نموونەی ژیانی دەرەبەگێکی چەکمەڕەق، کۆنە بەگێکی بارگین تۆپیو، شــێخێکی دەسبڕ، دەروێشــێکی زەرک وەشــێن، جووتیارێکــی زۆرلێکراو، بــاب نۆکەرێکی زمــان لووس، کاربەدەســتێکی بەرتیل خۆری بێگانە، تاجیرێکی سووت خۆری تەماعکار، جاسووسێکی نیشتمانفرۆش، تەنانەت، ژنێکی چارەڕەش و بێ بەشی کورد دەبینی.

خوێنــەر پاش خوێندنەوەی زۆربەی چیرۆکەکان پێکەنین دەیگرێ، بەڵام چ پێکەنینێ؟




پێکەنینێکی تاڵتر لە کەکرە.

ئەوەی بۆ کوردێکی دڵسۆز جێی داخ و خەفەتە ئەمەیە: کە دەگەڵ ئەوەشدا زیاتر ڕووداوەکانی نێوەرۆکی چیرۆکەکان دەگەڕێنەوە بۆ سی ساڵ لەوەی پێش کەچی دەبینی ئێستاش ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆ لە وەزعی کۆمەڵایەتی کورددا ڕووی نەداوە کە ئەم چیرۆکانە تازەیی خۆیان لەدەس بدەن.

ئێستاش جووتیار بەچەشنێکی نوێ دەچەوسێنرێتەوە و لەبەر زۆری ئیجارە و قیست و سوورسات دەس لە زەویوزاری خۆی هەڵدەگرێ و ڕوو لە شاران دەکا. ئێستاش تونی حەمام پڕن لە هەژارە بێ جێوڕێیەکان. ئێستاش بازرگانی سووت خۆر و سفتەباز، شێخی کۆنەپەرست و دەسبڕ، دەروێشی فریودراوی زەرگ وەشێن لە کوردستاندا کەم نین.

ئێستاش دایک و باوکی کورد بۆ چاری دەردی منداڵە نەخۆشەکانیان، دەس و دامێنی ئامینە خانی نووشتە نووس دەبن و زۆر ئامینە خانی بێ بەش و چارەڕەش ماون کە لەبەر وەزعی نالەباری کۆمەڵایەتی، هەوەس ناچاریان دەکا بەفێڵ ڕەشید فێرکەن نووشتەیان دەکۆشی باوێ.

ئێستاش سەرکار ڕەزایی پاسگاکانی کوردستان لە جەنابی سەرهەنگ ئیجارە دەگرێ و بۆ ئەستاندنی بەرتیل و سازکردنی پەلپ و بیانوو حوسێن قوڵی هەر بەدەستەوەیە.

خوێنەرانی بەڕێز؛ من لەو سەرەتا کورتەدا ناتوانم مامۆستا قزڵجی بەئێوە بناسێنم. خۆتان کتێبەکەی بەسەرنجەوە بخوێننەوە تا ئەم نووسەرە هەڵکەوتووە بناسن و لەبیری بەرزی بەهرە وەرگرن.

با تێکڕا فەرمایشەکەی پێشەوای نەمرمان دووپاتە بکەینەوە و بڵێین: «بریا زۆری وامان هەبان».



## پێشەکی بۆ قەڵای دمدم

بەدرێژایی مێژووی نەتەوەی کورد هەر کارەساتێکی گرنگی سیاسی و مێژوویی، هەر ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی بەرچاو، هەر چیرۆکێکی تاڵ و شیرینی دڵداری و هەر شایی و شینێکی گەورە لەهەر مەڵبەندێکی کوردستان قەوماوە، خۆوێژ و خۆشخوانە کوردە نەخوێندەوار و نەناسراوەکان لەسەر کێشی بڕگەی خۆمانە بەزمانێکی ساکار، بەڵام پوخت و پاراو و ڕەسەن و ڕەوان هۆندوویانەتەوە و ئاهەنگێکی تایبەتی خۆیان بۆ داناوە و پێیان گوتووە بەیت.

شایەر و بەیت بێژەکان ئەو بەیتانەیان لە کۆڕی دیوەخانی مەزنان، لە لامێردانی گەورە پیاوان، لە گۆشەی مزگەوتی گوندان و لە چایخانە و کاروانسەرای شاران بۆ خەڵکی تینوو و تامەزرۆ گوتووە. بەم جۆرە هەم نەیانهێشتووە ڕووداو و کارەساتەکان لەبیر بچنەوە و هەم زمان و فەرهەنگ و ئەدەبی فۆلکلۆری کوردییان ڕۆژ بەڕۆژ دەوڵەمەند و دەوڵەمەندتر کردووە.

ئەم بەیتانە سنگ بەسنگ و پشت بەپشت پارێزراون. دیارە بەپێی جێ و کات و وەستایی و ناوەستایی شایەر کەم و زۆر گۆڕانیان بەسەردا هاتووە. زیاد و کەم کراون وشەی تازە و نوێ و باویان هاتۆتە نێو و وشەی کۆن و سواویان لێ دەراوێژراوە. بەڵام نێوەرۆکی مەبەست هەروەک خۆی ماوەتەوە.

لە سەردەمی ئێمەدا کە جیهان ئاڵوگۆڕێکی سەیر و بەپەلەی بەسەردا هاتووە. ئینسان

شەپۆلی هەوای خستۆتە ژێر ڕکێف و ئاوەزنگی خۆی و ئاتۆمی قەڵشاندووە و لەسەر مانگ دابەزیوە. هەرچەند وەزعی کوردســتان گۆڕانێکی ئەوتۆی بەســەردا نەهاتووە و نەتەوەی کورد هەروا لە کاروانی شارســتانیەتی بەجێمــاوە و تەمومژی نەزانی و نەخوێندەواری لە ئاسمانی وڵاتەکەمان نەڕەویوە. بەڵام ئەگەر نووری کارەبا کوردەواری ڕووناک نەکردۆتەوە، ڕادیۆ و گرام و ڕیکۆردەر گەیشتۆتە کوێرە دێیەکانی کوردستانیش و دەتوانین بڵێین تیشکی زانست ناڕاستەوخۆ، کوردستانیشی گرتۆتەوە.

بەرنامــەی ڕادیۆکان، ئیســتوانەی گرامەکان و شــریتی ڕیکــۆردەرەکان خەڵکیان لە بەیــت و بــاوی شــایەر و هونەرمەندەکان بێ نیــاز کردووە. بۆیە مەترســیی ئەوە زۆرە شــاکارە بەنرخەکانی ئەدەبی فۆلکلۆریمان وردە وردە لەبیر بچنەوە و لەبیر چوونەوەشیان زیانێکــی زۆر گەورە لە زمان و فەرهەنــگ و مێژووی نەتەوەکەمان دەدا. هەرچەند زانایان و ڕووناکبیرانی کورد لە هەموو لاوە هەســتیان بەو مەترسییە کردووە و هەر کەس بەپێی هێز و توانا و دەرفەتی خۆی خەریکی کۆکردنەوەیانن. بەڵام بەداخەوە دەرۆســت نایەن و پێشگرییان بۆ ناکرێ.

یەکێک لە کارەســاتە هەرە گەورە و خوێناوییەکانی مێژووی نوێی کوردستان کە پاش دابەشــکردنی ئەم وڵاتە لەنێوان عوســمانی و قزڵباشــدا ڕووی داوە، گەمارۆدان و گیرانی قەڵای دمدم و شــەهیدبوونی ئەمیرخانی برادۆســت، خانی لەپ زێڕیــن و هاوپەیمانان و دۆستانی ئەم سەردارە و مەزنەی کوردە.

ئەم کارەساتە ئەوەندە خوێناوی و بەسام بووە، شا عەبباسی سەفەوی شای خوێنڕێژ و پیاوکوژی ئێران، ئەوەندەی ڕق لە نەتەوەی کورد بووە، ئەوەندە زاڵمانە و زۆردارانە دەگەڵ ئەم نەتەوە بێدەرەتانە جووڵاوەتەوە. ئەوەندەی خەڵک کوشتووە و وڵاتی خاپوور کردووە و ژن و منداڵــی بەدیل بردووە. ئەمیر خانیش ئەوەندە پیاوانە ڕاپەڕیوە و ئازایانە وەدەس هاتووە و سەری بۆ شۆڕ نەکردۆتەوە و بەرگریی کردووە و ئەوەندە مەردانە شەهید کراوە کە ڕابردنی زەمان نەیتوانیوە تۆزی فەرامۆشــی لەســەر ئەم کارەساتە دابێژێ و لەپێش چاوانی ون بکا.

شــایەر و خۆشخوانەکان ئەم کارەســاتەیان بەشێوەی جۆربەجۆر کردۆتە بەیت، لک و پۆپیان لێ کردۆتەوە و شاخ و باڵیان لێناوە. لە هەموویاندا دوو شت لە پێش چاو گیراوە: ئازایەتی و خۆڕاگریی ئەمیرخان و دڵڕەقی و بێ بەزەیی شا عەبباس.

لەنێو ئەم بەیتانای من لەم بارەدا بیســتوومن هیچیــان ناگەنە ئەم بەیتەی کە زانای

گەورەی ئاڵمانی «ئۆسکارمان» لە سەرەتای ئەم چەرخەدا لە ڕەحمان بەکری بیستووە و لە ١٩٠٥ دا چاپی کردووە و ئێستا لەدەس دایە. لە هەموو بەیتێکدا خەیاڵاتی شاعیرانە بەسەر واقعییاتی مێژووییدا زاڵ دەبێ. لەم بەیتەشـــدا ئەمە دەبیندرێ. بەڵام وا دیارە ئەم بەیتە زۆر پاش قەومانی کارەســـاتەکە نەگوترابێ، چونکە ناوی هێندێک کەس لە کاربەدەستانی قزڵباش و دۆستانی ئەمیرخان لەم بەیتەدا وەک خۆیان ماونەوە. مێژوونووسەکانی خۆمانە و بێگانەش لەسەر ئەو کارەساتەیان نووسیوە و سەرچاوەی هەموویان «عالم ارای عباسی» کتێبە بەنرخەکەی ئەسکەندەر بەگی تورکمانە.

ئەســـکەندەر بەگ هەرچەند نۆکەر و نمەک خوردەی شـــا عەبباس و دوژمنی نەتەوەی ئەمیرخان بووە و داوای ڕەوای ئەو ســـەردارە مەزنەی کوردی بەلاســـاری و ســـەرپێچی و تەنانـــەت نمەک بەحەرامی و لەڕێ دەرچوون داناوە و بەئاشـــکرایی جنێوی داوە و دەڵێ: «ئەرکی سەرشـــانی شـــای ئیســـلام پەنایە ئاســـەواریان لێ ببڕێ» بەڵام پیاو هەق بڵێ مێژوونووســـێکی یەکجار ورد و وریا بووە و ڕووداوەکانی مێژووی ســـەردەمی شا عەبباسی زۆر بەسەرنجەوە تۆمار کردوون. جگە لەوە خۆی لە گەمارۆدانی قەڵای دمدمدا بەشداربووە و ئاگای لە هەموو کەین و بەینێک بووە.

ڕاســـتە ئەویش وەک هەموو دەسوپێوەندی شایان ڕیاباز و درۆزن بووە و زۆری تەشی لەبەر شـــا عەبباس ڕستووە و بەبەژن و باڵای ئەو شـــا بەدفەڕ و خوێنڕێژەی هەڵکوتووە و وای نیشـــان داوە کە تاوانی کوردان بووە کە دڵی ناســـکی خاوەن شکۆیان شکاندووە و هەقی خۆیان بووە قەتلوعام بکرێن و بەو دەردە بچن. بەڵام دەگەڵ ئەوەشـــدا زۆر زانیاری تێدایە و ســـەرچاوەیەکی بەکەڵکە بۆ ئەو کەسانەی بیانەوێ لەبارەی قەڵای دمدم و ساڵی موکری قڕانەکەدا شت بنووسن.

کارەساتی دمدم و موکریان کە یەکێک لە بەسامترین ڕووداوەکانی مێژووی کوردستانە، کە هەســـتی نەتەوایەتیی زانایانی کوردی جۆشاندووە، خانیی نەمر ئەم هەستە ئاگرینەی چل و چەند ساڵ پاش کارەساتەکە دەربڕیوە.

لەم ســـاڵانەی دواییدا زانای بەناوبانگ و نووســـەری مەزنی کورد «عەرەب شـــەمۆ» چیرۆکێکی درێژی بەناوی قەڵای دمدم لەســـەر ئوســـلوبێکی نوێ و باوی ڕۆژ نووســـیوە. نووسینی چیرۆکی مێژوویی لە مێژە لەناو گەلانی جیهاندا جێی خۆی کردۆتەوە. بەڵام ئەمە یەکەم چیرۆکی درێژە کە من بەزمانی کوردی لەم بارەدا خوێندوومەتەوە.

بەداخەوە من نووســـینەکەی ئەوم نەخوێندۆتەوە، چونکە ســـەرم لە خەتی ڕووســـی

دەرناچێ و کتێبەکەش بەخەتی ڕووسی چاپ کراوە. بەڵام مامۆستا شوکور مستەفا کە ئەم چیرۆکەی هێناوەتەوە ســەر شێوەی کرمانجی خواروو و خەتی پەسندکراوی کۆڕی زانیاری دەڵێ: «دەستم لە نێوەرۆکی چیرۆکەکە نەداوە و هەر ڕواڵەتم گۆڕیوە».

مامۆستا عەرەب شەمۆ بەخەیاڵی بەرزی هونەرمەندانەی خۆی چیرۆکیکی شیرین و پڕ کارەسات و هەست بزوێنی خوڵقاندووە و خزمەتێکی گەورەی بەئەدەبی نەتەوەکەی کردووە. سەرتاسەری ئەم چیرۆکە بەتامە پڕە لە هەستی پیرۆزی ئینسانی، نیشتمانپەروەری و گەل خۆشەویستی.

چیرۆکــی قەڵای دمدم نموونــەی ئەدەبێکی ڕیئالیســتی ڕەخنەگرانەیە کە لە ئەدەبی کوردیدا ئەگەر بێ وێنە نەبێ کەم وێنەیە. لە لابەلای دێڕەکانی ئەم چیرۆکەدا پەردە لەسەر واقعیــی نەتەوەی کورد، بەلایەنی باش و خراپدا نیشــان دراوە و بۆ ئەو بێگانانەی کورد باش ناناسن زۆر بەکەڵکە.

پاڵەوانانی ئەم چیرۆکە هیچ کام بۆ کۆردێک نەناسیاو نین. «شەباب» لاوێکی کوردی ئاســایی و ڕەزاســووکە کە هەموو ڕۆژێ لە ڕێباز و کووچە و کۆڵانان تووشــی دەبین و قســەی دەگەڵ دەکەیــن. «دلبەر» کچــە کوردێکی لەبار و نەشــمیلانەیە کە لە هەموو گوند و شــارۆچکێکی کوردســتاندا نموونەی زۆرە و هیچ وێ ناچێ خەیاڵی نووســەرێک خوڵقاندبێتــی. زۆر «هەمزە چاوەشــمان» دیون و دواندوون. زۆر وەســتای ئەرمەنی و ئاســۆری ئامرازی پێویستییان بۆ دروســت کردووین. زۆر «ئەسکەندەرە پیرە» چیرۆکی کۆنیان بۆ گێڕاوینەوە.

کــەم لاوی کورد هەیە لە دڵداریدا شــەبابێک نەبێ. کەم کیژی کورد هەیە بڕوای بەپڕ و پــووچ نەبووبــێ و پەنای بۆ پڕ و پیرێژنان نەبردبێ و نووشــتەی چەور و شــیرینی و دەمبەسی بەمەلا نەکردبێ. چلدانە و شەمۆڵەی نەگربێتەوە. بن پشک و خوشکی بچووکی وەک (نەنێ)مان زۆر دیون کە دیاری و ڕاسپاردەی کاکیان بۆ دەزگیرانەکەی بردووە.

بەڕاستی مامۆستا شارەزایی تەواوی لە واقعیی ژیانی نەتەوەکەی هەیە و زانیارییەکەی خۆی زانایانە و وەســتایانە لە لابەلای دێرەکانی ئەم چیرۆکە شــیرینەدا نەخت و پوخت گێڕاوەتەوە.

هەوار و بانەمەڕ و ئاژەڵداری، هەرەوەز و دەســتەوا و لەبەر شــانە دانیشــتن، خوری پشــکنینەوە، تەشی ڕســتن، لێک کۆبوونەوەی کچان، تەون هەڵاوەسین، وێنەی مافوورە گرتنەوە، مازوو چنین، ڕابواردن، داوەت و هەڵپەڕین، ژوان و دڵداری، جووت و گا و کشتوکاڵ

و ئاشـــەوانی، نوێژ و تاعەت، ســـواری و تەقلە و ڕمبازی و ڕاو و شكار و نێچیرەوانی، نان بدەیی و میوانداری، ژن زۆرهێنان و كچ فرۆشـــی و شیربایی وەرگرتن، نیشتمانپەروەری و فیداكاری و گیانبازی، خەیانەت و بێگانەپەرستی و ڕووڕەشی، هەموویان بەزمانێكی شیرین و ساكار و لەجێی خۆیاندا باس كراون و نرخی چیرۆكەكەیان زیاتر كردووە. مامۆستا نە لە نیشـــاندانی كردارە باشەكاندا زێدەڕۆیی كردووە و لە ڕاستی دووربۆتەوە و نە كردەوە دزێو و ناشـــیرینەكانی شاردۆتەوە. مامۆستا لە سەرتاسەری ئەم چیرۆكەیدا تێ كۆشاوە ئاكاری پاك و كرداری چاك لەنێو كۆمەڵی كوردەواریدا برەو پێ بدا. دەیەوێ لاوانی كوردســـتان ڕاست و پاك و نیشتمانپەروەر بن و دۆست و دوژمنی خۆیان بناسن. دۆستیان خۆش بووێ و كۆمەك و یارمەتیی بدەن و باریووی لێ وەرگرن و دوژمنیان ناخۆش بوێ و ڕقیان لێ بێ و لەسەریەوە نەچن و فریوی نەخۆن هەر بەوە ڕانەوەستاوە و ویستوویەتی ئوسولی شەڕی پارتیزانی فێری شۆڕشگێڕانی كورد بكا و تەنانەت ئەوەندە لەم بارە دڵسۆزیی نیشان داوە كە ناچار بووە لە واقیع دووربێتەوە. بۆ ئەوەی شۆڕشگێڕانی كورد لە شەڕی شەوێدا فێری خۆشـــاردنەوە بكا. لە شەڕی شەمزینانددا ڕووداوێك دەخوڵقێنێ و هەمزە چاوەشی هێدی و هێمن و دڵســـۆز كە نموونەی فەرماندەیەكی هەرە باش و لەســـەرەخۆیە وا توورە دەكا كە ناچار بێ داگژێتە سەربازێك و لێی بدا. چونكە جگەرەی داگیرساندووە!

بێگومان مامۆستا لێرەدا هێند بەتەنگ فێركردنەوە بووە زەمان و مەكانی لەبیرچۆتەوە. ڕاســـتە لە زەمانی شا عەبباســـدا پێی ئەورووپاییەكان بۆ ئێران كراوەتەوە و تەنانەت ئەو پادشـــایە برایانی «شیرلی» وەك ڕاوێژكەری سوپایی هێناوەتە ئێران و باڵیۆزی ناردوونە ئەورووپـــا. دوور نییە تووتـــن كە لە ئەمریكاوە هاتۆتە ئەورووپـــا گەییبێتە ئێرانیش. بەڵام تۆ بڵێی لە كوردســـتان لەو ســـەردەمەدا قەننەكێش هەبووبن؟ گریمان تووتنیش بووبێ و قەننەكێش هەبووبن. خۆ ڕەنگبێ مامۆســـتاش وەك من لەبیری بێ تا ئەم دواییانە كورد بە بەرد و ئەســـتێ ئاگری هەڵدەكرد و ســـەبیلە و قەننەیان دەكێشا و جگەرە هەر نەبوو. جگەرەكێشـــان و ئاگر هەڵكردن بۆ پارتیزان زەرەرەری هەیە و مامۆســـتای مەزن دەیەوێ ئەم ئەزموونە بەنرخەمان فێر بكا بۆیە تووشی ئەم هەڵە بووە.

بەداخـــەوە ئەم چیرۆكە بەنرخە هەڵەی وای تێدا هەن. كە بەهیچ بارێ ناكرێ چاویان لێ بپۆشرێ.

چیرۆكی مێژوویی ئەســـڵێكی هەیە و هەمووی زادەی خەیاڵی نووسەر نییە بەڵام شاخ و باڵی لێ دەنێ و لك و پۆپی لێ دەكاتەوە. لە چیرۆكە سەركەوتووەكاندا هەمیشە ناوی قارەمانەكان و شـــوێنی گرنگی جوغرافیایی دەپارێزرێن. ئەو كەسەی مێژوویی دەنووسێ.

دەبێ شـــارەزایی تەواوی لە مێژوو و جوغرافیادا هەبێ تا بەهەڵە نەچێ بۆ بەڵگە ئیشـــارە بەچیرۆکی «شـــەر و ئاشـــتی» تۆڵستۆی دەکەین. بێگومان مامۆســـتا لە من باشتر ئەم چیرۆکـــە دەزانێ. چونکـــە بەزمانی ڕووســـی خوێندۆتەوە. ڕەنگبـــێ چیرۆکی «ئەوەندە قارەمان» زۆر کەم بێ. بەڵام چونکە تۆڵستۆی مەزن ئاگای لە مێژوو هەبووە و جوغرافیای وڵاتەکەی باش زانیوە ســـاڵی قەومانی شەڕان و ناوی قارەمانە دەرجە یەکەکانی و شوێنی شەڕگەکانی نەگۆڕیوە و پاراستوونی بۆیە خوێنەر قارەمانەکانی تریش بەقارەمانی خەیاڵی نازانێ و ڕووداوە پچووکەکانی نێو کارەســـات کە بەزادەی خەیاڵی نووســـەر نازانێ، جێی داخە مامۆستای خۆشەویستی ئێمە زۆر کەمی شارەزایی لە مێژوو و جوغرافیای کوردستان و ئێران هەبووە. سەرانسەری چیرۆکەکەی لەسەر خەیاڵی خۆی داڕشتووە بۆیە هەڵەی زۆر زەق و بەرچاوی لە نووسینەکەدا هەیە.

کەســـێک بیەوێ لەســـەر قەڵای دمدم بنووســـێ ناچارە بزانێ پایتەختی شا عەبباس ئیســـفەهان بووە نەک تاران، شـــا عەبباسێکی لە سەردەمی دەسەڵاتی ڕەش و زۆردارانەی خۆیدا زۆر شـــاری ســـووتاندن، زۆر قەڵای ڕووخانـــدن، زۆر ڕەوەی ڕفانـــدن، زۆر وڵاتی خاپوورکردن، ئیســـفەهانی وا ڕازاندەوە، وا ئاوەدان کـــردەوە، کە پێیان گوت: «اصفهان نصف جهان» ئێستاش ئەو خانووبەرە و مزگەوت و باغانەی ئەو دروستی کردوون و بینای ناون، جیهانگەران بۆ ئیسفەهان ڕادەکێشن.

مامۆســـتا پێش نووســـینی چیرۆکەکەی مێژوویی ئێرانی نەخوێندۆتەوە، تا بزانێ ئەو شـــا عەبباسەی ئەو باســـی دەکا چ دێوەزمەیەکی خوێنخۆر بووە؟ ئەگەر بەپەلە چاوێکی هەر بە (عالم ارای عباســـی) دا گێڕابا، کە مێژوونووسی تایبەتی شا عەبباس نووسیویەتی، دەیزانی ئـــەو زۆردارە پیاوکوژە نێرینـــەی لە مەڵبەندی موکریان، لە بەشـــێکی گەورەی نیشتمانەکەمان بڕیوە و مێیینە وردەی بەدیل بردووە.

پێم وایە ئەگەر دەیزانی کە شا عەبباس ئەوەندە زۆردار بووە کە نەتەنها هەزاران کەسی کوشـــتووە و هەزاران وەجاخی کوژاندۆتەوە، بەڵکە خۆشی وەجاخ کوێر کردووە و لە سێ کوڕەکانی خۆی دووی چاو دەرێناون و یەکی سەربڕیوە. تابلۆیەکی زۆر بەسامتر و ڕەشتر و نائینسانی تری لە شا عەبباس دەکێشا.

مامۆســـتا نەک زۆر ئـــاگای لە مێژووی ئێران نەبووە بەڵکـــو گوێی نەداوتەوە مێژوو و جوغرافیای وڵاتەکەی خۆشی، دەنا هیچ نەبا دەبوو بزانێ «سلێمانی» زۆر پاش کارەساتی قەڵای دمدم دروســـت کـــراوە. من بەش بەحاڵـــی خۆم ناوی عەشـــیرەتی «بەڕوودارم»

نەبیستووە کە مامۆستا دەڵێ خانی لەپ زێڕین گەورەی وان بووە. بۆ ئەوەی بزانین ئەمیرخان کێ بووە؟ و چۆن پێ گەییوە. ناچارین پەنا بەرین بۆ ئەو نووسراوەی دوژمن لەسەری نووسیوە، چونکە بۆ خۆمان سەرچاوەی کۆنترمان نین. خاوەنی «عالم آرا» دەنووسێ:

«پاش نەمانی شای بەهەشتی، کە ڕۆمییەکان مرخیان لە ئازەربایجان خۆش کرد، عێل و عەشیرەتەکانی کوردی سەر بەئەم دەوڵەتە بایان داوە و ڕەگەڵ ڕۆمییەکان کەوتن. شا موحەممەد ناوێک لە میرزادەکانی برادۆست بەفەرمانی خوندکاری ڕۆم کرا بەمەزن و خاوەن دەسەڵاتی برادۆست. ئەمیرخان سەری بۆ دانەنواند و ملی بۆ ڕانەکێشا، هەر دەمە ڕەگەڵ یەکێک لە ئەمیرەکانی گەورەی کورد دەکەوت. ماوەیەک لەکن عومەر بەگی حاکمی «سهران» ڕایبوارد. لە شەڕێکدا کە عومەر بەگ دەگەڵ دوژمنانی کرد، ئەمیرخان دەستێکی لە ئانیشکەوە پەڕی. ناوبانگی بەئەمیرخانی چولاق ڕۆیشت. لەو ساڵەدا کە ئاڵای بەرزی پادشائی لە ئازەربایجان دەشەکاوە و شا بەو پێ و قەدەمە پیرۆزەوە بەرەو نەخچەوان و ئێرەوان دەیاژوا. ناوبراو هاتە بەردەرکی پادشایەتی و خۆی بە شاپەرست و خزمەتکار نیشان دا. خاوەن شکۆ ئاوڕی ڕەحمەتی لێداوە. مەزنایەتی و دەستەڵاتداری تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕی پێ بەخشی و نازناوی «خانی»دایە و سەری بەرزکردەوە. مەڵبەندی ورمێ و شنۆی کە سەر بەئازەربایجانە و لە سەردەمی شای بەهەشتیدا لەژێر فەرمانی یەکێک لە گەورە گەورەکانی قزڵباشدا بوو پێ ئەسپارد. لەسەر فەرمانی شا وەستا زێڕینگەرەکان دەستێکیان لە زێڕی سوور دروست کرد و بەگەواهیرات و مرواری بەنرخ ڕازاندەوە و لە باسکیان بەست. چونکە ئازا و مەرد بوو خاوەن شکۆ زۆری ڕوو دەدایە و گەلێکی چاکە دەگەڵ دەفەرموو. ئەویش دەستی خزمەتی لەسەر سینگ دانا. لەسایەی دڵسۆزی و چاودێری خاوەن شکۆدا ڕۆژ بەڕۆژ بەپەیژەی مەزنایەتیدا چووە سەر و لە هەموو هاوشانانی خۆی تێ پەڕاند. چەند ناوچە و مەڵبەندی لە ئەمیرەکانی کوردی سەر بەڕۆم ئەستاندەوە. بەپایەبەرزی و لەشکر زۆری ناوبانگی دەرکرد. زۆر لە خێڵەکانی کورد و لە ئەمیرزادەکان لە دەورەی هاڵان و خزمەتی ئەویان ڕەچاوکرد. هێندە پێ نەچوو هەوا و فیز لە سەری دا و لەخۆبائی بوو...»

مێژوونووسێک کە ئەمیرخانی بەچاوی خۆی دیوە و سەرەڕای ئەو هەموو دوژمنایەتییە، ئیعتراف بەئازایەتی و مەردایەتی دەکا و دەڵێ: «ئەمیرخان لە عەشیرەتی برادۆست بوو و لە شەڕدا دەستێکی پەڕیوە و شا عەبباس دەستی زێڕی بۆ دروست کردووە» بەڵام مامۆستا دەڵێ چونکە زۆری زێڕ بەخشیوە پێیان گوتووە: «خانی لەپ زێڕین».




مامۆستا زۆر بەوردی و درێژی باسی قەڵای دمدم دەکا. بەڵام بەو حاڵەوە بەپێویستم زانی ئەم کورتە باسەی ئەسکەندەر بەگ لەسەری نووسیویە، لێرەدا بێنمەوە کە دەڵێ: «لەپێش ئیسلامدا لە زەمانی ساسانییەکان (اکاسرە)دا هەر لەو شوێنەدا قەڵایەک هەبووە کە پێی گوتراوە (دمدم) و دەسدرێژیی ڕۆژگار خاپووری کردووە».

لە جێگایەکی دیکەدا نەخشەی قەڵاکەمان ئاوا بۆ دەکێشێ:

«ئەم قەڵایە لەسەر دوندی کێوێکی یەکجار بەرز دروستکراوە کە یەکپارچە بەردێکی درێژووکە و تەسکە و وەک پشتی گا هەڵکەوتووە. لای شیمال و جنووبی دۆڵی زۆر قووڵن کە لە ژێڵا بۆ سەری دەبێ بەپەیژەی خەیاڵ بۆی بچی، لەبەر بەرزی پێویستی بەشوورە نییە و شوورەیان بۆ نەکێشاوە. دوو لایەکەی دیکەی کە پانایی قەڵاکەن، لای ڕۆژهەڵاتی پاڵی وەپانایی چیا داوە و شوورەیەکی زۆر تەواوی بۆ کێشراوە. بورجی زۆر بڵیندی هەن و دەرگایەکی بەرەو جنووب دەکرێتەوە. لە دەروازەوە بۆ عەرزی ڕێگایەک بەنێو بەردیدا هەیە و دەرگایەکی جنووب دەکرێتەوە. لە دەروازەوە بۆ عەرزی ڕێگایەک بەنێو بەردیدا هەیە کە ئەوەندە تەنگە بەزەحمەت سوارێکی تێوەدەچێ. سەنگەر بردنەپێش لە لای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە نەبێ ناکرێ. لە لای ڕۆژهەڵات تیرهاوێژێکی بۆ دەرکی قەڵای بمێنێ یەکپارچە بەردی سەخت و ڕەقە. لەبنەوە بوودڕی بۆ لێ نادرێ. کە بەردەکە براوە بورجێکی زۆر بەرز و قایمییان لێ دروست کردووە کە بۆ خۆی قەڵایچەیەکە. تا ئەو بورجە بەردەس نەکرێ سەنگەر بردنە بن قەڵا محاڵە. ئاوی قەڵا لە حەوزێکی گەورەڕا دابین دەکرێ کە بەباران پڕ دەبێ. بەڵام لە لای شیمال لەنێو گەلیدا نیزیکی قەڵا، کانییەک هەیە. ئاوی زۆر کەمە ئەمیرخان جۆگەی بۆ کێشاوە ڕێی بۆ کردۆتەوە و دەحەوزەکەی کردووە. ئاوی ئەم کانییە لە ئێوارەوە هەتا بەرەبەیان، حەوزەکە پڕ دەکا. ئاوەکەی بەشی ڕۆژێکی قەڵانشینەکان دەکا. گومبەزێکیان لە ڕێکی عەرزی لەسەر حەوزەکە هەڵخستووە کە لە پێش چاوان ون بێ. پێی دەڵێن (سولق)، بۆ پاراستنی حەوزخانەکە بورجێکیان بەپاڵ قەڵاکەوە هەڵچنیوە. لەلای جنووبەوە سەهۆڵدانێکیان سازکردووە کە بەبەفر و سەهۆڵ دەئاخندرێ. لە تەنیشت وێ حەوزێک هەیە تا ئەو بەفر و سەهۆڵەی لە هاویندا دەتوێتەوە و دەبێتە ئاو بەفیڕۆ نەڕوا و لەوێدا کۆبێتەوە و لە کاتی کەم ئاویدا بەکار بێ ئەو سەهۆڵدانەش قەڵایەچەیەکی لەسەر دروست کراوە و پاسەوان و تفەنگچی لەسەر دانراوە. بەوێش دەڵێن: (بوزلق) یا (قارلق)، ڕێگای ویش وەک ڕێگای (سولق) لە دەرەوەڕا ونە.

بەکورتی ئەم قەڵایە لە پێنج قەڵا پێک هاتووە. یەکیان ئەسڵی قەڵاکە، یەک قەڵای خوارێ، یەک قەڵای سولق و یەک بوزلق و ئەوی دیکەیان بورجی گەورەی دەرەوەی دەرگای

ڕۆژهەڵات کە لەپێشـــدا باسمان کرد. هەر پێنج ئەوەندە بەرز و قایمن کە پەیکی تیژڕەوی بیر و مێرووڵەی خەیاڵ ڕێیان تێ نابا و وێیان هەڵناگەڕێ».

پێم وایە ئەگەر مامۆستا هەر ئەوەندەی ئەسکەندەر بەگ وەک دوژمنێک لەسەر قەڵای دمدم نووسیویەتی دەخوێندەوە، جا واقیعییەتی مێژوویی بەو خەیاڵە بەرز و ناسکەی خۆی دەڕازاندەوە. چیرۆکە جوانەکەی دەگەیشـــتە ڕێزی شـــاکارەکانی ئەدەبی بەرزی نووسەرە بەناوبانگەکانی جیهان.

لە عالەم ئارادا ناوی هەموو ســـەرکردەکانی قزڵباش و زۆر لە پاڵەوانانی کورد هاتوون. چەند خۆش بوو مامۆســـتا قارەمانـــی دەرەجە یەکی خەیاڵـــی نەخوڵقاندبان و قارەمانە ئەســـڵییەکانی ناوبردبان. جا کەیفی خۆی بوو بازرگانـــی عەرەبی ناو دەنا (ئیبن بەتوتە) یـــا نا. چونکە دەتوانین تەئویلێک بۆ ئەوە بهێنینەوە کە ئەو بازرگانە بەناوی جیهانگەڕی بەناوبانگ کراوە و مەبەستی ئەو جیهانگەڕە نییە.

نامەوێ باســـی ئەوەی بکەم کەوا دیارە مامۆســـتا لە دوایی چیرۆکەکەیدا ماندوو بووە و پشـــووی وەک پێشوو درێژ و لەســـەرە خۆ نییە. چارەنووسی بەشی زۆری پاڵەوانەکانی نادیارە. چونکە ئەم شـــێوەم لە زۆر داستانەکانی ڕووس بەتایبەتی شاکارەکانی تۆڵستۆی مەزندا دیوە و مامۆستاش کەم و زۆر لەژێر تاوی ئەواندایە بۆیە هیچ لەم بارەدا ناڵێم. بەڵام دەوێرم بڵێم باسی گەمارۆدانی قەڵا و قەڵاداری ئەمیرخان و خۆڕاگری کوردان و بێ بەزەیی دوژمنی کورت بڕیوەتەوە. چونکە بەشـــی هەرە گرنگی کارەســـاتەکە کە سەرنجی خۆمانە و بێگانەی ڕاکێشـــاوە و ناوی ئەمیرخانی لە مێژووی کوردستاندا بەنەمری هێشتۆتەوە ئەم بەشەیانە.

لەنێو کوردەواریدا باوە دەڵێن ژنی قەڵانشـــینەکان بەتایبەتـــی ژنەکانی ئەمیرخان لە قەڵاداریدا بەشداربوون و لە بەیتەکەشدا ئیشارەی بۆ کراوە. وەک دەڵێ:

«کێ بوو لە خاتوون پەروەرێ
گوتی: کاک ئاڵی ئەتۆ ماوی ئەتۆش هەڵێ»

هەروەها مەشـــهوورە دەڵێن ژنەکانی ئەمیرخان و گەورە گەورەکان پاش گیرانی قەڵا و کوژرانی پیاوەکانی، خۆیان لە قەڵا هەڵداشتووە تا نەبنە دیلی دەستی دوژمنی بێ شەرم. لە بەیتەکە گوتراوە:

«کێ بوو؟ لە خاتوونی خانی
قبوول ناکەن کافرستانی




خۆمان هەڵدەدێرین لە چل کەوانی»

مامۆستا ویستوویەتی نەخشی ژیانی کورد لە خەباتی ڕزگاریخوازیدا بەرچاو نیشان بدا و جوانیشی نیشان داوە. ئەویش زۆر جوان باسی ئەوەی کردووە کە ژنەکان خۆیان کوشتووە. بۆیە داخم ناچێ نەیزانیوە کە یەکێک لە ژنەکانی ئەمیرخان کە ئەسکەندەر بەگ نەک بێژی نایە ناوی بەرێ بەڵکو قسەی سووکیشی پێ دەڵێ، شەش ساڵ پاش گیرانی قەڵا سەرلەنوێ قەڵا دەگرێتەوە. دڵنیام ئەگەر مامۆستا ئەوەی دەزانی چیرۆکەکەی دوو بەرگ دەبوو. چونکە ئازایەتی و فیداکاری ئەم ژنە کوردە بەشەرەفە خۆی بەرگێک چیرۆک هەڵدەگرێ.

مامۆستا باسی عەشیرەتی شکاک دەکا کە ئێستا لە دەوروبەری قەڵای دمدم دەژین، بەڵام لەو سەردەمەیدا هیچ ناویان نییە. کەچی باسی عەشیرەتی گەورە و بەناوبانگی جەلالی ناکا کە بەداخەوە لەو سەردەمیدا تەنیا عەشیرەتێکی کورد بوون یارمەتی شا عەبباسیان داوە و بەشی زۆریان لەنێو قزڵباشدا بوون و ژمارەیەکی کەمیان لە سەنگەری شەرەفدا بەرگرییان کردووە.

مامۆستا ویستوویەتی بەئەنقەست بڵێ شەڕی کوردان زیاتر بەتیر و شیر بووە بەڵام لە ڕاستیدا ئەمیرخان تۆپ و تفەنگیشی بووە، لەباری چەک و قۆرخانەوە تەنگاو نەبووە. هەر بێ ئاوی و تینوایەتی شپرزەی کردووە و وای لێ کردووە لە قەڵا بێتەدەر و شەهید بکرێ.

لە پێشدا گوتم من لە خوێندنەوەی خەتی ڕووسیدا کوڵم و چیرۆکەکەی مامۆستا عەرەب شەمۆم نەخوێندۆتەوە. جا بۆیە ناتوانم لەسەر شێوەی نووسینی ئەو چ قسان بکەم. بەڵام ئەوەکەی مامۆستا شوکور مستەفام چەند جار خوێندۆتەوە و بەڕاستی چێژم لێ وەرگرتووە.

عەیبی کار لەوەی دایە ئێمە تا ئێستاش زمانێکی ستانداردمان نییە کە کەس نەتوانێ لێی لادا. هەروا بەهاسانیش ناتوانین ئەم زمانە پێک بێنین و خۆمان لە پاشاگەردانی ڕزگار بکەین. ماوەیەکە هێندێک لە نووسەرە زاناکانمان بەکردەوە بۆ ئەم کارە بەنرخە تێ دەکۆشن.

دەوێرم بڵێم مامۆستا شوکور مستەفا یەکێک لە ئاڵا هەڵگرانی ئەم خەباتەیە و لەڕیزی پێشەوە دایە، مامۆستا وەک پیاوێکی زانا دەستی لە تەعەسوبی ناوچەگەری هەڵگرتووە و لە نووسینەکانی خۆیدا هەوڵ دەدا لە هەموو شێوەکانی زمانی کوردی کەلک وەربگرێ و بەبڕوای من لەم کارە پڕ سوودەشدا سەرکەوتووە.

مامۆستا تێ دەکۆشێ کام وشە ڕەسەن و سووک و ڕەوانە و کام کینایە لەسەر زاران خۆشە بەکاری بێنێ. لەبەکارهێنانی وشەی داتاشراوی ناڕەسەن و دزێو و ناشیرین خۆ دەپارێزێ. زۆر شارەزای ڕێزمانی کوردییە و لەژێر تەئسیری زمانی بێگانەدا نانووسێ.

مامۆستا خوێندەوار و ڕووناکبیرە، زۆر گەڕاوە، گەلێکی خوێندوەتەوە. زەحمەت و کوێرەوەری کێشاوە و ئەزموونێکی تەواوی وەسەریەک ناوە. لە سایەی ئەم ئەزموونەدا گەییوەتە ئەم قەناعەتە کە هیچ شێوەیەکی زمانی کوردی با زۆریش دەوڵەمەند و پڕ وشەبێ بەتەنێ ناتوانێ ببێ بەزمانی ئەدەبی نەتەوەکەمان. جا بۆیە ئەم ڕێبازەی گرتۆتە پێش کە لە پێکهێنانی زمانی ستانداردی کوردیدا بەشداربێ. سەرەڕای ئەوانە هەرگیز وەک پیاوێکی لەخۆبایی لە نووسینەکانی خۆی دڵنیا نییە و بەشوورەیی نازانێ ڕاوێژی بەدۆستان و نیزیکانی خۆی بکا. ئەوەش ئاکارێکی باشە و پیاو دەگەیەنێتە ئامانجی خۆی. مامۆستا شوکور لەمێژە بەنووسەرێکی سەرکەوتوو ناسراوە. بەڵام بەبڕوای من لە نووسینی ئەم چیرۆکەدا خۆی گەیاندووەتە ترۆپکی هەرە بەرزی ئەدەبی کوردی. لەپێشدا گوتم ئەم چیرۆکە لەچاو نێوەرۆکەوە لە ئەدەبی کوردیدا ئەگەر بێ وێنە نەبێ کەم وێنەیە. ئێستاش لە خۆم ڕادەبینم بڵێم لەچاو ڕواڵەت و فۆرمیشەوە هەر وایە.



# هەژار و شەرەفنامە

وتەیەک لە پێشەکیی شەرەفنامەدا

تەڕەسالّی وام نەدیبوو، هەوری ڕەش و چڵکن بەربینگی عاسمانیان بەرنەدەدا، تەم لە سەران نەدەڕەوی، باران هەڵی نەدەبرینگاند. ڕۆژ نەبوو چەند ڕەهێڵەی توند نەهێنێ و شەو نەبوو چەند ڕێژەی بەخوڕڕەم نەبارێ، شریخ و هۆڕی هەوران نەدەپساوە بەبێ نێوبڕ... بریسکەی دەدان...

لەنگێزە و باسریشک و قوڕوچڵپاو و جلێتاو بڕستیان لەکەڵ دەبڕی، کەویە بەفر و ڕونوو هەرەسیان دەهێنا، زەوی دەجمی و ڕێوبان جمگەیان دەدا.

لەو بەهارە تەڕ و تووشەدا و لەو ڕۆژە گرژ و مۆنانەدا، لە بناری کێوە سەربەرزەکانی کوردستان، لە بنکەیەکی پێشمەرگە تووشی یەک هاتینەوە.

من و هەژار لە منداڵییەوە، هاواڵ بووین، وێکڕا پەروازە و گەورە ببووین، هەڕەتی لاوەتیمان پێکەوە لەناو چوار دیواری قوڕماوی پڕ لە جۆلاتەنەی حوجرەی کۆنە مزگەوتانەدا ڕابواردبوو... ئێستاش وا بەسەری پیری، پاش بیست و ئەوەندە ساڵ لێک دووری و هەڵبڕان و تامەزرۆیی یەکترمان دەدیتەوە.. نەهاتی و لێقەومان هەردووکمانی کەنەفت و کەلەلا و پیر و زورهان کردبوو. ئەو ئەستوور ببوو من لاواز، ئەو لەبەر ورگ و گەد و گیپاڵی پشووی لێ بڕابوو، من لەبەر کزی و بێ هێزی هەر لاکەی سەرم دەهات... دیسان سەرمان گەیشتەوە یەک و بووینەوە: یەکماڵ. ماڵی چی؟ دوو لێفەی شڕ و پەتووڕ، سەرسەرینی پەڕپلاو و هەڵوەشاو، هەریەکە تەختە شکاوێک و بەهەردووکمان چرایەک و چادانێک و




دوو پیاڵەی ڕووکێش و ئاوخۆرەوەیەکی گڵینە و ئاوێ بێنە و دەســتان بشۆ. ژوورەکەمان بەوشکەبەرد داندرابوو. دیوارەکانی خوار و خێچ بوون، لە هەموو لایەکەوە زگیان دابوو.

هیــچ دیوێکی ســواغ نەکرابوو، باگێــڕەوەی نەبوو، ئاڵوودارەکانی کــەڕاوی بوون و چەکەرەیان دەرکردبوو.

هەڵاشــەکەی داچۆڕا بوو، بۆساردێکی پیسی لێ دەهات... هێندە تەنگ و تەسک بوو بەچیرەچیر جێمان دەبۆوە. هێند تاریک بوو بەنیوەڕۆ چرای دەویســت. هێند نەوی بوو، تێیدا هەڵنەدەهاتینەوە...

قســەی خۆمان بێ زۆریش تێر و پڕ نەبووین. دەگەڵ پێشــمەرگە جوان و جحێڵەکان لەســەر خوانێک کۆ دەبووینەوە و ژەمەنانمان یەک بوو، زێدەپارووی چەور و نەرمی پیری چڵێس و گردەنشــینمان بــۆ دیاری نەکرابوو... گۆزەرانمان پێکــەوە مێخۆش بوو: ترش وشــیرن تێکەڵاو بوو، یادی ڕۆژانی ڕابردوومان دەکــردەوە و دواڕۆژمان بەراورد دەکرد... ئەوەندەمان خۆشــی و ناخۆشی بەسەر دڵ و مێشکدا تێ دەپەڕی کە وەک دەروێشەکانی چیرۆکی کۆن دەگریاین و پێ دەکەنین، گریانمان بەپێکەنین سواغ دەدا. یاخود بڵێین زۆر زۆر پێ دەکەنین و قاقا دەگریاین. شــەوگار شەق دەبوو، لە بێداری بێزار دەبووم باوێشک دەمیــان گەزێک پێدا دەچەقانــدم بەوەنەوز و وردەوێژینگانــەوە دەبیرەخەو ڕادەچووم و دەلێفە شــڕەکەم دەخزام و دەمەویست سەرخەوێک بشکێنم و شەکەتی و کفتیم نەمێنێ. ئەو تازە وەخۆ دەکەوت: چوار مێردەکی لەسەر تەختە بێبەختەکەی بەپانەوە دادەنیشت، کاغەز و قەڵەمی لەســەر کۆشــی دادەنا، کەوڵە تیسکنەکەی بەخۆی دادەدا. ملی خوار و ســەری زل و شان و کەوڵی کە سێبەریان دەخستە ســەر دیوار، ئەو شەولەبان و غوولی بیابانەی وەبیر دێنامەوە کە دایکم بەساوایی لێی ترساندبووم.

دیــارە من لێم نەدەپرســی چ دەکــەی؟ ئەویش نەیدەگوت چ دەکــەم بەڵام دەمدی: شەرەفنامەی فارسی و عەرەبی لەدەوری خۆی دادەنان و لەبەر یەکی ڕادەنان و بەتێڕامان چاوەکانــی بن چاویلکەی بازبازێنیان بەســەردا دەکردن. هەر لەبن لێوانیشــەوە پرتە و بۆڵــەی دەهــات و ورتە ورتی بوو. جار لەدوای جاریش جیــڕەی قەڵەمە بۆری دەهات... بەوەدا دەمزانی خەریکی وەرگێڕانی شــەرەفنامەیە... کە وەختی خۆی بەفارســی لەسەر مێژووی کورد نووسراوە و بەچەند زمانێکیش تەرجومە کراوە. بەڵام وا دیارە هیچ کوردێک بەپێویستی نەزانیوە - یان دەخۆی ڕانەدیوە- بیکاتە کوردی...؟ چونکە:

شــەڕەفنامەی فارســی یان بڵێن فارســیی شەرەفنامە زۆر ســەخت و گرانە و ئەمڕۆ

لەناو فارســـی زمانانیشـــدا هەموو خوێندەوارێک تێی ناگا... بۆ ئەوەی ئەم ڕاستییە ڕوون کەینەوە دەبێ تۆزێک بەرەو پاش وەگەڕێین و ســـووکە ئاوڕێک لە ئێرانی زەمانی سەفەوی بدەینەوە.

ســـەفەوییەکان زۆڵە کـــوردی تازە ترکی لەڕێ دەرچـــووی دووڕەگ بوون و بەملهوڕی و گەلۆری دەژیان، لەژێر پەردەی ئایین و بەناوی وســـێن و هەباســـەوە شەڕیان بەخەڵک دەفرۆشت و لە کوشتار و تاڵان و بڕۆ بەولاوە نەیاندەزانی دنیا چ باسە... گوللە تۆپێکیان بەســـەد کتێبی باش نەدەگۆڕیەوە، هونەری جوان و شـــێعری پڕ مانا و ڕەوان لەلای ئەوان شـــیر و مەتاڵ و تیروکەوان بوو، ئەگەر کاریان بکەوتبا نووســـینیش، نووســـەرێکی وایان دەویســـت کە بەپاروە بەرماوێک و چنگە دراوێک کلکەســـووتەیان لەبەر بکا و کێچیان بۆ بکاتـــە گا و بەکەر بڵێ شـــێر و کوێر بەچاوتیژ دانـــێ و دز و بێ ویژدانان بەخدری زیندە قەڵەمداد بکا...

نووســـەری هونەرمەند و کارامە و بڕوا بەخۆ شـــەرمیان لەخۆیان دەکرد و پێیان زۆر شـــوورەیی بوو ئاوڕوویان بەئاوەڕۆ داکەن و ویژدان بەگیرفان بفرۆشن... بەناچاری خزینە گۆشـــە و کەنارانەوە و هەڵوەدای شـــاران بوون و هێندێک لە هیند ســـەری هەڵدایەوە و گەلێکیش بێ ناوونیشان توایەوە...

خوێڕی و تۆڕیش کە ببوونە گۆشتی سەر چەپەر، بەبلوێری خاوەن زێڕ و زۆران کەوتنە ســـەما و سەر و گوێلاکی ئەدەبی فارســـییان لەبەر پێدا پڵیشاوە و خمی لێ شێواو لەبەر یەک هەڵوەشا و ڕەتێنرا و نسکۆی برد و ئەگەر سەفەوی گۆڕیان گوم نەبووبا... لە مردن نەدەگەڕایەوە. لەپاش ئەوانیش هەتا درەنگ هەر خۆی بەسەر پێوە نەگرتەوە...

شـــەرەفخان لەو ڕۆژگارە ئەنگوســـت لەچاوەدا چاوی کردۆتەوە و لەناو تەپ و تۆز و گێژەڵووکەی ســـەفەویدا بەخۆدا هاتووە، لە ماڵی شـــادا ئەو فارســـییە دزێو و بن شڕەی پـــێ خوێندراوە! بەڵام ئەو کابرا بلیمەت و هەڵکەوتووە زۆر بەدەخۆ ڕادیوی باســـکی لێ هەڵماڵیوە و لەو گێژاوە خۆی پەڕاندۆتەوە و هێناویە ئەدەبیاتە بێ لەزەتەکەی ئەو ڕۆژەی بەبا کردووە و لە کەوی داوە و بەردبژێری کردووە و بەدانستە سپی کردووە و توێکڵی فڕێ داوە و کاکڵێکی پاک و خاوێن و تێرگۆشتی لێ هەڵبژاردووە و لەسەر پەڕی شەرەفنامەی داناوە و بەنموونەی ڕەوانی و جوانی پێشکەش بە فارسی دۆستانی ئەو زەمانەی کردووە.

بەڵام لە ڕاستیدا ئەو کاکڵە جوان و بەرچاوەش چونکە بەری داری ئەو دێمەکارەیە، هێندە ڕەق و چیرە ددان دەشـــکێنێ... جا من هەرچەندە دەمزانی هەژار فارســـی دەزانێ و زۆر

باشیشــــی دەزانێ... بەڵام لە دڵی خۆمدا پێم وا نەبوو دەتوانێ ئەو گابەردە لەســـەر شان دانێ و لەو کەل و بەندەنە رژد و کوڕە سەرکەوێ!!

وەرگێڕانی ئەو کتێبە ڕەق و زلە پشووی درێژ و جیکڵدانەی گوشاد و لە کارنەوەستان و ڕەنجی فەرهادی دەوێ... پیاوی دەوێ بەدرێژایی ســـاڵ و مانگ ســـێ ســـەرەی لەسەر هەڵنەگـــرێ و هەتا ئەو کەلاوە هەراوە لە هەموو لاوە ســـەر نەگـــرێ کاری بەکاری کەس نەدابێ... هەژاری وا شـــل و شەوێق و پەرژوبڵاو، لە لایەکەوە بەبنکە ڕابگا و لە لایەکەوە دەستە چیلەی گڕی شۆڕش بۆ ئێزگە کۆ بکاتەوە و لە لایەکی تریشەوە کارستەی ڕۆژنامە و شـــەونامە ئامادە بکا... ســـەرەڕای هەمووانیش وەرگێڕانی شەرەفنامەی شەرەفخانیش ســـەربار بێ و ئەویش ڕاپەڕێنێ؟ هەیهوو!! چی بەسەر چییەوە؟ بڕوام وا بوو هەوایەکە لە کەللەی داوە و کرمێکە لەســـەریدا دەجوولێتەوە هەر ســـەرێکە و لێی وەڕەز دەبێ و وازی لێ دێنێ.

بەهار پیر بوو، باران وەســـتانەوە، هەور ڕەوین، تاو خۆی نواند، تەم و مژ بوونە هاڵاو و دەگەڵ بەفری پار چوونەوە، گزوگومبەت گەرما شـــاڵاوی هێنا و جرِوجانەوەر، ژیانەوە و دوژمنانی کوردســـتانیش دەگەڵ تینی گەرما بووژانەوە، وەک زەنگەسوورە هارووژان و دە ســـەرچاوی نیشتمانپەروەرانی کورد هاڵان... ڕۆژانە لەبەر گرەگڕی فڕۆکە و گرمە و زرمەی بۆمبا و تەق و تۆق و شەوانە لەبەر هاشەهاشی ماران کە بەدرزی دیوار و کون و کەلێنی باندا بۆ ڕاوی مشک و نانی وشک سەریان بەژوورەکەماندا دەکرد... ئۆقرەمان لێ هەڵگیرا و سانەوەمان لێ تۆرا و لە هێلانەکەی تەرە بوو...

بەر لەوەی بزانم شەرەفنامەی کوردی سەری بەکوێ گەیشت، چاری ناچار لێک هەڵبڕاین و هەریەکە بۆ لایەک بازرەبووین و وێڕای کەودەری دەگەڵ بەفران هەڵدەکشاین...

ساڵ پایزێکی درەنگ بوو، سیخوار لەبەر پەساران هەڵی نابوو. ئاور خۆشەویست ببوو، لە دەوری ئاورگی پڕ لە پۆلووی داربەڕوو دیسان ژیانی دووبراله دەقی جارانی گرتەوە...

ئێمەی وا ســـوێر قسە هێشـــتا لە چەنەچەنی چاک و خۆشی نەوەستابووین و هەژدەر هەژدەر قسەمان لە دەم دەردەپەڕی... هەستا و لەسەر دەلاقەوە لە کۆنە تەوراتێک نەوی و خســـتیە ئامێزمەوە و گوتی: دەها بیخوێنەوە... بەڵام گەردنت ئازا نەبێ ئەگەر بەچاوی دوژمن سەیری نەکەی و ئۆباڵم بەملت ئەگەر هەر ڕەخنەیەک بەبیر دادێ، چاوی لێ بپۆشی و پێم نەڵێی... ئەگەر دۆســـتی بمگریەنە و نامـــەوێ قانەقدیلەم دەی... ئەگەر چرووک و پووکـــت وەبەر چاو بێ و دەنگ نەکەی تووک لە منداڵت نەیە. منیش بەبێ فوو لەدۆکردن




لێفەکۆنم لێ ڕاخست و شانم لێ داخست و شەرەفنامەی فارسیشم لەلای خۆم دانا و هەژارنامەی کوردیم زۆر بەوردی خوێندەوە و دەگەڵ ماکەکەیدا لەبەریەکم ڕانان و چۆنم هاتە بەرچاو، ئاوای دەگێڕمەوە:

پیاو هەق بڵێ دەربارەی مێژووی کورد هەرچی شەرەفخان بەدڵ نیازی لێ گرتووە و دەستی بۆ بردووە خستوویەتە سەر کاغەز. نوک و بەدی هەر لە سیر هەتا پیوازی زۆر بەدەسپاکی ڕاگوێزراوە و بەرگە عەجەمییەکەی لێ داڕناوە و جوان و قازاخ شۆراوە و جلوبەرگی زۆر نایابی کوردی دەبەرکراوە و بەخشڵ و زێڕ و سسڵەوپپڵە و خرینگە و تۆیەی کوردانە ڕازاوەتەوە و ئەگەر دەبینی هەزار قوڕعان دەخۆی: کە ئەو کتێبە هەرگیز بەبۆرە خزمایەتیش نەچۆتەوە سەر فارسی و هەر زکماک کوردییە و بەکوردی ڕسکاوە.

هەر کەس بزانێ تەرجەمەکردن دەبێ چۆن بێ؟ تێدەگا کە هەژار لەو هونەرەدا دوانەکەوتووە و بگرە زۆریش لەسەرە...

ئەوانەی ئەم کتێبە دەخوێننەوە و لەوانەیە پێیان سەیربێ کە هەژار ئەو کوردییە چۆن فێر بووە؟ بەڵام بۆمن کە لەگەپ و گەمەی سەر سەرانگوێلکانەوە دەگەڵی گەڕاوم و دەزانم چۆن ژیاوە لە کوێ ژیاوە و لە چەند سەرچاوەی هەڵێنجاوە... هیچ شتێکی سەمەرە نییە و بەلای منەوە باری خۆیەتی:

بەبڕوای هەموو کوردی زانێکی لە ڕاستی نزیک و لە شەڕە گەڕەک بەدوور تەنانەت بەبڕوای زۆربەی ڕۆژهەڵات ناسانی ڕۆژئاواییش لەناو زاراوەی سۆرانیدا شێوەی موکریان لە هەمووان پاک و ڕەوانتر ماوە و وشە و ڕاوێژی دەمی بێگانەی زۆر کەمتر تێ خزاوە. لەناو موکریانیشدا ناوچەی بۆکان لەو بارەوە سەرتۆپە... هەژار، موکریانییە و سەر بەناوچەی بۆکانە و منداڵی ئەو ناوە هێشتا سەریان لە هێلکە نەجووڵاوەتەوە لە کوردیدا بلبلن و زمانیان هەتا بڵێی ڕەوانە...

بابی هەژار زانا و کوردپەرەست بوو، هەموو کوردستان گەڕابوو، کرمانجی و سۆرانی زۆر باش دەزانی و لە ئەدەبی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکیدا دەستێکی باڵای هەبووە... هەژار لەسەر کۆشی ئەو بابە زمانی گرتووە و قسەی خۆش فێر بووە و دڵ و مێشکی بەشێعر و چیرۆکی کوردی ڕاهاتووە...

لە دێ گەورە بووە، دەگەڵ منداڵان بەو کوردییە بێ گەرد و ساکارە دواوە، دەگەڵ کیژۆڵاندا لەوبەر لەوبەری چیاوە باللۆرەیان بۆ یەکتر هەڵداوە... شەڕەجنێو و فڕ پێکدادان و تەوس و پلار و توانجی پیرێژنانی بیستووە... شەوانە بەلایەلایەی دایکە کوردی

موکریانــی دەخەو ڕاچووە، بەیانی بەورینگە ورینگی دڵتەزێنی کیژە کوردی مەشــکەژێن وەئاگا هاتووە... لە مزگەوتی لادێ، بەیت و لاوک و حەیران و گەلۆ، شــەو و نیوەشــەو و درکانە و ئازیزە و پایزە و سوارۆ، گوێچکەیان ئاو داوە...

بەمێرمنداڵی لە خانەقای شێخی بورهانی خوێندووە کە دەتگوت کەشتی نوحە و هەموو توخم و تۆوێکی لێ کۆببۆوە. هەر شــێوە و زاراوەیەکت بویستایە دەبەردەست دابوو... لە پەرێز و خێرۆکی پیران و زانایانی وەک: ســەید ڕەشــید و سەیفی قازی و شێخ محەمەد و مامۆســتای فەوزی دەســکەنەی کردووە و گوڵی هەڵگرتوونەوە... کە پێش گەیشتووە دۆست و هاونشینی شاعیران و نووسەران و کوردی زانانی وەک: مەلا مارف و خاڵەمین و قزڵجی و حەقیقی و جەوهەری و کاکە ڕەحمانی موهتەدی بووە کە لەو باوخۆشــتر بوون و هەریەکەیان لە ئەدەبی کوردەواریدا دەریایەک بوون... لەبەر دەســت و لەژێر چاوەدێری پێشــەوا، «قازی محەمەد»ی ئەدەبدۆســت و ئەدیب پەروەردا فێری ڕۆژنامەنووسی بووە و شــێعری بەکۆماری کوردســتان و شۆڕشــەکەی هەڵگرتووە نازناوی شاعیری میللی پێ دراوە...

لــە ژیانی ئاوارەییشــدا بەدەردی خۆی گوتەنی: بەشــەقی زەمانە فێری شــێوە لێک جیاوازەکانی کرمانجی کراوە. لە ژیانی پێشــمەرگەییدا شــارەزای شارەزوور و شارباژێڕ و گەرمیان و بیتوێن و هەولێر و کۆ و خۆشناو و سورچی و باڵەکایەتی و ناودەشت و گەلێک شــوێنی تریش بووە و هەر پیرێکی کوردی زان و زیندووی دەســت کەوتووە زۆر بەوردی دۆزیویە و هەرچی لە دەمیانەوە دەرچووە قۆزیویەتەوە ئەو هەمووی کۆکردۆتەوە بەکاوەخۆ لە بێژینگی داون و بنژیلی جودا کردۆتەوە و ساغ و پتەوی هەڵبژاردووە و بەمێشک و دڵی خۆی سپاردووە... ئیدی بۆ سەیرە کە هەژار کوردی زانێکی هەڵبژاردە بێ؟

هەژار بۆ تەونی ئەو کرە لەبار و ســفتەی خۆی، شــێوەی موکریانی کردۆتە تەخت و بۆ نەخش و وێنەکانی وشــەی ڕەنگین و خۆڕەنگ و جوانی هەموو زاراوەکانی تێوەداوە و تا بۆی کراوە خۆی لە ڕایەڵ و پۆی وشــەی نامۆ و بێگانە و کوردی داتاشــراوی تاقۆڵا و ناڕەسەنی تازە پێداکەوتوو پاراستووە.

سەیر لەوەدایە دەڵێی شەرەفخان و هەژار لێکیان گێڕاوەتەوە. لە ڕۆژگارێکدا کە هەژار شەرەفنامەی کردووە بەکوردی، زمان و ئەدەبی کوردی لەبەر بێ سەروبەرەیی و بەرەڵڵایی خەریکە بەمەرەدی زمان و ئەدەبی فارســی، زمانی ســەفەوی بچێ... لە سایەی نەزانانی خۆپەســندەوە ئاڵۆزی و شێواوییەکی زۆری تێ کەوتووە و مەترسییەکی گەورە هەڕەشەی لێ دەکا!




بێگومان هەژاریش هەستی بەو مەترسییە کردووە و لام وایە مەبەستی هەرە گەورەی لە وەرگێڕانی شەرەفنامە بووژاندنەوەی زمانی کوردی بووە و دەیەوێ لە مردنی بپارێزێ... جا چونکە مەیدانێکی فرت و فرەوان و پان و بەرینیشی بۆ هەڵکەوتووە و توانیویە و بەکەیفی خۆی قەڵەمی تێدا باژوێ و خزمەتێکی هێژا بەزمان و ئەدەبی کوردی بکا... هیچ بەدووریشی نازانم کە هێندێک لەو کەسانەی چەند ساڵە دەگەڵ ئەو خم لێ شێوانەی زمانەکەدا ڕاهاتوون نووسینی هەژاریان بەدڵ نەبێ... ئەوانەی لە دەباغخانەدا کار دەکەن بەبۆنی گوڵاو دەپشمن و سەرگێژە دەگرن و تا فێر دەبن ماوەیەکی دەوێ.

من لەو بڕوایەدام کە شەرەفنامەی هەژار دەبێ بکرێتە بەردی بناغە بۆ کوردی ئەدەبی و زمانی یەکگرتوومان. هیوادارم هەموو کوردێکی، کوردیخواز و دڵسۆز کەڵکی لێ وەرگرێ و هەژاریش هەر بەوەندەوە نەوەستێ و درێژە بەخزمەتکردنی زمانەکەمان بدا و درێخی نەکا...

١٩٧١



## پێشەکییەک بۆ دیوانی نالی

هەموو کوردێکی پاک، چاک، دیندار، دڵسۆز و ئەدەبدۆست، ئەگەر بەدڵ و گیان خۆی بەمنەتبار و قەرزداری مامۆستای هێژا و زانای کورد مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس نەزانێ ناهەقی دەکا. چونکە مامۆستا و کوڕە کارامە و لێزانەکانی بەهەموو هێز و توانای خۆیانەوە بەهیچ بارێک لە خزمەتی کوردی چارەڕەشی، دوورە بەشی هەژار درێخیان نەکردووە.

بەڕاستی ئەم خزمەتـە بەنرخانەی ئەم بنەماڵە چاکە، بەدیـن بەفەرهەنگ، بەزمان، بەئەدەب و ئاکاری کووردییان کردووە شـایانی ئەوپەڕی ڕێز و سوپاسـە. یاخوا لەم لایە لـە بەڵای لابەلا دووربن. بەردی سـارد و گەرمیان وەبەر پـێ نەیە و لەولاش وەبەر ئاڵای پێغەمبەر کەون و حەشـریان دەگەڵ حەشـری پیاوچاکان بێ. پێموایە خزمەت بەکوردی زۆرلێکراو چاکەیەکە کە لەپێش چاوی بینائی چاوان بزر نابێ و پاداشـی دنیا و قیامەتی دەبێ.

گەڕیدەیی و دەربەدەری ئەو سوودەی بۆ من هەبوو کە لە نێزیکەوە بەخزمەت مامۆستا بگەم و دەستی موبارەکی ماچ بکەم و بزانم کۆگای نور و دەریای بێ سنوورە.

جارێـک دەگەڵ چەند مامۆسـتای گەورە و ماقووڵ لە بـارەگای حەزرەتی غەوس لە حوجرە تەنگ و چکۆڵەکەیدا لە خزمەتی مامۆسـتا دانیشتبووین، من ئەو بیرەم بەمێشکدا دەهات ئەگەر هەموو نوسـینە بەنرخەکانی ئەم مامۆسـتا کورتەباڵا، ڕەزاسـووکە، خوێن شیرین و قسەخۆشە بێنی و لەتایەکی تەرازووی باوێ و جەستەی لاوازی خۆشی لە تایەکی

دیکە بخەی ئایا سەری وەمیچی حوجرەکەی ناکەوێ؟

دیــاره ئەوینێکی پڕ ســۆز، ئیمانێکــی پیرۆز و ئیرادەیەکی قــەوی و پتەو ئەم پیره خاوێنه و ئەم زانا کەم وێنەی هان داوه که لەو تەمەنەدا له خزمەت بەزانســت، بەئەدەب، بەئیسلامییەت و ئینسانییەت خافڵ و بێ ئاگا و شەکەت و ماندوو نەبێ.

باســی یەک یەکی نووسراوەکانی مامۆستا وەک تەفسیری قورئانی پیرۆز و شەریعەتی ئیسلام و... نه بەمنی بێ دەسەڵات دەکرێ و نه لەو کورته باسەدا دەگونجێ، ئەم ئەرکه له ئەســتۆی مامۆستایانی ئایینی و شــارەزایانی ئەدەب و پسپۆڕانی زانسته که هیوادارم کەمتەرخەمی نەکەن و شــوێنەواره بەکەڵک و باشەکانی مامۆستا پتر بەخەڵک بناسێنن. لەبارەی شــەریعەتی ئیسلامدا ڕای مامۆستایەکی شارەزام پرسی، فەرمووی هەر کەسه بۆ خۆی بۆچوونێکی هەیه، من بەڕاشــکاوی دەڵێم تا ئێســتا کتێبی وا تەواو لەبارەی فیقهی شافیعیدا نەنووسراوه.

من لێرەدا دەمەوێ بەکورتی لەبارەی ئەم دیوانه شــتێک بنووسم. بەبڕوای شارەزایانی شــێعر و ئەدەب نالی یەکێکه له گەشــترین و پرشنگدارترین ئەستێره بەرزەکانی ئاسمانی ئەدەبــی کــوردی. تەنیا ڕەخنه یا بەئەدەبتر بڵێم دەردی دڵێکی له شــێعری نالییان بوو ئەوەبوو که تێگەیشــتنی شــێعره ناســک و ورده جوان و ڕەوانەکانی زۆر هاسان نەبوو، پێویســتی بەشــیکردنەوه، لێتوێژینەوه و وردبوونەوەی تەواو بوو. کەســێک سێ زمانی عەرەبی، فارســی و کوردی نەزانیبایه چاک له شێعری نالی نەدەگەیشت. مامۆستای مەزن هەســتی بەو کەم و کوڕییه کردووه بۆیه بەخۆی و بەکوڕانییەوه، هەســتاون، تێکۆشاون ڕەنجیان کێشاوه و بەهەزاران زەحمەت نوسخەی دەستنووسیان پەیداکردوون لەبەر یەکیان ڕاناون و ئەو دیوانه بەنرخەیان شــەرح کردووه. له هەوەڵەوه پێشەکییەکی زانایانەیان بۆ نووســیوه که خۆی کتێبێکی سەربەخۆیه و خوێندنەوەی بۆ هەموو ئەم کەسانەی سەریان له شــێعر و ئەدەب دەخورێ پێویسته. لەدوایه شێعرەکانیان ڕاست کردۆتەوه. ماناکانیان لێداوەتەوه، هەڵسەنگاندووه و لەپێش خوێنەریان داناوه.

تا ئێســتا کاری وا له نێو کورداندا نەکراوه. زۆر کەس لەسەر نالییان نووسیوه، بەڵام کــەس ئەوەندەی خۆ پێوه مانــدوو نەکردووه. ئەوانی باش بــوون، ناتەواوبوون ئەوانەی نەزانانه نووســرابوون هەر نەبان باشــتر بوو. هیچ کارێک ئەویش کاری وا ئەستەم و گران بــێ کەموکوڕی نابێ، ڕەنگه ئەو کاره گەورەش نەختە نەقســێکی هەبێ، بەڵام بێگومان هاوتا و وێنەی نییه.

من بۆ خۆم پتر لە نێو چەرخە سەر و کارم دەگەڵ شێعری نالیدا هەیە ئەو سەردەمە کە وەک سوختەیەکی نەزان لە خانەقای شێخی بورهان بووم دەمدی مەلا زاناکان و موستەعیدە باشەکان لەسەر شێعری نالی دەڕۆن، ئەگەر نیوە خوێندەواری وەک منیان بۆ حاڵی نەبوویان، هیچ نەبێ سەرنجیان بۆ لای مەلە، لەو دەریا مەند و بێ بەستێنە ڕادەکێشان، چاپ بوونی نالی لەلایەن کوردی و مەریوانی وە دەروێکی بۆکردمەوە ئەگەرچی ئەم دیوانە نازدارە، بێ ئازارە دێو و دوژمنی پۆلیسی دەورانی ڕەشی پاشایەتی ڕەزاخان بوو بەدەس هەر کەسەوە گیرابایە هاواری سەر و ماڵی بوو، بەڵام من پەیدام کردبوو بەدزییەوە دەمخوێندەوە. موقبیل بەچاپکردنەوەی دیوانی نالی سەرەڕای ئەم کەموکوڕیانەی لە کاریدا هەبوو پتری بەرەو تێگەیشتنی شێعری نالی بردم. نێو و نرکە و هێرشی گیو لە نالیی نەتۆراندم تەنانەت چاپەکەی مووەفەقیشم نەک جارێک دەیان جار خوێندەوە. خوالێخۆشبوو حاجی مەحموودی وەتەمیشیم کە بازرگان و مڵکدارێکی پیر و خۆشزەوق بوو، باش دەناسی و بەو حاڵەوە دیتنی بۆ من هاسان نەبوو چونکە ئەو هاوین و بەهار لە دێ بوو، منیش هەر لادێیی بووم و کەمتر دەچوومە شار کە زستانان بەخزمەتی بگەم زۆرم کەڵک لە شێعر ناسیی ئەو پیاوە وەرگرت کە ڕەنگبێ کەم کەس مابن لە بیریان بێ ئەدیبێکی چەند بەئینساف و پیرە پیاوێکی چەند قسەخۆش بوو. ئێستاش بۆم ڕوون نەبۆتەوە ئەو بازرگانە زرینگە کە سەروکاری دەگەڵ گەز و جاو و کەتیرە و مازوو و خوری و مافوورە بوو چۆن ئەو هەموو شێعرە کوردییە جوانانەی لەبەربوون. ئایا بەیاز و دەستنووسی باشی بوون و دەری نەدەخست یا حافیزەی وا بەهێز و قەوی بوو کە چی لەبیر نەدەچۆوە. بەڕەحمەتی خودای شادبێ. ئاخ و داخ چەن گەورە پیاومان بوون و حاجی قادر گوتەنی: «لەبەر بێ دەفتەری گووم بوون و فانی».

شەقی ڕۆژگار هەڵی داشتمە کوردستانی عێراق لەوێ زۆر نالی ناسم دیتن و باشترم نالی ناسی تا سەرم لە بەغدا هێنا دەر و بەخزمەت مامۆستا مەسعود محەمەد گەیشتم. تا ئێستا کەسم نەدیوە وا لە شێعری نالی بگا. گفتولفتێکی خۆشی بوو کە بەبەیانی سیحراوی خۆیەوە دەهاتە شیکردنەوەی شێعری نالی خۆی مەست و سەرخۆش دەبوو و گوێگری وەجۆش دەهێنا. داخم ناچێ ئەم مامۆستایە ئەوەندەی لەسەر شێعری نالی دەدوا ئەوەندەی نەدەنووسی تا کۆمەڵ پتری کەڵک لێ وەرگرێ. لە بیرمە لە دانیشتنێکدا کە مامۆستا بەعادەتی خۆی شێعری نالی شی کردەوە، یەکێک لە دانیشتوان لە منی پرسی بەبڕوای تۆ مامۆستا لەبارەی نالیدا زۆر زێدەڕەوی ناکا؟ گوتم: من لە تەنیشت مەهابادەوە لەلایەکەوە تا سەرچاوەی (زەڵم) و لەلای دیکە تا هاوینەهەواری سەرسەنگ گەڕاوم و

دەگەڵ زۆر مامۆستای گەورە دانیشتووم کەسم نەدیوە ئەوەندە شارەزای شێعری نالی بێ. کەچی دەوێرم بڵێم ئەو گەورە پیاوەش بەتەواوی لە شـێعری نالی نەگەییوە. مامۆسـتا مەسـعود فەرمووی بەخوا ڕاسـت دەکەی. من ئەو مەلەوانە نیم بینم ئەوەندە درێژبێ کە بتوانـم لـە دەریای بێ بنی شـێعری نالی ئەو هەموو دوڕ و مرواریيانـە بێنمە دەر هەروا پەلەقاژەیەکی ناشیانەیە دەیکەم. بەڵکو شتێکم وەبەر دەسکەوێ. زۆری پێ نەچوو ڕۆژێک لە خزمەت مامۆستا مەسعود لە کۆڕی زانیاری کورددا خەریکی کاربووم. کاکە حەمەی مەلا کەریم هاتە ژوور و گوتی: «ئێمە مانای وشەی (نەی سوار)مان لەو شێعرەدا نەزانیوە ئێوە چۆنی بۆ دەچن» زۆرمان بیر لێکردەوە و نەمانزانی. بێ ئەدەبیم کرد و گوتم: «مامۆستا ئەو کاتە من گوتم جەنابیشـت دیوانی نالیت بەتەواوی بۆ سـاغ نەبووەتەوە و تۆ گوتت ڕاست دەکەی من پێم وابوو تەوازوع دەفەرمووی بەڵام قسەکەم وەڕاست گەڕا...» گوتی: «ماڵە نالیت نەشـێوێ کێ سـەرەدەر لەو هەموو وردە داوانە دەردەکا کە ئەو ناویەتەوە؟ من چووزانم نەی سوار چییە؟» ئیجازەم لێ وەرگرت و چوومە ژووری کاکە حەمە، هەرچی فەرهەنگی فارسی و کوردی لە کۆڕدا هەبوون سەنگ و سووژنمان دان و سەرەوبنمان دان و سەراوبنمان کردن و ئەو وشەمان نەدۆزیەوە. دیارە پاش ناهومێدبوون لە پەراوێزی لاپەڕە ٣٣٤ دا گوتوویانە دوور نییە نیزەدار بێ کە لە شـێعرەکەدا بێ مانا نییە. ئەو ڕۆژەی من گوتم کاکە حەمە حەیف فەرهەنگی دەوڵەمەندی دوکتۆر(موعین)مان بەتەواوی لەدەسـدا نییە. وێدەچێ ئەو ئەم وشـەی گرتبێ. ئێسـتاکە ئەم دێرانە دەنووسم فەرهەنگی دوکتۆر موعینم لەبەر دەسـدایە. ئەو فەرهەنگە گەورەش ئەم وشـەی نەگرتووە. بەڵام وشەیەکی تێدایە کە پیاو دەخاتە گومانەوە کە مەبەستی نالی ڕەنگبێ ئەم وشە بێ و ئەوانەی دیوانی نالییان نوسیوەتەوە بەهەڵەیان تۆمارکردبێ. فەرهەنگی موعین وشەی «نیساری» گرتووە بەمانا سوپاهی و لەشکری و دەڵێ. فیردەوسی لەبارەی تەبەقەی دووەم لە چوار تەبەقەی جەمشیددا دەڵێ:

صفـــی بر دگـــردسـت بنشـاندند
همی نـــام نیســـاریان خـــواندند

و هەروەها زیادی دەکا و دەڵێ وشەی (نیساریان) لە زمانەکانی ئێرانیدا سابیقەی نییە و بێ شـک موحەرەفی (artistar)ی پەهلەوی (ئوستایی raeslara) بەمانای (شەڕکەر

و سوپاهی) هاتووە و ئەم وشەیە لە فارسیدا بووەتە (ارتیشدار).

دۆزینەوەی ئەم وشـــە منی خستە سەر ئەم باوەڕە کە (نەی سوار) (نەی سیار) بێ، بەغەڵەت نووسرابێتەوە چونکە زۆر ڕوونە و بەهاسانی لە شێعرەکانی دەردەکەوێ کە نالی زۆر ئەهلـــی خوێندنەوە و موتاڵا بووە. دەســـەڵاتێکی زۆری بەســـەر ئەدەبیاتی عەرەبی و فارسیدا هەبووە. وەک بەئیشتیا لەسەریان نووسیوە گەڕیدە بووە و بەکوردستاندا گەڕاوە. ئەگەر واش نەبێ ئاشنایەتی ئەو دەگەڵ بابانەکاندا حاشای لێ ناکرێ. ئەوانیش کتێبخانەی ئەمیرانەیان بووە کە نالی کەڵکی لێ وەرگرتووە. تەماشـــای ئەو چەند شێعرە بکەن بزانن من بێ بەڵگە وا نالێم:

نالیـــا ئـــەم غـــەزەلـــە تـــازە کـــە تـــازەت گـــووتـــوە
بـــە دووســـەد مـــەســـنەوی لـــویـــی لـــوبابـــی نـــادەم

***

نییـــە دەخڵـــم لـــە شـــانامە و مـــەســـافی غەیـــری ئـــەم نوکتـــە
کـــە کوشـــتەی بـــەنـــدی تـــۆیـــە هـــەر کەســـی ئـــازاد و ئازابێ

***

کـــە دیتـــم ڕەنگـــی ســـەد ڕەنگـــی، گـــوتـــم بابایـــی عەییـــارە
کـــە بیســـتم لەفظـــی بێدەنگـــی گـــوتـــم شـــیپوری شـــاپوورە

بەڵـــێ بەم شـــێعرانەڕا کە ئەگەر ڕیزم کردبان زۆر پتریـــان جێ دەگرت دیارە کە نالی هەمـــوو جۆرە کتێبێک کە دەخڵـــی بەمەلایەتییەوەش نەبووبێ خوێندوەتەوە. کەســـێکی ئەسکەندەرنامەی ئەفســـانەیی خوێنبێتەوە و نەسیمی عەییار و شاپووری عەییار بناسێ، ئاشـــکرایە کە شـــانامەی فیردەوسی زۆر جار ســـەرەوبن کردووە و ئەم وشەی لە شانامە وەرگرتـــووە و ئەگەر ئەوەی زانیبێ کە نەی ســـیاری بەتەبەقەی دووەم لە چوار تەبەقەی زەمانی جەمشید گوتراوە ئەوە دەبێ شێعرەکە لە ئەسڵدا ئاوابووبێ:

دیـــدە نیگەهبانـــی یـــار، ناڵـــەی دڵ نـــەی سـیار
تیپـــی سریشـــکم هـــەزار ئاهـــە عەلەمـــداری مـــن

یانی چوار تەبەقەی زەمانی جەمشـــیدی ڕیزکردبن و لەباتی تەبەقاتی لەشکری تورکان کـــە لـــە مەغوولییەوە وەرگیراون، (ئـــون) (یوز) (تومان) بەکاری بـــردن چونکە گومان لەوەدا نییە کە هەزار پڕ بەپێســـتی (تومان)ی مەغوولییە. ئایا تاقمە مومتازەکەی ئەحمەد پاشـــای دۆستی وا تەبەقەبەندی نەکردووە و ئەو شێعرە پڕ ڕەمزەی پاش نەمانی تاقمەکە نەگوتووە؟ جوابی بەمن نادرێتەوە. بەڵام دەغدەغەی لە دڵمدا پەیدا کردووە.

ماوە شـــتێک لەبارەی نالیدا باس بکەم کە تا ئێستا کەس لەو بارەدا نەدواوە. ئەویش ئەوەیـــە، جگە لەوەی نالی خەریکی پێکهێنانی زمانی یەکگرتووی کوردی بووە، شۆڕشـــی ئەدەبیشـــی کردووە. ئەم ڕەسمە نالەبارەی لە دیوانی شـــاعیرەکانی پێشوودا هەبووە کە لـــە ئەلفـــەوە تا یا بکەنە قافیە لـــە دیوانی نالیدا نییە. کوا قافیـــەی (ڵ) (ظ)(ذ) (ع) (خ) (غ) لە دیوانەکەیدا؟ کە دیوانی شـــاعیرە هەرە باشەکانیشـــی درێوکردووە. لە باتی ئەوانە شـــێعری وا هەیە کە پیتە تایبەتییەکانی کـــوردی بۆ کردوونەوە قافیە وەک (ێ). «تەشـــریفی نەوبەهارە کە عالەم دەکا نوێ» نالی بەپێچەوانەی بۆچوونی هێندێک شـــێعر نەناس کە گوتوویانە هەر خەریکی دوو کار، شـــێعر و وشـــە ئارایی بووە و گوێی نەداوەتە نێوەڕۆک، شـــاعیری بەتەواوی مەعنای کەلیمە بووە. شێعری تەنیا بۆ دەربڕینی ئیحساسی ناســـکی ئینســـانی گوتووە جگە لە چەند پارچەی وەک وەسفی حوجرە و گوێدەرێژەکەی و وەســـفی تەبیعەت کە ئەوانیش لە ئیحساســـی شاعیرانە بێ بەش نین. شێعرەکانی دیکە پڕن لە ســـۆزی ئاشـــقانە و کوڵوکۆی دەروونی خۆی. بۆیە گوێـــی نەداوەتە ئەو قاعیدە و ئوســـووڵەی کە زانســـتی عەرووز شـــاعیری ناچار کردووە ڕەچاوی بکا. یانی غەزەڵ لە حەوت شـــێعر کەمتر نەبێ و حەتمەن دەبێ تاق بێ. باشترین غەزەلی نالی ئەو غەزەلانەن کـــە لە حەوت شـــێعر کەمترن یا جووتن. یانی نالی لەهـــەر جێگایەک کوڵوکۆی دامرکاوە قەڵەمی ڕۆناوە و تا ئیحساساتی دانەمرکاوە قەڵەمی تاوداوە. ئەگەر لە پارچە شێعرەکەی مەســـتوورە وردببنەوە، تێ دەگەن ئەو نالییەی کە وەســـتای قافیە بووە، لێرەدا ڕیعایەتی قافیەشی لە چەند جێگا نەکردووە. دیارە دۆزینەوەی ئەو جێگایانە کاری ئەو کەسانەیە کە دەزانن ڕەدیف و قافیە چن؟ بەڕەحمەتی خودا شـــادبن ئەو مامۆستایانەی بێ وردبوونەوە

و بێ ئەوەی بزانن شـیعر چییە؟ فەرموویانە ئیحساسی شاعیرانە لە شێعری نالیدا نییە یا کەمە، توخودا خوێنەری خۆشەویستی شێعر ناس سەرنجێکی بدە ئەم دیوانە تا بزانی ئەو هەژارانە چەند لە شێعر ناسیدا کۆڵەوار بوون.

لە جێگایەکەی تریش باسم کردووە کە قوتابخانەی نالی بەهۆی مەلا ساڵحی حەریقەوە لە کوردستانی ئێران بەتایبەتی لە موکریاندا برەوی پەیدا کردووە.

لەم ساڵانەی دواییدا کتێبێک بەفارسی بەناوی (ایران امروز) بڵاوبۆتەوە کە لە نووسینی (ئۆژین ئوبین) سـەفیری وەختی فەرانسە کراوەتە فارسـی. ئەم دیپلۆماتە لە ساڵەکانی ١٩٠٦ ـ ١٩٠٧ بەسـابڵاخدا تێپەڕیوە و چەند لاپەڕەیەکی ناشـیانەی لەسەر ژیانی کوردی ئەم مەڵبەندە نووسیوە کە سەرنج ڕاکێش نین. تەنیا ئەوەندەی سەرنج ڕاکێشە کە لەبارەی نالیدا نووسیویەتی:

لە نێوەڕاسـتەکانی چەرخی ڕابردوودا شاعیرێک لەنێو کورداندا هەڵکەوت کە ناوبانگی لـە چوارچێـوەی هۆز و خێڵ و زێدی خـۆی زۆر وێوەتر ڕۆیی، نالـی مەلایەکی خەڵکی سلێمانییە کە ئەمڕۆ شێعرەکانی لە دوورترین خڕ و شیو و دۆڵەکاندا ویردی زمانی کوردانە ئەم شـێعرانەی، موفتی سابڵاخ، (کە لە جێگایەکی تر بەناوی مەلا محەمەدی موفتی ناوی بردووە) بۆ ئێمەی وەرگێڕان.

دیارە ناوبانگی نالی هەشتا پترە گەیوەتە سابڵاخ کە موفتی وای بەسەفیر ناساندووە. نازانین شـێعرەکانی بە چ زمانێک بۆ سەفیر وەرگێڕاون. بەڵام پاش ئەو هەموو بەردەشۆر و دەسـکارییە هێشـتا تام و خوێ و بۆن و بەرامەی شێعری نالییان پێوە دیارە. ئەوەش جوابێکە بۆ ئەو کەسـانەی دەڵێن نالی زیاتر بەشـکل و وشە ئارایییەوە خەریک بووە تا نێـوەڕۆک و مەزموون. جارێـک هەر لەو بارەدا لە کۆڕێکی ئەدەبیدا کە خوشـک و برای عەرەبیشـی لێ بوون گوتم توخوا ئەم شـێعرەی نالی بۆ ئەم برا و خوشـکە خورمانێژ و خورما خۆرانە کە فرچکیان بەخورما گرتووە بکەنە عەرەبی بزانین بۆ خۆیان یاری شیرینی خۆیان وا بەخورمای خۆماڵی شوبهاندووە کە کوردێکی شارەزووری کەڵاش لەپێی مێوژخۆر شوبهاندوویەتی.

دەخیلـت بـم نەخیلـی یـا ڕوتابـی
وەهـا شـیرین و سـینە نـەرم و دڵڕەق




هەموویان کە مەزموونی شـیعرەکەیان بیست گوتیان تا ئێستا شێعری وا لەتیفمان لە عەرەبیدا لەو بابەتەوە نەبیسـتووە. هەموو دەزانین شـێعر کە وەرگێڕدرا جوانی شێوە و شکل لەدەس دەدا.

لەپێشـدا گوتم ئەم کتێبەش بێ کەموکووڕی نییە. بەڵام تا ئێسـتاش بێ وێنەیە. لە چەند جێگا نەزەری خۆم لە پەراوێزدا نووسـین. بەڵام چونکە ئینتیشـاراتی سەلاحەدینی ئەیوبـی لە چاپکردنەوەی ئەم دیوانـەدا بۆ ئەوەی کوردەکانـی ئێرانیش دیوانێکی کەم غەفڵەت و شـەرح لێکراویان لەدەسـدابێ بەپەلە بوو هەقیشـی دەدەمێ منیش نەمتوانی چاکی پێ ڕابگەم.

دیسان لەلایەن هەموو کوردێکی ئەدەبدۆستەوە سوپاسی مامۆستا و کوڕەکانی دەکەم.

نازانم کێ بوو نووسیبووی هەرماڵێکی ئێرانی کە قورئانێکی پیرۆزی لەسەر تاقە دانابێ پێویستە دیوانێکی حافیزیشی لەبن بێ.

منیـش دەڵێم خۆزگە هەموو ماڵـە کوردێکیش دیوانی نالی لەژێـر قورئانی پیرۆزدا دانابایە.

بەهاری ١٣٦٤

## ڕاوە تاژی

ساڵ درەنگ بوو، پایز داهات، زەوی ڕەنگی بزرکا، شینایی نەما، تینی هەتاو کەم بۆوە، ڕۆژ چیان بەبەرەوە نەما، شەو درێژ و درێژتر بوون، هەوا فێنک بوو، ڕەز ڕندران، مشتاخ هەڵخران، بێستان لەبەرکەوتن، بڕکە هەڵکێشران، جێ تووتن شێو کرانەوە، ئاوێژە لە بەراو دەرچوون، ئەستێر داریان لێ ڕاکێشرا، سەرچاوە قەوزیان گرت، بناوان هەڵدێران، دەراو بۆگە و لێڵ بوون، پاوان و هەڵەسوون، پێخوست و بۆژە بوون، پێورە وێنجە داس پەڕێن کران، ڕەپستە کۆڵە پنج بوون، نەوەندە تیشەیان چەند پەلکە بوو، ساردە کێڵ دندووکەیان دا، کا و گزرە لە کادێن کران، کۆدە و پۆڵکە و نەرمەگیا لە تایە و گیشە دران، تفاقی زستان داخرا، دێم کێڵ بەهیوای بارانی ڕەحمەت و هەقەپەڵەی پایز، دێمەکار و ئیشکەکەندیان داچاند، جارجار هەوری سپی و تەنک بەدەم باوە بەپەلە بەئاسماندا تێپەڕین، چەند پڕیشکی بڵاویان وەراند، دڵی شکارتەکەیلی بێ زەوییان داخورپاند و ترسان نەوەکو ئەوەندووکە دەغڵەی ئاو ماڵان بۆیان داچاندوون گەندەنێ بن و بەجارێک قووت بڕاو و بێ ساڵات بکەونەوە، دار و دەوەن خەزەڵیان دا، مێرگ و چیمەن بێ دیمەن بوون، لاپاڵی بژوێن بوونە ڕێچکە، نواڵەی زەنوێر کاتۆر کران، تەلان و بەندەن ڕووتانەوە، ڕووباری خوڕێن لە خوڕین کەوتن، ڕێبواری خوڕێن لە تەنکاویان دا، سوار بۆ بوار نەگەڕان، گیابەرزە بوونە ئیشکەڵ، دڕوو بوونە نەشتەر، تیکان بوونە پەیکان، پێکوڵ و کونجی بوونە بزمار و دەرزی و لەپێی گالەوەڕێنی پێخواس هەڵچوون و گردەنشینیان کرد، بابردەڵە وەک لەشکری

بەزیو و شـــکاو ڕەتێنرا، خۆی بۆ نەگیراوە، بڵاو بوو، پووش و پەڵاش وەک ترســـەنۆک و دووره پەرێزان خۆیان لە خوارە بایان گرت، لە نەدیو و پەسیو و بوودڕ و کەندەڵان خزین، هەوار خاڵی بوون، چادر و چیغ پێچرانەوە، ســـێپەک هەڵپەسێران، مەشکە بەرچیغیان تێ هەڵکێشـــرا و لەبن میچی قورماویَ نران، دۆدانە و شـــیر مەشک لە خەرارە کۆنان پێچران و لەبەر هەیوان و بێڵا بەســـینگ داکران، نێرەی بێ خێر هەڵاوەســـران، گوریس و پەتک هەڵوێزنران، شەنگەبێری قوڵچاغەیان داڕنی، بووزەڵە و بەربێنکەیان شانەوشان کرد، جامی مەڕدۆش و گادۆشکەیان لەبن پێرک و هەرزاڵان ئاخنی، بێژینگ و دەستاڕیان وەکار خست تا زمهەڕ بۆ زستانی دوور و درێژ گێژەو بکەن، ساوار بهاڕن، بروێش بەبا کەن، بۆ دراو لێ بکەن. کاکی شوان کە لە کوێستانی مەزن و هەرواری سازگاری مەڕی لە چرگەن دەچەقاوە و دەمی دەلەوەڕی پڕ و تەڕ و ناسک دەنا و یەکی لە یەکی دەرنەدەچوو، بۆ خۆشی لەسەر بەردێک دادەنیشـــت و قامکی لە بلوێر دەبزاوت و ئەوی لێی دەدا لێی نەدەداوە و پاشـــای بەسەپانی خۆی نەدەگرت، ئێستا بلوێری لە ماڵ داناوە، چونکە مەڕی کوێستان کە لەنگ و لۆر و دەغەزداری تێدا نەماوە و بێ چاوێنی بێ سمرە و ساکەتەی دووگی دەڵێی لینگە دەســـتارە و پشتی گرێی لێ براوە. کوا لە ئارانی قاقڕ و کراڕ دادەمەزرێ و دەچەقێتەوە؟ لە دەشـــتی کاکی بەکاکیدا پەڕ هەڵداوێ، پەرەم پەرەم دەبێ، هەر کرتکەی ڕوو لەلایەک دەکا، شوان ئەگەر وەک ددانی ماریش بێ، پێ ڕاناگا پێشی بگرێ، تێکی بکاتەوە، مەڕی قەڵەو و ســـاغ لە ئارانی بێ لەوەڕ چۆن چێشـــتاوان مۆڵ دەخوا، پاڵێنیان کۆڕ دەبەستێ، شێوەخۆران ڕادەوەستێ و شـــەوێنان لە حەوشەدا گیر دەبێ؟ شوان دەبێ چاوێکی ببێتە چوار چاو و خەو و خواردن لەخۆ حەرام بکا، گورگی فێڵباز و دز هەمیشـــە لە کەلێندایە شـــوان بخافڵێنێ، سەگ بخیچێنێ، تا کەلاک بســـتێنێ، کام مەڕی شاز و قەڵەوە بڕفێنێ و ئەگەر خودای نەخواســـتە شوان لەخەو بمێنێ و دەزبێنی نەگرتبێ مێگەل ڕابدا و یەکی نەهێڵێ و هەمووی بخنکێنێ، جا لەو حاڵەدا شوان کوا مەجالی هەیە لە بلوێر بتووڕێنێ و عالەمێک وەجۆش بێنێ؟

ساڵان لەم وەرزەدا کە کاری دێهات کەم دەبوو، سواغ و پینە و پەڕۆی بان و دەرک و دیواران تەواو دەبوو و ئاوردوو دادەخرا، جەنگەی ڕاوە تاژی دەهات. ڕاوەتاژی لە مێژە لە کوردســـتاندا باوە. تا نیوەی دووەمی ئەم چەرخە زۆر بەداب و دەستوور دەکرا، هەرچەند ئێســـتاش کەم تا کورتێک ماوە، بەڵام بەرەو نەمان دەچێ. دیارە هەر ڕێوشوێنێک بەسەر چوو، ئەم وشـــە و زاراوە و ئامرازانەی پەیوەندییان بەم ڕێوشـــوێنەوە هەیە، لەســـەر زار و زمانـــان نامێنـــن و وردە وردە لەبیر دەچنەوە، تەنیا لە بەیـــت و باواندا دەمێننەوە کە




تێگەیشتنیان بۆ بەرەی داهاتوو دژوار و ئەستەم و گرانە، خۆ بەناشکوری نالێم فەرهەنگ نووسـێکی ئەوتۆمان نەبووە و قامووسێکی وامان نییە ئەم وشە و زاراوانەی تۆمار کردبێ و لە نەمانی پاراسـتبێ، ئەم ڕۆژانە بۆ نووسـینی ئەم وتارە پەنام بۆ فەرهەنگی تاقانەی کوردی بۆ کوردی «خاڵ» برد، لەژێر وشـەی ڕاو و تانجی و تاژیدا شـتی وای نووسیبوو کابرا گوتەنی: «ئەزی تێدا شـەرمەزار بوومەوە». بۆیە ویستم ئەوەی لەبیرم ماوە و لێی دەزانم لەو بارەدا بنووسم تا قامووس نووسی دوارۆژمان کەڵکی لێ وەربگرن و ئەو لاوانەی کە وەک من ئەدەبی فۆلکلۆریکی کوردی بەخەزێنەی زمان دەزانن سوودی لێ وەربگرن.

تاژی یا تانجی و تاجی تۆرەمە سەگێکی درێژ، ناسک، شووش و لەسەر لینگە. پێستی تەنک و ئاماڵ ڕووتەیە، جوان و ژیکەڵەیە، گوتوویانە: «تاژی ئازادەی سـەگانە» توند و تۆڵـە، باش لینگ دەدا و بەدەوامە و بەکەڵکی ڕاو دێ، تاژی تا زەنگەی بەرزتر، تەنگەی گورجتر، کەفەڵی بڵیندتر، پشـتی ڕاکشـاوتر و ئامال کوورتر، پەنجەی شووشتر، سەر و کەللە و دەم و لەمبۆزی باریکتر و ڕەقتر و درێژتر بێ پەسندترە.

وەک هەموو تۆرەمە سەگێک بەنێری دەڵێن گۆڵ و بەمێی دەگوترێ دێڵ، گۆڵ هەمیشە بۆ جووتبوون ئامادەیە، بەڵام دێڵ جارێک یا دوو جار وەبا دێ، زۆر پێشتر نیشانەی وەبا هاتنـی دیاری دەدا، جا ئەگەر خاوەنەکەی بخوازێ زووتر با بگرێ باشـتری تێر دەکا تا قەڵەوبێ و ئەگەر بەپێچەوانە نەیەوێ ئاوس بێ ئەوە لە ژوورێکی تاریکدا دەیبەسـتێتەوە تـا لەڕ و لاواز بـێ و لە با بچێتەوە. جووتبوونی تاژیش وەک هەموو جسـنە سـەگێک «پێوەڕوانی» پێ دەڵێن، دێڵ و گۆڵ پێکەوە دەنووسێن و تا ماوەیەک لێک جوێ نابنەوە، تەنانەت ئەگەر لە زمانی کوردیدا بەزایینی هەموو نینۆکدار و گواندارێک «جگە لە مالۆس کە سـمدارە» دەڵێن ترەکین ـ لەشـێرەوە تا مشـک ـ ڕەنگە بۆیە بێ کە زۆریان بێچوو دەبێ. تاژیش و سەگیش لەوان هەڵناوێرن، دەڵێن دێڵە تاژی بەحەفتا شەو ڕۆژ دەترەکێ. بەوەندە تووتکەی بەزگێک دەبێ دەڵێن کۆخێک، دێڵێک لە سێوە تا یازدە تووتک دەینێ، دێڵە تاژی هەشت گوانی ئەم بەر ئەوبەری هەیە، تووتکە تاژی لە پێشدا چاوی نووساوە و نابینێ، پاش چەند ڕۆژ چاوی دەپشـکوێ، بەقسەی کۆنە ڕاوکەران هەوەڵ تووتک و ئاخر تووتکی کۆخێک لەوانی دیکە باشتر دەردەچن، تووتکە تاژی زوو فێری تێکۆشین خواردن دەبێ و ئیتر نیازی بەشـیری دایک نامێنێ، دێڵە تاژیی ترەکیو پێویستە زۆر باش بەخێو بکرێ و تێر بێ، دەنا زیانی خورۆ و مالانگەڕ دەبێ و پەکی ڕاوکردنی دەکەوێ، تووتک کە ژیوەڵە بوو، گوجووکی پێی دەڵێن و لەخۆیەوە فێری ڕاوێچکە دەبێ، ڕاوێچکەکردن تەمرینی ڕێکەوتن و ڕاو فێربوونە. گوجووکێک بۆ ئەوانی دیکە هەڵدێ و ئەوی تریش ڕێی دەکەون.




ڕاوکـــەری کۆن دەڵێن هـــەر گوجووکێک هەڵات دیارە لە خــۆی ڕادەبینێ و بەگەورەییش لەوانی دیکە چێتر و خێراتر و بەکارتر دەبێ، گوجووکێک بەساڵەوەختێک سونوو یا سوونی دێتەوە و پێی دەڵێن شـــەک، نیشانەی سوون هاتنەوە ئەوەیە کە گوڵ لە کاتی میزکردندا لاقی هەڵدێنێ، پاش ســـاڵێک دەبێتە خەرت و ئەمجارە تەمەنی بەخەرت حیساب دەکرێ. خێرایی و خوێڕپایەتیی تاژی تا نەبێتە خەرت دیاری ناکا، وا دەبێ شـــەک نۆرەش ناکا و کەچی بەخەرتی زۆر چێ دەبێ و بەپێچەوانە شەکی خێرا خوێڕی دەردەچێ.

## ڕەنگەکانی تاژی

تـــاژی ڕەنگی جۆر بەجۆری هەیە، ســـپی، ڕەش، ســـوور، نەباتی، شـــێ، خەزاڵ، بۆر، تاڵە، شـــڵە، خورمایی، خەنەیی، گورگی، پڵینگی، قەزوانـــی، بازوو، بۆزقاجی و بەڵەک، ڕەشبەڵەک، سووربەڵەک و شین بەڵەک.

## دەنگەکانی تاژی ئەمانەن

لووراندن، نووڕاندن، قرووسکاندن، نووزاندن، مڕاندن و ناسکاندن.

## سیفەتەکانی تاژی

چێ، خێرا، تیژ، پەل، ڕەشکوژ، خۆشڕست، بەدڕست، هەرزە، قرخەمەڕەس، دەمسارد، دەمگەرم، بەهەڵم و بەدەوام.

تاژی بەکاری ڕاوی ئاســـک و کێوی و کەروێشک دێ، چێترین و باشترین و بەکارترین، تاژی ئاسک کوژە، من کوێستانیم و ئاسکیش لە دەشت و گەرمیان دەژی و لە ڕاوە ئاسک شـــارەزانیم. مامۆستا عەلای ڕەحمەتی لە کتێبی «کوردواری» باسی ڕاوە ئاسک دەکا من




بەنەزانی خۆمەوە بەدڵم نەبوو، پێم وابوو هەڵەی تێدایە، ئەمما پیرە بەگێکی جاف جارێک باسی ڕاوە ئاسکی بۆ کردووم ئەوەتان بۆ دەگێڕمەوە، ڕاست و درۆی وەباڵ بەستۆی خۆی دەیگوت: زەمانی دەســەڵات و باوی بەگ و پاشــاکانی جاف کــە کۆچەر و ڕەوەند بوون باشــترین تاژی و ڕەسەنترین ئەسپ لەنێو جافاندا هەبوو، لە موکریانیش ناوبانگی ئەسپی جافان بووە - ڕەنگبێ ڕاست بێ چونکە لە عەرەبان نیزیکن و جسنە ئەسپی عەرەبیش لە دنیادا مەشــهوورە - دەیگوت: «پاشاکان تیپە سوارێکی باشیان هەڵدەبژارد، تاژییەکانیان وا فێر کردبوو کە ڕاویان دادەبەست و ڕستەیان هەڵدەکێشا و تاژی خۆی داویتە پێشکۆی سوار و مات دەبوو، کە ئاسک هەڵدەهات سواران بەو ئەسپە خۆشبەز و بەکارانەوە دەیان ڕەتاند تا دەیانزانی شــەکەت بوون ئەمجار تاژییەکانیان بەردەدایە تا لە خۆڵی دەگەوزاند، هەموو ڕاوکەرێک خەنجەری دەبەردابوو و کێردی دەبان و تیژی لە دیوی ژووری خەنجەردا لە کالان چەقاندبوو بەو کێردە سەری ئاسکیان دەبڕی و ڕفیسکەیان کون دەکرد و لە بەن سامۆرتەکەیان هەڵدەکێشا و بەتەرپزەی ئەسپەوە هەڵیانداوەسی».

کــورد بەهەموو گیاندارێکی گواندار و ســمدار کە کــەوی و ڕام نەبێ دەڵێ کێوی، لە کێوە سەرکەش و شاخە سەخت و ڕژد و هەڵەمووت و زەرد و ماهەکانی کوردستاندا کێوی دەژین، کەڵەکێوی، گاکێوی، شــوور، یەکجار کــەم بوون و لەوانەیە ڕەگەزیان لەم حاڵەدا لە مەترســیدا بێ و هەر نەمێنن و نەمبیســتووە ئەوانە بەتاژی ڕاو بکرێن، بیستووتانە کە کێوی بەتایبەتی ڕۆژانە لە شــاخی هەرە سەخت و ڕەوەزی ئەستەم نابێتەوە، دەڵێن هەر جێگایەکی شــاخ بارانی وێ بکەوێ کێویش دەتوانێ پێیدا بڕوا، دیارە تاژی لە جێگای وا کار ناکا.

بۆ ڕاوە کێوی بەتاژی بەرەگە دەنێنەوە. کێوی کە لەم شــاخەوە بچێتە شــاخێکی تر تیرەگ بەرنادا، یانی بەجێگایەکدا دەڕوا کە هەردووک دیوی کێوی لێ دیار بێ، جا ڕاوکەری شــارەزا، تیرەگێکی ڕەچاو دەکەن و حاشــارگەی لێ دروســت دەکەن، ئەگەر گوێنی و گیابەرزی لێ هەبێ، کۆختەیەکی دوو میتری یا کەمتر ساز دەکەن و خۆیان و تاژییەکانیان لەوێدا مەڵاس دەدەن، ئەگەر ئەوەیان بۆ نەلوا وارشی بەرد دروست دەکەن، کێوماڵ بەرێکی شاخ بەهەراو و هۆریا و تەق و ڕەق و چەقە چەق دەتەقێنن تا حەیوان بترسێ و بەتیرەگدا بپەڕێتەوە شاخی ئەوبەر و لەوبەرەگە هەڵەنگوێ، ئەگەر مەودای نێوان دوو کێو بەرین بێ و لە دوو جێگاوە بەرەگەی بۆ دەگرن. تا ئەگەر تاژی پێشەوە ڕاستی بکەن بەسەر بەرەگەی دووەمدا بکەوێ و ڕزگاری نەیە، تاژی قایم و بەهەڵم و فێڵاوی نەبێ نە دەگاتە کێوی و نە دەوێرێ خۆی لێدا، بەران و نێری قەیرە دەس دەکەنەوە و بەگژ تاژیدا دێنەوە و بەشەقۆن

تێی هەڵدەدەن و برینداری دەکەن، وا دەبێ دەشیتۆپێنن. بەڵام تاژی کە فێڵاوی بوو، هەر لە پاشــڕا لە کێوی ڕۆ دێ و کە بۆی هەڵکەوت، باتووی دەگرێ و بڕســتی دەبڕێ، ڕاوکەر دەڵێــن هۆی ئەوەی تاژی دەگاتە کێوی، ئەوەیە کێوی لە هەڵاتندا زۆر ئاوڕان دەداتەوە و مەحتەل دەبێ، دەنا زۆر بەباز و بڕدترە، کێوی بەتەڵە و شــتی دیکەش دەگرن کە دێرەدا جێی باس نییە.

## نەخۆشییەکانی تاژی

سەگە بایی، شانەڕەقە، شەککە، سەبنێسی، هاری، سووزەنەک.

## ڕاوە کەروێشک بەتاژی

کەروێشــک گواندارێکە کە نینۆکی هەیە، گیا خۆرە، کلکی زۆر قوڵەیە، تووکی نەرمە، درێژایــی لە بەرزایی پترە، پێشــووی لە پاشــووی کورتترن، بەباز و قنــە دەڕوا، گوێی زۆر درێژن، ســەری لەچاو لەشــی زۆر گەورەیە، چاوی زەق و لەڕوون و نانووقێن. زیاتر بەچاوان دەبیندرێتەوە، دەڵێن مێیەکەی حەیز دەشــوا، دەترەکێ و زەو و زووی زۆرە، لە جێگای سارد و گەرمدا هەیە. لە بژوێنترین کوێستانی کوردستاندا و گەرمترین و کڕاڕترین بێروونی عەرەبستاندا دەژی، بەبێچووی دەڵێن بەچ و کە پەڕەوازە بوو و توانی توند ڕابکا «سەپســێن»ی پێ دەگوترێ، بەڕواڵەت یەکجار بەســتەزمان و بێ دەسەڵات و ترسنۆکە و لەبــەر هیچ گیانــداری چوارپێ و باڵندەی پچووکی ڕاوی دەس ناکاتەوە، کەچی دوژمنی وەرزێر و ڕەزەوان و بێســتانچییە. تا دەستی لەســەر دابنێی بەزەڕ و بەدفەڕە، بەڕۆژ لە لاندا خۆی مەڵاس دەدا و بەشــەو دەگەڕێ و دەلەوەڕێ، هیچ ناپارێزێ. بۆ باغ، بێســتان، شــیناوەرد و، ڕەپســتە تەنانەت خۆیان و خەرمان وەک بەڵا وایە. بۆیە وەرزێر و باغەوان ڕقیان لێیە و بەتەپکە و تەڵە و خوردە و داو دەیگرن. گۆشــتی دەخورێ، دەڵێن تەمەنی بەوەڕا دیارە کە هەر ساڵە کونێکی لەبن کلک دەبێ.

نیزیکەی سـی، چل ساڵ لەوەی پێش کەم ساحێب مڵک و ئاغا و مەزنی کورد هەبوو، ڕموودەی ڕاوە کەروێشک نەبێ، دیارە ئەم کارەش بەستە بەدەست ڕۆین و نەڕۆینەوە بوو، ئاغای دەوڵەمەند ڕسـتەیان لە ئاوریشمی ڕەنگاوڕەنگ دەهۆنییەوە و گوڵینگی سیم پێچی جوانیان وێ دەخسـت. سەری گوڵینگداریان لە باسـکی ڕاستە یا ڕاست و چەپ لە شان دەکرد. قەڵادەیان لە قایشـی باش دروست دەکرد و بەئاوریشم دەچنی، زەنگوڵەی زەرد، زێو تەنانەت زێڕیان لێ دەدروو، سـەری دیکەی ڕسـتەیان لە ئاڵقەی قەڵادە هەڵدەکێشا. ئاغـای دێ بەخـۆی و بـاب نۆکەر و ڕەعیەت و سـوارەوە دەچووە ڕاو، لـەو جێگایەی زانیبایان کەروێشکگرە ڕاویان دادەبەشی و سوار سەفیان دەبەست، لەکێو یا بانوو سوارێک بەتاژییەکی کارامەوە سـەڕڕاوی دەگرت، سەرڕاو دەبوو لەپێش سوارانی بێ و چاوی لەلای خوارێ بێ تا ئەگەر کەروێشکیان لە داوێنی تێبەردا وریا بێ و بزانێ ڕوو لە کام لا دەکا، ئەو دەبوو ڕاسـتە و ڕاسـت لە پێشدا بێ، ئەگەر تاژی خوارەوە نەیانکوشت و بەماندوویی گەیشـتە سـەرڕاو ئەو تاژییەکەی خـۆی بەرداتێ، دەبوو تاژی سـەربەرەوژێر بەرنەدا و ڕاوەستێ تا کەروێشک کەمێکی لێ ڕەت دەبێ، بەرڕاو سوارێک بوو کە باشترین و چێترین تاژی پێ بێ و کەمێک لە دوای سـوارانەوە بێ تا ئەگەر کەروێشـک پاش ڕاو بکا، تاژی خۆی تێبەردا، سـوارەکانی دیکە کە نێوانیان پێنج شـەش گەز پتر نەبوو، چ تاژییان پێ با یان نەبا، دەبوو لە ڕێکی یەک بڕۆن و هەر کەسـە لەلای سـەرووی خۆی ورد بڕوانێ و هەوڵ بدا هیچ بنچک و بەردێک نەبوێرێ، تا سـەف ڕاسـتتر و نێوانی سواران کەمتر بایە، کەروێشـک چاکتر دەبیندراوە یا زووتر هەڵدەهات، لانی تازە و کوێرە و لانی شەوێ دینێ نیشانەی ئەوەبوو. کەروێشک هەر لەو دەوروبەرەیە، جا دەبوو بەفیتوو یەکتر حاڵی بکەن سەف ڕاستتر و سوار خوردتربن، ورد بڕوانن و نەیبوێرن. کەم وایە کەروێشک لەبەر سەفی ڕاسـت و ڕێکوپێک و سـواری ئارام، بوێرێ ڕا بکا، خۆی لە لاندا مەڵاس دەدا و لە عەرزی دەخا، ڕاوەکەری لێزان بەتەماڵ دەیبینێتەوە.

ئەو سـەردەمی داب بوو ئەگەر نۆکەرێک یا ڕەعیەت سوارێک تەماڵی دیباوە دەیگوت: «نۆکەری ئاغای خۆم و ڕاوکەرانم پێ دەڵێن هۆی تەماڵە!» عادەت وابوو ئاغا و خزمەکانی تەماڵانە بدەن بەو ڕاوکەرە و خەڵاتی بکەن، سـوار لە دەوری تەماڵ کۆدەبوونەوە، پایزە، ئازیزە، گوڵێ گوڵێ، حەیران و گەلۆیان لەسـەر دەگوت و جاروبار دەهۆڵ و زوڕنا و سـێ تەپڵیشیان لەسەر لێ دەدا، ئەگەر بۆ خاتری سەیر نەبا بەهاسانی بەدەستی دەگیرا، بەڵام ئاغای گەورە بۆ سەیر دەچوونە ڕاو نەک بۆ ڕاوەگۆشت، جا بۆیە ئەسپیان وەسەر دەپەڕاند کە هەڵێ و تاژیی تێبەردەن، دوو یا سـێ تاژییان تێ بەردەدا، ئی وابوو چێ و دەمگەرم

بوو گوریسێکی نەدەبرد و لە سەفی سوارانی دەرنەدەکرد و هەڵی دەگرت و ئی وابوو خێرا و پەل و دەمســـارد بوو، چەند جاری دەگێڕاوە، لێی دەدا، تێی ڕۆدەهات تا هەر خۆی یا تاژییەکانی دیکە دەگەینە نۆرە و هەڵیان دەگرت، تاژیی ڕەسەن کە کەروێشکی هەڵدەگرت نەیدەشەمزاند یا بەدەمیەوە دەگرت یا چەمۆڵەی لەسەر دادەدا، سوارێک دادەبەزی و سەری دەبڕی و وەبەن ســـامورتەی دەخست، ئەگەر تاژی خوێڕی بایە نەیدەشکاندەوە و خوارەی پێ نەدەکرد و کەروێشک ڕزگار دەبوو، ئەگەر باشتر بایە ڕاستی دەکرد و دەیگەیاندە سەر ڕاو یا لە کونی دەکرد، کەروێشک هەمیشە بۆ لێقەومان کونێک ڕەچاو دەکا، بەڵام تا زۆری بۆ نەیە ناچێتە کونەوە. سەرڕاوی شارەزا لای کونێیان لێ دەگرت وا دەبوو لە زارکی کوندا دادەنیشتا و ئەویش خۆی لە باوەش داویشتن. ئەگەر چوو لە کونیشەوە بەپێچەک دەریان دەهێنا، لە هێندێک مەڵبەند بەتەماڵ دەڵێن «دیاردی».

خۆشـــترین کاتی ڕاوە کەروێشـــک پاش بارانە. چونکە کوێرە و لانی تازە لە دوورەوە دیارە. وا دەبێ کەروێشک لەو کاتەدا کۆنەلان دەکاتەوە کە ئەویش دۆزینەوەی بۆ ڕاوکەری شـــارەزا هاســـانە، جگە لەوە بەر پێی تاژی کە ڕووت و بڵە، نەرم دەبێتەوە و ترسی کاڵە درانی نامێنێ، بەرپێی کەروێشـــک کوڵکنە و قوڕ دەگرێ و باشـــیش ناتوانێ ڕابکا و پێی دەڵێن کەلاشـــە کردن، ئەو ســـەردەمە زۆری پێ ناچێ و وەختی نینۆک شـــکێن دێ. کە وشکەبەند پەیدابوو و کەروێشک لان بەرەژێری کردەوە و ڕەپستە و باغی پاوانی داوە بەر پەلامار هێند قەڵەو دەبێ کە دەڵێن گورچیلەی دەبەزیدا ون بووە، ئەمجار بەســـەر زەوی بەســـتراو و ڕەقدا وا هەڵدێ هەر ویزەی لەبەر پێی دێ، تاژی لە ترســـی هەڵخلیســـکان و نینۆک شکان ناوێرێ توند ڕابکا، هەر تاژییەکی لەکاتی نینۆک شکێن و سیخوار لە پشتدا بکاتێ نایابە. کە نوابەفری هەوەڵ کەوت و بارنی نەکرد باســـی سەری کەروێشکە، چونکە شوێنی دەگەڕێ و بەپێشووی کورتەوە هەر دەرناچێ. ئەو گیاندارە بەڕواڵەت گێل و گێژە کە زانی شـــوێنی دەگەڕێ زۆر فێڵەزان دەبێ، شوێنی جووتەیە، پاشووی بەجووت وەپێش پێشـــووی دەخا، ڕاوکەر کە تووشی ڕاستە شوێن هات دەزانێ کەروێشک یا چۆتە شەوگەڕ یا گەڕاوەتەوە و بەپەلە دەیگێڕێ تا دەگاتە «دوولایی»، دوولایی ئەوەیە کەروێشک بەسەر شوێنی خۆیدا دەگەڕێتەوە، لە جێگایەکی بازێکی بڵیند داوێ و لەسەر کەڵەکێک یا قەدی ڕەوەزێک دەکەوێ، دەبێ ڕاوکەر بەقەراغ دوولاییدا بڕوا و نەیشـــێلێ تا بزانێ کەروێشـــک لەکـــوێ بازی داوە و وریا بێ پاش ڕاو نـــەکا و بازرە نەبێ، «هەزارە» هەر وەک دوولایی وایە، بەڵام کەروێشـــک چەندین جار بەشـــوێنی خۆیدا هاتوچۆ دەکا، وا دەبێ هەر لەنێو هەزارەدا دەکەوێ، وا دەبێ دیسان بازێکی دوور داوێ و لەهەر جێگایەک کەوت مات دەبێ.

شوێنگێڕی باش لە فێڵ و هەزارە و دوولایی کەروێشک دەگا و دەیدۆزێتەوە.

«کورتە» ئەوەیە کە کەروێشک دوای هەزارە و دوولایی بەقەد جێ جێخوونێک بەدەورە دەگـەڕێ و ئەوەندەی پێدا دێ و دەچێ کە کەس سـەرەدەر لە شـوێنی ناکا، ڕاوکەری شـوێنگێڕ دەبـێ زۆر بەسـەرنجەوە دەورەی کوتە بدا، کە نەڕۆییبوو ئـەوە دیارە لەنێو کورتەدایـە ئەودەم دەبـێ وەنێو کورتە بکەوێ، تا یا بیدۆزێتـەوە یا ناچاری بکا هەڵێ. کە بەفر زۆر بوو و بەفر بەسـەریش نەبوو کەروێشـک ڕونوو بەفر دەکۆڵێ و دەچێتە نێو بەفـرەوە، بـەوە دەڵێن «خوزە»، کەروێشـک لە خوزەدا بەوە دیارە کە جێی هەناسـە هەڵکێشـانی زەرد دەبێ و دیارە لێرەدا فێڵێک دەکا بەبن بەفرِدا ڕەهەندێک دەکۆڵێ و لە چەنـد جێگا خوزە دیاری دەدا. بۆ ئەوەی ئەو فێڵەشـی لێ ببڕن، یەکێک بەتاژییەوە لە نێوەڕاسـت ڕادەوەستێ و ئەوانی دیکە خوزەکان دەشێلن، کەروێشکی خوزە زیاتر ناوێرێ ڕابکا و بەدەسـتی دەگیرێ. لە پێشـدا گوتم کەروێشک تا زۆری بۆ نەیە ناچێتە نێو کون کە چووە نێو کون و دیاربوو و دەستی نەگەیشتێ، دارێکی نەرم و درێژ دێنن سەری لەلە دەکەن و لە تووکی کەروێشـکی بادەدەن و بـەم دارە دەڵێن «پێچەک». ئەگەر بەوەش نەهاتە دەر، ئەمجار تەڵەی لێ دادەنێنەوە و دەیگرن، لە مانگی ڕەشەمەدا ڕاوە کەروێشک دوایـی دێ، هەم لاواز دەبێ و بۆ خواردن نابێ هەم با دەگرێ، بەناوبانگترین چێشـتێکی لە گۆشـتی کەروێشکی دروسـت دەکەن «سەنگەسـیرە»، لە کابانان بپرسن چۆن ساز دەکرێ!!!

## ڕاوە ڕێوی بەتازی

کام منداڵی کوردە ناوی ڕێوی نەبیسـتبێ، سەدان ئەفسانە لەسەر ڕێوی لە فۆلکلۆری کوردیدا هەیە، خۆ لە پەندی پێشینیانیشـدا ئەوەندە باسـی ڕێوی کراوە هەر مەپرسـە وەک:

ڕێـوی خۆی لە کونەوە نەدەچوو قانگەلاشـی بەکلکیەوە دەبـردە ژوور، ڕێوی دەمی نەدەگەیشـتە ترێ دەیگوت ترشـە، ڕێوی کێچی دە کەوڵی کەوتووە، ڕێوی خۆی لە ئاوی خوڕ نادا، ڕاوە ڕێوی بۆ کەوڵییە و سـەیری لە ڕاوە ڕێوی خۆشـترە، وەک ڕێوی سیرمە خۆرە...

ڕێوی بەڕاستی جانەوەرێکی فێڵاوی و مەکربازە، نەوسن و بەزەڕە، هەموو شت دەخوا میوە و گۆشت و شتی وا، دوژمنی کەروێشک و مشک و باڵندەیە بەتایبەتی باڵندەیی پێڕۆیە. ئەوەندەی کەروێشک بۆ باغەوان و وەرزێر خراپە ئەویش ئەوەندە بۆ ئەوانەی باڵندەی کەوی و ماڵی ڕادەگرن جێگای مەترسییە، تووشی ڕەوە قەلەموونێک بێ تاقی لێ دەبڕێ، مریشک و جووچک هەر ناهێڵێ، لە کێویش هەمیشە لە کەو و سوێسکە و زڕەکەو و هەوێردە لە کەمیندایە، تەنیا کاری چاکی خواردنی مشکی کێوی و بەچە کەروێشکە، بەڵام ئینسان فێڵی لەویش دەبڕێ، بەڕاستی ڕاوە ڕێوی سەیری خۆشە، ڕێوی لە کوردستاندا زۆرە، وەک دەڵێن ڕاوی بۆ کەوڵییە، دەنا گۆشتی ئەگەرچی دەیخۆن، زۆر درێو و ناشیرینە، دەڵێن وەک گۆشتی ژووشک بۆ باداری دەرمانە.

بەڕاستی هەقیانە ئەو کەسانەی دەڵێن «سەیری لە ڕاوە ڕێوی خۆشترە» ڕاوە ڕێوی زیاتر بەپیادە دەکرێ، ڕێویش وەک کێوی کە ترسا هەمیشە تیرەگی کێو دەگرێ و بۆ کێوێکی دیکە دەپەڕێتەوە. دیارە لە کێو و شاخی ئەستەمدا ناژێ. لە هەموو جێگایەک تەنانەت لە دەشتی نەرمانیش هەیە، دوو دەستە کێوماڵ کێوێک دەتەقێنن و هەرا و هۆریایەکی زۆر دەکەن تا ڕێوی بترسێ، ڕاوەکەرێک لە حاشەرگەدا بەرەگەی لێ دەگرێ تا کێوماڵەکان ڕێوی وا دەتەقێنن بەسەر بەرەگەدا بکەوێ، ئەودەم بەرگەگر تاژی تێبەردەدا. تاژی دەرناچێ، بەڵام دەستی دەگەڵ دەکاتەوە، گازی لێ دەگرێ، بەنینۆک دەیڕنێ، تاژی کارامە هەوڵ دەدا لە پشت ئەستۆی ڕۆبێ و ڕایوەشێنێ تا لە کاری دەخا یا لە قەفەزی پشتی ڕۆبێ و هەڵیدێرێ تا بڕستی لێ دەبڕێ. بۆ ڕاوە ڕێوی پێویست ناکا تاژی خێرابێ، ئەسڵەن تاژی ڕەشکوژ و چێ لە ڕێوی بەرنادەن تاژی ڕێوی پێویست کوژ ئازا و قایم بێ باشترە نەک تیژ و گورج.

دورە یا «دووڕەگ» بۆ ڕاوە ڕێوی باشترە. دووڕەگ وەک لە ناوەکەیەوە دیارە جسنە سەگێکە لە جووتبوونی سەگ و تاژی پەیدا بووبێ، جا فەرق ناکا گۆڵ، سەگ بێ یا تاژی، هەرچەند ئەگەر گۆڵ تاژی بێ دووڕەگ جوانترە. دووڕەگ لە باسکە سەگ ڕووتەتر و بەرزەلینگتر و لە پاش تاژی لە هەموو جسنە سەگێک توندتر ڕادەکا، ئی زۆر خێرایان لێ هەڵدەکەوێ کە بۆ ڕاوە کێوی و کەروێشک تەنانەت گورگیش بەکاردێ، تۆرەمەی دووڕەگ و تاژی، پێی دەگوترێ «قەدەم».

خوێنەری خۆشەویست! بەم باسە دوور و درێژە ماندووم کردی یا نەقڵێکی خۆشت بۆ بگێڕمەوە، کەمێک بێیەوە سەرەخۆ، دەڵێن ڕۆژێک ڕێبوارێک تووشی ڕاوکەرێک هات، تاژییەک و توڵەیەکی کونێ و دارێکی درێژ و تەڵەیەکی پێ بوو، گوتی: کاکە ئۆغر بێ،

چ دەکەی؟

- دەچمە ڕاوە ڕێوی.

- ئەوانە چن پێتن؟

- کاکە ئەگەر ڕێوی لەبەرم هەڵات، ئەوە تاژییەکەی تێ بەردەدەم، ئەگەر کوشتی باشە، دەنا لە کونێی دەکا، کە کونەکە زۆر قووڵ نەبوو ئەم دارەی لێ پێچەک دەدەم، دەیهێنمە دەر، ئەگەر زۆر قووڵ بوو، توڵەکەی لەباڵ دەکەم.

ئەگەر ئەویش بۆی نەهاتە دەر تەڵەی لێ دادەنێمەوە ئاخری پێوە دەبێ.

ڕێبوار گوتی:

- کەوابوو، بۆ ڕێوی خودا ماوە و بەس!

# نەورۆز

لەبارەی نەورۆزی پیرۆزدا زۆر شت گوتراوە و نووسراوە. مێژوونووسان دەڵێن ئەو ڕۆژە کە ئاور دۆزراوە خەڵک کردیە جێژن و ناوی نا نەورۆز، یا دەنووسن ئەو ڕۆژە کە کاوەی ئاسنگەر لە زەحاکی خوێنخۆر و زۆردار ڕاپەڕی و دوایی بەدەستەڵاتی زۆردارانەی هێنا، کرا بەنەورۆز.

تەنانەت لە هێندێک برادەری شیعەم بیستووە کە حەزرەتی عەلی سڵاوی خوای لێ بێ لەو ڕۆژەدا لەدایک بووە. هیچ کام لەم بۆچوونانە بۆ ڕەتکردنەوەی نابن. دۆزینەوەی ئاگر ئەو نیعمەتە گەورەی خودا، ڕاپەڕینی کاوە و لەناخ ڕۆکردنی زەحاکی زۆردار و لەدایکبوونی حەزرەتی عەلی ئەو سەردارە بەناوبانگەی ئیسلام هەموو بۆیە دەبن جێژنیان بۆ بکەی، بەڵام بۆچوونی من لەبارەی نەورۆزدا بۆچوونێکی لادێییانە و کرمانجانەیە. لەوەش ناترسم مێژووزانەکانی شارستانی پێم بڵێن کەڕە کرمانجی مێژوونەزان و نەخوێندەوار ئەوەت لە کوێ هێناوە.

من پێم وایە ئەم ڕۆژە پیرۆزە و ئەم جێژنە گەورەی زۆربەی گەلانی ڕۆژهەڵات پێوەندیی بەئابوورییەوە هەیە.

جا ئیجازە بدەن بەکورتی لەو بارەدا بدوێم. تا بزانن منی کەڕە کرمانج کەنگێ و لە کوێم دەرسی ئیقتساد خوێندووە تا قسەی وا زل بکەم.

بابە با نەخوێندەواریش بم! خۆ ئەوەندەم لە خوێندەواران بیستووە کە ئەو گەلانەی بەزمان گەلی ئێرانی دەدوێن لە ڕۆژگارێکدا کە نە من دەزانم کەنگێیە و نە ئەو کەسانەی

خۆیان بە مێژووزان و مێژووناس دەژمێرن بۆیان ساغ نەبۆتەوە چەند هەزار ساڵ دەبێ لە قەفقازەوە سەرەوژێر بوونەوە و هەر یەک بۆ لایەک ڕۆیشتن.

ئـــەم گەلانـــە هەموویان شـــوانەوێڵە و مەڕدار بوون و ژیانیان بەپێســـت و گوانی ئەم گیانلەبەرە خوێن شیرین و بەستەزمانە کە زۆر زوو دەستەمۆ بووە، دابین کردووە.

ڕوونتر بڵێم خۆراکیان لە شـــیر و پۆشـــاکیان لە خوریی ئەو حەیوانە بووە. جا بۆیە خۆشیان ویستووە و گەرمێن و کوێستانیان دەگەڵ کردووە و بەدوای هەوار و لەوەڕگەدا وێڵ بوون و گەڕاون. نە زۆر شـــارەزای نووسینەکانی «هیرۆدۆت»، «تەبەری»، «گزنفۆن»، «فردۆســـی»، «مینۆرسکی» و «زێرنۆف» و ئەوانەم کە بنەچەکەی کورد بەرمەوە سەر کادۆخ و ماد و نازانم کێ و کێ؟...

بەڵام دەزانم کوردیش یەکێک لەو گەلانەیە لەپێشـــدا شـــوانەوێڵە بووە ئێستاش ئەگەر کارەســـاتی ڕۆژگار لێگەڕێ کەیفی لە شوانەتییە و وڵاتەکەشـــی بۆ ئاژەڵداری یا بەزمانی ئیمڕۆ دامداری و دامپەروەری دەناڵی.

ئێســـتاش هەرچەند مەڕداری لە کوردستاندا بەداخەوە زۆر کەم بووە و دامپەروەرەکان کاتی بەران تێبەردانیان گۆڕیوە، بەڵام ئەو دابە هەر نەگۆڕاوە، هەر کەس کەرتکە مەڕێکی بێ ئەو ڕۆژە بەران دەمەڕێ دەکا، میوانداری لە جیرانان دەکا، مێوژ و خورما و شـــیرینی دەدا بەمنداڵان و ئەگەر خەڵاتێکی زۆر باش بۆ شوان لە ئەستۆی بەران نەکا، کاکی شوان نایەڵێ بەرانی ڕەنگاو بچێتە نێو مێگەل.

بـــەڵام زۆر دوور نییە هەر بەبیری من مـــەڕدار لە ئاخر و ئۆخری مانگی میهر بەرانیان دە مـــەڕ کـــردووە و جێژنی میهرەگانیـــان بۆ کردووە. دیارە ئەو جێژنـــە ئەوەندە، گەورە بووە کە عـــەرەب وەریان گرتووە و کردوویانە بەمیهرەجان و بەهەموو ڕۆژی خۆش دەڵێن میهرەجان.

مەڕ بەپێنج مانگ دەزێ پێشـــینیان دەڵێن بەرخ پاش ســـەد ڕۆژ ڕووحی وەبەر دێ و مەترســـی بەر ئاویتن کەم دەبێتەوە. جێژنی سەدە کە ئێستاش لە زۆر شوێنی کوردستان دەیکـــەن و پێی دەڵێن «بێڵن دانا» پێوەندی دەگەڵ ئەم باســـە هەیە. دوو مانگ پایز و سێ مانگ زستان دەکاتە پێنج مانگ و لە شەوی ئەوەڵی بەهاردا زەوی مەڕ دێ و جێژنی هەرە گەورەی مەڕدارە.

پێم وانییە پێویستی بەڕوونکردنەوە بێ بەرخی مەستە شیر پاشی سێزدە ڕۆژ دەبێ لە کۆز دەرکرێ و بەزاوەماک بیبەیە لەوەڕ. ئەوەش سێزدە بەدەرەکەمان.




ئەوەیە بۆچوونی منی کەرە کرمانج کە لە ژیانی باوکم بەسەر مەڕ ڕادەگەیشتم و گەرمێن و کوێستانم دەکرد و بەپسپۆڕی ناوبانگم هەبوو. بەڵێ ماوەیەکی زۆر وێڕای شوانی شەوگەڕ و شەنگەبێری توند و تۆڵ لە کوێستانە جوانەکانی کوردستانی ڕەنگین ژیانم ڕابواردووە.

زۆر پاڵێنیان لە مندارە مانگدا بۆ ئەوەی شوانەکانمان نێوەڕۆ، خەوی بر بکەن و شەوانە مەڕ بڕەتێنن بۆ خۆم دەستم داوەتە گۆچان و چوومە بەر مەڕ و لەو وەختانەدا بووە شێعرم بەتەبیعەت و خۆڕسک و ژیانی کوردەواری هەڵگوتووە.



## جوانترین دیمەن

ئەدی و بدی نیم، وەک کارگ بەشـــریخەی هـــەوری بەهار هەڵنەتۆقاوم، ئەگەر هەڵۆی بەرزەفڕ نەبم بازی چاو دووراویش نیم، ئەگەر شێری خەوتوو نەبم خۆ ڕێوی گەڕیدەم.

نازپەروەردە و هەتاو نەدیو نیم، جەفاکێش و جیهان دیدەم. گەرمێن و کوێستانم لێک داوە، هەوراز و نشـــێوم بڕیوە، دەشـــت و بێروونم پێواوە، بەرکە و ڕژد و تەرت و تەلانی ئەســـتەمدا ســـەرکەوتووم، بەخڕ و شیو و دۆڵاندا تێپەڕیوم، لە گەوە و کوێرەڕێ و لاپاڵان هاڵاوم.

لە کێوی سەرکەش و شاخی هەڵەموت و هەزار بەهەزار ئارەقی ماندوویی و شەکەتیم ئەسترپیوە. لە زێی خوڕ و چۆمی مەندم داوە. لە دەروو و گەرو و گایان ئاوابووم.

لە بناری کێوێکی بەرز و ڕەقەن و سەخت و قووچ لە دایک بووم، بەژەکی شێرە ژنێکی کورد ڕۆژووم کراوەتەوە و فرچکم گرتووە، لەسەر بێژینگ لە فێڵی ئاڵ و شەوە پارێزراوم، گوێزەبانەم بۆ کراوە و لە لانک نرام، ســـەر ســـینگم پێ دادراوە و بەدەســـرازە پێچراوم، لایـــە لایـــەی کوردیم بۆ کراوە و گوڵزاری موت و مووروو ۆ کووژەکە و گوێ ماســـیلەم بۆ هەڵاوەسراوە، دارە دارەم کردووە، بەڕەوەڕەوە پێم کرتووە.

بەشـــیر و ماست و توێ شـــیر و پەنیر و مەیلە و لۆرک و شیرێژ و ڕۆن بەخێو کراوم، ئاوی سارد و زوڵاڵ و ڕوون و بێ خەوشی کانیاوم خواردۆتەوە.

ژیوەڵـــە و پەڕەوازە بووم، لە نێو باخ و باخچە ئاڵووباڵوو، گێلاس، شـــێلانە، هەرمێ،

سـێو، ترێ، بادام و سنجووم ڕنیوە، لە بێستان هاروێ، ترێزوو، کالیار، شووتی، کاڵەک، گرکە و فاتە بۆرم خواردووە.

لە دارە گوێزان جۆلانەم هەڵاوەسـیوە، بەسپی چناری بەرز و لووس هەڵچووم، شەوی مانگەشەو، قەرەقەرێ و خۆشاردنێکی و هەیجۆیەنم کردووە.

بەڕۆژ هەلووکێن، تۆپەڕاکردنێ و هەمزەلم کردووە، گەورەتر بووم فێری مێشێن و جگێن و ئەسکەملە بووم. بەجۆرابێن و کاڵەمستێن و فەنەی بێدەنگ و گەڕەلاوژە، شەوانی درێژی سـاردی زسـتانم گەیاندۆتە ڕۆژ، مژ و تەم، هەور و هەڵا و کرێوە و باران و بەفری سپی و خاوێنی یەک نوام دیوە.

گەییومە تەمەنی مێرمنداڵی، فێری سواری و ڕاو بووم، ڕمبازی و شەڕانخێوی و تەراتم کردووە تەقڵەم داکوتاوە، جلیتم هاویشتووە و پێدادراوە.

دەسـتم بەجڵەو جەمام بووە، بەڵام ئەسپم لەسەر گوڵی مافوورە گێڕاوەتەوە، شوێنم گێڕاوە، شینکەی مات و مەلوولم لە خوزە و گەرمەلانێ دەرپەڕاندووە و تاژی چێ و خێرام تێبەرداوە.

سیاسووتی بەهارێ، کۆلکەڕەش و مێرۆژان چوومە ڕاوەکەو و داوم چەقاندووە و تفەنگم تەقاندووە. لە نێوەوە چووم و سـەرەڕای ئـەو وەرزیش و یارییانەی لادێیانە خەریکی کار و کاسـبی بووم، ئاوم داشتووە، کەشـاوم کێڵاوە، مەڵەغانم گێڕاوە، گێرەم لێ خوڕیوە، خۆیانم هەڵداوەتەوە و لەبەر شنەی زریانی فێنک شەنم کردووە، مالووسکم زرینگاندۆتەوە، باڵەکەوم کردووە و خەرمانم هەڵگرتووە.

ئاژەڵداریـم کردووە، لە تـەڕ و قووڕی بەهاریدا، لەکاتی «بخـۆ و بلەرزە»دا چوومە هەواری زەنوێر و سـازگار و چادر و ڕەشماڵم لەسـەر کانی سارد و زوڵاڵ هەڵداوە، لەبن چادر دانیشـتووم و خوناوەی بارانی نەرمم دیوە، مەڕم لەبێر داوە و لابێرم گرتووە و زۆر جاریش خۆم لەسەر بەردەبێر دانیشتووم و مەڕم بۆ شەنگەبێرییان گرتووە، هاوێرم کردووە و زاوەماکم لێ خوڕیوە، مەڕی نەبانم گرتووە و بەرخی مێچکەم مێژاندووە.

پاڵێنـان مەڕم لە بەندەنی فێنک هەڵکردووە، مەڕم لەوەڕاندووە و بەرخم چەلاندووە و لەبەر خۆمەوە بەیت و لاوک و حەیرانم گوتووە، لە نواڵەی بزوێن و زەمەند، مەڕم شیوەخوار داوە و لە حەوشـەی گـەرم و بانەگردا ڕام گرتووە و دەزبێنم گرتووە و سـەگم لە ورگی دزوچنۆک و دڕندە بەرداوە و گیانی ئاژەڵی ترسەنۆکی بێ ئازاری فەقیرم پاراستووە.

شـەوێنان بەبزووتنی مەڕی دەسـبێنی ڕاپەریوم و بەوریایی چ تاریکەشەو بووبێ و چ




مانگەشـــەو و تا مەڕ تێری خواردووە و کەوتۆتەوە بەدوایدا ڕۆیوم و پاش ســـەرخەوێکی خۆش وەک شـــوانێکی باش پێش گزنگی هەتاو مەڕم لەبـــەر ڕۆژێکی کاتۆر هەڵکردووە و چێشـــتاوێ لە دەراوێکی خاوێن چێشـــتانگاوم داوە و هەڵم کردۆتە بـــەر ڕۆژێکی باگر بۆ نووستن و سانەوە و خۆشم لەبەر سێبەری گابەردێک سەرخەوێکم شکاندووە. پاش ئەوەی مێگەلەکەم ساوەتەوە، بەرەو تاوڵ نێری کێشم کردووە.

ئەوە ژیانی من بوو لە کوردەواری. بەڕواڵەت ژیانێکی ســـاکار و خۆش بوو بەڵام وەک پەزەکانـــم قەت ترســـی گورگم لـــە زگ دەرنەدەچوو، چونکە جاروبار گورگە مێشـــەکانی خۆماڵـــی، گورگە برســـییەکانی بەرتیلخۆر، بەدفەڕ، پیاوکوژی ســـەردەمی تاغووتیان تێ بـــەردەدام و ئەوی خواردبووم لەبن ددانیان دەردێنام. ئاخری دەریان پەڕاندم و هێلانەیان لێ شـــێواندم، پەنام بردە بەر ئەوانەی کە گیانیان لەسەر بەری دانابوو، لەوێش نەسامەوە زۆرم ناپاڵم و ڕاکێت بەســـەر ســـەریدا باری، زۆرم خانووی ڕووخاو و گوندی سووتاو دین. گەلێکم تەرمی شەلاڵی خوێنی شەهیدان دیت و کڕووزەی هەتیوی بێ دایک و باب و شینی دایکی ڕۆڵە کوژراو و هەناسەی هەژاری لێقەوماو بیست، گرمەی تۆپ دایانچڵەکاندم، ویزەی گوللە لە پەسیوانی خزاندم.

لەو ماوەدا وەک حەریق دەڵێ: «گوند و شـــاری کوردســـتانی ئەودیو نەبوو نەیگەڕێم جا نازانم ســـەرم بەهەموو ماڵێکدا کردووە یا نا» لە سوونێ ڕا تا قەڵادزێ ڕاپەڕیوم و تێ هەڵبوومەوە بۆ بەرزاییەکانی پشـــت هێرۆ و داگەڕاومەوە بۆ لای ماوەت و شـــینکایەتی. لە سەرچاوەی زەڵم ئاوم خواردۆتەوە... (وا دیارە ئەم وتارە ناتەواوە).

## بووکی یەکشەوە

هەستا چووە دیوە تایبەتییەکەی خۆی، زوو جلە کوردییە جوانەکەی داکەند و جلی ئیدارەی لەبەر کرد تا بچێتە بیمارستان. دایکی خەریکی هەڵوێژاردنی دیوی بەر دەستان بوو کە دیتی، بەپێکەنینەوە گوتی:

- ئەیرۆ پەری بەو جلانەوە دەڵێی باڕۆکەی کلک کێشراوی!

پەری وەڵامی دایەوە:

- دایە بەو جلانەوە لە بیمارستان باشتر دەتوانم هەڵسووڕێم، دەنا لیباس ئازادە و دەتوانم بەجلی کوردیشەوە بچمە بیمارستان. دایە دەمەویست عەرزت بکەم ئەگەر ئێواری درەنگ هاتمەوە نیگەران مەبە و دنیات لێ نەبێتە چەرمی چۆلەکەی، خاترجەم بە، نە ون دەبم نە گورگ دەمخوا، لە ماڵە کاک شەهابی خۆمان بانگ کراوم نەهاری لەوێ دەخۆم و پاش نیوەڕۆ دێمەوە. ڕەنگە باپیریش بێتەوە. دوێنێ تەلەیفوونی لێ کردم و گوتی، کارەکەم تەواو بووە.

دایکی گوتی:

- ڕۆڵە گیان! برۆ بەخوا و پێغەمبەر و پیاوچاکانم ئەسپاردی. دەزانم نە گورگ دەتخوا و نە لەو شارە گچکەدا ون دەبی. بەڵام وڵاتەکەمان ئاڵۆز پڵۆز و هەرچی و پەرچییە. بەخوای تا دەگەڕێیەوە هەموو ڕۆژێ دڵم لە مستیدایە. ئەمما ڕۆڵە تۆ قەبرێکی بابت تێی




چووه هێنده نێرگس عەزیەت مەده، زۆرم خۆش دەوێ، ژنێکی سـەنگین و لەسـەرەخۆ و بێدەنگ و بەسـتەزمانە. سەری ماوێژه سەر، فەقیره، بەخۆیدا دەشکێتەوه و دڵی دێشێ، گوناحت دەگاتێ.

ـ دایه گیان ئەتۆ ئەو گێله دەبنەوه برەت نەناسیوه. بەقەستی له مەجلیسان خۆی وا نیشان دەدا، دەنا وەک ماری سوججه بەگژ ئێمەدا دێتەوه و گەزارەی نیو گەز دەردەکێشێ و شـورت و شـۆمان دەردێنێ و کارێکمان پێ دەکا با بەدەواری شـڕی ناکا. نازانی کاک شەهابی هەژاری چۆن کونده جەرگ کردووه؟

ـ کچێ ده مەیرێسـه ئەو ژنه فەقیره مێشی لەبەر دەمی نافڕێ چۆن بەری نێو نرکه و تەوس و لاتاوی دیل بیلان و چەختی وەک تۆ دەگرێ؟

ـ دایه گیان بۆ خۆت دەزانی له منداڵییەوه دەگەڵ نێرگسـی دەسـته خوشکم قەتمان دڵ له یەکتر نەیەشاوه. دەزانێ قسەکانی من هەمووی گاڵتەی دۆستانەی نێو خۆمانه دەنا ڕاست دەکەی نێرگس بەڕاستی ژنێکی چاک و دڵپاکه.

ئەوەی گوت و خودا حافیزی له دایکی کرد و ڕۆیشت. تا گەیشته دەرکی حەوشه دایکی له پەنجەرەوه تێی دەفکری و دەیگوت:

«دەک دایکت بەقوربانی ئەم گفتولفته خۆشـه، ئەم بەژن و باڵا بەرزه و ئەم ڕەوت و لەنجـه جوانه بێ. یاڕەبی ڕۆڵه ئەوەندەی منت لێ ڕازییه خوداش ئەوەندەت لێ ڕازی بێ. یا خوا ڕووسووری دنیا و قیامەت بی. بەبەختی چاک بی، دایکت مەرگت نەبینێ. خودایه شوکرانه بژێرم ئەگەر سوارەت وا زوو لێ ئەستاندمەوه، ئەم جووته گوڵه، ئەم کچ و کوڕه باشەت داومێ.

کاکه سـوارەی مێردی دێد ئەستی و باوکی پەری و باپیر، پیاوێکی باش، خێرەوەمەند، قسـەخۆش و تێگەیشـتوو بوو. ئەگەرچی نەخوێندەوار بوو، بەڵام بەقەد حەوت مەلایانی دەزانـی. چونکـه بۆ خۆی زۆر زرینگ و وریا بوو و هەمیشـەش وەختی بێکاری خۆی له حوجـرەی فەقێیان یا لـه خزمەت مەلایان ڕابواردبوو، تا له دێ بوو، زسـتانان هەر ئەو بانگی دەدا و قامەتی دەکرد. شـەوانەش بێ شـەوبوێر دەچۆوه حوجرەی فەقێیان و بەو دەنگـه خۆش و زوڵاڵەوه لاوک و حەیران و بەیت و باوی کۆنی بۆ دەگوتن و شـت لەوان فێـر دەبوو. بەیانیان پێش مجێور دەچۆوه مزگەوت، چرای هەڵدەکرد. کوورەی پێوه دەنا و بەرماڵی ڕادەخست و که نوێژ دەبوو بانگی دەدا. که جەماعەت سەفی دەبەست ئەویش قامەتی دەکرد.

کاک سوار دەوڵەمەندترین ئامپای ئاوەدانی بوو، بەڵام چڵکن دەوڵەمەند نەبوو، سەخی و بەدڵ و دەس بڵاو بوو، حەوتووی جارێک مامۆستا و فەقێکانی بانگهێشتن دەکرد. لە هەموو کارێکی خێردا پێشەنگ و پێشقەدەم بوو، کەیخودایەکی باش بوو، خەڵک ڕێزیان لێ دەگرت و قسەیان قەبووڵ دەکرد، کێشە و نێوان ناخۆشی ئاوماڵانی عادلانە جێبەجێ دەکرد. ئێرەیی بەکەس نەدەبرد.

کاک سوار هەمیشە خاوێنترین و باشترین کەوا و پانتۆڵی دەبەر دەکرد. مام وسووی برای بەسەر کشتوکاڵ و مەڕ و پاتاڵ ڕادەگەیشت و کاکە سوار کاری زۆر سووکی وەک پاراو و شتی وا نەبا چی نەدەکرد.

کاکە سوار پیاوێکی کەڵەگەت، بەشان و باهۆ و سوارچاک بوو. هەمیشە ئەسپ و ماینی زۆر ڕەسەن و باشی ڕادەگرت و لە جلیت و ڕمبازی و شەڕانخێویدا کەس نەیدەگەیاندێ. کە مەدرەسەیان لە گوندەکەیان دانا کوڕ و کچەکەی خۆی ناردە فێرگە. مودیری هان دەدا کە دەرس باش بڵێ و هێندەی ئیحترام دەگرت و چاکەی دەگەڵ دەکرد کە مودیر شەرمی دەکرد بەقسەی نەکا. منداڵەکانی زۆر زیرەک و هۆشیار بوون و چاکیان دەخوێند. ساڵی ١٣٤٧ کە «ئووەیسی» کوشتارگای لە جڵدیان دانا و مام وسووی بەستەزمانی بەتاوانی ئەوەی کە دەستەیەک چەکداری شەوێک لە تاوڵێ ڕاگرتبوو گرت و پاش چەند ڕۆژ تیرەبارانی کرد، کاکە سواریش مەڕ و پاتاڵ و ئەسپ و ماینەکانی فرۆشت و دەستی لە جووت و ئاژەڵداری هەڵگرت و لەنێو شار خانوویەکی گەورە و خۆشی دروست کرد و دووکانێکی بەققاڵی دانا. لەوێش لە خێر و چاکە و هاتووچۆی مەلا و فەقێیان کەمی نەکردەوە. هەر پێنج فەرزەی بەجەماعەت دەکرد. بەڵام دەستی لە گوتن هەڵگرت. دووکانەکەی بوو بەمەکۆی ئەدەبدۆستانی شار. ئەو کەسانەی ئاشقە ئەدەب بوون، ئێواران لە دووکانی کاکە سوار کۆ دەبوونەوە، ئەو نوکتەی شیرین و قسەی خۆشی بۆ دەگێڕانەوە و بەیت و لاوک و گەلۆ و حەیرانی فێر دەکردن ئەوانیش شێعری شاعیرەکانی کوردیان بۆ دەخوێندەوە. سەیر ئەوە بوو، ئەو پیاوە نەخوێندەوارە مانای زۆر بەرێوجێی لە شێعرە جوانەکان دەداوە و ڕەخنەی زانایانەی لە شێعری هێندێک شاعیر دەگرت کە بەڕاستی جێی سەرسوڕمان بوو.

کاک سوار تانوپۆی لە سەروپیش کەوتبوو. بەڵام هیچ شوێنەواری پیریی پێوە دیار نەبوو. دووکانەکەی زۆر بەرمێن بوو چونکە هەموو کەس تێ گەییبوو کە ڕاست و دروست و بێ فرۆفێڵ و هەرزان فرۆش و دەس خاوێنە. هەموو خەڵکی دێهاتی دەوروبەر و ڕووناکبیری شارەکەمان سەودایان هەر لەوێ دەکرد. کاکە سوار دەیگوت ڕاستە ئێعدامی مام وسوو پشتی شکاندم، ئەوەی ئەو لە کشتوکاڵ و مەڕداری دەیزانی من نەمدەزانی، بەڵام هۆی

دەس لە جووت و گا و ئاژەڵداری هەڵگرتنم ئەوەبوو کە بتوانم بەمنداڵەکانم بخوێنم تا پێ بگەن و تێ بگەن.

خوا هەڵناگرێ کچ و کوڕەکەشــی جگە لەوەی ئیســتیعدادی باشیان هەبوو چاکیشیان دەخوێند. تا ئینقلابی پیرۆزی ئێران دەســتی پێ کرد. هیچیان زۆر ناسراو نەبوون، بەڵام لە ســەروبەندی ئینقلابدا خۆیان دەرخست. بەتایبەتی پەری کە هەزاران شێعری حەماسی کوردیی لەبەر بوو. هەمیشە لە ڕیزی پێشەوەی خۆپیشاندان‌دا بوو و بەخوێندنەوەی شێعری شاعیرە شۆڕشگێڕەکانمان خەڵکی هان دەدا. دەنگخۆشی و زمان پاراوی لە باوکی بەمیرات گرتبوو. تۆڵەی مامیشی لەو ڕێژیمە بۆگەنە لەبیر نەچووبۆوە.

پــاش ئینقلاب بۆ درێــژەدان بەخوێندن چووە تــاران و بوو بە نێــرس و گەڕاوە بۆ شارەکەمان کە ژیان لێرەدا بێ مەترسیش نەبوو. بەڵام پەری خزمەتی خەڵکی بێ دەرەتان و هەژاری بەلاوە گرینگ بوو. لە بیمارستان کەس نەبوو دوعای بەخێری بۆ نەکا و خۆشی نەوێ، چونکە بەدەرد و مەرگی هەموو کەسەوە بوو.

باپیر ساڵێکی مابوو زانستگە تەواو بکا و ببێتە موهەندیس کە کاکە سوار لە بۆمبارانی شارەکەماندا لەبەر دەرکی مزگەوت شەهید کرا و خەڵکی شار بەتایبەتی کەسوکاری خۆی تازیەدار و ماتەمبار کرد.

بیســت دەقیقەی بۆ وەختی ئیداری مابوو کە پەری گەیشــتە بیمارســتان، حەوشەی بیمارســتان لە نەخــۆش و بریندارا‌ن ژاوەی دەهات. تەماشــای کرد جەندەکێک لەســەر دارەمەیت لەبەر دەرکی بیمارستان داندراوە، سڵاوێکی کرد و پرسی:

- ئەم جەندەکە چییە؟

پیاوێکی قەیرەلاو هاتە پێش و گوتی:

- بیلامانێ ئەوە خێزانی منە و لەســەر تەراکتۆر هەڵدێراوە و هەموو لەشی هاڕدراوە و بێ حاڵە.

پەری بزەی لەســەر لێــو نەما و بەکابرای گوت بیهێنــە ژوور بزانم چی لێ قەوماوە؟ بەچوار کەســان دارە مەیتەکەیــان هەڵگرت و بردیانە دیوی چاوەنــۆڕی دوکتۆر. لێفە و ســیپاڵەکانیان لێ کردەوە و لەســەر نیوە تەختێک ڕایان کێشــا. پەری تەماشای کرد و تێگەیشت بەحاڵ ماوە و بەزەحمەت پشووی دێ. لە مێردەکەی پرسی:

- ئەوە بۆ وای بەسەر هاتووە؟

- خانم گیان، دوێنێ ئێــوارێ بەتەراکتۆر دەچووینەوە، تەراکتۆرەکەم کەمێک چەپەی




کرد و ئەوەش وای بەسەرهات، بەنۆکەرت بم عیلاجێکی بکە. سێ منداڵی سەر و پێچکەم هەیە و کەسم نییە چاوەدێرییان بکا.

پەری لێوی خۆی گەست، بەڵام چی نەگوت. لەو حاڵەدا دوکتۆر هات و ئەویش چاوێکی لە بریندارە نیوە گیانەکە کرد و گوتی:

- زوو بیبەنە دیوی عەمەل.

پەری هاتەوە نێو خەڵک شەهابی پزشکیاری دەگەڵ بوو، گوتی:

- شـــوکور ئێوە چاکن و ئەوە کاک شـــەهاب تەماشـــاتان دەکا. ئەوەی زانی پێویستی بەموعاینـــەی دوکتۆرە ڕای دەگرێ و ئەوەی بۆی دەرمان کرا دەرمانی دەکا، دەبێ ببوورن ئەو ژنە حاڵی باش نییە و ڕەنگ بێ عەمەلی بوێ و وەختی دوکتۆر زۆر بگرێ.

پاش ســـەعاتێک پەری هاتەوە نێو خەڵک، بزەیەکی شیرینی لەسەر لێوان بوو، مێردی ژنە بریندارەکەی بانگ کرد و گوتی:

- مزگێنیم دەیە ژنەکەت لە مردن ڕزگاری هات و ڕەنگبێ پاش دە ڕۆژی دی بگەڕێتەوە ماڵێ. بەڵام کاکە گیان! ئەو دەمی کە لە ژیانی ژنەکەت دڵنیا نەبووم دڵم نەهات سەرکۆنەت بکەم. ئێســـتا کە شوکر مەترسي و نیگەرانیم نەماوە پێت دەڵێم تەراکتۆر بۆ زەوی کێڵان دروســـت کراوە نەک بۆ موسافیرکەشی. ئێوە تا کەی دەس لەو تەماعە هەڵناگرن و ژیانی خۆتان و خەڵکی دەخەنە مەترسییەوە.

کابـــرا زۆری دوعـــای خێر بۆ پەری کرد و بەڵێنی دا کە لەوەودوا موســـافیر ســـواری تەراکتۆر نەکا.

نیزیک ســـەعاتی سێ لە بیمارســـتان نەجاتیان هات و وێکڕا بەرەو ماڵی کاک شەهاب کە زۆر لە بیمارســـتان دوور بوو وەڕێ کەوتن. خوشـــکە نێرگس چارشـــێوەکەی لە خۆی وەرگرتبوو و چاوەڕوانی ئەوان بوو. کە نیزیک بوونەوە، خوشکە پەری بەدەست ئیشارەی بۆ کاک شەهاب کرد و ئەم شێعرەی بەدەنگێکی بەرز خوێندەوە:

هێنـــد مونتەزیـــری تـــۆ بـــوو هەتـــا چـــاوی ســـپی بـــوو
نێرگـــس کـــە لەســـەر یـــەک قـــەدەم و دیـــدە چەقیبـــوو

ئەم شێعرە ئەوەندە جوان و بەجێ بوو کە هەموویانی سەرەڕای ماندوویەتی و برسیایەتی وەپێکەنین خست. نێرگس چەمۆڵەیەکی لە پەری نا و گوتی:

- جەرگت ڕەش بێ کچەتیوە دەم هەراشە هەر دە قسەی زەلامت کردووە. خۆڵت وەتڕ و تیتۆڵان، بۆیە تەشک و داوێنت وا جوانە... پەری پێکەنی و گوتی:

- بەســی بڕێسە، وەرە پارووبەکمان نان بدەیە هەموو لە برسان لاترەی دەبەستین، بۆ خۆت تا ئێســـتا حەوت جەمت کردووە. ڕەنگە ئــەوەی خەزوبەز بێ بۆ خۆت لرفتێ دابێ. دەک نەوست دەبەر پێت کەوێ.

پاش ئەو شـــەڕە دندووکە کە چوونە ژوورێ، ئەوان دەستیان، دەستۆی یەک کرد وەک دە ســـاڵ بێ یەکتریان نەدیبێ کەوتنە ڕامووســـینی یەک. پاش ماوەیەک نێرگس ڕووی لە پەری کرد:

- باجە پەری توخوا ئەم شێعرە جوانە ئی کام شاعیرە؟... پێکەنی و گوتی:

- ئەگـــەر پێتان دەڵێم زیاتر موتاڵا بکەن بۆ ئەوەیە. ئەگەر کەمێک شـــارەزای ئەدەبی کوردی بای دەتزانی ئەم شێعرە جوانە ئی «نالی» شاعیری مەزن و بەناوبانگی کوردە.

تـــا نەهاریان کرد و پێکەوە بوون هەر لەســـەر شـــێعری کـــوردی دوان، هەموویان لە شـــارەزایی و شێعرناسی و زەوقی ئەدەبی ئەم کچە سەریان سوڕما، زەردەی هەتاو بەحاڵ لەســـەر ترۆپکی کێوە بەرزەکان مابوو کە خواحافیزی لە خوشـــکە نێرگس و کاک شەهاب کرد و لە حاڵێکدا هێشـــتا پەری گاڵتەی بەنێرگس دەکرد و ئەویش جوابە جەنگی دەکرد بەپێکەنینەوە لێک جوێ بوونەوە.

پەری کە گەیشـــتە بەردەرکی خۆیان و شـــوێنی تەگەرە ماشـــینی دی زانی کە ئەوە ماشـــینی خوازبێنیکەرانە کە موهەندیس پیرانی ناردوونیە ســـەر پەری. دوو مانگ لەوەی پێش موهەندیس کاغەزێکی بەئەدەب و جوانی بۆ پەری نوسیبوو و داوای لێ کردبوو ئەگەر پێی خۆش بێ دەنێرێتە سەری. پەری کە دووجار زیاتر موهەندیسی نەدیبوو لە وڵامدانەوە پەلەی نەکردبوو و کاغەزەکەی بەکاک شەهاب کە دەیزانی دۆستێکی باش و بەئەزموونیەتی نیشـــان دابوو. کاک شـــەهاب بێ ئەوەی ئەم ڕازە لەکن کەس بدرکێنێ تەحقیقی تەواوی لەسەر موهەندیس کردبوو و بۆی دەرکەوتبوو کە موهەندیسیش وەک پەری خەڵکی لادێیە و لەســـایەی وریایی و زانایی خۆیەوە بۆتە موهەندیســـی کشـــتوکاڵ و ماڵی باوکی هێشتا هەر لە گوندن و وەک خۆیان کرمانجن و لە هەموو بابەتەوە لایقی هاوسەری کچێکی وەک پەرییـــە و چەند ڕۆژ پێشـــتر وای کردبوو کە بەحزووری ئەو لـــە جێگایەک یەکتر ببینن و قســـەی خۆیان ڕووبەڕوو تەواو بکەن و هەردووک یەکتریان پەســـەند کردبوو و قەراریان دانابوو، لەو ڕۆژەدا دایک و پووری موهەندیس بچنە خوازبێنی و تامی زاری دێدئەســـتی و




موهەندیس باپیر بزانن. کاک شـــەهاب ئەو میوانییەی بەو مەبەستە کردبوو کە پەری ئەو ڕۆژە لە ماڵ نەبێ.

بەئەســـپایی دەرکەی کردەوە و چۆوە تەماشـــای کرد دایکی و خاڵە خدری و باپیر لە دیوی بەردەستان دانیشتبوون، خاڵە خدری پاش شەهیدبوونی باوکی بەسەر دووکانەکەیان ڕادەگەیشت کە وەژوور کەوت هەرسێک لە قاقای پێکەنینیان دا و دایکی گوتی:

- بیبی جان خانم چۆن کەڵەکی واشت لە بن سەریدان؟

پەری شـــەرمێکی کچانە دایگرت و ســـوور هەڵگەڕا و سەری داخست و یەکسەر چۆوە دیوەکـــەی خـــۆی و جلەکانی گۆڕین و بەخەیاڵ بوو ئەمشـــەو لـــە دیوەکەی خۆی وەدەر نەکەوێ. بەڵام زۆری پێ نەچوو دایکی هەرای کرد:

- پەری گیان! ماڵی بابم لەوێ بەتەنێ چ دەکەی وەرە ئێرە.

پەری بەشەرمەوە چۆوە دیوی بەردەستان و بەئەدەب دانیشت. دایکی گوتی:

- ڕۆڵەگیان دەتزانی ئەمڕۆ خوازبێنیکەر هاتبوونە سەرت؟

- بەڵێ دایە گیان ئاگام لێ بوو.

- وەڵڵا کچم دایکی ژنێکی وێچوو و کەیخودا ژنە، بۆ خۆشـــی کە هەر لە ماشـــیندا دیم زۆر قۆزە. جا نازانم بۆ خۆت دەڵێی چ؟ بەیانی دێنەوە تا جوابیان بدەینەوە. باپیر هەڵی دایە و گوتی:

- خوشـــکێ گیـــان! من پیرانی باش دەناســـم کوڕێکی زۆر بەئـــەدەب و پاک و چاکە، مەدرەکی تەحسیلاتی بەرزیشی هەیە، جا دڵی خۆت دەزانێ.

پەری لە بن لێوان گوتی:

- بۆ خۆتان دەزانن.

دایکی گوتی:

- ئەوە بۆ دەڵێی مانگی شـــەرمێتە. لە کەنگێوە وا شـــەرمێون بووی ڕەپ و ڕاست بڵێ مێردی پێ دەکەم و ڕزگارمان بکە.

هەموو پێکەنین و ئیدی باسی ئەو مەوزووعەیان نەکردەوە. چەند ڕۆژ پاش، باپیر، کاک شەهاب و چەند کەسی دیکەی بانگهێشتن کردبوو. لە پڕ مەلا و دوو فەقێ و پیرەپیاوێکی خاوێن و ڕەزا سووکی دێهاتی وەژوورکەوتن، یەکێک لە دوو فەقێیەکان دەفتەرێکی گەورەی لەبن هەنگڵدا بوو. لەبەریان هەســـتان، وەلای ســـەروویان خستن و لەسەر چۆک دانیشتن. مامۆستا سیغارێکی داگیرساند و ڕووی لە موهەندیس باپیر کرد و گوتی:

- ئاغا میرزا! مام سمایل بابی ئاغای پیرانییه و وەکالەتی شەرعی داوەتێ کە پەری خانم مارە بکا. ئێستا چ دەفەرمووی؟

باپیر گوتی:

- مامە گیان پڕ بەدڵ سوپاسێ دەکەم و ئێمە لە ئێوە هەر خزمایەتی گەرممان دەوێ و ئیحترامی خوشکم و هیچی دیکە.

کورتی ببڕینەوە، ئەوێ ڕۆژێ پەرییان لە موهەندیس پیرانی مارە کرد. چەند ڕۆژ پاشان خەنەبەندانێکی خۆش بوو. باو باوی نێرگس بوو. وەک کەوی شەڕانی پەڕبازێ لە دەوری پەری دەکرد و دابوویە بەر هێرشی لاتاو و تەوس و پللار. پەری دەستی لەبەر نەدەکردەوە، ڕۆژی پێنج شەمۆش هەموو لە ماڵی بووکی بوون. نێرگس وەک خولخولە هەڵدەسووڕا و پەزیرایی لە خەڵک دەکرد و جارجارە چەپۆکێکی بەپەریدا دەدا یا چەمۆڵەیەکی لێ دەنا و هەموویانی وەپێکەنین دەخست، لای بانگی شەوان تارای سووری جغ جغەداریان بەسەر پەری دادا و بووکیان سواری ماشین کرد و بەداب و دەستوورێکی کوردانە و موحتەرەمانە بەڕێیان کرد.

ئێوارەی جومعە بوو و ئیدارە نەبوو. لە ماڵێ دانیشتبووم و تەماشای تەلەویزیۆنم دەکرد. لە پڕ گرم و هۆڕ پەیدا بوو و تۆز و خۆڵ بەری ئاسمانی گرت. هەواپەیماکانی بەعسی شارە خونچیلانەکەیان دا بەر ڕاکێت و بۆمب. ئێمە بەپەلە خۆمان لە ژێرزەمین هاوێشت. هاڕە و زرمەی فڕۆکەی دوژمن و تەقەی دەسڕێژی دژی هەوایی خۆمان زراوی دەتۆقاند و گوێی کەڕ دەکرد. وەک ڕۆژی قەرەوەیس باب ئاگای لە کوڕی نەبوو. پاش نیو سەعات کە هاتمە دەر دووکەڵ‌شینکە لە هەموو لایەکی شار هەڵدەستا و لەبەر بۆنی باروت و تۆز و خۆڵ پشوو هەڵنەدەکێشرا. بەتاڵووکە خۆم گەیاندە ماڵی کاکە سوار. دیار بوو سەدەمەی نەدیبوو. بەڵام دەرکی داخرابوو، کەس لە ماڵ نەبوو. بەنێو خەڵکی سەرلێشێواو و چاو بەگریاندا بەغاردان چوومە ماڵە موهەندیس پیرانی. بەداخەوە خانووە تازە و جوانەکەی ئاداری بەسەر پادارەوە نەمابوو. کاک شەهاب و نێرگس و دێد ئەستی و باپیر، لە حاڵێکدا بانگ لەسەر بانگیان لێ دەدا، خەریکی لابردنی خشت و بەرد و گڵ بوون، منیش وەک ئەوان لە گابۆڕم دا و خەریکی کار بووم. وردە وردە خەڵک هاتە یارمەتیمان. لەلای نیوەشەودا جەنازەی زاوای تازە و بووکی یەکشەوەیان لەبن خاک و خۆڵ دەرێنا.

## هەواری خاڵی

شــەو ڕاشکابوو، موسەجەلەکەمان کاری دەکرد، شــریتەکە ئارام ئارام هەڵدەوێزندرا. گۆرانییە کوردییە خۆشەکانمان یەک لە دوای یەک دەبیستن. هەر من و ئەو بووین. کەسی دیکەمان بەدەورەوە نەبوو. پیرە مات و بێدەنگ بوو، چاوە لێڵ و سیسەکانی لێک نابوون، جگەرە لەنێو ئەنگوســتە ڕەق و تەقەکانیدا دووکەڵی دەکرد و بەخۆڕایی دەسووتا. دەنگی حەسەن زیرەک و خالەقی و مەلا حوسێنمان گوێ لێ بوو.

شریت گەیشتە سەر دەنگی «ماملێ» کە دەمزانی زۆری پێ خۆشە. کەچی لەپڕ وەک گوزێکیان ئاوی ســارد پێدا کردبێ. تێکڕا بوو، داچڵەکی چاوی هەڵبڕی، دەورووبەری خۆی بەســەرکردەوە و بەدەنگێکی نووســاو و لەرزۆک کە دەتگوت لە بنەبانی ئەشکەوتەوە دێ گوتی.

«کاکە بەسە تۆ خوا بێدەنگی بکە».

دەسبەجێ ئەنگوستم لەســەر دوگمەی موسەجەلەکە داگرت. بەڵام سەرم سوڕما و لە دڵی خۆمدا گوتم:

«یانی چی؟ بۆ وای بەســەرهات؟ بۆ ڕەنگی بزڕکا؟ بۆ پەشــۆکا؟ بۆ تکای لێ کردم موســەجەلەکە بکوژێنمەوە؟ خۆ ئەو دۆستی نیزیکی مامڵێیە، مامڵێی زۆر خۆش دەوێ و گۆرانییەکانی گەلێک پێ خۆشــن. جاران کە گۆرانییەکانی مامڵێمان لێ دەدا ســەرتاپای

دەبوو بەگوێ و مووی لێ نەدەبزووت، دەبوو ئێمەش ورتەمان لەبەر نەیەتەدەر، دەنا لێمان تووڕە دەبوو، دەیگوت: دەنگی زوڵاڵ و ئاسمانی ئەم هونەرمەندە خەمم دەڕەوێنێ، کوڵ و کۆم دادەمرکێنێ ئۆخژنم دەخاتە نێو دڵ و دەروون».

ئەدی چۆنە ئەمشەو گۆڕاوە؟ بۆ نایەوێ گوێی لە دەنگی ئەم خۆشخوانە مەزنە بێ؟

دوو مـــژی توندی لە جگەرەکـــە دا دووکەڵی بەزار و تفنکدا هاتەدەر، بەتووڕەیی لەژێر جگەرەکەیدا کوژاندیەوە و هەڵی پرواند. دیســـان مات بۆوە، هەناســـەیەکی سارد و درێژی هەڵکێشـــا، لێوی کرۆشت، دەســـتی وەبەر چەنەی دا و چاوی بێ ترووکان لە سووچێکی ژوورەکە بڕی خەمێکی قووڵ، ئازارێکی بێ ئامان و دەردێکی گرانی لە سیمادا بەدی دەکرا. وەک پیرە هەڵۆیەکی باڵ وەریوی چەنگ شـــکاوی لە ڕاو کەوتووم دەهاتە پێش چاو. وێ دەچـــوو بیر لە ڕۆژانی خـــۆش و هەڕەتی لاوەتی بکاتەوە کە تازە بەهیوا نییە بگەڕێتەوە. لەمێژ بوو هاودەم و هاودەنگ بووین، باشم دەناسی و دەمزانی ئەو کاتەی کۆنە برینەکانی دەکولێنەوە و ناسۆرەکانی تەشەنە دەبنەوە و ژان لە دەروونیدا پەنگ دەخواتەوە، تووشی ئەم حاڵە دەبێ و پێی خۆش نییە بیدوێنن.

جاری وا بەجێم دەهێشـــت، لێی دەگەڕام بەتەنـــێ لەنێو خەمەکانیدا بتلێتەوە و خۆی دەرمانێک بۆ دەردەکەی بدۆزێتەوە. بەڵام ئەمجارە لێم بوو بەوەسوەسە نەمدەزانی بۆ وای بەســـەرهات؟ دەمەویســـت هەرچۆنێ بێ لەم ڕازە بگەم، جگەرەیەکم بۆ داگیرساند و دامە دەستی.

بزەیەکی تاڵ لێوە وشک و بەبارەکانی لێک هەڵچڕین ئەم بزە غیرەتی لەبەر نام بڵێم:

«مامـــە گیان! پێم ســـەیرە ئەوە بـــۆ لە ماملێ زیـــز بووی، خۆ تۆ جـــاران ماملێت بەهونەرمەندێکی گەورە ناو دەبرد و گۆرانییەکانت زۆر پێ خۆش بوون».

کەمێک بەتووڕەییەوە گوتی:

«من لە ماملێ زیز بووم؟ نا ئەم تاقە گۆرانییەم پێ خۆش نییە».

گوتم: «نەکا هەوای گۆرانییەکە نارەسەن بێ».

- لەبیرم بوو دەگەڵ ئەو هەموو ڕێزەی بۆ ماملێ دادەنێ ڕەخنەشـــی لێ دەگرێ و پێی ناخۆشە جار جار هەوای نارەسەن دەڵێ کە مایەی مۆسیقای بێگانەیان پێوە دیارە.

زۆر جار دەیگوت چونکە ماملێ خۆشـــخوانێکی گەورە و بەناوبانگە و دەنگی داخوازی زۆرن و لاوەکان وەدووی دەکەون زیاتر لەو کەسانەی ناشیانە و نەزانانە ئەم کارەی دەکەن، بەڵام خەڵک پێشوازیان ناکا زیان لە مووزیکی نەتەوایەتیمان دەدا.

گوتی: «کارم بەڕەسـەنی و ناڕەسـەنی هەوایەکەی نەداوە، دەنگی ماملێم لە هەموو حاڵێکدا پێ خۆشـە، بەڵام تەعبیرێک لە شێعری سەربەندی گۆرانییەکەدا هەیە کە ئازارم دەدا و گەلێکم ئازار دەدا».

گوتـم کام تەعبیر؟ «دەمەویسـت بەوردبوونەوە لە تەعبیرەکـە ڕازەکە بدۆزمەوە و مەتەڵەکە هەڵێنم».

گوتـی: تەعبیری گەییمە هـەواری خاڵی. «ئەم تەعبیـرە بیرەوەریەکی کۆن و تاڵم دێنێتـەوە یاد، کە ڕابردنی ڕۆژگار و تاڵ و سـوێری ژیان تا ئێسـتا نەیتوانیوە ژیلەمۆی فەرامۆشی بەسەردا بکا».

هەوداکـەم هێندەی دیکە لێ ئاڵۆز بوو، دڵم هێندەی دیکە کەوتە خرت و پرت خوایە! دەبێ ئەم چەند وشـە سـاکارانە چ بیرەوەرییـەک بخەنەوە یادی ئەم پیـرە، زورهانە، ڕەنجەڕۆیە؟ کە لە ژیانی درێژ و پڕ مەترسـیی خۆیدا تووشـی کارەسـاتی گەلێک گەورە و گـران و ڕووداوی فـرە بەسـام و تاڵ هاتووە. زۆری ڕەنج و کوێـرەوەری و ئاوارەیی و دەربەدەری دیوە، سارد و گەرمی ڕۆژگاری چێشتووە و شەو و شەونخوونی کێشاوە و لەگژ بـەدکاران ڕۆچووە و لەبەر زۆرداران دای نەنواندووە و لەپێناوی ژیاندا زۆر جار تا لێواری گۆڕ ڕۆیشتووە. نەمدەوێرا بیهاروژێنم، لە خۆم ڕانەدەدی لێی پرسم، دڵنیا نەبووم وەڵامم دەداتەوە، کەم وابوو پرێسـکەی دڵی بۆ کەس بکاتەوە و ڕازە کۆنەکانی بدرکێنێ، ناچار بێدەنگ بووم و چاوم لە سەروسـیمای پیاوانە و پیرانە بڕی، ئەویش کڕ و مات بوو. دیار بوو دەریای دەروونی شەپۆلان دەدا و کوورەی لە جۆشی هەناوی ئاورینگان داوێ.

پاش ماوەیەک بێدەنگی شـریتەکەم لەدوو دا تـا گۆرانییەکی دیکەی ماملێم دۆزیەوە، دەنگم دایە، پیرە هۆشـی هاتەوە بەرخۆی، سـوورایی خۆشی و شادی لە کوڵمە سیس و چرچ و بێ ڕەنگەکانیدا پەیدا بوو. بەتاسـەوە گوێی بۆ گۆرانییەکە هەڵخسـت تا تەواو بوو.

بەزەردەخەنەوە گوتی:

«برا تۆ ئەوەم بۆ لێدە بزانە پێم خۆشە یا نا؟»

هەسـتا خەریک بوو بڕوا بەڕوو هەڵماڵاوی پێشـم لێ گرت و گوتم: «پێت نەگوتم ئەم گۆرانییە چ بیرەوەرییەکت دەخاتەوە یاد و ئەوەندەت ئازار دەدا؟»

چـرژا، لێوی لەرزین، نێوچاوانی گرژکرد و گوتی: «لـەم دنیا پان و بەرینەدا هەموو کەس هێندێکی ڕازی ئەوتۆ لە سینەدا هەن کە بۆ نیزیکترین کەسیان ناگێڕێتەوە و دەگەڵ

خۆیان دەباتە ژێر گڵ. ئەم ڕازەی منیش لەوانەیە، تا ئێستا کەس لێی نەبیستووم. تۆش بیزانی چ قازانجت پێ ناگا و نەیزانی چ زیانت لێ ناکەوێ».

زانیم زۆر قەڵس نییە، بۆیە گوتم:

«نازانم بۆ ئەوەندەم پێ خۆشــە لەو ڕازە بگەم، بــەڵام ئەگەر درکاندنی زیانی بۆ تۆ هەبێ گرنەت لێ ناگرم».

زۆر توند کۆکی، دەستی بەسنگەوە گرت و دانیشتەوە و گوتی:

«پیــاو واز ناهێنـــێ، لە کۆڵم نابیتەوە، دەوەرە بۆت بگێڕمەوە: ئەو ســـەردەمەی من لە تافی لاوەتیدا بووم، هێشــتا شــەڕی دووەمی جیهانی نەقەوما بــوو. دنیا ئەو هەموو ئاڵوگۆڕەی بەسەردا نەهاتبوو، ژیان زۆر ساکارتر بوو بەتایبەتی وڵاتەکەی ئێمە لە ئێستاش پاشکەوتووتر بوو. هیچ شارێکی کوردستان بەرق و کارەبای نەبوو، هێشتا لە دێهات چرای ڕۆن گەرچــەک و چۆڵە چرا مابوون و ئاگر بەبەرد و ئەســتێ هەڵدەکرا. هەرچەند تاک و تووک ئۆتۆمبێل بەڕێگا ناخۆش و ناهەموارەکانیدا ڕابردن. بەڵام هێشــتا باشــترین ماڵی سواری ئەسپ بوو. شازدە، حەڤدە ساڵە بووم کە دەستم لە خوێندن هەڵگرت و چوومەوە دێ. باوکم ئەسپێکی زۆر جوان و باش و تفەنگێکی ڕاویی دامێ، وەک هەموو دنیام هەبێ وا بوو، زۆرم شایی بەخۆ بوو.

هەموو ڕۆژێ بەیانی زوو سوار دەبووم و بەدەشت و مەزرادا دەگەڕام، پاش نیوەڕۆیانیش دەستم دەدایە تفەنگ و دەچوومە ڕاو.

پایز داهات کاروبار لە کەمێی دا، ڕاو خۆشــتر بوو، ڕۆژێک پیرە ڕاوکەرێک پێی گوتم کەو ڕەو دەســتی پێ کردووە، کەوێکـــی زۆری تەرەکەمە لە فلان کێو کۆبوونەوە کە هەم ماندوون و هەم ناشــارەزا ڕاویان خۆشــە و کوشتنیان هاســانە، ئەگەر زوو لێیان وەخۆ نەکــەوی، بــەرەو گەرمێن دەڕۆن و لە کیس دەچن. بەیانی دەســتم دا تفەنگ و لە لاقانم وەرێنا و خۆم گەیاندە چیا. ڕاستی دەکرد وەک خیز و خۆڵی کەو لێ بوو، هەرچەن ناشی بووم و ڕاوم نەدەزانی و باشم نەدەنگاوت، دیسان زۆرم کوشت. ئێوارێ ماندوو و شەکەت، بەڵام شــاد و بەکەیف بەرەو مــاڵ بوومەوە یەکەم جار بوو توورەکــەی ڕاوێم ئەوەندەی نێچیر تێدابێ، لام دا سەر کانیاوێک کەمێک بحەسێمەوە. تەماشام کرد ڕەشماڵێکی گەورە لەسەرچاوە کانیەکە هەڵدراوە. ڕێگام بەبەر دەرکی تاوڵەکەدا بوو، دیتم کیژێکی باڵابەرزی، بەژن باریکی، گەندومی کوڵمە ســوور، چاو و برۆ ڕەش و کەزێ شــۆڕی زۆر جوان و ڕەزا ســووک لەبەر دەرکی چادر ڕاوەستاوە و تەشـــی دەڕێسێ. لێی نیزیک بوومەوە، بەڕاستی

حەپەســـام و پێم لە بەند چوون، بەشــــەرمەوە سڵاوم لێ کرد. لام وابوو جوابم ناداتەوە و خۆی لە ژووری داوێ. کەچی بەڕووخۆشـــی جوابی دامەوە، بەگەرمی بەخێرهاتنی کردم و گوتی: فەرموو لادە چامان سازە پیاڵەیەک چا بخۆوە. گوتم: ڕۆژم لێ درەنگە، ناگەمەوە، بەزیـــاد بێ. بەڵام لە دڵی خۆمدا زۆرم پێ خۆش بـــوو لادەم و هیچ نەبێ تاوێک لە بەژن و باڵا و ڕەنگ و ڕووی ئەم کیژە ناســـک و نازدار و شـــۆخ و لەبارە بفکرم، کە هەر ئەمجار چـــاوم پێ کەوتـــووە و نازانم خەڵکی کوێیە و کچی کێیە؟ خەریـــک بووم بڕۆم و تێپەڕم دەستی بەسوێندان کرد و گوتی: نابێ بڕۆی. چوومە ژوور لە لامێردانی، لێفەیەکی خاوێنی بۆ لەســـەر لبادان ڕاخســـتم. چووە کولێنێ هێندەی فووی لـــە قەننەی کەی کەوڵێک نان و جامێک شـــیرێژ و ڕۆن و تاســـێک دۆی ترشی ســـاردی لەپێش دانام. بۆ خۆشی شانی وە دیرەگی تاوڵێ دا و ڕاوەســـتا. تا پتری تێ دەفکریم زیاترم پێ جوان بوو نەمدەتوانی چاوی لێ بترووکێنم. ئەویش چاوی لە من نەدەترووکان، گوتم بۆ ڕاوەســـتاوی دانیشە. بێ پەروایانە زۆر لە نیزیکم دانیشـــت، ئەو لە من باو خۆشـــتر بوو، ڕەنگبوو یەک دوو ساڵ لە مـــن بەتەمەنتر بێ، ئەو گەورە کچ بوو و من مێرمنداڵ، دیاربوو لە دڵداریشـــدا ئەزموونی زیاترە. وردە وردە، شـــەرمم شـــکا و لێم پرســـی: ناوت چییە؟ کچی کێی؟ بەڕاشکاوی و بەدەنگێکی ســـیحراوی گوتی: ناوم هەمینە، کچی پیاوێکی مەڕداری دەوڵەمەند بووماڵیان ڕێـــگای چـــوار ڕۆژی کاروانێ لێرەوە دوور بوو بەدوای لەوەڕگـــەدا گەیبوونە ئێرە. گوتی: چوار بێریم دەگەڵن ناردوومنە ئاوردووان. خۆم پێ ڕانەگیرا گوتم: خۆشم دەوێی. بەنازەوە پێکەنـــی و گوتی ئەیەڕۆ! (کەنگر و قوماش نابنە وێڵداش). کورتی ببڕمەوە لە ماوەیەکی کورتدا نامۆییمان لە نێواندا نەما.

بەڵێنی پێدام هەموو ڕۆژێ پاڵێنی بۆم بێتە بن بەردێک کە لەودیوی چادرەکەیان بوو. هەموو ڕۆژێ بێ نێوبڕ بەبیانووی ڕاو دەچووم یا باشتر بڵێم دەفڕیم بۆ ژوانگەکەمان. هەموو جارێ کە دەچووم ئەو لەوێندەرێ چاوەنوارم بوو. بەهیچ زمانێک ناتوانم خۆشـــی و شادی ئەو ماوەت بۆ بگێڕمەوە کە پێکەوە ڕامانبوارد. بەڵام خۆشـــترین دڵداریم بووە. ڕۆژێکیان بەعادەتی ڕۆژان دەستم دا تفەنگ و لە بەندەن هەڵبووم. هەوراز و سەربەرەژێرم نەدەزانی. وەک بـــا دەفڕیم، دەمەویســـت زووتر بگەمە جێ ژوان، دەمەویســـت زووتر چاوم بەچاوی (هەمین) بکەوێتەوە، دەمەویســـت لەشە نەرم و گەرم و گوڕەکەی لە ئامێز بگرم. چاو لە چاوە جوانەکانی ببڕم. لێوە، ناســـک و ئاڵەکانی بمژم. مەمکە تورت و خڕەکانی بگوشـــم. دەمەویست گوێم لە دەنگە خۆش و ناسک و خەمڕەوێنەکەی بێ. خۆی بەقوربان و سەدەقە بکەم هەرچەن زۆر نیزیک نەبوو. بەڵام زۆر زوو خۆم گەیاندێ. پشـــووم ســـواربوو هەناسە

بڕکەم گەیشتیٚ. چوومە بن بەردەکە کەسی لیٚ نەبوو دڵم داخورپا، بۆ نەهاتووە؟ بۆ دیار نییە؟ لێم نەتۆرابیٚ؟ نا نا دوێنیٚ بەخۆشــی لێک جویٚ بووینەوە. ئاگام لیٚ بوو تا ئاوابوو چەند ئاوڕی ئاسکانەی لیٚ دامەوە. باوکی بەکەین و بەینەکەی نەزانیبیٚ؟ ئەو پرسیارانم لە خۆم دەکرد و وەڵامێکم بۆ نەدەدۆزرایەوە، دەتگوت: لەســەر پۆلان دانیشتبووم، حەجمینم لیٚ هەڵگیرا، ئۆقرەم لیٚ بڕا چیدی خۆم بۆ زەوت نەکرا. بەســینگە خشــکە لە بســتۆکە ئاوابووم، ئەودەمی زانیم چم لیٚ قەوماوە؟ ڕەشماڵ لە جێی خۆی نەمابوو داگەڕام بۆ جیٚ هەوارەکەی، لەویٚ دانیشــتم. لێت ناشــارمەوە تێر و پڕ گریام و شینێکی باشم گێڕا، قەت هەمینم نەدیتەوە. نازانم ماوە یا مردووە؟ ئەگەر مابیٚ دەبیٚ ئەویش وەک من پیر و کەنفت بوویٚ، بەڵام هەرگیز فەرامۆشــم نەکردووە و ئێســتاش لە خەیاڵدا وەک کچە جوانەکەی ئەودەمیم دێتە پێش چاو. ناتوانم بەخۆمی بســەلمێنم پیربووە و پیری دزێو و ناشــیرینی کردووە. سی ساڵ بەسەر ئەو ڕۆژەدا ڕابواردووە. منیش دنیام زۆر قوونەکەو کردووە و لە تاڵی و ناخۆشــییان ڕاهاتووم و ڕۆژگار خاڕاندوومی. بەڵام هەرچەن جارێک بەسەر هەواری خاڵیدا کەوتووم بەخۆم نەبووە گریاوم». مامە پیرە هەستا بڕوا لە حاڵێکدا کە گریانی لە ئەوکی گیرابوو و فرمێسکی لە چاواندا قەتیس مابوون، چەند هەنگاوێک ڕۆیشت و ئاوڕێکی لیٚ دامەوە و گوتی: «بۆیە گوتم ئەم گۆرانییە لیٚ مەدە!»

## مەهاباد

لەوەتی تووشــی ئاوارەیی بووم، لەوەتی وڵاتی خۆشەویســتی خۆم بەجێ هێشتووە، لەوەتی لە یار و دیار و کەســوکاری خۆم هەڵبڕاوم. هەموو ئێوارەیەک بێ نێوبڕ خەمێکی گران، ئاوازێکی بێ ئامان و ژان و برکێکی بێ دەرمان، ڕوو لە دڵ و دەروونم دەکا، ئۆقرەم لێ هەڵدەگرێ، ئارامم پێ ناهێڵێ و بڕستم لێ دەبڕێ.

ناتوانم لە ژووریێ دانیشــم، پێــم خۆش نییە کەس بەدەورمەوە بــێ، حەز بەتەنیایی دەکەم، بێدەنگیم پێ خۆشــە، پێم خۆشــە ماوەیەک دەگەڵ خۆم، دەگەڵ هەســتی خۆم ڕایبوێرم. هەور بێ یا ســاماڵ، گەرم بێ یا ســارد، خۆش بێ یا ناخۆش وەدەردەکەوم. کەمێک بەپێیان دەگەڕێم و بیردەکەمەوە. خۆ ئەگەر بتوانم لە ئاوەدانی وەدەربکەوم، کە لە گوێی کەنداڵێک، لەدەم ڕووبارێک، لەسەر بەردێک، لەبن دارێک دانیشم و لە ئاسۆ ڕامێنم، زۆر زوو سووک دەبم و دڵم دەکرێتەوە و جاری وایە هەست بەشادیش دەکەم.

لەم ڕۆژانەدا وەک هەموو ڕۆژێک پەژارە ســواری شــانم بوو، خەفــەت دایگرتم، ئازار هێرشــی بۆ هێنام، حەجمینم لێ هەڵگیرا و ناچار بووم وەدەرکەوتم. هەوا نەرم و خۆش بوو، لە ئاســمانی ســاوی زســتانیدا پەڵەهەورێکی پچووکیش بەدی نەدەکرا. هەتاوی بێ تیشــک و تین وەک تەشــتێکی پڕ لە خوێن لە ئاســۆیەکی دوورە دەست بەرەو ئاوابوون دەچوو. کێ دەزانێ ئەمڕۆ لەو دنیا پڕ شەڕ و کێشەدا خوێنی ڕژاوی چەند کەسی بێ تاوانی دیوە وناڵەی چەند بریندارى بەجێماوی بیستووە؟




جگەرەیەکم داگیرساند. بەجادەدا ڕۆیشتم. ئەوەندەی با نەدەهات دووکەڵی سیغارەکەم داڕفێنێ و گەڵای دارەکانی ئەم بەر و ئەوبەری جادەکە ببزوێنێ. لام دا کۆڵانێک کە لە جادەکە ڕاستتر و ئارامتر و بێدەنگتر بوو. چەن ژن بەجلی ماڵێوە لەبەر دەرکێک لێک هاڵابوون، هەژدەر هەژدەر قسەیان دەکرد، قاقا پێ دەکەنین. بەکێ؟ بەچی؟ بۆچی؟ نازانم بەڵام خۆ هەموو کەس وەک من ئێواران خەمبار نییە. تا پتر هەڵدەکشام بێدەنگی زیاتر دەبوو.

سەگێکی گەڕۆکی، وریا و قووت و ڕەوەک کلکی لە گەڵۆزی گرتبوو، مڵ و مۆی دەکرد. قەپە کۆڵێکی گەورە لەولاتر لەسەر چینچەکان هەڵترووشکا بوو، گوێی خشت بڕابوون پیر و کەنەفت بوو، لەبەر لاوازی هەموو پەراسووی دەبژێران، لەمبۆزی بۆزی و بناگوێ و نێوچاوانی شوێنی کەڵپ و کۆنە برینانی پێوە بوو، دیاربوو ڕۆژگارێک دڕ و شەڕانی بووە. دێڵە بەبای لە گەماڵان بڕیوەتەوە، بەچی مەعلووم گورگی نەخنکاندووە، هێلکە و ڕۆن و کولیچەی نەخواردووە و خۆشەویستی خاوەنەکەی نەبووە؟ بەڵام کە ڕەو کەوتووە و کەلاکی داوە، ئینسان، ئینسانی بێ وەفا، بەرەڵڵای کردووە!

چاوە پرووشکەکانی لەسەر یەک دانابوون، دەتگوت بیر لە سەردەمی گوجووکی و جحێڵی و خۆشەویستی و بەدەسەڵاتی خۆی دەکاتەوە. تێی ڕامام، زگم پێی سووتا، خەمی ئەویش بوو بەسەر باری خەمانم. ژنێک لە پێچی کووچەیەک وەدەرکەوت، ژنێکی شۆخ و شەنگ و جوان و چەلەنگ و کۆک و پۆشتە، قژ زەرد و چاوکاڵ و سوور و سپی و ڕوومەت پان، باڵابەرز و بەژن باریک، مەمکە خڕەکانی، بلووزە تەنگ و تەنکەکەی هەڵدا بوو، بەلەنجەولار دەڕۆیشت ئەو هیچ ئاوڕی وەمن نەدەدا. بەڵام من چاوێکی کڕیارانەم بەسەرتاپای داگێڕا، هیچ ئەندامی لەشیم نەبوارد. دەڵێن «بەندەی بێ عەیب نییە» بەڵام من نەمتوانی هیچ عەیبانی لێ بگرم. دەرفەتم هەبوو تێی فکرم، من لە ڕێیندا پەلە ناکەم، دەگەڵ ئەوەشدا ئەو نەیدەتوانی جێم بێڵێ. چونکە دەستی کچێکی پچووکی زۆر ڕەزا سووک و ژیکەڵە و پاک و خاوێنی بەدەستەوە بوو و پێ بەپێی ئەو دەڕۆیشت.

پشیلەیەکی سووربەڵەکی کوڵکن و قەڵەو لە ماڵێک هاتەدەر. دیاربوو خۆشەویستی کابانە، تێروتەسەلە، جێی گەرمە و پارووی نەرمە. کلکی قەف کردبوو، بەفیزەوە ڕاوەستا لووتی بەرزکردەوە. لە پڕ کچەکە دەستی ژنە جوانەکەی بەردا و ڕای کردێ. پشیلە نەبزووت، دەیزانی، پەنجە نەرم و نۆڵەکانی ئەم کیژە ئازاری نادەن.

ژنەکە وەپەلەکەوت، بەدەنگێکی زۆر ناسک و خۆش هاواری کرد، ناوێکی ئەوەندە




خۆش و پیرۆز یا هیچ نەبێ بەلای منەوە، خۆش و پیرۆزی بەزار داهات کە وەک برووسکە لێم بدا لە جێی خۆم وشـــک بووم. بەچاوترووکانێک نیزیکەی نیو چەرخی ژیانم، ژیانی پڕ تاڵی و سوێری، پڕ ل ڕەنج و کوێرەوەری، پڕ هەوراز و نشێوی خۆم وەبیرهاتەوە.

(گوێم بەهەڵە نەبیبیســـت؟) ئەمە پرســـیارێک بوو لە خۆم کرد. بەڵام شـــۆڕە ژنەکە نەیهێشـــت چیـــدی دوودڵ بم. هەرای کـــرد: «مەهاباد ڕۆڵە مەچـــۆ دەتڕنێ!» ئیتر خۆم پێ ڕانەگیرا، وەک شـــێتان ڕام کرد. پشـــیلەکە لەبەر من هەڵات، کچەکەم لە ئامێز گرت و تێر تێرم ماچ کرد. باش بوو ئەم فریشـــتە پاکە لێم نەترســـا و نەگریا بەسەیرەوە چاوە جوانەکانی لە چاوم بڕی. دایکی بەزەردەخەنەیەکی پەرییانەوە لێم نیزیک بۆوە باوەشی بۆ کچەکە کردەوە، پێی گوت: «شـــەیتان»؛ ئەمجار بەزمانی خەڵکی شارەکە سوپاسی منی کرد، بەکوردی گوتم: «من سوپاسی تۆ دەکەم کە ناوی وا شیرینت لە کچەکەت ناوە».

ئیتر ئەو پیاوە پیرە هەوەسبازەی چەن دەقیقە لەوەی پێش نەبووم، بوومەوە ئەو لاوە تازە پێگەیشـــتووەی سی ساڵ پێش کە ســـۆفیگەری سیاسیم دەکرد، کە بەچاوی برایانە تەماشـــای هەموو کچە کوردێکم دەکرد. ئیدی بەچاوی هەوەس تەماشای ئەم ژنە جوانەم نەدەکـــرد و وەک خوشـــکی خۆم دەهاتـــە پێش چاو. حەیف ئەو نەیهێشـــت زۆر بەپاکی بمێنمەوە وەک هەموو ژنێکی بەپرســـیار لێی پرسیم: «مامە خەڵکی کوێی» بەدرۆ جوابم داوە. درۆکەم هیچ زیانی بۆ ئەو نەبوو. بەهاســـانی بڕوای کرد بەڵام من پێم خۆش نەبوو لەم دەمەدا درۆم بەزار دابێ و پاکییەکەم گەردی لێ بنیشـــێ، چەن هەنگاوی تر پێکەوە ڕۆیشتین دەرکێکی کردەوە.

- نافەرمووی؟
- ئاوەدان بێ.
- خوا حافیز.
- بەخێرچی.

ئەو چۆوە ژوورێ، منیش ڕێی خۆم گرت چوومە بن ئەو دارەی کە زۆر ئێوارەی تریش لـــە بنی دانیشـــتووم. ئەم دارەی لە دوور وڵات بۆ من بۆتە «ســـنگ صبـــور» و زۆر جار پرێســـکەی دڵم لەبن کردۆتەوە. ئەم دۆســـتە بێ زمانەی ئاگای لە زۆر ڕاز و نهێنی ژیانی ئاوارەیی من هەیە و دڵنیام کە کەس لێی نابیستێ.

جگەرەیەکی دیکەشـــەم داگیرســـاند. مژێکی توندم لێدا و کەوتمە نێو دەریای خەیاڵ. مەهابادە بچکۆلانەکەی دەمێ دیم وەبیرهاتەوە، خەیاڵم زۆر بەئەو نەگیرســـاوە. چووە بۆ

لای شاری مەهاباد. ئەو شارە خۆشەویستەی کە نیشتمانپەروەرانی کورد تەنانەت لە وڵاتی غەریبیش کچی بەناو دەکەن. ئەو شارەی نیزیکەی پەنجا ساڵی تەمەنم لەوێ و لە دەوروبەری ڕابواردووە، ئەو شارەی شارەزای هەموو کووچە و سیلە و پەسیوێکی ویم. ئەو شارەی کە زۆر ڕۆژی خۆشم تێدا کردووە بەشەو و زۆر شەوی تاڵم تێدا کردووە بەڕۆژ.

سەرم بەماڵە هەموو خزمەکانمدا کرد. سەری هەموو دۆست و ئاشناکانم دا، هەموو شوێنە بەناوبانگەکانی شار گەڕام. گومبەزان، دەشتی عەلی ئاباد، کانی مام قەمبەران، تەپکی گڕاوان، تاقەدار، باغی سیسە و سێ ئاشانم وەک خۆیان هاتە بەرچاو.

کە ڕوانیمە خەزایی بەخەیاڵ لە بن ئەم تاقەدارە فڕیم و لە بن تاقەدارە پیرەکەی مەحموود کانی نیشتمەوە. لەپڕ شتێکم وەبیرهاتەوە کە لەمێژ ساڵە نەلێی دەترسم و نەبیری لێ دەکەمەوە. «مردن!» ئەو شتەی پیاوە هەرە ئازاکان لێی تۆقیون. ئارەزووم کرد پاش مردن لە بن ئەم دارە بنێژرێم.

هەودای خەیاڵم پسا، هاتمەوە سەرەخۆ، بەخۆمدا شکامەوە، ڕەخنەم لەخۆم گرت و گوتم: «ئەمە چ ئاواتێکە مەگەر ئەتۆ نەبووی دەتگوت پاش مردن پیاو هەر چۆنێک بنێژرێ و لەهەر جێگایەک بشاردرێتەوە فەرق ناکا. تەنانەت دەتگوت هەق نییە مردوو زەوی لە زیندووان داگیر بکا. ئەگەر لەباتی هەر مردوویێک نەمامێک بنێژرێ و کەلاکی مردووەکە بسووتێنرێ و خۆڵەمێشەکە لەبن نەمامەکە بکرێ تا پێی بەقەوەت بێ خزمەتی مرۆڤایەتی زیاتر تێدایە».

جوابی خۆم داوە:

«ڕاستە من وام گوتووە و ئێستاش پاش ئەوەی بەلێرەوارەکانی کوردستاندا گەڕاوم و ئەم ڕاستییەم بۆ ڕوون بۆتەوە کە بەداخەوە مردووەکان لە زیندووەکان باشتر دارستانەکانمان بۆ دەپارێزن، دیسان لەسەر بڕوای خۆم هەر ماوم. بەڵام ئەم ئاواتەشەم هەیە. پاش مردن خۆڵەمێشی من دەبن داری مەحموود کانی بکرێ تا بەخۆڵەمێشی من ئەم دارە بەقەوەت بێ کە کەس نازانێ چەن ساڵە بەقەدی کێوە ڕووتنەکەی خەزاییوە دیارە؟»



# له ڕۆژێکی پایزیدا

بۆ مامۆستا شڵماشی

پایزه ســـارده، ڕەشـــەبای پایز وەک قەدیمیان گوتوویانە چ بەسەر دەواری شڕ دێنێ!
وەک هەمیشە باری سەفەر دەبەستم، توورەکەیەک پڕ لە کاغەز و قەڵەم و دوو سێ نان...
کوڕگەل پێم دەڵێن نەوســـن، وەک پیرەمێرد کە لێی دەگێڕنەوە هەمیشـــە بابۆڵەی نان و کەبابـــی لە گیرفاندا بووە. منیـــش لە دەرەوە بابۆڵەی نان و پەنیرم لە گەڵدایە و گەرچی دەزانم هێندێک دوورتر، لە لادێ، دەرگای هەر ماڵێک بکەیەوە پێڵاوت لەسەر چاوی خاوەن ماڵە. نانی گەرم و پەنیر، یان ماســـت و هەر خواردەمەنییێکی دی کە شک بەرن لە میوان شاردراوە نییە.

خەڵکی ئێمە دەڵێن میوان حەبیبی خوایە و تەنانەت هێندێکیش لەســـەر ئەو بڕوایەن ئێستا میوان دانەبەزیوە، ڕۆژی ئەو لەلایەن پەروەردگارەوە هاتۆتە ماڵەکەوە. دوای هێندێک ڕێ ڕۆیشـــتن، چەند لاپەســـێو و هەوراز و نشـــێوێک و دیتنی ڕوانگەی سروشت و دیمەنی جوانی ئاو هەوەڵین قۆناغم گوندێکە کە خۆم ناوم ناوە مەڵبەندی ئازایان. (شڵماش) بەڵێ شڵماش. لە داوێنی زنجیرە چیای هومل چەند ڕەشماڵ لە پەنا یەک دان و هێندێکیش جیا لـــە یەک، وێنەی گوندەکانی لێک بڵاوی هۆڵەند و دانمارک و بێروت. لەگەڵ خەڵکێکی ئازا و نەبەزیو و هەوڵدەر، ســـاڵ دوانزەی مانگ لە هەوڵ و تێکۆشـــاندان. لە هۆڵەند و پاریس




و لبنان و وارشەو، هەرچی شوێنی جوان و بەدیمەنە بۆم مەڵێن! کە دڵگیر دەبم، چونکە شڵماش لە سەرووی هەمووانە و لە هەمووی ئەوانە جوان و ڕازاوەتر و بەدیمەنترە.

لەوانەیە هێندێک کەس بەوە تاوانبارم دەکەن کە لە نووسین زیادەڕەویم کردووە و وەک دەڵێن قەڵەم لە دەســتی دوژمنداوە، بەڵام من بۆ ئیســپاتی ئەو داوایەم چەند شاهیدێکم هەن، کە یەکێک لەوانە بولبولێکی مەهجورە و بەداخەوە ئێستا دەستم پێ ناگا ئەو ئێستا لەگەڵ هێندێک لە یاران لە وڵاتی غوربەت دایە... چاوەڕوانی ڕۆژێکە ئەو سەرماوسـۆڵ و ڕەشەبایە لەعنەتییە لە وڵات بارکا و سڕ سیپاڵی تێک نێ و بۆ ئەبەد لەو وڵاتە گۆڕی گوم بێ، ئاخر ئەو پەروەردەی ئەو خاکە جوانەیە.

ئەو بولبولە دەنگ خۆشـە لە (ســەربانە و سابنێ و هۆمەرە و دارنیشان و چۆم پەمۆ) لەگەڵ گوڵاندا هاوئامێز و دەس لە مل بووە و ئەغیار وەک گورگی چاوبرسی بەغیلیان پێ بردووە، وەک بۆ خۆی پێی لێ ناوە لە (سەربانە) زۆر خۆشی ڕابواردووە.

لــەو بولبولــە دوور وڵاتە کە بگوزەرێین، ئەو باڵندانە کە لە کاتی گەڕانەوە بۆ گەرمێن بەسەر شڵماشدا تێ دەپەڕن شاهیدن. سەرقافڵەکەیان وەچانێک دەگرێ و هاواری هاواڵەکانی دەکا و دەڵێ: نیوەی ژیانی ئێمە لە سیاکێو بەفیڕۆ چووە، هاواڵان دەڵێن بۆچی، سەرقافڵە دەڵێ ســەردانەوێنن و تەماشــایێکی خوارەوە کەن و ئەو دیمەنە جوان و ڕازاوە ببینن. وا چاکە بچینە خوارەوە و پشــوویێک بدەین. بەڵام بەداخەوە و دیســانیش بەداخەوە، کاتێک دێنە خوار و نزیکی زەوی دەبنەوە بۆیان دەردەکەوێ کە ســەرما و سۆڵێکی چۆن بەسەر ئەو مەڵبەندەدا زاڵ بووە و لەوەش خراپتر ئەو ڕاوچییە بێ بەزەیییانە کە دەستیان لەسەر ماشــەی تفەنگە و ها ئێســتا گرمەی لێ بێنن ها تاوێکــی دی، ئەوەیە کە بەگورجی تێ دەپەڕن و لەچاو گوم دەبن و بەرەو گەرمێن دەڕۆن و دەڕۆن...

بەڵام بەهیوای ڕۆژێکن کە لە گەڕانەوەدا دوور لە چاوی ڕاوچی و ســەرما و ســۆڵ و ڕەشــەبا تاوێک لەو مەڵبەندە وچانێک بدەن. بەڵام ئێســتا ڕۆژ بەڕۆژ تووشــتر دەبێ و دەرەتانی ئەوە نییە.

بــەڵام بەهــار... ڕۆژی مەوعود... ڕۆژی دیداری یــاران، ڕۆژی یەکتر دۆزینەوە و چاو لێکەوتنی هاواڵان، ڕۆژێک کە سەرما و زمهەریری زستان دەڕوا و گۆڕی گوم دەکا، خۆزگە بۆ ئەبەد بایە! گوڵەکان ســەرلەنوێ ســەر لە زەوی دێننە دەرێ، لە جاران چاتر و زۆرتر و بۆن خۆشــتر، ڕێواس و مەندۆک و بیزا و کەما و گوڵە مێلاقە و وەنەوشــە... هەریەک لەلایەک.

ئـــەو کاتە شلّماشـــیش وەک هەموو مەڵبەندێکی کوردســـتان دەبێتەوە مەکۆی یاران، بولبولی دوور وڵاتیش دێتەوە ماڵ و سەرلەنوێ بەدیداری گوڵ شاد دەبێتەوە.

دەڕوانمە دەوروبەرم لەژێر چنارە گەورەی ســـەرچاوی لە پێشـــەوەم هێندێک بەولاوەتر گۆڕی پیرۆزی خوالێخۆشـــبووێک دەبینم کە بێ شک ئەهلی ئیمانە. مورشیدی گەورە مەلا حەمەدەمینی هەمەوەند، هەزاران فاتیحە و ڕەحمەت پێشکەش بەڕۆحی پیرۆزی و هەزاران هێنـــدەش لە کوڕە قارەمان و نەبەزەکەی، دەمەوێ قەڵەمەکەم بشـــارمەوە و... چی دی نەنووسم تا ئەو ڕۆژە... بەهار... بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا و بەشاردنەوەی قەڵەمیش سێڵاوی ئەســـرینم بۆ ناشـــاردرێتەوە. چونکە دەڵێن کاسە کە پڕ بوو لەســـەریەوە دەڕژێ، سەرم دادەنەوێنم و بەدزیەوە فرمێســـکەکانم پاک دەکەمـــەوە، هەتا ئەغیار لە ڕازی دەروونم تێ نەگەن و بەترســـنۆک و بێ ورەم دانەنێن. نا ئەمن... هەرگیز ترســـنۆک و بێ ئیرادە نیم وەک ئەو کێوەی پشـــتم پۆلایین و سەرکەشـــم. بەڵام ئێستا لێم گەڕێن بەو فرمێسکانە کە لە نووکی خامە دەڕژێنە سەر کاغەز، فرمێسکی چاوم بڵێسەی ئاگری دەروونم بۆ ماوەیەک خامۆش کەم و وەک ئاگرێک لەژێر خۆڵەمێشـــدا لە کـــورەی دڵم ڕای گرم، چونکە دەزانم بەکزەبایەک دیسان ئەو ئاگرە بڵێسەی لێ دێتەوە و سەرلەنوێ گڕ دەگرێتەوە.

هەتـــا بەهـــاری مەوعود، کە زۆر جوان و بەدیمەنە و دڵرفێـــن، هەتا ئەو ڕۆژە خواتان لەگەڵ. ڕەفیقان هیچم لێ بەجێ نەماوە و توورەکەکەم هەر لە شـــاندایە و کاغەز و قەڵەم و بابۆڵە نانەکە. دەڕوێشـــم و دەڵێن دەروێش لەهەر جێگایەک شـــەوی بەســـەردابێ، لێی دەنوێ.

بەڵام لە خەویشدا هەر لە بیری هاتنی بەهار و دیتنی هاواڵانم... و بێ دەرپێم و دەڵێن بێ دەرپێ هەر دوو گەزی جاو لە خەوێ دی...[1]

١٣٥٦/٨/٣٠

---

١ ـ ئەم نووسینەی هێمن موکریانی لە بنەڕەتدا نامەیەکە لە ٢٠ی خەزەڵوەری ١٣٥٦ی هەتاوی (٩ی تشرینی دووەمی ١٩٧٨) بۆ مەلا محەمەدی شلّماشیی ناردووە. سدیق ساڵح، گۆڤاری ئێستا، ژمارە ١٢، ئاياری ١٩٩٨

وەرگێڕان بۆ کوردی






نووسینی: دوکتۆر سادق جەلالی

چیـــرۆک لە ماڵێکەوە لە کۆلانـــی (دو دختران) لە بن پیرە چنارێکدا کە گەلێک مۆمی سووتاوی لە دەورە کەوتبوون دەس پێ دەکا.

(هۆمیرۆس) تەنیا هەر حەماسە بێژێک بوو، بەڵام فیردەوسی حەماسە بێژی فەلسەفە، مرۆڤایەتـــی و مێژووی گەلێک بوو، حەماســـە بێژی بیری پاکی ئینســـانان: پاڵەوانەکانی مێرخاس بوون لە سەرانســـەری ئیلیادیدا هەرگیز تووشـــی قســـەیەکی ئەوەندە ئینسانانە نابین:

شـــەرابی ئـــاڵ بخـــۆوە خوێنـــی خەڵـــک مەڕێـــژە
تـــۆ خاکـــی، وەک ئاگـــر تـــونـــد و تیـــــژ مـــەبـــە
ئـــەم ئـــاوە ڕەنگینـــــەی بخـــۆیـــەوە باشـــــترە
لـــــەوەی پیـــرێـــژن تـــووکـــت لـــێ بـــــکا

نەزەری (برتراند راسیل) لە هەڵسەنگاندنی شانامە و ئیلیادەدا.

ناوی مەنســـوور کونیەی ئەبولقاسم فیردەوسی بووە: لە هەڕەتی لاوەتیەوە دوو هەتاو

لە دڵیدا بەجووت تیشـــکیان داوێشت. خۆشەویســـتی نیشتمان و ئەوینی کتایونی. ئێرانی دەپەرســـت کە نیشتمانی لە مێژینەی بوو، کتایونی خۆشدەویست کە وەک گورد ئافەرینی ڕۆستەم نەشمیل و شێر دڵ بوو.

زەردەپەڕی، ڕۆژێکی بەهاربوو لە بەستێنی ڕووباری (باژ) لەسەر گابەردێک دانیشتبوو. هەتاوی جەنگەی زەردەپەڕی تەماشـــا دەکرد. خوێنـــی خۆر دەڕژایە نێو ڕووبارەوە. لاوی خوراسانی لەبن لێواندا دەیپرتاند:

- دەڵێی خوێنی سیاوەشە لە تەشتی زێڕیندا.

ئەمجـــار لە ڕێگایەکی چۆڵ و پێچاوپێـــچ کە بەکێوەکەوە دیار بوو ڕاما، نەســـوارێک ڕادەبرد، نە هەســـتی پێی ڕێبوارێک دەهات. ڕێگا چۆڵ و بەتاڵ بوو، لاوکوڵەی خوراسانی کە مێزەرێکی ســـپی بەسەرەوە بوو و لفکەکانی بەنێو شـــاناندا بەردابۆوە، لەبەر خۆیەوە گوتی:

- ئەدی بۆ مێرخاســـان و شۆڕەســـواران بەو ڕێگایەدا بەپرتاو لێ ناخوڕن؟ بۆ کوڕژنی ئەسپیان لەو شێو و وەرد و لانەدا دەنگ ناداتەوە؟ بۆ هەروا هەرایان کپە؟

پرســـیارەکانی بـــێ وەڵام مانـــەوە، لەباتـــی وەڵام دەنگێکـــی ناســـک و ژنانە گوێی زرینگاندەوە:

- ئیتر مێرخاس و شۆڕەسواران نابینی، پاڵەوانان لە شیرینی خەودان، هەڕەتی لاوەتی بەفیڕۆ مەدە شێعرت پێشکەشی بەژن و باڵای من بکە.

فیردەوسی ڕووی وەرگێڕا کیژێک بەکوڵمەی ئاڵەوە، بەبرۆی کەوانیەوە، بەچاوی ڕەشی وەک چاوی کارمامزەکانی (دەشتی ئاهوان) بەرەوڕووی پێ دەکەنی، دڵی گەشایەوە:

- ئیتر مێرخاسێک نەماوە.

- کتایون چەند تەنیا بووم!

کتایون دەســـتی لەژێر چارشێو دەرهێنا، دەسبەندێک زێڕ لە مەچەکە سپی و قەڵەو و پرەکانیدا دەبریسکایەوە:

- ها مەنسوور ئەمە ئەو کتێبەیە کە دەتویست.

فیردەوسی لاو بەپەلە کتێبەکەی لە دەستی ڕفاند، بەرگێکی چەرمی کۆنی تێ گیرابوو، لەبەر پرشـــنگی مانگ کە تازە ســـەری لەکەڵ دەرهێنا بوو و دارستانی چڕ و پڕ و چیای بەرز و ســـەوزی دەنگاوت. چاوێکی بەلاپەڕە زەردەکانیدا خشاند، بەزەحمەت چەند دێڕی بۆ خوێندرایەوە:

«کاتێک بیژەنیان لە چاڵاوا هاویشت،
مەنیژەی کچی ئەفراسیابی پیر،
ئاگادار بوو و...
بەخەم و ئەسرینەوە هاتە سەر چاڵاو، شەو تاریک بوو. تاریک و بێ مانگ بوو.
ئەفراسیابی پادشای تووران لە غوڕابی خەودا بوو».
کتایون گوێی هەڵخستبوو، دەیەویست بزانێ پاش ئەوەی مەنیژە چووە سەر چاڵاو چ ڕووی دا؟ لەسەرەخۆ گوتی:
ئەم کتێبە چیرۆکی چەند خۆشی تێدا هەن.
فیردەوسی لەچاوە پڕشنگ تێ چەقیوەکانی کچەکە ڕاما:
- چاوڕەشی خۆم! ئەم کتێبە چیرۆکی ژیان و ئازایەتی و تێکۆشانی کەسانێکە کە لەسەر ئەم خاکە ژیاون. تۆ نازانی زۆو ئەم خاکە هەڵاڵە و شلێر و سوێسن و بەیبوونی لێ دەڕوا، ڕۆستەم لە سیستانەوە بەرەو مازندەران ئەسپی ڕادەدا ئارەش لەسەر ترۆپکی ئەلبورز زێی کەوانی دەکێشا ئاگری ئاورگەکان نێڵەیان دەهات و...
- دەزانی ئەمڕۆ خەڵک چیان دەگوت؟
فیردەوسی دەستە نەرمەکانی لەنێو دەستی خۆی گرت و گوتی:
- ئاسکۆڵەی دەستەمۆی من دە بڵێ! بزانم خەڵک چیان دەگوت؟
- دەیانگوت باوکت لە خەودا دیتوویەتی تۆ لە سەربانێکی بڵند هاوار دەکەی و دەنگت دەگاتە هەر چوار لای جیهان.
فیردەوسی دەستی بەرەو ئاسمان هەڵێنا و گوتی:
- سەیرە، دەی چی دیکەش؟
- تۆ بڕوا ناکەی؟ باوکت لە مزگەوتی گەورە تەعبیری خەونەکەی لە (نجیب الدین) پرسیوەتەوە، ئەویش وەڵامی داوەتەوە و گوتوویە:
«ئەبولقاسمی تۆ ناوبانگ دەردەکا لە هەموو جیهاندا و لە هەموو ڕۆژگارێکدا». لاوەکە گوێی لەو قسانە گرت و کەوتە بیرکردنەوە.
لەو ڕۆژەوە کە دەچوو بۆ فێرگە ئاگرێک لە دەروونیدا بڵێسەی ئەستاندبوو، ئەم ئاگرە دەیسووتاند، دەیبرژاند، دەیکردە ژیڵەمۆ، ئەم ئاگرە ئەستێرە بارانی دەکرد، ئەستێرە و ئەستێرە...
فیردەوسی خۆی دەخواردەوە، ڕەنجی دەکێشا، هەستی ئاگرینی دەمێک دانەدەمرکا.

لاو بوو، داوێن پاک بوو، نیشتمانپەروەر بوو، زانا و بەرزەفڕ بوو.

ئەگەر لەنێو شـــاعیرەکانی ئێراندا بگەڕێین، کەس لە فیردەوســـی مەزنتر نادۆزینەوە. حەماســـە بێژێک بوو کە تابلۆی دڵپاکان و مێرخاسانی دەکێشا. شێری بەدەستێکەوە بوو و هەتاوی بەدەستی دیکەوە. شێرەکەی جەرگی ناپاکی دەنجنی و هەتاوی دەروونی پاکانی ڕووناکتر دەکردەوە.

وەنییە هەر من و تۆ بیناســـین، کتێبە نەمرەکەی فیردەوســـی لە سەرانسەری جیهاندا ناســـراوە. لێرەدا کە برتراند ڕاســـیل، پاش لەبەر یەک ڕانانی حەماسەکانی فیردەوسی و «هۆمیرۆس» ڕاستگۆیانە دەڵێ:

«هۆمیرۆس تەنها حەماسە بێژێک بوو، بەڵام فیردەوسی حەماسەی مرۆڤ و مرۆڤایەتی دەژیاندەوە».

فیردەوســـی فەلسەفەی گەورەی ئینســـانی دەڕازاندەوە لەپێناوی ژیاندنەوەی مێژووی گەلێکدا تێ دەکۆشا و دەگەڵ جەبری زەماندا بەربەرەکانی دەکرد.

با بچین لەســـەر گۆڕە پیرۆزەکەی فرمێسک بڕێژین، کوڵ و کۆ دامرکێنین. لە بەرامبەر ئـــەوەدا چۆک دابدەین. بەپیاوێک هەڵبڵێین کـــە پاک بوو، مەزن و لە دوایی ژیانیدا تەنیا و دەس تەنـــگ بـــوو، داخدار و ملتەبار بـــوو کەچی بەو حاڵەوە گەورەترین حەماســـەی خوڵقاند. فیردەوســـی بەوپەڕی ئەوینەوە خەریکی هۆندنەوەی شانامە بوو. هەرچەند پێش ئەو (دەقیقی) دەســـتی بەو کارەی کردبوو. بەڵام تازە دەســـتی پێ کردبوو کە بەدەستی کۆیلەکـــەی خۆی کوژرا و کارەکەی بەناتەواوی بەجێ ما و فیردەوســـی درێژەی بەو کارە دا.

ئیتر کەم کەس ڕۆڵە وەرزێری تووســـی لە کووچە و کۆڵانان دەدی ئەو لە دەریایەکی قووڵ و بێ بندا، لە باوەش شـــەپۆلان باســـکی داویشـــتن. هەرچی لە کاری شانامەدا پتر دەچووە پێش وەک پشـــکۆیەکی شنە بیگەشێنێتەوە زیاتر گڕی دەگرت، بڵێسەی بەتینتر دەبـــوو، دنیا و ژیان و هەبوون و نەبوونی ئەو لە وشـــەیەکدا کۆکرابۆوە ئەویش «ئێران» بوو...

ڕۆژێک کتایون کچی چاوڕەشی خوراسانی کە کوڵمەکانی خڕ و خاڵ و چاوەکانی بادامی بوون و دوو گۆی بلوورین لەسەر سینگی دەلەرینەوە بەئەسپایی لە پلیکانی ئەو باڵاخانەی فیردەوسی تێ خزابوو سەرکەوت. پەردەی هەڵداوە کەمێکی تێ فکری. فیردەوسی خەریکی کاری خۆی بوو هیچ ئاگای لە دەوروبەری خۆی نەبوو، کتایون بەتەوسەوە گوتی:

- تۆ...؟! خۆزگە قەت ئەم کتێبەم بۆ نەدەهێنای. فیردەوسی بەو دەنگە ناسک و شیرین و پڕ توانجە ڕاچەنی و گوتی:

- ئاخ کتایون ئەوە ئەتۆی؟ گوڵی سەد ڕەنگم، دەگەڵ ئەم کتێبە کۆنە کە دوو هەزار ساڵ لە تەمەنی دەگوزەرێ وا خەریکم کە بڕوا بکە خۆشم لە بیرچۆتەوە. ئاخ تۆ نازانی چ خەزنەیەکی دارماڵە؟

شادی لە ڕوخساری فیردەوسیدا بەدی دەکرا. کتایون سوور هەڵگەڕابوو، بەشیرینی لێوە ئاڵەکانی دەگەست و بەناز گوتی:

- مەنسوور، بەهار دەشتی (تابران)ی گوڵباران کردووە. شینکە دەڕوێ، گوڵ دەپشکوێ هەور دەگری، هەموو لایەک پڕ لە جوانی و لە چریکە و گۆرانی و سترانە، بەڵام تۆ تەنانەت ئەوین و دڵداری و ژوانیشت لەبیر کردووە.

کتایون ئەم قسانەی دەکرد و هات لەکن دۆشەکچەی فیردەوسی دانیشت و بەتووڕەیی و نازەوە کاغەزەکانی تێک وەردان، دیار بوو ئێرەیی پێ دەبردن. دیسان بەتەوسەوە پێی گوت:

- تۆ لە بیرت چۆتەوە بەهار هەڕەتی شادی و دڵداری و خۆشی و ئاهەنگە.

فیردەوسی لە چاوە ڕەشەکانی کیژۆڵەی تووس ڕاما و بەئارامی گوتی:

- گوڵەکەم! سوێند دەخۆم بەخاڵی ڕەشی گۆشەی لێوت کە دەڵێی جادووە لەسەر کانی ژیان ڕۆنیشتووە. دنیا لەبەر پێی تۆدا دەبینم، سەرتاپات بەزێڕ و زێو دەڕازێنمەوە، تۆ نازانی شەوی ئەو شەو خەو بێ و لە چاوی من نەکەوتووە، چاوم وەک چاوی ئەستێران خەوی نەدیوە ئەوینێکی بەتین لە مندا دەگوورێ، حەماسەیەکی نەمر لە مندا چەکەرەی دەدا. ئەی کچی باڵا بەرزی بەژن باریک تۆ نازانی.

کتایون ئارام ئارام سەری فیردەوسی لەسەر ڕانی خۆی دانا، دەستێکی بەکاکۆڵە ئاڵۆزەکانی داهێنا و گوتی:

- ئێستا ئارام بگرە بنوو سەر وەسەرینی ڕانە نەرمەکانی من بکە.

فیردەوسی بەنارە نارە گوتی:

- کە پەردەیان لەپێش هەتاو لادا.

- بەیان ئەنگوت و خەو زڕا،

دیسان گوتی:

- کتایون ئەو کتێبە تۆ دات بە من دەریایەکی مەند و قووڵە ئەو شانامەی بەدەستی




منەوە، ئاسمانێکی بەرزی پڕ ئەستێرەیە.

ئاگری ئێرەیی لە چاوە جوانەکانی کتایوندا بریسکایەوە و بەتووڕەیی گوتی:

ئەدی ئەستێرەکانی چاوی من؟

فیردەوسی کەزیە نەرم و درێژەکانی لە چەنگی گرت و بۆ لای خۆی ڕاکێشا و گوتی:

لە ئاسمانی چاوە ڕەشەکانی تۆدا هەزار ئەستێرەی گەش دەدرەوشێتەوە. ڕووناک، پاک و بێ گوناهـ.

چاوەکانی تۆ دوو چرای ڕۆشنی منن کە لەبەر ڕووناکی ئەواندا مرواریيە نەسماوەکانی شانامە دەسمم و دەیانهۆنمەوە و بەرمووریکی نایاب دروست دەکەم و لە ئەستۆی بووکی شێعر و خەیاڵ نا، لە ملی مێژووی ئێرانی دەکەم.

کتایون بەناز و شەرمەوە گوتی:

- ئەدی بووک و زاوایەتی ئێمە؟

فیردەوسی پێکەنی:

- بیست ڕۆژی دیکە مانگی محەڕەم دوایی دێ، جا پەنجە بلوورینەکانت لە خەنە دەگرم، تارایەکی حەریری سووری تەنکت بەسەر دادەدەم، پەردووت بەگوڵ و وەنەوشە دەخەملێنم.

کتایون لە خۆشیان وەک منداڵان شاگەشکە بوو و گوتی:

- دەی قسان بکە دەی، ئەو قسانەی تۆ چەند جوانن چەنە شیرینن.

فیردەوسی لە دوورە دەستەکانی دەشتی خوراسان ڕاما و گوتی:

- چاوە جوانەکەی تۆ دەڕوانێتە بەرەبەبانێکی دوور، دوور دەڕوانێتە ئەو ڕۆژانەی کە گزنگ کەوت. ئیتر من نەماوم مەنسووری تۆ ئیتر بۆتە خاک و خۆڵ، بۆتە تۆزی ڕێگای ئەو کاروانانەی کە شەودرەنگان لە دەروازەی تووس دەردەکەون بەڵام شانامەی من نەمرە. نا کتایون من نامرم، نامرم لە دواڕۆژدا دەزانن ئەو پیاوەی لە خوراسان ڕابوو، مەشخەڵێکی لە ئاگری زەرتەشت بڵێسەدارتری داگیرساند، لەبەر ڕووناکی ئەو مەشخەڵە، تۆوی ئەدەب، نا مێژووی ئێرانی چاند. هەتا هەتایە زیندووە و نامرێ.

کتایون! ئەو کاتی خەڵک دەڵێن: ئەو پیاوە لە ساڵی ٣٢٩ ی کۆچی هاتە سەر دنیا. ڕۆڵە وەرزێرێکی پاک بوو. نیشتمانی خۆی دەپەرست بای نەورۆزی لە شنەی بەهەشت پێ خۆشتر بوو. بێ پەروایانە لە دەریای شێعردا مەلەی دەکرد، بەئیرادەیەکی مەحکەم، مەحکەمتر لە چیا بەدۆڵ و شێو و ڕکە و بەردەڵاندا ڕادەبرد، لە سەرما و گەرما لە دێو




و درنج نەدەترسـا: نەبەزی تا گەنجینەی شـێعری دۆزیەوە و پێشکەشی خەڵکی جیهانی کرد!

- من ئیدی نامرم زیندووم، تۆوی شێعرم چاندووە.

ڕۆژ هاتن و ڕابردن، سـاڵ بەسەرچوون، چۆن ساڵانێک؟ ئەو ساڵانەی ژیان و تەمەن و ماڵ و سامانی فیردەوسییان وەک حەزیا هەڵدەلووشی.

ماڵ و سامان و زێڕ و زیوی نەمابوو، بەرەو پیری دەچوو بێ هێز و کەنەفت بوو، گنج و چین ڕوخسـاریان داگرتبوو. بەڵام بەدەستی ئەو شوورەی کۆشکێکی بەرز داڕێژرابوو کە بەختێکی نوورانی لەسەر دەرکەکەی نووسرابوو:

«کۆشـکە بەرزەکان وێران و خاپوور دەبن، بەری با و باران و گەرما و سەرما ناگرن، من کۆشکێکی بەرزم لە نەزم دامەزراند کە با و باران زیانی پێ ناگەیەنن».

وردە وردە، تەمەنی فیردەوسـی بەرەو ژوور دەچوو، پیـری پەلاماری دەهێنا، هیچی نەما بوو، بەڵام بەو حاڵەشەوە شەو و ڕۆژی لەکن نەبوو هەمیشە سەری بەسەر شانامەی (ئەبو مەنسـوور)دا دادەگرت و چیرۆکە کۆنەکانی دەخوێندنەوە و دەیهۆندنەوە تا پیری و دەستەنگی بەجارێکی شپرزەی کرد:

- ئەی ئەوەی ئەو چەرخە بەرزەت ڕاگرتووە!
- بۆچی بەسەری پیری منت هەژار کرد.
- تا لاو بووم چاکترت بەخێو دەکردم.
- بەپیری سووکت کردم.
- ڕۆژگار لەباتی جڵەو، وەکازی لەدەست نام.
- ماڵەکەم بڵاو بوو و حاڵەکەم شێوا.

فیردەوسـی پەنجا و هەشت ساڵە بوو کە بیستی سوڵتان مەحموودی غەزنەوی چۆتە سەر تەختی پادشایەتی، بەبیری داهات شانامەی بەناوی ئەوەوە بکا، بەڵام نەیدەزانی ئەو پادشایە زۆر بەدفەڕ و خراپ و هەق نەناسە.

لەو سـەردەمەدا ئاسمانی بەرزەفڕی فیردەوسـی بەرەو تاریکی دەچوو، ئەستێرەکانی یەک یەک ڕادەخوشان بەردەبوونەوە و دەکەوتنە سەر خاکی نەهاتی و داماوی.

کارەسـاتێکی تاڵ و ناخۆش بوو، پیرە وەرزێری خوراسـانی لەسەر ترۆپکی ناوبانگ ئەوەنـدە هەژار و نـەدار ببوو کە ئیتر دووکەڵی لە ماڵی هەڵنەدەسـتا و ئاورگی لە دڵی ناهومێدان ساردتر بوو، لە پێناوی نیشتماندا تۆزکاڵ تۆزکاڵ دڵ و گیانی خۆی خستە ژێر

پێی مێژوو و حەماسەوە تا تواوە.

لە کاتێک کە زمان لووسـی بێ مایە، لە بارەگای سـوڵتاندا زێڕ و زیویان وەسەر یەک دەنا، ئەو لە ئاگری نیشـتمانپەروەریدا دەسـووتا و جگە لە خەم و فرمێسـک و هەناسە بەشێکی نەبوو، بەو حاڵەشەوە هێشتا دوودڵ بوو:

- چ بکەم ئایا شانامەی بەدیاری بۆ سوڵتان مەحموود بەرم؟

- ئایا داچێندراوی سەوز و شین و جوانی خۆم بە کێ بسپێرم؟ ئەوانە نە قەدری زانست دەزانن و نەهەست دەکەن چ ئاگرێکی نەمر لە دڵی مندا بڵێسەی ئەستاندووە.

لەو سـەروبەندەدا دەردێکی گرانی دیکەی وەک نەشـتەر، لە دڵ ڕاچوو. ڕۆڵە سـی و حەوت سـاڵەکەی نەخۆش کەوت. نەخۆشییەکەی درێژەی کێشا، لەسەر سەرینی ئەو لاوە دوو دڵ دەکوڵین و دەیانکورکاند. دڵی کتایون و دڵی ئەبولقاسمی فیردەوسی.

شەوێکی ڕەش و تاڵ و گرژ و مۆن بوو، سێبەری مەرگ بەسەر سیمای لاوەکە کشابوو، کتایون یەک بەخۆی قیژاندی:

- تەماشای کە هیچ دەنگ نایە، هەموو بێدەنگن هەموو خامۆشن، هەموو مردوون، ئێمە برسین، تەواوی ماڵ و سامانی خۆت دانا تا چیرۆکی ڕۆستەم و سوهراب و بیژەن و مەنیژە و سـوودابە و سـیاوەش و کیومەرەس و هۆشەنگت کردە شێعر، تۆ چت پێگەیشت؟ چت بۆ ماوەتەوە؟

فیردەوسی هیچی نەگوت هەر چاوێکی لێ کرد، لە نیگای ئەودا تێشکان و لێقەومان و دەرد و ژان پەنگی خواردبووەوە. ئەو چی بەو ژنەی کە لەگەڵی پیر ببوو و بەو لاوەی کە مەرگ دەستی لە ئەوکی نابوو گوتبایە؟

هێشـتا شـەو پەڕ و باڵی ڕەش و شـوومی هەڵنەوێزنیبوو کە کوڕ پشووی لێ بڕا و پیرەمێرد داخدار و تازیەبار بوو:

«من تەمەنم لە شێست و پێنجی هەڵبوارد،

ڕەوا نەبوو بەزێڕ و زیوی بگۆڕمەوە،

مەگەر سوودێک لە پەندی خۆم وەرگرم،

بیر لە مەرگی ڕۆڵە خۆشەویستەکەم بکەمەوە

نۆرەی من بوو بڕۆم ئەو لاوە ڕۆیشت

لەبەر دەردی ئەو لاشەی بێ گیانم».

لێرەدا بوو کە ناچاری تەنگی پێ هەڵچنی و قورسـایی باری کارەسات شانی چەماند،

شانامەی کە ئاوێنەی ڕەنج و ئەوین و هەستی بەتینی خۆی و ئازایەتی و مێرخاسی دلێرانی ئێران بوو بەناوی سـولتان مەحموود تەواو کرد. لەو کارەدا ئەبولعەباسـی فەزلی کوڕی ئەحمەد نەخشێکی گرنگی هەبوو.

لـە کۆلانی (دو دختـران) لەژێر پیرە چنارێک کە گەلێکی مۆمی نیوەسـووتاوی لەبن کەوتبوون، پیاوێک کە سەر و ڕیشی هەموو سپی ببوو شەوێک دەستی کتایونی بەدەستە لەرزەکانی گرت و گوتی:

- شانامە تەواو بوو هەتاوی لاوەتی من و تۆش ئاوا بوو! ، کتایون کە کولمەکانی چرچ و بێ ڕەنگ و چاوەکانی پرووش ببوون گوتی:

- لەو مالەدا هێشتا مۆمێک دائیسێ.

- هێشتا ژیان درێژەی هەیە.

- هێشتا دلێک لێ دەدا.

فیردەوسی زەردەیەکی خەمناکانەی هاتێ، خەمناکانە بەلام بەرزەفرانە و گوتی:

- ئەو مۆمە هێشتا ڕۆنەمرکاوە، ئێستا هەزار شێعر، شێست هەزار زێڕی پێ دەدەن.

بەیانی پیری چیرۆک بێژ بەرەو غەزنەین کەوتە ڕێ. فەزلی کوڕی ئەحمەد لەسـەر کار نەمابوو و دەرکرابوو، خاوەنی شانامە لە بارەگای سولتان مەحموود دۆست و پشتیوانێکی نەبوو کێ ئەو چارەنووسـە دەناسـێ؟ ئایا پیالەی بەرزەفڕی و خۆڕاگری پیاوە نەمرەکان بەدەسـتی کێ دەشکێ؟ بۆ چارەنووسی کەلە پیاوان، زانایان و هونەرمەندان هەر تاریکی و تاریکییە؟

فیردەوسـی بەپلیکانی مەڕ مەڕی کۆشکی سولتان مەحموودا سەردەکەوت، سەربەرز بـوو وەک هەلۆکانی دوندی چیا، شـانامەی وەک خەزنەیەکی دارمال لە گەوهەر و دوڕی نایاب لەبن هەنگلدا بوو، شـانامە نەبوو، ئاوێنەیەک بوو کە دیمەنی ئاوات و ئارەزووەکانی لاوەتی و ڕەنج و ژان و دەرد و کوێرەوەری پیری خۆی تێدا دەبینی. تەمەنی لە هەشـتا نیزیک ببووەوە، دەسـتی دەلەرزین و شـانامەش گران بوو بەقەد گرانایی مێژووی کۆنی ئێران. هێزی کەم بوو، ئەژنۆی دەلەرزین، چاوێکی بەدەوروبەری خۆیدا گێڕا:

- کوان قارەمانەکانی من؟ پالەوانەکانی شانامە لەکوێن؟ کوان گیو و گودەرز و ڕۆستەم و تووس تا باسکی من بگرن؟

حەکیم ئەبولقاسـمی فیردەوسـی لە بارەگای سولتان مەحموود ڕاوەستا بوو. سولتان بەڕێزەوە تێی ڕاما شـانامەی کە لە حەوت بەرگدا بەخەتی عەلی دەیلەمی نووسـرابوو لێ

وەرگرت و چەند شێعرێکی خوێندەوە و ڕووی گرژ کرد و گوتی:

- ئەوەیە شانامە؟

- فیردەوسی وەڵامی دایەوە:

- ئەوەیە چیرۆکی کۆنی مێرخاسان و گەورە گەورانی ئێران.

- بەڵام من جگە لە باسی ڕۆستەم هیچ لەو کتێبەدا نابینم، لە لەشکری مندا هەزار پیاوی وەک ڕۆستەم هەیە.

فیردەوسی سەری هەڵێنا، ملی قەف کرد، سینگی دەرپەڕاند، ڕاستەوخۆ و بێ پەروا چاوی لە سوڵتان مەحموود بڕی و گوتی:

- نازانم لە لەشکری سوڵتاندا چەند پیاوی وەک ڕۆستەم هەیە؟ بەڵام ئەوەندە دەزانم دایکی ڕۆژگار ڕۆڵەیەکی وێنەی ڕۆستەم نەدیوە.

ئەوەی گوت و ئیزنی وەرگرت و ڕۆیی، سوڵتان مەحموود بەوەزیزەکەی گوت:

- ئەو پیاوە بەمنی گوت درۆزن، بەڵام من بەو حاڵەشەوە لەسەر ئەوەم جایزەکەی بدەمێ.

زۆر شەوان شانامەیان لە کاتی خەودا بۆ سوڵتان مەحموود دەخوێندەوە. بەڵام ئەو ناڕەحەت دەبوو، ئێرەیی ئازاری دەدا، ئازایەتی و پاڵەوانی و داوێن پاکی قارەمانانی شانامە دەیڕەنجاند هێندی ڕق هەڵدەستا وەختابوو شێت بێ.

لە ئەنجامدا دووزمانی پیاوخراپان کاری خۆی کرد. ئایا ئەوە خواجە حەسەنی میمەندی بوو کە ئەو کارە دزێوەی کرد و بەسوڵتان مەحموودی گوت: «قوربان! شاعیرێکی وا هەر دەبێ چەند درەمی بدرێتێ»، سوڵتان مەحموودیش بیست هەزار درەمی زیو جایزە بۆ نارد. ئاگری ڕەقی فیردەوسی بڵێسەی سەند، هەستی کرد ناپیاوان دەیانەوێ بیشکێنن بەڵام ئەو وەک کۆنە شوورێکی قایم خۆی ڕاگرت و هەرەسی نەهێنا. لە تووڕەیی سوڵتان نەترسا بەماندوویی و ڕق هەستاوی چووە حەمام. تەواوی دراوەکانی دا بەکیسەکێش و ئاوگر و حەمامچی و لە غەزنەین وەدەرکەوت و سەری خۆی هەڵگرت.

ئەو گەورە پیاوە شار بەشار ڕای دەکرد و سێبەری شوومی پیاوەکانی سوڵتان مەحموودی بەشوێنەوە بوو. تا خۆی گەیاندە مازەندەران ئەو مەڵبەندی کە زۆر لاپەڕەی شانامەی پڕ کردۆتەوە.

شەوی تاریک بوو، زەنگی کاروان دەشتی بێدەنگی پڕ زرینگ کردبوو، فیردەوسی لە مازەندەرانڕا بەرەو خوراسان دەچۆوە. کە گەیشتە دەروازەی (تابران) لەرزی و فرمێسکی




گەرمی بەریشی سپیدا هاتە خوار و لەبن لێواندا گوتی:

- کــوا لاوەتی من؟ بۆ کوێ چــوون پاڵەوانەکانی من، هەموو ئاوابوون. ئاســـمان بێ ئەســـتێرەیە و وجوودی من بەتاڵ و بێدەنگە. ئێســـتا تەمەنم نیزیک هەشتا ساڵە، هیوام بەجارێک با بردی.

ڕۆژی دیکە تێپەڕبوون، ســـاڵی تر بەســـەرچوون، تا لە بەرەبەیانی ساڵی ٤١١ یا ٤١٦ ی کۆچیدا، باڵندەی زامدار، ئەســـتێرەی شـــکاو و ئاوێنەی تۆز گرتـــوو و هەتاوی گیراو، خراپە و دووڕوویی و فێڵبازیەکانی ئەم جیهانەی لێ ون بوون و مرد. دەنگێک لە ئاسمانی خوراسانەوە هات: فیردەوسی مرد، خوای شێعر مرد! .

یـــاری ڕۆژگار ببینن، هەر لەو ڕۆژانەدا بوو کە ســـوڵتان مەحموود پەشـــیمان بۆوە و فەرمانی دا تا شێست هەزار دیناری زێڕ بۆ فیردەوسی بنێرنە تووس.

ئەمە گاڵتەی درێوی ڕۆژگار بوو، زێڕەکانیان گەیاندە بەر دەرکی فیردەوســـی کچەکەی کە لە شینی باوکیدا فرمێسکی دەڕشت و مووی دەڕنێوە کە جایزەی شانامەی چاو پێکەوت وەک شێتان پێکەنی و بەتووڕەیی گوتی:

- بڕۆن، بڕۆن نامەردینە، ئەو بەخششـــە بەرنەوە خەزنەی ســـوڵتان، من هەرگیز وەری ناگرم! لێ گەڕێن با گیانی باوکم لە ئاســـماناندا هـــەروا بەرزەفڕ بێ هەروا بەرزەفڕ بێ... بەرزەفڕ.

## ئەو جۆرەی بتەوێ

شەکسپیر

ڕۆژگارێـــک بـــوو وڵاتی جوان و دڵگر و کانگەی ئەوین و دڵداریی فەرانســـە، بەرەڵڵا و هەرکەس هەرکەس بوو، کەس سەری بۆ کەس دانەدەنواند، کەس بەرپەی کەسی نەدەپێوا، هـــەر لایەی بەدەس میر و مەزن و دەرەبەگێکەوە بـــوو. لە ناوچەیەکی ئەم وڵاتە میرێکی زۆرداری، داگیرکەری، دڵڕەش فەرمانڕەوایی دەکرد. کە دەســـەڵاتی مەزنایەتی لەدەســـت براکەی خۆی دەرێنابوو، ملک و ماشی لێ بڕیبوو.

ئـــەو میرە لەدەس پیســـی و ناپاکی و ماڵپەرســـتیدا وێنە و هاوتـــای نەبوو. براکەی خۆی کە تا ڕادەیەک لەنێو خەڵکدا ناخۆشەویســـت بـــوو، دەرکردبوو. برای زۆر لێکراوی، لێقەومـــاوی وەدەرنراو پەنای بۆ لێڕەواری دووره دەســـت و چڕ و پڕی «ئاردن» بردبوو. لەوێ دەگەڵ چەند دۆســـت و ئاشـــنا و لایەنگری خۆی ژیانێکی شاد و ئازاد و بێ دەردی سەریان ڕادەبوارد.

ورده ورده ئۆگـــری ژیانی ســـاکاری جەنگەڵ بوو، خەم و پـــەژارەی بەدیتنی دیمەنە جوانەکانی خۆڕســـک دەڕەواند. ئاوی ســـارد و ڕوون و بێ خەوشی کانیاوی دەخواردەوە. هەوای خاوێن و سازگاری زەنوێرانی هەڵدەمشت، کارگ و ڕێواس و گوارده و شیر و پەنیر و لۆرک و کەره و هەنگوێنی کوێستانی لە چێشتە چەور و سوێر و تیژەکانی کۆشک باشتر پێ دەکەوت. دەرد و دەغەزی دەپەڕاند و ئازار و نەخۆشیی نەدەهێشت ڕۆژ بەڕۆژ ژمارەی،

لێقەومـــاو و دەرکراو و ڕاونراوی پتر لێ کـــۆ دەبوونەوە و دەوری قەوغاتر دەبوو، وەڕەزی زیاتر دەشکا و مەترسی کەمتر دەما.

ئەو میرە دەرکراوە کیژێکی هەبوو، تا حەز بکەی نازدار و لەبار و وریا و زانا و وشیار بوو. ئەوەندە گفت و لفت خۆش و خوێن شیرین بوو کەس نەبوو بەدڵ خۆشی نەوێ، نێوی «ڕوزلیندا» بوو.

ڕۆزلینـــدا لەوە ڕۆژەوە باوکی بۆ پاراســـتنی پەنای بردبووە «ئـــاردن» لە ماڵە مامە بەدفەڕەکەیـــدا مابۆوە. تا ئاودەنگ و هاودەمی «ســـلیا»ی کچی مامی بێ. ئەو گلدانەوە هەرچەند ڕۆژەکانی هەوەڵ سەخت و تاڵ و ناخۆش بوو، بەڵام ئەو جووتە کچە زوو ئۆگری یەک بوون و بوونە دۆستی چاک و پاک و گیانی یەکتر.

چیرۆکی ئێمە لێرەوە دەس پێ دەکا، «ڕوزلیندا» ڕۆژێک وەک ڕۆژانی پێشـــوو، لەبەر پەنجەرەی ژووری «ســـلیا» بەوەڕەزی دەســـتی وەبەر چەنەی هەڵدابوو و بیری لە ژیانی پچڕاو و هەڵوەشـــاوەی خێزانـــی خۆیان دەکردەوە و «ســـلیا»ش بەپەنجە نەرمۆڵەکانی دۆستانە پرچە خاو و جوانەکانی دادەهێنا.

لەو کاتەدا خزمەتکارێکی ئەمیر هاتە ژوور و پەیامی ئەمیری بۆ هێنان و گوتی:

ئێســـتا ئەمیر دوو پاڵەوانان بەگژ یەکدا دەکا دەفەرمووێ ئەگەر وازیان لێیە ئەوانیش بێنە تەماشا.

لەو سەردەمەدا باو بوو کە پاڵەوانان لە پێش چاوی میر و گەورە گەوران زۆرانبازی بکەن و ئەوانیش بەفیزەوە لە ســـوێیان ڕاوەســـتن و ئەم کارە دزێوە و ناپیاوانە مایەی ڕابواردن و ســـەرگەرمی و دڵخۆشی ڕەسەنزادە بەدەســـەڵاتەکان بوو. «ڕوزلیندا» و «سلیا»ش کە زۆر وەڕەز و دڵتەنگ بوون بۆ تەماشـــا چوون. بەڵام بەداخەوە دیمەنەکە لەباتی وەڕەزیان بشکێنێ پتری خەمبار کردن. چونکە دیتیان مێر منداڵێکی ریوەڵەی، باریکەڵەی شووش و گشت خەریکە ئامبازی لەندەهۆرێکی مل ئەستوور و سینگ پان و دێوەزمەیەکی بێ کلک و شاخ و بەشان و باهۆ و بێ ڕەزا بێ.

جیاوازیی تەمەن، وێک نەچوونی لەش و ئەندام، نیشـــانەی کارامەیی و ئەزموون، دیار و بەرچاو بوو. هەموو کەس دەیتوانی بەهاسانی ئەنجامی ئەم بەگژیەکداچوونە نابەرامبەرە خەفەتبارە پێشـــبێنی بکا. کەچی لاوەکە هیچ نیشانەی ترسان و بزرکان و تێشکانی پێوە دیار نەبوو دەتگوت، لێی ڕوون و ئاشکرایە، زاڵ دەبێ و سەردەکەوێ و ڕووسوور دەردەچێ و بزەی هەر لەسەر لێوان بوو.




«ڕوزلیندا» زۆر پەشێو و خەمبار بوو، ئارام ئارام لە کوڕەکە چۆ پێش، نیگای دڵرفێن و سیحراوی تێ بڕی. بەزمانێکی نەرم و شیرین پێی گوت:

«دەس لەم کارە منداڵانە و شێتانە هەڵگرە، چونکە ئەم کابرا زل و زەبەلاح و بەهێزە لەوانەیە نەتهێڵێ و ژیانی لاوەتی تۆ بخاتە مەترسییەوە».

لاوە نەناسیاوەکە بەئەدەبەوە گوتی:

«داخــی گرانم ناتوانم پەنــد و ئامۆژگاری ئەم کچە نازدارە لە گوێی بگرم. من بڕیاری خۆم داوە، بەرەنگاری دەبم، ئەگەر سەرکەوتم شانازییە و ئەگەر تێداچووم، لەم دنیا پان و بەرینەدا تاقە کەسێک نییە دەنکێک فرمێسکم بۆ بڕێژێ!» لە حاڵێکدا چاوی بەتاسەوە لە چاوە پڕ شەرم و جوانەکانی کچەکە بڕیبوو گوتی:

«تەنیا ئاواتم ئەوەیە دڵسۆزی و خەمخۆری تۆ پشتیوان و هاندەرم بێ».

زۆرەوانێ دەس پێ کرا، «سلیا بەئاواتەوە بوو لاوی نەناسیاو سەرکەوێ. ڕوزلیندا دەس بەدوعا بوو و دەپاڕاوە خودا لاوەکە لە شــەڕی ئەم لوزەندەرە بپارێزێ. بەتایبەتی ترســی جوانەمەرگی ئەو پەریشان و هەراسانی کردبوو. تێ گەیشتبوو ئەم لاوەش وەک ئەو بێکەس و بێ پەنایە دڵەکوتەی گرتبوو، بۆ یەکەم جار لە ژیانیدا هەســتی بەشتێک لە دڵی خۆیدا کردبوو، ئەویش هەستی ئەوین بوو».

بەپێچەوانەی بۆچوونی تەماشــەکەران لاوی مێر منداڵ کە لەبەر کابرای بەگەد و گیپاڵ نــەک هەر خــۆی لەبەر ڕاگرت و چەقی، بەڵکو بەرســینگەی لێ بڕیــەوە، مەچەکەی لێ ئەنگاوت، ســەر سمتەی دا و باو لەســەر باوی هێنایە. تا کابرا بڕستی لێ بڕا شل بوو و فێڵی پێ نەما. ئەمجار بەهەردوو دەست بەرزی کردەوە و بەرقەوە وای لە تەختی هەردی ڕاکێشا کە چوار پەلی هاوێشت و لەجێی نەبزووت و پشووی لێ بڕا.

چەپڵەڕێزان، هۆریاکێشان، دەنگی ئافەریم، دەستت نەرزێ، باوکم دەبەرت مرێ، ڕووی دایک و باوکت سپی بێ بەرز بۆوە. میر خۆی پێ ڕانەگیرا لاوەکەی بانگ کرد و لە ڕەسەن و بنەچەکەی پرسی:

«وەڵامی داوە کوڕە گچکەی (سیر رولاندبز)م. ئەمیر چرژا، گرژ بوو، ڕووی لێ وەرگێڕا. باوکی دەناسی و دەیزانی یەکێک لە دۆستانی نیزیکی براکەی بوو».

بەڵام پلەی خۆشەویســتی «ڕوزلیندا» بەرزتر بۆوە و لە حاڵێکدا کە لە بنەوە دەستی «سلیا»ی دەگوشی گوتی:

«باوکم باوکی ئەم کوڕەی زۆر خۆش دەویست و متمانەی تەواوی پێ هەبوو». ئەگەر

دەمزانی ڕۆڵەی ئەو پیاوچاکەیە بەهیچ بارێک نەمدەهێشــت توخوونی ئەو غووڵە بکەوێ. بەپاڕانەوە بەئاهـ و فرمێسک داوێنم دەگرت و وازم پێ دەهێنا.

هەردووک چوونە لای کوڕەکە کە لە بێ مەیلی میر دڵی پەشـا بوو، زۆریان لاواندەوە و دڵخۆشــی دایەوە. کە هاتن بڕۆن «ڕوزلیندا» زنجیرێکی لە گەردنی بلووڕینی دەرهێنا و لە مستی نا و گوتی:

«ئەم یادگارە پچووکەم لێ وەرگرە. من لە ماڵی دنیا چیدی شک نابەم، دەنا تۆ بۆیە دەبووی دیاری زۆر بەنرخترت پێشکێش بکەم.»

٢

(فرەدریــک) فەرمانڕەوای داگیرکەر کە وەفای «ڕوزلینــدا»ی دەگەڵ لاوەکە بینی و لەلای دیکەوەش باسی چاکی و پاکی و بەبەزەیی و بێ ئازاری پێ ڕاگەیاندبوو. بەڕقدا چوو و هاتە سەر ئەوەی برازاکەی لە ماڵی خۆی دەرکا.

ڕۆژێک کە دەگەڵ «ســلیا» دانیشتبوون وەژوور کەوت و بێ شەرمانە و ناپیاوانە پێی گوت: هەر ئێســتە دەبێ لێرە بڕۆی! هەرچی «ســلیا» پاڕاوە و لالاوە و گریا و دەست و داوێنی باوکی بوو سوودی نەبوو. ناچار تکای لە باوکی کرد مەر! بدا ئەمشەوەش پێکەوە ڕابوێرن.

شەوێ تەگبیریان کرد و هاتنە سەر ئەوە بەجووت ڕابکەن و خۆبشارنەوە. بەیانی زوو یەک لە جلی لاوێکی توند و تۆڵ و ئەوی دیکی لە بەرگی لادێییدا بەدەرکی نهێنی کۆشک دەربازبوون و بەناشارەزایی ڕوویان لە جەنگەڵی «ئاردن» کرد.

هیچ کام نەیاندەزانی چییان بەسەردێ و ڕۆژگار چ بۆسەیەکی بۆ ناونەوە. ڕێباز نادیار و دواڕۆژ ون بــوو. تەنیــا ئامانجیان ئەوەبوو. ڕێگای دوور و درێژ ببڕن و زوو خۆبگەیەننە لێری «ئاردن» کە بەشــکو میر لە وێندەرێ بدۆزنەوە ژیانی تاریک و تنووک و ســارد و سڕیان لەبەر تیشکی بەتین و لاواندنەوەی ئەودا گەرم و ڕووناک بێتەوە.

«ڕوزلیندا» بەجلی پیاوانە و «سلیا» لە بەرگی کیژێکی لادێییدا بەنێو سەدان ڕێبواردا تێپەڕین و کەس نەیناسین. کاتێ ڕۆژئاوا بوو لە یەکەم حەسانەوەدا چونکە خشڵ و دراوی نەقدیــان پێ بوو توانییــان ژووری پاک و خاوێن بگرن و خواردنــی باش بخۆن و ڕاحەت بنوون.

٣

«ئۆرلاندۆ» گچکەترین و لاوترین کوڕی «سیر ڕوِلاند» بوو. هەر لە سەرەتای ژیانەوە ڕۆژگار ژەهری ناکامی لە جامی کردبوو، هێشـــتا زارۆکێکی پچووک بوو کە باوکی هەمیشە بەجێی هێشتبوو و چارەنووسی بەبرا گەورەکەی «ئلیور» ئەسپارد بوو. «ئلیور» لاوێکی ســـووک و خۆش ڕابوێر و لە خۆبایی بوو. بەپێچەوانەی وەســـیەتی باوکی هیچ ئاگای لە براکەی نەبوو و باشـــی پێ نەگەیاند. «ئورلاندو» دەگەڵ ئاواڵی گەڕۆک و ســـووکەڵە و خوێـــڕی و هیچ و پووچ گـــەورە بوو. بەڵام چونکە بۆ خۆی چاک و دڵپاک بوو بەبێکارە و دەستەوەســـتان دەرنەچوو، باش پێگەیشت. لاوێکی بوێر و نەترس و بەهێزی لێ دەرهات. ئەوە هەســـتی ئێرەیی و بێزاری کاکی بزواند و خەریک بوو بەهەر جۆرێک بێ ســـەری لە ناخی ڕۆکا و لەنێوی بەرێ.

بەم مەبەســـتە شـــوومە هانی دەدا بەرەنگاری پاڵەوانانی بەهێز و بێ ڕەزا ببێ بەڵکو بـــەدەس ئەوان بچێ. بـــەڵام بەختەوەرانە هەموو جارێ زاڵ دەبوو و ئەوانی دەشـــکاند و دەبەزاند. کە لەم کارە ناهومێد بوو، شەوێکی ژووری نووستنی ئاگر تێ بەردا کە بەهەزار زەحمەت و ناری عەلی ڕزگاری هات.

«ئادام» کۆنە خزمەتکاری باوکی کە بەشـــی زۆری تەمەنی لە خزمەتی ئەم بنەماڵەدا بردبووە سەر، لەم ڕازەی گەیاند و واداری کرد پێش ئەوەی نەخشە ناپاکەکانی کاکی جێ بگرن، ڕابکا و خۆی دەرباز بکا و وڵات بەجێ بێڵێ. چونکە دەیزانی چ شـــک نابا و هیچ دراوی نییە، پاشەکەوتی چەند ساڵەی خۆی دایە و بۆ خۆشی ڕەگەڵی کەوت.

کـــە گەیشـــتە جەنگەڵی «ئـــاردن» پیرە پیـــاوی کەنەفت و زورهان لـــە پێ کەوت، «ئۆرلاندو» ئەوی لەبن سێبەری دارێک دانا و بۆ خۆی بەباریکە ڕێیەکی لێرەواردا ڕۆیشت تا گەیشتە جێگایەک کە میر و دۆستانی خەریکی خواردن بوون. شیری لە کاڵان دەرکێشا کە بەزۆری خواردنیان لێ بستێنێ، بەڵام میر فەرمووی دا و بەڕووخۆشی گوتی:

«وەرە دەگەڵمان بخۆ».

«ئورلاندو» لەکاری خۆی پەژیوان بۆوە و داوای لێبوردنی کرد، پاشان سەرگوزشتەی خۆی بۆ گێڕاوە و گوتی: «ناوی (ئۆرلاندو) و کوڕی چووکی (سیر رولاند)ە».

میر کە بیرەوەری زۆر خۆشـــی لە دۆستایەتی باوکی هەبوو گەلێکی بەخێرهاتن کرد و لە ناسینی ئەو زۆر شاد بوو ناردی پیرە پیاوەکەشیان هێنا و لەژێر باڵی خۆی گرتن.




٤

هێشـــتا حەوتوویەک بەسەر ژیانی «ڕوزلیندا» و «ســلیا» لە جەنگەڵدا ڕانەبردبوو، ڕۆژێــک «ڕوزلینــدا» بەبن پیــرە دارێکدا تێپــەڕی و دیتی ناوی ئەو لــە بەژنی دارێکی هەڵکەندراوە. بەلایەوە سەیر بوو...

هەروا دەگەڕا و تەماشــای کرد ناوی بەدارێکی دیکەوەش هەیە، هەرچی ســەری هێنا و بــرد بۆی نەچۆوە ســەر یەک ئەوە چییە؟ ئاخری هاتە ســەر ئەوەی لــەم لێرەوارەدا فریشتەیەکی ئەفسانەیی هەبێ کە هاوناوی ئەو بێ لەو خەیاڵەدا بوو کوتوپڕ تووشی لاوێک هات کە خەریکی ڕاو بوو، کە باشــی تێڕاما «ئورلاندو»ی ناسییەوە، دڵی کەوتە لێدان و ڕەنگی بزرکا، لێی نیزیک بووەوە و گوتی:

«ناوت چییە؟»

گوتی: «ئورلاندو»

ئەویش ئەوینێکی شــورت و گوم و ئاواتێکــی بابردەڵەی لەڕەنگ و ڕووی ئەودا بەدی کرد و گوتی:

«ئەدی تۆ ناوت چییە؟»

«کانیمد»

پێکــەوە گەڕان «ئورلاندو» بۆی گێڕاوە کە چۆن جارێکی لەوپەڕی ناهومێدیدا لەکاتی ملانەدا کچێکی جوانچاک و دڵپاک هومێدی وەبەر ناوە و شێت و شەیدا و گیرۆدەی خۆی کردووە لەو دەمەوە لە بیری نەکردووە و هەمیشە گۆرانی پڕ سۆزی پێ هەڵدەڵێ و ناوی لە داری جەنگەڵ هەڵدەکەنێ. «ڕوزلیندا» وەختا بوو لە هۆش بچێ و خۆی لە ئامێزی باوێ. بەڵام خودای ئەقڵ تێی ڕاخوڕی، جارێ وەختی خۆ ناســاندن نییە، چاکی تاقی بکەوە و بزانە ڕادەی وەفاداری و فیداکاری چەندە؟ گوتی:

«من نەک (ڕوزلیندا) دەناســم، بەڵکو خزمایەتیشــم دەگەڵ هەیە. وا چاکە هەرچی لە دڵت هەیە بۆ منی هەڵڕێژی تا هەمووی پێ ڕابگەیەنم».

«ئورلاندو» هەموو ڕۆژێ دەچووە کن دۆســتە تازەکــەی و وێکڕا دەچوونە نێو دار و دەوەن و گوڵ و گوڵزار و تەنیشت کانیاو و جۆبار و خەمی دڵی خۆیان دەڕەواند.

بــەرە بەیانێکی زوو تازە گزنــگ کەوتبوو. کە «ئورلاندو» هەســتا و بەرەو دیداری دۆســـتەکەی ڕۆیشت. تەماشــای کرد کابرایەک لەسەر چەقی ڕێگا ڕاکشاوە و خرپ خەوی

لێ کەوتووە. تێی فکری و برا گەورەکەی «ئلیور»ی ناسییەوە. پێی سەیر بوو ئەو فێڵباز و ترسنۆکە لێرە دەبینێ؟ ئەو زۆر لەوە ئازاتر و پتاوتر بوو کە تۆڵە لە دوژمنی خەواڵوو و بێ دەسەڵات بستێنێتەوە. بەڵام بەبێزاری لێی لادا و ڕووی وەرگێڕا و خەریک بوو تێپەڕێ و بڕوا و تەماشای کرد مارێکی شینی ئەنگێوی وەک دۆدانە دۆ، ملی قەف کردووە و گەزارەی دەرکێشاوە و دەهاژێنێ و بەرەو ئەو دەخوشێ. هەستی ئینسانی و خوێنی برایەتی هەموو ڕق و قینی لەبیر بردەوە، شیری هەڵکێشا و ڕای کردە ماری، لە پڕ نەڕەی دێڵە شێرێکی سەر تووتکان جەنگەڵی لەرزاندەوە، ئەو دەستە پاچە نەبوو، لەپێشدا مارەکەی بەزەبرێکی دوو لەت کرد و پاشان بەگژ شێردا هات. شەڕێکی خوێناوی ڕووی دا، شێری توورە پەلاماری دایە. ئەویش دای نەنواند، وەبەر شیرانی دا و شپرزەی کرد. شێری ڕق هەستاوی بریندار ئامبازی بوو و بەچنگاڵە تیژەکانی لایەکی شانی تا پەنجەی دادڕێ، بەڵام نووکی شیری ئەویش جەرگ و ڕیخۆڵەی شێری وە دەشتی خست و خستی و حەیاتی ڕەشی لێ بڕی.

«ئلیور» کە ئەو دیمەنەی دی ئەسرینی پەشیمانی بەچاواندا هاتە خوار. ئەوەندە بەخۆی داشکاوە و شەرمەزار بۆوە کە خۆی خستە سەر پێی براکەی و داوای کوشتن یا بووردنی لێ کرد. «ئۆرلاندو» کە دڵێکی پاک و بیرێکی ڕووناک و خاوێنی بوو لە باوەشی گرت و ڕابردووی لە بیر بردەوە و بەخشی. بەڵام خوێنڕێژی باسک و ماندوویی بڕستی لێ بڕیبوو، نیشانەی مەنزلی دۆستەکانی پێ گوت. ئەویش لەکۆڵی کرد و بردیەوە ماڵە «ڕۆزلیندا» و کارەساتەکەی سەرلەبەر بەتەواوی گێڕاوە. «سلیا» و «ئلیور» خەریکی برژاندنەوەی باسکی و حەساندنەوەی کفتوکۆی لەشی بوون «ئۆرلاندو» شەرمەزار بوو کە بۆ ئەوەندە شەکەتە. «سلیا» بەپێکەنینەوە گوتی:

«پێت وایە دەگەڵ بێچووە پشیلە گەمەت کردووە، هەتیو! تۆ دێڵە شێری سەر تووتکانت کوشتووە» لەم حاڵەدا «ئلیور» چاوی لە چاوە جوانەکانی «سلیا» نەدەترووکاند. دیاربوو «سلیا»ش بێ مەیل نەبوو و جارجار بەناز پەنجەی «ئلیور»ی دەکوشی و وەڵامی داخوازییەکانی دەداوە «ڕۆزلیندا» پاش تاوێک گوتی:

«ئۆرلاندو بێننە لای من باشترم ئاگا لێ دەبێ، بەڵام باسی پەرێشانی منی بۆ مەکە».

ئلیور کە دڵ و دینی لە پێناوی ئەوینی ئەم کیژە نابوو بەپەلە هاتەوە لای «ئۆرلاندو» و ئەوی لە ڕازی خۆی ئاگادار کرد و گوتی:





«لەخودای دەوێ (سلیا) بێتە ژنی ئەو».

ئۆرلاندو بزەیەکی هاتە سەر لێوان و گوتی:

«بچۆ لای و هەموو قسەی خۆتی بۆ بگێڕەوە. نازانی ئێستا تەنیایە و «کانیمد» دێتە لای من»

دوو دڵدار کە بەڕواڵەت دوو دۆستی گیانی گیانی بوون بەتەنێ مانەوە. «ئۆرلاندو» باسی ئەوینی «ئلیور» و «سلیا»ی گێڕاوە. پاشان گوتی:

«خۆزگە و هەزار خۆزگە ئێستا ڕوزلیندای خۆشەویستی منیش لێرە دەبوو».

«ڕوزلیندا» پێکەنی و گوتی:

«هیوابڕ مەبە سۆزی جوانترین بەرگی خۆت لەبەر بکە، وەرە بنکەی میر. ناردوومە خۆشەویستەکەت بێ تکای لێ دەکەم بێتە ڕەزا و شووت پێ بکا».

سۆزی میوانداریێکی باش و جوان لە بنکەی ڕازاوە، میر، ئلیور «ئۆرلاندو» و ئەوانی دیکە چاوەنۆڕ بوون. لە پڕ دوو کچی جوان و چەلەنگ بەجلی خۆوڵاتییەوە دەس لەنێو دەستی یەکتر دەرکەوتن.

«ڕوزلیندا» خۆی بەسەر پێڵاوی باوکی دادا و تکای لێ کرد ئیزن بدا مێرد بە «ئۆرلاندو» بکا، میر لە خۆشی دیداری کچەکەی وەختا بوو باڵ بگرێ، دەستی دوو نۆ بووکانی لە دەستی تازە زاوا نا.

لەولاشەوە میری داگیرکەر کە تەنانەت کچەکەی خۆشی لە دەستانی ڕای کردبوو. بەری شەپۆلی تووڕەیی خەڵکی نەگرت و پەنای بۆ دەیر برد، میری پێشوو سەرلەنوێ چۆوە سەر جێگای خۆی.

خەستەخانە ١٩٧٨/١١/١٠

## ڕێزی نان بگرن

پیاوێکی باڵا بەرز، موو کەژ و چاو کاڵ بوو، نموونەی پیاوێکی ئاڵمانی، پزیشک بوو، زۆر هێدی و لەسەرخۆ بوو، نیشانەی ئەندامەتی حیزبی بەیەخەیەوە دەدرەوشاوە.

ڕۆژێـــک بەمیوانی هاتە ماڵی ئێمە لە کاتی خواردندا ورکە نانێکی زۆر وردی لێ کەوت بەســـەر ســـوڕمانەوە دیتم داهاتەوە و هەڵی گرتەوە و پێش ئەوەی من چ بڵێم خســـتیە زاریەوە.

ئەگەر جاران کارێکی ئەوتۆم بەئێرانییەکەوە دیبا کە لە هەموو تەمەنیدا نان و خواردنی بەنیعمەتێکی ئاســـمانی زانیـــوە و ڕێزی لێ گرتووە، زۆرم بەلاوە ســـەیر نەدەبوو، بۆچی ئێســـتاش خۆم ئەگەر لە کۆڵان و ڕێباز تووشـــی ورکە نانێک بم کە فڕێ دراوە یا وەریوە، هەڵی ناگرمەوە و فووی لێ ناکەم و لە کۆنە دیوارێکی ڕا ناکەم؟ تا نەبێتە پێخوست. بەڵام ئەو دوکتۆرە ئاڵمانییە کە هەمیشـــە تێر و تەســـەل بووە و لە ئێروو و خۆشیدا ژیاوە. بۆ وای کرد؟ بیر کردنەوەکەم بوو بەپرسیار و گوتم:

«بۆچی ئەم ورکەت کە ڕەنگبێ پیسیش بووبێ خوارد؟»

بزەیەکـــی هاتێ بەڵام بزرکا و نیگای تاریکـــی و پەژارەی لێ باری. پاش تاوێک ڕامان گوتـــی: «دەزانـــم خواردەمەنی هەیە و دەزانم ئێســـتا لە زۆر وڵاتان گەلێک شـــت وەگیر دەکەوێ و تەنانەت لە هێندێک ماڵان بەپێی فیلانە. ئێمەش لێرە لە ئێرووودا دەژین، بەڵام



من مەرجم کردووە هەتا ماوم هەرگیز هیچ خواردەمەنییەک فڕێ نەدەم و خەسار نەکەم».

دوایە ئەم سەرگوزەشتەی بۆ گێڕامەوە:

«لاو بووم تازە لە زانستگەی پزیشکیدا دەستم بەخوێندن کردبوو، یەکێک لە دۆستانی کۆنم دۆزییەوە کە لە منداڵییەوە ئاشنا بووین. دەگەڵ خۆی بردمە کۆڕی لاوانی کۆمۆنیست ئەگەرچی دەترسام بەڵام چالاکی و هەڵسووڕانی ئەم لاوانە سەرنجی ڕاکێشام و ویستم بەم ئاگرەی لە دەروونی ئەواندا بڵێسەی گرتبوو خۆم ببووژێنمەوە و نەک هەر خۆم گەرم کەمەوە بەڵکو گڕێک لە دەروونی خۆم هەڵگیرسێنم.

ئەو دێوەزمەم ناخۆش دەویست کە وردە وردە سێبەری شوومی بەسەر وڵاتدا کێشابوو و هەموو کەلێن و قوژبنی تەنیبوو. ئەم لاوانە دەیانویست دەگژ ئەو ڕاچن. کەم کەم لەوان نیزیکتر دەبوومەوە و ئەو تاعوونە ڕەشەم کە بریتی لە هیتلەر و حیزبی نازی بوو، باشتر دەناسی و لە جاران پتر ڕق و قینم لێ هەڵدەگرت و تێ دەگەیشتم چ تارماییەکی ڕەش و بەسام و مۆتەیەکی خوێنمژ هەڕەشەمان لێ دەکا و چ چارەنووسێکی شووم و دزێومان لە پێشدایە و دواڕۆژێکی چەن پڕ مەترسی چاوەڕوانمان دەکا.

ژیان و کار منی لەم لاوانە هەڵبڕی، ترس وای هەموو کەس داگرتبوو کە من نەمتوانی دۆستانی خۆم بدۆزمەوە. ئەوەندەی پێ نەچوو شەڕ هەڵگیرسا و منیش کە ئیتر پزیشک بووم ناردرامە جەبهە. دەڕۆیشتین و پێمان لەهەر جێیەک دەنا. چارەڕەشی، ماڵوێرانی، برسایەتی و ئازار و جەزرەبە و ئاگر و سووتمان و کێم و خوێن و نەخۆشی و مەرگمان دەگەڵ خۆمان دەبرد. من بەتاقی تەنێ لەنێو ئەو هەموو ئەفسەر و سەربازانەدا کە بەکردەوەی خۆیان دەنازین، خەفەتم دەخوارد. تەنیا کارێکی نەختێک باش کە لە دەستم دەهات ئەوەبوو بەنهێنی یارمەتی گرتووەکان بدەم. یا ئەو کەسانەی بەزۆری و بەبێگار خزمەتی خۆمان پێ دەکردن ئازار نەدەم و پاروە نانێک یا تۆزە دەرمانێکیان بەدزی و فڕێ بدەمێ.

زۆر زوو گەیشتینە وڵاتی پان و بەرینی شووڕەوی، لەوێ جاری وا بوو چەند مانگ لە جێگایەک دەماینەوە، من خەریک بووم لە فەرماندەکەم نیزیک ببمەوە. تا لە سایەی دۆستایەتی ئەودا ئازاری پترم هەبێ و بتوانم خواردن و دەرمان بدەم بەو ژن و کچانەی خزمەتمان دەکەن و ئەوەشم بۆ کرا. ئیتر هەموویان خوویان بەو کاری من گرتبوو جاروبار سەریان داوێشتە سەرم پێیان دەگوتم دڵتەڕ، جاری واش بوو ناویان دەنام دوکتۆری سوور. منیش بەکاوەخۆ کاری خۆم دەکرد و گوێم بەو گاڵتە و گەپانە نەدەبزووت. جونکە کارم




باش دەکرد و لە کارکردنم ڕازی بوون ئەفســەرە بەرزەکان دەگەڵم دۆســت بوون. منیش ئاگام لە دزی و دەسپیســی ئــەوان بوو، بۆیە کەس وێم نەدەڕســت و ئازاری نەدەدام و دۆســیەی بۆ دروست نەکردم. دەنا شۆفار و دووزمان و جاسووس یەکجار زۆر بوون وردە وردە زمانی ڕووسی فێربووم.

«ڕۆژێک یەکێک لەو کچانەی دەمناسی بەپەشۆکاوی و سەرلێشێواوی لێم وەژوور کەوت و گوتی: دوکتۆر دەستم بەداوێنت ئەگەر دەتوانی یاریدەم بدە. گوتم چ قەوماوە؟ چ کارێک لە دەس من دێ؟ گوتی: دایک و باوکم سەریان دێشێ و زۆر سەخڵەتن و ئێمە نازانین چ بکەیــن و چمان لە دەس نایە، ماڵەکەیان بەپەنا ماڵی ئێمەوە بوو. کارەکانم تەواو کرد و دەگەڵی چووم برێک دەرمانیشم برد. باش دەمزانی ئەم ژانە سەرە لە برسانە، چووینە نێو ماڵێک ئیتر چی تێدا نەمابوو چەن ســیپاڵ، چەن تەختەی لەت و پەت چەند قاپەشــکاو و کۆنــە ســەماوەرێک و چادانێکی گاوکراو و چەن پیاڵە نەبــێ، خانوویەکی بچووک بوو کە شــەڕی شــووم و ئێمەی داگیرکەر بێ ڕەحم گەسکمان لێ دابوو. لە تەنیشت تەندوور پیرێژن و پیرە پیاوێکی نیوە زیندوو تخێڵ ببوون. لە ڕوخســاری ئەواندا تەنیا دوو چاوی ڕۆچوو بریسکەیان دەدا. بەپەنا یەکەوە ڕاکشابوون. وەک مردووان زەرد هەڵگەڕابوون. بێ هێز و لەڕ و لاواز بوون، نەیاندەتوانی قســە بکەن یا ببزوون. دوو سێ زارۆکی ڕەشوڕووت و کز و مردەلۆخە بەترســەوە تەماشــای منیان دەکرد. تەماشــام کردن پرســیم: چەند ڕۆژە چییــان نەخواردووە؟ کچەکە بەکوڵی گریانەوە گوتی: حەوتەیەکە زەوادیان نەبڕیوە، بەنیگەرانییەوە گوتم: چما چتان نەبوو؟ بۆ زووتر بەمنت نەدەگوت؟ من ئەوشەو لە بەشی خۆم شتێکت دەدەمێ دەرخواردیان بدە.

کچەکە گوتی: دوکتۆر تۆ زۆر دڵســۆزی، بەڵام هەرچی دەکەم ئەم دووانە هیچ ناخۆن تەنیــا جار جارە چۆڕێک ئاو نەبێ. نووزەی پیرێژنەکەم گوێ لێ بوو چوومە ســەرینی تا باشتر، گوێم لێ بێ. دەیگوت ئێمە بەشی خۆمان ژیاوین نابێ پاروو لە زاری ئەم زارۆکانە بگێڕینەوە. هەرچی هەبێ با ئەوان بیخۆن، تا بژین، تا گەورە بن تا ڕۆژی خۆشــتر ببینن دایکە بێدەنگ بوو، دیتم ئەو دوو پیرە فیداکارانە دەستی یەکتریان گرتووە و چاویان لێک نــاوە، دەتگوت بەم کردەوە دڵی یەک دەدەنەوە و پێشــی ناڵــەی خۆیان دەگرن. ئەوکم گیرابــوو، زمانم لە بەنــد چووبوو، لە بەرامبەر ئەم هەموو خۆڕاگری و پێداگرییەدا چم پێ نەبوو بیڵێم. ئەوان بەگیان و دڵ بەپیر مەرگەوە دەچوون. چەند حەبی ئیسپرینم دانێ تا کەمێک ژانە ســەرەکەیان کەم بێتەوە. تەنیا ئاواتم ئەوەبوو وەک ئاڵمانییەک بێ ڕێسمەی دەرکی ئەم ماڵە خاپوورە ماچ بکەم و لە ڕاست ئەم هەموو زیبک و غیرەتەدا چۆک دادەم،

بەڵام بەداخەوە هەر ئەوەندەم توانی لەبەر ئەواندا کە ئیتر نەمابوون سەردانوێنم.

لــەو ڕۆژەوە مەرجــم کــردووە خواردەمەنی هەرچی بێ نرخیش بــێ زایە نەکەم و تا هەم لەســەر مەرجی خۆم ڕادەوەســتم. من لە نیزیکەوە بەڵێ زۆر لە نیزیکەوە دێوەزمەی برسایەتیم دیوە.

١٩٧٣/١٣٥٢

## کورتەی ئۆدیسە

هومێر

شـــاری ئەســـتەم و شـــوورەداری «ترووادا» پاش گەلێک قەڵاداری و دەستەوەکەری و بەرگری و شـــەڕ و کێشـــە و خوێنرێژی و قات و قڕی بەدەس دەگیرێ و بەجارێکی تەخت و خاپوور دەکرێ.

هێرشـــبەرانی کۆڵنەدەر، پاڵەوانان و مەردانی گەمارۆدەر و دلاوەرانی نەبەز، سەرخۆش لە بادەی زاڵبوون و ئازایەتی دەگەڕێنەوە بۆ نێو ماڵ و منداڵ و کەســـوکار و خاووخێزانی خۆیان.

لەم نێوەدا تەنیا «ئۆلیس»ی کەللەڕەق، ســـەربزێو و چاونەترسی پاتشای «ئاتاک» لە ترســـی هەڕەشـــەی «نپتۆن» خوای دەریایان هەڵوەدا و ئاوارە دەبێ. «پنلوپ» ژنە جوانەکەی و (تلماک) ڕۆڵە تاقانەکەی هەر چاوەڕوانن و چ سەر و سۆراغی نییە. ساڵ و مانگ تێپەڕین و ئەو هەر بێ سەروشوێنە. دوژمنانی «ئۆلیس» و گیرۆدەکانی ئەوینی «پنلوپ» دەرفەتیان هێناوە و مرخیان لەو نازدارە شۆخ و شەنگە و لەو ژنە جوان و چەلەنگە خۆش کردووە و هەریەکە خەریکن بەفێڵێک ئەم ژنە پاک و خاوێنە بەدەس بگرن. بەلام «پنلوپ» ژیرانە هەر کامەی بەچەشـــنێ تەفرە دەدا و بۆ گەڕانەوەی مێردەکەی ڕۆژ ئەژمێری دەکا.

لەلایەکی دیکەوە بەیارمەتی «مینروا» خوای ئەقڵ، کوڕەکەی وەدوای شووەکەی خستووە گێژاوی توند و تیژ و بێ بەزەیی دەریا جارێکی دیکەش پەلاماری شـــێتانەی بردە ســـەر کەشتی سەرگەردان و بێ پەنای «ئۆلیس» و پێش ئەوەی کەشتییەوانەکانی وەخۆکەون و

چارەیەک بدۆزنەوە. کەشـــتییەکەیان لە بەستینی «ئۆژیژی» لە قوڕ دەنیشێ ئەم دوورگە بنکەی ژنە جادووگەرێکی زۆر جوان بوو کە ناوی «کالیســـپو» بوو. هەر لە یەکەم نیگادا دڵی چوە ســـەر «ئۆلیس» و ویســـتی دەســـتی دەگەڵ تێکەڵ بکا و دەگەڵی بمێنێتەوە. بەڵام ســـەرداری مەزن دڵی لە جێگایەکی دیکە بوو. ئاواتی گەڕانەوە بۆ نیشتمان و زێدی خۆشەویست و دیداری ژنە وەفادارەکەی و ڕۆڵە نازدارەکەی دەیتواندەوە. بۆیە هیچ ڕووی نەدایـــە و خـــۆی تێ نەگەیاند. جادووگەریش بەڕق داچوو و ســـوێندی خوارد تا مابێ لەم دوورگەدا زیندانی و دەسبەسەری بکا.

«ئۆلیس» ماوەی هەشـــت ســـاڵ لەم دوورگەدا دەسبەسەر بوو. ڕۆژانە لە کەنار دەریا لەسەر گاشە بەردێکی دادەنیشت و فرمێسکی هەڵدەڕشت و بەخەمناکی لە ئاسۆ ڕادەما.

پەرێشـــانی و لێقەوماوی گەیبووە ڕادەیەک کە خودایان هەموو بەزەییان پێدا دەهات بەڵام «نپتۆن» خوای دڵڕەق و ڕق ئەســـتووری دەریا، بڵێســـەی قینـــی دانەدەمرکاوە. ئاخر ئەو چۆن لە کەســـێکی یاخی و ســـەرکێش و نەترس دەبوورێ کە خۆی لەو بەکەمتر نەدەزانی؟

ڕۆژێ «مینـــروا» خودای ئەقـــڵ پێی زانی کە «نپتۆن» ســـەفەرێکی دوور و درێژی لەپێشدایە و وا زوو ناگەڕێتەوە بەهەلی زانی و ئۆلیسی سواری تەختەیەک کرد و ناردیەوە بۆ وڵاتی خۆی. بەڵام بۆ بەدبەختی نپتۆن ئەوەندەی پێ نەچوو و گەڕایەوە کە ئەوەی دی چاوی چووە پشـــتی سەر. یەک بەخۆی نەڕاندی و فەرمانی بەگەواڵە هەوران دا. پاڵ وێک بدەن و شـــۆرابە بەر بدەنەوە و یارمەتیش لە ڕەشـــەبا و گێژەلووکە وەربگرن. بەم جۆرە فەرتەنەیەکی نایەوە کە بەچاوتروکانێک تەختەی ئۆلیسی چارەڕەشی تێکوپێک شکاند و ورد و خاش کرد. ئۆلیسی بێچارە کەوتە نێو نێرینەی دەریای بێ ئامان و وەپەلەقاژەکەوت. بەڵام لەم جەنگەڵدا (ئینۆ) پەری دەریایی بەچاوی ئەنگاوت و زگی پێ سووتا و تیتۆڵێکی لە ڕووپۆشەکەی خۆی دڕاند و بۆی هاویشت و گوتی:

«لە نێوقەدی خۆتی ببەستە دەتگەیەنمە وشکایی»

ئۆلیس کە لە سەرەمەرگدا بوو بەقسەی کرد. بەڵام بوورایەوە و ئاگای لە خۆ بڕا. کاتێ وەخۆ هاتەوە خۆی لە بەستێنی دورگەی (فیناس) دی.

ئەمشەوە «نازیکا» کچی فەرمانڕەوای (فیناس) خوای خوایانی خۆیانی لەخەو بینی:

کە فەرمانی پێ دا بەیانی زوو هەســـتی جلی باوک و براکانی بەری لە دەریا بشـــوا. بەیانی زوو دایکی چێشتێکی باشی دروست کرد و گۆزەیەکی شەرابی کۆن و دەفرێکی پڕ




زەیتوونی دایە و خزمەتکاری دەگەڵ ناردن بۆ لێواری دەریا.

کیژەکان تازە لەسەردەمی کەناری دەریا دەستیان بەیاری و گاڵتە و گەپ کردبوو. کە دیتیان کەڵەپیاوێکی بەشان و باهۆ و بەدار و بار و کەڵەگەت، بەڵام شپرزە و خوێناوی و بریندار لەبن گابەردێک هاتە دەر. خزمەتکارەکان کە چاویان پێ کەوت ترسان، زیڕاندیان و هەڵاتــن. ئەمما نازیکا ئازایانە بەپیرییەوە چوو و ماندوو نەبوونی لێ کرد ئۆلیس کە لەبەر بێ هێزی و شـــەکەتی و برســـایەتی توانی نەمابوو. بەسەرهاتی خۆی بەکورتی بۆ گێڕاوە. نازیـــکا، نان و چێشـــت و شـــەرابی بۆ دانا. تا تێر و پڕی خـــوارد و ئاهێکی هاتەوە بەر. ئەمجـــار پیلی گرت و بردییە کن باوکی «ئالینووس» فەرمانڕەوای دڵپاک و پیر و زوڕهان پێشوازێکی گەرم و بەخێرهاتنێکی زۆری لێ کرد و لە حاڵ و ئەحواڵی پرسی. ئۆلیس پاش ڕۆژێک حەسانەوە سەرگورشتەی خۆی وا بۆ گێڕاوە:

(من ناوم ئۆلیس کوڕی «لائێرتیس» پاتشـــای ئیتاکم لە سەرانســـەری یۆناندا کەسێ نەبوو ناوبانگی منی نەبیســـتبێ و داســـتانی ئازایەتی و نەبـــەزی و تاریفی هێزی باهۆی منی نەزانیبێ. شـــوورەتی دلێری و بوێری من لە دنیادا نەما و گەیشـــتە حەوت تەبەقەی ئاسمان. بۆیە خودایان لێم تووڕە بوون و تووشی ئەو هەموو بەڵایانەیان کردم. نەیانهێشت بگەڕێمەوە زێد و نیشتمان و نێوماڵ و خێزانی خۆم.

کاتێک گەمارۆی ترروادا دوایی هات. من لەشکرەکەی خۆم گێڕاوە و ڕووم لە وڵاتی خۆم کردەوە. بەڵام هەر لە یەکەم ڕۆژدا دەریا بەگژماندا هات. چوار شەو و ڕۆژ ئێمەی وەک زلە کایەک خســـتە بەر شەپۆلە بێ ئامانەکانی خۆی. ڕۆژی پێنجەم شەپۆلەکان هێوربوونەوە. خۆمان گەیاندە دوڕگەیەک کە ئی هۆزی «ســـیکۆن» بوو لە پێشـــدا ئێمە هێرشمان بردە سەر ئەو هۆزە وەحشییە و تاڵان و دەسکەوتێکی باشمان وەگیرکەوت. بەڵام بەیانی کوڕە کوڕەی هۆزەکە لێمان وەخۆ کەوتن و کوشـــتارێکی باشیان لێ کردین و بەزەحمەت خۆمان ڕزگار کرد.

کاتێک کەشتیی ئێمە کەوتەڕێ هەوا نەرم و خۆش بوو و هەتاوی بەتین و گەرم تیشکی زێڕین و جوانی خۆی بەســـەر دەریای شـــین و هێمندا بڵاو دەکردەوە و چاو لە دیتنی تێر نەدەبـــوو. بەڵام ئەوەندە پێ نەچوو هەوا ئاڵۆز و تـــووش بوو. با و تۆفان و گەردەلوول، گێژەنەیان نایەوە. پاش نۆ ڕۆژ خەبات و بەرەنگاری ئازایانە لە بەســـتێنی دوڕگەی «کنار خـــۆران» لەنگەرمان گرت. لـــەم دوڕگەدا هۆزی «کنار خۆران» دەژین. بەشـــێکی ئێمە دابەزین و چوونە ئاوەدانی بەشکم نان و ئاوێک پەیدا بکەن. ئەوان لەوێندەرێ بەخواردنی

میوەیەکی شـــیرین کە پێی دەڵێن «کنار» ســـەرخۆش و گێژ و وێـــژ بوون و لەبیرەخەو ڕاچوون و هێزی وەیان نەما لە جێگای خۆیان ببزوون. بەزۆرەملێ و پاڵەپەستۆ هەرچۆنێک بوو گەیاندماننەوە کەشـــتی و بەپەلە دوورکەوتینەوە نەوەک فێری خواردنی ئەم میوە بین و هەتا دەمرین لەوێندەرێ دایکوتین.

ســـەفەری ئێمە لە دەریای تۆفانیدا هەروا درێژەی بوو تا گەیشتینە وڵاتی «سکلوپ» یا ســـەرزەمینی غوولانی یەکچاو. لەنگەرمان گرت و دەگەڵ دوازدە هاوڕێ بۆ پەیداکردنی تێشـــووی ڕێگا بەرکە و هەورازەکاندا هەڵگرین. لەوێ تووشـــی ئەشـــکەوتێکی زۆر گەورە بووین. کە بەرێز، مەشکەشـــیر، پێســـتە پەنیر، خیگە ڕوونی لێ داندرابوون. لە خۆشیان شاگەشـــە بووین و هەڵپەڕین و چاوەڕێی خـــاوەن ماڵی دەوڵەمەند بووین. تا بگەڕێتەوە و ئازووخەیەکی زۆری لێ وەرگرین.

کـــە زەردە پـــەڕی و ڕۆژ ئاوابوو پیاوێکی زل و زەبـــەلاح و خوێنتاڵ و دزێو کە تەنیا چاوێکی لە نێوچاوان بوو. دەگەڵ گاڕانێک مەڕ گەڕایەوە ئەشـــکەوت. پەزەکان هەموویان لـــە خۆی قەڵەوتر بوون کە چـــاوی پێمان کەوت و بەدەنگێکی وەک هەورە تریشـــقە کە هەموو ئەندامانی لەشـــمانی لەرزاند گوتی: ئەی بێگانـــە کێن؟ لە کوێوە هاتوون؟ لێرە چ دەکەن؟ ئێمە لەســـەرەخۆ وەڵاممان داوە: ئەی خانەخوێی مەزن ئێمە پۆلێک لە لەشکری یۆنانیانین لە شـــەڕی ترواد دەگەڕێینەوە. ماوەیەکە ڕێگامان لێ گۆڕاوە و ئازووخەمان لێ بڕاوە و چمان نەماوە و ئێستا پەنامان بۆ ئێوە هێناوە کە لە ڕێگای «زئوس»دا ئەمشەو پەنامـــان بدەی و بەیانی کەمێکمان ئازووخە پێ کـــەرەم بفەرمووی. وەڵامی ئەو بەرقەوە بۆ ئێمەی لێقەوماو ئەوەبوو: ئەی چارە ڕەشـــینە ئێوە بەهەڵە چوون کە پێتان وایە ئێمە بەندەی زئوســـین خوای ئێمە نپتۆنە. ئەمجار هەستا و بەردێکی یەکجار گەورەی بەزارکی ئەشـــکەوتەکە وەنا. پاشـــان دوو کەسی لێ هەڵبژاردین و بەهاســـانی پچڕ پچڕی کردن و لەپێش چاوی ئێمە زۆر بەئیشـــتیاوە خواردنی و پێکەنی گوتی شـــێوی ئەمشەوم ناخۆش نەبوو. دوایە لەســـەر لۆدە کایەک کە لە قوژبنی ئەشکەوتەکە هەڵدرابۆوە لەسەر گازەرای پشت ڕاکشا و خرپ خەوی لێ کەوت. لەپێشدا ئارەقەیەکی ساردم ڕێ نیشت. بەڵام دوایە غیرەتم بزووت و ئاگرزی تووڕەیی هەموو لەشـــی داگرتم و مووم لێ بوونە نەشـــتەر. نیازم وابوو شـــیرەکەم هەڵکێشـــم و بەهەموو هێزی خۆم لەســـەر دڵی ڕۆکەم. بەڵام دوایە بیرم کردەوە ئەگەر بیکوژم دەبێ هەموومان لەم ئەشـــکەوتەدا بمرین و برزین. چونکە دەمزانی جگە لە خۆی کەس ئەم بەردەی بۆ لە دەرکی ئەشکەوت ناکرێتەوە.

بەیانی زوو هەســـتا ئاگری کردەوە، پەزەکانی دۆشین ڕسقەکەی ڕەعەمەل هێنا و دوو

کەســی دیکەی ئێمەی برژاندن و خواردنی و دەم و لەوسی لستەوە و مەڕەکانی دەرکردن و بەردەکەی بەزاری ئەشکەوتەوەنا. ئەو ڕۆژەی هەر ئەوەندەمان پێ کرا شینی دۆستانمان بگێڕین. دوای زۆر لێکدانەوە بیرێکم بەمێشک داهات. لە گۆشەیەکی ئەشکەوتەکەدا دارێکی زۆر گەورەی زەیتوون هەڵپەسـێردرابوو. دەگەڵ دۆســتان بەزەحمەت نووکمان تیژ کرد و لە ئاگرمان نا تا باش داگیرسـا. شەو کە غوولی یەکچاو هاتەوە. چوومە لای و گۆزەیەکی شــەرابی تونــد و کۆنمان پێ مابوو بۆم برد و گوتم قوربان! ئــەو دیارییەت دەدەمێ بەو مەرجە بەرم بدەی. غوول وەری گرت و یەک بین بەســەریەوە نا و گوتی: شــەرابێکی زۆر بــاش بوو. ئەی بێگانە ناوت چییە تا من وەبیرم بێتەوە. گوتم: قوربان ناوم هیچکەســە دۆســتان هەر پێم دەڵێن هیچکەس. گوتی: ئافەرین هیچکــەس بەڵێنت پێ دەدەم تۆ لە دوای هەمووان بخۆم.

شــەراب کاری خۆی کرد، خاوی کردەوە، گێژ بوو و بەپشــتەوەدا کەوت و لە غورابی خــەوێ ڕا چوو. ئیتر خۆگنخاندن کەڵکی نەبوو بەیارمەتی شــەش کــەس لە یاران دارە زەیتوونمان لە ئاگردا سوور کردەوە و بەهەموو هێزی خۆمان لە تاقە چاوەکەمان ڕۆ کرد. چاوی ســووتا و یەک بەخۆی نەڕاندی کێو و دەشــت دەنگی دایەوە و ئەشکەوت لەرزی، هێنــدەی پێ نەچوو ئەو غوولانەی لــەم دەوروبەرە بوون داوەڕووکان. ئێمە هەموو خۆمان شــاردەوە و چاوەڕوانی چارەنووســی خۆمان بووین. غوولەکان لێیان پرسی: چ بووە؟ کێ وای لــێ کردی؟ ئەو کە لە تاوی ئێــش و ژان وەک مار جینگڵی دەدا لە وەڵامدا دەیگوت هیچکەس، هیچکەس، دۆســتەکانی وای بۆ چوون ئەم بەڵایە «نپتۆن» بەسەری هێناوە و هیچ لە دەس ئەوان نایە و ڕێی خۆیان گرت و ڕۆیشتن.

غوولی بریندار و کوێر و کوتر بەردی زارکی ئەشکەوتی لابرد. تا مەڕەکان بڕۆن. دەستی بەپشــتی هەموویان دادەکێشا تا بزانێ خۆمان بەپشتیانەوە قایم نەکردووە؟ تا بمانگرێ و تۆڵەمان لێ بکاتەوە. بەڵام ئێمە کە خۆمان بەبەر زگی بەرانەکاندا هەڵاواسی بوو ڕزگاریمان هات. مەڕەکانیشــمان وەپێش خۆماندا و خۆمان گەیاندەوە کەشتی. من گاڵتەم پێ کرد و گوتم: من پاتشای ئاشتاکم. غوولی نیوەگیان بەردێکی گەورەی هەڵکەند و تێی هەڵکردین. باش بوو دوورتر لە ئاو کەوت، دەنا لەوانەبوو کەشتییەکەمان غەرق بکا.

لەوێــوە بەرەو ماڵ گەڕاینەوە. بەڵام ســەفەرەکەمان چەنــد ڕۆژ لەبەر تۆفان درێژەی کێشــا. ڕۆژێک گەیشــتینە دوڕگەیەکی پــان و پۆڕ. کە زانیمان بنکــەی «ئایوولووس» پاســەوانی بایەکانە. کە بەسەرهاتی سەیر و ســەمەرەی خۆمانم بۆ گێڕاوە. هەمبانەیەکی پــڕ لە بای دامێ. گوتی: بەهێزی خۆم بایەکانم تێــدا بەند کردووە، بەڵام نەکەی زاربێنە

زێڕینەکـــەی بەهیچ بارێـــک بکەیەوە. کە بایەکان بەڕەڵڵا دەبن و دەســـبەجێ پاپۆڕەکەت تێک دەشـــکێنن زۆرمان ســـپاس کرد و بەتیشـــوو و ئازووخەیەکی تەواوەوە کەوتینە ڕێ بەڵام دوو ڕۆژ لە ســـەفەری ئارام و ئاســـوودەی ئێمە تێ نەپەڕیبوو کە: هاوڕێکانم بیریان کردبووەوە کـــە «ئایوولووس» بێگومان گەنج و گەواهیراتێکی زۆری بۆ من لە هەمبانەکە کردووە و ڕەنگبێ، بەشی وانی لێ نەدەم. خۆیان پێ ڕانەگیرابوو و زاربێنەکەیان کردبۆوە. لەپڕ هەوا گۆڕا با هەڵی کردێ تۆفان پەیدا بوو. دیســـان گەمیەکەمانم کەوتەوە فەرتەنە و داڵی مەرگ بەســـەرماندا دەخولاوە. بەهەزار ناری عەلی گەیشتینە دورگەی «سیرسە»ی جادووگەری بەدفەڕ. لەوێش گوڵمەزی وامان بەسەرهات لە گێڕانەوە نایە. هەر چۆنێک بوو لەو موڵەکەش ڕزگاریمان هات. پاشـــان چووینە دورگەی «ترزیاس» شوانی مێرخاس زۆر پیاوانە و بەڕووخۆشانە دەگەڵمان جوولاوە. بەڵام هاوڕێکانم ئەوەندە تامەزرۆ بوون. چەند مەڕی ئەویان کوشـــتەوە و خوارد. «هیلوس» خـــوای هەتاو ئەو نامەردییەی بەدڵ نەبوو گازنـــدەی بردبووە بەر «زئوس» خودای خودایان بڕیاری دابوو تۆڵەیان لێ بکاتەوە. بۆی کە ئەو دورگەمان جێ هێشت تۆفان کەشتییەکەمانی تێک شکاند و بەتەنێ من دەرچووم، ماوەیەک لەنێو دەریادا مەلە و پەلەقاژەم کرد تا گەیشـــتمە دورگەی «ئۆژیژی» هەشـــت ساڵ لەوێ دەسبەسەر بووم تا بەتەختەیەک نەجاتم بوو و ئێستا ئەوە لێرەم دەبینن).

کاتێک سەرگوزشـــتەی ئۆلیس دوایی هات هەموو زگیان پێ ســـووتا. پاتشای فیناس کەشـــتی بۆ ئامادە کردن و پیاوی دەگەڵ خســـتن و بەڕێی کرد. کە گەیشـــتنە بەندەرگە خودای ئەقڵ خۆی گەیاندێ و پێی ڕاگەیاند کە هەر ئێستا تەواوی دوژمنانی لە کۆشکەکەی ئەون و ئەگەر بەئاشـــکرایی بچێتەوە. لەوانەیە بەهەمووان ســـواری سەری بن و بەخۆڕایی بیکوژن. وا چاکە جلی هەژارانە لەبەر بکا و بچێتە کۆخی کۆنە دۆســـتەکەی «ئۆمائوس» ئۆلیس بەقسەی کرد و لەوێ لاوێکی جوانچاک و ڕێکوپێک و بەشان و باهۆی چاو پێکەوت بەدرۆشـــم زانی کوڕەکەی خۆیەتی. باوک و کوڕ پێک شاد و شوکر بوون و پاش نیزیکەی بیست ساڵ یەکتریان لە ئامێز گرت و ماچ کرد.

شـــەوێ بەجلی شڕەوە چووە کۆشکی خۆی. کە لە دەرکی وەژوور کەوت سەگە پیر و نەخۆشەکەی «ئارتوس» کلکەسووتەی لەبەر کرد، سواڵکەرێکی خوێری زانی ئەو ڕێبوارە، هەژارە، ڕووتەڵە جگە لە ئۆلیس نابێ کەسی دیکەبێ. دەسبەجێ خەبەری بۆ (ئاینتووس) کە یەکێک لە ســـەرداران بوو برد. ئەو گەرچی بڕوای بەســـواڵکەرەکە نەکرد. هەســـتا و چوارپایەکی بەهێزی خۆی لە تۆقی ســـەری ڕاکێشـــا. ئۆلیس تێـــک هەڵگلا و بەتووڕەیی

هەســتاوە و خەریــک بوو تۆڵەی بکاتــەوە. بەڵام خودای ئەقڵ تێی ڕاخــوری. ناچار لە سووچێک خزا. (ئاینتووس) دڵنیا بوو کابرا بەهەڵە چووە.

لــە ژووری تالار هەرا بوو. (پنلوپ) کەوانە گەورەکەی ئۆلیســی بەدەســتەوە بوو و دەیگوت:

«دوا هەلتانە هەر کەس توانی کەوانی مێردەکەم بکێشــێ و تیرێکی پێ باوێ شــووی پێ دەکەم».

هەموو ئەم پێشنیارەیان قبووڵ کرد و بەفیزەوە ئامادە بوون. بەڵام هەرچی قەوەیان دا بەخۆ و هەوڵیان دا نەیانتوانی کەوان بکێشن. تا لە دواییدا ئۆلیس هاتە پێش هەموو بەوە پێکەنین کــە هەژارێکی پیر و زورهان دەیەوێ هێزی خۆی دەگەڵ هێزی لاوانی بەناوبانگ تاقی بکاتەوە. بەڵام بەپێچەوانەی بۆچوونی ئەوان کەوانی تا ئاخر کێشا و تیرێکی توندی هاویشت.

ئەمجار جلە شرەکانی لەبەر خۆی دارنی و نەڕاندی:

«ئەی زۆردارانی خۆپەرســت ئەو کەســەی لە بەرامبەر ئێوەدا ڕاوەستاوە کەس نییە، ئۆلیس نەبێ کە پاش گەلێک ســاڵ دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی و دەبینێ دۆستانی خەیانەتی پێ دەکەن».

تلماکیش بەجلی زێرکفت و ڕەنگاوڕەنگەوە هات و لە تەنیشــت باوکی ڕاوەستا. ئۆلیس کەوانەکەی ڕاکێشا و تیرێکی لە ئەوکی ئاینتوو دا و لە حاڵێکدا کە جامی شەرابی زێڕینی بەدەستەوە بوو لە خوێنی خۆی گەوزی.

کــە ئەو کوژرا ئەوانی دیکــە وەخۆ هاتنەوە. بەڵام هەرچی لەنێزە و شــیر و مەتاڵی خۆیان گەڕان نەیاندۆزینەوە. چونکە تلماکی ژیر و وریا لێی شــاردبوونەوە مێزیان شکاندن و کورســیان دەس دانێ و ڕاماڵیان بۆ ئۆلیس برد. بەڵام لە بەرامبەر هێزی باهۆ و تیری گرچووبــڕی ئەودا خۆیان نەگــرت و توانایان نەبوو هێندە پێ نەچــوو هەموو لە خوێنی خۆیاندا تلانەوە.

پاڵەوانی مەزن ژنە خۆشەویســتەکەی لە ئامێز گرتەوە و پاش بیســت ساڵ ئاوارەیی، بەختەوەری ڕووی تێ کردنەوە.

١٩٧٨/١٢/٤

# وشە ونبووەکان

کاتۆل مەندیس

ســـەردەمێک لە مەڵبەندێکی زەنوێر و سازگار وەک بەهەشـــتی بەرین پەریزادێک رای دەبوارد کە لە شـــۆخ و شەنگی و جوان و چەلەنگیدا وێنەی نەبوو. بەڵام لە بێ بەزەیی و دڵڕەقی و دەسرەشیدا کەس دەسکی لەدوو نەدەکرد. لە مەڵبەندەکەی ئەودا خەڵک ژن و پیاو، پیر و لاو، وردە و زارۆک هەموو بەشێکی باشیان لە پیتی خۆڕسک پێ بڕا بوو.

کەس نەیزانی پەریزاد بۆ ڕقی لە پڕ و لە ناکاو لە دانیشتوانی ئەم مەڵبەندە پڕ خێر و بێرە هەستا؟ بۆ ئاورگی تووڕەیی بڵێسەی بەرز بۆوە؟ بۆ هاتە سەر ئەوەی بەگژیاندا بچێ؟ لەپێشدا بیری کردەوە تۆفانێکی توند و بەسام بەرپا بکا، کۆشکان بڕووخێنێ خانووبەران برمێنێ، کۆخان تێک تەپێنێ، کەپران ڕابێنێ، تاوڵ و ڕەشـــماڵ و چیغ و چادران ڕاڕفێنێ تا شوێنەواری ژیان و مان و بوون و گوزەران لەو نێوە نەمێنێ.

پاشـــی خەریک بوو، هەموو گوڵەگەش و بۆنخۆشـــەکان بپرووکێنێ، هەموو گیا شلک و تەڕەکان، هەموو دارە ســـەوز و بەرزەکان، ســـیس و ژاکاو و کلۆر و هلۆڵ بکا. تا کەس خۆڕسکی دڵگر نەبینێ، تا کەس دیمەنی خەمڕەوێن نەبینێ و هەموو لایەک بکا بەبیابانێکی کاکی بەکاکی و بێ ئاو و شینایی و ئیشکارۆیەکی زوورک و ڕەق و بیروونێکی چۆڵ و هۆڵ و شۆرەکاتێکی خۆێڵین و سووتاو.

دوایە هاتە ســـەر ئەوە ناسک و نازدارەکان، تەسک و لەبارەکان، ڕەزا سووک و خوێن

شـــیرینەکان بکاتە ڕمووزنەی دزێو، پیرێژنی سەر بەسۆدرە، یاڵ یابووی لاجانگ بەڕشک، پورە گوڵنەتەڵەی ئەفسانەیی تا ئەوین و دڵداری، ژوان و شەوگورد و چاو برەکین و تاسکە تاسک، دەسبازی و ڕاز و نیازی دڵداری دوایی بێ.

بەوەشـــەوە زەرد نەبوو ویستیَ گێژەڵووکە و ڕەهێڵە و لەنگیزەیەک، لە بەرد، لە ئاگر، لە مشکی و خۆڵەمێش، لە ژیلەمۆ و پزیلک بەسەر وڵاتدا ببارێنێ و هەموو زیندەوارێکیان وەبن دا.

پاش ئەوە، خەیاڵێکی وای بەدڵی داهات هەتاو داپۆشـــێ و تیشـــکی گەرم و بەتین و ژیانبەخش بتارێنێ تا تاریکی و ســـەرما و زوقم و ســـیخوار و سەهۆڵبەندان کاری خۆیان بکەن و گیانلەبەر نەهێڵن.

ئاخرەکەی وەک کۆنـــە دزێکی دەس پیس و دیواربڕێکی چاوچنۆک کەلێنی دۆزییەوە، پاش وردبوونەوە و بیر لێکردنەوە بڕیاری دا ڕســـتەیەکی ئینســـانی و سێ وشەی ئاسمانی لەبیر هەمووان بەرێتەوە:

«تۆم خۆش دەوێ».

لە هەوەڵەوە خەڵک نەیاندەزانی چییان لێ قەوماوە، چ ڕووی داوە، تووشی چ بەڵایەک بوون، چۆنیان تانوپۆ لێ تێک چووە؟ تەنیا هێندێک دەیانزانی لەم نێوەدا شتێک بزر بووە. بەڵام هەســـتی پێ ناکرێ، کیژە جوانەکان کە جاروبار وێـــڕای دەزگیرانەکانیان دەچوونە ســـەیران و گـــەڕان و بووکە نازدارەکان کە دەگـــەڵ تـــازە زاواکان، دەچوونە نێو پەردە هەســـتیان دەکرد کە دەبێ ڕســـتەیەکیان پێ بگوترێ و بەشەرم و نازەوە وەڵامی بدەنەوە بەڵام کام ڕســـتە؟ هیچ لەبیریان نەمابوو، دەیانزانی ئەم ڕستە تەعبیرێکی شاعیرانەیە، لە چەند وشـــەی زۆر ناسک و شیرین دروســـت بووە کە پڕە لە تاسە و ئاوات و ڕاز و نیاز و هەست دەبزوێنێ و ئەوین دەجوولێنێ. ئەمما زمانیان گرێ درابوو. پەشۆکابوون، سەرسام بوون دەیانویست بپرسن، یارمەتی لە یەکتر بخوازن. بەڵام هەموو بێ هۆش و سەرگەردان بوون و چیان بەبیردا نەدەهات.

زەمان تێ دەپەڕی، کەچی خەم و پەژارەی خەڵک هەر زێدەتر دەبوو. گشـــت ئەوەندە هەراســـان و پەرێشـــان بوون. دەتگوت: خۆڵیان بەسەردا دابێشـــتوون. دەتگوت: هەموو جگەرگۆشـــەی شـــیرینی لەدەس داوە و ڕۆڵـــەی لێ ون بووە. هەرچـــی دەیانکرد ڕەمزی بەختەوەریی جاران و ڕازی شادیی پێشوویان بدۆزنەوە نەدەکرا و نەدەلوا.

وردە وردە هەودای دۆستایەتی پسا، بڵێسەی خۆشەویستی دامرکا. پشکۆی ئاشنایەتی




ژیلەمۆی نامۆیی بەسەردا کرا. لە هەموو لاوە ئینکەبەری، ئیرەیی، دڕدۆنگی و دوژمنایەتی سەری هەڵدا، وشە باو و شیرین و خۆشەکانی وەک: گیانەکەم، جەرگەکەم، ئازیزەکەم، چاوەکەم، باوکم، دایکم، رۆڵەم، کچم، کوڕم، مامە، کاکە، دادە، بەتەواوی لەبیر چوونەوە.

گراوی لە کوڕە حەیرانان تۆران چونکە دەیانویست ڕستە خۆشەکەیان لێ ببیسن و ئەوانیش چاریان بێچار بوو. کابان مێردانیان ڕێ نەدەدا سەرجێ چونکە پێیان وابوو، سارد بوونەوە. بۆیە ئەم چەند وشەیان بەزاردا نایە. ڕێگای کانی و دەراوان نەدەگیران و ژوانگە چۆل بوون و بەقوڕ گیران.

خوایا! ئایا لەم جیهانەی تۆدا، بێ هەستی ئەوین، هیچ شت تام و بۆنی هەیە؟ ئایا ئەگەر ئەو پەریزادە ڕق ئەستوور و خۆپەرستە، ئەو مەڵبەندەی بەیەکجاری وێران و خاپوور کردبایە باشتر نەبوو لەوەی هەستی ئەوینی تێدا بمرێنێ؟

لەو مەڵبەندەدا شاعیرێکی لاو دڵتەڕ و خاوەن هەست دەژیا. حاڵی وی نەک لە خەڵکەکە خۆشتر و باشتر نەبوو بەڵکو پەشێوتر و تاڵتر بوو. بۆ دەربڕینی هەستی ئاگرینی دەروونی خۆی، لە ڕستە ونەکە دەگەڕا. بەتایبەتی پێش ئەوەی پەری دلاواز و بەدئاکار. ئەو بڕیارە ناهەموارە بدا و ئەو کارە نالەبارە بکا. ئەو غەزەلێکی ناسک و پڕ سۆزی دەس پێ کردبوو. کە هەموو قافیەکانی بەوشە ون بووەکان تەواو دەبوو. غەزەلی شاعیری لاوی، داماوی، دڵسووتاو، ناتەواو مابۆوە چونکە ڕستە پیرۆزەکەی نەدەهاتەوە بیر.

بەرەبەیانێک شاعیری خەمناک و دڵتەنگ لە دەرەوەی ئاوەدانی لەبن دارێک لەسەر جۆبارێک دانیشتبوو و بیری دەکردەوە:

خوایا! بۆ وام بەسەر هاتووە؟ بۆ بیرم شێواوە؟ بۆ وشک بووم؟ بۆ من ئاورگی هەست، دەریای شێعر و خودای قافیە نەبووم. بۆ ئێستا ناتوانم غەزەلەکەم تەواو بکەم؟ بۆ؟ بۆ؟

بەهەڵکەوت لەم بەیانە دڵڕفێنەدا پەری تیژباڵ و بێ خەیاڵ و دڵڕەق و بەدفەڕ هاتە ئەم شوێنە، تا شنەی بەیان هەڵمژێ، تا بۆنی گوڵان بکا، قاسپەی کەوانی گوێ لێ بێ، وڕینگەی بلبلان ببیستێ، خوڕە و هاژەی شەپۆڵی چۆمی خوڕێن دڵی شاد بکا.

لەپڕ چاوی بەشاعیری دڵتەنگی تێگیراو کەوت. دڵی داچڵەکی، تەزووی بەلەش داهات، دەریای ئەوینی خرۆشا، شێت و وێتی شاعیری لاو بوو. خۆی هێنا سەر ڕەنگی کیژۆڵەیەکی خونجیلانە و نەشمیلانە و خوێن شیرین و ڕەزا سووک و بەپاڵییەوە دانیشت. بەنیگای پڕ هەوەس و بەناز و عیشوەی دڵڕفێن بەلەنجە و لاری شۆخانە، دڵی تەڕ و ناسک و جوانی پەرستی ڕفاند، دەستی ئاویشتە ئەستۆ و لێوی بەلێویەوە نا، تێری ڕامووسی و لە دەریای

خۆشـــی و کامەرانیدا نوقمی کرد. شـــاعیری بێ بەش و ناکام، بەم ئەوینە کوتوپڕە. بەم لاواندنەوە و لەزەت وەرگرتنە. یەکپارچە بوو بەکۆی ئاگر. دەتگوت: لەباتی خوێن، مسـی داخـــی لە دەماران دەگـــەڕێ. پەری لە ئامێزی گەرم وەرێنا گیـــان و لەش و دڵ و دینی پێشکێش کرد.

بەفەرمانـــی پەری دەروازەی ئاســـمانی شـــین کرایەوە، پەری و شـــاعیر وەک جووتە کۆترێکی سپی تیژباڵ بەرەو ئاسۆی بێ سنوور هەڵفڕین. ئەستێرە گەش و پرشنگدارەکان، وەک خەرمانێک ئاڵماس بەگرشـــە گرشـــە بەدەورەیاندا ســـووڕان و ســـووڕان. گالیســـکەیەکی زێڕی مرواری کوت کە ئەسپێکی سپی باڵداری تێ کرابوو. ڕاگیرا، سواری بوون و بەپانایی ئاســـماندا گێڕانی. بۆ خۆشیان نەیانزانی ئەم گەشت و گەڕانە ئەم شادی و سەیرانە چەندی درێژە کێشا؟

بەجووت هاتنەوە ســـەر زەمینی خاکـــی و هەر لەو مێرگ و چیمەنـــە ئارامیان گرت، شاعیری لاو وێڕای جریوەی مەلانی سەرمەست غەزەلی ئاشقانە و پڕ سۆزی وای بۆ پەری خوێندەوە کە ئاگری لە دەروون و هەناو بەردا و ئۆقرەی لێ بڕی پەری هەرگیز دەنگی وا زولاڵ و قســـەی وا خۆشی نەبیستبوو. کەچی بەو حاڵەوە گەردی خەم و پەژارەی لەسەر ڕوخسار نیشتبوو و پۆلی فرمێسکی وەک مرواری لە چاوان هەڵوەری، شاعیر بێدەنگ بوو، سەری سوڕما و بەشڵەژاوی بەسەر پێیانی داکەوت و گوتی:

(ئەی فریشـــتەی جوان، ئەی ئارامی دڵان! چت لێ قەوماوە، چ ڕووی داوە؟ پاش ئەو هەموو خۆشی و ڕابواردنە بۆ دەگری و دەبارێنی؟ ئایا کەس لە گوڵ کاڵتری پێ گوتووی ئایا کەس دڵی ناسکی شکاندووی؟ ئایا کەس خەیاڵی ئارامی شێواندووی؟)

پەری لە حاڵێکدا کە فرمێسکی لەسەر کوڵمەی لە گوڵ ناسکتری دەسڕیەوە گوتی:

(بەڵێ خۆشەویســـتم، بەڵێ! لـــەم ماوەدا کە ئێمە پێکەوە ڕامانبـــواردووە تۆ هەموو شتێکت گوت مەگەر شتێک نەبێ کە هەر لە هەوەڵەوە گیانی من تینووی بیستنی بوو. تۆ لەنێو ئەم هەموو قسە خۆشانە و شێعرە تەڕانەدا، جارێک نەتگوت تۆم خۆش دەوێ).

هێشـــتا پەری قسەکەی تەواو نەکردبوو کە شاعیری دڵتەڕ هەرای شادی لێ بڵیند بوو و دەســـتی کرد بەهەڵپەڕین و ســـەما، ون بووەکەی دۆزیەوە کە ئەو هەموو ڕەنج و ئازار و مەینەت و کوێرەوەرییەی لە پێناودا کێشـــا بوو. وەک مەلێکی بەرزەفڕ بەســـەر مێرگ و چیمەن و گوڵ و گوڵزار و باخ و دارســـتاندا فڕی گەشـــتە شار و لە گۆشەیەک دانیشت و غەزەلەکەی تەواو کرد. ئەمجار بۆ خەڵکی خوێندەوە، خەڵک بەبیســـتنی شێعرەکە کەوتنە




ســـەما و هەڵپەڕکێ، ژیان دەســـتی پێ کردەوە، ئەوین لە دڵاندا پەیدا بروە. کیژە ســـرک و ڕەوەکەکان بەرەو ژوانگە بوونەوە، هەتاوی بەختەوەری تیشـــکی هاوێشـــت و تاریکی و سەرمای نەهاتی و ناهومێدی نەهێشت.

بەڵێ لەم دنیایەدا ئەگەر شێعر نەبووبا، هیوا، خۆشی، ئەوین، دڵداری و پێک گەیشتن مانای نەبوو و ئەگەر شـــاعیر نەبووبا تا پەیامی ئاســـمانیان بداتێ سەرما و سۆڵی ژیانی جیهان ڕەقی دەکردین.

لە فارسی تەرجەمە کراوە
١٩٧٨/١١/١٥




بلزاک

دوکتۆر (بیانشوون) شاگرد و پزشکیاری جەڕڕاح و توێکاری هەرە بەناوبانگ پرۆفیسۆر (دیپلۆن) بوو. ڕۆژێک بەڕێکەوت بەمەیدانی (سین سوولپیس)دا تێ دەپەڕی. مامۆستاکەی خۆی دی کە بۆ کلیسا دەچێ، سەعات نۆی بەیانی بوو، پرۆفیسۆر (دیپلۆن) کە هەمیشە بەگالیســکەی تایبەتی دەگەڕا، بەپێیان بوو و لەلای کۆڵانی (پووتی لیوون) ڕا دەهات کە کۆڵانێکی بەدناو بوو، ڕاســت وەک کەســێک دەچوو کە بیەوێ خۆی لە یەکێک لەو ماڵە سووک و بەدناوانە ڕۆکا.

بیانشــوون مامۆستاکەی خۆی باشــی دەناســی و دەیزانی پیاوێکی ماددی و لەخوا بەدوورە. بڕوای بەئایین و مەزەب و زیندووبوونەوە و دنیای دی نییە. هەر بۆیەش ســەری لەم کارە سوڕما و بەئەسپایی شوێنی کەوت و چووە کلیسا دیتی مامۆستاکەی کە بەقەدەر نووکی دەرزی بڕوای بەدین و ئایین و کلیســا و کەشــیش و نوێژ و دوعا نەبوو، ئەوا لە سووچێکی کلیسا لە بەرامبەر کۆتەڵی حەزرەتی مریەمدا چۆکی داداوە و وا خەریکی نوێژ و پاڕانەوەیە ئاگای لە خۆی و دەوروبەری نەماوە. بەڕاستی پێی سەیر و سەمەرە بوو.

ترسا نەوەکو مامۆستاکەی بیبینێ و لای وا بێ شاگردەکەی شوێنی دەگێڕێ و کێشکی دەکێشــێ. هەروەک بەئەســپایی چووبووە ژوور ئارام و بێدەنگیش دەرکەوت و ڕێی خۆی گرت و ڕۆیشــت. ئەم ڕێکەوتە چــاوەڕوان نەکراوە بیری ئاروژاند بــەڵام گوێی نەدایە و




فەرامۆشی کرد.

سێ مانگێکی پێ چوو ڕۆژێک مامۆستایەکی زانستگا کە هاوکاری دیپلۆن بوو هاتە سەردانی و لەکن بیانشوون دۆستانە دەستی لەسەر شان دانا و گوتی:

«هاوڕێ! تۆم لە کلیسای سَین سوولیپس دی و بەلامەوە سەیر بوو؟ بۆم نەچووە سەریەک لەوێندەرێ چ دەکەی ئاخر تۆ و کلیسا؟»

دیپلۆن وەڵامی دایەوە: «چووبووم تەماشای قەشەیەک بکەم کە ئەژنۆی ئاوی هێناوە و دەبێ عەمەل بکرێ و شازدە خانم (ئانگوولیم) بەمنی ئەسپاردووە».

بیانشوون بەوە دڵی ئاوی نەخواردەوە، دەیزانی نەخۆشی وا لە کلیسا تەماشا ناکرێ بەخۆی گوت: «دیسان بۆ نوێژ و پاڕانەوە چووە».

لەو کاتەوە بڕیاری دا هەر چۆنێک بێ سەرەدەری لەم گرێ پووچکە دەربکا. لەبیری بوو چ ڕۆژێک مامۆستاکەی لە کلیسا دیبوو. ساڵی دواتر ڕاست لەو ڕۆژەدا چووە وێ و خۆی لە پەنایەک حەشار دا. چی وای نەکێشا دیپلۆن لە پێچی کۆڵانی (پووتی لیوون) لە گالیسکەی دابەزی و بەپەنایەکی ڕێگای کلیسەی گرتە پێش و خۆی تێ کوتا. بیانشوونیش بەدوای ئەودا چووە ژوور و ڕوانی مامۆستاکەی بەچۆکدا هاتووە و خەریکی نوێژ و پاڕانەوەیە. واقی بردەو و لەبەرخۆیەوە گوتی:

«سەیرە؟ لەلایەک بێ بڕوایی و بێ دینی و خوانەناسی و لەلای دیکەوە چۆک دادان و نوێژکردن و دوعا خوێندن؟»

کە نوێژ و پاڕانەوە دوایی هات و کلیسا بەتاڵ بوو و مامۆستاکەی دەرکەوت بیانشوون خۆی گەیاندە سەرپەرشتی کلیسا و پرسی:

«ئەرێ ئەو پیاوە ماقوولەی لەو سووچە نوێژی دەکرد و دەپاڕاوە دەناسی و ئایا زۆر دێتە کلیسا؟»

وەڵامی داوە:

«ئەوە پێ لە بیست ساڵ دەنێ من بەسەر ئەم کلیسایە ڕادەگەم. دیومە کە هەموو ساڵێ دوکتۆر دیپلۆن چوارجار بێتە ئێرە و خێر و خێرات بکا بەڕاستی خێرومەندە».

دەوری شاگردی بیانشوون تەواو بوو دیسان ڕۆژێک بەبەر کلیسای گۆریندا ڕادەبرد. بەدڵی داهات کە ڕەنگبێ مامۆستاکەی لەوێ بێ. چووە ژوور، بەڵێ دیپلۆن وەک جاران چۆکی دادابوو و خەریکی نوێژ و پاڕانەوە بوو.

بیانشوونیش لە تەنیشتی چۆکی دادا. کە نوێژ بەتاڵ بوو سڵاوی لێ کرد و خۆی پێ

ناساند. پێکەوە لە کلیسا هاتنە دەر گوتی:

«مامۆستا! جەسارەت نەبێ ڕازێک لەمن بۆتە مەتەڵۆکە و بۆ خۆشت نەبێ کەس ناتوانێ هەڵیبێنێ»

نەقڵەکەی لە سەرەتاوە بۆ گێڕاوە و لەسەری ڕۆیی:

«تۆ کەسێکی لە کاتی دەرس گوتنەوە و کارکردندا بەڕاشکاوی و ئاشکرایی دەڵێی بڕوات بەو خودایەی کە خەڵک دەیپەرستن نییە. ئەدی چ بۆتە هۆی ئەوەی بەپەنامەکی دەچی بۆ کلیسا و نوێژ دەکەی و دەپاڕێیەوە و تەنانەت خێر و خێراتیش دەکەی؟»

دیپلۆن گوتی:

«دۆستە لاوەکەم! من تازە پیر بووم و پێم لەسەر لێواری گۆڕە و هیچ پێویست ناکا ئەم ڕازە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی لاوەتی و دەورانی خوێندنم لە تۆ بشارمەوە».

بیانشوون شان بەشانی جەڕڕاحی مەزن و زۆر بەناوبانگی پاریس کەوتەڕێ. وردە وردە گەیشتنە کۆڵانی کاتروان (چواربا) کە لە کۆڵانە هەژارنشینەکانی پاریسە. دیپلۆن لە بەرامبەر خانووبەرێکی تەنگ و تاریکدا کە وەک قەڵایەکی پڕ پێچ و لابەلا دەچوو، ڕاوەستا و گوتی: «وەرە سەر» و خۆی بەپلیکاناندا هەڵگەڕا، تا نوهوومی شەش سەرکەوتن لەوێ گوتی:

«چیرۆکی چوونە کلیسا و نوێژ و پاڕانەوە و خێر و خێراتی من لێرەوە دەسپێ دەکا. ئەو کاتە ڕۆژگارێکی یەکجار سەخت و ژیانێکی زۆر تاڵم ڕادەبوارد. هەم نامۆ و غەریب بووم و هەم برسی و ڕەشوڕووت کەوش و پێڵاوێکی باش و جلوبەرگێکی خاوێنم، نەبوو. ئەمڕۆ کە چل پەنجا ساڵ لەو سەردەمە تێ پەڕیوە. بیردەکەمەوە کە چۆن توانیم بژیم و بۆ لەنێو نەچووم. لە پاریسدا تەنیا و بێکەس بووم و بۆ خەرجی خوێندن و کڕینی کتێب هیچ بەهیوا نەبووم لە چ لایەک تەنانەت یەک شایی چییە پێم بگا. دەسکورتی و برسایەتی تووڕە و تۆسنی کردبووم درست و ئاواڵێکم پێوە نەمابوو و سەر و وەزعێکی واشم نەبوو کەس ئارەزووی دۆستایەتی من بکا. لەو ماڵەی لەپێش چاوتە نیشتەجێ بووم و دەرسی پزیشکیم دەخوێند و خۆم بۆ یەکەم ئەزموون ئامادە دەکرد، وام گوریس گەیبووە هیچکان، کە نە دەمتوانی بچمە پێش و نە بگەڕێمەوە دواوە و بڕیارم دابوو یا بمرم یا خۆم بگەیەنمە لای سەروو. قەرار وا بوو کەسوکارم مانگانە سی فرانکم بۆ بنێرن، بەڵام زۆر جار ئەم پوولە کەمەشم پێ نەدەگەیشت. باش دەمزانی پەیداکردنی ئەوەندووکە دراوەش بۆ ئەوان چەند دژوارە. پوورێکی پیرم بوو. سندووقێکی کۆنی جلوبەرگی کۆن

و نوێ لە سندووقخانەکەیاندا دۆزیبووەوە و بۆی ناردم. هیچ نەبێ خاوێن و پاکژبوون. بەڵام چونکە دراوی کرێبارم شک نەدەبرد نەمدەتوانی ئەم جلانە وەریگرمەوە. هەمیشە لەم دەرک و ئەو دەرکم دەدا بەڵکو بتوانم سندووقەکە وەریگرمەوە و خۆم کەمێک کۆک و پۆشتە بکەم. تەنیا چارەم ئەوەبوو، بڕێک لە شتومەکەکان هەرزان فرۆش بکەم و ئەوانی دیکەم بۆ دەرچێ. لەم ژوورەی هاوسێمدا پیاوێکی ئاوفرۆش خەڵکی (سین فلوور) دەژیا ناوی (بووژارت) بوو ئاشنایەتی ئێمە هەر ئەوەندە بوو کە تووشی یەک دەبووین وەک دوو هاوسێ سڵاوێکمان لێک دەکرد و چیدی. ڕۆژێک هەر ئەو پیاوە پێی ڕاگەیاندم کە خاوەن ماڵ ڕای ئەسپاردووە چوونکە سێ مانگە کرێم نەداوە. دەبێ ژوورەکەی بۆ چۆڵ بکەم. کە نیگەرانی و پەشێوی منی هەست کرد گوتی: خەم مەخۆ بەتەنێ نی، منیش دەردەکا و بیانووی ئەوەیە کاری ئاوفرۆشی دەگەڵ وەزعی ئێرە ڕێک ناکەوێ و دانیشتوانی خانووەکەی وەزاڵە هێناوە. ئەو شەوە سەختترین شەوی ژیانی من بوو، بەیانی زوو لە خەو هەستام، بیرم دەکردەوە خوایا ئەم سر و سیپاڵە بۆ کوێ بەرم؟ خەریکی خواردنی نان و شیر کە تەنیا خواردنی من بوو، بووم لە پڕ بووژارت وەژوور کەوت و گوتی: ئاغا گچکە! تۆ دەخوێنی و دەچیتە زانستگە. من منداڵی سەر ڕێگام لە هەتیوخانە گەورە بووم و دایک و باوکی خۆم ناناسم و قەت ئەوەندەم دراو نەبووە بتوانم ژن بێنم و ماڵ پێکەوە نێم. بۆیە وەک تۆ بێکەس و تەنیام داشقەیەکم هەیە بێ شک دیوتە لەبەر دەرک ڕای دەگرم و ئاوفرۆشی پێ دەکەم ئەم خرت و پرتەی من و شتومەکەکانی تۆی تێدا جێ دەبێتەوە. ئێستا کە لێرەمان دەردەکەن دەڕۆین، بەڵکو بتوانین پەسیوێک بۆ خۆمان بدۆزینەوە و سەر پێکەوە نێین. کوڕە خۆ ئێمە کۆشکی پاتشایەتیمان ناوێ هەر هێندە تێیدا بحاوێینەوە بەسە و نوایەک بێ لە با و بارانمان بپارێزێ شوکری خوا دەکەین. گوتم زۆر سوپاست دەکەم، بەڵام من سێ مانگ کرێی ئێرە قەرزدارم و جگە لەمە سندووقێکیان کۆنە بۆ ناردووم کە دەبێ کرێباری بدەم و وەری گرمەوە و هەموو نەغدێنەم لە پێنج فرانک تێپەڕ ناکا. گوتی: گوێ مەدەیە خوا شوکر کیسەم بەتاڵ نییە بەشی ئەوانم هەیە، خەم مەخۆ خوا گەورەیە، هەستە خڕ بکەوە تا بڕۆین.

قەرزەکانی دامەوە و خرت و پرتەکانمان لە داشقە نا و تەنافی هاوێشتە شانی و ڕۆیشتین لە هەر جێگایەک نووسرابوو (ژوور بۆ ئیجارە) ڕادەوەستا و پرسیاری دەکرد. کرێی ژوورەکان زۆر گران بوون و بۆ ئێمە نەدەبوون هەرچی هەوڵمان دا لە گەڕەکی (کارتیە لاتین) کە گەڕەکی خوێندکاران بوو ژوورێکی هەرزان پەیدا بکەین گیرمان نەکەوت ناچار بووین چاو لەوێندەرێ بپۆشین درەنگانێ، ئێوارێ لە پاساژی بازرگانی لە بەشی

(حەوشـــەی ڕووهان) دوو ژوورمان کە لەم بەر و ئەوبەری پلیکان بوون بەشێست فەرانگ ئیجارەی سالانە بەکرێ گرت و بووینە ئاومال. بووژارت هەرچۆنێک بوو ڕۆژانە سەد شایی پەیدا دەکرد و سەد (ئەکۆ)یەکیشی پوولی نەغد بوو و ئاواتی ئەوەبوو کە بتوانێ ئەسپێک و چەلەنگێکی ئافرۆشـــی پەیدا بکا و ببێ بەئاوفرۆشـــێکی ئابڕوومەند. کە لە حال و بالی مـــن ئاگادار بوو وازی لە ئاواتەکەی هێنا و گوتـــی: تۆ دەبێ بخوێنی و کاری تر لە کاری من واجبترە. ئیتر لەو ڕۆژەوە خەرجی منی وەئەســـتۆ گرت. هەر پێی دەگوتم ئاغا گچکە. شەوانە کە لەکار دەگەڕاوە لە ژوورەکەی من دادەنیشت و بەتاسەوە سەیری خوێندنەوە و موتالای منی دەکرد. ئەو پیاوە باشە کە تەمەنی خۆی لە چل سال دەدا سەر تا پێ هەست و عاتیفە بوو، نەیدەزانی هەستی خاوێنی خۆی چۆن دەرببڕێ، دەیگوت لەم دنیایەدا هیچ زیندەوارێک منی خۆش نەویســـتووە ســـەگێکی بەڕەللا نەبێ، ئەویش پێش ئەوەی دەگەل تۆ ئاشـــنایەتی پەیدا بکەم لەبەر پیری تۆپی. بـــووژارت وردە وردە، هەموو ئاواتی ژیانی لەسەر من ساغ بۆوە بەجۆرێکی وا کە تەواوی کەسوکار و هیوا و ئارەزووی بەتەنێ لە مندا کۆبۆوە. بۆ من لە دایک دلســـۆزتر و بەبەزەییتر بوو. ئەوی باش بایە بۆ منی دەویســـت. حازر بوو خۆی هیچ نەخوا و هیچ لەبەر نەکا تا پێداویستییەکانی دەرس و کتێب و ژیانی ساکاری من جێبەجێ بکا. ئێمە پەیڕەوەکانی ئایینی مەسیح هەمیشە لەبارەی خۆپارێزی و چاکی و پاکییەوە دەدوێین. ئەم پیاوە ئاوفرۆشە هەموو ئەم سیفەتانەی تێدا کۆببوونەوە. بەڕۆژ کە لە کۆلان و خەیابان تووشـــی یەک دەبووین لە حالێکدا کە تەنافی داشـــقەکەی بەشانەوە بوو و بەدوای خۆیدا دەیکێشا بەوپەڕی مەزنایەتی و دلسۆزییەوە بزەی دەهاتێ دیاربوو کە چەند بەساغی و سەلامەتی و پاک و خاوێنی من دلخۆش و شادە.

کەم کەم خوێندنم تەواو بوو و دەســـتم بەکاری پزیشکی و جەڕاحی کرد. دەبوو وەک پزیشـــکیارێک لە نەخۆشخانە بمێنمەوە. ئەم دووربوونەوەی بەلاوە گران بوو. بەلام وەسەر خۆی نەدەهێنا و باســـی نەدەکرد. پتری زەحمەت دەکێشا و خەریک بوو دراوی پەیدا بکا و بمداتـــێ تا مـــن بتوانم تێزی دوکتۆرام تەواو بکەم و لەچاپـــی بدەم، بەلێنی دابوو هەر دەرفەتی بێ، سەرم بدا.

کە چیرۆک گەیشـــتە ئێرە پرۆفیســـۆر بەشاگردی پێشـــووی گوت: بیانشانوون ئەگەر ریسالەی دوکتۆرای من تەماشا بکەی دەبینی کە ئەوم بەناوی ئەو پیاوە جوامێرە نووسیوە و پێشکێشی ئەوم کردووە. کەم کەم لە نەخۆشخانە داهاتێکم پەیدا کرد و توانیم دراوێک بۆ هێنانەدی ئاواتی لەمێژینەی ئەو پاشـــەکەوت بکەم و ئاخری ئەســـپ و چەلەنگم بۆ کڕی لەلایەکەوە دەتگوت دونیایان داوەتێ کە بۆتە ئافرۆشێکی ئابڕوومەند. بەلام لەلای دیکەوە

لەحاڵێکدا ئەوپەڕی ڕاستی و دروستی و پاکی و خاوێنی پێوە دیاربوو پرتە و بۆڵەی بەسەرمدا دەکرد و دەیگوت: ئەمە چت کردووە؟ تۆ تازە سەرەتای کارتە و پێداویستت بەهەزار شست هەیە و دراوت پێ دەوێ و لە ڕاستیدا ئێستا تۆ لە من موحتاجتری. شوکر لەشم ساغە و شانم زامی نەهێناوە و نیازم بەئەسپ نییە. کەچی دیاربوو لە خۆشیان خەنی بووە و لە پێستی خۆیدا ناحەوێتەوە کە دەبینێ من، منی بێ دەسەڵات و ڕووت بۆ خۆم بوومە پیاوێک و داهاتی خۆم هەیە. ئەمجار وازی لە من هێنا و بۆ لای ئەسپەکە چوو، دەستی بەیاڵ و بڕ و شانی و بدەوگە و پشت و کەفەڵ و لاق و لەتەریدا دەکێشا و چاوی لەخۆشیان گرشەگرشی بوو. جارێک دەیڕوانیە من و جارێک لە ئەسپەکەی دەفکری ئامرازی جەڕڕاحی من ئێستاش هەر ئەو ئامرازانەن ئەو بۆی کڕیبووم و بەیادگارێکی خۆشەویست هەڵم گرتوون. وردە وردە ناوبانگم دەرکرد و بەگەورەترین جەڕڕاحی فەرانسە و جیهان ناسرام. بەڵام ئەو پیاوە جارێک بەڕووی دانەدامەوە و لەکن کەس بەزاریدا نەهات کە لە سایەی پیاوەتی و جوامێری و فیداکاری ئەودا گەیشتوومە ئەم پایە. هەر خۆم باشم دەزانی ئەگەر دڵسۆزی ئەو نەبایە من نەک نەدەبوومە پیاو و نەدەگەییمە هیچ بەڵکو لەوانە بوو هەر نەشمێنم.

ڕۆژێک خەبەرم پێ گەیشت نەخۆش کەوتووە، دەستم لە هەموو کار و پیشەی خۆم هەڵگرت و خۆم گەیاندە سەری و دەرمان و پەرستاریم کرد. جاری یەکەم توانیم لە چەنگاڵی مەرگ ڕزگاری بکەم بەڵام بەداخەوە پاش دوو ساڵ نەخۆشییەکەی هەڵی داوە و برووزی ئەستاند. ئەوی بۆم دەکرا کردم، دەرمانی ئەوتۆم بۆ پەیدا کرد لە قوتووی هیچ عەتتارێکدا نەبوو، کاری وام بۆ ئەنجام دا لە چ کتێباندا نەنووسراوە. ئەوەندەم قەدر گرت لە هیچ پاتشا و خاوەن دەسەڵاتێک نەگیراوە. بەڵام داخی گرانم سوودی نەبوو. سەر تا پێم پڕ بوو لە قەدرزانی و نمەک ناسی و بەڕاستی حازربووم لە عومری خۆم کەم بکەمەوە و لەسەر عومری ئەوی دانێم. ئەمما بەداخەوە هەموو کار و زانستم، هەموو ڕەنج و تێکۆشانم، هەموو شەو و شەونخوونیم بەفیڕۆ چوو، بووژارت، بوژارتی خۆشەویست باوکی دووەمم یا باشتر بڵێم باوکی ڕاستیم لە باوەشمدا گیانی دا. وەسیەتنامەکەی بەخەتی عەریزەنووسێکی گشتی سەر شەقام نووسرابوو بەپێی ئەو بەڵگە هەرچی لە پاشی بەجێ مابێ ماڵی من بوو و تەنیا میراتگری من بووم دیارە ئەو وەسیەتنامە ئەو کاتەی ئامادە کرابوو کە لە گەڕەکی حەوشەی ڕووهان تازە ببووینە ئاوماڵی یەک. ئەو پیاوە نەخوێندەوارە خێوی ئیمان و بڕوایەکی یەکجار پتەو بوو حەزرەتی مریەمی گەلێک خۆشدەویست و لەبەر نەزانی و ساکاری ئەوی بەدایکی خوا دەزانی. دەگەڵ ئەوەشدا ئەو لە ئەوینی خوا و مەزهەبی

کاتۆلیکی خۆیدا سـووتابوو و دەشیزانی من بیروبڕوام دەگەڵ ئەو جیاوازە و ئیمانم بەخوا و کلیسـا و ئایین سسـتە، هەرگیز لەو بارەدا نەیدەدواندم و سەری نەدەهاویشتە سەرم و وای دەنواند کە هیچ دەربەسـتی بیروبڕوای من نییە. لە قووڵایی دڵمەوە دەڵێم: ئەی ئەو کەسـەی پێت دەڵێن خوا ئەگەر لە عالەمدا شـوێنێک هەیە پاش نەمان پیاوچاکی بچنێ، بووژارتـی من لەبیر مەکە ئەگەر لە ژیانیدا تووشـی گوناهـ و تاوانێکی وا بووە کە دەبێ سـەزا بدرێ. لە سـەرەمەرگدا داوای لێ کردم بەپێی ئایینی مەسیحی بینێژم. دڵنیام کرد کە داواکەی بێنمە جێ و ئەسـپاردم کە لە کلیسـا بۆی بپاڕێنەوە و نوێژی بۆ بکەن. لە نەخۆشیدا هەمیشە دەیگوت: دەترسم بمرم و نەمتوانیبێ، وەک پێویستە ئەرکی سەرشانم ئەنجام بدەم. بێچارە لە هەموو ژیانیدا ئازاری بۆ کەس نەبوو و لە بەرەبەیانەوە تا بوومەلێڵ ڕەنجی دەدا و ئارەقی دەڕشـت و هێشـتا لای وابوو خوای لە خۆی ڕازی نەکردووە. نازانم ئەگەر لە ڕاسـتیدا بەهەشتێک هەبێ و بووژارتی نەچێتێ ئەدی کێی لێ دەبێ؟ لەو پەڕی ساکاریدا مرد تەنیا کەسێکی دەگەڵی چووە سەر قەبران من بووم. منیش کاتێ گەورەترین دۆسـت و دڵسۆزترین سەرپەرشـتی خۆمم بەخاک ئەسپارد بیرم کردەوە کە چۆن چاکەی بدەمـەوە. ژن و زارۆک و کەسـوکار و خزم و نیزیکی نەبـوو کە بیانخەمە ژێر چاوەدێری خۆمەوە. وەبیرم هاتەوە زۆر جار باسـی ئەوەی بۆ کردبووم خۆشە پیاو پاش مردن نوێژ و دوعـا و خێـر و خێراتی بۆ بکرێ. بەڵام بۆ ئەوەی بیر نەکەمەوە پێی قەرزدارم و دەبێ بۆی پڕ بکەمەوە هەرگیز خواهیش و داوای لێ نەکردبووم پاش مەرگی کارێکی بۆ ئەنجام بدەم. بەڵام خۆم هاتمە سـەر ئەم بیرە کە تەنیا لەم ڕێگایەوە دەتوانم هەق ناسـی خۆم دەربخەم و ئەو چاکەی بدەمەوە کە هەرگیز و هەرگیز فەرامۆشی ناکەم کە ئەو ڕێوشوێنەی پاش مردنی بۆ جێبەجێ بکەم. بۆیە دەگەڵ کاربەدەستانی کلیسای سین سوولپیس قەرارم دانا کە هەموو سـاڵێ چوار جار وەک باوە، نوێژ و دوعای گشـتی بۆ بکەن ڕۆژی یەکەمی هەر چوار فەسـڵی ساڵ خۆشم دەچمە کلیسا و بەیادی دۆستی گەورە و لەدەسچووم نوێژ و دوعا دەکەم و من بە گیان و دڵ حازرم لەباتی ئەو سەزا بدرێم. تا ئەو زووتر بچێتە ئەو جێگایەی پێی دەڵێن بەهەشت.

کە چیرۆک گەیشـتە ئێرە دیپلۆن تاوێکی بێدەنگ بوو و دوایە سـەری بەرزکردەوە و گوتی:

«دۆسـتی خۆشەویست! کەسێک کە خاوەنی بیروبڕوایەکی وەک منە لەوەی زیاتری لە دەسـتی نایە. لەو بیرەدا نیم کردەوەی من لەلایەن خواوە پەسـند نەکرێ. من بەهەرچی خۆشـم دەوێ سـوێند دەخۆم کە ئامادەم هەموو دار و نەداری خۆم بدەم تا بتوانم ئەو




بیروبڕوایەی بووژارت لە مێشکیدا بوو لە مێشکی خۆمدا بگونجێنم».

پاش ماوەیەک دوکتۆر بیانشــوون لە ژوور ســەرینی مامۆستای پایەبەرزی پرۆفیسۆر دیپلۆن حازر بوو و ئەویش بەنۆرەی خۆی مرد. کێیە بتوانێ بڵێ مامۆستا دیپلۆن کە ڕۆیی بەئیمانەوە نەڕۆیی[1].

١ - ئەم چیرۆکە لە نووسینی بلزاک، گەورە نووسەری فەرانسەیە. من لە ڕووی گۆڕینی فارسی مامۆستا جەمالزادە بەدەسکاری کەمەوە کردوومەتە کوردی.



## تەنیا هەمیشە تەنیا

گی دو موپاسان

پاش خواردنی ژەمێکی تێروپڕ هەموو شـــاد و دڵخۆش بوون، یەکێک لەوان دۆســـتێکی کۆنم گوتی:

«پێم خۆشە کەمێک لە شانزەلیزە بگەڕێین».

وەڕێ کەوتین بەبن ئەو دارانەدا کە هێشتا تاک و تووک گەڵایان پێوە مابوو، ڕابردین هیچ دەنگێک نەدەهات جگە لەو زەنا زەنایەی هەمیشە لە پاریسدا هەیە و نابڕێتەوە، شنەبایەکی فێنک ڕوومەتی ئێمەی دەنگاوت. کۆمەڵە ئەســـتێرەکان بەئاسمانی شین و ساماڵەوە گرشە گرشیان بوو و پرشنگی زێوینیان داوێشت. دۆستەکەم گوتی:

«نازانم بۆ شەوانە لێرەدا لە هەموو جێیان زیاتر بەئاسوودەیی هەناسەم دێ و دەچێ؟ بیرم پان و بەرین دەپێوێ، لەپڕ برووسکێک مێشکم ڕووناک دەکاتەوە کە بۆ تاوێک دەمەوێ لە هەموو ڕازەکانی جیهان بگەم».

پاشـــان ڕۆچنە دادەخندرێ، هەموو شـــت دەبڕێتەوە. هەر وا دەڕۆیشتین جار جار دوو ســـێبەرمان دەدی کە لە ســـیلەی دیوارێک دەلەرزین یا بـــەلای تەختێکدا تێ دەپەڕین کە دوو ئینســـانی لەسەر بوون و پێکەوە نووسابوون و دەتگوت دوو پەڵەی ڕەشن. ئاواڵەکەم دەیگوت: «بێچارانە، نام ئارووژێنن، هەر ئەوەندە هەیە هەســـت بەبەزەیەکی توند و قووڵ دەکەم».

لەنێو ڕازەکانی ئەم جیهانەدا تەنیا لە یەکیان وردبوومەوە، چارەڕەشـــی هەرە گەورەی

ئێمە لە ژیاندا ئەوەیە تا هەین تەنیاین، هەمیشـــە هەموو تێکۆشانمان ئەوەیە لە دەس ئەو تەنیاییە ڕابکەین «ئەوانەی لەســـەر ئەم تەختانە دانیشـــتوون وەک ئێمە و وەک هەموو کەســی دیکە دەیانـــەوێ تەنانەت بۆ تاوێک بەتەنێ نەژین، کەچـــی هەتا هەتایە تەنیان، هەموو کەس کەم تا کورتێک لەوە گەیشتووە».

من ماوەیەکە ڕەنجی تەنیایی دەکێشـــم دڵنیاشـــم هیچ شتێک ناتوانێ دوایی بەم ڕەنجە بێنێ. گوێت لێیە هیچ شـــتێک، هەر کارێک بکەین هەر چەندی تێ بکۆشین قسەمان چەند نەرم بێ و باوەشمان چەند گەرم! هەمیشە هەر تەنیاین. من ئەمشەو تۆم بۆیە دەگەڵ خۆم گێـــڕا تا بەتەنێ نەچمەوە ماڵ. چونکە زۆر لـــە تەنیایی بێزارم. بەڵام قازانجی چ بوو؟ من قســـانت بۆ دەکەم تۆش گوێم بۆ ڕادەدێـــری، پێکەوەین کەچی تەنیاین، تێ دەگەی دەڵێم چی؟ لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە: «چەند بەختەوەرن ســـاویلکەکان، ئەوان خۆ بەبەختەوەر دەزانن، ئەوان هەست ناکەن تەنیان. ئەوان لەو تەنیاییە شوومەی ئێمە ناگەن. ئەوان وەک ئێمە سەرلێشێواو نین» ڕەنگ بێ پێت وابێ کەمێک شێتم وا نییە؟

گـــوێ هەڵخە لەو کاتەوە هەســـتم بەتەنیایـــی کردووە. پێم وایە هەمـــوو ڕۆژێ بەرەو تاریکخانەیـــەک دەچم کە دیوارەکانی نابینم و نازانم بنەبانی لـــە کوێیە؟ بەو تاریکخانەدا دەڕۆم، بێ ئەوەی کەس ڕابەرم بێ کەس بەدەوروبەرمەوە بێ و کەس وەک من ئەم کوێرەڕێ باریک و تاریکە بپێوێ.

لەم تاریکخانەدا جگە لە دەســـتی خۆم هەســـت بەهیچ دەستی دیکە ناکەم. دەزانی چ دەڵێم؟ چەند کەسێک لەو ژیانە بێ ئامانە گەیشتوون. ئالفیرد دوو مووسە دەڵێ:

«کێ دێ؟ کێ بانگ دێڵێ؟ هیچ کەس تەنیای تەنیام. ئەی تەنیایی ڕەش و شووم».

بەڵام ئەوەی بر من بڕوایەکی تەواوە بۆ ئەو گومانێک پتر نەبوو، ئەو شـــاعیر بوو، ئەو تاپۆ و تارمایی دەخولقاندن ئەو بەڕاستی قەت بەتەنێ نەدەماوە کەچی من تەنیای تەنیام.

(گوستاو فلۆبیر) کە یەکێک لە چارەڕەشترین مرۆڤی جیهان و ڕۆشنبیرترین کەسی سەر زەوی بوو ئەم ڕستە کورتەی بۆ دۆستێکی خۆی نووسیوە:

«ئێمە لە چۆڵێکدا دەژین کە کەس کەس ناناسێ».

ئایا زەوی دەزانێ لەو ئەســـتێرانەدا کە ئەوەندە لە ئێمە دوورن هەر پرشنگیان دەگاتە ئێمە؟ چ ڕوو دەدا؟ بەڵێ ئینسان زۆر لەوەش کەمتر لە هەستی ئینسانێکی دیکە ئاگادارە. ئێمـــە وەک ئەم ئەســـتێرانە لێک دوورین. زیاتریـــش تەریک بووینـــەوە. چونکە ناتوانین بیرکردنەوەی یەکتر شی بکەینەوە لە ڕازی یەکتر بگەین. تۆ هیچ شتێک لەو ئینسانانەی خۆ تێک هەڵدەسوون بەڵام ناتوانن یەکتر بناسن چارەڕەشتر دەبینی؟ ئێمە ئەوەندەمان یەکتر

خـــۆش دەوێ دەڵێی زنجیر کراوین. بەئامێزی ئاوەڵاوە لە پەنا یەکترین بۆ ئەوەی بەیەکتر بگەین. تاســـەی نیزیک بوونەوە بەتەواوی هەست دەکەین. بەڵام هەموو بۆ کەلکە. هەموو پەلەقاژەیەکەمان بێ ســـوودە، دەردی دڵمان، لە باوەش گرتنمـــان، لاواندنەوە خۆڕاییە. دەمانـــەوێ ئاوێزانی یەکتربین، لێک هەڵێین. خۆ لە ئامێز هاویشـــتنمان تەنیا دەبێتە هۆی ئەوەی تێک هەڵنگوین.

من هیچ کاتێک لەو کاتە خۆم بەتەنیاتر نازانم کە ڕۆچنەی دڵم بۆ دۆستێکم دەکەمەوە. چونکە باش ئەم پەرژینە بێ کەلێنە دەبینم کە لە نێوانماندا هەیە. ئەم دۆستەی بەرامبەرمە، چـــاوە ڕووناکەکانـــی دەبینم کە لە منی بڕیون. بەڵام گیانی لە پشـــت ئەم چاوانە نابینم. گوێم دەداتێ، بەڵام بیر لە چ دەکاتەوە؟ بەڵێ بیر لە چ دەکاتەوە؟ تۆ هەســـت بەم ئازارە ناکەی؟

ڕەنگ بێ لێم بێزاربێ، ڕقی لێ هەڵگرتبم، یا گاڵتەم پێ بکا؟ ئایا بیر لەوانە دەکاتەوە دەیانڵێم، تیزم پێ دەکا، یا بەگێژم دەزانێ؟ چۆن بزانم چۆن بیر دەکاتەوە؟ چۆن بزانم لە چی بیر دەکاتەوە؟ چۆن دەتوانم تێ بگەم ئەوەندەی خۆش دەوێم کە خۆشم دەوێ؟ و لەو ســـەرە پچووکە خڕەدا چ لێکدانەوەیەک هەیە؟ چ ڕازێکی سەر بەمۆرە بیرەکانی نەناسراوی ئینسانێک. بیری بزر و ئازاد، بیرێک کە ناتوانین سنوور و ڕێبازی بۆ دیاری بکەین. ناتوانین بەسەریدا زاڵ بین یا بیبەزێنین.

هەموو شـــتێک لە قووڵایی تاریکی (من)دا ڕادەگرین، لەو قووڵاییەدا کە کەس دەستی ناگاتـــێ، کـــەس ڕێی تێ نابا، کەس بۆی نادۆزرێتەوە. چونکـــە کەس نییە وەک من بچێ، کەسیش نامناسێ.

هیچ نەبێ تۆ ئێستا دەمناسی؟ نا بەشێتم دەزانی، تاقیم دەکەیەوە، دوورم لێ رادەوەستی لە خۆت دەپرسی:

«ئەمشـــەو بۆ وای بەســـەرهاتووە؟ ئەرێ تێـــت گەییوم؟» ڕەنگـــە بتوانی بۆ تاوێک بەختەوەرم بکەی. ژنن ئەوی دوورەپەرێزی خۆم باشتر نیشان دەدەن.

چارەڕەشـــی، داماوی، حەپەساوی، ئای چەندم ئەوانە لەدەس ژنان دیوە چونکە زۆر لە پیاوان پتریان هەستی تەنیا نەبوون بۆ پەیدا کردووم.

کاتێک پیاو تووشی ئەوین دەبێ هەست دەکا لە جاران بڵاوترە، هەست بەبەختەوەرییەکی بەرزتر لە بەختەوەریی ئینسانی دەکا. ئەم هەستەی لە کوێوە پەیدا دەبێ. لەوێڕا کە پیاو هەست دەکا ئێتر تەنیا نییە، تەرەکەمەیی دوایی هاتووە، چ هەڵەیەک؟

ژن کە تاســـەی ئەوین لە ئێمەدا تیـــن دەدا درۆیەکی گەورەیە، بیرەخەوە. من ئەوکاتە

شــیرینەی دەگەڵ ئەو کەزەیە درێژە، کوڵمە ســووره، چاو جوانە کە نیگای هۆشــی پیاو دەفرێنــێ ڕای دەبوێرم. دەزانی چۆنە؟ چ تراویلکەیەک چــاوم فریو دەدا؟ چ بیرەخەوێک دەمباتەوە؟ وا دەزانم من و ئەو بۆ تاوێکی دیکە دەبینە تاقە کەسێک بەڵام ئەو دەمە قەت نایە. پاش چەند حەوتە چاوەڕوانی، هیوا، شادی، خۆشی، ڕۆژێک خۆم لە هەمیشە تەنیاتر دەبینــم. پاش هەر ماچێک، پاش هەر دەســتەملان بوونێک، پــاش هەر لە ئامێز گرتنێک تەنیایی پتر دەبێ. شاعیرێکی (سوورلی پرودهام) دەنووسێ:

«لاواندنەوەیان، دڵخۆشــی دانەوەیان، جگە لە تاسەیەکی بەسام و پەلەقاژەیەکی ناکام نین کە دەیانەوێ یەکەتی نامومکین لەنێوان گیان و لەشدا پێک بێنن». پاشان خواحافیز، تەواو بڕاوە، پیاو هێشتا ئەوەی بۆ ماوەیەک هەموو شتی ژیانی بووە، نەناسیوە و لە هەستی دەروونــی بێ خەبەرە. لەوپەڕی نیزیک بــوون و تێکەڵاویدا لە قووڵایی گیانی بێ خەبەرە. وشــەیەک تاقە وشــەیەک، هەڵەی پیاوی ڕوون دەکاتەوە. وەک بریسکێک کە لە تاریکیدا ببریسکێ ئەم کەنداڵە ڕەشەی کە لە نێوانماندا هەیە نیشان دەدا. دەگەڵ ئەوەشدا جوانترین دەمی ژیان ئەو دەمانەن کە شــەوێک لە پاڵ ژنی خۆشەویســتماندا بێ دەســبزێوی ڕای دەبوێرین. با بەرزەفڕ نەبین، زێدەڕەویی نەکەین، چونکە هەرگیز دوو ئینسان نابن بەیەک. بەڵام بۆچی ڕۆچنەی دڵم ئاخنیوە، هەرگیز ئەوی لە دڵمدایە، مێشــکمی خەریک کردووە، باس ناکەم چونکە باش دەزانم حوکمی تەنیایی هەتا هەتایەم دراوە. سەرنج دەدەمە هەموو شــت بیروڕای خۆم دەردەبڕم. بیروڕاکان، کێشەکان، دیمەنەکان بۆ من گرنگ نین. ناتوانم لە هیچ کام لە زەمینەکانی فیکریدا دەگەڵ هیچ کەس هاوبەش بم. چەند وشەی زۆر ساکار و کورت بۆ وەڵامی پرســیارەکانی ڕۆژانە بەکاردێنم جاری واشــە زەحمەتی وەڵامدانەوەش ناکێشم و هەر بزەیەک لێوەکانم هەڵدەپچڕێ. تێم دەگەی؟ لە مەبەستم حاڵی دەبی؟

شەقامی درێژمان تا تاقی نووســرەتی «ئەتواڵ» پێوا. چونکە دۆستەکەم ئەم قسەی بەپەراوێزەوە کە من ئێســتا لەبیرم نەماون بۆ کردم ئەویش زۆر بەکاوەخۆ. دوایە ڕاوەستا لە پڕ دەســتی بۆ لای ستوونی (کرانیتی) میسری کە سەرگوزەشتی وڵاتەکەی بەخەتێکی سەیر لە پایەی نووسراوە و لە پاریس لەنێو ئەستێرەکاندا بزرە، ڕاداشت و قیژاندی «ئێمە هەموو وەک ئەم بەردەین».

بێ دەنگ و بێ ماڵاوایی بەجێی هێشتم. مەست بوو، زانا بوو شێت بوو یا ژیر بوو هێشتا نازانم. جاری وایە بیردەکەمەوە هەقی بوو جاری واشە پێم وایە ئاقڵی شێوا بوو.

## چیرۆکی کوولەکە

یەکێ بوو، یەکێ نەبوو، کابرایەکی گاوان بوو، لە دەرەوەی شار لە ئەشکەوتێکدا دەژیا. وا هات ژنەکەی ئاوس بوو پاش نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ و نۆ سەعات و نۆ دەقیقە خودا لەباتی زارۆکێکـــی ژیوەڵە و خرپنە کوولەکەیەکـــی دانێ، ئەوانیش کوولەکەیان لە کەلێنە بەردێک ڕۆکرد و لێی گەڕان.

ڕۆژێ گاوان ماندوو و مردوو لە بەندەنێ هاتەوە و لە تەنیشت ژنەکەی ڕۆنیشت، لە پڕ کوولەکە وەزمان هات و گوتی: «باوکە!» گاوان تێکڕا بوو و ترسا گوتی: «خودایە ئەوە چییە؟» کوولەکە گوتی: بۆ هەترەشت[1] چوو؟

ســـبەینێ بچۆ کچی ئەمیرم بۆ بخوازە. کچی ئەمیـــر زۆر جوان و لەبار بوو بەناوبانگ بوو. کوولەکە گوتی: «لە بارەگای ئەمیر کورســـییەکی زێڕ لەم بەر و یەکێکی زیو لەوبەر داندراون، ئەوی بۆ ماڵی دونیا یا نیازێکی دیکە بچێ لەسەر ئەوی زیو و ئەوی بۆ خوازبێنی بچێ لەسەر ئەوی زێڕ دادەنیشێ».

کابرای گاوان زۆر پاڕاوە گوتی: ڕۆڵە من زۆر دەسکورتم، زۆر نەدارم داوای وا لە ئەمیر بکەم دەسبەجێ لەسەرم دەدا.

کوولەکە بەتووڕەییەوە گوتی: «من دەڵێم بڕۆ کچی ئەمیرم بۆ بخوازە».

---

١ ـ هەترش چوون: زەندەق چوون، ترسان.

سـبەینێ گاوان گاڕانی ئاوەدانی بەرەڵڵا کرد و ڕووی لە کۆشکی ئەمیر کرد لە تالار و سەرسـەرایان وەسەرکەوت و چوو لە بارەگا لەسەر کورسی زێڕ دانیشت و گوتی: چش با ئەمیر لەسەرم دا و ڕزگاریم.

ئەمیر بەفیزەوە هاتە بارەگا و دیتی گاوان لەسـەر کورسی خوازبێنیکەران دانیشتووە زگی پێ سووتا و گوتی: «کاکی گاوان دەزانم تەنگدەست و بێ ئیرووی[1] دەڵێم بێ بەشت نەکەن». گاوان گوتی: «هاتووم کچەکەت بۆ کوڕەکەم بخوازم» ئەمیر گوتی: زۆر باشـە مەرجێکی هاسانت دەگەڵ دەبەستم، ئەگەر بردتە سەر کچەکەمت دەدەمێ.

- فەرموو

- سۆزی چل سواری سوورپۆش بە چل ئەسپی سوورەوە و چل نێزەی سوور دەبێ لە حەوشەی سەرا ڕابگری!

- بەسەرچاو!

گاوانی داماو بەدڵی شکاو و چاوی پڕ ئاو گەڕاوە دیتی ژنەکەی بەهاوار و بانگ دەگری، پاڵی بەپاڵیەوە دا و ئەویش لە بانگی دا و گوتی: «هەر ئەمڕۆم لەسـەر ئەم دنیام ڕوونە ماوە، بەیانی ئەمیر کام لە پێستـی سەری داخنێ» ژنەکەی پرسی: چی گوت؟! گاوانەکە گوتی: «چل سـواری سوورپۆشـی بەچل ئەسپی سوورەوە[2] و لەگەڵ چل نێزەی سووردا لێ ویستم!»

- بابانم وێران بێ!

کوولەکە گوتی: «ئەوە چ شین و شەپۆرێکە دەیکەن؟! لە فڵان جێ تاتە بەردێک هەیە زۆر گەورەیە، پێی دەزانی؟»

- بەڵێ.

- کونێکـی تێدایە، بچۆ دەم بەکونەکەوە بنێ و بڵێ: «ئەحمەد خان! موحەمەد خانی برات سڵاوت لێ دەکا و دەڵێ: سبەی پێش گزینگ چل سواری بەو حاڵ و ڕەنگەوە بنێرێ بۆ حەوشەی سەرای ئەمیر، هەر نیو سەعاتیان پێ دەچێ!»».

گاوان چوو، ڕاسـپێری بەجێ هێنا، بەڵام کەس وەڵامـی نەدایەوە و گەڕاوە! کوولەکە گوتی: «چووی؟»

---

١ ـ ئیروو؛ مەعیشەت، گوزەران

٢ ـ بە کوردی بە ئەسپ ناڵێن: «سوور»، بەڵکو ئەگەر ڕەنگی تاریک و کلک و یاڵی ڕەش بوو پێی دەڵێن: «کوێت»، خۆ ئەگەر ڕەنگی کاڵ بوو کلک و یاڵی لە ڕەنگی خۆی یا کاڵتر بوو پێی دەڵێن: «شێ»

- بەڵێ، چووم.

- دەبڕۆ بســـرەوە، خودا کەریمە. گاوان تێ خزا، بەڵام خەو چییە لە چاوی نەکەوت تا شەو بڕاوە ئەم دیو و ئەودیوی کرد و گینگلی دا.

ئەمیر بەجەللادی گوت: «بەیانی دەچی ســـەری گاوانی گۆشاگۆش دەبڕی چونکە ئەو مەرجەی دەگەڵ ئەوم بەستووە نەک هەر بەئەو، بەکەس جێبەجێ نابێ». تاریک و ڕوونی بەیانی جەللاد شیری سوو و دەرکەوت، تەماشای کرد چل سواری سوورپۆش بەچل ئەسپی سوورەوە و چل نێزەی سوور ڕیزیان گرتووە. ئەمیر هاتەدەر بەچاوی خۆی دیتنی.

لەولاشەوە گاوان کازیوەی بەیانی لە ترسان دەرپەڕی و چوو بۆ کرشکی ئەمیر، ئەگەر چوو چ ببینێ؟ هەرچی داوای کردووە ئامادەیە، لەخۆشـــیان شاگەشکە بوو و بەهەڵەداوان گەڕاوە.

کوولەکە پرسی: «ها باوکە سوارەکان هاتوون؟»

- بەڵێ، هاتوون.

«ئەدی لە چی ڕاوەســـتاوی؟ هەســـتە بچۆ کچی ئەمیرم بۆ بێنە». گاوان چوو گوتی «میرم مەرجی خۆم بردە سەر». ئەمیر کچەکەی سوارکرد و گاوان جڵەوی کێشا و بووکی هێنا بۆ ئەشکەوت. ئێوارێ گاوان و ژنەکەی چوون بۆ ئاوەدانی، کچ بەتەنێ و بەخەمناکی لە ئەشـــکەوتدا مایەوە. لەپڕ کوولەکە شاتلۆرەی بەســـت تا بەرپێی کیژەکە. کچ ڕاچەنی و گوتـــی: «خودایـــە ئەوە چییە؟» پاش تاوێک کوولەکە قەلشـــی و لاوچاکێکی لێ هاتە دەر. کچ نەک بەدڵێک، بەســـەد دڵ ئاشـــقی بوو. موحەمەدخان گوتی: کچی ئەمیری دڵت دەمگرێ؟. کچ بەشەرمەوە گوتی: «بەڵێ». لاو گوتی: دە هەستە قاوەم بۆ لێ بنێ بەڵام وریابە هەڵنەچێ، هەڵبچێ پێک نابڕێین. کچ گورجانە هەســـتا قاوەی وەسەرنا، بەڵام وای چاو لە لاوەکە بڕیبوو هۆشی نەما و قاوە هەڵچوو لە پڕ موحەمەدخان بزر بوو، کچ حەپەسا و ئەو شەوی تا بەیانی بەبانگ و سەڵا گریا و لە خۆی دا.

بەیانی کاڵەی ئاســـنی لە پێ کرد و گۆچانی ئاسنی بەدەستەوە گرت و ڕۆیی و گوتی: «پـــاش موحەمەدخانـــی حەڵاڵی دونیام لێ حەرام بێ، حەوت ســـاڵ بەو دنیایەدا گەڕا و گەلێکی کوێرەوەری و چەرمەســـەری دی، کاڵەکانی ســـوان و گۆچانەکە شـــکا و سۆراغی دۆســـتەکەی نەکرد. ڕۆژێک بیری کردەوە و گوتی: دەگەڕێمەوە و بەباوکم دەڵێم کۆشـــک و میوانخانەیەکم لەســـەر حەوترێیانێک[1] بۆ دروست بکا، هەر ڕێبوارێک هات سەرگوزشتەی

---

١ ـ لە فۆلکلۆری کوردیدا زیاتر چوارێیانم بیستووە.




خۆی پێ دەگێڕمەوە بەشــکم ئەو کەسانەی دنیا گەڕاون خەبەرێکی موحەمەدخان بزانن و ڕەنجەڕۆ نەبم.

کچــی ئەمیری گەڕاوە. باوکی کە وا کز و کەڵــەلای دی گوتی: «کچم گیان! بۆ خۆت تووشی ئەم ڕۆژە کرد؟»

باوکە گیان! گەڕانی ڕۆژگار و سووڕانی دەوران دەگەڵ ئازاردان یەک نییە».

ئەمیرگوتی: «کچم چت دەوێ؟».

باوکە گیان چم لەتۆ ناوێ ئەوە نەبێ کە لەســەر حەوترێیانێک لە دەشــتێ کۆشک و میوانخانەیەکم بۆ دروست بکەی تا هەر ڕێبوارێک بەوێ داهات چیرۆکێکم بۆ بگێڕێتەوە.

- «هەی بەســەر چاو کچم گیان!» ئەمیر وەستا و کرێکاری وەکار خستن و کۆشک و میوانخانەیان دروست کرد. غولام و قەرەواشیشی[1] دانێ.

کــچ هەموو ڕۆژێ لە بەیانەوە تا ئێوارەی درەنگ لە هەیوانی دادەنیشــت و بەدووربین تەماشــای دەکرد، هەر ڕێبوارێک بەوێندەرێدا ڕابردبا بەزۆر یا بەخواهیشت ڕایان دەگرت و میوانداری دەکرد و چیرۆکی پێ دەگێڕایەوە.

ڕۆژێک لە ڕۆژان پیاوێکی کوێر، کە کوڕێکی حەوت ســاڵەی خۆی دەسکێشی بوو، لەم گونــدەوە دەچوو بۆ ئەو گوند، ئێوارە بوو گەینــە ڕووبارێک کە تاتەبەردێکی گەورەی لێ نیزیک بوو، پیرەپیاو بەکوڕەکەی گوت: «ڕۆڵە گیان! خەوم دێ ســەرخەوێک دەشــکێنم وریابــە مــار پێمەوە نەدا» کوڕەکە لەکن باوکی دانیشــت و ئەویش خەوبردیەوە لە ناکاو دەنگێک لە تاتەبەردەکەوە هات و کوڕەکە لەخەو ڕاپەڕی، ترسا و گوتی: «ئەوە چییە؟» بینی وا مەنجەڵێک لە بەردەکە بەربۆوە و سەربەژێر هاتە خوار و لە ڕووبار کەوت و پڕ لە ئاو بوو و تێ هەڵبۆوە و چۆوەوە نێو تاتەبەردەکەوە، هەتیو چوو لە قەراغ ڕووبار ڕاوەستا و بیــری کردەوە: ئەگەر جارێکی دیکە مەنجەڵ هاتەوە خۆی تێڕادەکەم و دەچم بزانم نێو ئەو تاتەبەردە چی تێدایە؟!

کوڕ یەشکی کێشا تا دیسان مەنجەڵ خلۆربۆوە، لەنێوی دانیشت و چووە نێو تاتەبەرد، تەماشــای کرد ئەشــکەوتێکی زۆر جوانە و دیوارەکانی هەموو بــەردی مەڕ مەڕن و چل تەختی خەوی لێ داندراوە. چوو لە بن تەختێک خۆی شــاردەوە. پاش بەینێک چل کۆتر

---

[1] ـ قەرەواش: وشەیەکی لێکدراوی تورکی و کوردییە، (قەرە) تورکییە، یانی ڕەش، (واش) ی کوردیش یانی ڕەنگ، واتە: کەنیزەکی ڕەش پێست.

لووربوونەوە ئەشـــکەوت، پەڕ و باڵی کۆترییان داماڵی و هەموویان بوونە لاوی جوانچاک، هەریەکە لەســـەر تەختێ ڕاکشـــا، یەکیان خەمناک بوو تەنبوورێکی دەس دایە و لێی دا و گۆرانی زۆر ئاشقانە و بەسۆز و کوڵی گوتن.

دایکی شـــیوی بۆ هێنان هەر کەسە بەشی خۆی بۆ دانان، بۆ موحەمەد خانیشی هێنا و گوتی: «ڕۆڵە! ئەوە حەوت ســـاڵ پترە بۆ خاتری پیرەژنێک خۆت بەو دەردە بردووە و هەموو شەوێ دەکرووزێیەوە و ئێمەشت وەتەنگ هێناوە، بۆ خاتری خودا شتێک بخۆ».

- دایە! شیوەکەم بۆ لەبن تەختەکەم دانێ کە هێور بوومەوە دەیخۆم.

دایکی شیوەکەی بۆ وەبن تەختەکە نا.

بەیانی هەر چل لاو بوونەوە کۆتر و ڕۆین. کوڕەکە وەڕەز بوو و بیری کردەوە: خودایە! دەبێ مەنجەڵ کەی بچێتەوە بۆ ئاو تا من خۆم ڕزگار بکەم؟ بێ شـــک باوکم هەســـتاوە و دەمکوتێ.

کوێـــرەش وەخەبەر هات. بانگی کوڕەکەی کرد چ جواب نەبوو، وای خەیاڵ کردەوە کە لـــە ئاو کەوتووە و خنکاوە. هـــەر هەرای دەکرد و دەگریا. بەیانی کە مەنجەڵ لە تاتەبەرد دەرکەوت کوڕ خۆی تێ هاویشت، دیتی باوکی بەکوێرە کوێرە لێی دەگەڕێ و هەرای دەکا. بانگی کرد: باوکە! چییە؟

- لە کوێی؟

- من چوو بوومە ئەم گوندە گۆشت بکڕم. باوکی هەڕەشەی لێ کرد و گوتی: «منت لەو چۆڵە بەجێ هێشتووە و بەئەستۆی شکاوت چووی گۆشت بکڕی؟! تۆ لە خودا ناترسی؟!» کوڕەکە زۆر شـــەیتان بوو. دڵخۆشـــی داوە و خاوی کردەوە، دەستی گرت و ڕۆیشتن. کە گەیشـــتنە ڕووبار بواری دۆزیەوە و باوکی لە کۆڵ کرد و لە ئاوی پەڕاندەوە و ڕێی خۆیان گرت، لە حەوت ڕێیان کوڕەکە کۆشکێکی دی، بوولێڵی ئێوارە بوو، کچی ئەمیر بەدووربین دەیڕوانی کوڕێکی وەبەر چاو هات کە دەستی پیرێک دەکێشێ پیاوەکە زۆر پیر بوو هەشتا ساڵ دەبوو و کوێریش بوو کچی ئەمیر گوتی: «بەخودای ئەوە بێگومان زۆر نەقل و نەزیرە دەزانێ ئەمشـــەو هەر چیرۆکانی پێ دەگێڕمەوە. کە ڕێبوارەکان نیزیک کۆشـــک بوونەوە هـــەرای کرد: «مامە پیرە! لەم نیزیکانـــە ئاوەدانی نییە ئەگەر ناتەوێ لە چۆڵی ڕاببوێری وەرە ئەمشەو میوانی من بە».

کوێرە گوتی: ئاوەدان بێ خاتوون! وەسەرکەوتن دۆشەگیان بۆ ڕاخستن، دانیشتن.

وەختی شـــیوێ خواردنیان هێنـــا خواردیان قاوەیان هێنا خواردیانـــەوە، کچی ئەمیر

بەکوێری گوت: «مامە پیرە، تۆ دنیات زۆر دیوە، وڵاتان زۆر گەڕاوی، ئەقلێکی خۆشم بۆ بگێـــڕەوە، من زۆر وەڕەزم و دڵم گیراوە. کوێرە گوتی: خاتوون! بەخودای من هیچ نازانم، کوڕی کوێرە گوتی: لەباتی ئەو من عەرزت دەکەم، باوکی ئانیشـــکی لە کەلەکەی کوتا و گوتی: «تۆ چیرۆک چووزانی؟» کچی ئەمیر گوتی: پیرە! ئێســـتاکە بۆ خۆت بۆم ناڵێی دەڵێکەڕێ با ئەو شتێک بڵێ! کوێرە گوتی: «زۆر باشە خاتوون! با بۆت بگێڕێتەوە».

کوڕ بەباوکی گوت ئەوە چتە باوکە؟ کچی ئەمیر گوتی: «خوا بتپارێزێ دەم و کاوێژت چەند خۆشـــە» کوڕ گوتی: «کە گەیشتینە نیزیک ئاو دانیشتین باوکم خەو بردیەوە، من گوێـــم لێ بوو دەنگێک لە تاتەبەردێک هات»، کچی ئەمیـــر گوتی: «ڕۆڵە وەرە لە پەنام دانیشـــە و ڕاســـتەکەم بۆ بگێڕەوە»، کوڕی هێنا لە تەنیشـــت خۆی دانا ئەویش گوتی: «خاتوون! من دیتم مەنجەڵێک لە تاتەبەردەکە هاتە دەر سەر بەژێر خلۆر بۆوە و لە ڕووبار کەوت و پڕ ئاو بوو ودیسان لەکێو هەڵبۆوە، من چوومە لێواری ڕووبار دانیشتم کە مەنجەڵ هاتەوە من خۆم تێ هاویشـــت و چوومە ناو تاتەبەرد، ژووری ئەو تاتەبەردە ئەشـــکەوتێک بـــوو کە چل تەختی خەویان لێ دانابـــوو بوولێڵی ئێوارێ چل کۆتر هاتنەوە پەڕ و باڵیان وەراند و بوون بە چل لاوی جوانچاک هەریەکە لەســـەر جێ و بانێک دانیشت یەکێک لەوان ناوی موحەمەدخان بوو زۆر خەمناک بوو لەســـەر تەختەکەی دانیشت، تەنبوورێکی دەس دایە لێی دا و گوتنیشـــی گوت دایکی شـــیوی بۆ هێنا، بەڵام نەیخوارد، دایکی هاتە کنی و گوتی: «حەوت ســـاڵ پترە بۆ خاتری پیرەژنێک خەم دەخۆی، تۆ ئێمەشـــت بەخۆتەوە تووشـــی پەژارە کردووە. ئەو گوتـــی: دایەگیان خواردنەکەم بۆ لەبـــن تەخت دانێ دوایە دەیخۆم. دایکی وای کرد، بەڵام ئەو دەستیشی بۆ نەبرد. بەیانی هەستان و بوونەوە کۆتر و لە شەقەی باڵانیان دا. من چاوەنۆڕ بووم تا مەنجەڵ بەرەو ئاو چوو خۆم تێ هاویشتەوە و لەوێ هاتمەدەر، دیتم باوکم لێم دەگەڕێ، دەستم گرت و ئەوە ئێستا لێرەین».

کچی ئەمیر بەکوێرەی گوت: «بێڵە کوڕەکەت بێ ئەو تاتەبەردەم پێ نیشـــان بدا ئەو کۆشکە و هەرچی تێی دایە ماڵی تۆ و گەردنت ئازادبێ» بەیانی کوڕ وەپێش کچی ئەمیر کەوت و بردیە پەنا تاتەبەردەکە. تا نیوڕێ[1] لەوێندەرێ دانیشتن، لەپڕ دەنگێک لە تاتەبەرد هات و مەنجەڵ هاتەدەر و بەرەو ڕووبار خلۆر بۆوە، کچی ئەمیر خۆی تێ هاویشت و چووە نێو تاتەبەرد و کوڕیش بەرەو کۆشکی باوکی گەڕاوە.

کچـــی ئەمیر لەبن تەختی دەزگیرانەکەی خۆی شـــاردەوە و چاوەنۆڕ بوو. ئێوارێ چل

---

١ ـ نیوڕێ: نیوەڕۆژ، نیمەڕۆ.




کۆتــر هاتنەوە و پەڕ و باڵیــان لەخۆ کردەوە. کچ دیتی موحەمەدخــان زۆر لاواز بووە. لەسەر تەخت دانیشت و تەنبووری بەدەستەوە گرت و گۆرانی بەسۆزی تێ هەڵکرد، دایکی شێوی بۆ هێنا و گوتی: ڕۆڵەگیان! دەبخۆ حەوت ساڵە لە سوێی پیرەژنێک ئاوات لە خۆت کردووە!

دایەگیان! لەبن تەختی بنێ دوایی دەیخۆم. نیوەشەو کچ دەستی موحەمەدخانی گرت، تەماشای کرد گراویەکەی[1] خۆیەتی گوتی: لەکوێوە هاتووی؟

- حەوت ســاڵە من دەوری دنیات لێ دەگەڕێم. ســبەینێ موحەمەدخان بەدایکی گوت: ئەمڕۆ نەخۆشم ناچمە گەڕان. ئەو ڕۆژەی نەچووە دەر و خۆشیان ڕابوارد.

موحەمەدخان بەکچی ئەمیری گوت: دایکم نایەڵێ تۆ بێنم هەستە ڕابکەین! بەڵام لەوێ کەڵەشــێرێک بوو هەر شــتێک قەومابا دەیخوێند. کە قووقەی بەرز بۆوە. دایکی ڕای کرد و گوتی: دەبێ شــتێک لە موحەمەدخان قەومابێ کە ئەمــڕۆ دەگەڵمان نەهات، کە دیتی موحەمەدخان نەماوە وەشوێنی کەوت. موحەمەدخان وێردێکی خوێند بۆ خۆی بووە شوان و ژنەکەی بوو بە مەڕ.

پیرێژن لێی پرسی: «شوانە ژن و پیاوێکت نەدیوە ڕاببرن؟»».

- بەڵێ پێش پێی تۆ ڕابردن، ڕێی گرت و ڕۆیشــت، بەڵام کەســی نەدی دیسان گەڕاوە بۆ لای شــوان، بەڵام شوان ون ببوو ئەمجار موحەمەدخان خۆی کردە ئاشەوان و ژنەکەی کردە ئاشــێڕ. دایک کوڕەکەی ناســیەوە و گوتی: ڕۆڵە! تۆ ناتوانی لە چنگی من دەرچی بەخودای ئەگەر ژنەکەت لەتۆ جوانتر نەبێ ســێحرێکتان لێ دەکەم هەردووک ببنە تۆز و خۆڵ، ئەگەر جوانتربێ پیرۆزت بێ. موحەمەدخان دەستی ژنەکەی گرت و هێنای، پیرێژن تەماشای کرد بووکەکەی لە کوڕەکەی جوانترە، گوتی: «پیرۆزت بێ پێکەوە بژین».

ئیشاڵڵا وەک ئەوان بەمراد گەیشتن ئێوەش بەمراد دەگەن.

---

١ - گراوی: یار، دۆستی کچ.



## مامۆستا هێمن و دیوانی تاریک و ڕوون

**شنه ئامادەی کردووە**

**مامۆستا هێمن مامۆستاییێکی گەورەی شێعری کوردییە هەروەها لە پاڵ شاعیرێتی بەرزی خۆی وەکو ڕۆڵەیێکی کۆڵنەدەر و خەباتگێڕی کورد ناسراوە، وە هەڵکەوتنی شاعیرێکی وا بەتوانا و لەناو میللەتەکەمانا مایەی شانازی هەموو کوردێکە لە هەموو لایێکی کوردستان. شاعیری نەبەزمان هەمیشە ژیانی خۆی لەپێناوی ئازادیخوازی میللەتەکەیدا بەگران نەزانیوە، تەنانەت وازی لە هەموو خۆشییێکی ژیانی تایبەتی خۆی هێناوە، وەک لەو ماوەیەی ژیانیدا کە دەستی لە خۆشەویستەکەی خۆی هەڵگرتووە بۆ ئەوەی زیاتر خۆی بۆ خزمەتکردنی بزووتنەوەی ئازادیخوازی میللەتی کورد تەرخان بکات (هەروەکو لە سەرەتای دیوانەکەیدا ئەڵێ). ئەوەی ڕاست بێ بەهەر شێوەیەک باسی مامۆستا هێمن بکەین لەم لایەنەوە ناتوانین بەتەواوەتی مافی خۆی بدەینێ، بەڵام بەباوەڕی من ئەو دێڕەی کە نازم حیکمەت وتوویەتی تا ڕادەیەک بەسەر هێمنی ئینسان و شاعیردا ئەچەسپێنرێ... نازم حیکمەت ئەڵێ: «شاعیریان برد بۆ بەهەشت وتی: ئاخ نیشتمانەکەم»، ئەوەش لێرەدا بەئاشکرایی دیارە کە چۆن مامۆستا هێمن وازی لە ژیانی خۆشی و ماڵ و منداڵ هێناوە و ژیانێکی ئاوارە و ساکارانەی لەدوور وڵات بۆ خۆی هەڵبژاردووە. هێمن (سەید موحەمەد ئەمین شێخولئیسلامی موکری) بووە و دایکی ناوی (زەینەب) و کچی شێخی بورهان بووە.**




لە ۱۹۲۱ز لە گوندی (لاچین) نیزیکی سابڵاخ لەدایک بووە.

خوێنەری ئازیز، ماوەیەک لەمەوبەر مامۆستا هێمن گوڵبژێرێکی لە هەڵبەستە تەڕ و پاراوەکانی کردە چەپکە گوڵێک و لەژێر ناونیشانی (تاریک و ڕوون) لە دیوانێکی قەشەنگدا بڵاوی کردەوە و خستییە بەردەستی خوێنەران. جا بۆ ئەوەی زیاتر مامۆستا هێمنی شاعیر و ئینسان و ئاوارە بەخوێنەرانی هاوکاری بناسێنین بەپێویست زانرا چاومان پێی کەوێت و گفتوگۆیەکی لەگەڵا بکەین... بەڵام دوای گەڕان و بەڵێنی و چاوەڕوانی کردنێکی زۆر، بەهەزار حاڵ مامۆستا هێمنمان بۆ دۆزرایەوە و ئەو دانیشتنەمان لەگەڵا کرد، جا وا پێشکەش بەخوێنەرانی بەڕێزی هاوکاری ئەکەین:

*لە ژیاننامەکەتا دەڵێی ئەو قازانجەی کە لە شاعیریم کردووە ناوی دوور و درێژم لە کۆڵ بۆتەوە... کەچی لە شوێنێکی تری ژیاننامەکەتا دەڵێی ناوی نهێنی حیزبیم بوو... ئایا پەیوەندی شاعیرێتی بەحیزبێتیتەوە هەبوو؟

- لەو کاتەی کە بووم بەحیزبی من هەر شاعیر بووم وەلەبەر تەبیعەتی شاعیریم ناوی نهێنیم کرد بەهێمن کە بەتەبیعەت حەز لە بێدەنگی و سولم و ڕابواردنم پێ خۆشە بۆیە ناوی هێمنم هەڵبژاردووە.

* بەڵام شاعیر هیچ کاتێک هێمن نابێت...؟!

- بەتەبیعەت حەز لە هێمنی ئەکەم بەڵام ئەگەر هێمنی بۆم نییە ئەوە جیایە.

- یا وەک سالم لەبەر نەخۆشی ناوی خۆی ناوە سالم... تۆش لەبەر ژیانی ئاوارەییت ناوی خۆت ناوە هێمن.

* دوای دەرچوونی دیوانەکەت، ئایا هیچ شێعری ترت وتووە؟

- پاش دەرچوونی دیوانەکەم شێعرێکی درێژم وتووە کە کەم جار شێعری وا درێژم وتووە وە ئەم شێعرە تەئسیری شێعری فارسی تێدایە وە هۆی وتنی ئەوەبوو کە هەستم بەجودایی و غوربەت ئەکرد وە توانیم لەم شێعرەدا ئەو هەستە دەربڕم کە تیایا دەڵێم:

بشنو از نی چون حکایت میکند
واز جدائیها شکایت میکند
ساقیا وا بادەوە وا بادەوە
ڕوو لە لای من کە بەجامی بادەوە

نابێ قەت ناڵەی جودایی بێ ئەسەر
جا چ نەی بیکا چ پیاوی دەربەدەر
بۆیە ناڵەم تێکەڵی نەی کردووە
شیوەنێکم کرد کە نەی نەیکردووە
شیوەنی من شیوەنی ئینسانییە
بانگی ئازادی و گروی یەکسانییە
شیوەنی من شینی کوردی بێ بەشە
ئەو گەلەی حاشا دەکەن لێی وەهەشە

دوای ئەوەش شێعرێکم وتووە لە مناجاتی مانگدا کە لەژێر ناوی (تریفەی سارد)ە دەڵێم:

بەڵێنی ڕاگەیاندێ راسپاردە
گوتی بۆت دێتە بن ئەم پاردە غاردە
لە جێژوانی لەمێژە چاوەڕێتم
نەهاتی کیژی جوانی هەڵبژاردە
تەزووی گەرمم بەلەشدا دێ ئەگەرچی
تەزاندی شان و پیلم بەردی پاردە
وەرە با ڕەنگ و ڕوخسارت ببینم
بەمن چی تیشکی داوێ مانگی چاردە
گڕی ئەم ڕوومەتەی تۆ جوان و گەرمە
تریفەی مانگەشەو جوانیش بێ ساردە

* لەگەڵ ئـەوەی دڵداریت نەکردووە تەنیا ماوەییکی زۆر کورت نەبێ بەڵام شـێعرە دڵدارییەکانـت وەکو ئەوەی کـە تەجرەبەیەکی دوور و درێژت هەبـێ، ئەمە بەچی لێکی ئەدەیتەوە؟

- هەرچەند لەو ماوەیەدا دڵدارییەکەم لێ تێک چووە بەڵام هەسـتی ڕاسـتەقینەی ئەو ماوەیـە لە ناخمدا مـاوە، چونکە بێ بەش بووم لـەم نیعمەتە، (حرمان) وای لێکردم کە شێعرەکانم بەم جۆرە بێت.

* ئەگەر ئەدیب نەبوویتایە حەزت ئەکرد ببیت بە چی؟

- زۆر دڵم خۆشە کە ئەدیبم وە ئەگەر نەبوومایە بەئەدیب حەزم ئەکرد ببم بەئەدیب.

* بەڕای تۆ ئەدیبی ئێستای کورد تا چ ڕادەیەک لە مستەوای مەسئوولیەت دایە؟

زۆریـان توانیویانە بگەنە ئەنجام بـەڵام کەممان توانیومانە مەسـئوولیەتی خۆمان جێبەجێ بکەین، زۆربەی ئەدیبانی کورد باری سیاسـی ڕێگەی گرتوون واتا هەر خەریکی ئـەو دۆخە نالەبارەن کە کورد تیای بووە و ویسـتوویانە لەم لایەنەوە بگەنە ئەنجام بۆیە بـاری کۆمەڵایەتییان لەبیر چووە کـە لایەنێکی گرنگی ژیانە و ڕەنگە بەلامەوە عەیبە کە بڵێین لەم سەردەمە لەباری کۆمەڵایەتیدا دواکەوتووین. بەڵام ئەبێ بەرەو باشتری بەرین.

***

شـنە نـەبزێوی سـەری بسـکی ڕەشـی
کـە لـەسـەر ڕوومـەتـی ئارامـی گـرت
گـوێ مەدە ئـەو قسـە کـۆنەی کـە دەڵـێ
لـەشـکری کـافـرە ئیسـلامی گـرت

ئەم شێعرەت بە چ مناسەبەتێک وتووە؟

- ڕۆژێـک لە کۆڕی زانیاری دەگەڕامەوە و سـواری ئۆتۆمبێل ببـووم لەگەڵ کیژێکدا وەبایەکـی تونـد ئەهات کە هەر قژی تێک ئەدا ئەویش هـەر خەریکی چاککردنەوەی بوو و بۆی نەئەکرا وە جوانی ئەو کیژە منی مەست کردبوو بۆیە ئەم شێعرەم بەدڵا هات.

* ئایا ئێمە ئەتوانین سـنوور بۆ تەواوبوون و دەستپێکردنی قۆناغی ئەدەبی دابنێین؟ وە ئایـا قۆناغی پاش گۆران دەسـتی پێ کـردووە؟ وە چۆن ئەدەبی ئـەو گەنجە تازە




پێگەیشتووانەی ئێستا هەڵدەسەنگێنی؟

- ئێمە ناتوانین سـنوور لە نێوان قۆناغی ئەدەبیدا دابنێین تەنیا تەبیعەت شـاعیرێک دێنێتە ناوەوە کە تازەکردنەوەیەک یا داهێنانێک لە شـێعریا ئەبێ کە جیاواز دەبێ لەگەڵ شـاعیرانی پێشـوو. بەڵام بەنەسـبەت قۆناغی گۆرانەوە تەواو نەبووە و هەر بەردەوامە چونکە تا ئێستا شاعیرێک پەیدا نەبووە کە لە مستەوای گۆراندا بێت وە تازەکردنەوەیەکی جیاوازی کردبێ لە هی گۆران. وە تا ڕادەیەک ئەم جیلە تازەیەی هەڵنەسەنگاندووە، زیاتر لەوەش گۆران لە کوردسـتانی ئێراندا زیاتر خۆشەویستترە و شێعرەکانیشی لەوێ بڵاوترە کـە بەداخەوە تاکو ئێسـتا بەڕێکی کۆنەکراونەتەوە. من وەکو خەڵکی‌تر سـەیری گۆران ناکەم کە تەنیا شاعیرێکە تازەکردنەوەیەکی بەسەر شێعر هێناوە، چونکە ئەو شێعرە کۆنە کلاسیکییەکانی کەمتر نییە لە هی تازەکانی، «گۆران گەڕاوەتەوە دواوە بەڵام گەڕانەوەکەی پێشکەوتووانەیە».

* ئایا کێشە هەیە لە نێوان شاعیرانی نەوەی کۆن و تازە، وە تا چ ڕادەیەک تازەکان پاش ١٩٧٠ توانیویانە هەنگاو بنێن؟

- بەڵێ کێشـە لە نێوان شـێعری کۆن و تازەدا هەیە بەڵام شاعیرانی تازە نەیانتوانیوە هەنگاو بنێن تەنیا زۆر کەمیان نەبێت لەبەر کەمبوونی تەجرەبەیان وە لەبەر مەغرووری.

* ڕات چییـە بەرامبەر بەو شـاعیرانەی کە بڵێ قۆناغی تازە دەسـت پێ دەکەم وە قوناغی گۆران بەجێ دەهێڵم وە هەنگاوی تازە دەنێم؟

ئەگەر توانی ئیقناعم بکات بەڕێزەوە سەیری دەکەم.

* هەتا ئێسـتا هەندێ کەس شـێعری (حوڕ) بەشـێعر دانانێ... ئایا تۆ ڕات چییە بەرامبەری؟ وە هەوڵدانت بۆ دانانی هەیە؟

- شێعری (حوڕ) بەلای منەوە شێعر نییە، بەڵام ئەگەر جوان بێ لەزەتی لێ وەرئەگرم وەکو پارچەیەکی ئەدەبێ بەرز. چونکە ئەبێ شێعر چوارچێوەیەکی تایبەتی هەبێ وە ئەگەر بەشێعری نەزانم هەوڵدانیشم نابێ بۆ دانانی، وە من ناڵێم شێعر هەر ئەبێ لە قالبی کۆندابێ بەڵام ئەبێ وەزن موراعات بکرێ، بەڵام قافیە زۆر گرینگ نییە.

* بەس بەلای خۆیانەوە وەزنی هەیە.

- من بەلامەوە وا نییە و کەسیش ئیقناعی نەکردووم.

* ئەگەر ناوەرۆکی شێعر گۆڕا مەرجە ڕوخساریش بگۆڕێ؟

بەلامەوە شێعر تەنیا ناوەرۆکەکەی بەرەوپێش بڕوات باشترە هەتا ئەگەر لە ڕوخساری

کۆنیشدا بێت، بۆ نموونە ئەم دوو شێعرە فارسییە هەرچەند لە کۆنترین قالبە بەڵام بیر (فکر)ی تازەترین ئینسانی تێدایە وە ئەتوانین بڵێین زۆر تازەیە:

ساحلی افتادە گفت گرچی بسی زیستم
هیچ نەمعلوم شدە کە من چیستم
موجی فرو فولتەء نرم بجنبید و گفت
هستم اگر میروم گر نروم نیستم

واتای دێری یەکەم:

ڕووباری بەختی من زۆر مەعلووم نەبوو کە من چیم

دێری دووەم:

شەپۆلی ئارام بووەوە دەڵێ وەجوودی من ئەوەیە ئەگەر نەبم نیم

* ئافرەتی کورد لە نووسین و ئەدەبیاتدا دواکەوتووە هۆی چییە و چۆن چارەسەر دەکرێ؟

من تەجرەبە وا فێری کردووم کە جیاوازی لە نێوان کوڕ و کچدا نییە، بەڵام لەبەرئەوەی کە جنسیان جیاوازە بەرهەمیشیان جیا ئەبێ، وە کەم دیاربوونی ئافرەت لە کۆڕی ئەدەبیاتدا ئەوە ناگەیەنێ کە لە پیاو بێ تواناترە بەڵکو کۆمەڵ ڕێگای نادا کە ئەو هەستەی هەیێتی دەری بڕێ وە نووسەریش ئەو کاتە سەرکەوتوو ئەبێ کە هەستی ڕاستەقینەی خۆی بنوێنێ بۆیە هەتا کۆمەڵ ڕێگە نەدا ناتوانێ بێتە ئەم کۆڕەوە چارەسەرکردنیش لە خەباتێکی توندداییە دژی پیاو.

* ئایا جگە لە شێعر بابەتی تری ئەدەبیت نووسیوە؟

- گەلێ چیرۆکی کورتم نووسیوە بەڵام چاپ نەکراوە وە ئێستاش لام وانییە بڵاوی بکەمەوە هەروەها وتاری سیاسیشم هەیە وەهەوڵدانی تەرجەمەشم هەیە وە ئێستا ڕۆمانێکی

فارسـیم وەرگێڕاوە کە ئامادەیە بۆ چاپ لە نووسـینی (مارک توین)ە بەناوی (شازادە و هەژار).

* ئەدیبی سەرکەوتوو ئەبێ چۆن بێ؟

- ئەبێ سـەهلی مومتەنیع بنووسـێ، واتا شـتێک بنووسـێ کە خەڵکەکە تێی بگا و بەرهەمەکـەی ئەبێ جوان بێ و تەرخانی بکا بۆ کۆمەڵی خۆی وە لە گیروگرفتی کۆمەڵی بدوێ و چارەسـەری بۆ بدۆزێتەوە، وەنابێ زۆر بڕوای بەبەرهەمی خۆی هەبێ بەڵکو ئەبێ تـا ڕادەیەک دوودڵ بێ لێی، وە بەرهەمەکەی هەرچەند بەلای خەڵکەوە پەسـند بکرێ و لەلای ڕەخنەگر سەرکەوتووبێ نابێ لە خۆی بایی بێ چونکە ئەگەر لەخۆی بایی بوو ئەوە بەرەودوا ئەچێ و ئەوەستێ.

* کام شێعر لە شێعرەکانت لەوانی تر بە بەرزتری دەزانی و بۆچی؟

- ئەوەی لە خەیاڵم بێت (کاروانی خەبات)م لە شـێعرە هەرە چاکەکانمە لەبەرئەوەی هەستی ڕاستەقینەی خۆمم دەربڕیوە بەرامبەر بەڕەفیقێکی خۆشەویستم وە لام وایە تیایدا سەرکەوتووم.

ڕۆژنامەی هاوکاری، ژمارە ٢٣٤
١٩٧٤/٩/١٣



## وتوویژ دەگەڵ هێمن

لەبەهاری ئەمساڵدا (١٣٧٦ی هەتاوی ـ ١٩٩٧ی زایینی) لە شاری نەغەدە، لەلای دۆستانی بەڕێز، کاک سەلاح بەیگی، کاک یوسف فازڵی و... نەواری شەوی شێعرێکم وەدەست کەوت کە لە ڕۆژی پێنجشەممە (٣٠ی خاکەلێوەی ١٣٥٨ی هەتاوی ـ ١٩٧٩ی زایینی)دا، لە شاری مەهاباد بەڕێوە چووە. لەم شەوە شێعرەدا مامۆستا هێمن، سەید کامیلی ئیمامی، مەلا غەفوور دەبباغی، حوسێن شەریف پەناهی و ژمارەیەکی دیکە لە شاعیرانی کوردستانی ئێران بەشدارییان کردبوو. لە ماوەی ئەو سێ ساعاتەی کە شەوی شێعرەکەی تێدا بەڕێوە چووە، هێندێک پرسیاری ئەدەبییان لە مامۆستا هێمن کردووە و هەمیشە بەوپەڕی دڵسۆزییەوە وەڵامی داونەتەوە.

لەژێرەوە چاوتان بەپرسیار و وەڵامەکان، دەکەوێ و لەگەڵ هێندێک بیروڕای مامۆستا هێمن ئاشنا دەبن.

دوای ئەوەی خوالێخۆشبوو مەلا غەفووری دەبباغی (حافز) شێعر دەخوێنێتەوە لە مامۆستا هێمن دەپرسن کە بیروڕای سەبارەت بەم شاعیرە چییە. مامۆستا هێمن دەفەرمووێ:

بەڕاستی مامۆستا مەلا غەفوور، جێی شانازییە بۆ شارەکەمان، یەکێک لە هونەرەکانی کە دە مامۆستادا دەبینم ئەوەیە کە سەرەڕای ئەوەی کە بۆ خۆی شارستانییە و بەناشکوریش ناڵێم کوێر و ڕۆشندڵە، بەڵام لە شێعرەکانیدا، وشەی زۆر جوان و ناسک و ڕەسەنی کوردی دەبینم. حەتتا جێی تەعەجوویە بۆ من! من جارێکی لێیان پرسیم کە مامۆستای شێعری تۆ





کێ بووە؟ گوتم: ڕوودکی. من لە ڕوودکی فێر بووم، کاتێ شاعیر شتێک نەبینێ و لەمسی نەکا ناتوانێ شـــێعری لەسەر بڵێ. پێم وایە هەموویان خوێندوومانەتەوە. منیش بەمنداڵی ئەو شێعرەم خوێندووە:

«بـوی جـوی مولیـان آیـد همی
یـاد یـار مهربـان آیـد همـی
ریـگ هامـون و درشـتیهای او
زیـر پایـم پرنیـان آیـد همـی»

تەماشـــا دەکەن هەموو حیسی کوێرانەیە تێیدایە، لەمسە. هیچی تر نییە، بۆنی دەکا، حیسی دەکا لەبەر پێیدا. کەوابوو باسی دیتنی تێدا نییە. بەڵام مامۆستا دیارە لە ئەسەری مومارەســـەی زۆردا، یانی لە ئەســـەری زۆر خوێندنەوەی شێعری شـــاعیر، گوێ لێگرتنی شێعری شاعیرەکانی دیکەدا، ئەو شتانەی کە ناشیانبینێ دەتوانێ جوانیان وەسف بکا. کە ئەوە بەعەقیدەی من هونەرێکی یەکجار گەورەیە. لێرەدا دەمەوێ نوکتەیەکتان عەرز بکەم. دوکتۆرێکی ڕۆشـــندڵمان هەیە لە کوردستانی عێراق. کە دوکتۆرە دە ئەدەبیاتی عەرەبیدا، کەچی بەڕاســـتی بێ یارمەتی ژنەکەی هیچی بۆ ناکرێ، ژنێکی خوێندەواری هەیە کە هەم ژنیەتی و هەم مونشـــییەتی... ئەگەر شێعر بڵێ بۆی زەپت دەکا، ئەگەر نەقد یا ئینتیقاد دەکا، ئینتیقادەکانی بۆ دەنووسێتەوە. ئەو دەیڵێ، ئەو دەینووسێتەوە. مامۆستا بەداخەوە لەوەش مەحرـوومە (هەموو خەڵک پێدەکەنن) نوکتەیەکی خۆشم لەسەر ئەو دوکتۆرە هەیە. ڕۆژێکی پێکەوە دەگەڕاین، ژنەکەشـــی دەگەڵ بوو، دیارە ژنەکەی خوێندەوارە. ژنێکی زۆر ماقووڵیشـــە، چاوســـاغێتی. ڕەفیقێکی کوردی ئێرانی یادی بەخێر لێی پرسیم ئەرێ ئەوە کێیە؟ ئەو ژنە چییە دەگەڵ ئێوە دەگەڕێ؟ گوتم ئەوە عەسای مووسایە بۆمە.

لێرەدا کاک شەریف حوســـێن پەناهی شێعرێک دەخوێنێتەوە و پاشان مامۆستا هێمن دەفەرموێ:

شـــێعری ئەو برایەمان درێژ بوو، شـــێعری (ملوانکەی شـــین)، وە ئەغلەب شـــاعیرە لاوەکانمان دەیانەوێ شـــێعریان درێژبێ. پێیان وایە بەدرێژ و کورتێی چاکە. ئەم شـــێعرە بەعەقیدەی من ئەگەرچی درێژ بوو و وەختیشـــی زۆر گرت بەڵام کورت بوو، چونکە پتری دەبوو وەسفی زرێبار و شتی وا کردبا. بەوەی شێعرەکەی عەیبدار نەدەبوو. دەمەوێ لێرەدا




ئامۆژگارییەکی شاعیرە لاوەکانمان بکەم، پێیان وانەبێ شێعر بەدرێژیی چاک دەبێ، شێعر ئەوەیە کورتیش بێ وە شــاعیری چاک ئەو کەســەیە بتوانێ مەتڵەبی گەورە لە شێعرێکی بچووک دابرێژێ. ئەمما ئەو مەوزووعە دەبێ درێژبێ، وە بەعەقیدەی من کورتە. دەنا دوێنێ ئەو شاعیرە لە منی پرسی کوتی: تۆ کام شێعری خۆت خۆش دەوێ؟

من کوتم: نزیک بەچل ساڵ لەوەی پێش شێعرێکم گوتووە، تاقە شێعرێک تاقە بەیتێک و بــۆم زیادە نەبــووە هەتا مام، چونکە پێم وابوو تەواوی ئیحساســی دەروونی خۆم لەو شێعرەیدا کوتووە. هەر یەک شێعرە، مەنزوورم ئەوەیە شێعر فێربن، دەڵێم:

«ئـەسـیری بسـکی ئاڵۆزی کچـە کـوردێکی نـەشـمیلم
تـەماشـاکەن چ سـەیـرێکـە، بـەدەسـتی دیلـەوە دیلم»

دەوەیدا ئەوەی ئیحساسم بووە کوتوومە ئیدی چیدیکە نەماوەتەوە. کچی کورد بۆ خۆی دیلی ئیجتماعی کوردەوارییە، منیش ئەسـیری ئەوم. تکا لە شاعیرە لاوەکان دەکەم گوێ مەدەنە شێعری درێژ و کورت.

لێرەدا بەڕێوەبەری کۆڕەکە دەڵێ بڕیاربوو بەپێی تەمەن، مامۆستاکان شێعر بخوێننەوە، ئێستا کە دەمەوێ داوا لە مامۆستا هێمن بکەم کە شێعرمان بۆ بخوێنێتەوە، دەترسێم پێی وابێ کە بەپیرمان داناوە. مامۆستا هێمن دەفەرموێ:

وەڵڵا پێم واي من زۆر لە پیری ناترسـێم، مامۆسـتای گەورەمان سەید کامیل ئیمامی لە پیری دەترسـێ، چونکو لێیان پرسی شاگردەکانت کێ بوون؟ هێمنی بەشاگردی خۆی قبووڵ نەکرد. ئەو وەختی ئەو شـێعری دەگوت ئەمن منداڵ بووم. «پێدەکەنێ» عەرزت دەکەم کەوابوو منیش یەکێکم لە شاگردانی ئەو مامۆستا گەورەیە.

ئەوشۆکە ڕەفیقێک باسی ئەوەی دەکرد کە ئێوە بۆ ئەوەندە ئەهمیەت بەشێعر دەدەن. بەهونەرەکانــی تر نادەن؟ من پێـم وایە ئەوە لەبەروەی نییە ئەمــە هونەرەکانی دیکەی کوردمــان لەبەرچاو نەبێ بەڵکو لەبەر بێ دەرەتانییە. کورد پەنای بردووە بۆ شـێعر کە زووتر بەگوێی خەڵک بگا. ئەوی بەشـێعر دەیڵێین بەمەقالە نووسـیبامان نەدەگەیشـتە گوێی خەڵکــی. ئەمە ئیحتیاجمان بەڕۆژنامە هەیە هەتا بتوانین هونەرەکانی دیکەشـمان نیشــانی خەڵک بدەین. بریا ئەمەش چیرۆکنووسێکی وەک ســەمەدی بێهرەنگیمان هەبا، دەبوو ئەوپەڕی ئیفتیخاری پێ بکەین. بڵێین چی؟ ڕەنگە هەشــمان بێ، ڕەنگە لەنێو ئەو

عالەمەیدا ئی وا هەبێ چیرۆکی چاک بنووســێ. ئەمما لە ڕابردوودا لە کوێی بڵاوکردباوە؟ چۆنی بڵاوکردباوە؟ ئەوەیە کە دیســان پەنامان بردووە بۆ شــێعر کە زوو لەبەر دەکرێ و زوو دەچێتە ناو خەڵکەوە.

من زۆرم کۆڕی شــێعر و شــاعیری دیون، چونکە شەقی ڕۆژگار گێراومی بە وڵاتاندا و دیومە، عادەتەن ئەگەر شــێعرێک گوێگر پێیان چاک بوو (ئەوە بۆیە ناڵێم داوای چەپڵە بکەم ها لە بیرتان نەچێ!) چەپڵەی بۆ لێ دەدەن بۆوەی دوو جاری بخوێنێتەوە. یەکێک لە شــێعرەکانی مامۆســتای کە زۆر بــەرز بوو چەپڵەتان بۆ لێ دا، بــەڵام بەداخەوە ئەو کەمتری ئەو کۆڕانە دیوە دەنا دەبوو جارێکی دیکەشی خوێندباوە تا چاتری لێ حاڵی بن. تکا دەکەم شــێعری هەر شاعیرێکتان لەوەی پاش پێ چاک بوو پێی ڕابگەیەنن دوو جاری بخوێنێتەوە، با بێتە حیفزتانەوە. من بۆ خۆم شــێعری تازەم نییە بەڵام پەنا دەبەمەوە بۆ دیوانەکەی کۆنم یانی بۆ ناڵەی جودایی کە لەوێدا شێعرێکتان بۆ دەردێنم.

بێگومان مامۆســتای هەموو شاعیرە نیشــتمانییەکانی کورد ئەحمەدی خانی بوو کە حەقمانە پێی بڵێین نابیغە چونکە زۆر لەپێش شــاعیرەکانی دەوروبەری خۆشماندا حیسی میللییەتــی تێدا بزووتووە، بەڵام هــەر دەردی کوتووە دەرمانــی نەکوتووە. دەڵێ کورد میللەتێکی لێقەوماوە و چیتر، ئەمما ئێمە شاعیرێکمان هەبووە بەناوی حاجی قادری کۆیی کە دەبێ هەموو بەحەق ئەم شاعیرە بناسین. ئەوەڵ شاعیرە کە ئەلحەمدولیلا موجەسەمەی بۆ دروســت کرا. من هەرچەند شاعیری موناسبات نیم و، لە موناسباتدا شێعر ناڵێم بەڵام ئەو کەســانەی تاریک و ڕوونیان خوێندۆتەوە دەزانن کە شێعرێکم بۆ موجەسەمەی حاجی قادری گوتووە. بەڵام بەداخەوە جارێکی پاش موجەسەمە کە چوومە کۆیێ و دیتم سەری موجەســەمەی حاجی قادری گوللەیەکی وێ کەوتبوو و کونی کزدبوو. ئەوە حیســی منی زۆر بزواند و غەزەلێکم گوتووە کە ڕەنگ بێ زۆری ڕەمز تێدابێ. بۆیە لە سانسۆر دەرچووە و لە ناڵەی جوداییشــدا چاپ بووە. ئەگەر زۆری ڕەمز تێدا نەبووبا پێم وایە دەرنەدەچوو. بەئیجازەی ئێوە ئەو شێعرە دەخوێنمەوە:

لە کــۆ ئــەســـرین دەبارێنــم لــەبــۆ کــوردی پــەڕاگــەنــدە
لــە گــەرمێــن غــەرقی ئــارەق بووم و چــاوم هــەر لــە ســامڕەندە
منــی زنجیــر پســێن لێــرە ئەســیری بســکی جــوانێکــم
زەمانــە گــەرچی ئاڵــۆز و پــەشێوە، کــەڵ بــەمــوو بــەنــدە



کوتی ئێواره بازاڕێ وەره ماچت دەمێ نەم ویست
هەڵۆی کوێستانی کوردستانم و ناژیم بەدەستەندە
دڵم سەد هێندی دیکانە بەناز بشکێنی دەنگ ناکەم
چ سوودێکی هەیە، کێیە بپرسێ داد و گازەندە
جیهان و هەرچی خێر و خۆشییە بۆ هەڵبژاردانە
بەقانوونی تەبیعەت پاشەڕۆکخۆرە ئەوی گەندە
ئەگەر تاوانی بێ هێزی نییە بۆچی لە دنیادا
بەشی من ماتەم و شینە، بەشی خەڵکی زەماوەندە؟
بەمردوویش نیشانەی گوللەیە ئەو کەللە پڕ شۆره
ئەوێستاش دەرسی سەربازی دەڵێ ئەو شاعیرە ڕەندە
سەری تەعزیم لەبەر تۆ دانواندن فەخره بۆ هێمن
بژی حاجی کە کێوی هیممەتت سەد هێندی ئەلوەندە

**لێرەدا بەڕێوەبەری کۆڕ پرسیارێکی لە مامۆستا هێمن دەکا و دەڵێ:**

**مامۆستا تکایە بفەرموون کە جەنابتان زۆرتر دە چ حاڵێکدا، یانی زۆرتر لە چ کاتێکدا شێعر دەڵێن؟ هێندێک وەدەزانن شێعر لە وەخت و سەعاتێکی تایبەتدا دەگوترێ دەمانەوێ ئەوەی بۆ شاعیرە لاوەکانمان ڕوون بکەیەوە؟**

**ئەو وەختی منیش لاو بووم، پێم وابوو شێعر یەعنی قسەیەک کە وەزن و قافیەی هەبێ. منیش دادەنیشتم و کاغەز و قەڵەمێکم بەدەستەوە دەگرت و وەزن و قافیەیەکەم دەنەزەر دەگرت و شێعرم دەکوت. زۆر مەمنوونی باوکی خۆمم کە دیوانەکەی منداڵی لێ سووتاندم دەنا ئەلعان بەدەست خەڵکییەوە مابا گاڵتەیان پێ دەکردم. بەڕاستی شاعیری هەروا وەزن و قافیە نییە، شاعیری دەبێ سۆز و دەروون و کوڵ و کۆیَ ئەو شاعیرە بێ بخرێتە قالبی نەزم و ئاهەنگەوە. من زۆر جارم گوتووە هەرچەند بۆ خۆم بڕێکیش قافیە سازم بەڵام زۆر ئەهمیەت بەقافیە نادەم دەشێعردا، بەڵام بۆ وەی شێعر و نەسر لێک بکەمەوە موعتەقیدم بەمۆسیقا و ئاهەنگ و وەزن دە شێعردا. من وەختێ شێعر دەڵێم کە بەڕاستی شێعر زۆریم لێ بکا. تا زۆریم لێ نەکا، تا لە خەوم هەڵنەستێنێ، تا خەو و خواردنم لێ نەتۆرێنێ،**

من شـــێعر ناڵێم. چونکە من دەتوانم مەقالەیەک بنووســـم، ئەگەر بمەوێ وتارێکی سیاسی بنووســـم بەنابەرین شـــێعر شـــتێکی دیکەیە کە کوڵ و کۆی دەروونی خۆمە دەو وەختەدا دەیڵێم. نازانم توانیومە لاوەکان حاڵی کەم یا نا؟ بەڵێ، شـــێعر شوعار نییە، ئەوڕۆ بیڵێي و ســـبەینێ بمرێ. شێعر ئەوەیە کە هەرنەبێ پاش شـــاعیرەکەی بەینێک بمێنێتەوە. زۆر شـــاعیری وام پێ شک دێ شـــێعرەکانیان دەپێش خۆیاندا دەمرن. ئەمما زۆر شاعیری وا هەبـــووە هەروەکو نالی، ئێمە تازە دەزانین، تـــازە تێ گەییوین ئەو نامرێ و قەتیش هەتا تاریخ هەیە نامرێ، کەچی هەر شـــێعری عاشقانەشـــی کوتووە، شێعری نیشتمانی و شتی کەمتر کوتووە، ئیللا شێعرێکی زۆر گەورە نەبێ کە بەشارەکەی خۆی هەڵکوتووە:

«قـــوربانـــی تـــۆزی ڕێگـــەتـــم ئـــەی بـــادی خـــۆش مـــروور
ئـــەی پـــەیکـــی شـــارەزا بـــەهـــەمـــوو شـــاری شـــارەزوور»

کە ڕەنگبێ دە کەم زبانانداندا قەسیدەی هێندە وەسیع و جوان هەبێ.

لێـــرەدا بەڕێوەبەری کۆڕەکە داوا لە مامۆســـتا هێمن دەکا کە لە بارەی ئەو شـــاعیرە لاوانـــەی کـــە لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا کە کۆڕەکە بەڕێوەچووە، شـــێعریان بۆ کێ بەرکێی ئەدەبی ناردووە، قســـان بکا «مامۆستا هێمن، مامۆستا هاوار (عەلی حەسەنیانی) و کاک مەجیدی نانەوا داوەری ئەم شێعرانە بوونە». مامۆستا هێمن دەفەرموێ:

ئەو ســـێ کەســـانەی کە ئێوە هەڵتان بژاردوون، شێعری شاعیرە لاوەکان تەماشاکەن، ئەو ســـێ کەسەن کە موعتەقید بەشـــێوەی نوێ و کۆنن. ئەگەرچی ئەو ئیستلاحە ڕەنگە برێکیـــش غەڵەت بێ «کۆن و نوێ» شـــێعر ئەگەر چاک بوو هەمیشـــە تازەیە قەت کۆن نابـــێ. بەڵام وەزنـــی عەرووزی یا غەیرە عەرووزی وا چاترە. من بۆ خۆم پێم وایە شـــێعر دەهەر قالبێکیدا شێعربێ، شێعرە، چ دە قالبێکی نوێدا و، چ دەقالبێکی کۆنی عەرووزیدا. ئەگەرچی بەئیجازەی مامۆســـتا شـــێخ کامیل ئەوەی دەڵێم هەر شـــتێکی مەوزوون دەم دنیایـــەدا تۆ بخوێنییەوە بەهـــەر زمانێک، لە فاعیلاتون فاعیلاتێکـــی بخەی. کەوابوو من دەمەوێ شـــێعر ئاهەنگێکی هەبێ کە وەختێکی خوێندتەوە دەبیســـەردا تەئسیری هەبێ. یەکێک لەو شـــاعیرانە کە شـــێعری هێنابـــوو، بەعەقیدەی من پڕ خەیاڵترین شـــێعر بوو خەیاڵێکی شاعیرانەی زۆر جوانی تێدا بوو بەڵام ئاهەنگی مۆسیقای نەبوو. لەبەروەی داوام لێ کرد کە پتر حەول بدا مۆســـیقایەک دەو شـــێعرەدا دروست بکات با کارە شاعیرانەکەی

بەخۆڕایی نەچێ. ئەوەیە نەزەری من. شـــاعیرێک کـــە موعتەقیدە بەوەزن و قافیە، دەبێ هەموو ئوســـوولی کۆن ڕەعایەت بکا، دەنا بەنەزەری من شـــاعیرێک کە فەرقی ڕەدیف و قافیە نەکا و بەوەزنی کۆن شێعر بڵێ، بەعەقیدەی من دەبێ پتر بخوێنێتەوە جا ئەودەمی شێعر بڵێ. لەبەروەی هێندێکیان بۆیە ڕەدبوونەوە کە فەرقی ڕەدیف و قافیەیان نەکردووە. هێندێکیان بۆیە ڕەدبوونەوە کە ئاهەنگیان دەشـــێعردا نەبووە. هێندێکیشیان بۆیە قەبووڵ کران کە هەموو شتێکیان هەبووە. بەڕاستی من شاعیرێکی دی کە هیوای دواڕۆژم یەکجار زۆر پێیە، خەڵکی شـــارەکەی خۆشمان نییە، منەتیشی نییە، نە نانم دەداتێ و نە ئاو، نە مومکینە جارێکی دیکە بیبینمەوە، کەچی پێم شاعیرە، ئەویش کاک شەریفە کە بەڕاستی خەیاڵی شـــاعیرانە یەکجار دە شـــێعرەکەیدا هەن، وە ئەو تەوازوعەم تێدا دی. وەختێکی داوەرەکان دەیانکوت ئەو شێعرە ڕەنگبێ نەقسێکی تێدا هەبێ بۆ خۆی بێ وەی نارەحەت بێ، بێ وەی کێشـــە لەســـەر شێعرەکەی بکا، بەقســـەی داوەرەکانی دەکرد. شاعیر دەبێ موتەوازع بێ هەتا بتوانێ ببێتە شـــاعیرێکی بەرز. دەبێ لەوەی نەترســـێ سبەینێ یەکێک ڕەخنـــەی لـــێ دەگرێ. هیچ شـــتێک دەو دونیایەیدا تەواو نییە و هەموو شـــتێک جێگای ئینتقـــادە. هونـــەر قەت تەواو نابێ و قەتیش و قەتیش تەواو نابێ و لەبەر وەی لە ڕەخنە نابێ بترسێین ئێمە. ڕەخنەشت لێ دەگرن دەڵێن ئەو شێعرەت خراپە، بەڵام نابێ بترسێی. کەسێکی حیسی شاعیرانەی هەیە دەبێ حەول بدا چاتر خۆی نیشانی ئەو خەڵکە بدا.

گۆڤاری سروە، ژمارەی تایبەتی (بێ تاریخ)



## دەگەڵ مامۆستا هێمن

پێشەکی: ئەحمەدی شەریفی

ئامادەکردن: سەید سمایلی حوسێنی

پێشەکی:

لە ساڵی ۱۳۶۲/ ۱۹۸۳ وە، زەمزەمەی پێکهێنانی ناوەند و پەخشخانەیەکی چاپەمەنی و دەرکردنی گۆڤارێکی کوردی، وەک کەڵە مێشکی مامۆستا هێمنی تەنیبوو. بۆ ئەنجامدانی ئەم کارە گرینگە، سەرەڕای وتووێژی دوور و درێژ لەگەڵ کاربەدەستانی کۆماری ئیسلامی، چەند کۆڕ و کۆبوونەوەی دەگەڵ کەسەیلی فەرهەنگی، بنووس و شاعیر، قەڵەم بەدەست و ئەدیبی کورد وەک یەزدانبەخش، عەلی حەســەنیانی (هاوار)، موهەندیس فارووقی کەیخوســرەوی، سەید حەمەدەمینی بەرزنجی (خاڵە مین)ی خوالێخۆشبوو، هەژاری ڕەحمەتی، خوالێخۆشبوو مامۆستا سەید تاهیری هاشمی، خالیدی حیسامی (هێدی) و... پێک ئانی و لەم بارەوە یەک دوو جار نامەی بۆ من نووسی و چەندین ڕا تەلەفۆنی کرد و دەیگوت: کوڕینە قەت دەرفەتی وا لەبــار هەڵناکەوێ، با کات بەفیڕۆ نەدەین و بکۆشــین گۆڤارێک دەرکەین. دەیانفەرموو ئەگەر ئەو کارەی بکەین و مویەســەر بێ، بۆ هەوەڵین جار لە مێژووی کوردستانی ئێراندا، ئێمە دەبین بەئاڵاهەڵگری گۆڤارێکی کوردی، کە میری (دەوڵەت) بەڕەســمی ئیزنی وەشانی پێ دەدا، دەبینە خێوی وەشانخانە وگۆڤاری کوردی و دەکارین خزمەتێکی فرە بەفەرهەنگ و ئەدەبی گەلە بێ بەشەکەمان بکەین.

دەبێژن خوا کاران وەڕاست ئەگێڕێ و هەرکەسێ لەسەر سەبران بێ، خێری وەڕێ دێ. ئەوەش لە مام هێمن ڕووی دا و پاش خۆ ماندووکردنێکی فرە، سەرەنجام زۆربەی کەسەیلی کــە لەم بارەوە پێوەندی لە تەکا گرتبوون و ڕووی تێ کردبوون، بەگیان و دڵ بەهانایەوە هاتن و بڕیاری هاوکاریان پێ دا، کە یەک لەوانژێ منی ڕەبەن بووم.

قۆڵ هەڵماڵدران، قەڵەم وەگەڕکەوتن، وتارگەل نووســران، شێعری جۆر بەجۆر ناردران بــۆ گۆڤارێکــی بێ ناو کە بڕیــار بوو هێمن سەرپەرشــتی بکا. پاش چەند دانیشــتن و قسەوباســکردن، تەگبیر و ڕا هاتە ســـەر وەی کە گۆڤاری بێناو وەرزانە بێ و جارێ ساڵی چــوار هەژماری لێ بوەشــێ هەتا بزانین خوا لە داهاتــوودا چ دەروویەکی تر وەدەکا. بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکەش، مامۆستا هێمن تاقمێکی لە کوڕگەلی خاس و ژیر و ژیهاتیی ورمێ و مەهابــاد لە دەوری خۆی گردوکۆ کردن، یەک وتاری دەخوێندەوە، یەکی تر تایپی دەکرد، یەکــی تــر بەرگ و ڕووبەرگی بۆ گۆڤــاری بێناو چێ دەکرد، ئەوی دی ژێ خۆشــخەتیی وەئەســتۆ دەگرت... مام هێمن خۆشی بەســەری پیری، خورتانە دەکۆشا و شەو و ڕۆژی لێ گۆڕابوون، نان و چای ببووە سیغار و گوتار و نووسراوەی هەڵدەسەنگاندن بەسەریاندا دەچۆوە، شێعری باشی شاعیرانی هەڵدەبژارد و بۆ هەوەڵین ژمارەی گۆڤارێک کە بڕیاربوو بێتە وەشــان، ئامادەی دەکردن. هەرکات تەلەفۆنت لێ دەکرد دەیفەرموو: ســەرن قاڵە و کاروبارن زۆرن.

پایزی ئەوێ ســاڵێ، لە کرماشانەوە بۆ چەندەمین ڕا هاتمەوە مەهاباد و چوومە ورمێ و سەردانی مام هێمن، هەتا بزانم کاروباری گۆڤاری گۆڕین بەکوێ گەییوە؟

گشــت دامودەزگای گۆڤاری بێناو و دەرنەچوو، دوو سێ هۆدە بوو. مێز و سەندەڵی و مۆبڵ و شــتی وا لە ئارادا نەبوون. لە هەر هۆدەیەک تەختە موکێتێک ڕاخرابوو و کوڕگەل لەسەر زگ لێی ڕاکشابوون و ملیان لێ قوت کردبۆوە و خەریکی خوێندنەوە و هەڵبژاردنی وتارەیل و شــێعرگەل بوون. مامۆستا باڵنجێکی وەبن شانی دابوو و لەسەر تەنیشت پاڵی دابۆوە و خەریکی سیغارکێشــان و بەوتار داچوونەوە بوو. سەرەڕای ئەوەی ژێر سیغارێکی گەورەی لەپێش بوو بەڵام دەوروبەری پڕ لە ســووتووی ســیغار بوو. هەر ســـەڵاوم کرد و منی دی هەستا سەر پێ و یەکدین دەباوەش گرت و سەروچاوی یەکن ڕاموسی و پاشان فەرمووی کاکە کوانێ؟ عەرزم کرد، چی قوربان؟

بەڕوو تەڵخییەوە فەرمووی نەکا نەتنووســیبێ؟ مەگەر نەمگوت دەبێ لەســـەر گۆڕانی ناوچەی کرماشان شتێ بنووسی؟




دەستم دەگیرفانی پان و بەرینی دمرقۆپان ڕاکرد و وتارەکەم لەپێش دانا بەپەلە چاوێکی پێداخشاند و فەرمووی دەیدەم بە کەریم (کەریمی قەییوومی)یش بەسەریدا بچێتەوە.

گوتم مامە ناوتان نا؟

پێکەنی و فەرمووی کوڕە منداڵ هەتا حەوتووی نەچێ نێوی نانێن. با جارێ ئێمەش هەموو کاروبارێکی ئامادەکەین و پاشان خۆ نێو قات نییە، خودا بۆ نێوێک کەریمە.

عەرزم کرد مامۆستا دۆستانی کرماشان سەرەڕای سڵاوی بێ پایان، زۆر ئارەزووی دیدارتن، دەیانەوێ بەرەو باشووریش بێی.

فەرمووی: کاکە ئەحمەد بەسەری تۆ. منیش دە تاسەی دیتنی سەید تاهیر و مامۆستا مەلا موحەمەد (خوالێخۆشبوو مەلا محەمەدی ڕەبیعی) و کاک مووسا (خوالێخۆشبوو مووسای گەرمیانی) و شێخ لەتیف (سەید عەبدولباقی هاشمی) و دۆستانی تر دام. خودا کارساز بێ زستانێ، یان سەرە بەهارێ دێمە زەیارەتی ئەو زاتانە.

زستان هات و هێمن نەهات. بەهاری ساڵی ١٣٦٣/ ١٩٨٤ داهات، لە سەرەتای مانگی گوڵان، ڕۆژێک لە ڕۆژان مامۆستا تەلەفۆنی کرد و فەرمووی دێمە سنە و لەوێڕا دێمە کرماشان، بڕیارمان وا دانا ڕۆژانی (١١ و ١٢) لە سنە بێ و ڕۆژی (١٣) بێتە کرماشان. فەرموویان ئێوارەی ڕۆژی (١٢)ی مانگی گوڵان لە سنە (شەوە شێعر)ێک پێک دێ. ئەگەر توانیت ئەتۆش وەرە و سەرلەبەیانی ڕۆژی دواتر لەگەڵ من بگەڕێوە کرماشان. بەڵێن وا داندرا پاش نیوەڕۆی ئەوێ ڕۆژێ لە سنە یەکتر ببینینەوە.

شەڕی داسەپاوی ڕێژیمی بەعسی و بۆردومانی پەیتا پەیتای شاری کرماشان، ئەوێ ڕۆژێی لێ کردینە شین و گریان. هەرکەس بەلایەکدا پەرەوازەی گوندەیلی ناوچەی گۆران و هەورامان بوو، منیش ڕۆژی ڕوونم لێ بووە شەوی تار و بەرەو پشت چیای بێستوون و ناوچەی نەژیاوەران بۆی دەرچووم و نزیکەی حەوتوویەک نەمتوانی بگەڕێمەوە شار و لە دیداری مامۆستا لە سنە و کرماشان بێبەری بووم. بەڵام مامۆستا پاش تەواوبوونی شەوە شێعری سنە، سەرەڕای ئەمە کە دۆستانی وێ زۆری پێ دەڵێن مەچۆ کرماشان، دێتە ئەوێ و ڕەحمەتی سەید تاهیری هاشمی دەبینێ.

با ئەوەش بڵێم، ساڵی داهاتوو، یانی سەر لە بەهاری ساڵی ١٣٦٤ مامۆستا جارێکی تر هاتەوە کرماشان و ژمارە ١ی گۆڤاری «سروە»ی وەک دیارییەکی گرانبەها بۆ هێنایین. لەم سەفەرەدا دەرفەت هەموارتر بوو و توانیمان پێکەوە، دیدار و سەردانی




زۆر زانای گەورەی کرماشـــان بکەین و سەر لە شوێنەوارە مێژووییەکانی تاقی بوستان و بێســـتوون بدەین. مامۆســـتا بڕیاری دا لە دەرفەتێکی تردا، جارێکی تر بێتەوە کرماشان و بچینە ناوچەی هەورامان و گۆران و قەڵخانی و ســـەرپێڵی زەهاو، بەڵام مەرگ مۆڵەتی نەدا و ئەم سەفەرەی تر هەرگیز ئەنجام نەدرا. مامۆستا بەدیتنی شاری گەورەی کرماشان پڕ بەدڵ شاگەشـــە ببوو، دەیگوت: کوڕە قەت باوەڕم نەدەکرد شـــارێکی وا گەورە هەبێ کە خەڵکەکەی هەموو کوردبن و هەموو شـــێوە زاراوەیەکی تێدا بئاخێڤرێ و هەموو جۆرە جلوبەرگێکی کوردی تێدا بەدی کرێ. ئارەزوومەندی ئەوە بوو دەفتەرێکی گۆڤاری ســـروە لە شـــاری کرماشـــان دابندرێ لەگەڵ زۆر ئاواتی تر کە بەدی نەهاتن. پاش کۆتایی هاتنی شـــەوە شێعرەکەی سنە برای شاعیر و نووسەرم کاک ســـەید «سمایلی حوسێنی»، ئەم وتووێژەی لە تەک ئەنجام دەدات و پاشان نەوارەکەی دەدا بەمن و، منیش ئێستا سەرەڕای ســـپاس لە کاک ســـمایل، دەقی ئەم وتووێژە پێشـــکەش بەڕەوانی پاکی مامۆستا هێمنی خۆشی نەدیو دەکەم.

ئەحمەدی شەریفی




- لەبارەی شێعر و شاعیریدا
- سەبارەت بەزمانی یەکگرتووی ئەدەبیی
- چۆنیەتی دامەزراندنی گۆڤاری «سروە»

* سـەید سمایل: ئێستاش پێمان خۆشـە لەم فرسەتە کە دەستی دا و ئەم هەلە کە کەوتە دەستمان (بەختەوەرانە لە خزمەت تاقمێک لە ئەدەبدۆستاندا کۆبووینەوە و بەتایبەت مامۆستا هێمن ئەستێرەی پرشنگداری ئاسمانی ئەدەب و شێعری کوردی) کەڵک وەرگرین، لام وایە ئەمانەی کە سـەروکاریان لەگەڵ ئـەدەب و ئەدەبیاتدا بێ، کەم تا فرە، گومانم نییە هیچ کەس هەبێ ناوی مامۆستا هێمنی نەبیستبێ، شێعرێکی لە مامۆستا لەبەر نەبێ و بەتێکڕایی ئەم شاعیرە پایەبەرزەمان نەناسێ...

ئەمانـەی لە خزمەتیان داین: بریتین لە ئاغای کەریمی قەیوومی و ئاغای جیهانی کە بەزاراوەی کوردی شـیمال بەحسـمان لەگەڵ ئەکا و هەروەها ئاغای ئەسەدی کەرەمی لە مەنتەقە و ناوچەی کرماشان.

مامۆسـتا هێمن لەگەڵ بەخێرهاتننتان ئەگەر ئیجازە بفەرمووی یەکەمین پرسیارمان وا مەترەح بکەین کە جەنابتان لە چەند ساڵییەوە دەستتان داوەتە شێعر؟

مامۆسـتا هێمن: لە تەمەنی ١٠ ـ ١٢ سـاڵیدا دەستم کرد بەشێعر گوتن. بەڵام شێعرم نەدەناسی کە شێعرم دەگوت، پێم وابوو شێعر ئەوەیە کە وەزن و قافیەیەکی لەباری هەبێ و ئەوی دیکە هیچ نییە. خۆشـبەختانە ئەو شـێعرانەی لەو تەمەنەدا گوتبوومن بەدەستی

باوکم دە ئاگر خران و ئەگەر مابان ئێستا خۆم دە ئاگرم دەخستن. بەڵام دە بیست و یەک ساڵیدا هەستم کرد کە شاعیر دەبێ چۆن بێ؟ لە بیست و یەک ساڵیدا، یەکەم شێعرم دە گۆڤاری «نیشـــتمان»دا بڵاوبۆوە، کە پێم وایە شێعرە، ڕەنگبێ لەباری شێوەوە نەگەیێتە باری شێعرەکانی ئێستام، بەڵام لەباری ناوەڕۆکەوە کوڵوکۆی دەروونی خۆم بووە و دەرم بڕیوە. چونکە من پێم وایە، شـــاعیری واقیعي کەسێکە کە ئیحساس و کوڵوکۆی دەروونی خۆی دەربڕێ و بهێنێتە ســـەر کاغەز. دەنا قافیە ڕێکخســـتن و وەزن دروســـت کردنم پێ شـــاعیری نییە. دیارە وەکو کەلامێکی زیبا بەلامەوە خۆشەویســـتە، بەڵام دە ئیحساســـی خۆمدا پێی دەڵێم نەزم، نەزمی جوان، شـــێعر بەشـــتێکی دیکە نازانم. ئەوە نەزەری منە لەبارەی شێعرەوە. وەک عەرزیشم کردی لە دە دوازدە ساڵی ڕا دەستم پێ کردووە، بەڵام شێعری کرچ و کاڵم دەگوت.

* ســـەید سمایل: مامۆســـتا! کەوابوو بەمرووری زەمان، ئینسان هەرچی دە زەمینەی شـــێعردا کار بکات ئەو کرچ و کاڵی و بەئیســـتلاح ئەو خامییە، پوختە ئەبێ و ئەگەیەتە مەرحەلەی تەکامول و ڕەخسان. نەزەرتان لەم بارەوە چییە؟

مامۆســـتا هێمن: وەڵڵا نەزەرم لەم بارەشـــەوە فەرقی هەیە، شاعیریش وەکوو هەموو ئینســـانێک فەرقی هەیە، هێندێک شـــاعیر، بەجەوەڵانێک لە ژیانیانـــدا دەگەنە تەکامول. وەنەبـــێ هەر تەجرەبە بێ. دەورانێـــک لەژیانیاندا دەگەنە تەکامـــول و تەواوبوون، وەکو مامۆســـتا گۆرانی گەورە، کە لە دەورانێکی عومری خۆیدا پێم وایە شـــاعیری وا بەرز هەر نەبووە و نابێتەوە. ئەگەر بڕوا بفەرموون، زۆر جەسارەتە ئەوەی عەرز دەکەم، شێعرەکانی دەورانی ژیانی ناگاتە شێعرەکانی ناوەڕاستی ژیان...

* ســـەید سمایل: مامۆســـتا شێعر هەیە کە بۆ مەقتەعی خاس لە زەمان وتراوە، یانی بـــەدەرد مەقتەعی خاس لە زەمـــان ئەخوات، نەزەرتان لەم بـــارەوە چییە؟ باش وا نییە شاعیر شێعرەکەی بۆ هەموو زەمانێک باش بێ، یانی واقیعیەتێکی مەلمووس بێ کە هەموو زەمانێک قابیلی دەرک بێ؟

مامۆستا هێمن: عەرزت دەکەم، ئەمن ئەو شێعرەی کە بۆ زەمانێکی تایبەتی دەگوترێ بەشـــێعری نازانم، بەشـــوعاری دەزانم. ئەمن پێم وایە کە شـــێعر ئەوەیە کە پاش مردنی شـــاعیریش زیندوو بێ. هەروەکو دەزانین سێ سەد ســـاڵ لە وەفاتی ئەحمەدی خانی مە ڕابردووە، ئێســـتاش شـــێعرەکانی هەر بەتام و خوێن. هەروەک بۆ ئەو ڕۆژەی گوتبن وایە، قەتیش کۆن نابن. شێعرێک کە ئیحساسات و عەواتفی ئینسان بەیان بکا ئینسانی واقیعی،

ئەوە شـیعرە، ئینسان ئەو شیعرەی دەوێ. هەتا شێعر مابێ و ئینسان مابێ، ئینسان ئەو شێعرەی دەوێ. زۆر شاعیری وا هەن، پێش ئەوەی بۆ خۆیان بمرن، شێعرەکانیان مردوون. زۆر شاعیری واشمان پێ شک دێ با هەر باسی کورد نەکەین وەک حافزی شیرازی کە تازە ئێمە دەزانین کە شێعرەکانی چەندە لەگەڵ ژیانی ئەورۆی ئێمەن. ئەگەر ئیجازە بدەی دوو شێعری حافیزی بخوێنمەوە تا قسەکەم وەڕاست بگەڕێ:

بیـا تـا گـــل برافشـانیم و مـی در سـاغر اندازیـم
فلـک را سـقف بشـکافیم و طـرح نـو در اندازیـم
اگـر غـــم لشـکر انگیـزد کـه خـون عاشـقان ریـزد
مـن و سـاقی بهـــم سـازیم و بنیـادش براندازیـم

ئایا ئەو شێعرە کۆن دەبێ؟ بەعەقیدەی من کۆن نەبووە.

* سـەید سمایل: بەڵێ، مامۆسـتا ئەوەڵین شاعیری کورد کە بەکوردی شێعری وتبێ کێ بووە؟

مامۆسـتا هێمن: تەعبیری ئەوە بڕێک گرانە. بەڵام تا ئەو جێی ئەمن متالەعەم لەسەر ئەدەبی کوردی کردبێ، پێموایە ئەوەڵ دەنگێکی شێعری کوردی لە هەورامانەوە بەرزبۆتەوە، ناشزانم شـاعیرەکەی کێ بوو. بەڵام سەیرە لە هەورامانەوە لەوپەڕی جنوبەوە، پەڕیوەتە شـیمال... شێخ ئەحمەدی جزیری و فەقێ تەیران، ئەو شاعیرە ناسراوانە پێش ئەحمەدی خانی بەزاراوەی شـیمال شـێعریان گوتووە. بەڵام ئەحمەدی خانـی ئیتر دنیایەکی بۆمە کردۆتەوە، کە بەڕاستی دەبێ خەڵکی کورد بۆ ئەبەد ئیفتیخار بەو شاعیرە بکات.

* سـەید سـمایل: مامۆسـتا گیان، هەروەک خۆت ئەزانی لە مەنتەقەی کوردستانا لەهجەی فرە هەیە، کە ئەم لەهجانە، هەروەک خۆتان ئەزانن، بەعزێکی جەرەیاناتی تاریخی و بەهەرحاڵ مەوقەعیەتی جوغرافیایی بۆتە باعیسی مانی و بەعزێ لەو لەهجانە بەمرووری زەمان قابیلی ئەوەن نەمێنن، بەعزێکیشـیان بەهەوڵ و تەقەلای خەڵکی لائەچن... جا بۆ شێعر لەناو لەهجە کوردییەکانا کامت پێ باشە؟

مامۆستا هێمن: ئەگەر بۆ خۆم موکریانی نەبام، پێم وابوو، لەهجەی موکریان باشترین لەهجەیە بۆ زمانی کوردی. بۆ زمانی یەکگرتووی کوردی، بەڵام دەترسێم ئەوەی بەتەعەسسوب دابنێن، کە ئەمن و تەعەسسـوبیان نەگوتووە. مامۆسـتا جەمیل ڕۆژبەیانی دەفەرمووێ،

موکریان بەمانای (موغ ڕێیان)ە، یانی ڕێگای ئەو موغانە بووە کە لە هەورامانەوە هاتوون، یـا لە جێگای دیکەڕا، بە (دریاس/ دریان) کە کۆنە شـاری موکریانە، بەوێدا ڕابوردوون و هەریەک لەوانە هێندێک وشـەی کوردیان بەجێهێشتووە. هێندێک تەعبیری شێعریان بەجێ هێشـتووە، ئەوانە ئێسـتاش لەموکریانا حیفز کراون (پاراسـتراون). ئەم لەهجە دەڕوا تا دەگاتە نزیک سـولەیمانی. دیارە لەهجەی سـولەیمانی تـا حەددێکی لەگەڵ لەهجەی موکریانی، یانی لەهجەی شاری سـولەیمانی نەک لەهجەی دێهاتەکانی فەرقی هەیە، یانی لەهجەی موکریانی ناوەڕاسـتە لە کوردستاندا. بەعەقیدەی من چاکترین لەهجەیە کە ئێمە بیکەینە بناغە بۆ ئەوەی زمانی یەکگرتووی کوردی لێ دروست بکەین.

* سەید سمایل: بەڵێ، کەوابوو هەم بۆ پەخشان و هەم بۆ شێعر؟

مامۆستا هێمن: بەڵێ...

* سـەید سـمایل: مامۆسـتا گیان لەناو شـاعیرە کوردەکانماندا، قەدیمەکان، یانی کلاسیکەکان، کامیانت بەلاوە باشتر و پاراوترە؟

مامۆستا هێمن: عەرزت دەکەم من زاراوەی کلاسیکم لەبارەی شێعری شەرقیدا بەکەیفێ نییە. بەڵام شێعری عەرووزی و هیجایی بڵێین باشترە...

* سەید سمایل: یان شێعری تەقلیدی!

مامۆسـتا هێمن: ... بەڵێ شـێعری تەقلیدی! عەرزت بکـەم، بەعەقیدەی من، ئێمە شـاعیرێکمان نەبوو لـە نالی بەکارتر. ئەو شـاعیرە بەبڕوای من هەر لـەو وەختەدا دە بیری دروسـتکردنی زمانی یەکگرتووی کوردیدا بووە. ئەتۆ دیوانی ئەو شاعیرە بەدیققەت بخوێنەوە، تەماشـا دەکەی وشـەی هەریەکـە لە لەهجەکانی کوردی تێدایە، جا ناسـک خەیاڵیشـی چ عەرزکەم، چ بڵێم؟! بەتایبەتی یاریی بەوشـەکردنی مامۆستا نالی قابیلی موقایەسـە نییە لەگەڵ هیچ شـاعیرێکی تر. ئەگەر ئیجازە بدەن، دوو شێعرم ڕەنگە لەبەر بێ بۆتان بخوێنمەوە:

دەروانییـــە وەک هێڵـــەگی ســـەودا ســـەری گێـــژم
بـــۆیـە بـــەدەقیقـــی مـــەســـەلـــە هـــەرچی دەبێـــژم
هـــەر پـــەرچـــەم و پێشـــانییە فکـــری شـــەو و ڕۆژم
هـــەر گـــەردن و زولفـــە ئـــەمـــەلـــی دوور و درێـــژم

ئەو شێعرانەی برێک قووڵن، کە مانا لێکدانەوەیان وەختی دەوێ... بەڵام نالی بەڕاستی




شێعری (سەهل و مومتەنیع)یشی هەبووە.

ئەوەم زۆر گێڕاوەتەوە، جارێک کۆڕێکی ئەدەبی بوو، برای عەرەبی لێ بوو، پێم گوتن برا عەرەبەکان، ئەی ئەو کەسانەی بەخورما فرچکتان گرتووە، ئەی ئەو کەسانەی دەبن سێبەری دارخورمادا پەرەوازە بوون، ئایا بۆ خۆتان شێعرێکی وا جوانتان لەبارەی خورمادا هەیە کە نالی دەفەرموێ:

دەخیلت بم نەخیلی یا ڕووتابی
وەها شیرین و سینە نەرم و دڵڕەق

بڕوا بکە، هەموویان گوتیان نیمانە...

* سەید سمایل: ئەگەر ئیجازە بفەرمووی شێعرێکی هەیە کە مەتلەعەکەی: «چییە گوارە گوناهی وا بەنەستەق/ بەگوێ هەڵتاوەسیوە، سەر موعەلەق؟!»...

مامۆستا هێمن: لەبارەی گوارەدا، شتێکی دیکەی جوانتری هەیە زۆر کوردانەیە:
«سەراپای گوارە زەردی ترس و لەرزە/ دەڵێی عاسیی بووە لەو جێگە بەرزە»
(بەپێکەنینەوە) ئەوە کوردانەترە.

* سەید سمایل: بەتێکڕایی نالی لە سەنعەتی بەدیعی ئیمتیازێکی زیاتری لە شاعیرانی تر هەیە. شێعرەکانی فرە بەدیعی هاتێیا، مامۆستا گیان... نیما، قسەیەکی هەیە، ئێژێ ئەشێ ئینسان موسەلەت بێ بەسەر قافیەدا، نەک قافیە موسەلەت بێ بەسەر ئینسان. من وا دەرک ئەکەم لەم قسانە، کە حەتمەن وەزن و قافیە ئەبێ هەر هەبێ، مونتەها نەک حاڵەتی تەقلیدی و عەرووزی هەبێ، بۆچوونی جەنابتان لەم بارەوە چییە؟

مامۆستا هێمن: منیش قسەیەکم هەیە، دەڵێم شاعیر دەبێ شێعر ئازاد بکات کە خۆی بۆ خۆی قالب بدۆزێتەوە، لە «ئەزموونی شاعیریمدا» کە پێم وایە چاپکراوە لەوێدا دەڵێم ئەگەر من ناڵەی جودایم لە وەزنی مەسنەویدا نەگوتبایە، نەمدەتوانی کوڵوکۆی خۆم دابمرکێنم، بەڵام ئەگەر «پەری شێعر»م دە وەزنی هیجاییدا نەگوتبایە هیچ تامی نەدەبوو، ئەوەیە بڕوای من. من شاعیرێکم دە پێشدا چوارچێوە دروست ناکەم بۆ ئەوەی شێعرێک دە چوارچێوە و وەزن و قافیەیەکدا بڵێم، لێدەگەڕێم شێعر بۆ خۆی دەیبینێتەوە. ئەگەر شێعر بێ دەتوانێ بیبینێتەوە، قافیەش ببینێتەوە. مامۆستا گۆران شێعری کوردیی نوێ کردەوە، گۆران پەنای بردەوە بەر فۆلکلۆری کوردی. کام شێعری گۆران تۆ هەڵدەبژێری، کە ئەو

دەناو فۆلکلۆری کوردیدا وەزنی نەبێ؟ بۆ نموونە، شێعرێکی کە زۆر بەدڵمە، نازانم لەبیرمە یان لەبیرم نییە. «کوردســـتان گەڕام، دۆڵاودۆڵ پێوام، نە لە شـــار و نە لە دێ، نەمدی کەس، وەک تۆ جوان بێ، تۆیت و بەس، کچە کوردێک دڵ پێی شـــادبێ، وەک فریشـــتە و پەریزاد بێ...». بەڵام تۆ تەماشا دەکەی لە بەیتەکانی کوردیدا ئەم وەزنە هەیە.

* کەریم قەییوومی: بەیتی خەزێمێ...

مامۆســـتا هێمن: بەڵێ، بەیتێک هەیە بەنێوی خەزێم، ئەوانەی هەموو تێدایە. نازانم لە بیرمە یا نا؟ کەریم ئەتۆ لەبیرتە؟ بەڵام ئەگەر هەمووشـــم لەبیر نەبێ، شـــتێکم لەبیرە کە دەڵێ:

سەد وەستام بۆ بێ لەلای شیرازێ
دووسەد وەستا بێ لەلای دریازێ
کراسێ بدروون بۆ بووکە نازێ
دە بلا تەنک بێ، نەرم و شلک بێ
بۆ بووکە نازێ...

ئایا ئەوە هەر ئەو وەزنە نییە؟ ئەمما دە فۆلکلۆری کوردیدا ئیتیفاقەن قافیەش مەترەح بووە. ئەگەرچی ئەمن بۆ خۆم پێموایە مەترەح نییە قافیە بۆ شـــێعر. وەزنم پێ مەرجە، قافیـــەم پێ مـــەرج نییە. ئەگەر ئەتۆ فۆلکلۆری کوردی چاتـــر متالەعە بفەرمووی دەزانی کە ئـــەوان قافیەیان ڕەعایەت کردووە. تیکراری قافیەیان، وەکو لە شـــێعری عەرووزی یا تەقلیدیدا کە ئێوە دەفەرموون، کردووە. ئەوەیان پێ عەیب نەبووە، بۆ دەربڕینی مەتڵەبی خۆیان، زۆر جاریان تیکراری قافیە کردووە.

ئومێدوارم ڕۆژێک (توحفەی موزەفەرییە) کە پێشـــکەش کراوە بە کەرترین شای ئێران یانی موزەفەرەدین شا (گشتیان پێ دەکەنن) و هەر بۆیەش ناوی توحفەی موزەفەرییەیە، بەدەستتان بگا و بزانن کە بەڕاستی فۆلکلۆری مە چەند دەوڵەمەندە.

ئـــەم ڕۆژانە ئەدەبدۆســـتێکی کـــورد بۆی گێڕامـــەوە گوتی: «دەگـــەڵ جەلالی ئالی ئەحمەد چووبووینە دەماوەند. من ئەو شـــێعرەی گۆرانییەم گوت: من و دەماوەند ....... هاودەردین»...

* کەریم قەییوومی: ... شەرتێکمان بەست.

مامۆستا هێمن: بەڵێ، شەرتێکمان بەستەن... نا، (من و دەماوەند، شەرتێکمان کەردەن/ ئەو تەم و من غەم تا وەڕووی مردەن)

جەلالی ئالی ئەحمەد گوتی: ئەی خاک بەسەرمان، ئێمە لە داوێنی دەماوەند دەژین و وەک بەچکە کوردێک ناتوانین باسی دەماوەند بکەین.

* سەید سمایل: باسی وەزن و کێش و قافیەمان دەفۆلکلۆری کوردیدا کرد. مەسەلەیەکی‌تر کە بەنەزەرم لێرەدا ماوە، مەسەلەی هۆرەیە کە ئەوەیش هەروەکو بەیت ئەخوێندرێ (دەگوترێ). ئاهەنگێکی تایبەتی هەیە. مونتەها سەر بەئەوێستایە، بەشێک لە گاتاکانە. گاتاکانی ئەوێستا لە کۆنا بەئاهەنگی تایبەت خوێندراوە بەناوی (هۆرئامەنان)، کە دوایە تەسحیفی بەسەردا هاتووە و وشەی هۆرئامەنان بووە بەهۆرە. کەلیمەی هەورامانیش هەر لە هۆرئامەنانی ئەوێستاییەوە بووە. جا حەز دەکەین کە بیروڕای جەنابیشت سەبارەت بەهۆرە و مەنشەئی هۆرە بزانین کە ئەمرۆش بەهەرحاڵ بەسوڕەتی ئاهەنگێکی قەدیمی هەر ماوە.

مامۆستا هێمن: من لە زمانەوانیدا شارەزاییم نییە. بەڵام لەبارەی ئەم کەلیمە تایبەتییەدا، بڕوام هەروەک بڕوای مامۆستای گەورەمان «زەبیحی»یە، کە پێموایە ڕاست دەکا کە دەڵێ هۆرە هەریەکێک بووە لە گاتاکان و زۆر بەئاشکرایی دیارە کە کەلیمەی هۆرە وەکو ئەهۆرومزا، ئەهۆرامزدا دێتە بەرچاو. پێموایە ئەو کەلیمە هەر ماوەتەوە.

* سەید سمایل: بەڵێ، ئەڵعانیش دە فارسیدا کەلیمەی «هوڕا» بۆ دەنگێکی مومتەد (کشاو) هەر بەکار ئەبرێ. ئەڵبەتە هۆرەش هەر دەنگێکی مومتەدە. ئەمن لەم باوەڕەدام کە «هۆڕای» ئێستای زمانی فارسیش هەر پاشماوەی هەمان «هۆرئامەنان» یان «هۆرا» بێ کە لە ئاوێستادا بووە.

مامۆستا هێمن: بەڵێ، خراپی بۆ نەچووی، بۆچی؟ دەکوردی خۆشماندا «هەرا» ماوە. «هەرا» یانی بانگکرن بۆ لای خوا. کەوابوو هەرچی ئەم «هێ»یانەی لە پێشەوەبێ و ئەو حەرفانەی تێدابێ، پێموایە مەربووتن بەگاتاکان. ئیتر ماون و تەحریف (سوان و جێگۆڕکێ) یان بەسەر داهاتووە و وایان لێهاتووە.

* سەید سمایل: مونتەها، ئەو هۆرە یان هۆرئامەنانی ئەو وەختە لە گاتاکاندا، بەعینوانی موناجات، بەعینوانی گات و ستایش هاتووە.

مامۆستا هێمن: بەڵێ بەمانای دوعاکردن هاتووە. مومکینە هەر بەمانای دوعاکردن

بێ.

* سەید سمایل: ئەمڕۆ هۆرەش هەر ئەو حاڵەتی قەدیمییەی هەیە، یەعنی لە حاڵەتی شێوازی ئەمڕۆیدا نییە و هەر حاڵەتی کۆنی قەدیمییە.

* کەریم قەییوومی: شـێوازیَ گوتنی هۆرە و خوێندنی هۆرە بۆ خۆی موشەخەسە کە جەرەیانی ئەو چۆنە، یەک نەوع عیبادەتە، یەک نەوع لاواندنەوەیە، یەک نەوع پاڕانەوەیە، ئەسڵەن لەحنی سیستیمی گوتنەکەی موشەخەسە.

* سـەید سمایل: مامۆستا گیان! ئێسـتا ئەگەر ئیجازە بفەرمووی لە زەمینەی کاری ئەدەبی خۆتان پرسیار بکەین. ئێستا بەچییەوە مەشغوڵن، خەریکی کام کتێبن؟

مامۆسـتا هێمـن: عەرزت بکەم وەڵڵا ئەمـن ئەلعان کاری تایبەتیم نووسـینی کتێب نییە. ئەمن ئێسـتا خەریکم لە موجەلەیەکدا کاردەکەم کـە بەزمانی کوردی خەریکین لە ورمـێ بڵاوی کەینەوە. بەداخـەوە کادرمان کەمن. زۆرمان هاوار کـرد بۆ براکانی هەموو جێگایەک کە یارمەتیمان بدەن و بەڕاسـتی یارمەتیشیان داین. بەڵام بۆ خۆتان دەزانن کە وەزعێکی ناخۆش لەو وەختە ڕووی دا. بەداخەوە ئەو کەسانەی کە نامەیان بۆ ناردووین لە سەردەشتەوە، لە پیرانشارەوە، لە سەقزەوە، ئێمە کە جوابمان بۆ دەنووسینەوە، بەرگەشت دەبوونەوە. چونکە نازانین بۆ کوێ ئاوارە بوون. ئەمما ئەوەی کە ئێمە ئارەزوومانە ئەوەیە کـە موجەلەیەکی فەسـڵی لانی کەم بڵاوکەینەوە. دیارە ڕەنگـە دوایە ڕەخنەگرانی کورد ئەو مەسـئوولیەتەش باوێنە سەر ئەستۆی من. بەڵام دەمەوێ من ئەو موجەلەیە بەزمانی ئەدەبیی کوردی بڵاوکەینـەوە. ئەمما ئەوە دەلیل نییە کە ئێمە لە موجەلەدا، لەهجەکانی دیکەی کوردیمان لەبیر بچێتەوە. ئێمە تکا لە هەموو قەڵەم بەدەسـتان دەکەین کە شێعر و پەندی پێشـینیان، ئاداب و ڕسـومی کوردی بەلەهجەی خۆیانمـان بۆ بنێرن کە ئێمە لـە گۆڤارەکەماندا بڵاوی بکەینەوە. بەتایبەتی زۆرمان پێ خۆشـە کە وێنەی دیمەنەکانی کوردسـتان بڵاوکەینەوە. ڕەنگ بێ خوا یارمەتیمان بدا یەکەم موجەلە یا گۆڤاری کوردی بێ کە مسەوەر(ڕەنگی) دەبێ، جا ئێوە و هیمەتی ئێوە.

* سەید سمایل: بەڵێ، مامۆستا گیان موجەلەکە ناوێکی تایبەتی هەس؟

مامۆسـتا هێمن: نەخێـر، خەریک نین ناوێکی تایبەتی بۆ دروسـت کەین، ئەگەرچی هێندێک لە برایان ناویان بۆ دۆزیوەتەوە، بەڵام چونکە موجەلەیەکی فەسڵییە جارێ ناومان بۆ دانەناوە، ئومێدوارم بگاتە جێگایەکی گەورەتر لە ناو.

* سەید سمایل: مامۆستا گیان، مەجمەعە عیلمییەکەتان، یا ئینتشاراتی سەلاحەدینی

ئەیووبی جگە لەو مەجەلەیە کاری تری فەرهەنگی ئەکا؟

مامۆستا هێمن: بەڵێ، تا ئێستا پێنج کتێبمان ناردۆتە ژێر چاپ و ئەلعان لەژێر چاپدان، کە یەکێک لەوان دیوانی نالی ئەو شاعیرە گەورەیە بەشەرحەوە کە مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس و کوڕەکانی لە سەریان کردووە. ئەوی دیکە دیوانی وەفاییە کە شاعیرێکی مەهابادییە. دوو کتێبی نەسری هەن، یەکیش فارسییە (کرد در تاریخ بیگانگان) کە بەعەقیدەی من هەر دەبوو بەفارسی بێ هەتا برا فارسەکانمان بزانن ئێمە چ زەجرێکمان کێشاوە لە توولی تاریخدا. لەبەروەی ئەو کتێبەمان بەفارسییە. دەنا باقی دیکەمان ئەوی دەژێر چاپدان کوردین. پێموایە زۆر زوو دەکەونە دەستی خوێنەران ئینشاڵڵا.

* سەید سمایل: نیازتان هەیە کە ئیدامەی بدەن و کۆڕەکە هەر کاری ئەدەبی بکا؟

مامۆستا هێمن: عەرزم کردی، لەم ڕۆژانەدا لێیان پرسیم تۆ بۆ لە ورمێی، چدەکەی؟ گوتم ئەمن گەر کارمەندێکی ڕەسمیش بوویام ئەلعان بازنشستە بووم. بەڵام عیشق بەزمانی کوردی، عیشق بەئاداب و ڕسومی کوردی، عیشق بەخەڵکی کورد، منی وادارکردووە بەو پیرییە و بەو نەخۆشییەوە بچم و دەو مەجەلەیەدا کارێ بکەم، لەو کۆڕەدا کارێ بکەم. ئومێدەواریشم زۆر پتر سەرکەوتوو بین. بەڵام شتێکی کە لێرەدا دەمەویست بیڵێم ئەوەیە کە ئێمە کەشف و کەرامەتمان نییە بزانین «ئاغای حوسێنی»یەک لە سەنەندەج هەیە و شاعیرە. دەبێ ئەو خۆی بەمە بناسێنێ جا ئێمە بزانین شاعیرە یان شاعیر نییە.

ئێمە دەفکری وەی داین کۆڕێکی زۆر گەورەتر تەشکیل بدەین. جا لەهەر جێگایەکی بوو. دەبێ بزانین کێ دەعوەت دەکەین بۆ ئەو کۆڕەی، بزانین کێ دەبێ لەو کۆڕەدا خاوەن نەزەربێ. لەبەروەی تکا لە هەموو ئەو قەڵەم بەدەستانە دەکەم کە کوردییان خۆشدەوێ، کە ئەو میللەتە بێ بەشەیان خۆشدەوێ، کە ئەو میللەتە لێقەوماوەیان خۆشدەوێ لە ناردنی ئاساری خۆیان درێغی نەکەن.

سەید سمایل: ئینشاڵڵا، هیوادارین کە هەموو لایەک بێن بەدەنگتانەوە. ئەوانە کە مایەیان هەیە و دەتوانن خزمەتێ بکەن بەکورد و فەرهەنگی کوردی بەدەنگتانەوە بێن و یارمەتیتان بدەن. ئەگەر ئیسە کەموکوڕییەکتان بێ، بەهەرحاڵ چون سەرەتای کارە، هیواداریـن بەمرووری زەمان ئەم کەموکوڕییانە لابچن و جەنابت لەو مەجمەعە عیلمییەدا هەر بمێنێ ئیشاڵڵا بۆ داهاتوو.

مامۆستا هێمن: مان و نەمانی من موهیم نییە، ئێوە بمێنن، زمانی کوردی بمێنێ، من دەبێ ڕۆژێک هەر بمرم، بەڵام نە کورد دەمرێ و نە زمانەکەی.

* سەید سمایل: مامۆستا گیان، من وەک بزانم ناڵەی جودایی کە ئاخرین دیوانی ئێوە بووە کە گەیوەتە دەستمان، خەڵکیش حەتمەن چاوەڕانن کە لە ئایندەدا کارێکی ترتان بڵاوبێتەوە ئیشاڵڵا، ئایا خۆشتان بەتەمای ئەوە نین کە لە ئایندەدا دیوانە شێعرێکی ترتان بڵاوبێتەوە؟

مامۆستا هێمن: (بەپێکەنینەوە) وەڵڵاهی ئێمە تا ئێستا هەر قسەی جیدیمان کردووە، بەڵام با شۆخییەکیش بکەین. مریشک ئەگەر پیر بوو لە هێلکە دەچێتەوە، پێم وایە شاعیریش ئەگەر پیر بوو لە هێلکە دەچێتەوە. پێم وانییە دیوانە شێعرێکی تری منتان بەدەست بگا، بەڵام هەتا دەمرم دەنووسم، نەسر دەنووسم.

* سەید سمایل: مامۆستا، ئەو شێعرانەی کە بە بەهانە داتان ناوە بۆ بۆمبارانی بانە، بۆ بۆمبارانی پیرانشار، هەر ئەوانە بەشێوەی کتێبێک بڵاوبێتەوە باشتر نییە؟

مامۆستا هێمن: زۆرم کتێبی بچووک خۆش ناوێ، ون دەبێ لەنێو قامکاندا. ڕەنگە شتێکی وەک تاریک و ڕوونیشم تازە بۆ دروست نەبێتەوە.

سەید سمایل: مامۆستا شێعری فارسیت هەیە یان نا؟

مامۆستا هێمن: نەخێر.

سەید سمایل: تا ئێستا شێعری فارسیت نەبووە؟

مامۆستا هێمن: بەمنداڵی شێعری فارسیم دەگوت، زۆر خراپیشم دەگوت، چونکە بەعەقیدەی خۆم تەسەلوتم بەسەر زمانی فارسیدا نەبووە. بڕواشم وایە قسەی حاجی قادری کۆیی زۆر بەجێیە، لەبارەی ئەو شاعیرانەی کە بەزمانێکی تر شێعر دەڵێن کە دەفەرموێ:

وەک مریشکێ کە عەقڵی نەهێنێ
بێت و جوجکەی مراوی هەڵێنێ
ئاگا کە هاتوو گەیشتە جۆگەلەیەک
ناچێتە شوێنێ کە بمرێ جوجەڵەیەک
جێی ئەوی ئیشکە، جێی ئەویش ئاوە
تێدەگا هەر قوون دڕانی ژێ ماوە

* کەریمــی قەییوومی: ببووره مامۆســتا، زۆر بەجێیە کە ئاغای «حوســێنی»یش شێعرێکمان لە شێعرەکانی خۆی بۆ بخوێنێتەوە.

* سەید سمایل: شێعرەکانی من ئەڵبەتە بۆ ئەوە ناشێن کە لە خزمەت مامۆستا هێمن و جەنابتانا بخوێندرێنەوە، بەڵام بەســەرچاو منیش لە شــێعرەکانی خۆم قەتعەیەکتان بۆ دەخوێنمەوە، بەڵام ئیجازە بدەن ســوئالێکی تر لە مامۆستا بکەم تا ئەندازەیەکیش خاریج لە بەحسەکەمان نییە.

مامۆستا هێمن: فەرموون.

* ســەید سمایل: بەڵێ، مامۆستا هەژارت لە نەســرا پێ بەقەوەت ترە یان لە شێعرا یان لە هەردووکیانا؟

مامۆســتا هێمن: بەعەقیدەی من ســوئالێکی بڕێک گرانە. هەژار لە نەزم و نەسردا، لە هەردووکیاندا زۆر قەوییە. بەڵام ئەوەی ئەمن پێی دەڵێم شێعر زۆر کەم لە شێعری هەژاردا هەیە، ئیلا لە (بەرەو موکریان)یدا نەبێ کە ســۆزی ئاشــقانە و شــاعیرانەی تدایە و تێیدا دەبینی.

* ســەید ســمایل: عیدەیەک لایان وایە کە مامۆستا هەژار لە نەسرا باشترە لە شێعر. لە نەسرا بەقەوەتترە. لەبەر ئەمە بوو ئەم سوئالەم عەرز کردن.

مامۆســتا هێمن: بێگومان، عەرزت دەکەم کە هیچکەســمان نییە لە مامۆســتا هەژار کوردیزانتر بێ، قەڵەمێکی زۆر جوانی هەیە، هەم لە نەســردا و هەم لە نەزمدا، بەتایبەتی دە تەرجەمەدا. یانی من تەرجەمەی خەییامی مامۆســتا هەژارم پێ لە ئەســڵەکەی کەمتر نییە. جا ئەگەر حەملی نەکەن بەسەر تەعەسسوبەوە، پێموایە لە ئەسڵەکەی خراپتر نییە، چونکە هەم مەفهوومی شــێعرەکانی خەیامی هێناوەتەوە و هەم خزمەتی بەزمانی کوردی کردووە کەوابوو دوو خزمەتی کردووە ئەو لەوێدا.

* سەید ســمایل: خەڵکیش تا ئەندازەیەک لەو باوەڕەدان کە خوێندنەوەی هینەکانی هەژاریان لا خۆشترە لە فارسییەکە. باوەکو عەلاقەشیان پێیەوە هەیە، بەڵام لەبەر پاراوی شێعرەکانی مامۆستا هەژار، حەز ئەکەن ئەو بخوێننەوە.

جا ئەگەر ئیجازە بفەرموون لە شــێعرەکانی خۆشــم هەرچەند قابیلی نییە، قەتعەیەک ئەخوێنمەوە:

کــوڵــی گریــان و ئــەســرینم وەکــو چــۆم دایــە نــاق ئیمشــەو

لە خەڵوەتخانەیی غەمدا من و چاوێکی زاق ئیمشەو
لە کونجی نائومێدیدا لە پێمە کۆت و بەندی غەم
چلۆن ڕێگەی ئومێد ببڕم کە ماوم پێ لە فاق ئیمشەو
کە ڕۆیی، دین و دڵمی برد بەجارێ ئەو بەبێ ڕەحمی
لە دڵدا لێ ئەدا تاسەی دیار و ئیشتیاق ئیمشەو
لە مەیدانی ژیانمدا بەرەو ئاوات و ئامانجم
چییە ئەسپی مرادی من کەوا نادا وزاق ئیمشەو
لە هیجری ئەو مەلەک شێوە بەشم هەر دەرد وناڵینە
خودا کەی بێ، نەجاتم بێ لەدەس دەرد و فەراق ئیمشەو
غەریب و مەنزڵی هیوام نشێو و پڕ لە هەورازە
چلۆن ئەم ڕێگەیە ببڕم، بەبێ تۆشە و تفاق ئیمشەو

مامۆستا هێمن: پێموایە ئاغای حوسێنی تەوازوعەکەت بێ جێ بوو، ئەو شێعرە لە ڕیزی غەزەلە هەرە جوانەکانی کوردی حیساب دەکرێ.

* سەید سمایل: تا ئێستا شێعرم قوربان بۆ کەس نەخوێندۆتەوە، یانی لای هیچ کەس نەم وتووە کە شێعرم هەیە. مەنزوریش لە خوێندنەوەی ئەوە، ئەمە بوو کە جەنابتان ئیزهاری نەزەر بکەن کە پەسەندی جەنابتان بێ.

مامۆستا هێمن: بەڕاستی جوان بوو کاکە.

* سەید سمایل: ئەگەر ئیجازە بفەرموون، ئەمجار نۆرەی جەنابتانە کە بەدەنگی خۆشی خۆتان شێعرێکمان بۆ بخوێنیەوە.

مامۆستا هێمن: شێعرێک کە بۆ خۆم خۆشمدەوێ، شێعرێکە بەنێوی (ئێوارەی پاین). هەرچەند بەداخەوە لەگەڵ ئەم فەسڵە یەک ناگرێتەوە، دەبێ ببوورن لێم کە شێعری ئێوارەی پایز لە بەیانی بەهاردا دەخوێنمەوە، بەڵام خۆم پێم خۆشە:

لە ئاسۆیەکی دوورە دەست
ئاوابوو زەردی پایزی

دەتگــوت بــووکێکی بێ نازە
پــەردە جــێ دیڵــێ بــەزیزی
پــەڵــە هــەورێکــی چڵکنە
گرتــی ســووچێکی ئاســمان
گــەڵای زەردی دارێک وەری
زریــان بــردی بــەرەو نەمــان

(هتد)

سەید سمایل: خۆش بی مامۆستا گیان، بەڕاستی فرە بەتین و تەئسیر بوو، هیواداریین سەرکەوتووبی. مامۆستا هەروەک خۆت ئەزانی بۆ ڕێزلێنان بەبۆنەی حەفتەی موعەلیمەوە، بەشداریتان کردبوو لە ئاهەنگی شەوی شێعرێکا کە لە هونەرستانی سەنعەتیا ڕێک خرابوو، حەز ئەکەین بفەرموون نەزەرتان لەو بارەوە چ بووە؟ ئەو شــەوە شــێعرتان بەدڵ بوو یان نا؟

مامۆســتا هێمن: بەڵێ بەڕاســتی زۆرم بــەدڵ بوو. بۆ هەموومان خــۆش بوو، ئەوە پێشرەفتێکی زۆر گەورەیە، ئێمە دەبێ قەدری بزانین.

بەڵام لەبارەی شــێعری شاعیرەکاندا، بەڕاستی شێعری وایان هەبوو لە ئەوجی شێعریدا بوو. هەروا شــاعیری چاکیشــیان دی کە شــێعری خۆیان لەوێدا نەخوێنــدەوە، بۆمەیان خوێندەوە کە بەڕاستی شێعری زۆر چاکیان هەبوو.

بەڵام هەر ئەو شــەوە، کە دەو بەرنامەیەدا دوو شــێعری زۆر درێژی من خوێندرانەوە، وەســیەتێک دەکەم بۆ شاعیرە لاوەکان، تا پێیان دەکرێ شێعری کورت بڵێن با خوێنەر و گوێگر ماندوو نەکەن. چونکە ئەو برا کاشــانییەی کە شێعری هەوەڵێی بەڕاستی سەرنجی منی ڕاکێشا، کە داوای شێعری دیکەیان لێکرد ئیدی ئەو تام و خوێیەی نەما...

هەر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی ئێمە عادەت بکەین شێعری کورت بڵێین. چ لەوەی چاکترە کە گوێ نەدەینە قەواعیدی عەرووزی و نازانم قەواعیدی شــێعر و لەهەر جێگایەکی ئیحساسی خۆمان براوە، قەڵەمەکە دانێین و چیدیکە نەڵێین.

دیســان نالی نەمر موبتەکیری ئەو شــتەیە کە غەزەلە جوانەکانی ئەغڵەبیان چوار یا

پێنج شـیعرن. ئەوە وەسیەتێکمە بۆ شاعیرە لاوەکان کە حەشو دەشێعریاندا نەبێ، دیارە شێعر بەپیاوی نییە، ئیحساس بەشاعیر نییە، وا دەبێ نابڕێتەوە و درێژ دەبێ. ئەمما ئەگەر ژێیان کرا کورتی بکەنەوە.

ئەوە وەسیەتی منە بۆ شاعیرە لاوەکان.

* سـەید سـمایل: زۆر تەشـەکور دەکەین لە ڕاهنومایيیتان هەروا لە وتووێژەکەتان مامۆستا گیان.

تێبینی:

١ ـ لەکاتی ئەو وتووێژەدا، هێشتا گۆڤاری «سروە» ناوی لێ نەندرابوو.

٢ ـ کەریمـی قەیيوومی کـە لەم وتووێژەدا ناوی هاتووە. نووسـەرێکی کارامەی خەڵکی مەهابادە و ماوەیەکی زۆر پیاوانە شان بەشانی مامۆستا هێمن بەنانەزگی سروەی هەڵسووڕاند. کاتێ مامۆستا هێمن کۆچی دوایی کرد، تەلەفۆنم لە کەریم کرد و پرسیم سروە چی لێ دێ؟ گوتی خوا یاریکار بێ هەتا چەند ڕۆژی دیکە وتارەکانی ژمارە ٥ی ئامادە دەکەم و دەیانهێنمە کرماشان و نیشانی مامۆستا سەید تاهیر و مەلا محەمەد و تۆیان دەدەم، ئەرخەیان بن ناهێڵم نەمانی هێمن ببێتە هۆی نەمانی سـروە. لە زەمانی مامۆستا هێمندا، گۆڤاری «سروە» چوار ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە.

٣ ـ سەید سمایلی حوسێنی، شاعیر و نووسەری مەریوانییە و ئێستا لە سنە دەژی.

لە گۆڤاری «گزینگ»ی ژمارە ٢٣ بەهاری ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.



## له به‌هاری شیلاناوێوه تا پاییزی ورمێ

هاوینی ١٩٨٥، دوای نزیکه‌ی ده ساڵ دوورکه‌تنه‌وه، بۆ یه‌که‌م جار گه‌ڕامه‌وه بۆ کوردستان. له ورمێ چوومه ئینتشاراتی سه‌لاحه‌ددینی ئه‌ییوبی و گۆڤاری سروه، که ئه‌و ده‌م تازه دامه‌زرابوون، بۆ سه‌ردانی مامۆستا هێمن، که ده ساڵی ڕێک بوو چاوم پێی نه‌که‌وتبوو. دواجار که یه‌کمان بینیبوو هاوینی ١٩٧٥ بوو. ئه‌وه‌ش چیرۆکێکی خۆشی هه‌یه، هیوادارم له ده‌رفه‌تی دیکه‌دا بتوانم باسی بکه‌م.

ئێواره‌ی ڕۆژی ١٩٨٥/٧/٢٥ له‌گه‌ڵ دۆستێکدا میوانی ماڵی مام هێمن بووین. ئه‌و شه‌وه تا دره‌نگێ دانیشتین و قسه و باسێکی یه‌کجار خۆشمان کرد. ئه‌م گفتوگۆیه‌شمان هه‌ر له‌و دانیشتنه‌دا ئاماده‌کرد. ڕۆژی دواتر ٧/٢٦، ماڵاواییم له مام هێمن کرد و چووم بۆ سابڵاغ. مامۆستا زۆری تکا کرد که له گه‌ڕانه‌وه‌دا دوو سێ شه‌وی دیکه له‌لایان بمێنمه‌وه، به‌ڵام به‌داخه‌وه هه‌رگیز ڕێک نه‌که‌وت و ئیدی چاوم پێی نه‌که‌وته‌وه. له‌م ژماره‌یه‌دا به‌شی یه‌که‌می گفتوگۆیه‌که بڵاوده‌که‌ینه‌وه. به‌و هیوایه‌ی پاشماوه‌که‌ی له یه‌ک یا دوو به‌شی دیکه‌دا، له ژماره‌کانی داهاتوودا، بکه‌وێته به‌رچاوی خوێنه‌ران.

فه‌رهاد شاکه‌لی[1]

---

١- ئه‌م پێشه‌کی‌یه هی ئه‌و کاته‌یه که کاک فه‌رهاد شاکه‌لی سه‌رنووسه‌ری گۆڤاری هێژای «مامۆستای کورد» بۆ یه‌که‌م جار وت و وێژه‌که‌ی بڵاوکردۆته‌وه.

• لای میللەتانی دیکە، دەزانی شتێک هەیە پێی دەڵێن فەرهەنگی ناوداران.

- بەڵێ...

• ئەگەر لە فەرهەنگی ناودارانی کوردا ناوی هێمن بنووسرێ. دەتەوێ چی لەسەر بنووسرێ، چۆن بنووسرێ؟!

- بڕوا بکە، بنووسن شاعیرێکی لادێیی کورد بووە کە فەرهەنگی میللەتەکەی خۆی لە چوارچێوەی شێعردا بەخەڵک نیشان داوە. من بۆ خۆم پێم وایە هونەرێکی دیکەم نییە (جگە لەوەی) کە ژیانی میللەتەکەی خۆم نیشان دەدەم، ئەوەندەی توانیبم، ئەوەندەی شێعر ئیجازەی دابم، ئەوەندەی دەتوانای شاعیریمدا بێ...

• یانی لە ڕیزی شاعیراندا باس بکرێی...

- ئەگەر کورد نەبام، بەعەقیدەی من دەبوو لە ڕیزی نووسەراندا باس بکەن. بەڵام چونکە کورد هەلی وای بۆ هەڵنەکەوتووە کتێبی گەورە بنووسێ، یا ڕۆمان بنووسێ، یا داستان بنووسێ، حەتتا مەقالەی سیاسی بنووسێ... دەنا من بۆ خۆم پێم وابوو ئەگەر لە وڵاتێکی پێشکەوتوودا بام نووسەر دەبووم، لەپێش وەیدا شاعیریم.

• ئێستا بەهەر حاڵ تۆ شاعیری.

- بەڵێ ئەڵئان شاعیرم.

• باشە بەلای تۆوە شێعر چییە؟!

- بەلای منەوە، شێعر کوڵ و کۆ و هەستی دەروونی ئینسانێکە. لەهەریەک لە حیسسەکانی ئینسانییەوە، یانی چ لە حاڵی شادیدا، دەربڕینی ئەم هەستە دەبێتە شێعر، چ لە حاڵی ناخۆشیدا، کە بەداخەوە، من بەشاعیری غەم مەشهوورم، چونکە ژیانیشم هەر سەرتاسەر پڕ بووە لە غەم و داخ و ئەویش هەر ئیلهامم لە نەتەوەکەم وەرگرتووە، چ بکەم؟! وەختێکی من شاعیری نەتەوەیەکی بووم کە هەمووی بۆ خۆی غەم و داخە، منیش هەر غەم و داخم دیوە. لەبەر وەی شێعرەکانم هەمووی بۆنی غەمی لێ دێ. زۆر کەمە، هەر نییە، لە تەواوی شێعرەکانی مندا خەڵک وەپێکەنین بخەن. هەر وە گریانیان دەخەن.

• تۆ باسی ئیلهاماتت کرد. بەلای تۆوە ئیلهام، بەو مەعنا کۆنەی کە دەگوترا، بەڕاستی هەیە؟!

- نازانم، ئەو ئیلهامەی کە پێت وابێ فریشتەیەک، یا پەرییەک، باوجوودێکی من ئەوەم گوتووە، یا شەیتانێک دێتە بن هەنگڵی پیاوی، وە شێعری پێ دەڵێ، من بڕوام بەوان نییە. بەڵام پێم وایە، دیتنی دیمەنێک یا بیستنی داستانێک، شتێک لە دڵی یا لە

خەیاڵی ـ شاعیردا بەدی دێنێ، کە ئەوە تەعبیری ئیلهام، لەبارەی ویدا دروستە و من بۆ خۆم، هەر ئەوەبووە، وەختێکی، مەسەلەن بۆ نموونە دەیگێڕمەوە، من بەشارێکی گەورەی وەک سولەیمانیدا، ئێوارێکی پایز ڕۆشتم، چۆڵ چۆڵم دیوە. ئا ئەمە منی هان دا شێعری (ئێوارەی پاین) بڵێم. وە خۆت دەزانی نە باسی سولەیمانی تێدایە و نە باسی کوردیشی تێدایە. بەڵام ئێوارەییێکی پایز بوو کە من دیتم شاری سولەیمانی چۆل بوو. هەر ئەمە بوو بەباعیسی ئیلهامی وەی ئەو شێعرە بڵێم. بەڵێ من ئەوە بەئیلهام دەبینم. لە ڕاستیدا، دەناسم...

* تۆ لێرەدا بۆ تاکە تێکستێ، با بڵێین بۆ تاکە شێعرێ باس دەکەی. بەڵام بۆ دەست پێکردن، بەشێعر نووسین، هەر کابراکە دەبێتە شاعیر، ئەوەیان چۆن تەفسیر دەکەی؟!

ـ بەعەقیدەی من، شاعیری واقعیی هەر ئەو کەسەیە کە وەکو وێنە هەڵگرێک وێنە لە شت هەڵگرێ، بیخاتە ناو خەیاڵی خۆی و بەخەیاڵی خۆی بیرازێنێتەوە. بەبڕوای من شاعیری واقعیی کەسێکە کە لە ژیان ئیلهام وەرگرێ لە ژیانی ئینسانی، لە ژیانی دەوروبەری خۆی. یەکێک لە نەزەرییەکانی من لەبارەی شێعرەوە گوتوومە و هێندێ کەس تەئییدی دەکا و هێندێ کەس تەئییدی ناکا، من پێم وایە شاعیر ناتوانێ لە چوارچێوەی دەوروبەری خۆی بچێتە دەرێ. یانی ئەلئان من شێعرێک لەسەر سوێدێکی، کە نەمدیوە، بیڵێم، پێم وایە شێعر نییە، خەیاڵێکە بۆ خۆم کردوومە... شتێکی بێتامی لێ دەردەچێ، بەڵام وەختێکی من لە وڵاتێکی دەرەوەی کوردستان دەمەوێ شێعر بڵێم، تەماشا دەکەم کوردستانم دێتەوە یاد. هەر وەکو لەبیرمە، لە جێگایەکی شاخاوی و بەردەڵان و جەنگەڵدا، شەوێکی نیوەشەو، من گوێم لە دەنگی بولبولان دەبوو، لای بەیان، کوردستانم هاتەوە بیری، وڵاتێکی دووریش بوو لە کوردستان، ئەو شێعرەم گوت:

بەیان ئەنگووت و شەو ڕابرد و من هێشتا خەوم نایە
دەخوێنن بولبول و قومری، بەڵام قاسپەی کەوم نایە
خەیاڵ دەمباتە جێژوانی شەوانێ لاوەتی ئەمما
خرینگەی بازنە و خرخاڵ و بەرمووری ئەوم نایە

هەرچی کردم، نەمتوانی لەو موحیتە، لەو دەوروبەرەی خۆم ئیلهام وەرگرم بۆ ئەو شێعرەی گوتوومە، هەر خەیاڵ بردمیەوە کوردستان و بازنە و خرخاڵی کچە کوردێک.

• تۆ پێت وایە بۆچی بووی بەشاعیر. بۆ نەبووی بەشتێکی تر؟

- بەڵێ... ڕەنگبێ ئەگەر پێشەکی تاریک و ڕوون بخوێنیتەوە، لەوێدا نووسیومە، من تا لە مەدرەسەی سەرەتاییدا دەمخوێند، هیچ پێم وانەبوو ئەدەبیات چییە. لە هەموو دەرسەکانیشمدا هەر وەک یەک بووم، یانی دەرسی ڕیازیش و ئەدەبیشم هەر وەک یەک بوو. بەڵام وەختێکی چوومە حوجرەی فەقێیان بۆ دەرس خوێندنێ، لەوێ زۆر باسی شێعر و ئەدەب دەکرا و من لە پێشدا ئەوە شیفتەی کردم بۆ لای شێعر و ئەدەب. لە پێشدا پێم وانەبوو شێعر چییە؟!

پێم وابوو وەزنە و قافیەیە و هەرچی وەزنەکەی لەبارتر و قافیەکەی گرانتر بێ، شێعری چاتر ئەوەیە. بەڵام زۆری پێ چوو تا تێگەیشتم، شێعر بەیانی ئیحساسی شاعیرە. وە بەختەوەرم کە ئەغڵەب لەو یانی سەدی نەوەد و پێنج لەو شێعرانەی کە لەو وەختیدا، پێش وەی بزانم شاعیری چییە (نووسیومن) بەتاڵون، وە شکور نەبوونە بەڵا بەسەرمەوە، ئەڵعانەکانێ، حاشایان لێ بکەم!

• ئەوانەی کە باوکت سووتاندنی...

ئەوانە کە باوکم سووتاندنی... دەستی خۆش بێ...

• ئێستا، بەهەرحاڵ، ئەگەر خۆت ویستبێت یا نا، یەکێکی لە شاعیرە گەورەکانی کورد. بەڵام کە ئێستە ئاوڕ بۆ دواوە ئەدەیتەوە سەیری شێعری خۆت ئەکەی، پێت وایە چیت خستۆتە سەر شێعر، چیی تازەت هێناوە؟!

- لەبارەی قالبی شێعرەوە پێم وا نییە شتێکی تازەم هێنابێتە گۆڕێ... وەکو بۆ خۆم لە جێگایەکی دیکەشم گوتووە و ئەلعانیش تیکراری دەکەمەوە، وەختێکی خەیاڵێکی شاعیرانە بەربینگم پێ دەگرێ شێعر ئازاد دەکەم بۆ خۆی قالب بۆ خۆی بدۆزێتەوە. من قەت دەپێشدا قالبم بۆ شێعر نەدۆزیوەتەوە تا شێعر لەو قالبەدا بڵێم... لەبەر وەی لەباری قالبدا تەنیا شێعرێکی، پارچە شێعرێکی کە من پێم وایە پێش من هیچ شاعیرێکی کورد دەو قالبەدا شێعری نەگوتووە (شەنگەبێری) یەکەمە، پێم وایە لەپێش مندا هیچ کەس دەو قالبەدا شێعری نەگوتووە... با ئەوەشت لەپێشدا بۆ تەشریح کەم، کە هیچ یەک لە شاعیرەکانی مە، قالبێکی نوێیان نەهێناوەتە گۆڕێ، من دەتوانم بەدرێژی بۆت سابیت بکەم، کە مامۆستا گۆران، کە ئێمە بەشاعیرێکی نوێی دەزانین، هونەرەکەی ئەوەبوو گەڕاوەتەوە بۆ وەزنی هیجایی، کە وەزنی هیجایی وەزنێکی فۆلکلۆریکی زۆر کۆنی کوردە، یانی گەڕاوەتەوە بۆ وەزنەی.




• هەموو وەزنەکانی گۆران...؟!

- تەقریبـــەن، هیچی نییە لە فۆلکلۆردا نەبــێ... یانی نەهەموو وەزنەکانی دیوانەکەی، ئەوەی پێی دەڵێن نوێیەکەی. ئەوی شێعری نوێیەکەی، ئەتۆ توحفەی موزەفەرییەی چاک بڕوانـــە، هەمـــوو وەزنەکانی تێدایە. بەڵام ئەو بڕێکی کورت و درێژ کردوونەوە. مامۆســـتا گۆران دەڵێ:

کوردستان گەڕام
دۆلا و دۆڵ پێوام
نە لە شار و نە لە دێ
نەمدی کەس
جوان بێ وەک تۆ
تویت و بەس
کچە کوردێ وەک گوڵ وابێ،
کوردستانێ پێ ئاوابێ...
بڕۆ تەماشای توحفەی موزەفەرییە بکە، دەڵێ:
سەد وەستام بۆ بێ
لە لای شیرازێ
دوو سەد شاگرد بێ لای دریازێ
کراسێ بدروون بۆ بووکە نازێ
دەبڵا تەنک بێ، دەبڵا شلک بێ
بۆ بووکە نازێ.

هەر ئەو وەزنە نییە؟! مولاحەزە بفەرموو هەر ئەو وەزنەیە. مامۆستا گۆران هونەرێکی کـــردووە، گەڕاوەتەوە بۆ وەزنـــی هیجایی. ئەمن تەئیدی دەکەم کە دەفەرمووێ ئەم وەزنە لەگەڵ تەبیعەتی زمانی کوردی پتر ڕێک دەکەوێ. وە بەعەقیدەی من پتریش ڕێک دەکەوێ. ئەمنیـــش عەقیدەم هەروەک وی وایە لێرەدا. ئەمما من پێم وایە مامۆســـتا گۆرانیش، ئەو کەســـەی کە پێم وایە قەڕنی بیستەم شـــاعیری لەوی چاتری تێدا نەبووە لە بیرت نەچێ،

ئەوە دەلیل نییە کە من نەقد دەگرم یان باس دەکەم، لە ئیرادەتی من نیسبەت بەمامۆستا گۆران کەم ناکاتەوە مامۆســتا گۆران، بەعەقیدەی من، بڕیاری خراپی دا لە ژیانی خۆیدا، کە دەفەرموێ ئیدی تازە من ناچمە ســەر قالبی کۆن، پێم وابوو دەیتوانی شێعری دیکەی وەک دەروێش عەبدوڵڵاش هەر لە قالبی کۆندا بڵێ و میللەتەکەی ئەلعان ئیســتفادەی لێ بکا. خۆ مەحدوود کردنی شــاعیر دەقالبێکدا، یا دە چەن قالبدا، پێم وایە کارێکی ئاقڵانە نییە، بەڵێ...

● من پرسیارەکەم ئەوەبوو کە چت هێناوەتە شێعری کوردییەوە، چیی تازەت هێناوە، تۆ باسی شەکڵت کرد، بەڵام ئەی شتی تر؟!

- چــی تازەم هێناوە؟! وەڵڵاهــی... ئاخر من بۆ خۆم بڵێم چی تازەم هێناوە... بەڵێ شــتی تازەم هێناوە ڕەنگبێ لەپێش مندا هەبوون، شــاعیرە غەریبەکانی کوردستان، کە بەداخــەوە هەریەکــەی کەس نازانێ لە کــوێ مردوون، وەک حاجی قــادر یا وەک نالی، کــە باســی دەردی غوربەتیان کردووە، بەڵام من پێم وایــە زۆر نوێترم لەوانە لە (ناڵەی جودایی)دا باســم کردووە... ڕەنگبێ، بێ تەئسیر نەبووبێ شێعری بەهارەکەی حاجی قادر یا شــێعرەکەی نالی بۆ ســولەیمانی ناردۆتەوە، ڕەنگە ئەوانە هیچیان بێ تەئسیر نەبووبن دەمێشکمدا جووڵەیان کردبێ، بەڵام منیش دەردی غوربەتی خۆمم لە ناڵەی جوداییدا پێم وایە زۆر چاک تەشریح کردووە. ئەوە شتە نوێیەکە کە من هێناومە. زۆر شتی نوێی دیکەشم هەیە کە نازانم، ئەلعان لەو وەختەیدا، نە کتێبم لەپێشە و نە چی... بۆ خۆم ئەلعانەکانێ بیر دەکەمەوە و هیچ ناتوانم شێعر بڵێم، چونکە هەرچی دەبوو بیڵێم گوتوومە، وەختێکی من گەرمەشین دەڵێم بۆ شەهیدێکی کورد، ئیدی تازە هەرچەند دەکەم لەوەی چاتر ناتوانم، پێم وایە، بڵێم.

● لەوە گەرمتر...

- لەوە گەرمتر ناتوانم شــین بگێڕم... وەختێکی من باسی بەهاری کوردستانم کردووە، پێم وایە ئیدی نەققاشــییەکم کردووە لە بەهاری کوردســتان، لــەوەی چاتر ناتوانم تازە نەققاشــی بکەمەوە. وەختێکی باســی تەبیعەتی کوردستان دەکەم... هەموو... ئیدی لێم بڕاوە، وشــەم لێ بڕاوە. تازە چــی دیکە بڵێم؟! هەرچی بیڵێم تیکــراری موکەڕەرە. وە لەوانەدا بەعەقیدەی من، نوێ... شتی زۆر نوێم هێناوە... نوێیان تێدا هەیە.

● باش بوو باســی زمانــت کرد، کە دەبوو زووتر بتگوتایە، بەڵام وا درەنگتر باســت کرد. ئێســتە زۆر کەس پێی وایە تۆ لە زماندا زۆر شــتت تازە کردۆتەوە، یانی ئەو زمانە

شــێعرییەی کە تۆ بەکاری دەهێنی، چ وەکو وشە، وشەی تەنهای سەربەخۆ وەری بگری، چ وەک دەربڕین. هەندێ دەربڕین هەیە، ڕاســتە، کۆمەڵێ وشەی ئاساییە و لەناو خەڵکا هەیە، بەڵام کە بەشــێوەیەکی تازە پێکەوەت نا، دەربڕینێکی تازەش دروســت دەکا. تۆ ئەوەت زۆر وەستایانە کردووە. بەڵام ئەمەت چۆن کردووە؟ ئەمەت چۆن بۆ دێ؟!

- ئــەوە هــۆی ئەوە بوو کە من بێچووە لادێیی بووم، وە زانیومە ئەو وشــەیە خەڵکی نەخوێندەوار لە لادێدا چۆنی بەکاردێنن. وەختێکی من لە لادێدا دەژیام زیاتر شــێعرەکانی خۆم لە پێشــدا بۆ پیرێژنێک دەخوێندەوە تا بۆ ڕۆشنبیرێکی بخوێنمەوە، بزانم زمانەکەم چــاک پێکــەوە هاتووە، یان نە. و من لێرەدا مەمنوونی دێنشــینی خۆم بووم. یەکێک لە شێعرناســەکانی مەهاباد لەبارەی مندا دەڵێ: هێمن شــاعیر نییە، شــیلاناوێ کردوویەتە شــاعیر. بەڵێ من لە شــیلاناوێیەکدا دەژیام کە هەر چی لە شێعرەکانمدا هەیە، لەوێشدا هەیــە. ئاو هەڵدێــر دەڵێم، نازانم چ دەڵێم، ئەوانە هەموو لــە دێیەکدا هەن، دیومن. ئەو گوڵانــەی کە باســیان دەکەم لەنێو شــێعرەکانی خۆمدا، هەموو لە دێیــەکان هەن و من عەقیدەم وایە ئەگەر برایەکی زەوقی شــاعیری هەبێ، بەقەد من گەڕیدە با، کوردســتانی گەڕابا، ئەویش دەیتوانی وشــەکان وا جێبەجێ بکات. ئەلعان من، نووسەرێک کە ڕەنگبێ تۆش بیناسی و هەر لەو وڵاتەش بێ کە تۆ لێی، دیم، نووسینێکم دیوە، ئەو وشانەی کە من لە شــێعری خۆمدا بەکارم هێناوە، ئەویش بەکاری هێناوە. ئەو بەکارهێنانەش هەر ئەوەیە عەرزم کردی، دێهاتی بەکاری دێنێ. مامۆستای من دێهاتی بووە.

● لە پرســیارێکی پێشتردا باســی نالەی جودابیت کرد. هەڵبەت بەلای منەوە، ڕەنگە بەلای زۆر خەڵکی دیکەشــەوە، وەک ئەو ڕۆژەش بۆم باس کردیت، تۆ ئەگەر تەنیا نالەی جودابیشــت هەبێ، بەســتە. بەڵام نالەی جودایی چۆن دروست بوو، یانی بڵێین بەرهەمی ساتێکی عاتیفی بوو، بەکورتی چیرۆکی ئەو شێعرە خۆی چییە؟

- ڕەنگبێ برێک گران بێ بەڵام باوەڕم پێ بکە ئەم شێعرە وەک برووسکێک بەمێشکمدا هاتووە و لە ئانێکیشدا کە من هاوارێک بۆ غەریبی خۆم بکەم. ئەویش، بەڵێ، عیللەتێکی هەبــوو. من لە بەغدایەکــی گەرمی هاویندا، بەتاقی تەنێ، لەگــەڵ یەک دوو ڕەفیقی زۆر فەقیــر بەجێ مابووم و ڕەفیقەکانــی دیکەم، کە ئەو دەمی لە بەغــدا دەبوون، هەمووی چووبوونــە ئەورووپــا بۆ گەڕان، منیان لــە بەغدایە بەجێ هێشــتبوو. وە ڕەفیقەکانی لە بەغدایەشــم پەیداکردبــوون، کوردەکانی عێراقی، ئەویش هەموو وە شــاخ کەوتبوون. من بەتەنێ مابوومەوە. ئەو غەم و داخ و دەردە وەک برووســکێک دە یەک ڕۆژدا بەمێشــکمدا هات، بەڵام بۆ ساز و پەرداخ کردنەکەی شێعرەکە ماوەیەکی زۆری تووڵ کێشا.

• یەکەم جار کە نووسیت، هەموویت نووسی؟!

- نا هەمووم نەنووسیبوو، بەڵام تەقریبەن، دەتوانم بڵێم ئیسکلێتەکەم داڕشتبوو، بەڵام دوایە زۆری پێدا هاتم و چووم و، ئێستاش بڕواناکەم کە هەمووی بەدەستی خەڵک گەیبێ. بــا ئەو حەقیقەتە بڵێم، ئەگەر من لەو وەختەیەدا کە خەیاڵی ئەم شــێعرە لە مێشــکمدا هەبوو، ئەگەر من مەســنەوی مەولەویم لە ئیختیاردا با، ڕەنگ بوو ئەو شــێعرە بەوجوود نەیە، ئەگەر مەسنەویم خوێندباوە...

• ئەو کەف و کوڵە.

- ئــەو کەف و کوڵەم دەنیشــتەوە. هەر ئەوەندە شــێعرەم لەبەر مابــوون کە لەوێ ئیستینادم پێ کردوون...

• بەکارت هێناوە...

- بەکارم هێناون... دەنا مەســنەویم دە ئیختیار دابا ئیدی کەف و کوڵەکەم دەڕۆیی. ئەوەم بیستووە کە دەڵێن بەمامۆستا گۆرانیان گوت، گوتیان: بۆ شینت بۆ ڕەفیق حیلمی نەکــردووە، بۆ ئــەو پیاوە گەورە؟ گوتــی: وەڵڵا گریام. لەبەرئەوەی هەســت و کەف و کوڵەکەم بوو بەفرمێسک، نەبوو بەشێعر. من بڕوام بەو حەقیقەتە هەیە کە ئەگەر پیاو بۆ شتێک گریا، ئیدی شێعری بۆ ناگوترێ.

• ئەم باسەی کە دەیکەی زیاتر پیاو بۆ ئەوە ڕادەکێشێ کە بیر لە تەکنیکی شێعر نووسین بکاتەوە، چۆنی دەنووســی... یانی کەف و کوڵێک دێت، جــاری وا هەیە بەخوێندنەوەی مەولانایەک دەڕوا هیچی لێ نامێنێتەوە، جاری واش هەیە بەگریانێ قەرەبووی دەکەی...

- بەڵێ...

• بەڵام جاری وا هەیە ئەوانە هیچیان دادت نادەن، دەبێ بینووسی...

- دەبێ بینووسی...

• دەمەوێ زیاتر لەوە تێ بگەم، تەکنیکی نووسین لای تۆ چۆنە؟! دەنووسی و چاکی دەکەی؟! دەنووسی و وەکو خۆی دەیهێڵێتەوە، چۆنی دەنووسی؟!

- بەڵێ... من لەپێشدا کەف و کوڵەکەم دێنمە سەر کاغەز... بەڵام زۆر کەس وا بووە ئینتیقادی لێ کردووم کە تۆ زۆر دەســت لە شــێعری خۆت دەدەی. من تا جێگایەک کە لێی بێزار دەبم هەر دەستی لێ دەدەم، هەر کەلیمەی دەبەمە پێشەوە، دەیهێنمە پاشەوە، قافیــەی جوان دەکەم، قافیەی ناهێڵم، نازانم... یەکێک لە ڕەفێقانی قەدیمم، کە ڕەنگبێ ئەلعان، ئەو دەعیەی نەهێنێ من بەڕەفیق بزانێ، دەیگوت جاری وا هەیە تۆ شێعری خۆت

خرادەکەی. هێندەی دەست لێ دەدەی، خرای دەکەی. من بەخۆم نییە ناتوانم دەس لە شێعری خۆم نەدەم. پێم وایە، بۆ خۆم پێم وایە چاکی دەکەم، خەڵکی واش هەیە پێم دەڵێن خراپی دەکەی. زۆری دەس لێ دەدەم، بەڵام...

● پیاو کە «لەکوێوە بۆ کوێ»کەت دەخوێنێتەوە و، ئەو پێشەکییەی کە بۆ تاریک و ڕوونت نووسیوە، یان ناڵەی جوداییەکەت دەخوێنێتەوە، وا هەست ئەکا تۆ زۆر لە وڵات دوورکەوتوویتەوە... یانی وەک بڵێی هەزاران میل کەوتۆتە نێوان تۆ و وڵاتەوە، کوردستانەوە... بەڵام لەهەر لایەنێکەوە لێکی بدەیتەوە، تۆ لە کوردستانی عێراق بوویتە، نەک تەنیا لە عێراقی عەرەبا، کە ئەوەندە هەست بەغەریبی بکەیت. ئەی بۆچی ئەو هەستەی کوردستان وای لێ نەکردووی کە کەمتری بکاتەوە بابڵێین ئەوەندە هەست بەغەریبی نەکەی، وەک پیاو لە شێعرەکە و لە پێشەکییەکەدا دەیبینێ؟!

- وەڵڵاهی، کاکە، من بەڕاستی با ئەو هەقیقەتە بڵێم، من نە تەنیا لە کوردستانی عێراق هەستم بەغەریبی نەدەکرد، بەڵکە پێم وابوو لە ماڵە خۆمم. وە بەتایبەتی ئەگەر دەچوومەوە شارەکانی کوردستان، ئەوە زۆر دەردی غوربەتی لە مندا دەکوشت. بەڵام عاتیفەی ژن و منداڵ... من شاعیرێکی ڕەبەنی وەک حاجی قادر نەبووم... تاقانەیەکم بەجێ هێشتبوو کە زۆرم غەم بوو... دیارە هەر کوڕە کوردەکانم زۆر خۆش دەویستن، بەڵام جێی ویبان بۆ پڕ نەدەکرمەوە. خوشکم بەجێ هێشتبوو، برام بەجێ هێشتبوو... ئەوانەش... پیاو با زۆر درۆزن نەبێ، هەرچی کوڕە کوردێکم زۆر خۆش ویستبێ، پێم وانییە بەقەد کوڕی خۆم خۆش ویستبێ. بەڵام ئەو شێعرانەی کە زۆریان بۆنی غەریبی لێ دێ هەر ئەو شێعرانەن کە من دەساڵی ٧٤-٧٥ دا کوتوومن... ناوێرم... بۆچی بەنێو بڵێم... تەنیا موسەکینێکی هەمبوو، ناوەکەی نابەم، کابرایەک بوو، کوردێکی کە پێم وایە نەوێرابوو بچێتە شاخی، دەنا کێ هەبوو نەچووبێتە شاخی...

● ناوی مەحموود زامدار بوو.

- بەڵێ... وەڵڵاهی... ئیدی ئەوە تۆ دەیڵێی... دەچووم دەردی دڵی خۆم لەکن ئەو کەسەی هەڵدەڕشت. بەڵێ مەحموود زۆری زەرەر لە خۆی دا، ئەگەر مەحموودیش لە شاخی بایە شێعری چاتریشم دەکوت... ڕۆژێ دەچووم لەکن وی خۆمم دەخافلاند... ئەو مەلعوونە نەیدەهێشت ببێتە شێعر (پێ دەکەنێ). با خاترەیەکی خۆشی خۆم و مەحموودت بۆ بگێڕمەوە. ڕۆژێک لە یەکیەتی نووسەرانی کورد دانیشتبووم... مامۆستا عەبدوڕەزاق بیماریش لەوێ دانیشتبوو، بۆ خۆیشی لەوێ بوو... سێ چوارێک لەو بیمار و نازانم زامدار

و شــتانە لەوێ بوون. ئەو کابرایە دەســتی کرد بەکەرنامە خوێندنەوەی. دەپێش هەموو شــتێکدا گوتی: کەر گیانلەبەرێکی هێمنە... کورە گوتم، هەتیوە بۆ هەژار نییە، بۆ زامدار نییە (هەموو پێ دەکەنن)، ئاخر، بۆ بیمار نییە، بۆ هەر هێمنە...؟! یەکجار زۆر خەجاڵەت بوو (هەموو پێ دەکەنن).

● بەشێکی زۆری تەجروبەی غەریبیت پێوەندی بەو ماوەیەوە هەیە کە لە عێراق، یا لە کوردستانی عێراق بووی... ئێستا ئەو تەجروبەیە چۆن دەبینی؟!

- مولاحەزە بفەرموو، شــێعرەکانم تاریخیان هەیە. من ئەو موددەتەی کە لە کوردستان بووم، لەژێر ناپاڵم و تیزابی دوژمندا بووم، یەک شــێعرم نییە کە باسی غەریبی تێدابێ... مەتەرێزی شــەرەفم لە شــەڕدا گوتووە، بەڵام دەڵێم ئاوارەنیم، وا دەزانم لەماڵم... بەڵام نارەحەتیەکەی من هەر ئەو وەختە بوو... ئەگەر تاریخی شــێعرەکانم بخوێننەوە، هەر ئەو وەختەیە کە من هەست بەغەریبی دەکەم، کە لە بەغدا بەتەنێ بەجێ مابووم...

● کەوابــێ ئەم غەریبییە، ئەم غوربەتەی لێرەدا بــاس دەکرێ، غوربەتی زمانە، یانی پێوەندی بەزمان و فەرهەنگەوە هەیە، فەرهەنگی نەتەوایەتی میللەتی...

- بەڵێ...

● یانــی تۆ غەریبییەکەت زیاتر لەوە دابوو کە لە وڵاتێکدا بووی، لە ڕووی زمانەوە لە ڕووی فەرهەنگەوە لێیەوە دووری... وا نییە؟!

- بەڵێ... ئەوە کامیلەن وایە... من کە نێزیک بە... نازانم دە ساڵ... یا هەشت یا نۆ ساڵ لە بەغدا مام، وێستا ئەوەندە عەرەبی فێر نەبووبووم کە بتوانم ئیحتیاجاتی ڕۆژانەمی پێ ڕەفع بکەم. دیارە ئەوەش موحتاج نەبووم. ڕاستییەکەی ئەوەبوو کە دەمتوانی هەمیشە بەشی ئەوەندە کوردێک پەیداکەم کە ئەگەر قاتێک بکڕم ببێتە دیلمانج و بۆم بکڕێ. دەنا پێم وانییە هێندەش نازیرەک بم کە زمان فێر نەبم... بەڵام... وەڵڵاهی ئیســتعدادی زیان فێربوونیشــم کەمە... ها... ئەوەت پێ بڵێم وەدوایە بەڕاســتی من نەمدەویســت ئەدەبی عەرەبیــش فێربیم، چونکە تەماشــام کردبــوو کە قەت نابمە ئەدیبێکــی چاکی عەرەب، ئەدەبی عەرەبی، ئەدەبیاتی عەرەبی بخوێنمەوە، یا نووســینی عەرەبی بخوێنمەوە، مەگەر خەبەرێــک زۆرم ئیحتیــاج پێ بووبێ، خۆمم عەزیەت دابێ، دەنا قەت گۆڤار و شــتی وام نەدەخوێندەوە. عیللەتیشــی ئەوەیە کە بۆ خۆت دەزانی ئەدەبی عەرەبی چەندی زەرەر لە زیانی کوردی داوە. با حەقیقەتێک بڵێم، دیارە ئەو دەمی من نووسینە کوردییەکانی عێراقم زۆر دەخوێندەوە. تا لە کوردستان دەبوون، بەئیستلاحی ئێرە دەبیرستان، یا بەئیستلاحی

وێ سانەوی و شتی واتان دەخوێند، هەموو کوردییەکی خالیس و جوان دەنووسرا. لەگەڵ دەبوونە دوکتۆر، ماشاڵڵا عەرەبیتان فکر دەکردەوە و کوردیتان دەنووسی. وای چ بەدبەختێک بەسەر زبانی کوردیدا هاتبوو... ئەو عەرەبی فکر کردنەوە، هەستام بەو کارە (پێ دەکەنێ)... یەقوومو بیهازە لعەمەل... بەڕاستی زەرەری گەورەی داوە.

• با جارێکی دی بێینەوە سەر مەسەلەی دەربەدەری، یا ئاوارەیی و دوورکەوتنەوە لە وڵات... ئایا پیاو دەتوانێ بڵێ یەکێ لە هۆیە هەرە سەرەکییەکان لە شێعری تۆدا دەربەدەری و ئاوارەبوونە؟!

- نا عەرزت دەکەم ئەوە بۆ زەمانێکی مەحدوودە. شێعری من ئەگەر غەمناکە، هەموو لەبەر لێقەوماوی، چارەڕەشی، بەدبەختی میللەتەکەمە تێیدا مونعەکەس بووە، نە ئی خۆم، وەختێکی من لە تەمەنی بیست و دوو ساڵی دەڵێم:

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن

باوەڕ بکەن کوڕە دەوڵەمەندێکی زۆر تێر و پڕ و پاک و خاوێن بووم، بەڵام میللەتەکەم تووشی ڕەنج و دەرد و حەسرەت بوو... (ئەمن) لێرەدا (هێمن) نییە، (ئەمن) میللەتی کوردە.

• بەڵام ناتەوێ ئەوەش بڵێی کە جوانترین شێعرت ئەوانەن غەریبی پێی گوتووی!!

بـا... نە ئەوە لەبەر وەش بووە کاکە، لەبەر وەی بووە من تەجروبەی شێعرم زۆرتر ڕۆیوەتە پێشێ... هەر غەریبی نەبووە، من تەجروبەی شێعریشم زیاتر بووە... ئەزموونی شێعرم هەتا تەمەن بەرەو ژوورتر چووە، بەرەو پێشتر چووە.

• ئەی کەواتە سەرچاوەی شێعر، لای تۆ، جگە لەوەی وتمان، کە ڕەنگە دەربەدەری جوانترین شێعری پێ گوتبی، چی دیکەیە؟!

- وەڵڵاهی... جوانیش زۆری تەئسیر لە من کردووە، جوانی دیارە بەهەموو مەعنای کەلیمەوە. بەڵام جوانترین شتیش لە نەزەر مندا ژن بووە، یان ئینسان بووە، کە دیارە جینسی موخالیفە، لە هیچ شێعرێکی مندا، تۆ پێم وایە، بۆنێکی وا نەکەی کە من تەمایولێکی غەیرە ئینسانیم تێدا بووبێ... بەڵێ... بەڵێ... تۆ هەر ناڵەی جودایی دەبینی لە شێعرە غەریبییەکانی مندا، ئەدی... شێعری وام هەیە کە ناڵەی جوداییش نییە، بەڵام بۆنی غەریبی لێ دێ، کە دەڵێم: یادم بکەن، زۆر سەیرە... بەڕاستی ئەو شێعرەی من کەم

کەوتۆوەتە بەر لێکۆڵینەوە و ئینتقاد. من پێم وایە لەو شێعرەیدا زۆر شتی نوێم هێناوەتە گۆڕێ. کە لە پێش مندا هیچ شاعیرێکی کورد لائەقل نەیکوتبێ. من دەڵێم:

لــەو دەمـــەیــدا گــڕ دەگـــرێ مـــەیل و تـــاســـە
لەو دەمـــەیدا تێــک هــەڵــدەنگـــوون هـــەناســـە

پێم وایە «تێک هەڵدەنگوون هەناســـە» ڕەنگبێ ئەو تەعبیرە زۆر کەم بێ لە شێعری شاعیرانێ کە من بیانناسم. ئەوەش هەر نەوعێک لە دەردە غوربەتەکەم... بەڵێ... جوانی لە هەموو شـــتێکی دی... جوانیش یەکێک بووە لەو شـــتانە کە منی هان داوە بۆ شـــێعر گوتن... جوانی تەبیعەت... دیارە پتر لە جوانی تەبیعەت، جوانی ئینســـان... ئینســـانی جینسی موخالیف.

• تۆ بڵێی لێرە باسی تەعبیرت کرد... لەو دەمەیدا تێک هەڵدەنگوون هەناسە...

ـ بەڵێ...

• ئەمـــە ئەگـــەر بەراوردی بکەی لەگەڵ ئـــەو دەربڕینە ئیحساســـاتیەی کە لە ناڵەی جوداییدا باست کردووە، ئەوەیان زۆر بەئاشکرا پێوە دیارە کە زیاتر شتێکی ئیحساساتییە و ڕەگەزێکی ماددی تێدا بەدی ناکرێ. بەڵام «تێک هەڵدەنگوون هەناســـە» شتێکی زیاتر ماددی نیشان دەدا. ئەمە بەڕەئی تۆ، دوو تەجرەبەی جیاواز نیشان نادا؟!

ـ با... با.. بەڵێ... بەڵێ دوو تەجرەبەی جیاوازە. بەعەقیدەی من لێرە مەحروومییەتێکی دیکە نیشان دەدا، لەوێ مەحروومییەتێکی دی. ئیدی پێم وایە زۆریش شکافتر نەڵێم... (پێ دەکەنێ)... چونکو هەر ماچی کچە سولەیمانیان تێری نەدەکردم بەتەنیا (پێ دەکەنێ)... چونکو باوکانە بوو... وەک عەرزم کردی، ماچیان نەئەدا بەشاعیرە لاوەکان، دەیاندا بەمن، چونکـــو پێیان وابوو بێ ئازارم (پێ دەکەنـــێ). بێ ئازار نەبام بۆ دەیاندا (پێ دەکەنێ)... نازانم تۆ ئەو شێعرەی منت دیوە، کە خەڵک ڕەنگبێ زۆری فکر لێ نەکردبێتەوە:

وەرە ماچـــم دەیـــە ماچـــی خودایـــی
کـــە بێـــزارم لـــە ماچـــی ســـینەمایی

لێرەدا ماچی سینەمایی ئەو ماچانەن کە وەکو بابێک ئەو خەڵکە منیان ماچ دەکرد...

پێم وایە ماچی بابانە بوو (پێ دەکەنێ) کردوومەتە ماچی سینەمایی...

• جگە لە دەربەدەری جگە لە خۆشەویستی نیشتمان، دیارە ئافرەتیش ڕۆڵێکی زۆری لە شێعری تۆدا هەیە... تۆ چۆن سەیری ئافرەت دەکەی... بەلای تۆوە ئافرەت بۆ شاعیر دەبێ چی بێ؟!

- پرسیارێکی زۆر گرانە، ڕەنگە گوێیان لێ بێ (پێ دەکەنێ) بەڵام چ بکەم، دەبێ جوابت بدەمەوە. من پێم وایە ئافرەتێک بەڕاستی بۆ ئینسانێک... یا ژنێک... من کەلیمەی ئافرەتیشم قبووڵ نییە، لە بیرت نەچێ، پێم وانییە لە «خودای جوانی» ڕا هاتبێ، پێم وایە لە (عەورەت)ی

• منیش لەم کاغەزەدا هەردوو وشەکەم نووسیوە...

- بەڵێ... با تۆ خواکەی ئێمە بڕێک لەسەر وەی بڕۆین... کێشەم زۆر لەسەر وەی بوو، دەمکوت ئافرەت «عەورەت»ە کە لە ئەدەبیاتی فارسیدا فەوقولعادە بەکارهاتووە، بەمانای ژن و منداڵ، بەمانای... حەرەم... یەعنی ئەم کەسانەی کە نابێ خەڵک بیانبینێ... کەوتۆتە زمانی کوردییەوە. لە کوردستانی ئێراندا تەنیا ئەو کەسانەی پێیان عەیبە باسی ژنەکانیان بکەن، ئەوان بانگی دەکەن ئافرەت... دەنا ئەگەر ناوی ژنەکەی بوێرێ بڵێ: فاتم، ئایش، نازانم... گوڵێ... چی... ناڵێ ئافرەت، ئیدی بانگی ژنەکەی دەکا.

زۆر سەیرە... ڕۆژێکی دەگەڵ یەکێک لە مامۆستاکان کێشەم بوو. دەیکوت ژن بەمەرحەلەیەک لە ژیانی ئافرەت دەڵێن کە کچێتی نەمێنێ... گوتم یانی ئەگەر کەسێک بچێتە حەمامی ژنانە، حەتمەن دەبێ کچایەتی نەمابێ (پێ دەکەنێ)... یا کابرایەک کە دەڵێ کەوشی ژنانە دەفرۆشم، ئیدی ئەمە هەر دەبێ بەکچی نەفرۆشێ... نا وانییە... ژن کەلیمەیەکی دژی پیاوە. کەوابوو ژن هێندەی کەلیمە ناسکە، هێندەش بۆ خۆی لەلای من ناسکە... بەڵام بەو حاڵەوە بەلای منەوە موحتەڕەمە. یانی ئەوەندە بەلای منەوە موحتەڕەمە کە دەگەڵ ئەو هەموو خۆشەویستییەی من دەگەڵ ژنم هەیە، خۆت لە من باشتر دەزانی، یازدە ساڵ من دەربەدەر بووم، ژنێکی دیکەم نەهێنا، چونکو پێم وابوو ژنێک بۆ ئینسانێک بەسە. دەنا پێت وانەبوو ئەمن لەو کوردستانی عێراقە پیرێژنێکم وەگیر کەوێ...

• ئەگەر بە (سیغە)ش بوایە...

- (پێ دەکەنێ)... ئەگەر بەسیغەش بوویا... بەڵێ...

• ئەوە پاشان دێمەوە سەر ئەو باسە... بەڵام شتێکت باس کرد کە تۆ وا دیارە ئەوەی




خۆتت لەبیر چۆتەوە. ئەو سەرەتا دوور و درێژەی تاریک و ڕوونت نووسیبوو، لەیەک شوێنا باسی خێزانەکەی خۆتت بەناو نەکردبوو... دواییش لەسەر ئەوە ڕەخنەیان لێ گرتی...

- بەڵێ

• ئەوە چی بوو...؟

- عــەرزت دەکەم... من لەو ڕەخنەدا جوابم داوەتەوە، دەڵێم ئەوە پاشــماوەی ژیانی چینایەتی بووە کە تەئسـیری کردووە لەمندا و بەئیسـتلاحی فارسـی، نازانم بەکوردی بڵێـم چی، (ناخودآگاه) من باسـم نەکردووە، دوایە لـە مەقالەیەکی بچووکدا مەعزەرەتم خواستووە...

• دەڵێی «نەچووە بچێ»...

- نەچــووە بچێ... بەڵێ... بەڵێ... ئەوە پاشــماوەی... جـا ئەلعان کە ئەوە لەمندا نەماوە... ئیسـتاکە زەمان وای کردووە پێک گەیشـتووینەوە، دیسـان هەر لە شارێکی غوربەتین ئیدی...

• بەڵێ...

- ئەگەر من جارێکی بمەوێ کۆمەکێکی... وەکو دەزانم ئەتۆ لە ئەورووپایە... ڕەنگبێ... بەماڵە خۆت بکەی... ئەگەر من بمەوێ... ئەو ماڵ دەماڵێ، بڵێم بیدە بەمن برێک گەسک لێ دەم، ئەو پاشــماوەی چینایەتی تێدا ماوە، دەڵێ تۆ چۆن کاری ژنانە دەکەی؟! (پێ دەکەنێ)... دەنا من پاشماوەی چینایەتیم تێدا نەماوە...

• باشــە... ئەگەر وابێ باشــە... بەهەڵسوکەوت لەگەڵ ژندا، بابڵێین بۆ شاعیرێک... پێت وایە لە ڕێگەی دڵدارییەوە پیاو باشتر ژن دەناسێ، یا ژن هەر وەکو خۆی لە تەبیعەتدا هەیە...

- وەڵڵاهی، کاکە، من وەکو کوردێک تووشی ژن بووم. بۆ خۆت دەزانی داب و ڕوسوومی کوردی، دڵدارییەکی... دڵدارییەکەش هەر مەحدوودە، وەکو ئەو دڵدارییەی کە دەزانم ئەتۆ دەڵێی چی... و من بەو شکافتەیە بڵێم... وەڵڵاهی پێم وایە، پیاو تەنیا وەختێک دەتوانێ ژن دەرک کا، کــە ئیزدیواجی کردبێ، یانی ژنــی هەبێ، ئەو دەمی دەتوانێ دەرکی کا... پێم وا نییە لە دڵداریدا پیاو بتوانێ ئەو تەجروبەی بێتە دەستی وەکو ژندارێک هەیەتی... عیشــقێک، ئەوینێک یا عیشــقێک پایەدارە کە ئەخلاقیشی لەگەڵ بێ. گوایە... ئەگەر تۆ سەیری دیوانەکانی من بکەی، من لە ساڵی ۱۳۲۵ ی هەتاویدا ژنم هێناوە...

ئەگەر تاریخەکان بەهی زایینی بڵێی... کە دەکەنە تەقریبەن چل و شــەش، ۱۹۴۶ من

ژنم هێناوە. ئەگەر تەماشای تاریخی شێعرەکانم بکەی، شێعرە دڵدارییەکانی من هەموو پاش ژن هێنان گوتراون، ئەوانی کە تام و بۆنییەکیان هەیە.

• کەواتە بۆ کێت وتوون...؟!

- کە وابوو زۆری شایی بەخۆ دەبێ، قسەکانمان توندە (پێ دەکەنێ)... کە وابوو پێم وا نییە بۆ شتێکی دیکەم گوتبێ...

• هەندێ بیروڕای جیاواز لە بارەی پێوەندی ژن و پیاوەوە هەیە، سێکس بەردەوامی دڵدارییە، لووتکەی دڵدارییە یا دڵدارییە، یا دڵداری لەگەڵ سێکسدا دەمرێ... تۆ چۆنی دەبینی؟!

- من پێم وایە دڵداری لەگەڵ سێکسدا پەروەردە دەبێ و دەڕواتە لای سەروو...

• یانی بەلای تۆوە لووتکەیە؟!

- بەلای منەوە، بەڵێ، لووتکەیە... من زۆرم بڕوا بە عیشقی ئەفلاتوونی نییە.

• ئەم جارە لەو گشتییەوە دێمەوە سەر تۆزێ تایبەتیتر، دەربارەی تەجرووبەی خۆت. دایکی سەلاح، با بڵێین خێزانەکەت بۆ تۆ چی دەگەیەنێ؟! ئەمن ناویم لەبیر نییە...

- نێوی ئایشە... بەڵێ...

• بەڵێ...

- وەڵڵاهی لە هەموو کەس خۆشەویستترمە لە ژیاندا، بێ ئەولا و ئەولای، با گوێشی لێ نەبێ...

• بۆ ئەمەیان گوێی لێ نەبێ ها...؟!

- بەڵێ گوێی لێ نەبێ، زۆر غـووروور دەیگرێ (پێ دەکەنێ)... با غووروور نەیگرێ... بەڵام بەلای منەوە لە هەموو کەس بۆ من خۆشەویستتر بووە لە ژینمدا... و ئەلعانیش تەحەککومێکی کە گاڵتەم بەگیانی خۆم کردووە لە تەواوی ژیانمدا، دەگەڵ زۆر ملهوڕی گەورەدا موبارەزەم کردووە، خەباتم کردووە، لە موقابیلی ویدا، ئەلعان، زۆر بێ دەسەڵاتم. لە حاڵی حازردا زۆر بێ دەسەڵاتم... بەڕاستی دەبێ لەسەرم بکەنەوە (پێ دەکەنێ).

• ڕەنگە هەر تۆ وانەبی... تەجروبەی تۆ... نازانم ئێوە چەند ساڵ بوو یەکتان نەدیبوو؟!

- ئێمە... پتر لە دە ساڵ و نیو...

• بەڵێ...

- دەڵێن کە نازم حیکمەت... نازم حیکمەتیش تەجروبەیەکی وای هەیە...

• بەڵێ... دوای، وابزانم، یانزدە یا دوانزدە ساڵ کە مونەووەری بینییەوە... ژنەکەی...

- بەڵێ...

• هەمووی هــەر چوار مانگ لەلای مایەوە... ناردییەوە... ئیدی نەشــیدییەوە... تۆ چۆن بووی؟!

- وەڵڵاهی... من پێم خۆش نییە تازە لێک جوێ بینەوە... تا ئەوەی پێی دەڵێن مەرگە و هادیمولـــەزات (هادم اللذات) لە یەکمان جوێ نەکاتــەوە، پێم خۆش نییە، لێی جوێ ببمەوە، ڕاســتییەکەی ئەوەیە. بەڵام بەڕاســتی وەکو من، پاش گەڕانەوەشم ئیتر شێعری دڵداریم نەگوتووە و هەر مانایشی نەماوە بۆ من و ڕەنگبێ بڕانی کەلیماتە. یانی، بەڕاستی کەلیمەم بۆ جوانی لەدەست چوو. ئیدی هیچم نەماوە پێی بڵێم. ڕەنگە ئەوەش مەسەلێک بێ، کە ئیتر من چ بڵێم... من کەلیمەی کلاســیکم لەبارەی شــێعری کوردیدا پێ غەڵەتە، بەڵام لە شێعری ئەو ڕۆژەدا ئەوەی من لە بارەی ژندا دەڵێم:

بەڕیشــی بــۆزەوە ســوجدەی دەبــەم مــن بــۆ جەمالــی تۆ
ئــەدی بۆچــی دەیانگــوت دار کــە پیــر بــوو تــازە دانایە

تازە ئیدی تەماشــا دەکەم شــتی وا لەتیفم نایەتەوە خەیاڵ و لەبەر وەی دەســتم لێ هەڵگرتووە... بەهەزار زەحمەت توانیومە لەو بەینانەدا شــێعرێک لەسەر حیجابی ئیسلامی بڵێم کە پێم وایە شێعرێکی خراپ نەبێ، ئەمما لەبەرم نییە ئەلعان بۆت بخوێنمەوە.

• ئەمە پیاو بۆ پرســیارێکی تر ڕادەکێشــێ... بەڵام مەبەســتم تۆ خۆت، وەکو مام هێمن، نییە. بەڵکو شــاعیر بەگشــتی، ژن هێنان بەلای تۆوە چۆنە، یەعنی شاعیر دەبێ ژن بهێنێ؟!

- وەڵڵاهی، کاکە، ئاخر وەکو عەرزم کردی، من پێم وایە هێندێ کەس، دەگەڕێمەوە بۆ پرسیارەکەی تۆ، هێندێ کەس پێی وایە ئەگەر ژنی هێنا دادەمرکێ و هێندێ کەس... من بۆ خۆم ئەگەر ژنم هێنا بوومە شاعیر، بەڵام نازانم خەڵکی دیکە چۆنە؟

• تۆ پێت وانییە مامۆستا گۆران پاش وەی دایکی ڕووناکی بوو (دەبێ مەبەستی دایکی هێرۆ بێ، نەک دایکی ڕووناک ف.ش) ئیدی شێعری دەربارەی جوانیدا کەم کوتووە؟!

- جوانترین شــێعرەکانی ئەوانەن کە لــە بەینی ژن هێنانەکانی و دوای ژن هێنانەکانی گوتوونی...




گوتوویەتی...

بەڵێ...

● نازانم، چونکو تاریخیان نییە... بەداخەوە شـیعری مامۆستا گۆران عەیبێکیان هەیە کە پیاو نازانێ... بیسـتوومە ژنە عەرەبەکەی زۆر جـوان بووە، من کە نەمدیوە. پێت وا نییە دامرکابێ پاش وەی ژنە عەرەبەکەی بووە؟!

- وەڵڵاهی، وەک تۆیش باسـت کرد، نازانم، یانی لەبەرئەوەی تاریخەکەی پێوە نییە، پیاو نازانێ...

● بەڵێ... بەڵام من شـاعیرێک دەناسـم، ئەلعان دەتوانم لێرە باسی بکەم، ئەمما پێم خۆش نییە لە زمان منەوە، ئەوە بکوترێ بۆ خۆت قسـەی لەگەڵ دەکەی. ئەمن پێم وایە مامۆسـتا هەژار لەگەڵ ژنی هێنا ئیتر شـیعری جوانی نەگوت. لەگەڵ ژنی دووەمی هێنا شێعری عاشقانەی جوانی نییە... بەڵێ، لەبەرەو موکریاندا، کە دووربۆتەوە، بۆ ماوەیەکی لە برازنم دووربۆتەوە، بڕێک شێعری عاشقانەی جوانی تێدا هەیە، کە ئەویش بۆ ماوەیەکی موختەسـەر بووە. یا لە بابا هەژاری موکریاندا بڕێک عاشـقانە شێعر دەڵێ، بەڵام تۆ پێت وا نییە زۆریان تەقلیدین؟!

- وایە... ڕاستە...

●بەڵێ...؟!

- ڕاستە وایە

بەڵێ... و من لەبیرمە کە هەژارێکی زۆر منداڵ پێش وەی ڕەنگبێ ئەو شـێعرانەی لە ئاڵەکۆکدا بڵاوبووبنەوە، پێش وەی ژن بێنێ دەیتوانی شێعری عاشقانە بڵێ...

چـاوت کە گۆشـەدارە وەکو ڕۆژی نیشـتمان
پەیـدا دەکا هـەرایـەکی لـەو کـوردەوارییە

ئەو شـێعرەی زەمانی زۆر منداڵی مام هەژارییە، زۆریش جوانە. ئەوە مەربووتە بەئەو ڕۆژەی کە لە پشـتی گۆڤاری نیشـتماندا چاپ دەکرا، تەماشـا دەکەی ئەو شێعرەی زۆر جوانە...

● وایە...

- بەڵێ...

• ئەم دوو سێ پرسیارەی دوای هەستێکی وا بەپیاو دەدات، وەکو بڵێی شاعیر، کۆمەڵێ قانوون هەیە کە دەیگرێتەوە، یا کۆمەڵێ چوارچێوە هەیە کە تەنیا بۆ شاعیرە و ڕەنگە بۆ خەڵکی تر نەبێ. من بەش بەحاڵی خۆم ئەوەندە باوەڕم بەوە نییە قانوونی تایبەتی هەبێ بۆ شاعیر، کە خەڵکی دیکە نەگرێتەوە.

- بەڵێ...

• بەڵام، بەهەرحاڵ، دیسان یەک دوو پرسیاری لەو بابەتەت لێ دەکەم. بەلای تۆوە پێوەندی نێوان شاعیر و ئازادی چییە و... چۆنە؟ ڕەنگە وا ڕاستتر بێ بڵێین نووسەر و ئازادی، چونکە مەسەلە تەنیا شاعیر نییە... (ئەگەر ئەم پرسیارەم ئەمڕۆ بکردایە دەمگوت هونەرمەند و ئازادی - ف.ش).

- بەعەقیدەی من... بەڵێ... ئەفسووس... لەوەتی من قەڵەمم بەدەستەوەیە قەتم هەست بەئازادییەک نەکردووە کە قەڵەمی خۆم بەکەیفی خۆم بەردەم... پێم وایە قەید و قیوودێک هەمیشە هەیە کە شاعیر یا نووسەر ناتوانێ ئەو ئازادییەی حیسسی دەکا...

هەرچی دەکەم ئەو خەیاڵەی پێی مەستم (لەڕاستیدا - هەرچەند - ف.ش) بۆی بێتە سەر کاغەز. سەیرە... ئێوە پێتان وایە شاعیرەکانی غەربی یا ئەورووپایی، نووسەرەکانی غەربیش توانیویانە بەو هەموو ئازادییەی، بەرەڵڵایی، یا... نازانم چی شێعر بنووسن؟ ڕەنگبێ هەموو کەس پێی وابێ ئیعترافاتی ڕۆسۆ زۆر سەریحە.

بەڵام تۆ فکر دەکەیەوە ڕۆسۆ شتی شاردۆتەوە یا نە؟! من پێم وایە زۆر شتی شاردۆتەوە... لە هەموو کەس سەریحتری نووسیوە، بەڵام ئایا شاعیرێک ئینسان نییە؟! ئینسانێک جارێک، بڵێی ڕۆسۆ، دەعومری خۆیدا جارێکی زگەشۆرەی نەگرتبێ... تۆ تەواوی ئیعترافاتەکەی بخوێنەوە، قەت باسی وەی تێدا هەیە...؟! (پێ دەکەنێ)...

- جوانە...

- کەوابوو، کاکە بەڕاستی قەت ئەو ئازادییەی کە ئیدەئالە بۆ شاعیر و نووسەر... بەتایبەتی شەرقی، ئیدی بۆ خۆت دەزانی شەرق ئەوپەڕی... بەعەقیدەی من، ئەو ئازادییە، هەڵنەکەوتووە. جا ئەو جار بۆ من پترە، چونکو من...

- بەڵێ... لەپێش هەموو شتێکدا چونکو کوردم... ئەو جارەکانە ماوەیەکی دوور و درێژ، خۆت دەزانی... ئەوەشت با پێ بڵێم، ئەگەر نەکەوتبامە عێراق و، چاپەمەنییەکانی عێراق شێعرەکانیان بۆ چاپ نەکردبام و هەر دە مەتبووعاتی حیزبدا چاپ کرابایە. زۆر لە شێعرکانم دەفەوتان. من ناڵەی جودابیم دەدا بەئۆرگانی حیزبەکەمان، دەیگوت بەمن چ

مەربووتە تۆ مەشــرووب دەخۆیەوە یا نە... (هەموو پێ دەکەنن)... و ڕەنگبێ لە ناڵەی جودایی چاتر من شــێعرێکم هەیە بە ناوی (ســووڕی دەوران)، بەڕاستی هەر لە ناڵەی... ناڵەی جوداییدایە...

تێیدایە...

- بەڵێ...

ـ من لەوێدا پێشــبینی ڕووخانی شـام کردووە... دوو سێ ساڵ پێش ڕووخان... پێم وابوو...

بــە ئــەفسانەی دەزانــن ســـووڕی دەوران
غـــولام و ورتکـــەخۆری دەرکـــی گـــەوران
بـــەلام ڕۆژێـــک دەبـــێ دەوران بـــدا ســـوور
لەبـــەر گـــەوران نەبـــێ پشـــتی خەڵـــک کـــوور

- ببوورە... پێش ئەوەی بچمە سەر پرسیارەکەی تر...

ـ بەڵێ... من لەوەیدا زۆر...

- بۆچی پێت وایە ئەمە پێشبینییە؟! خۆ هەر زۆر کەس وای وتووە و واش دەڵێ کە زۆرداری نامێنێ، هەر دەبێ بڕووخێ و... یانی بووە بەقسەیەکی کە هەموو کەس دەیڵێ... (هەموو پێ دەکەنن)...

ـ وەڵــڵا... ئەلعان ئەوەیە، ئیــدی... من حەیاتم داوەتێ، خەڵکی دیکە... ئی خەڵکی دیکە با بردوویەتی... (پێ دەکەنێ)... بەڵێ، ڕاستە... ئەوە مەسەلەیەکی دیکەیە، بەلام من دەمزانی کە زۆردار هەر دەڕووخێ... بەڕاســتی هێندە نیزیکیشم پێشبینی نەکردبوو... ئەم ڕۆژانە برایەکی عێراقم دی، گوتی ئەتۆ وەسیەتنامەیەکت لەکن خوشکەکەی من هەیە، کە وەســیەتت کردووە، نووســیوتە کە ئەگەر مردم چی لێ بکەن. یانی من پێم وابوو لە کوردســتانی عێراق دەمردم و تازە کوردســتانی ئێران نابینمــەوە... یانی ڕووخانی ئەو زۆردارەی بڕێک دوورتر بوو... پێم وابوو دوورترە... بەڕاســتی ئینقلابی ئێرانی وەکو من دەخەیاڵی خۆمدا پێشبینیم کردبوو، پێم وانەبوو وا هاسان و وا زوو ئیمپریالیزمی پاشەکشە دەکا... ئەگەرچی ئێستاش نەیکردووە، بۆ خۆت دەزانی... ئەوەی زوڵم و زۆرە هەر دەیکا، بەلام نیوە بەزیوێکی، بەڵکە بەزیوە ئیدی...

• دیسان یەکێ لەو شتانەی کە زۆر باسی لێوە دەکرێ، شاعیر و سیاسەت، یا نووسەر و سیاسەت. تۆ پەیوەندی ئەو دووانە چۆن دەبینی؟! سیاسەت شێعر ناکوژێ؟

- وەڵا بەعەقیدەی من، زۆر زەرەر دەدا لە شاعیر، زەرەری زۆر گەورەش دەدا، موقەییەدی دەکا، بەڵام بۆ کوردێک چ بکا؟!پێی وایە ئەوەش ئەرکێکە لەسەر شانی کە دەبێ بۆ ڕزگاری خۆی هەوڵ بدا... ئەمن لە وڵاتێکدا کە ژیانێکی نەتەوایەتی سەربەخۆم هەبا، پێم وایە قەت نەدەچوومە ناو سیاسەتەوە. یانی من پێم وانییە ئەدەب لە سیاسەت دووربێ... ئەوە شتێکی سەیرە... کە هەر کەس دەتوانێ نەوعێک لە ئەدەب بۆ خۆی هەڵبژێرێ... و ئەدەب، هەموو ئەدەبێک، کەم و زۆر لە خزمەتی سیاسەتدا هەر هەیە، بەڵام خۆبەستنەوە بەحیزبێک زۆر زەرەر لە شێعر دەدا. تۆ ڕەنگ بێ هەموو ژمارەکانی ڕۆژنامەی کوردستانت، کە لە عێراق دەردەچوو و ئێمە دەرمان دەکرد، هەمووت...

• بینیومە... بەڵێ...

- بینیوتە و لەوێ کەم شێعری من دە ڕۆژنامەدا چاپ کراوە. ئەو شێعرانەی بێ ئیمزان زۆریان هی منن ئیدی. ئەو دەمەی من حەقم نەبوو هێمنیان لەبن بنووسم. ئەگەر ڕۆژگارێکی «تاریک و ڕوون» بڵاو نەبووباوە تۆ نەتدەزانی «گەرمەشین» هی کام شاعیرە، یا «کاروانی خەبات» هی کام شاعیرە، جا وەرە بەدوایدا بگەڕێ. دەبێ کێ بێ «کاروانی خەبات»ی گوتبێ، دەبێ کێ بێ «ئارەق و تین»ی گوتبێ... مەسەلەن شێعرێکی کە من بۆ تەرمی حاجی قادری کۆییم گوتبوو، ڕۆژنامەکەی خۆمان حازر نەبوو چاپی بکا ئیدی. دەیگوت تۆ تازە ئاشکرابووی و شاعیری ئەو شێعرەی، ئێمە دەمانەوێ شاعیری ئەو شێعرە ئاشکرا نەبێ. تەنیا شێعرێ کە من بەتەواوی، وەکو خاتیرەیەکی، لەززەتم لە شێعری خۆم بردووە، چونکو تەئسیری ئانی کردۆتە سەر خەڵک، ئەو شێعرە بوو کە من بۆ تەرمی حاجی قادری گوتوومە، بۆ کۆتەڵی حاجی قادر گوتم. لەو کۆبوونەوەی کۆیەدا، کاکە، تەئسیری ئانیی هەبوو لەسەر خەڵکەکەی کە لەوێ بوو. زۆرم ئەودەمی خۆ خۆشەویست کە دەتوانم شێعرێکی وا بڵێم...

بەڵام شاعیری کورد، وەک گۆران دەیگوت:

لەپێش هەموو شتێکا چونکو کوردم
چۆلەکەی ناو هەزاران داوی وردم

● هەرچۆنێ بێ، خۆ دەبێ کوردایەتی بکا...

- بەڵێ...

● کوردایەتی لە پارتایەتی جیا دەکەیتەوە؟!

- نەخێر... ئەوەیە عەرزت دەکەم... بەڵام پارتێک کە لە خزمەتی کوردابێ. وەختێکی من پارتێکم دیت کە لە خزمەتی کوردا نەبێ، ئیدی بۆ دەبێ جاش بم کە من دەخزمەتی ئەو پارتییەدا نەبم؟! من دەتوانم لە ڕێگایەکی دیکەدا خزمەتی ئەو کوردە بکەم. بەداخەوە سەرکردەکانی مە زۆر بێ ئینسافن، پێیان وایە هەر کەس دەگەڵ وان نەبێ دوژمنی وانە...

● بەڵام ئەگەر مەسەلەکە لەو چوارچێوەیە ببەینە دەرەوە کە مەبەست هەر تۆ یا شێعری کوردبێ، با هەر باسی شاعیر بەگشتی بکەین... ئایا شاعیر پێویستی بەوە هەیە لە ژیانیدا فەلسەفەیەکی هەبێ؟ خۆی بەفەلسەفەیەکەوە ببەستێتەوە؟!

- نەوەڵڵا... من زۆرم فەلسەفە لە شێعردا..خۆش ناوێ. من پێم وایە شێعر هەر ئەوەیە کە ئیحساساتی ئەو ئینسانەی بێ کە خۆی پێ شاعیرە... بەڵام وا دەبێ هێندێک هەن شاعیری باش کە فەلسەفە بەئەندازەیەکی باش دێننە بەرهەم. عەرزت دەکەم مولاحەزە بفەرموو فەلسەفە ناسکی شێعر دەکوژێ. حاجی قادری کۆیی ئەو شاعیرە مەزنەی ئێمە ئیتر ویستوویەتی فەلسەفەی کوردایەتی، ڕزگاری کورد، بخاتە چوارچێوەی، چونکو وەسیلەیەکی دیکەی نەبووە ئەو بیروڕای خۆی بەکورد بگەینێ، ئیللا شێعر نەبێ، یەعنی نەزم نەبێ... لەبیرت نەچێ... من شێعر و نەزمیش فەرق دەکەم... حاجی قادر ئەگەر تەماشا دەکەی... تەماشای شێعرە غەرامییەکانی دەکەی شاعیرێکی تەواو بووە... بەڵام وەختێکی تەماشای شێعرە سیاسییەکانی دەکەی ئیدی گوێی نەداوەتە جوانی شێعر، هەر ویستوویەتی ئەو پەیغامەی پێیەتی، ئەو ڕیسالەتەی پێیەتی بەخەڵکی ڕابگەیەنێ. تەنیا کەسێکی کە من پێم وایە فەلسەفەشی هەبووە و شێعریش... حافزی شیرازییە، بەعەقیدەی من لە عەینی حاڵدا شێعرەکانی یەکجار زۆر جوان و پڕ مەعنان، شێعریشن، فەلسەفەیەکی زۆر گەورەش لە شێعرەکانیدا هەیە. نوێخوازییەکی زۆر گەورە لە شێعرەکانیدا هەیە کە ئێستاش بۆ من نوێن. مولاحەزە بفەرموو پاش نیزیک بەحەوتسەد ساڵ شێعرەکانی نوێن، ئەوڕۆکانەش نوێن... کەچی (مەسنەوی) کە بەلای ئێمەوە زۆر کتێبێکی گەورەی فەلسەفی یا عیرفانییە، هەریەک شاعیر کوتوویەتی... دیوانی شەمس و مەسنەویش هەر شاعیرێک کوتوویەتی. لە دیوانی شەمسدا لەبارەی قالب و کەلیمات و ئەوەدا زۆر گەورەترە، بەڵام لە

مەســـەویدا فەلسەفەکەی گەورەترە... نازانم... لێرەش دەبێتە دوو ئینسان لە جێگایەکی توانیویەتـــی قالبی جوان، کەلیماتـــی جوان، فکری جوان لە شـــێعری خۆیدا بگونجێنێ. دەمەســـەویدا زۆری گوێ نەداوەتە قافیە و وەزن و کەلیماتی جوان، هەر ویســـتوویەتی فەلسەفەکەی نیشان بدا، عیرفانەکەی نیشان بدا...

● باشـــە ئەم ئیمتیازە بۆ تەنها دەدەیت بەحافز خۆ شاعیرە سۆفییەکان، بەگشتی یا بڵێین ئەدەبی ســـۆفی، ئەگەر هەمووشی نەبێ، ئەوا بەشـــێکی زۆری، شتی زۆر جوانیان وتووە، ئەوجا ســـۆفیگەری نەک هەر لای ئیســـلام بەڵکە ئەوەی بەزمانانی ئەورووپایی پێی دەڵێن mysticism دەورێکی گەورەی لە ئەدەبدا بینیوە...

- جا ئەوە ســـەیرە کە منیش بەخیلافی، بەپێچەوانەی هەموو کەس حافزم پێ سۆفی نییە.

● من مەبەستم بەستنەوەی فەلسەفەیە بەشێعرەوە...

- بەڵێ...

● خۆ سۆفیزمیش...

بەڵـــێ بۆ خۆی فەلســـەفەیەکە. جـــا ئەو جار بێتە ســـەر ئەوە. ئەگەر بێیتە ســـەر سۆفیزمیش... هەن، شـــاعیری وا کە بەڕاستی سۆفیزمیان لە شێعردا زۆر جوان کوتووە، وەکو مەحوی خۆمان... یا مەولەوی خۆمان، ســـەید عەبدولڕەحیمی مەولەوی بەڕاســـتی توانیویەتی؛ سۆفیزمی بەشتێکی مومتاز دەزانم، دەنا دیوانی شاعیرەکانی دیکەی فارسیش هی وای زۆر تێدایە... سەنایی باس دەکەی، عێراقی باس دەکەی، بەڕاستی ئەوانەش زۆریان هەن، شاعیری زۆر بەرز، سۆفیزمیان زۆر چاک هێناوەتە ناو چوارچێوەی شێعرەوە... بەڵام حافیز من پێم وایە زۆر بەرزترە لە سۆفیزمیش، پێم وایە عارفێکی زۆر گەورەیە کە دەڵێ:

بیـــا تـــا گل برافشـــانیم و مـــی درســـاغر اندازیـــم
فلـــک را ســـقف بشـــکافیم و طـــرح نـــو در اندازیـــم
اگـــر غـــم لشـــکر انگیـــزد کـــه خـــون عاشـــقان ریـــزد
مـــن و ســـاقی بهـــم ســـازیم و بنیـــادش براندازیـــم

کوا ئەوە لەگەڵ شێعری سۆفییەکی وەک یەک دەچێ، ئەوە شێعرێکە نازانم لە کوێیە. هەتا مەسەلەن خەڵک پێی وایە... خەییام زۆر مەشهوورە، کەچی، من سەیرە کە هیچ...

پێم وایە خەییام نە فەلسەفەی هەبووە و نە هیچ... پێم وایە شک و دوودڵی و تەردیدێک لە شێعرەکانیدا گونجاوە، کە بۆ خۆشی ئینسانێکی شەککاکە، کە نازانێ... من فەلسەفەی خەییامم هیچ بەلاوە فەلسەفەیەکی عەجایب و غەرایب نییە. ئیدی ئەوە عەقیدەی شەخسی خۆمە. خەڵکی دیکە نازانم تۆ چ بەراوردێکی لەوەی دەکەی کە من فەلسـەفەی خەییامم زۆر پێ فەلسەفەیەکی سەیر نییە.

● ئەی جەلالەددینی ڕوومی؟ تۆ لە باشترین شێعرتا کە ناڵەی جودابیە، لە دوو شوێنا پەنات بردۆتە بەر جەلالەددینی ڕوومی... بۆچی؟

- بەڵێ... من پێم وایە عارفێکی یەکجار زۆر گەورەیە...

● لەبەر عارفییەکەی یا لەبەر شێعرەکانی؟

- عەرزت دەکەم... عەرزم کردی لە شەمسـدا... لە دیوانی شەمسـدا شاعیرێکی زۆر گەورەیە... لە مەسنەویدا ئەو شاعیرە نییە، یان ساحیبی ئەو قالبە کە لەوێدا ئیستیفادەی لێ کردووە، مەسـەلەن «خود» و «بەد - بد» کە ئێمـە ئەلعان تەلەفوزی دەکەین، زۆر جـاری کردۆتە قافیە، کە ئەودەمی زۆر عەیب بووە، بەڵام گوێی نەداوەتە قافیە... ئەگەر تەنیا موقەدیمەکەی کە من... منیش هەر زۆر لە موقەدیمەکەی موتەئسـیرم: بشنو از نی چون حکایت می کند.

کاکـە، ئیدی ئەوە... ئەلعانیش ئەمن هەر تێیدا حەبسـم... لە موقەدیمەی بەولاوەتر ناچم... پێم وایە موعجیزەیە، شـێعر نییە... لە موعجیزەش گەورەترە... بەڵام لە دیوانی شەمسدا کە دەڵێ... تەماشای ئەو شتە جوان و تازەی، کە ئەلعانیش هەر تازەیە:

دی شـیخ بـا چـراغ همـی گشـت گـرد شـهر
کـز دیـو و دد ملولـوم و انسـانم آرزوسـت

لەو دەمێوە لە ئینسان دەگەڕێ، ئێمە ئەلعانیش لە قەڕنی بیستەمدا... ئاخر و ئۆخری قەڕنی بیستەمدا هەر لە ئینسان دەگەڕێین...

● بـەڵام دیۆجین، ئەوەی یۆنانـی، پێش ئەو، دەڵێن بەچـراوە دەگەڕا، دەیگوت لە ئینسان دەگەڕێم...

- بەڵـێ... ئیـدی ئەو... بەڵام ئەو خسـتوویەتە ئەو زوبانە جوانەوە... لە ئینسـان دەگەڕێ... بەڕاستی لە ئینسان دەگەڕێ...

• باشە پێت وانییە ئەم ئیعجابەی تۆ، ئەم خۆشەویستنەی تۆ، بۆجەلالەددین مەسەلە ئەوەیە تۆ زیاتر فارسی دەخوێنیتەوە...

ـ بەڵێ... جا من چ بکەم... غەیری فارسی و کوردی چ دیکە نازانم... زبانی دیکە نازانم غەیری فارسی و کوردی و... کوردییەکانیشمان... بەخوای... کاکە... مامۆستای وا هەیە دەڵێ... مێژووی ئەدەبی شەش هەزار شاعیرم کۆ کردۆتەوە، بەڵام ئەمن هەرچەند دەیانبژێرم هەر قامکەکانم بەسن بۆ شاعیرە گەورەکانمان... بۆ شاعیرە گەورەکانی پێشوومان و لەنێو لاوەکاندا دەبینم هەن و ئەمما ئیدی وێستا کاڵ و وێستا مەجالیان نییە شێعر بڵێن و... چووزانم، هەزار دەرد و گرفتاری کە بۆ خۆت دەزانی بۆ شاعیری کورد هەیە. بەڵام شاعیرە گەورەکانی مە... مامۆستا عەلائەددین سەجادی، هێندەی گڵ لەسەر وییە، هێندە عومری لاوەکانمان بن کە دەیانەوێ مێژووی ئەدەبی کوردی ئینشائەڵڵا بنووسن... ئەو کتێبە زەلامە، پێم وایە دوازدە شاعیرە باسیان دەکا، کە هیچیشیانی نەتوانیوە بەخەڵک بناسێنێ ئەوەیە کە... کاکە چ بکەین... لەبەر وەی ڕوو دەکەمە ئەدەبی فارسی، بڵێم چی، ئەدەبی فارسی ئەدەبێکی دەوڵەمەندە.

• تۆ باسی حافز و مەولانات زیاتر کرد، ئەدەبی فارسی هیچی تری تیا نییە؟!

ـ هاهـ... شاعیری زۆر گەورەی تریش هەیە... مەسەلەن گەنجەوی، کە کەسیش نازانێ میللەتی چییە.

• دەڵێن کوردە...

کورد دەڵێ کوردە، چونکو دایکی:

گــر مــادر مــن رئیســهء کــرد

مــادر صفتانــه پیــش مــن مــرد

ئەوە گومان لەوەیدا نییە دایکی کوردە. ترکیش دەڵێن ترکە، چونکو قەبری لە گەنجەیە و ژنێکیشی هەبووە بەنێوی «ئافاق» ترک بووە. بەڵام من عەقیدەم وایە نە لاوانەوەی رەئیسە خانمی دایکی کردوویەتییە کاژیک (پێ دەکەنێ)، نە ئافاق خانم کردوویەتییە پانتورکیست، نە... پیاو نازانێ بابیشی کێیە و بەڕاستی... بۆ خۆی... ناوی دەبا، بەڵام میللییەتەکەی ناڵێ بۆ خۆشی بەمیللییەتی نەنازیوە، وەک فیردۆسی دەڵێ:

بسی رنج بردم در این سال سی
عجم زنده کردم بدین فارسی

بەعەقیدەی من ئەو عەجەمی زیندوو کردۆتەوە بەپێنج گەنجەکەی، بەڵام نەیگوتووە زیندووشم کردۆتەوە... بەزمانی فارسی چاک دەردەبڕێ. ڕەنگبێ تورکیشی زانیبێ، تۆ پێت وایە پیاو دایکی کوردبێ و کوردی نەزانێ، بەعەقیدەی من زانیویەتی...

- دەبێ زمانی دایکیشی زانیبێ...

- ژنیشی کورد (بێگومان مەبەستی مامۆستا هێمن تورکە، نەک کورد. ف.ش) بێ، ئیدی چۆن، چۆن نازێ ئەو خانمەی هێندەی خۆشویستووە... پێم وانییە بەڵاڵی ئەویش ڕازی بکات... بەزیانی بەینەلمیلەلی (بین المللی) ئەوە کوا جێبەجێ دەبێ (پێ دەکەنێ)... بەڵام «فارسی» پێی وا بووە موناسیبترە بۆ شێعرەکەی، بۆ ئیحساساتەکەی. و لە هیچ کوێ ناڵێ من بۆیەم ئەو شێعرە بەفارسی گوت پێم وایە فارسی چاترە لە تورکی یا لە کوردی. بەڵام تەواوی ئاسارەکەی، حەتتا بۆ نموونەش ئێمە نابینین ئەم کابرایە میسرەعێکی کوردی کوتبێ، وەکو هێندێک بۆ خۆت دەزانی، شاعیرەکانیمە، هی قەرنی، نۆزدەمان، بۆوەی کە بڵێ فارسی دەزانین، ئەقەللەن... باوەڕ بفەرموو وەختێکی دیوانی مەحوی بڵاوبۆوە من زانیم مامۆستا گۆران فارسی باش نەزانیوە، چونکو کاکەی فەللاح بۆی گێڕامەوە کوتی: مامۆستا دەڵێ ئێوە شێعرەکانی مەحوی مەعنا نازانن، هونەری مەحوی لە فارسی گوتنەکەیدایە، وە حاڵێکی من دەزانم، فارسییەکانی بەداخەوە هەر کاوێژی کوردییەکانێتی (پێ دەکەنێ)... وە لە کوردییەکەیدا زۆر چاکی پتر دەربڕیوە، کەوابوو...

- ئەی مەولانا فارس بوو، تورک بوو، چ بوو، بەلای تۆوە؟!

- وەڵڵاهی، کاکە، ئەویش... بڕوا... نازانم... لە بەڵخەوە هاتووە، بەڵخیش ئەو دەمی... فارسی زوبانێکی... ڕەواجی هەبووە، نووسین بەفارسی بووە، تۆ بۆ خۆت، کاکە فەرهاد، پێت وایە تاران بەقەد سولەیمانی تۆ فەرەیدوون و ئیرەج و نازانم گەرشاسب و... ئەوی تێدان... ئەسفەندیار و... وەڵڵاهی ڕەنگبێ، تاران بەقەد سولەیمانی سی ساڵ لەوەی پێش ئەسفەندیاری تێدا نییە... ئەدەبی فارسی ڕۆییوە کاکە... ئەدەبی فارسی ڕۆییوە، وای لێ کردوون کە پادشایەکانی عوسمانی، کە بۆ خۆت دەزانی خەلیفەکانی

عوسمانی ویستوویانە، هەمیشە شەڕیان بووە لەگەڵ فارس، کەچی بەفارسییان شێعر گوتووە بۆ خۆیان. من زۆر بەزەحمەت، لە بولغاریا بووم، فێری ئەو خەتە عەجایب و غەرایبەی بووم کە ئەوان پێیان دەنووسی، بۆ ئەوەی تابلۆیەکی بخوێنمەوە. ڕۆژێکی بەبەر دەرکێکدا ڕۆیشتم، تەماشام کرد لێی نووسراوە «مەیخانە» ئەوپەڕی تەعەجوبم کرد، گوتم کاکە مەیخانە چ دەکا لە بولغارستانێ؟! تەماشا دەکەم لێرەڕا ڕۆییوە، چۆتە تورکیە و لە تورکیەڕا، لەگەڵ تورکان چۆوەتە بۆ بولغارستان و لەوێ بە «باڕ»ێ کە تەواوی ئەورووپایی دەڵێن باڕ...

● لەوێ بۆتە مەیخانە...

- لەوێ بۆتە مەیخانە... کەوابوو ئەدەبی فارسی ڕۆییوە ئیدی... ئێمەی کورد، سەیرە، دیوانی خانای قوبادیت نازانم بەنەزەر گەییوە یا نا؟ ئێستاش، ئەمن مەم و زینێکی کۆنم، ئەلعان، لێرە لەکن ڕەفیقەکەت هەیە، کە ئەودەمی هەمزە بڵاوی کردۆتەوە، سەر بەحسەکانی هەموو بەفارسی نووسیوە...

● ڕاستە...

- کەوابوو ئێمە پێمان وا نەبووە کوردی... بابی مە پێی وا نەبووە کوردی نەسری پێ دەنووسرێ. هەر پێی وابووە شێعری مومکینە پێ بکوترێ، ئەمما نەسری نابێ پێ بنووسرێ، حاڵێکی ئەمە دەزانین کە بەڕاستی دەتوانین پەخشانی زۆر بەرز بەزمانی کوردی بنووسین. من «شازادە و گەدا»م لە فارسیڕا، دیارە، تەرجەمە کردووە، هی مارک تۆینی. لەبیرمە بەموتەرجیمە فارسییەکەی، کە بەڕاستی جێی فەخری ئێران، وە ناتوانم بڵێم جێی فەخری کوردە، با وجوودی کە کوردە، چونکو خزمەتی بەزمانی فارسی پتر کردووە، بەداخەوە. کوردی وا باش نازانێ ئەگەرچی کوردیش دەزانێ، ئاغای محەمەدی قازی، کە ئەگەر ئیشائەڵڵا ڕێت لە تارانێ کەوتووە بەخزمەتی بگە، بەڕاستی پیاوێکی زۆر گەورەی کوردە... ئەو... نازانم لە چ زەمانێکڕا وەری گێڕاوەتە سەر فارسی، منیش لەسەر فارسییەکەی وێڕا کردوومەتە کوردی. بەداخەوە ئێستاش چاپ نەکراوە. هەر لە عێراقیشم کردبووە کوردی. وە لێرەدا بەحسێکی دیکە دێتە گۆڕێ. من دەعەینی حاڵدا کە ناڵەی جودابیم دەگوت، بۆ ئەوەی کە برێکیش دڵی خۆم خۆش بێ و پێکەنینێک بێتە دڵم، شازادە و گەداشم تەرجەمە دەکرد کە کتێبێکی تەنز و... ڕۆژێکی عەرزم کرد، گوتم مامۆستا من شازادە و گەدام لەسەر فارسییەکەی تۆ تەرجەمە کردووە، دە زۆر جێگایاندا پێم وایە ڕەتم کردووە لە تۆ، بەڵام لە جێگای واشە زۆر دەست کورتم... کوتی-

تەوازوعـــی فەرموو ـ فەرمـــووی تۆ نەخێر هەر چاترت کردووە. بەڵام واقعییەت ئەوەیە، لە جێیەکی من گەیشـــتوومە باســـی هەژاری، فەقیری، نەداری، باســـی هەژاری و فەقیری و نەداری و چارەڕەشی و بەدەبەختی دەکەم، بەبێ شک چاکم کردووە، چونکو ئەوەندەم لە ئیختیاردایە و فرمێسک و ڕۆندک و نازانم چم لە ئیختیاردایە.

● لای فارس نەبووە...

ـ لای فارس نییە. بەڵام وەختێکی دەگەمە تەخت و تاج و پادشـــا و تالاری پادشـــایی و پەردەی پادشـــایی و سفرەی پادشایی، تەماشـــا دەکەم منێکی کە لەسەر کەوڵی ڕەق نانـــم خواردووە، چۆن دەتوانم، ئەو کەلیماتانەی لە کوێ بێنم کاکە... منێکی کە بەنان و ماســـت و لۆرک و شـــیرێژ پەیدا بووم، کوا دەزانم باسی خۆراکی پادشایانە بکەم و لەوێدا زەعیفم. من خۆم ئیعتراف دەکەم زەعیفم... لەباتی ئەعلا حەزرەتی قەدەر قودرەتی نازانم هومایەنفـــەڕی نازانم چـــی، ئێمە هەمانە و نیمانە خاوەن شـــکۆیە (پێ دەکەنێ)، ئەویش دروست کراوە بۆ خۆت دەزانی.

● باســـی نەسر و شێعر و ئەوەت هێنایە پێشەوە، باسێکی چاکە! زۆر کەس پێی وایە تۆ نەسرت لە شێعرت جوانترە!

ـ وەڵڵاهی منیش... هەر لە ئەوەڵی موساحەبەکەمدا کوتم، ئەگەر کورد نەبام، مەجبوور نەبووم ئیحساســـاتی خۆم بەشـــێعرەوە بەخەڵک ڕابگەینم، منیش پێم وایە نەسر نووسینم خۆشترە. وەنەبێ بۆ خۆم موخالیفی ئەو کەسانە بم کە وا دەڵێن.

● بێجگە لە ئەدەبی فارسی، ئەدەبی میللەتانیتر چی و چەندت خوێندۆتەوە، مەبەستم لە ڕێگەی فارسییەوە...؟!

ـ بەڵێ... هەر لە ڕێگەی فارســـییەوە... وەڵڵاهی، کاکـــە، من تەقریبەن ڕەنگبێ دوو ســـاڵ بێ، موتالەعەم لە کەمـــی داوە، چونکو کاری دیکەم هەیـــە، بەداخەوە موتالەعەم کەمە، دەنا پێم وایە تەواوی شـــاکارەکانی ئەدەبی غەربی کە بەفارســـی تەرجەمە کراین خوێندوومەتەوە. مەســـەلەن پێم وایە هیچی چیخۆف و تۆڵســـتۆی و شـــۆلۆخۆف و ئەوە نەمابێ نەمخوێندبێتەوە.

● ئەی دیستۆفسکی و شکسپیر؟!

ـ شکسپیر کاکە، من بەڕاستی لە شێعری تەرجەمە... شێعری شکسپیرم خوێندوونەوە، بەڵام من لە شێعری تەرجەمەکراو ئەو لەززەتە نابەم کە... وەختێکی هاملێت دەخوێنمەوە نازانم، بەڕاستی ناتوانم گەورەیی شکسپیرێک کە بۆ منی تەشریح دەکەن، بەو هاملێتەی...

دۆنی ئارام دەخوێنمەوە و شـــۆلۆخۆفی وا دەناسم. وەختێکی جەنگ و سوڵحی تۆلستۆی دەخوێنمـــەوە، وەختێک ئاناکارنینای دەخوێنمـــەوە، وەختێکی چیرۆکەکانی جەک لەندەن و ئەوی دیکە، نێوی چییە پیاوا! (خوشـــەهای خشـــم) هی کێیـــە، نازانم، دەخوێنمەوە، بەڕاســـتی ئەو نێوە ئەورووپاییانەش هێندە ناخۆش دێتە بەر گوێی پیاوی نازانم بیانڵێم. ئەمما، بەڵێ شاکارەکانی ئەدەبیاتی غەربم هەموو...

● جۆن شتاینبێکی ناوە...

- بەڵێ... بەڵێ... وەختێکی (خوشـــەهای خشم) دەخوێنمەوە دەزانم چی گوتووە... بەڵێ... بەڕاستی... باسی دۆمای کرد... ئەلیکساندر دۆما منی زۆر کێشا بۆ لای... دیارە بـــۆ خۆت دەزانی زۆر ڕۆمانتیکن نووســـینەکانی. بەڵام بەڕاســـتی پیاوی بەزەوق دەکەن، یانی پیـــاو ناتوانێ... فێری خوێندنـــەوەی دەبێ... وەختێکی ســـێ چەوەندەری دۆمای دەخوێنییەوە ئیدی ناتوانی دەســـت لە خوێندنەوەی هەڵگری. پێم وایە حەتا من لەبیرمە بەجەوانی چیرۆکەکانی پۆلیسیشم دەخوێندەوە و زۆریشم بەلاوە خۆش بوو...

● شەرلۆک هۆڵمز و شتی وا...؟!

- بەڵێ... ئەوانەشم دەخوێندەوە و زۆریشم بەلاوە خۆش بوو. ئەم ڕۆژانە باسی ئەوانەم بەوانە کرد، دوایە دەســـتم بەخوێندنەوەکانی دۆما و نووسەرانی ڕۆمانتیکی فەرانسەیی... زیاتر ئەودەمی لە فەرانســـەوە شت دەکرا بەفارسی... باوەڕ دەکەی تۆ، من (بینوایان)ی: فیکتۆر هۆگۆم لە سێ ڕۆژاندا خوێندبێتەوە چونکو ڕەفیقەکەم بەئەمانەتی دامێ، گوتی لە ســـێ ڕۆژان زیاتر نابێ و هەمووشـــم خوێندۆتەوە و ئەلعانیش کە دەیکەمەوە، ڕەنگبێ چل ساڵ ڕابردبێ بەسەر ئەو خوێندنەوەی مندا، ئەگەر دەیکەمەوە، تەماشا دەکەم دێتەوە بیرم، ئەودەمـــی هێندە بەدیقەتم خوێندۆتەوە. ئەلعان وا نیم، بەداخەوە، کتێبێکی دەخوێنمەوە لەبیرم دەچێتەوە. ئەمما بەمنداڵی خوێندوومەتەوە، بەجەوانی خوێندوومەتەوە، تازە ئیدی تازەگی بۆ من نەماوە.

● باش بوو هێناتە ســـەر باســـی خوێندنەوە، تۆ چیت خوێندۆتەوە، چ دەخوێنیتەوە؟ یانی خوێندنەوەکانت زیاتر لە چ مەجالێکدان؟!

وەڵڵاهی کاکە، من بەڕاستی عەلاقەیەکی زۆرم بەداستان هەیە، ڕۆمان هەیە...

● تۆ خۆت شاعیری و داستان زۆرتر دەخوێنیتەوە...

- زۆرتر دەخوێنمەوە... زۆر سەیرە، باوەڕ بفەرموو وەختێ دیوانی شاعیرێکم وەدەست دەکـــەوێ، لە پێشـــدا موقەدیمەکەی دەخوێنمـــەوە. پێم وایە لە پێشـــدا موقەدیمەکەی

بخوێنمەوە تا بچمە سەر شێعرەکانی. پێم خۆشە بزانم نەسرەکە چۆن نووسراوە لە بارەیدا، ئەو شاعیرە چۆن بەمن ناسێنراوە بەڵێ، ڕۆمان و داستان دەخوێنمەوە. بەڵام تۆ نازانی بەڕاستی لە فارسیشدا، بێجگە لەوەی تەرجومە کراون، ئەمجار خۆشیان، فارسی بەڕاستی نووسەر و شاعیری گەورەیان هەیە، نووسەری گەورەیان هەیە. باوەڕ بکە ئەو بەینانە کتێبێکم خوێندەوە، (از صبا تا نیما) ئەدەبی کوردی لە بەینی دوو شاعیردا، شاعیرێک کە...

• ئەدەبی فارسی...

- بەڵێ... ئی فارسی...، بەڵێ... باوەڕ بفەرموو پیاو تەعەججوب دەکا، ئەو ئینسانە چەندی موتالەعە کردووە بۆ نووسینی ئەو کتێبە، وە چۆنی توانیوە نەسر نووسەکان و شاعیرەکانی لە (صبا) وە تا (نیما) - پێم وایە قەڕنێک یا قەڕن و نیوێکی بەینە هەمووی بەخەڵک ناساندووە. نە ئەوەی کە مەسەلا عیشقی هەمەدانی بابی نێوی سەید ئەبولقاسمی کوردستانی بووە، ئەوە موهیم نەبووە لە نەزەر ویدا، چی کوتووە ئەو کابرایە، ئەوە بۆ وی موهیم بووە، وە تەحلیلی کە ئەو کردوویەتی لەسەر ئەوە، کە بەداخەوە ئێمە وێستاش شتێکی وامان لە ئەدەبی کوردیدا نییە. ئەوەش هی چییە... من خودای نەخواستە، پێم وابێ کورد بێ ئیستیعدادە؟! نا... خودای نەخواستەش نییە، چونکو بڕوام بەوەی هەیە کە کورد بەئیستیعدادە، بەڵام مەجالی نییە کاکە. ئەلعان ئایە ئەگەر محەممەدی قازی مەجالی با، ئەو هەموو کتێبەی کە بەفارسی تەرجەمە کردووە - ڕەنگبێ بۆ خۆشی حیسابیان نەزانێ چەندی کتێب تەرجەمە کردووە - بەفارسی تەرجەمە دەکرد؟! نا... پێم وایە ئەگەر لە کوردستانێکدا با بۆ کوردی تەرجەمە دەکرد. وە ئەلعان تەسمیمی گرتووە کە ئەوەی تەرجەمەی دەکا، حەددی ئەقەل حەول دا شتێ تەرجەمە بکا لەسەر کوردی شت تێدابێ، کە ئەلعان کورد و کوردستانەکەی نیکیتینی لەبەر تەرجەمە دایە و ئەو ڕۆژانە پێم وایە، ئینشائەڵڵا دەگاتە دەستمان و ئەگەر منیش بمێنم یا خۆم تەرجەمەی دەکەمە سەر کوردی یا یەکی دیکە وادار دەکەم کە تەرجەمەی بکاتە سەر کوردی. یەکێک لە مامۆستاکان کتێبێکی عەرەبی... من نەمدی، ئەو دەمی چاپ نەکرابوو، گوایە، دەبێ پاش من چاپ کرابێ... قەتم لەبیر ناچێ و، ئەوە داخێکە لە دڵما. کوتم تۆ بۆ لەسەر ئەحمەدی خانی بەعەرەبی دەنووسی، خۆ وێستا کورد ئەحمەدی خانی نەناسیوە، بۆ عەرەبی دەناسێنی؟!... کوتی وەڵڵاهی کاکە ئەوە پوولی پتر تێدایە... باوەڕم پێ دەکەی، بۆ خۆم لێم بیستووە، ئایا من دەبێ چ بکەم ئەحمەدی خانی ناناسم وەکو... وەک ئەو دەیناسێ، یا وەک هەژار دەیناسێ، من نایناسم. وە لەبەری پاڕامەوە، کوتم بریا تەرجەمەت نەکردبا

شێعر بەشـێعر پێت ناساندباین... پێت ناساندباین خانی چییە، بەڕاستی خانی ناناسین، بەڕاستی نازانین چ بلیمەتێک بووە... بەخۆڕایی نییە کاکە، ڕەنگبێ لە جێگایەکی دیکەشدا نووسـیومە کە کاکە ئێوە چ هەرا و هۆریایەکتانە. شـێعر هەر بەکوردی بڵێن و کەلیمەی عەرەبی تێدا نەبێ و... خۆ بۆ مەم و زین دەبێ تەماشـای قاموسـی فیرووزئابادی بکەی تا لە کەلیمەکانی بگەی، بەڵام تا وێستا، بۆ خۆت دەزانی، بەچەند زمانی دنیایە تەرجەمە کراوە مەم و زین...

• بەزۆر زمان...

- بەڵێ... کەوابوو بەوەی کە: (سـەرنامە بەنامی تۆیە ئەڵڵا) بەوەی پێم وا نییە خانی لەبەر چاوی دنیایە کەوتبێ، شاعیرێکی گەورەیە.

ڕاستە... خانی... ئەڵبەتە دوایی دێینە سەر خانی... خانی تەنیا شاعیر نییە، موفەککیرە، خاوەن بیرە، بیریارە، دەردی کاک مەسعوود دەڵێ... وە باوکی کوردایەتیشە...

• بەڵێ...

- یەکەم کەسە کوردایەتی کردووە و بەپرۆگرامیش کردوویەتی...

بەڵێ بەپرۆگرامیش... وە من... با ئەوەشـت عەرزکەم، کە کوردایەتی، یا ناسیۆنالیزم لە شـێعری خانیدا، دیفاع لە هەژارترین، چارەڕەشترین قەومی دنیایە بووە، وە حەتا ئەو کەسـانەی کە موعتەقید بەناسـیۆنالیزمیش نین، ئەگەر لە موقابیلی ئەوەیدا، ئەگەر بڵێم ئەوە ناسیۆنالیستە زوڵمە... ئەوە ناسیۆنالیستی نییە... دیفاع لە...

• بۆ خۆت دەزانی... ئەو باسەی کە زۆر جار خەڵک وای باس دەکەن... شەڕی نێوان، یا بڵێین پێوەندیی نووسـەر و ڕەخنەگر... تۆ چۆنی دەبینی؟! بۆ خۆت تەجرووبەی خۆت لەو بارەیەدا چۆن بووە؟

- وەڵڵاهی، کاکە من، بەداخەوە، کەم ڕەخنەگری وام دیوە، کە لە کوردستاندا، لە خۆم ڕەخنەی باش بگرێ... بەڵام زۆر بڕوام بەڕەخنەگر هەیە. من پێم وایە ڕەخنەیە نووسەر و شـاعیر دەکاتە نووسەر و شاعیر. وە هەر شاعیرێکی یا نووسەرێکی، لە ترسی ڕەخنەگر، دەسـتی بەقەڵەمەوە نەلەرزیبێ وەختی نووسینێ پێم وایە قەت ناگاتە... نازانم لە کوێدا خوێندوومەتەوە دەڵێ شاعیرێک بەڕەخنەگرێکی کوت، گوتی ئەمن دەچمە هەر جێگایەکی پەیکەری شـاعیرێکی لێیە، بەڵام تا ئێسـتا پەیکەری ڕەخنەگرێکم نەدیوە لە هیچ کوێ. گوتی ئاخر لە سایەی ئێمەیە کە ئێوە...

• پەیکەرتان بۆ دەکرێ...

- پەیکەرتـــان بـــۆ دەکرێ... بەڵێ... من پێم وایە ڕەخنەگر زۆر باشـــە، وە بەداخەوە کـــورد... من... لە کوردســـتانی عێراق دەگەڵ مەتبووعات ســـەروکارم بووە، خەڵک زۆر دوژمنایەتـــی لەگـــەڵ پیاوی پەیدا دەکرد ئەگەر ڕەخنەی لێ دەگرت. تەنیا کەســـێکی کە ڕەخنەیـــان لێ گرت و ڕەخنەیەکی بەعەقیدەی من بەجێش نەبوو، هی دڵشـــاد محەممەد ئەمینە لەسەر من. خۆی لێ شاردمەوە، ڕۆژێکی لێی گەڕام، ماچم کرد، کوتم کاکە گیان، تۆ بوویە باعیسی ئەو هەموو هەرایەی...

● لەسەر تاریک و ڕوون کرا...

- لەســـەر تاریک و ڕوون... نەخێر، وەڵڵاهی بەکەیفی خۆتم لەسەر بنووسە... زۆریشم پـــێ خۆش بوو... ئەلعانیش هـــەر پێم وایە کە ڕەخنەگـــر زۆر زۆر دەورێکی گەورەی لە بووژاندنەوەی ئەدەب و فەرهەنگی میللەتێکدا هەیە.

● ئـــەی بڵاوکردنەوە چۆنە بەلاتەوە؟ زۆر کەس پێی وایە کە پیاو مەجالی هەبوو بڵاو بکاتەوە، شـــتی خراپیش دەڵێ... وای لێ دەکا، حەز لە بڵاوکردنەوە کردن وای لێ دەکا کە شتی کاڵ و کرچیش بخاتە سەر لاپەڕان...

- وەڵڵاهـــی، کاکە، ئیـــدی،... من هەر ئەو ڕۆژانەش دەگەڵ مامۆســـتا هەژار لەبارەی وەیدا موناقەشـــەیەکمان بوو. من پێم وایە هەموو نووســـینەکانی ئەو کەسانەی دە پازدە کتێبیان نووسیوە، بەئەندازەی شێعری «شوکری فەزڵی»م بەلاوە موهیم نییە... هەر ئەو غەزەلەیشـــم لێ دیوە، ئەو پێنج شـــەش شێعرەی بۆ کوردی گوتووە. کار کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەولێژی نەکەی... (ڕاستییەکەی: ئیش کە ڕووی ئەمرۆ...ف) من پێم وایە کـــەم و پوخت زۆر چاکترە، وەک زۆر و... لەگەڵ زۆر و بۆری یەکجار موخالیفم. پێم وایە کەمی بنووسی و چاکی بنووسی باشە.

● سانسۆرت پێ چۆنە؟!

- وەڵڵاهی لێی بێزارم...

● سانسۆری سیاسی ئەڵبەتە...

بەڵێ... بەڵێ... ئیدی... وەڵڵاهی لە هەموو نەوعە ِسانسۆرێکی بێزارم...

● ئەی هەندێ جار پیاو خۆیشی دەبێ بەسانسۆری خۆی...

- بەڵێ، لێی گەڕێ بۆ خۆی، یا نووسەر بۆ خۆی سانسۆری خۆی بکا...

● باشترە...؟!

- باشترە... دەزانی، سانسۆر زۆر لە زەوق دەدا! لە حەتتا سانسۆری ئەخلاقی، حەتتا

سانســۆری نازانم عەقیدەتی. بەعەقیدەی من لێی گەڕێ، پێی بڵێ خۆت خۆت سانســۆر بکە نووســەرا نووســەرێکی عەقلی وەی نەبێ خۆی خۆی سانسۆر بکا حەیفە هەر قەڵەم بەدەسەوە بگرێ.

- یانی لە کوردستانێکدا ئەگەر تۆ وەزیری ڕاگەیاندن بی، چ دەکەی...

- وەڵڵاهی ئەگەر (پێ دەکەنێ)...

- کە ناشبێ...

- بەڵێ... دیارە... (آرزو بر جوانان عیب نیســت)، لە فارسیشــدا شــتی وا هەیە... بــەڵام قەت ئەوەی نابینم. ئەمما ئەگەر بیبینم... ئیللا شــتی خراپ نەبێ... ها... (پێ دەکەنێ).

- شتی خراپ چییە؟!

- شتی خراپ، لە باری ئەدەبییەوە ئەرزشی نەبێ، دەنا لە باری دیکەوە هەرچی دەیڵێ من سانسۆری ناکەم. بەڵام کەسێکی بەڕاستی ئەرزشی نەبێ و بیەوێ خۆ بەسەر خەڵکیدا بسەپێنێ ڕەنگبێ (پێ دەکەنێ) نەیەڵم شتی وی چاپ بکرێ...

- ئەی باشە، باشتر نییە ئەوەش بکەوێتە بەرچاوی خەڵک و خەڵک بۆ خۆی بڵێ تۆ خراپی...؟

- کاکــە هێند دواکەوتووین، بەداخەوە. مامۆســتا زەبیحی دەیکــوت، بۆ خۆی هەزار جاری کوتووە، لە کتێبەکەشیدا نووسیویەتی. نووسیویەتی، من نامەیەکم لە بەرواره‌وە بۆ هاتووە، وەختێ کۆمەڵەی ژێ. کاف بووم، نووسیویەتی بەرواری...

- ئەوەندەی ئەوەندە...

- ئەوەندەی ئەوەندە... دەڵێ پەنجا ســاڵە... من بۆ خۆم ئەودەمی بەتەئریخم زانیوە، پەنجا ســاڵە خەریکــم لەبیر خەڵکی بەرمەوە لەبیری ناچێتــەوە. وە باوەڕم پێ بکە لەو نامانەی کە ئێســتا بۆمان دێ، بۆ سروە دێ، ئەغڵەبی بەرواری نووسیوە... بڵێین چی... وەختێکی غەڵەت هاتە گۆڕێ... نازانم بۆ ئەو کوردە ئەو نەخۆشییەی هەیە، شتی غەڵەتی چاتر دێتە بیر...

- تۆ، ئەڵبەتە، سانسۆرت تووش بووە، سانسۆری داگیرکەرانی کوردستان...

- تەواوی ژیانی خۆم من لەژێر سانسۆردا بووم...

- ئەی سانسۆری کورد...؟!

- لەژێر سانسۆری کوردیشدا بووم.




● ئەوەیان چۆن...؟

- وەڵڵا، کاکە، ئەوەم دەتوانی ڕەفع بکەم. سانسۆری کوردم دەتوانی ڕەفع بکەم، بەوی دەوێرام. لەولایە، وەکو عەرزم کردی، وەختێکی ئەندامی حیزب بووم، سانسۆریان دەکردم، دەچووم لە جێگەیەکی دیکە بڵاوم دەکردەوە، یا ئەقەللەن دەمدایە دەسی خەڵکی...

● ئەی ئەو شـێعرانەت کە بەبێ ناو لە کوردسـتاندا بڵاوت دەکردنەوە، مەبەسـتم لە ڕۆژنامەی کوردستاندا...

- بەڵێ ئیدی، ئەوە سانسـۆرەکە بوو، بەڵام لە تاریک و ڕووندا شـێعرێکم هەیە، کە دیارە ئەوەش دەبێ لەبیر نەچێ کە مەحەللییە. لە مەهابادا وەختێک کە من ئەو شـێعرەم بڵاوکردەوە بەنێوی (ڕاوە بەراز)، ئەوەڵا شـوجاعەتێکی سـەیرم کرد، کە چەکی ڕاویان، تفەنگی ڕاویان لە هەموو کەس ستاندبۆوە و کە لە عێراق تەقە هەیە، نابێ لێرە تۆ تفەنگی ڕاویان بەدەسـتەوە بێ، من وێرام، بۆ خۆشـم ڕاوکەر بووم، ئەودەمی، ئەو ئیحساساتەی خۆم بڵاو بکەمەوە. لەوێدا برێکیشـم گاڵتە کردووە. لە کوردسـتانی عێراق ئەو شێعرەی من زۆری دەنگ نەداوە، بەڵام لە کوردستانی ئێران ئەو وەختی، دەنگێکی عەجایبی داوە، چونکـو ئـەوەلا کەس نەیدەوێرا بڵێ بۆ شـا چەکی لە خەڵکی ئەسـتاندەوە. من ئەوەم بڵاوکـردەوە، بەڵام دە لیباسـی جەفەنگ و شـتی وادا ونم کرد. حەتـا وایان لێ هاتبوو زابتەکان، ئەفسـەرەکان، ئەفسـەرەکانی ڕاوکەر، بۆ خۆیان هەموو لەبەریان بوو، ئەوانی کورد. مەسەلا دەوێدا دەڵێم:

ئیتـــر مـــەحمـــوود بانـــادا سـمێڵی
سـمێڵ بادانـــی پـێ عـەیبـە بـەدێڵـی
کـە ڕاوکـەر بـێ تفەنـگ ئەڵبەتـە دیڵـە
لــە هەمـــووان دێلتریـش مەحمـــوود سـمێڵە

لەوانەدا دوو سـێ شـێعری وای تێدا بوو کە پسـاوە، ئەلعان دێمەوە، پاش ئەوەی هاتوومەوە مەهابادێ، پێم دەڵێن بۆ ئەو شـێعرەی تێـدا نییە. خەڵکی مەهاباد لەبەریان ماوە، بەڵام سانسـۆری حیزب ئەو شـێعرانەی لێ پەڕاندن. هەرچـی حەولم دا کە باوکم ئەقەللـەن نوختەیان لە جێگا دانێن... گوتیان نا. کەچی شـێعرەکە لەبیر خەڵکی ماوە. ئەوە سانسـۆری حیزب بوو کە ئەمە کەلیمەی سـووکی تێدایە. برێکم گاڵتە کردبوو، دوو




سێ کەلیمەی، ڕەنگبێ، دەگەڵ ویقاری (ئەلفەکە بەشێوەیەکی گاڵتە ئامێز درێژ دەکاتەوە. ف) سیاسی یەکی نەگرتباوە، لێیان فڕێ داوە.

• ئێستە کە ئەندامی پارتی نیت، یا ئەندامی پارتییەک نیت، زۆرتر باسی سیاسەت و باشتر باسی سیاسەت دەکەی. ئەودەم بۆ نەتدەکرد...؟ لە تاریک و ڕوونیشدا وات نەگوتووە، یا پێشانت نەداوە کە سانسۆری حیزبیش و کوردایەتیش تەئسیری لێ کردووی...

- ئەوەش هەر سانسۆری حیزبە کاکە (پێ دەکەنێ)، مەگەر تاریک و ڕوون کێ بڵاوی کردۆتەوە؟! حیزب بڵاوی کردۆتەوە، خۆ من بڵاوم نەکردۆتەوە.

• ئەی ئێستە چۆن سەیری تەجروبەی سیاسی خۆت ئەکەی؟!

- قەرار وا نەبوو لە سیاسەت قسە نەکەین...؟!

• نا... مەبەستم ئەوە نییە بەدرێژی باسی بکەی، تەنیا وەک یەکێ لە تەجروبەکانی، سەرچاوەکانی شێعر لای تۆ، هەڵبەتە سیاسەتیش دەورێکی بینیوە. ئێستە چۆن سەیری ئەو ژیانە دەکەی کە لە سیاسەتدا بردووتە سەر؟!

- وەڵڵاهی من ئەلعانیش بەجێی شانازی خۆمی دەزانم، چونکو پێم وایە کورد هەر بەشێعر ڕزگاری نەدەبوو... لە ڕژێمی تاغووتیدا، پێم وابوو کە دەبوو سیاسەتیشی بۆ بکەی، حەتتا چەکداریشی بۆ بکەی. لەشەڕی سێ مانگەی لەگەڵ لیبرالیزم و بەنی سەدردا من چەکداریشم کرد، بەو پیرییەی خۆمەوە. ئەلعان «بەردە هێمن» مەشهوورە کە لەبن بەردێکی دانیشتووم و هێلیکۆپتەرم وەبەر تفەنگان داوە. بەدەست و تفەنگیش خوێڕی نیم، ئەمما پێم وابوو بەنەفعی ئیمپریالیزم کورد نابێ دەست بداتە چەک ئیدی. من دەو بڕوایەدام، ئەلعانیش هەر دەو بڕوایەدام کە ئیمپریالیزم دەیتوانی لە شەڕی ئەووەڵی جیهانیدا کوردستانێ بەوجوود بێنێ، زۆر بەئاسانی دەیتوانی، نەیکرد، بەتایبەتی ئەو ئیمپریالیزمەی فەرەنسە، کە بەحاڵەتێکی برا کوردەکانی سووریەمان بەلەش و خوێن هەموو شتێکی خۆیانەوە، ئیحساسیان کردووە. تاریخ نیشانی داوە ئەگەر ئیمپریالیزمی فەرەنسە یاریدەی کەمال ئەتاتورکی نەدابا، بەو زووانە شۆڕشی کوردی تورکیەی دانەدەمرکایەوە. ئێمە چۆنمان هیوا بەوەی بێ. ئەوەیە کە من، ڕاستییەکەی، وەکو ئینسانێکی دژی ئیمپریالیزمی ئەلعان لە سیاسەتدام.

• ئەوجا با بچینە سەر شێعری کلاسیکی کوردی یا هەر ئەدەبی کلاسیکی کوردی...

- بەڵێ...

• چەند شارەزاییت لێ هەیە؟

- بەڵێ، وەڵڵاهی هەر لە پێشداش گوتم من کلاسیک نالیم، کاکە، چونکو... من دەڵێم، عەرووزی، کۆن، نازانم... هەرچی دەڵێ... وەڵڵاهی زۆر شارەزام من.

• کلاسیک کە دەڵێم، لێرەدا مەبەستم تەنیا شەکل با بڵێین فۆرمی شێعر نییە، بەڵکە هەر وەک قۆناغێکی تاریخی ناوی کلاسـیک دەبەم... هەر ئێمەش نین، میللەتی دیکەش هەموو وان...

- ئێمە دوو نەوعمان ئەدەب هەیە، بەڕاسـتی... ئەدەبیات، شێعر هەیە... نابێ بڵێین ئەدەبیاتمان هەیە بەتەواوی مەعنای کەلیمە... دوو نەوعمان ئەدەبیات هەیە، نووسـراو و نەنووسـراو، یانی ئەوانەی وەک شـاعیرەکانی لە جزیری، فەقێ تەیران و لە جزیر ڕا دێیە خوارێ... ئەگەر ئەوانە دەڵێی من شاعیری زۆر گەورە دەنێو وانەدا دەبینم. ئەگەرچی زۆر چـاک لەهجەی گۆرانی نازانم من - با ئـەو حەقیقەتەش بڵێم بەڵام وەختێکی بەراوردێکم کردووە لە بەینی شـیرین و خوسـرەوی خانای قوبادی و نیزامیدا هیچ بەکەمی نازانم لە نیزامـی، لە نیزامی بەکەمترم نایەتە بەرچاوی. وەختێکی مەم و زینی لە موقابیلی یەکێک لە پێنج کتێبەکانی نیزامیدا دادەنێم، ئەگەر مەم و زین دە موقابیلی لەیل و مەجنوونی کە هەر لەسەر ئەو وەزنە دانراوە، موقابیلیان بکەین، ئەمن پێم وایە لە باری مەعناوە، مەم و زین چێتر و فەیلەسووفانەترە. وە بۆیەش زۆری بەموەفەق دەزانم قارەمانەکانیشی کوردن، سـەحنەی داستانیشی هەر کوردسـتانە، فەرهەنگ هەر فەرهەنگی کوردییە. داب و ڕەسم هەر داب و ڕەسـمی کوردییە، بەڵام نیزامییەکی لە گەنجەیڕا دەچێ بۆ خۆڵی عەرەبستانی نەیتوانیوە ئاداب و ڕوسـوومی عـەرەب وەکو عەرەبێک بەیان بکا. دیارە فارسـییەکەی زۆر ڕێک و درووسـترە لە کوردییەکەی خانـی. دەگەڕێینەوە بۆ نالی و مەحوی و ئەوانە، بەڕاسـتی پێم وایە شـاعیری زۆر گەورەن وە زۆرم ئیمان پێیانە... شـاعیرەکانی قەڕنی بیستوممان...

• ئەی شێخ ڕەزا...؟!

- وەڵڵاهی کاکە، شێخ ڕەزا بەڕاستی نازیمێکی چاکە...

• نازیم...؟!

- نازیـم، فەرقی هەیە بەعەقیدەی مـن. یەعنی توانیویەتی وەزن و قافیە و قالبی زۆر جوان دروست بکا. بەڵام شێعرەکانی سەرفی نەزەر لەوەی هەجون، تەنز نین...

• ئەی ئەوە، بەڕەئی تۆ، تازە نییە؟ شتێکی تازە نەبوو لە ئەدەبی کوردیدا؟!



- نەخیر... دە ئەدەبی کوردیدا تازەن، بوچی...
- ● ئەی زمانی شێخ ڕەزا، بۆچی پیاو باسی ئەوەش نەکا...؟!
- ئای... زۆر، زۆر... بەڕاستی ڕەوانە...
- ● زمانێکی زۆر سوارە...

- زۆر ڕەوانــە... زۆر ســوارە... عــەرزم کردی، من لەبارەی وەزندا شــێخ ڕەزای زۆر بەگەورە دەزانم و لەباری وەیدا کە تەعبیری کوردانەیشــی هێناوەتە ناو شێعری خۆیەوە، کە لە پێش ویدا دیارە لە شێعری نالیدا کەم تا کورتێک دەبینرێ، لەبیرت نەچێ، بەڵام:

کارێ کــە غــەم و دەردی فەراقــت بەمنــی کرد
ســەرما بــەهــەتیــو، بــا بــەدەواری شــڕی ناکا

ئیدی کوردی کوردییە. لەبەروەی شــێخ ڕەزاشم... بەڵام بەداخەوە شێعرەکانی زۆریان ڕووی مەجلیســیان نییــە ئیدی... دەڵێی چی... تۆ خوداکــەی... ئەوە لەکن خۆمان بێ ئیشائەڵڵا، خۆ ئەوەی بۆ هەموو کەس لێنادەی... ڕۆژێکی کچەکانی تەلەبەی بەشی کوردی دانشکەدەی بەغدا هاتنە لام هەموویان پێدەکەنین...

- ● جا کوا کچمان هەبوو...؟!
- بەدی، سێ چوارێکمان هەبوو...
- ● نیوەیان لەپیاو دەچوون.

- هاهــا... وا... هاتنە لام، پێدەکەنین ســەیر. کوتم بەچی پێدەکەنن؟! کوتیان وەڵڵا مامۆستا عەلائەددین سەجادی ئەوڕۆ لەسەر دەرسی باسی شێخ ڕەزای بۆ کردووین و ئەو شێعرەشی بەنموونە خوێندۆتەوە:

بــەو جووتــە گــونە مــن کە دەڵێــی عەنتــەری نێرم
لێــم لادە نــەوەک بتخەمــە بــەر حەملەیــی کێــرم

دەیگــوت مامۆســتامان بۆ خۆمــان وەک عەنتەری نێر هاتبووە بەرچــاو (هەموومان پێدەکەنین)... هەموو پێدەکەنین، بەڕاســتی ئەگەر لەبیرت بێ ڕەنگبێ، مامۆســتا ئەگەر

ڕووتت کردباوە، ڕەنگبێ لە شتێکی سەیری بکردایە... بەڵێ... شێخ ڕەزا، بەداخەوە، شێعرەکانی، بڵێم چی، بۆ پێکەنین دەبن، بۆ خۆشی دەبن. بەڵام کاکە، شێخ ڕەزا، ئەو کەسەی شارەزای ئەدەبی فارسی بێ، زۆر شاگردی عوبەیدی زاکانی بووە، زۆریش لەوی شاعیرتر بووە، یانی، موسەللەتتر بووە بەسەر وەزن و قافیە... بەڵام ئی شێعری عوبەیدیزاکانی دەعەینی حاڵدا کە جنێوی داوە، کە هەجوی کردووە، نەتیجەیەکی موسبەتی لە شێعرەکانی وەرگرتووە، بەداخەوە شێخ ڕەزا هەر جنێوی داوە، بۆ خۆت دەزانی... ئەم جنێودانە وە نەبێ بۆیە بووبێ ئیسلاحی جامیعەی بکا... دەنا حاجی قادری کۆییش جنێوی گەورەي هەیە. بەڵام هێمن لە موقابیلی وەیدا دەڵێ: وەکو باڵی پەری پاکە جنێوت... چونکو جنێوەکەی موسبەت بووە. لەوبەری ئەم نەقدەم لە شێخ ڕەزا هەیە... و پێم وایە، با ئەوەش دەربارەی شێخ ڕەزا بڵێم: هیچ کوردێک لە شێخ ڕەزای ئەلعانیش فارسی چاکتر نازانێ...

● فارسی؟

ـ بەڵێ بەعەقیدەی من، ئەلعانیش، لەو کوردستانەی ئێرانیدا، کە هەموومان بەفارسیمان خوێندووە، هیچمان ناتوانین شێعری فارسی وەکو وی بڵێین. مەحشەرێکە لە شێعری فارسیدا کە پیاو هەر سەری... تەعەججوب دەمێنێ. ئەڵبەتە من دەگەڵ فیکرەکەی یەک نیم، بەڵام تەماشای ئەو دوو شێعرە دەڵێ:

رسم فرنگیان کله از سر فکندن است
تعظیم چون کنند خداوند جاه را
من اکتفا بشیوەی ایشان نمی کنم
هم سر به پایت افکنم و هم کلاه را

کە ڕەنگبێ شاعیرە مەدداحەکانی فارس بۆ خۆیان مەدحی وای پادشایان نەکردووە، ئەمما پێم وایە هیچی نەداوەتێ چونکو کورد بووە... (پێدەکەنێ)... بەڵێ...

● ئەی مەلای جەزیریت پێ چۆنە؟

ـ وەڵڵاهی کاکە، توخواکەی من شتێکی نازانم بۆ دەبێ بەزۆری... من کرمانجی وا نازانم... حەتتا کاک هەژارم ئینتقاد کرد، کە تۆ دەڵێی ئەوە لەگەڵ مەولانای ڕۆمی هاوشانە... پێم وایە برێک زێدەڕەویت کردووە لەوەیدا. بەڕاستی شێعرێکی بۆ خوێندمەوە

کــە من موتەوەججیهی نەبووم، ئەلعانیش لەبیرم نییە، هۆ وەتا دیوانەکەشـــی، بەداخەوە فرســـەتی وام نییە تەماشـــای بکەم، بۆم نابینرێتەوە. تەماشـــام کرد بەڕاستی عارفێکی گەورە بووە. ڕەنگبێ جەلالەددین شـــێعری وای نەبووە. کە وابوو هەژار بەخۆڕایی هێندەی پێ هەڵنەکوتووە. بەڵام ئەوەی ئەگەر مامۆســـتایەکی کرمانجی چاتر دەزانن لە من، ئەگەر بەوان بڵێی... من گۆرانی چاتر دەزانم لە کرمانجی... بەڕاستی لە کرمانجیدا زۆر کۆڵم... ئەگەر عەرزت دەکەم برێک لە خانیدا شارەزاترم ئەوەیە کە ئەوەڵا زۆر پترم خوێندەوە... دە بێکاریدا توانیم مەم و زین چاکتر بخوێنمەوە.

- بەکرمانجییەکەی یا ئەوەی هەژار؟

- بەکرمانجییەکـــەی. هی هەژاریش یارمەتی دام، پیاو حەق بڵێ، ئەویش یارمەتی داوم ئیدی. وەختێکی شێعرێکی تێ نەگەیشتووم چووم تەماشای هەژارەکەشم کردووە. تەماشام کردووە، ئەگەرچی ئەگەر تەماشـــای پێشـــەکی توحفەی موزەففەرییە بکەی هەژارم نەقد کردووە کە نەیتوانیوە فەلسەفەکەی خانیمان پێ نیشان بدا.

ئەو ڕۆژانەش تووشی ئەدیبێکی زۆر گەورەی کورد بووم بەنێوی سەید تاهیری هاشمی، کە ئێوە نایناســـن... بەڕاســـتی گەورەیە. ئەو، حەتتا ئینتقادی لە مامۆستا مەلا کەریمی بوو کە بەخۆڕایی شـــەرحی لەســـەر نالی کردووە. دەبێ شـــاعیر لێی گەڕێی، هەر کەسە وەکو دەریاییێک، بەشـــی خۆی لێ هەڵێنجێنێ. حەیفە... حەیفە ئەو کەسەی لە نالی ناگا، تێی بگا... لێی گەڕێ با تێی نەگا... بەڕاســـتیش ئەوەندەی جوان فەرموو. حەتتا لەسەر مەلای جزیری کاک هەژاریش ئەو نەقدی هەر هەبوو. دەیکوت مامۆســـتا هەژار دەبوو ئەو کەلیمانەی بۆ ئێمەی گۆران موشـــکیلە بۆمان بکاتە فارسییەک، یا کوردییەکی سۆرانی، با تێی گەیشتباین، ئیدی لازم نەبوو ئەو شەرحەی لەسەر بکا. ئەو عەقیدەی وایە...

- سەیید تاهیری هاشمی...

- بەڵێ... بەڕاستی ئەدیبێکی گەورەی کوردە. ئەدەبناسێکی گەورەی کوردە.

- ڕەخنەگرێکی باشیشە وا بزانم...

- ڕەخنەگرێکی باشە...

وتارەکانی لە ڕادیۆ کرماشـــانەوە دەیخوێندنەوە شـــتێکی بەڕاستی نایاب بوون. بەڵێ، عەرزت دەکەم، ئەو جار کتێبخانەیەکی زۆر عەزیمی کوردی هەیە. دەیگوت پتر لە بیســـت دیوانی مەولەوی...

- دەستنووس مەبەستت...

- دەستنووســـی هەیــە. بەڵێ وە دەیگوت وەختێکی مامۆســـتا مـــەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس خەریکی مەولەوی بوو، لە منی نووســـی کە ئەتۆ عەقیدەت چۆنە... بنووســـە، ئەو شـــتانەی کە مەشـــکووکی هی مەولەوین، یا هی مەولەوی نین. گوتی وەڵا هەمووم بۆ نووسی، بەداخەوە هەمووی چاپ کردووە (پێ دەکەنێ)... کوتی ئەوەی ئێوە لە سروەتاندا چاپ کردووە یەکێک لەوانە بوو کە ئەمن بەمەشـــکووک پێم موعەڕڕەفی کردبوو و من دڵم نەهات دەو مەجلیسە خوسووسییەیدا بڵێم کە کتێب لە عێراقێدا هەتا ئەستوورتر بێ پتری پـــووڵ لێ وەگیر دەکەوێ... دڵم نەهات ئەوەی عـــەرز بکەم (پێ دەکەنێ) بەڵێ، گوتی، زۆریان بەمەشکووک دەزانم ئەوەی ئەو هەیەتی. من شتی چاترم هەیە. وە ئەوەی کە ئێمە لە سەفحەی دووەمی...

- سروە.

- لە سروەدا نووسیومانە: هەرچەن مەواچان...

- ئەوە هی خانای قوبادییە...

- خانـــای قوبادییە، خەڵـــک بەنەوعی دیکەی بۆ ناردووی ــن: «مەحزووزەن هەر کەس وەزوان خوێش»، ئەو دەڵێ: دڵشادەن... عەرزت دەکەم، دەڵێن «ئەوڕەنگ» وای دروست کردووە. ئەوەمان لە زمانی مامۆستا تاهیری بیستووە، دەڵێ من دەستم لێ نەداوە، وەرن نوسخە ئەسڵییەکەتان نیشـــان دەم خۆی وای نووسیوە. ئەم کەسانەی تەسەڕوفیان تێدا کردووە پاش وی تەسەڕوفیان کردووە...

- ئەی مەولەوی...؟! سەید عەبدولڕەحیم.

- بەڵێ... سەیید عەبدولڕەحیمیش هەر ئەو چاکی دەزانێ.

- نا، مەبەستم وەکو شاعیرێک چۆنی دەبینی؟

- من زۆر بەگەورەی دەزانم. زۆر سەیرە، بارەها، لە بیرتە کە لە عێراقیش ئەگەر دەیانکوت بەموناســـەبەتی، مەسەلەن، وەفاتی (ئەلفەکە بەشێوەیەکی گاڵتەئامێز درێژ دەکاتەوە. ف) تەوفیق وەردی شـــێعرێک بڵێ (پێ دەکەنێ)، من شـــێعرم بۆ نایێ بەموناسەبە، دەمکوت من شـــاعیری موناســـەبات نیم، کەچی ئەم کابرایە هەموو شێعرەکەی موناسەبەتە، کەچی دەهەموویدا، بۆ خۆت دەزانی، گەییوەتە ئەوج، پێم وایە...

- ڕاستگۆ بووە، ئەوەیە مەسەلە...

- بەڵێ زۆر ڕاستگۆ بووە...

- بەڵام ڕەنگە لە هەمووی جوانتر ئەوانە بن کە بۆ عەنبەر خاتوونی نووسیون؟!

- پـــەک، پەک، پەک... بەڵێ، بەڵێ، پێم وانییـــە... دیارە لە بیرت نەچێ کە، نازانم شـــێعری کامەیانە، پێش وەی، حەمەغای دەربەند فەقەرەیە، نازانم چی، کە ئەویش لەسەر گڵکۆی تازەی لەیلێ...

● ئەحمەد بەگی کۆماسی...

- کۆماســی بێ، یا نازانم، بەڵـــێ... گڵکۆی تازەی لەیلێ دەپێـــش عەنبەر خاتووندا کوتراوە. ئەگەر ئەوە نەبا، یانی ئەوەشـــمان لە ئیختیاردا نەبا، دەبوو بەقەتعە شـــێعرێکی عالەمی ناسرابا، بەڕاستی. پێم وانییە کەس شینی بۆ خۆشەویستی خۆی گێڕابێ، وەک ئەو دووانە هەردووکیان گێڕاویانە. هەردووکیان زۆر چاکن... بەڵێ... و خۆشەویســـتی عەنبەر خاتوونی هەر لە مەرگەکەیدا دیار نییە. ئیدی، لە نەخۆشییەکەیدا کە جەرگی بۆ دەکاتەوە، دڵی بۆ دەکاتە هەنار و دەڵێ کون کونی کەو بۆنی پێوەکە، هەنار بۆ هەڵامەت...

● ئەویشی هەر بۆ عەنبەر خاتوون نووسیوە؟!

- بەڵێ. ئەویشی هەر بۆ عەنبەر خاتوون نووسیوە... بەڵێ... نەخێر، شتێکی سەیرە. باوەڕ بفەرموو شـــێعرێکمان... قەرار وایە مامۆستا تایەر بۆمان بنووسێ، ئەگەر ئیشائەڵڵا سروە گەیشتە فەسڵی زستانێ. بۆی، خوێندینەوە مەفهوومەکەم لەبیرە ئەگەر شێعرەکانم لەبیـــر نەبێ، مەفهوومە بۆ خۆت دەزانی، کـــە... ئەگەر بیکەینە زبانێکی دیکەش ئەو تام و بۆنەی هەر هەیە، دەڵێ زســـتانە و عوزری هەیە بۆ دیتنی... بچێتە خزمەت شێخەکەی، شێخی سەراجوددین، زستانە. ناتوانم بێم، پیرم، نازانم چم، ئەمن ناتوانم بێم، بەفر ڕێگای گرتووم، بەڵام ئەو کەســـانەی شەوقی زیارەت زۆری بۆ هێناون، من ڕێگەکەیان پێ نیشان دەدەم زۆر بەئاســـانی بڕۆن بۆ لای وی، ئەویش ئەو ڕێگایەیە کە هەناسەی من بۆ خزمەت شـــێخ کردوویەتیەوە، ڕەشانگە... هێند گەرمە هەناسەکەم، بەڕەشانگەکەیدا بڕۆن دەگەنە تەوێڵە... ئایا تا ئێســـتا فکری وا ناســـکت... پێم ئایە زۆر کەم هەیە. لەســـەر زستانی ناشیرینی چەند جوان... ئەوی کردووە، بەڵێ...




نووری چاوم کەریم گیان:

بەم نیوەشەوە ساردە، سڵاوێکی گەرمت پێشکێش دەکەم. وەبیرم دێ کە تازە عەلائەددین پەیدا ببوو کاک مامەندی شەختانێ هەزار ڕەحمەت لە گۆڕی بێ و دەگەڵ نووری خودای وەخەبەربێ، خەبەر دەزانێ و بەپەلە پیاوێک دەنێرێ بۆی بکڕێ و بیهێنێتە شەختان. سەرتان نەیەشێنم زۆری پێدەچێ عەلائەددین دەگاتێ. بەداب و دەستوور لە دیوەخان هەڵدەکرێ کاک مامەندی ڕەحمەتی خۆی ڕێ دەخا و تەماشا دەکا تینێکی ئەوتۆی نییە دەڵێ: «ئەوەیە عەلائەددین؟» دەڵێن: «بەڵێ». دەفەرمووێ: «هەر سێک تەڵاقی دە مامەندم کەون و کچی خۆم... بێ تسی مامەندی گەرمترە» منیش ئێستا وام بەسەرهاتووە. منێکی بەمنداڵی لەبن کورسی ڕەژی کوورانێدا پەرەوازە بووم، بەمێر منداڵی و لاوی و ئەکابری لە لاچین و شیلاناوێ لە تەنیشت کوورەی سووربۆوەی سەختەداری بەتین دەنوستم، بەپیریش تووشی گەرمای بەغدا بووم و لەو ئاخرانەشدا دیسان لە کورسی بەرکەمران خزاوم. ئەمساڵ ئەوە تووشی ورمێ بووم. گوتیان بابم ئەتۆ لەو قەلاتووچکەدا بەکوورەی نەفتی ئەم زستانە نەک مەقاوی دەگری بەڵکو تووشی ئێپلیگیش دەبی و سەکەت دەبی. وا چاکە خانوویەکی شووفاژدار بگری. پاش هەوڵ و تەقەلایەکی زۆر شوفاژم پەیدا کرد. هەر ئێستاکە ئەم نووسراوەت بۆ دەنووسم سەعات سێ و نیوی پاش





نیوەشـــەوە کە لە سەرمان دەرپەڕیوم و پاڵم وەئاسنی شوفاژ داوە. بەڵام ئەگەر لەترسی دایە خانم وێرابام «بەقوربانی بەژن و باڵای بم» سێ بەسێ تەڵاقم دەخوارد تسی خانباغی گەرمترە لەو شووفاژە.

کەریم گیان! مزگێنیت دەمێ دیزەی ســەروپێمان لەسەر سێ کوچکان دامەزراند، بەڵام جارێ ئاورمان کەم وەبەر داوە. هیوادارم ئەگەر لەســەرمان ڕەق نەبم و لەبرســان بەلادا نەیــەم و بەکلکەلەقــە بگەمە بەهارێ وای بکوڵێنم هەل و پەل بێ. بەڵام کوا ئەوە بەتەنێ بەمنی پیری سەرمابردەڵە دەکرێ. باوی ئێوەیە ئەی نووری چاوی هەموو کوردێکی ڕاست و دروســت و ئەدەبدۆســت بگەنە هانام. ئێوارەی ڕابردوو لەلام بوون دەیانگوت هازا گۆ و هازا مەیدان. پێشــنیارم کرد لەپاش دیوانی حەریق کتێبێکی شــێعری بەناوی «تەبیعەت لە شــێعری کوردیدا» ئامادە بکەین. بیرم کردەوە بــۆ خۆم بەتەنێ چم پێ ناکرێ، واش دەستەوەستان نیم. ئەمما دەمدی شتێکی باش دەردەچێ بۆیە پەنام بۆ ئێوە دۆستانی لاو هێنا. تکایە بێ هەدادان خەریک بن لە بەهاری «سێمان» و «نالی» و «حاجی قادر» و «پایزە»وە دەس پێ بکەن، تا دەگاتە زســتانی سەیف هەر کەس لەبەر خۆیەوە خەریک بێ نەواران بێنێتە ســەر کاغەز، دیوانان بپشکنن. ســەفەران بکەن، خەڵکی تازە ببینن. پێویســت ناکا هەر شێعر بێ. نووســینی تۆم دیوە ڕەنگە زۆری وەک تۆ هەبن نەیانناسم بەپەخشــانی جوان وەســفی جوانی تەبیعەت بکەن. کاک عەلی حەسەنیانی بێ ئەزموون نییە ببینن. بۆ خۆتان خۆپەســەندی وەلا بنێن، لێک هاڵێن. دیارە هەر بەوەندەوە زەود نابین. خەریکی کۆکردنەوەی هەموو جۆرە فۆلکلۆرێک بن. پەندی پێشینیان، گۆرانی باش، حەیران، گەلۆ و چیرۆکی منداڵان، کوڕە ئەگەر خۆ سەخڵەت بکەین زۆر هەژار نین. ئاغای خانباغی خوا ڕاوەستاوی بکا، قسەی خۆشی قسەخۆشەکانی سابڵاغێ و خۆی ئامادە بکا، ئەحمــەدی بەحــری خەریکی کۆکردنەوەی پەندەکان بێ، هەر کــەس بەقەد خۆی. دیارە من چاوەڕوانی یارمەتی پیاو و ئینســانانم، لە باڵندە و دڕندە و بڕندە داوای هیچ ناکەم. ڕەش ئەحمەدی «تحفه مظفریه»ی پێ شــک دێ. دەکرێ خاوەنەکەی ئەوەندە، پیاوەتی بکا و یارمەتیان بدا. دەســبەجێ دەگەڵ عەلی تەماس بگرە. بۆ خۆت و هەر کەسی دیکە پاش جێژن دەتوانن ســەرم بدە و کەللەپاچە تەماشــا بکەن. من بەهیوای ئێوە خۆم لەو قاڵمەقاڵە هاویشــتووە. وەباڵی کوردتان بەئەستۆی ئەگەر خۆتان ماندوو نەکەن. قاسم و ســمایلی پاکزادت لەبیر نەچێ. لە ئێستاوە دیمەنێکی بەهاری کوردستان بۆ پشتی کتێب ئامادە بکەن. کە هاتی زۆر قسە دەکەین.

برات هێمن





کاک کەریم

نووســـینەکانت لەبارەی شـــاعیری پایەبەرزی کورد (ســـالم) دا پەسندکراو و ئەوە لە گۆوارەکەماندا چاپ بوو و سوپاســـت دەکەین. ئێمـــە وامان دانابوو کە لە هەر ژمارەیەکدا شـــاعیرێکی مەزنی کورد بناسێنین. بۆ خۆمان مێژووی ئەدەبی مامۆستا مەلا عەلائەددینی خوالێخۆشـــبوومان لە دەســـدا بوو بەڵام زۆرمان پێ جێگای موتمانە نییە. چەند کەســـی دیکەش نووســـینی ئاماڵ جوانیان لەســـەر شاعیرەکانی کورد بۆ ناردبووین. بەڵام چ بکەن هەر ئەو ســـەرچاوەیان پێ شـــک هاتبوو و کەڵکیان لێ وەرگرتبوو. بۆیە بەدڵمان نەبوو. ئەوەی تۆ هەرچەند بەداخەوە ســـەرچاوەی وات نەبووە کە ســـالم باشتر بناسێنی دیسان کەلین پڕکەرەوە بوو.

بەڕاســـتی سالم شاعیرێکی مەزنە و باش نەناســـراوە. کەسێکی زۆر شارەزای ئەدەبی دەوڵەمەندی فارسی نەبێ ئەگەر سالمیش باش نەناسێ عەیب نییە. وا دیارە ئەگەر دیوانی ســـالمت لەدەسدابایە بۆ تۆیەکی کە شـــارەزای ئەدەبی فارسیی، ناســـاندنی سالم دژوار نەبوو.

کەســـێکی لە وردەکاری شێعر بگا و دیوانی تەواوی شاعیریشی لە دەسدابێ چۆن ئەو شێعرە جوانە بەڵکو کەم وێنەیەی سالمی لەبیر دەچوو کە دەڵێ:




قــەراری ئاشــق و قانوونـــی حیکمـــەت زیـــددی یـــەک هاتـــن
کـــە تەســـکینی برینـــی دڵ بەنفحـــەی زولفـــی موشـــکین بوو

یا:

بەعیشـــوە و غەمزەیـــی مەعشـــووقە ئاشـــق کێـــو لەبـــن دێنـــێ
بـــە لای ســـالم کەننـــدەی بێســـتوون موژگانـــی شـــیرین بـــوو

چ بنووسم، کوڕە بەگیانی تۆ هێندەم نووسیوە چم لە «نووسیندان»دا نەماوە دیسان بۆ خاتری تۆ بۆ خاتری کەسێکی بەدڵ خۆشم دەوێ و هیوادارم خزمەتکارێکی باشی گەلە بێ بەش و چارەڕەشـــەکەمان بێ، بۆ کەریمی ئازیزم ئەم چەند دێرە دەنووســـم و ئەم دوو شێعرەی خۆم کە زۆرم خۆش دەوێن تۆمار دەکەم:

تـــەک و تەنیـــام و عەزیرانـــم کـــوان؟
بۆنـــی گـــۆڕخانەیـــی لـــێ دێ جـــێ ژوان
نامـــەوێ پاشـــی نەمـــان بـــۆم بگـــری
ئێســـتە ماچـــم بدەیـــە کیـــژی جـــوان!

٦٤/٧/١٧



## خۆت بناسە



خۆشەویستەکەم: خۆت بناسە بزانە تۆ کێی؛ مێژوو بخوێنەوە و تێبگە لە چ ڕەگەزێکی، ئەگەر بڕوا بەمێژوونووسەکانی خۆمان ناکەی، ئەگەر وەکو جۆلاکە بەسەردڕی خۆت ڕازی نی، بڕوا بەبێگانەکان و بەڕۆژهەلاتناسەکان بکە بزانە ئەوانە دەربارەی تۆ، باب و باپیری تۆ، خاک و نیشتمانی تۆ، چی دەڵێن و چی دەنووسن.

ئازیزەکەم: تۆ کوردی، تۆ لە نەتەوەکی خاوێنی، تۆ ڕەگەزێکی پاکی، باپیرەکانی پێشووی تۆ هەر لەم خاکەدا (کە کوردستانی پێ دەڵێن و ئێستا تۆی تیا دەژی و داخەکەم هەر لەتەی بەدەست کەسێکەوەیە) ژیاون، بەڵام چۆن ژیانێک؟ وەک تۆ دیل و ژێردەستی دراوسێکان بوون؟ نە بەخوا ئەوان سەربەست و سەربەخۆ بوون و ئازاد ژیاون.

گیانەکەم؛ کوردەگیان بەقسەی برای خۆت بکە، لە خەوی نەفامی هەڵسە تۆزێ لە حاڵی خۆت وردبەوە هۆشت بینەوە بەر خۆت، قۆڵت هەڵماڵە بەهەموو هێزی خۆت بقیژێنە بڵێ: ئەمنیش ئادەمیزادم، حەقی ژیانم هەیە ئەمەوێ وەکو خەڵک ئازاد و سەربەست بژیم سەربەخۆییم دەوێت و حەقی مەشروعی خۆم داوادەکەم، لە دیلی و ژێردەستی دراوسێکان جارس بووم و ئەمەوێت ڕزگاربیم.

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ٢، خەزەڵوەری ١٩٤٣/١٣٢٢




چاکە بەرژەوەندێکی لە حاڵی خۆمان بکەین و بزانین بۆچی وەپاش کەوتووین؟ بۆ چما ئێمە لە ڕەگەزی ئەو میللەتە نەجیبە نین کە بەگوێرەی مێژوو ئیقراری هەموو مێژووزان و ڕۆژهەڵاتناسێک یەکێک لە میللەتە هەرە گەورە و لەمێژینەکانی ڕۆژهەڵاتە، مەگە ئێمە لە نەتەوەی ئەو قەومە غەیور و دلێرە نین کە لاپەڕەکانی مێژوو پڕن لە شەرحی ئازایەتی ئەوەوە بەعالەم دەسەلمێنن کە قەت لە چ دەور و زەمانێکدا هیچ دراوسێک نەیتوانیوە ئاسوک پەڕێنی و بچێتە نێو سنووری موڵک و نیشتمانی ئەو. ئەدی بۆچی ئێستا وامان بەسەرهاتووە؟ بۆچی هێندە وەپاش کەوتووین و بووینە ژێر چەپۆکەی هەموو کەس؟ ئەگەر کەمێک بیر بکەینەوە و تۆزێک لە حاڵی خۆمان وردبینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مایەی چارەڕەشی و بەدبەختی ئێمە هەر ئەم نیفاق و دووبەرەکییەی ناو خۆمانە، کە وابێ لەسەر هەموومان لازم بەڵکو واجبە بۆ ڕێکخستنەوەی براکانمان تێکۆشین ڕەگوڕیشەی دووبەرەکیی لەبن بهێنینەدەر و یەکیەتی و برایەتی لە هەموو کوردستاندا دامەزرێنین.

ئەی برا خۆشەویستەکان، ئەی لاوە بیر ڕووناک و خوێندەوارانی کورد؛ مایەی ئومێدی ئەو قەومە لێقەوماوە ئێوەن، ئەوڕۆ ڕۆژێک نییە ئێوە بێدەنگ و هەست دابنیشن و لە قوژبنێک بخزن. کاتی ئاسایشت و تەمبەڵی ڕۆیی، جەنگەی هەوڵدان و تێکۆشان و ماندووبوونە، بەڵێ ئەمڕۆ ڕۆژی کارە و نابێ قەت لە کارکردن ڕاوەستن، دەنا ئەو هەولەتان لەکیس دەچێ و زەحمەت وگیرتان دەکەوێتەوە.

لازمە بەدڵێکی پڕ هیواوە بەهەموو هێزی خۆتان بۆ ڕزگارکردنی نیشتمان وە نەجاتدانی هاوخوێنەکانتان کۆشـــش بکەن هیچ شتێک نابێ ببێتە پێشگری کارتان بەنەیروی یەکێتی و برایەتی ئەو کەســـانەی کە دەبنە بەرهەڵستی پێشکەوتنی ئێوە و حەز بەلەناوچوونتان دەکەن، لەناوبەرن.

ئەگـــەر ڕۆژگار یارمەتـــی ئێوەی نەدا ئەگەر چەرخی چەپگـــەرد بەمرادی ئێوە نەگەڕا مەبەزن و مەیدان بەتاڵ مەکەن و دڵنیابن بەســـەر هەموو قۆرت و تەگەرێکدا زاڵ دەبن و لە هیچ کەس و هیچ شـــتێک مەترسن خوا پشتیوانتانە و هەمیشە ئەم وتارەی پێغەمبەری گەورەی ئیسلام و ناردراوی خۆشەویستی یەزدان کە دەفەرمووێت:

«کار بکە و دڵنیابە بەئاوات دەگەیت!»

لەبیر بێت و بیکەنە سەرمەشقی هەموو کارێکتان تا یارمەتی یەزدان حەقی مەشرووعی خۆتان لە بێگانە دەستێننەوە.

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ٥، ڕێبەندانی ١٩٤٤/١٣٢٣



## سکالایەک لەگەڵ نیشتمان



ئەی نیشتمانی خۆشەویستم، بۆیە هێندەم خۆش دەوی چونکو ئەمن ئێستا کە لاوێکی توند و تۆڵم لە پێشــا کۆرپەیەکی لاواز و ســاوا بووم لە دامێنی تۆدا گەورە و پەروازە بــووم و گەیشــتوومە ئەم ڕۆژە گەورەی وەک (حەزرەتــی محەمەد «ص») و گوێیان لە قورئان خوێندنی دەبوو ئیمانیان پێهێنا، یا لە حاڵێکا کە کتێبە ئاســمانییەکەی ئەم زاتە پەردەیەکی ئەســتووری لە نێوان خۆیان و هەوا و هەوەســی ناپاکەکەیان ئەکێشا و پیاوە زانا و تێگەیشتووەکانی لەوان بەزیاتر دەزانی و دەیفەرموو:

«هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون»!؟

خوێنەرە خۆشەویســتەکان ئەگەر نموونەیێکو لە ژیانی عەســری خۆمان نیشان بدەێن ســەرتان سوڕنامێنێ ئەویش ئەمەیە: ئاغاییێکی کوردی عێراق، بەڵکو سەردار عەشیرەتێک یەک دوو ساڵ لەمەوبەر نامەیێکی بۆ ئاغاییێکی کوردی ئێران نووسیبوو: «کە دەستی من و دامانی تۆ نەکەی بەهیچ بارێک لەپێناوی کوردایەتیدا تێبکۆشی چونکو کوردایەتی مانای ئەمەیە هەموو لاوە خوێندەوار و گەنجە تازەپێگەیشتووەکان بێنە سەرکار و ئێمە لە ژووری دیوەخانا دابنیشین».

ئێمــە نازانین خوێنەرە بەڕێزەکانمان چەندە فەرق لەنێــوان ئەم ئاغا کوردە عێراقییە خۆشەویســتە و (ئەبو جەهل) و (ئەخنەس) دائەنێــن بەڵام ئێمە ئەڵێین: ئەی بەبڕین چی دەستێکی بۆ زیانی نەتەوەی خۆی داوێنی مەردوم ئەگرێت ئێوەش بڵێن ئامین.

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ۶، ڕەشەمەی ۱۹۴۳/۱۳۲۲



## شیخ یوسف شمس الدین البرهانی

«چەندێک لەمەوپێش بەسەرهاتێکی دوور و درێژی ئەم زاتەم نووسیبۆوە و پێشکەشی ئیـــدارەی ناوەندیم کردبوو تا بۆ چـــاپ بنێرنە دایرەی چاپەکانـــی کۆمەڵە، بەڵام عەینی ڕیســـالەیان بۆ ڕەدکردمەوە تا چاوێکی تری پێدا بخشـــێنم، ئێســـتا خەریکی ئەو کارەم بەڵام تا حازربوونی بەســـەرهاتی موفەسەڵی شێخ، چەند دێرێک دەربارەی ژیانی ئەم زاتە دەنووسم».

کە میری گەورەی ڕەواندز لە داگیرکردنی وڵاتانی (سۆما و برادۆست بووەوە ١٢٤١ هـ)، بەوڵاتی لاجاندا دەگەڕاوە ڕەواندز، بەگوندی (نەڵۆس)دا کە گوندێکی زل و دارای قەڵاتێکی بڵیندە ڕادەبرد خەڵکی ئەم گوندە کە بە (بەگزادە) نێویان کردبوو، پێیان وابوو میر شکاوە و بەشپرزەیی هاتوونەوە، دەســـتیان کردە گەپ پێدان و «قەبو، قەبو»یان لێداناوە؛ میر ڕقی هەڵســـتا گەڕاوە کوشتارێکی زلی لێکردن، تەنیا ژنێک بەکوڕێکی ساوای مەمک مژەوە ڕزگاری بوو بۆ لای (ســـابڵاخ) هەڵات لە گوندی (عیساکەند) جێگیر بوو، کوڕەکەی (وسوو) بەخێوکرد تا گەورە بوو کرا بەگوێلکەوانی (ئاغا). بەڵام (وسوو) کە دیتبووی لە مزگەوتێ فەقێیـــان دەخوێنن ئەویش ئارەزووی خوێندنی کرد، هەمـــوو بەیانێک دەچووە کن مەلای ئاوەدانی دەرسی دەخوێند تا ببێتە (مەلا!).

ئاغا کە زانی (وســـوو) دەرســـی دەخوێنێ بانگی کرد و لێی توورە بوو گوتی: ئەگەر جارێکی دیکە بزانم دەرست خوێندووە دەتکوژم، بەڵام هەڕەشەی ئاغا گیانی پاکی (وسوو)

ی لـــە خوێندن نەگێــڕاوە و ئیجازەی لە دایکی وەرگرت و ڕۆیشـــتە شاری (ســـابلاخ) لە مزگەوتی (ڕۆســـتەم بەگ) دەســـتی بەخوێندن کرد. چەندێک علومی دینی خوێند پاشان ســـەودای تەسەوفی کەوتە مێشـــکی، وەکو دەگێڕنەوە خەونێک دەبینێ پێی دەڵێن وەرە شێخ عوسمان بانگت دەکا، ئەویش لەبەر سادەیی خۆی وا دەزانێت شێخ فەقەت لە (مەکە) و (مەدینە)ی دەبن، دەســـت دەداتە گۆچان و توورینی نان و ملی ڕێگا دەگرێت، نازانم لە چی شارێکی کوردســـتانی عێراق پیاوێک پرسیاری لێ دەکا: «بۆ کوێ دەچی؟» وەڵامی دەداتەوە دەڵێ: دەچم بۆ (مەکە)ی خزمەت شـــێخ عوســـمان، کابـــرا پێدەکەنی و دەڵێ: «فەقێ، شێخ عوسمان وا لە تەوێڵە»، ئەو نێزیک بوونەوەی ڕێگا دڵخۆشییێک بۆ (وسوو) سازدەکا، ڕێگای تەوێڵە دەگرێتە پێش دەخزمەت حەزرەتی شێخ عوسمان (سراج الدين)دا تا چەند ساڵ ڕیازەت دەکێشێت پاشان لەلایەن ئەم زاتە موعەزەمە ئیرشادی بۆ موکریان دەدرێتێ، پاڕانەوە و تکای زۆریش نەیتوانی باری ئەم وەزیفە قورسە لەسەر شانی (وسوو) یاوەکو حەزرەتی ســـیراجوددین فەرموویانە (مەلا وسوو) لابەرێت، بەناچاری دێتە موکریان لە گوندی (بورهان) دادەنیشـــێت مەشـــهور دەبێ بە (شمس الدين البرهاني)، دوای چەند ساڵێک دەچێتە گوندی (شەرەفکەند) لە زەوییێکی بێ کەلک خانەقاییێک بینادەنێ و دەست دەکا بەئیرشـــاد. لە ســـاڵی (١٢٢٨ هـ) دەتەمەنی ٩٧ ساڵیدا لەم جێگایە وەفاتی کردووە و نێژراوە.

شـــێخ یوسف پیاوێکی زۆر موتەعەســـیب بووە بۆ قەومی کورد، هەمیشە بەکوردییێکی پەتـــی دواوە، بەفەرمانی ئەم زاتە موقەدەســـە گەلێک کتێبی شـــەرعی وەکو (ابن حجر) لەلایـــەن مەلاکانەوە کراوەتە کوردی، ماڵ و دراو نەیتوانیوە هیز بخاتە ســـەر مێشـــکی، دەوڵەمەند و هەژار لەبەرچاوی وەکو یەک بووە خوای لێ خۆش بێ.

گۆڤاری نیشتمان، ژمارە ٧،٨،٩، بەهاری ١٣٢٣/١٩٤٤




## نامەی کچێکی دیل

هەڵبەستەی: ئارکاد

خۆشەویستەکەم

غەم و دەردی من یەکجار زۆرە، لە درێژایی شەقامی مژوایدا گۆڕاییەکانی ئێمە لەپێش چاو ون دەبن، ئەمن بەخڕ و دۆڵاندا دەبەن و بۆ لای شـــاری مەرگم ڕادەکێشــن، بەتەنێ هـــەر ئەمن نیم بەڵکە هەموو کچانی گوندەکەم دەگەڵن. خواهی نەخواهی لە کەســـوکار و ماڵـــی خۆمان دووربووینەوە، ئاواڵەکانم هەموو بەتـــاو دەگرین، بەڵام ئەمن لەبەر زۆربەی غەم و فرمێســـکم لە چاویدا قەتیس ماوە. ئاواتم هەر ئەوەندەیە کە کازیەکانی خۆم وەبەر ئەو چەرخانە بدەم کە هەمیشــە دەسووڕێن، بەڵام سوودی نییە، دەگەڵ ئەو کێشکچیانەی ئاگاداریمان دەکەن هیچ ناکرێ!

خۆشەویستەکەم

لەو کاغەزە ژاکاوە نامەت بۆ دەنووسم، ناتوانم بڵێم ئەو وتانە بەخوێنی خۆم دەنووسم چونکو خوێن دەرەگ و دڵی مندا بەستوویەتی. بەڵکە ئەو نامەت بەو میدادە بۆ دەنووسم کـــە لە گیرفانمدا شـــاردوومەتەوە و ئەتۆش تکا دەکەم بـــۆ خزمەکانمی بخوێنیەوە. ئەتۆ چوویتە جەبهەی جەنگ و ئەمن تا وێســـتا لە تۆ بێ خەبەرم، تەنانەت ئادرێسیشت نازانم، ئـــەدی بۆ کوێ؟ بۆ کوێ دەنووســـم؟ تەنیا مەوزووعێکی دەدەمە دەســـتی دوژمن تا پێم پێکەنی!، ئەمن بەقەولی گۆرانیبێژانی شارەکەمان وەڵامم بەئاسماندا دەنێرم.

نامەکـــەی من کە بەدوای بادا بۆ لای هەوران دەڕوا، شـــایەد ڕۆژێک دەگەڵ پریشـــکە

پریشکی بارانێ وەدەس تۆ بکەوێ.

خۆشەویستەکەم: ئێمە بەبەستێنی چۆمە بەرینەکانی خۆماندا تێپەڕین و چەپکە گوڵێکمان لە چۆمی هاویشت[1]، شەپۆلی ئاوێ چەپکە گوڵەکانی مەی قوم کرد، ئاواڵەکانم هەموو هیوا براوبوون، تەنها چەپکە گوڵەکەی من قوم نەبوو و ئاو بردی. لەوکاتەدا ئەتۆم بەجلکی سەربازییەوە هاتە پێش چاو، لەسەر بەردێکی ڕاوەستابووی و کڵاوەکەت بۆ لای من ڕادەوەشاند و بزەت پێم دەاتێ، گوولله بەهەوادا دەڕۆیشتن بەڵام وەتۆ نەدەکەوتن و ئەگەر وێشت کەوتبان نەیان دەبڕی و برینداریان نەدەکردی. لە پاشان ئێمە بەدابی جاران دەگەڵ یێکتر وەڕێ کەوتین، ئەمن لەو کاتەدا پێم وابوو کە بەدبەختی بۆمە لە خەو و خەیاڵێک زیاتر نییە، چونکو لەتەنیشت یەکترین و خۆشبەختین. ئەدی هیچ پێمان وانییە کە عڕابەکانی دوژمن بەنێو زەمەند و گیاوگژ و دەخڵوداندا ڕێگامان بۆ دەکەنەوە.

لەو عانەدا ئەمن پێم وابوو خێزانی تۆم، یێکترمان لە ئامێز دەگرت و قاقا پێدەکەنین. چەپکە گوڵەکەی من هەروا بەسەر ئاوا دەڕۆیشت، بەڵام بیرکردنەوەی من لەو بابەتەوە بێ کەڵکە، چونکو بەڕاستی ئەمن بڕوام بەفاڵ نییە.

خۆشەویستەکەم: تاو پەڕیوە، تارمایی بەسەر لێرەوارەکاندا کشاوە، بەسەر چلوکی دارەکانی کاج دا و بەپەڕپەڕۆچکەی ئاسماندا مانگی هەنگوینی منی لێقەوماو، دەچێتە پێش. لە پەنجەرە گوڵی عال دەبیندرێن کە ئاونگیان لەسەر دەدرەوشێ.

هەر دەڵێی چاوی کاڵە دەگری، بەڵێ دەگری تا نەنگی من نەبینێ و دەزانی چ شەوێکم لەپێشدایە!، شەوێکە کە نازانم لە ئامێزی پیاوێکی بێگانەدا یا لە باوەشی خاکی شاردا دەبێ بنووم. ئەمن بەندەیەکی شەرمەزار زیاتر نیم تا دەژیم، لەباتی وەی دەگەڵ تۆ جووت بم دەگەڵ خەم و کوێرەوەری بوومە ئاواڵ. بەسە ئەو شکایەتە خۆڕایانە، ماڵئاواییت لێدەکەم و نازانم ئەو نامە نووشتاوەوەت لە کوێ پێدەگات. ئەگەر ئەو نامەیەت پێنەگەیشت، دەبێ نامە درێژەکەی دیکە بخوێنیەوە، کیهە نامە؟، ئەو نامەی کە فرمێسکی دەسگیرانەکەت لە ڕێگای ئاسنی نووسیویە. ئەگەر ئی منیش نەبێ هی ئەو کچانەیە کە لەسەر هەموو شەقامێک و هەموو ڕێگایەکی ئاسن فرمێسکیان ڕشتووە.

بیخوێنەوە و وڵامەکەت ئامادە بکە و بەنووکی سەر نیزەتەوە بیهێنە بەرلین. گوێت لە دەنگم بێ و بەدرێژایی ئەو ڕێگایانە فرمێسکەکانی من بەخوێنی دوژمنان بشۆوە. ئەمن

---

١ ـ ئوکرانی و هێندێک لە شارانی دیکەی ڕوسیە لە ڕۆژی جەژنی... دا (ناوی جەژنێکە ناخوێندرێتەوە) کچان هەریەکە چەپکە گوڵێکی دەبەستن و بەئاوێی دادەدەن، ئەگەر گوڵ قوم بێ نیشانەی بەدبەختییە و ئەگەر قوم نەبوو ئەوە باشە.




لە تۆ دەنووســـم، لە تۆ دەپاڕێمەوە و دەڵێم بەو چەشنە ناتوانم بژیم، ئەنگی من بشۆوە، پەلەی بکە تۆڵەم بســـتێنەوە، بەتایبەتی تۆڵەی خاکەکەم بستێنەوە، ئی کێهە خاکی؟ ، ئی ئەو خاکەی لەژێر پێماندا نەرم و ڕەحەتە.

گۆڤاری کوردستان، ژمارە ٢، ٣٠ سەرماوەز ١٣٢٤، ٢١ دیسەمبەر

ئیقتیباس لە ڕۆژنامەی ئارەزوو




## ئازایەتی سمایل ئاغای سمکۆ

دەگێڕنەوە دەڵێن سمایل ئاغای سمکۆ سەرداری ڕەشید و بەنێوبانگی کورد لە چاخێکدا کە شـــاری ڕەزائیەی داگیرکرد لەپێش ئەوەدا بچێتە نێو شـــاری، گەورە گەورەکانی وڵات بەپیریەوە چوون و لە دەرەوەی شار دیدەنییان لێکرد. سمایل ئاغا دەهات و دەچوو گەفی لێدەکـــردن، لـــەو کاتەدا مارێک لەو مارانەی کە بە بەبێ ڕەزای لەو وڵاتەدا مەشـــهوورن بۆ لای هات. ســـمایل ئاغا بۆ ئەوەی ئازایەتی خۆیان پێ نیشان بدا و بەیەکجاری بیانتۆقێنێ، داهاتـــەوە و مارەکەی گرت. ماوەیەک هەر هاتووچوو و هەڕەشـــەی لەوان کرد و مارەکەی دەدەســـتەوەدا، لە ناکاو ڕەنگی بزرکا و لێوی بەددان گەســـت و مارەکەی لە هەردی دا و کوشـــتی. لەدوایە خەنجەری هەڵکێشـــا و ئەو قامکەی کە مارەکە پێوەی دابوو پەڕاندی و دەگەڵ ئەوەشـــدا کە خوێنی قامکی وەک پلوسک هەڵی دەداشت وازی لە قسەکردن نەهێنا تا قسەکەی تەواوبوو.

وام بیســـتووە لە پاش کوشتنی ئەو مەردە نەبەزە و ئەو پیاوە نەبەزە و ئەو سەردارە بەجەرگە کە لە ســـاڵی ١٣٠٩ دا بەدرۆ و دەلەســـە هەڵیان خەڵەتاند و هێنایانە ناو شاری شـــنۆ و لەوێ بەفێڵ شەهیدیان کرد، کەلاکیان لەنێو کەلاکی سائیری شوهەدادا بەو قامکە بەپێوە ناسییەوە، چونکو هێندە شپڕزە کرابوو ئەو نیشانەی نەبوایە بەزەحمەت دەناسراوە.
ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٣، ٢٦ بەفرانباری ١٣٢٤/ ١٥ ژانویە ١٩٤٦

## ئازادیمان دەوێ

شەش ســاڵ جەنگ بوو، شەش ساڵ خوێن ڕژا، شەش ساڵ کوشتارکرا، شەش ساڵ، بەڵێ شــەش ساڵی تەواو ئاڵا هەڵگرەکانی دیموکراســی بێ وچان و پشوودان، بێ دامان و ڕاوەســتان هەوڵیان دا و تێکۆشــان و خەو و خواردنیان لە خۆیان حەرامکرد. بۆچی؟ هــەر لەبەرئــەوەی بناغەی زوڵم و زۆرداری بڕووخێنن و ڕەگوڕیشــەی جــەور و بێداد لە بنەڕەت دەربێنن و ئــازادی و دیموکراتی لە گێتیدا بڵاوبکەنەوە و نەهێڵن چیدی زۆرداران ماڵی هەژاران بخۆن و بەدەســتەڵاتان حەقی بێ دەستەڵاتان پاماڵ بکەن. لەپاش کێشە و هەرایەکی زۆر، لەپاش جەنگ و کوشتار و خوێنرێژییەکی بەسام، لە دوای زەرەر و زیانێکی بێ ئەندازە ئازادیخوازەکان زاڵبوون و دەس لە کوشتار هەڵگیرا، خوێنرێژی نەما، کۆشکی زوڵم و ئیستیبداد ڕووخا، نەمامی جەور و بێداد هەڵکێشرا، مۆسۆلینی کوژرا هیتلەر مرتەی لێبڕا گوڕنیک گیرا و دنیا حەساوە.

جــا ئەوجا باوی هــەژار و زۆرلێکراو و لێقەوماوانە و کاتــی هاوارکردن هاتووە و ئەو نەتەوانەی کە هەمیشــە لەژێر پێی دوژمندا ناڵاندوویانە هاوار دەکەن و دەڵێن: «ئازادیمان دەوێ»!

ئێمەش واتا میللەتی کورد یەکێکین لەو نەتەوانەی کە لەمێژە دیل و یەخســیر و ژێر چەپۆکی و تامی ئازادیمان لەبیر چۆتەوە و دەمێکە دەربەدەر و قوڕبەســەر و زۆرلێکراو و تێشــکاو و داماوین. ئێســتاکە کولاوکەی هەویامان بۆ کراوەتەوە و تا ڕادەیەک ژیاوینەوە،




هـــاوار دەکەین و دەڵێین ئازادیمـــان دەوێ، بەڵێ ئازادیمـــان دەوێ و نابێ چیدی دیل و ژێردەســـت بین و ئامادەین لە ڕێـــگای ئازادیدا فیداکاری بکەیـــن و دەس لەگیان و ماڵی خۆمان هەڵگرین.

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٥، ٢٩ بەفرانباری ١٣٢٤/ ٢٠ ژانویە ١٩٤٦






برای هەرە خۆشەویستم: مەجدی گیان

لەپێشدا تکات لێدەکەم لووتم لێ خوار نەکەی و ڕووم لێ وەرنەگێڕی و قەڵس و تووڕە و زیز و دڕدۆنگ نەبی و وەپەڵەنەکەوی و پێت وانەبێ ئەمن لینگەبەریت دەکەم و ناخۆشم دەوێیی و ناتناسم و نازانم چ شیرین کوڕێکی.

خۆشەویستەکەم: بڕوام پێبکە ئەتۆم بەقەدەر چاوی ڕاستم خۆش دەوێیی و باشیشت دەناسم و دەزانم:

ئەتۆ لاوێکی خوێندەوار و دانا و تێگەیشتوو و بیرڕوون و پیتۆڵی، ئەتۆ زۆرت کوێرەوەری دیوە و سخلەتت کێشاوە بەدوی خوێندندا هەڵوەدای وڵاتان بووی، ئەتۆ ئێستا کە «مودیری و مامۆستای هەرە گەورەی دەبیرستانی مەهابادی». وە تەنانەت ئەوەشم بیستووە کە ئەوساڵ چوویە تاران و لەوێ لە تاقیکردنەوەدا وریایی و زرنگی خۆت نواند و ڕووی کوردانت سپی کردەوە و بێجگە لەوانە دەزانم کوڕی زانایەکی بەنێوبانگ و ماقوولی کوردستانی و تێگەیشتن و زانینی بۆ تۆ بەمیرات گەییوە.

بەڵام داخی گرانم نازانی بەزمانی کوردی و واتا زمانی دایک و بابی خۆت بنووسی!، یا دەزانی و بەئانقەست وا خراپ و تێکەڵ و پێکەڵی دەنووسی. ئەگەر نایزانی ئەوە هەوڵدە تێبکۆشە خۆت ماندوو بکە فێریبە جا ئەوجار بنووسە، خۆ ئەگەر دەزانی و هەر بەئانقەست




وا دەنووســـی، پێویســـتە بزانی و تێبگەی کە بەو کردەوە ناشیرینە دڵی هەموو نەتەوەی کورد لە خۆت دێشـــینی و دەبیتە نیشـــانەی تەوس و پڵلار و تووکی کوڕەکانی هاوخوێن و هاونیشـــتمانت، براکـــەم، هەر کوردێکی خونگەرم و نیشـــتمانپەروەر و کوردیزان چاوی بەنووســـراوەکانی تۆ بکەوێ نێوچاوانی گـــرژ دەکات و تووڕە دەبێ و مل دەنێ لە پرتە و بۆڵە و... بڕوات بێ ئەمن کە خۆم بەبرایەکی بەئەمەگ و...[1] و بەکەوچکە ئاوێکی وەمەلە دەکەوی، پێم خۆشـــنەبوو کێشـــەت دەگەڵ بکەم و بەخۆتدا بشکێنمەوە و دڵت بێشێنم. لەبەرئەوە گوێی خۆم لێ ئاخنی و قوڕوقاپ دانیشـــتم و چاوەتۆڕ بووم کە بۆ خۆت ئەغیار بیەوە.

ئەمـــە پێی چوو هەتا ئەوشـــۆ لە ژمارە ١٥ ی کوردســـتاندا نووســـراوێکی تۆم لەژێر ســـەرەتای (ئاتۆم)دا چاوپێکەوت بەڕاستی کە خوێندمەوە وەختابوو لەداخان شەق بەم و بدڕێم! وەیەکجار زۆر تووڕە بووم و گەلێکم پیش خواردەوە و تارماییم بەســـەرچاوی کشا، دەســـبەجێ دەرهەڵ بووم و دەســـتم دا قەڵەم و ئەم نامەیەم بۆ نووســـی: ترووسکەکانم، بەبەلەی چاوانم مەجدی گیان بەقوربانت دەبم ئاخر پێم بڵێ ئەتۆ ئەو نووســـراوانە بۆ کێ دەنووســـی؟ لەکنە خۆت بۆ کوردانی نانووســـی؟ بۆیەی نانووســـی خەڵک بیخوێنێتەوە و کەلکی لێوەرگری، بۆیەی نانووســـی هەموو کوردێکی خوێندەوار و نەخوێندەوار تێی بگا؟ ئەدی بۆچی وا تێکەڵ و پێکەڵی دەنووســـی؟ بۆچی بەکوردییێکی پەتی و پاک و خاوێن و بەڕێوەجێ نانووسی؟ کە بۆ خەڵکی قازانجی هەبێ.

براگیان، ئەو چەشنە نووسینە، بێجگە لەوەی هیچ قازانجێکی بۆ کوردان نییە زیانیشی یەکجـــار زۆرە، چونکو ئەو ڕۆژنامەیە بەدنیـــادا بڵاودەبێتەوە و دەکەوێتە دەس دوژمنان و ئەوانیش لە بیانوو دەگەڕێن کە نووســـراوەکانی تۆیان خوێنـــدەوە دەیکەنە هەرا و لێمان لەچەپڵـــە دەدەن و دەڵێـــن؛ چۆن ئەوەیـــە زمانی کوردی! ئەوەیە ئـــەو زمانەی هێندیان پێهەڵدەگوت و شـــاخ و باڵیان بۆ دروســـت دەکرد؟ و دەیانگوت هێندە هێندە باش و بەر ئاوەڵەیە، بەو بۆنەیەوە هیوام هەیە لەوەی پاش زۆر بەشـــێنەیی بنووسی و هەتا دەتوانی وتارەکانت پەتی بن. ئیدی بەخوام ئەسپاردی.

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٧، ڕەشەمە ١٣٢٤/ ٢٠ فوریە ١٩٤٦

---

١ ـ ئەو شوێنە لە دەقە ئەسڵیەکەدا ناخوێندرێتەوە.




زۆر کەس بەتایبەتی ئەو کەسانەی کە سەریان لە سیاسەت دەخورێ پێیان وایە کە هەڵپەڕینەوە و قیامی نەتەوەی کورد و داوای ئیستیقلال و ئازادی و سەربەخۆئی کردنی ئەو میللەتە هەر لە تاوی جەزرەبە و زۆری کاربەدەستانی مچومۆڕ و زۆردار و بلەوەزی بێگانەیە، ئاشکرایە کە بێگانەکان یانی فارس و عەرەب و تورک لەو ماوە دوور و درێژەدا کە دەستەڵاتیان بەسەر کورداندا هەبووە هەرچی نەدەبوو بکرێ دەگەڵ ئەو میللەتە دڵپاکەیان کردووە و خۆیان لە هیچ خراپەیێک نەپاراستووە.

ئێستاش خوێنی شەهیدانی ڕێگای سەربەستی کورد کە بەدەستی کەمالی بێ کەماڵ و دەستوپێوەندە خوێنمژەکانی ڕژاوە هەر دەکوڵێ. ئێستاش گوڵاڵە سوورەکانی کێوی ئاگری خوێنی نەوجەوانانی ڕەشید و ئازای کورد وەبیر پیاو دێننەوە. ئێستاش قاژ و قووژ و زیڕ و هۆڕی ژن و منداڵ و هاوار و ناڵە ناڵی لاوانی برینداری کوردی مەریوان کە لە ساڵی ڕابردوودا بەدەستی سەرتیپ هۆشمەندی دیکتاتۆر قەتل و عام و تارومار کران لە گوێیان دەزرینگێتەوە، ئێستاش بەندیخانەی ئەو دژمنە زۆردارانە پڕن لە لاوی بێ سووچ و تاوانی کورد و هەر ڕۆژە نارۆژێک یەکێک لەوان بەسێدارەوە هەڵداوەسرێ.

خۆ حاڵی زاری کوردی هەژاری بارزان کە چەند مانگ لەوەی پێش دەوڵەتی ئیستیعماری عێراق تالان و بێ خانومان و دەربەدەر و ماڵوێرانی کردن لە هەموو کەس مەعلوومە و ئاشکرایە، دروستە کە ئەو کردەوە ناشیرنانە ڕۆژ بەڕۆژ هەستی تۆڵە ئەستاندنەوە لە دڵی لاوانی خوێن گەرم و مللەتپەرستی کوردا بەهێزتر دەکەن. دروستە ئەو ڕەفتار و ئاکارە




وەحشیانە سات بەسات لاوان وەگەنجانی کورد بۆ لای ڕزگاری و ئازادی هان دەدەن بەڵام ڕاستێکەی ئەوەیە ئەوانە هیچیان نەبوونە هۆی هەڵپەڕینەوە و قیامی نەتەوەی کورد، ئەوانە هیچیان کوردیان وادار نەکردووە کە داوای ئیستیقلال و سەربەخۆیی بکا بەڵکو کورد میللەتێکی ١١ ملیۆنییە و بەهەموو شەرع و قانوونێک حەقی ئیستیقلال و سەربەخۆئیی هەیە و داوای ئەو حەقە مەشروعەی خۆی دەکا.

ئەی دنیا، ئەی دنیای ئازادی تەلەب، ئەی دنیاییێکی شەش ساڵ تەواو دەگەڵ زۆرداران ملەت کرد و لەو پێناوەدا بەشی زۆری لاوانی خۆت بەکوشت دا، بزانە: کورد ئیستیقلالی دەوێ. بزانە: کورد زوڵمی لێکراوە حەقی خوراوە موڵکی لێ داگیرکراوە و دەیەوێ بەحەقی خۆی بگا. بزانە: کە سیاسەتی شوومی ئیستیعماری بۆ قازانجی خۆی ئەم میللەتەی لە ئازادی بێ بەش کردووە و لە ئەنجامدا بزانە کە کورد ڕوشدی ئەوەی هەیە کاروباری ماڵە خۆی بەچاکی هەڵسووڕێنی و پێداویستی کۆمەگی کەس نییە قیوومی ناوێ و تا تاقەتی لێدەبڕێ سەر وەباری کەس ناهێنێ و بۆ ئەستاندنی سەربەخۆیی هەوڵ دەدا.

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٢٩، ١٠ خاکەلێوە ١٣٢٥/ ٣٠ مارس ١٩٤٦




لەو کاتەدا کە پاش شــەش ســاڵ شــەڕ و کوشــتار، پاش گەلێک ڕەنــج و ئازار و خوێنــڕژان و پیاوکــوژان، دوای زۆر کوێرەوەری و دەربەدەری و تــاڵان و برۆ، ئادەمیزاد دەیــەوێ لە بەروبووی کردەوەی خۆی بخوا و لەژێر ســێبەری داری ئازادیی کە بەخوێنی خۆی پەروەردەی کردووە و چەند ســاڵان بەدیارییەوە دانیشــتووە، دانیشێ و بحەسێتەوە و ماندوویی ئەو دەورەی شــەڕی لەبیر بچێتەوە. لەو ڕۆژانەدا کە لە هەموو جێگایەک قســە لە سولح و ئاشتی دەکرێ. ڕادیۆ و ڕۆژنامەکان بڵاویان کردەوە کە دوو جەردەی پیاوکوژ، دوو زەرووی خوێنمژ، دوو ماری بێ ڕەزا، دوو زۆردار و دیکتاتۆر دوو دوژمنی خوێنی کورد! یەعنی نوری ســەعید پاشا و ســیراج ئۆغڵو بۆ بەستنی پەیمانێکی نوێ یا تازەکردنەوەی پەیمانی شوومی (سعد آباد) لە ئانکارا کۆبوونەوە، ئایا ئەو پەیمانە چییە؟ ئایا ئەو پەیمانە بۆیە بەســتراوە کە قازانجی بۆ ئادەمیزاد بێ؟ ئایا ئەو پەیمانە بۆیە بەســتراوە کۆمەگ بەڕاوەستانی ئاشتی و سولح بکا؟ نەء نەء ئەو پەیمانە... قڕدانی ئادەمیزاد.......... تێک دانی........ چونکو ئەو کەســانەی........ ڕێگر و شــوڕانی و.........[1] ئەوانە لەوانەن بۆ دەسرێکی قەیسەرییێکی ئاور تێبەردەن، ئەوانە دوژمنی سولح و نەتەوەی ئادەمیزادن و ئەو پەیمانە شــوومەیان بۆیە بەستووە کە تۆوی کورد لەسەر زەوی نەهێڵن و ئەو نەتەوە بەیەکجاری نابوود و حەقی مەشــرووعی وی پاماڵ بکەن. وەکو بیســتوومە سیراج ئۆغڵو

---

١ ـ ئەو شوێنانە لە دەقەکەدا ڕەشبوونەتەوە و ناخوێندرێنەوە.

بەنوری سـەعیدی گوتووە هەنگینێ ئێمە دەتوانین دەگەڵ ئێوە ببینە دۆست و هاوپەیمان کـە ئەو نەختە حەقەش کە عیبارەتە لە نووسـین و خوێندنـەوەی زمانی کوردی ئەویش لەژێر سانسۆرێکی قەویدا، بۆ کوردان قائیل نەبی و ئەلبەتە ئەویش لە خودای دەوێ کورد نینۆکی نەبێ خۆی پێ بخورێنێ. بەڵام داخوا ئەوانە دەتوانن کوردان بەجارێکی لەنێو بەرن و تۆویان لەسەر زەوی هەڵگرن.

داخوا دەتوانن کوردان وادار بکەن واز لەو حەقە مەشـرووعەی خۆیان بینن! نەء نەء پێویستە ئەوانە بزانن و باش تێبگەن کە کورد میللەتێکی نەمر و نەبەزە و بەباوەش بمرن ناتوانن لەنێوی بەرن و بێدەنگی بکەن.

کورد هەیە و لە مەیدان دەرناچێ و بەهەرۆگیف ناپەشۆکێ و واز لە حەقی خۆی ناهێنێ و هەتا تنوکێکی خوێن دەبەردامابێ لە رێگای ئازادی و سەربەخۆییدا کۆشش دەکا و حازر نییە چیدی نۆکەری بێ جیرە و واجب و سـووک و چرووکی تورک و عەرەب و فارس بێ و ئەو هاوار دەکا و دەڵێ: ئەی ئەو کەسـانەی موقەدەراتی دنیا دەبەر دەستی ئێوەدایە، ئەی ئەو کەسانەی کە بۆ هەڵکەندنی نەمامی زوڵم و بێداد ئەو هەموو فیداکاریو کرد، ئەی ئەو کەسانەی کە دەتانەوێ.........[1] کە بەشادی و ئازادی بژی، سەرنجێکی بدەنە حاڵی ئێمە و مەیەڵن چیدیکە ئەو زۆردارانە لەژێر پێی خۆیاندا بمان تولخێننەوە، قەبوول مەکەن لـەوەی پاش ئەو خوێنمژانە خوێنی ئێمە بمژن و ئەگەر هاوارێکمان کرد یا لەجێی خۆمان جوولاینەوە لێمان لەهەرا بدەن و مەڵێن کورد رێگر و شەڕانییە.

توبی خودا ئەوە ئینسافە کابرایێک بێ بەزۆری مڵکت لێ زەوت بکا و ئەگەر پێت گوت ئـەوە موڵکی باب و باپیری خۆمە و دەبی بۆخۆم بەجێ بێڵی، لەباتی بەجێهێشـتن پێت بڵێ رێگر و شەڕانی و کێشەم پێدەفرۆشی.

هەویـام هەیە ئاڵا هەڵگرەکانی ئازادی چیدی ئـەو ناحەقیانە قبووڵ نەکەن و نەهێڵن بەتەنها لە دنیادا مللەتی کورد لە ئازادی بێ بەش بێ.

رۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٣٢، ١٧ خاکەلێوە ١٣٢٥/ ۶ آوریل ١٩۴۶

---

١ ـ ئەو شوێنانە لە دەقەکەدا رەشبوونەتەوە و ناخوێندرێنەوە.



## ڕۆژنامەی مەردی مللی



### بۆچی کوردستانو لەبیر کردووە؟

بەقەڵەمی: ئەحمەد حەمروش

کـــورد ئێرانیـــن و بێجگە لە ئێران حەشـــارگەیەکیان نییە میللەتی ئـــازا و لەمێژینەی کورد کە لەبەر هێندێک شـــت لە نیشـــتمانی ئەســـڵی خۆی دوورکەوتۆتەوە و ئەوڕۆ لەژێر چەکمەی نۆکەرانی ئیســـتیعمار و تەرفەدارانی سیاســـەتی (پان تورکیسم) ژیانێکی تاڵ و پڕ لە ناخۆشـــی ڕادەبوێرێ، ئاخری ڕۆژێک دەبێ ڕاســـتەوەبێ و شێرانە زنجیری ئەسارەت بپســـێنێ و تۆڵەیەکی زۆر بەســـام و پیاوانە لەو کەســـانەی دەستدرێژییان بۆ حقوقی وی کردووە و ئازاریان داوە و ئازادییان لێ ســـەلب کردووە بســـتێنیتەوە و زیندوو و نەبەزی خۆی بەدانیشـــتووانی سەر زەوی بســـەلمێنی و دەدوژمنانی خۆی بگەیەنێ کە کورد هەر زینـــدووە پایەدارە و بەهیچ جۆرێک نامرێ و ســـێڵاوی حەوادیس بناغەی عەزم و غیرەتی وی نالەقێنێ.

تێفکـــرن، کیهە میللەتە لە بەرابەر ئەو هەموو کۆششـــەی کە بۆ لەنێوبردنی وی کراوە وەدەکرێ هێندە بەهیمەت و خۆڕاگر و پایەداربێ.

کیهە میللەتە بۆ پاراستنی میللەتی خۆی بتوانێ دەگەڵ میللەتی غالیب وە بەدەستەڵات و زۆردار ملە و مبارەزە بکات.

ج نەتەوەیـــەک بەقەدەری ئـــەو نەتەوە لە ڕێگای ئازادی و سەربەســـتیدا فیداکاری و جانبازی کردووە و قوربانی داوە و زیانی دیوە و ئاوارە و دەربەدەرکراوە.

میللەتی غەیورتر و ئازاتر و نەبەزتر لە برا کوردەکانی ئێمە، کە داخەکەم ئێستا لەژێر پەنجەی بێ ڕوحمی بێگانانداندا ئەسیرن، کەمتر وەگیر دەکەوی بەڵکە هەر نابیندرێ. هێندێک لە دەوڵەتە ئیرتیجاعییەکانی عێراق، کە بەیارمەتی و مەبەستی ئیستیعماری و بەپێچەوانەی مەیل و ڕەغبەتی میللەتی عێراق هاتوونە سەرکار و هەمیشە لاگری سیاسەتی ئیستیعماری بوون و قازانجی میللییان چاوەدێری نەکردووە، بۆ پەیداکردنی دووبەرەکی و دوژمایەتی لە بەینی کورد و عەرەبدا ڕفتاری یەکجار بێ شەرمانە و خراپیان دەگەڵ کوردان کردووە.

دیسان دەوڵەتی تورکیاش ئەو ڕەفتارەی دەگەڵ ئەو میللەتە ئازایە کردووە و بەکوشتار و قەتل و عامی وان سەحنەییکی خوێنینی لە دونیادا هێنا ڕوو کە ڕووحی بەشەریەت و نەوع دۆستی لەو کارە بێ شەرمانە بێزارە.

تاریخ زوڵم و زۆرێکی کە دەوڵەتە ئیرتیجاعییەکانی عێراق و تورکیا لە برا کوردەکانی ئێمەیان کردووە قەت فەرامۆش ناکا. میللەتی قارەمانی کورد بەخوێنی گەش و سووری خۆی نێوی بڵیندی خۆی بۆ ئەبەد لە لاپەڕەکانی مێژوودا سەبت کردووە و هەتا ئادەمیزاد لە دونیادا دەژی نێوی ئەو جەللادە بێ ڕوحمانەی کە دەستە دەستە و پۆل پۆل لاوانی کوردیان سەر بڕیوە و زیندوو زیندوو دەئاوریان هاوێشتوون بەخراپە دێنێ. بەڵام هەرچی زووتر زۆری بۆ میللەتی کورد بهێندرێ و زیاتر جەزرەبە بدرێ ئەو ئاورە مقەدەسەی کە لەنێو دڵی پاکی ویدا لەمێژە دایسێ پتر بڵێسە دەستێنی و بێگومان سەرتاپای دوژمنانی دەسووتێنی. سەردانەواندن و چاوسۆرکردنەوە لە قامووسی کوردیدا نییە. ئەوە حەقیقەتێکە کە مێژووی خوێنین و پڕ ئیفتیخاری کوردستان شاهیدی لەسەر دەدا.

وەنەبێ کوردان هەر لە دەرەوەی نیشتمانی خۆیاندا تووشی کوێرەوەری و سەخڵەت و ناڕەحەتی بووبن بەڵکە لە نیشتمانی ئەسڵی خۆیان یەعنی لە ئێرانیشدا لە زەمانی حکومەتی ڕەزاخانی پەهلەویدا تووشی گەلێک مەینەت و کوێرەوەری بوون و حەقی ژیانیان نەبووە.

پەیمانی سەعد ئاباد کە هەموو کەس دەزانێ سەرفەن بۆ لەنێوبردنی کوردان ئیمزا کراوە، ئیمزای دەوڵەتی (ظل الله)ی ئیرانیشی پێوە بوو. ڕەفتار و ئاکارێکی ڕەزاخان دەگەڵ کوردانی دەکرد بەڕاستی یەکجار زۆر ناپیاوانە بوو، هەڵپەڕینەوەی ئێستای کورد عەکسولعەمەلی ئەو زوڵم و زۆرەی پێشووە.

ئەورۆ تەواوی ئەو کوردانەی کە لە وڵاتاندا بڵاوبوونەوە و لەژێر پەنجەی تورک و عەرەبدا، دیسان چاوی ئومێدیان دە نیشتمانی ئەسڵی خۆیان بڕیوە.

ئەهزەتی دیموکراتیکی کوردستان کە بناوانی لە نێوەڕاستی نیشتمانی ئەسڵی کورداندا




هەڵگیراوە هەموو کوردی دنیای متەوەجیهی ئێران کردووە ئەگەر دەوڵەت لە ئیحساساتی پڕ شۆری کوردان ئیستیفادە بکا و تۆڵەی بێ بەشی و چارەڕەشی زەمانی ڕەزاخانیان بەچاکی بۆ بکاتەوە و دەگەڵ جەنابی قازی محەمەد ڕەهبەری مەحبوب و مەزنی کوردستان، کە بێ شک لە ڕیزی پیاوە هەرە گەورە و زانایەکانی ڕۆژهەڵات حیساب دەکرێ، واریدی موزاکەرە بێ و مەسئەلەی کوردستان بەقازانجی ئازادی ببڕێتەوە، قووەتێکی وا بەهێز و نەبیندراو لە ئێراندا پەیدا دەبێ کە گرێی پشتی ئیستیعمار تێک دەهاڕێ و دەیشکێنێ.

ئەگەر کوردان لە دەرەوەی نیشتمانی خۆیاندا بەدەستی عەرەب و تورک گرفتارین هیچ نەبێ دەبێ لە نیشتمانی ئەسڵی خۆیاندا حەقی ژیانیان هەبێ و بەئازادی ڕابوێرن.

داخەکەم ڕەفتاری ڕەزاخان هیچ لە ڕەفتاری تورک و عەرەبان کمتر نەبوو ئێستاش خوێنی برا کوردەکانمان لە دەشتە پان و بەرینەکاندا شەپۆل دەدا، ئێستاش زنجیری دیلی لە دەست و پێی میللەتی ئێران دانەپندراوە، ئێستاش دەستی بێ ڕەحمی حاکمی نیزامی لە کۆبوونەوە و ئیجتماعات لە سنەدا جلۆگێری دەکا و نایەڵێ شکایەتی کەس بەگوێی ئەولیای ئوموور ڕابگا. گرانی هەڕەشە لە سەقز دەکا، کوردستان لە حاڵی تۆقین دایە.

ئەگەر دەوڵەتی ئێستاکە ئازادیخوازی و تێگەیشتنی سیاسی خۆی لە جێبەجێ کردنی مەسئەلەی ئازەربایجان و لە ڕووناک کردنی ئاسۆی تاریکی سیاسەتی خارجیدا نیشان داوە، دەگەڵ ڕەهبەرانی فرقە دیموکراتی کوردستان واریدی موزاکەرەبێ بەشەرتێکی عەناسیری ئیرتیجاعی و بەکرێگیراو لێبگەڕێن، مەسئەلەی کوردستان پێش بەتەقەدومی ئازادی و قازانجی ئێران تەواو دەبێ.

ئێمە لە جەنابی ئاغای (قوام السلطنه) تەمەنا دەکەین کە هەرچی زووتر ئاغای (مظفر فیروز) کە لاوێکی موتەرەقی و زانای موعاسیرە بۆ کوردستان بەڕێبکات تا مەسئەلەی کوردستان حەڵ بکرێ.

کورد برای ئێمەن، یادگاری باب و باپیری ئێمەن، دەبێ بۆ داوا مەشروعەکانی وان گوێ ڕادێرین، ئەوان بێجگە لە ئازادی و عەدالەت چی دییان ناوێ.

ئەمن پێم وایە ئەو چرا ڕووناکەی کە ئێستا لە کوردستاندا هەڵکراوە بەو زووانە سەرتاسەری ڕۆژهەڵات ڕووناک دەکا و ئازادیخوازانی ئێران کە لە خوزستان و ئازەربایجان و کوردستان و سایری نوقاتی ئێراندا هەن، کارێکی وا دەکەن کە ڕۆژی سەرئالاییکی کە هەرگیز ڕۆژی لێ ئاوانەبووە، بیلئاخیرە لێ ئاوابێ و میللەتی ئەسیری ڕۆژهەڵات نەجات دەدەن!

ڕۆژنامەی کوردستان، ژمارە ٧٩، ٢٩ گەلاوێژی ١٣٢٥/ ١٩٤٦

قەرار بوو بێی لەگەڵ خۆت شادی بێنی

نەهاتی، گەرچی پێت دابووم بەڵێنی

لەناو کوردا نەبوو پەیمان شکاندن

لە کوێ فێر بووی گوڵم پەیمان شکێنی

* * *

ئەگەرچی ڕۆیی، قەت ناچی لە یادم

دەکەم یادت، بەیادی تۆوە شادم

کە بارگەت بۆ هەوار تێک نا عەزیزم

شکا ئەستووندەکی تاوڵی مرادم